# ته فسیری شعیب



## بۆتێ گه یشتنی ماناو مه به ستی قورئان

ته فسیری سوره تی البقره ئایه تی (۱)_(۳۹)

به رگی یه که م

نووسینی: قاسم محسن عولا

٤-٥-١٤٤٥هـ--١٨-١١-٢٠٢٣م

## پێشەکی:

### بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين ، القائل فى كتابه الكريم : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ١٧٤﴾ [النِّسَاء : ١٧٤] ..؟! قال تعالى: ﴿قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ١٥﴾ [المَائـِدَة : ١٥] ..؟! والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين ، نبينا محمد ﷺ ، القائل : (( خيركم من تعلم القرآن وعلمه )) ..؟!

قال تعالى: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١ قَيِّمٗا لِّيُنذِرَ بَأۡسٗا شَدِيدٗا مِّن لَّدُنۡهُ وَيُبَشِّرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا حَسَنٗا ٢﴾ [الكَهۡف : ١ - ٢] ..؟!

الحمد الله الذي أنار قلوب عباده المتقين بنور كتابه المبين وجعل القرآن شفاء لما في الصدور وهدى ورحمة للمؤمنين والصلاة والسلام على خاتم الأنبياء وأشرف المرسلين سيدنا محمد ﷺ النبي الأمي الطاهر الزكي – الأمين الذي فتح الله به أعينا عميا وأذانا صما وقلوبا غلفا وأخرج به الناس من الظلمات إلى النور صلاة وسلاما دائمين إلى يوم البعث والنشور وعلى آله الطيبين الأطهار وأصحابه الهادين الأبرار ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين ...؟!

الحمد الله نحمدة ونستعينه ونستغفره ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ، ومن سيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأشهد أن محمد عبدة ورسوله

قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ [آل عِمۡرَان : ١٠٢] ..؟! قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ [النِّسَاء : ١]..؟! قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ [الأَحۡزَاب : ٧٠ - ٧١] ..؟!

# بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

حەمدو سوپاس و ستایش بۆ ئەو زاتە ی کە منەتی نا بە سەرمانداو کتێبێ کی بۆ رەوانە کردوین کە هەمووی نور و روناکی و هیدایەت و رێنموویی رێنیشاندەرە بۆ بەندەکانی ، بێ گومان ئەو نورە کە قورئانی پیرۆزە ، مرۆڤە کان لە تاریکییەکانی بێ باوەری یان کوفر و شریك و هاوبەشی دانان و شخص پەرستی و بت پەرەستی و یان پەرستنی دار و بەرد پەرۆ و رۆژو مانگ ئەستێرە و بتەکان ..؟! لە نەفامی و بێ باوەری ئەم پەرستنە پرو پوچانەی باسمان کرد قورئانی پیرۆز رزگاری کردووین .؟! بە لێ قورئانی پیرۆز ئێمەی گەیاندە راستە رێگای راست و دروست ، ئیمان و باوەری خوا پەرستی راستەقینەی پێ بەخشین ، رێ نیشاندرەمانە بۆ ناسین و پەرستنی پەروەردگاری جیهانیان ..؟! بەلێ بەراستی پەروەردگار ئەوەندە نازو نیعمەتی پێداوین کە بەهیچ جۆرێك هەرگیز ژماردنی نیعمە تەکانی لە توانای هیچ کەسێك دانیە ، چ جای سوپاس کردنی من بۆ نیعمەتەکانی پەروەردگار ئەوەندە دەتوانم کە سەری بەندایەتی خۆ م بۆ زاتی (الله )ی بەرزو بە شکۆ لە خاك بنێم و بەردەوەم سووجدەی شکور حمدی بۆ ببەم لە نوێژکانم و غیری نوێژەکانم کە بلێم : (( یارب لك الحمد کما ینبغی لجلال وجهك عظیم سلطانك)) ، بەلێ قورئانی پیرۆز کتابێکی پەروەردگاری جیهانیانە بۆ ئێمەی رەوانە کردوە لە رێگای جبریل (علیە السلام ) بە وە حی نیگا ، بۆ پێغەمبەری ئاخر زمان خاتم الانبیاءﷺ ..؟! ئەم قورئانە بۆ ئەوەی ببێتە دوستوری ژیانی مرۆڤ بۆ رزگار بوون لە دونیا و دارۆژ دا ، چونکە هیدایەت رێ نیشاندەری گشت مرۆڤە کانە ، نور رووناك کەرەوەی چاوەکانە ، مرۆڤ لە تاریکی رزگار دەکات بۆ رووناکی ، هەروەها بیرو باوەری راستەقینەی ژیانی مرۆڤی تێدایە ، لە شەریعەت پەیامەکەی دا یەکسانی و دادپەروەری تێدا بەدی دەکرێت ، هەر کەسێك دەست بەم قورئانە بگرێت و کاری پێ بکات ، ئەوا بەدلنیایەوە لە هەر دوو دونیادا سەر فەراز سەرکەوتوو دەبێت نە ترسی دەبێت بۆ داهاتووی نە خەم پەژارەشی دەبێت بۆ قیامەت لێ پرسینەوەی ..؟! بەلام کار کردن بە قورئان لە دوای تێگەیشتن لە مەبەست مانای ووشە رستە و شیکردنەوەو راڤەی ئایەتە کانی یەوە دێت ، بۆیە تەفسیر کردنی ئەم قورئانە پێ زۆر بەنرخترە لە هەموو مال و سامان و پلە و پۆستی خۆشگوزەرانی هەموو دونیا..؟! چونکە بەراستی رێگای بەهەشت و هیلاکەتی دونیام بۆ ئاسان دەکات ، هەر بۆیە بەلێنم داوە تامردنم وابەستەی قورئانی پیرۆز بم ، پەنا بەخوا بۆمانی ئاسان بکات لە علم و زانست بەرەکەتی خۆی (أن شاو الله ) ...؟!

بەڵێ قورئانی پیرۆز بەهاو نرخی یەکجار زۆر بەرزی هەیە ، هەر کەسێك دەستی پێوە بگرێت ، سەر فرازی و شکۆمەندی هەر دوو دونیایە ، نە ترسی هەیە لە دونیا دا و نە لە قیامەتیشدا ، نەخەم وپەژارەی هەیە بۆ دونیا و نەبۆ قیامەتیش ، چونکە خاوەنی هەڵگری ڕێبازو دەستوری قورئانە ..؟!! بەڵێ قورئان لە دوای تێ گەیشتن لە ووشە و ماناو مەبەستەکانی وە هەڵوەستە کردن بۆ مانای ئایەتە کانی هەروەها سوودوەرگرتن لە چیرۆك و پەندو ئامۆژگاریەکانی دا وە وورد بوونەوە لە ووشە و ماناو نهێنیەکانی قورئان ، بێ گومان هەمووی لە ڕێگای زانستی تەفسیرەوە دەست دەکەوێت ، لەم ڕوانگەیەوە لێکۆڵینەوە وراڤە کردن و تەفسیرکردن زۆرە لە سەر ماناو مەبەستی قورئان ، جا چ لە زانایانی ئەم ئۆمەتە وەکو پێشینە کان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، یان چ لە پێشینە چاکەکانی ئەم ئۆمەتەی ئیسلام وەکو شوێن کەوتووەکان (تابعین ) یان شوێن کەوتوویی شوێن کەوتوان ،( تابعی تابیعن ) هەروەها ئەوانەی بە زمانی عەرەبی تەفسیری قورئانیان کردووە لە زانایانی پێشینەکان ، یان چ ئەوانەی خۆمان بە کوردی راڤەو تەفسیری قورئانیان کردووە ، منیش لەم سۆنگەیەوە لێکۆڵینەوە و راڤەو تەفسیری قورئانی پیرۆزم کردووە ، بێ گومان لە ڕێگای وەرگرتنی سەرچاوەکانی زانایانیی تەفسیر جا چ زانایانی عەرەبی یان زانایانی تەفسیری کوردیەکان ، بۆیە بزاڤی راڤە کردنی قورئانی پیرۆز بۆ کوردی ئێستاش بەردەوامە ، منیش بە پێویستم زانی تەفسیری قورئانی پیرۆز بکەم بە پشتیوانی (خوای گەورە )، چونکە نزیکە دە ساڵ دەبێت من خەریکی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزم ، هەروەها زمانی عەرەبیم تەواو کردووە لە کۆلێژی ئاداب ، هەرووەها چەندین پەرتووکم نووسیەوە لە بواری ئاینی بەتایبەتی نووسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ناوی (بحرالحدیث یان دەریایی فەرموودە ) هەروەها نووسینەوە ژیان و سیرە و پێغەمبەری خوا ﷺ (ژیانی ڕۆشنایی چاوم پێغەمبەری خوا ﷺ ) ، هەروەها چەندین پەرتووکی تریشم وەرگێراوە لە عەرەبییەوە بۆ سەر زمانی کوردی ، بە تایبەتی پەرتووکەکانی الشیخ (محمد صالح المنجد ) وەکو :( نفاق ، توکل ، الصبر ، ئەخلاص )، هەروەها زانستی فەرموودە بەناوی (علوم الحدیث بەکوردی زانستی فە رموودە )، وە (فەزل و گەورەیی قورئانی پیرۆز )، (تەفسیری سورەتی الفتح ) وە (تەفسیری سورەتی فاتحە )، ، ئەمانە هەموو بەرهەمی هەوڵو کۆششی منە بۆ خزمەت کردنی ئەم ئایینە پیرۆزەی ئیسلام ، (خوای بەرزو بلند ) لە کردەوەچاکەکان بۆمان حیساب دەکات ، بۆ بەرز ڕاگرتنی ئەم ئاینە..؟!جا خوێنەری بەرێز خوشك برایانی موسلمان ، هۆی نووسینی تەفسیری قورئانی پیرۆزم ئەوەیە بۆ ئەوەی هاوزمانەکانم زۆر چاك لە قورئانی پیرۆز داتێ بگەن بۆ ئەوەی وابەستەی قورئان بن ، چونکە هەموو ژیان بەندە بە قورئانی پیرۆزەوە ، ڕێگایەکە بۆ ڕزگار بوون لە خەم پەژارەو دەڵە ڕاوکێ ، هەر بۆیە قورئان هیدایەتە بۆ متقین قال تعالى:

﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢﴾ [البَقَرَةِ : ٢] ..؟!هەروەها شیفایە بۆ سینەکان وە رەحمەتە بۆ ئیمانداران قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧﴾ [يُونُس : ٥٧]..؟! هەروەها نور ڕووناکی یەکی زۆر ئاشکرایە خەلکی لە تاریکی دەبات بۆ ڕووناکی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ١٧٤﴾ [النِّسَاء : ١٧٤] ،..؟! هەروەها ڕێگای هیدایەت ڕاست و دورست نیشان دەدا ،قال تعالى: ﴿وَلَٰكِن جَعَلۡنَٰهُ نُورٗا نَّهۡدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنۡ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٥٢﴾ [الشُّورَى : ٥٢]..؟!ئەمانەو چەندین

سوودی تریش بۆ مرۆڤ لە قورئانی پیرۆدا هەیە ..؟! من ئەم تەفسیرەی قورئانم کردووە بەراستی بەناوی کورە بچووکە کەی خۆم داناوە ، چونکە پێش لە دایك بوونی ئەم ناوەم لە قورئان دەرهێنا کە بە ناوی پێغەمبەر شیعب (علیە السلام ) کردووە ، چونکە ناوە کە ڕۆژ سەرسامی کردووم کە چەندە خاوەنی ڕێزو پایەو بووە ، هەروەها دادپەروەربووە لە بریاردا ، چەختی لە کێشان پێوانە کردنی تەرازوو کردۆتەوە،﴿إِذۡ قَالَ لَهُمۡ شُعَيۡبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ١٧٧﴾ [الشُّعَرَاء : ١٧٧] واتە: شوعەیب - صلى الله علیە وسلم - پێی فەرموون: ئەوە بۆ تەقوای خوای گەورە ناکەن بەوەی کە ئیمان بێنن..!!هە روەها﴿۞ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ وَلَا تَنقُصُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَۖ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ ٨٤﴾ [هُود : ٨٤] واتە: بەسەرهاتی شوعەیب پێغەمبەر – صلى الله علیە وسلم - و قەومەکەی} [ وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ] بۆ لای قەومی مەدیەن کە لە نێوان حیجازو شام نیشتەجێ بوون شوعەیب پێغەمبەرمان نارد - صلى الله علیە وسلم - کە ئەمیش لە خۆیان بووە [ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ ] ئەمیش وتی: ئەی قەومی خۆم بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن و خوا بپەرستن و شەریك بۆ خوا دامەنێن لەبەر ئەوەی جگە لە زاتی پیرۆزی الله هیچ پەرستراوێکی تری حەقتان نیە شایەنی پەرستن بێت [ وَلَا تَنْقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ ] وە پێوانەو کێشانەتان کەم مەکەن بەجوانی و تەواوی بەخەڵکی بدەن [ إِنِّي أَرَاكُمْ بِخَيْرٍ ] وە من ئەبینم کە ئێوە خوای گەورە ڕزق و ڕۆزیەکی فراوان و زۆری پێ بەخشیون [ وَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُحِيطٍ (٨٤) ] من لەوە ئەترسێم ئەگەر ئێوە لەسەر ئەم کارانە بەردەوام بن خوای گەورە سزایەکتان بدات لە ڕۆژێکدا کە سزای خوای گەورە دەورتان بدات و شوێنی ڕاکردن و پەناتان نەبێ بۆی ڕا بکەن..!!هەروەها ئەم تەفسیرەم بەناوی (شعیب) کردووە، (إن شاو الله ) (خوای ) گەورە پشتوانم دەبێت لە تەواو کردنی تەواوی تەفسیری

قورئان ، ئێستا تەنها لە سورەتی بقرە دا ئایەتەكانی (١- ٣٩ ) راڤە یان تەفسیر كردووە ، بە پشتیوانی خوا هەموو سورەتەكە تەواو تەفسیر دەكەم ...!!!بێ گومان من وەكو سەرچاوە پشتم بەستووە بە هەموو تەفسیری زانایان ، هەر لە زانا پێشینە كان و تا زانایانی ئەم سەردەمەش بۆ نموونە وەكو نابلسی یان ابن عثیمین وە یان زانا ناودارە كوردیەكان عبدالقادر تەوحیدی و مامۆستا علی باپیر ، هەروەها مەلا عبدالرحمن مەلا تەها عبدالعزیز حاجی باپرداود دزەیی ، هەروەها مەلا محمود گەلالەیی ، هەر وەها مامۆستا مەلا محمد مەلا صالح بامۆكی ، هەروەها تەفسیری باران ، چەندین سەرچاوەی تەفسیری كوردیەكان ، هەروەها لە تەفسرە عەربیەكان تە فسیریطبری تەفسیری ابن كثیر تەفسیری بغوی تە فسیری چەندین تەفسیری تری عەرەبی سەرچاوەم وەرگرتووە ، هەروەها هەوڵم داوە تەفسیری قورئان بەقورئان بكەم ، هەروەها تەفسیری قورئان بە فەرموودە ، هەرەها تەفسیری قورئان بە ووتەی هاوەڵان وەكو (عبداللە ی كوری عباس ) یان (عبداللە كوری مسعود ) ، هەروەها زانایانی تەفسیر فەرموودەناس وەكو (ابن جریر ) ، (ابن ابی حاتم ) ، (مقاتل بن سلیمان ) ، (قتادە ) ، (مجاهد ) جەندین زانایی تریشە — رەزاو رەحمەتی خوا یان لێ بێت — هەرەها پشتم بەستوە بە سەرچاوەكانی (موسوعە تەفسیر ماسور ) ..؟!بەلێ پێغەمبەری سەروەر رۆشنایی چاومان فەرموویەتی :( هەر كەسێك (خوای گەورە ) خێری بۆ ویست بێت ئەوا لە ئاین شارەزایی دەكات ) ئاین بریتیە لە (قورئان و سوونەت ) كە سەرچاوەی هەموو ژیانە یان سەرچاوەی هەموو بریارە شەرعیە كان ، یان حوكمە شەرعیە كانە ، جا هەر موسلمانێك باوەرداری راستەقینە تێ بگات لەم دوو سەرچاوەیە ئەوا بەدلنیایەوە (خوای گەورە ) خیری بۆیی ویستووە ..؟! هەروەها زانستی قورئان و تەفسیری قورئان لە سەرووی هەموو زانسێكەوەیە كە موسلمان فێری ببێت ، چونكە هەموو شتێكی لە خۆ دەگرێت ..؟! وەكو زانستی عقدە یان بیرو باوەر یان زانستی فقە یان هەر زانستێكی دونیا وی هەیە هەر هەمووی لە خۆ دەگرێت وە جەندین زانستی تریش كە موسلمان دەبێت فێری بیت ، هەروەها لە رووی زمانەوانی هەوڵم داوە زاراویەك بەكار بهێنم هەم لە زاراوەی هەولێر نزیك بێت هەم لە زاراوەی شارەكانی تری كوردستان نزیك بێت بەتایبەتی ئەوانە ی بە شێوە زاری سۆرانی قسە دەكەن ،بۆ ئەوە خەلكی لە ماناو مەبەست و راڤە ی ئایەتەكان تێ بگات ، هەروەها لە هەندێك شوێن ووشە ورەستە ی عەرەبیم نووسیوە ، چونكە پەرتووكە كە پەرتووكێكی ئایینە، بێ گومان قورئانیش بە زمانی عەرەبی دابەزیوە تە خوارەوە بۆ پێغەمبەری نازدار ﷺ پێشەوای مرۆڤایەتی ،هەروەك﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ٢﴾ [یُوسُف : ٢] واتە: ئێمە ئەم قورئانە پیرۆزەمان بە زمانی عەرەبی دابەزاندووە بەڵكو لێی تێ بگەن و فێری بن، چونكە زمانی عەرەبی پاراوترین و فراوانترین و دەوڵەمەندترین و روونترین و

مانابەخشترین زمانە..؟! هەروەها ﴿وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾ [النَّحل : ١٠٣] واتە: وە ئەم قورئانەش بە زمانێکی عەرەبی ئاشکرا دابەزیوە پڕە لە ڕەوانبێژی و بەلاغەت و فەصاحەت..؟! بێ گومان ئەوەی کە نووسیمە زۆربەی نەقلە ووتەکانی زانایانی تەفسیرە چەندێکی نەبێت ووتە گوفتارو بیرو راو بۆچوونی خۆم نووسیوە ، بەلام لە هەندێك شوێندا ئاماژەم بە ووتە گوفتارو رابۆچوون یان تەفسیری زاناکەم نەکردووە ، چونکە پەرتووکە کە لەوە زیاتریش دوور درێژ دەبوو ..؟! هەر سوودێك یان شتێکی جوان ئامۆژگاریەکی جوان هەبێت بە پی توانا لە تەفسیری شعیب دا نووسیومە ، لە ووتەی زانایان ووتەی راست دروستم باسکردوە ، زۆر بەشم وەرگێراو بۆ زمانی شیرینی کوردی ، بە پێ توانە لە زمانی عەرەبی دا ، بەداخەوە مەبەستمە شتێك لەم سەردەمە ی ئێستا باس بکە کە زۆربەی خەلکی بە ناو مەلا کان وایان ترساندووینە ، کەوا خەلکی نەکەن توخنی قورئان بکەون یان تەفسیر و راڤەی بکەن ، چونك پیێ تاوانبارو گوناه بار دەبن تەنانەت لە سەدەکانی ناوەراست دا حرام کرابوو کە قورئان راڤە بکەن بۆ سەر زمانە کانی تری غیری عەرەبی بەهیچ جۆرێك نابیت چونکە بە تاوانێکی گەورە هەژمار دەکرا ، بەلێ دەبوو خۆت فێری زمانی عەربی بکەیت ئینجا لە قورئان تێ بگەین ، بەلام سوپاس بۆ خوا ئێستا قورئان بۆ چەندین زمان وەرگێراوە یان تەفسیری بۆ کراوە ، بۆیە لە پێشدا ئەو ترس و توقاندیان دروست کردبوو لە دلی موسلمانان دا ، بۆ ئەوە خەلکی تووشی شخص پەرستی بکەن ، دوور بکەونەوە لە توحید و یەك خوا پەرستی راستە قینە ، هەروەها دەستەیەکی تریش دەلێن : تەنها قورئان بەس بۆ پشت بەست بە شەریعەتی ئیسلام ، بێ گومان ئەمانەش لە تێکدەرانی ئەم ئاینەن دوژمنانی ئاینی ئیسلام من ، چونکە ناکرێت بی فەرمووده قورئان تەفسیر بکرێت ، یان هەندێکی تریش لە شخص پەرستان پێیان وایە قورئان دەبێت لە مالەوە بێت نەخوێنرێت و نە لێ تێ بگەین ، تەنها بۆ ئەوەیە قورئان کاتێك مندال لە دایك دەبێت لە بەن سەری دادنرێت، یان بۆ خوێنەوەیە لە تازیەکان و مولوودی پێغەمبەری خوا ﷺ ،ئەویش بێ گومان بدعەو داهێنراوە لە ئایین دا ، ئەمانەچەندین کارو کردەوەی تریش بە قورئانی پیرۆز ، بەلام ووتەی راست ئەوە یە کە بخوێنەوە بۆ تێ گەیشتنی قورئان وە لە ماناو مەبەستی قورئان بگەین کاری پێ بکەین لە سەر رێچکە و رێبازی قورئان برۆین ..؟! لە کۆتایید ئۆمێدم وایە (خوای گەورە ) ئەم قورئانە بۆ بکات بە تشێوی قیامەتم ، وە داوا کارم لە (خوای گەورە ) بەقسمەتی هەموو ئیماندارێك بکات ، وە ئۆمێدم وایە ئەی براو خوشکی بەرێز ئە گەر هەلەیەکت بینی لەوەی نووسیومە ئەوا داوی لێ خۆش بوون دەکەم ، لە (خوای گەورە ) هەروەها دوای لێبردنیش دەکەم لە خوێنەری بەرێز ئە گەر کەم کوریەك یان هەلەیەکی بینی جا چ رێنووسی ئیملایی بێت یان چ هەلەی شەرعی ئاینی بیت وەکو عقیدە و بیرو باورە یان چ هەلەیەکی فقەیی بێت

یان چ هەڵە یەكی فكری بێت یان لە بیر چوونەوە یە ك بێت ، جا داواكارم بەخێری خۆتان ئاگادارم بكەنەوە ، ئەوەشی كە راست دورستە وەكو ئامۆژگاریەك وەری بگرن ، تەنها ئەوەی نووسیومە بەدڵنیایەوە لە (خوای گەورە ) یەوە هاتووە كە راست و دروستە ، ئەوەشی هەڵەو كەم كوریە ئەوەیە كە منیش مرۆڤم هەموو مرۆڤێكیش هەڵە دەكات، بۆیە بم بەخشن لە هەڵە و كەم كوریە كانی ئەم تەفسیرەی قورئانی پیرۆز ، كە بە تەفسیری شعیب ناسراوە ، ئەم تەفسیرە ببێتە رەحمەت بۆ داپیرانم و باپیرانم بۆ مامی كۆچ كردووم لە سەر خاك نشتیمان شەهید كراوە لە بەرانبەری رژێمی بەعسدا، هەروەها ببێتە رەحمەت بۆ باوكی هاوسەرەكەم محمد زكی ، هەروەها پێشكەشی دەكەم بە دایك و باوكم هەردوو هاسەرەكەم منداله كانم كە زۆر ماندوو بوونە لە گەڵم دا ، چونكە زۆر كاتیان پێ بەخشیم و زۆر ماندوو هیلاك بوونە لە گەڵ مندا ، (خوای گەورە ) پاداشتی خیریان بداتەوە ، هەروەها پێشكەشی دەكە بە هاورێ زیدە خۆشەویستەكانم ئەوانەی لە پێناوی (خوای گەورە ) بۆنەتە هاوری براو خۆشەویستی بۆ هەتا هەتایی كە برایەكی موسلمانی دامەزاوی راستەقیننە ئەوانە بەردەوام شایەنی رێز شكۆ و خۆشەویستینە لە لای من ، بۆ ئەو هاورێ و برا موسلمانانەی كە هەمیشەو بەردەوام خزمەت بەم ئایینە دەكەن ،وە پێشكەشی دەكەم بە مندالە كانم كە بێتە هیدایەت و رێنموویی و ئامۆژگاری بۆ ئەوەی لە سەر رێگە و رێبازو رێچكەی قورئان برۆن ، (نیهاد ، سیدادا، شعیب ، مهتاب ، لیلی ، صابرین ، وە پێشكەشی دەكەم بە خەسوی خۆشەویستم كە وەكو دایكی دووەم وایە (گوڵناز عباس ) وە پێشكەشی دەكەم بە مامۆستاو براو خۆشەویستم دكتور (دلدار باڵەكی ) مامۆستایی زمانی عەرەبی لە كۆلیژی ئاداب ، هەروەها پێشكەشی دەكەم بە هاورێ و خۆشەویستیم مامۆستام ( مەلا فەرهەنگ ) پێشكەشی دەكەم بە هەموو برا و خوشكەكانم ، پێشكەشی دەكەم بە هەموو مامۆستایەكانم كە یەك وانەی لێ وە فێر بوومە ، وە هەروەها پێشكەشی دەكەم بە هەموو موسلمانان ئەو براو خوشكە ئیماندارانە ، هەروەها پێشكەشە بۆ رووحی شەهیدانی غەزە كە ببێتە رەحمەت نصرەت فتح مبین بۆ ئەو براو خوشكانەی غەزە، ببێتە ئارامی وخۆگری بۆیان ﴿أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ [الفَتۡح : ٤] هەروەها بێتە فتح مبین ﴿ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ١﴾ [الفَتۡح : ١] هەروەها ببێتە ﴿نَصۡرًا عَزِيزًا ٣﴾ [الفَتۡح : ٣] ئامین (إنشاءالله ) ...

## سُورَةُ البَقَرَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى
لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ
وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ
إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾
أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾

# کورتە باسێك دەربارەی سورەتی (البقرە)

سورەتی (البقرە) لە ریزبەندی سورە تەکاندا بە دووەم سورەتی قورئانی پیرۆز دێت لە دوای سورەتی فاتحە دا ، بێ گومان سورە تێکی مەدنیە ، هیچ راو بۆ چوونی جیاوازی لەسەر نیە کە سورەتێکی مەدنیە ، وە ژمارەی ئایە تەکانی سورەتی (البقرە ) ژمارەیان (٢٨٦) ئایەتە ، هەروەك راو بۆچوونی جیاواز هەیە لە سە ر ژمارەی ئایەتەکانی دا وەکو لە (مصحف الکوفی ) داهاتووە ژمارەی ئایەتەکانی (٢٨٦) ئایە تە ، بەلام لە (مصحف المدنی ) ، وە بە تایبەتی لە خوێندی (وەرش )دا ژمارەی ئایە تەکانی دەکاتە (٢٨٥) ئایەت ، چونکە (الم ) بە ژمارەی ئایەت دانادرێت بەلکو بەکردنەوەی سورەتی (البقرە) دادەنرێت ، هەروەها لە (مصحف الکوفی ) بە ژمارەی ئایەتەکانی سورەتی (البقرە ) دادەنرێت و ، کە ژمارەی ئایەتەکانی دەکاتە (٢٨٦) ئایەت ، هەرەوەها ژمارەی ووشە کانی سورەتی (البقرە ) چوار راو بۆچوونی جیاوازی هەیە کە ئەمانەن :

یەکەم : ژمارەی ووشە کانی سورەتی (البقرە) دەکاتە (٦١٢١) ووشەیە .[١]

دووەم : ژمارەی ووشەکانی سورەتی (البقرە) دەکاتە (٣١٠٠) ووشەیە .[٢]

سێ یەم : ژمارەی ووشەکانی سورەتی (البقرە) دەکاتە(٦١٤٤) ووشەیە .[٣]

چوارەم : ژمارەی ووشەکانی سورەتی (البقرە) دەکاتە(٦٢٢١) ووشەیە .

ژمارەی پیتە کانی سەرەتی (البقرە) دوو راو بۆ چوونی هە ئەمانەن :

یەکەم : ژمارەی پیتەکانی سورەتی (البقرە) دەکاتە (٢٥٥٠٠) پیتە .[٤]

دووەم : ژمارەی پیتەکانی سورەتی (البقرە) دەکاتە(٢٦٢٥١) پیتە .[٥]

---

[١]- تفسیر ثعلبي في تفسیر الكشف والبیان (١٣٥/١)
[٢] - تنویر المقباس من تفسیر ابن علباس ص(٣).
[٣] -مراح لبید لكشف معنى القرآن المجید(٩/١) .
[٤] - تفسیر ثعلبي في تفسیر الكشف والبیان (١٣٥/١)، تفسیر ابن كثیر القرآن العظیم (٦٦/١) .
[٥] - مراح لبید الكشف معنى القرآن المجید (٩/١)

هەر وەك كە باسمان كرد لەپێشدا سورەتی (البقرە ) سورە تێكی مەدنیە ، بەلام هەندێك دەلێن: تەنها ئایەتی (٢٨١) نەبێت كە ئایە تەكە لە مككە دا بەزیوە كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ٢٨١﴾ [البَقَرَةِ: ٢٨١] واتە: ئەی خەلكینە لە سزاو تۆلەی رۆژێك بترسن كە تیایدا بۆ لای خوا دەگەرێنەوە ، لەوە ودوا هەموو كەس پاداشتی كارو كردەوەی خۆی وەردەگرێت و ستەمیان لیّ ناكرێت ..!! ئەو ئایەتە دابەزیە خوارەوە لە (منى لە حجە الوداع ) دا ، بەگریمانە كە ئەو ئایەتە مەدنیە لە دوای كۆچی دا .

هەروەها سورەتی (البقرە) درێژترین سورەتی قورئانی پیرۆزە كە ووتمان (٢٨٦) ئایەتە ، وە یەكەم سورەتی قورئانی پیرۆزە لەدوای كۆچی پێغەمبەری خواﷺ واتە: لە سالی یەكەم كۆچی دا لە شاری مەدینە سورەتی (البقرە )دابەزی، یەكەم سورەتی قورئانی پیرۆز لە شاری مەدینە دا بەزی سورەتی (البقرە ) ، وە كۆتا سورەتی قورئان كە لە مككەدا دابەزییە خوارەوە سورەتی (المطففین ) بوو پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چووە بۆ شاری مەدینە لە سالی یەكەمی كۆچیدا سورەتی (البقرە ) دابەزییە خوارەوە ، هەروەك ئەم سورەتە ناسراوە یان مشهورە بە سورەتی (البقرە ) واتە: (چێل) زاراوەی هەولێری ، وە بە زاراوەی شارەكانی تر وەكو: كەركوك و سلیمانی و پی دەلێن : (مانگا) ، بەلێ ئەم (چێلە) كە (خوای گەورە ) فەرمانی كرد بە نەوەی ئیسرائیل كە سەری ببرن ، بەلی لە دوایدا بە درێژی ئەم چیرۆكەی كە بە چێلە كەی نەوەی ئیسرائیل ناسراوە باسی دەكەین ، بەلی سورەتی (البقرە ) كۆكەرەوەی هەموو سورەتەكانی قورئانی پیرۆزە ، چونكە هەموو بابەت و باسە كانی قورئانی لە خۆ دەگرێت ، هەروەك ( أصول التوحید ) دورست بوونی مرۆڤ ، رەوشت بەرزی یان پەروەردە كردن لەسەر رێنموویی و هیدایەت ، وە ئەو كەسەی هەلگری رەوەشتی قورئانە یان پێویستە بە قورئان ئەوا بیّ گومان هیدایەت دراوە و رەوشتی قورئانی هەلگرتووە پابەندە بە فەرمانەكانی ، وە دوور دەكەوێتەو لە قەدەغە كراوە كانی ، هەروەها لە سورەتی (البقرە )دا باسی سیّ چینە لە مرۆڤ دەكات ئەویش ئەوانەی كە:١- ئیمان و باوەریان هێناوە واتە : ئیمانداران ، ٢- بیّ باوەرە كان واتە : كافرە كان ، ٣- مونافیقە كان واتە : دوو رووە كان كە لەنێوان كفرو ئیمانن..!! هەر لەم سورەتەدا بەدرێژی باسی مێژووی نەوەی ئیسرائیل یان جولەكەكان دەكات ، كە لە كاتی دابەزینی ئەم سورەتەدا جولەكەكان لە شاری مەدینەدا دراوسیّ موسلمانەكان بوون ،هەروەها باسی ئاداب و شەریعەتی ئاینی ئیسلام دەكات ، هەروەها باسی دەسەلات و توانای (خوای گەورە ) دەكات كە چۆن مردوو زیندوو دەكاتەوە ، وە باسی مامەلە كردن وە كرین وفرشتن لە رووی شەریعەتی ئیسلام دەكات ،وە بەیان كردنی (اركان ئیسلام ) یان بانگەوازی كردن بۆ جیهادو تیّ كۆشان ، كە شكومەندی و مەردایەتی یە ، هەروەها باس لە هەلوێستی موسلمانان دەكات كە ئەم ئایینە پیرۆزە یان بۆ هاتە خوارەوە ، وە باسی گفتو گۆ و هەلسوكەوتی موسلمانان دەكات كە چۆن بن بەرانبەر بە هاوبەش بریار دا نان یان موشریكان ، وە باسی چیرۆكی نەوەی ئیسرائیل دە كات كە چۆن بوونە بە رانبەر بە پێغەمبەران لە پێشدا (علیه السلام ) ..!!

هەروەها سورەتی (البقرە) ناوی (فسطاط) واتە: داپۆشێرەی یان خێوەتگەی قورئان ناوە هەروەك لە (ابی سعید الخدری ) وە لە (خالد بن معدان ) – خوا لی یان رازی بیت- وە لە رسول الله ﷺ قال: (( السورة التی یذکر هذه البقرة فسطاط القرآن ، فتعلموها ، فإن برکة ،وترکها حسرة )) .[١] واتە: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سورەتێك تان بۆ باس دەكەم كە سورەتی (البقرە )یە كە داپۆشەری قورئانە یان خێوەتگەی قورئانە ، فێری بن ، ئەگەر فێری سورەتی (البقرە ) بوون ، ئەوا برەكەتە ، بەلام ئەگەر وازتان لیّ هێنا ئەوا تووشی حسرە ت و دلّ شكان و ناخۆشی دەبیت ..!! چونكە هۆكاری ئەوەی كە ناوەی ((فسطاط القرآن)) لە بەر ئەوەی كە گشتگیرەوەی هەموو بابە تەكانی قورئان لە خۆ دە گرێت ، وە كو چادرێك یان خێوەتگەیەك وایە بۆ قورئان كە دەبێتە دا پۆشەری قورئان لە هەموو بابەت و باس ، چیرۆك ، پەند و ئامۆژگاریە كانی قورئان ، هەروەها ئەو گەورەیی شەریعەت و( اصول الدینە) ، هەروەها ناوێكی تریشی هەیە ئەویش پیّ دەوترێت (سنام القران ) واتە: لووتكەی بەرز، ئەمەش فەزل گەورەیی سورەتی (البقرە ) دەگەیەنیّ ، هەروەك لە (ابو هریرە ) – خوا لی رازی بێت – دەفەرموویت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إن لكل شیء سناما ، وإن سنام القرآن سورة البقرة ، وفیها آیة هی سیدة آی القرآن : آیة الكرسی )) .[٢] واتە: هەموو شتێك لووتكەی بەرزی خۆی هەیە ، وە لووتكە بەرزی قورئانیش سورەتی (البقرە ) یە ، ئەو ئەویش ئایە تێكە لە سورەتی(البقرە )داكە گەورە ترین ئایەتی قورئانی پیرۆزە (ئایەت الكرسی ) یە ..!! هەروەها سورەتی (البقرە ) ناوێكی تریشی هەیەكەبەوناوە بەناوبانگە ئەویش لەگەل سورەتی(ال عمران ) بە هەر دوو كیان پیّ دە لیّن : (الزهراوین ) واتە : دوو درەو شاوەكە ی وەكو مانگ واتە: (البقرە ) و (ال عمران ) لە (عبدالله بن بریده ) گێراویەتەوە لە باوكی یەوە – خوا لیان رازی بێت = دەلێت : ئێمە دانیشتین لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گویمان لیّ بوو دەی فەرموو : (( تعلموا سورة البقرة ، فإن أخذها بركة ، وتركها حسرة ، ولا یستطیعها البطلة ، ثم سكت ساعة ، ثم قال : تعلموا سورة البقرة ،وال عمران ، فإنهما الزهراوان ، وإنهما تظلان صاحبهما یوم القیامة كأنهما غمامتان أو غیایتان ، أو فرقان من طیر صواف . وإن القرآن یلقی صاحبه یوم القیامة حین ینشق عنه القبر كالرجل الشاحب فیقول له : هل تعرفنی ..؟ فیقول : ما أعرفك ، فیقول : أنا صاحبك القرآن الذی أظمأتك فی الهواجر ، وأسهرت لیلك ، وإن كل تاجر من وراء تجارته ، وإنك الیوم من وراء كل تجارة فیعطی الملك بیمینه ،والخلد بشماله ، ویوضع علی رأسه تاج الوقار ، ویكسی والداه حلتین لایقوم لهما الدنیا ، فیقولان : بم كسینا هذا ..؟ فیقال لهما : بأخذ ولدكما القرآن ، ثم یقال له : اقرأ واصعدفی درج الجنة وغرفها ، فهو فی صعود ما دام یقرأ هذا كان أو ترتیلا )).[٣] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : خۆتان فێری سورەتی (البقرە ) بكەن ، چونكە دەست پێوە گرتن و فێر بوونی بركە تە ، واز هێنانی لە سورەتی (البقرە ) حسرەت و دلّشكاوەو پەشیمانیە ، وە جادوو گەورە فالچی و ساحیرە كان توانایان بە سەر دانیە ، جا دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ ماوە یەك بیّ دەنگ بوو ، دواتر فەرمووی : خۆتان فێری سورەتی (البقرە ) و وە سورەتی (ال عمران ) بكەن ، چونكە ئەم دووانە رووناكیە كەیان درەشاوەیە وەكو مانگ ، وە هەر دووكیان سێبەر لە خاوە نەكانیان دەكەن لە رۆژی قیامەتدا وەك دوو پارچە هەور یان دوو چەتر

---

[١] - الدارمي في فضائل القرآن برقم (٣٢٥٧).
[٢] -سنن الترمذي برقم (٣٣٧٧).
[٣] -سنن الدارمي برقم ٣٤٤٣) أو (٣٢٥٧) في فضائل القران .

یان خێوت ، یان دوو پۆلە باڵندەی باڵ کراوە وان  کە سێبەریان دێت بەسەر خاوەنەکانیان دا ، وە قورئان وە پیاوێکی رەنگ پەریو دەگات بە خاوەنەکەی لە رۆژی قیامەتدا ، کاتیێ گۆرەکەی یان قبرە کەی لە سەر شق دەبێت یان والادەبێت و پێی دەلێت : ئای دەمناسی ..؟ خاوەنەکەشی دەلێت : ناتناسم ، وە  پیاوە رەنگ پەریوەکە دە لێت : من هارێکەتم ، ئەو قورئانەم کە تویندووم دەکردی لەکاتی گەرما و ، شەونخونیم پێدەکردی بە شەوەکانت ، جا هەموو بازرگانێك بەدوای بازرگانیە کەیەوەیە ، تۆ ئەمرۆ دەدریچتە دەستی چەپی و ، تجای رێزیشی دەخرێتە سەر و ، دایك و باوکیشی پۆشتە دەکرێن بە دوو تاخمە جل کە بە دونیا نانرخینرێت یان قیمەت ناکرێت ،وە یان بە دونیا دا بەراورد ناکرێن ، وە دایك و باوکیشی دەلێن : بەهۆی چ شتێك پۆشتە کراوین ..؟!! پێیان دەوترێت : بەدەست گرتنی مندالە کنتانەوە بە قورئانی پیرۆزدا ، دواتر بە خاونی قورئان خۆێنکە ئەوەی دەستی بە قورئانەوە گرتووە دە وترێت : بخوێنە و بەرزبەرەوە بە پلە کانی بەهەشت و کۆشکەکانی دا ، جا هەر لە بەرز بوونەوەدایە مادەم قورئانە کە بخوێنیت بە خێرایی بێت بان بە هێواشی بێت ..!!هەرلە صحیح مسلم داهاتووە لە (ابو امامە الباهلی ) – خوا لیێ رازی بێت – دەلێت : گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووفەرمووی : (( أقرءوا القرآن فإنه يأتي يوم القيامة شفيعا لأصحابه اقرءوا الزهراوين  البقرة  ال عمران فإنهما تأتيان يوم القيامة كأنهما غمامتان أو كأنهما غيايتان أو كأنهما فرقان من طير صواف تحاجان عن أصحابهما اقرءوا سورة البقرة فإن أخذ بركة وتركها حسرة ولا تستطيعها البطلة )) .[١] واتە: قورئان بخوێنن کە بەراستی لە رۆژی قیامەت دا دەبێتە تکاکارو شفاعەت بۆ خاوەنانی قورئان خۆێن ، ئەو دوو گولە یان ئەو دوو مانگە درەوشاویەی قورئان ، واتە: (البقرە و ال عمران ) بخوێنن ، جا بەراستی رۆژی قیامەت ئەو دووانە دیچن وەك دوو پلە هەور یان وەك دوو سێبەر یان دوو کۆمەلە بالّندە کە کە بالە کانیان کردۆتەو  وەکو چەتر کە پشت گیری یارمەتی خاوەنانی قورئان خوێن دەدەن ، سورەتی (البقرە ) بخوێنن کە بەراستی وەرگرتنی بەرەکەتە ، بەلام وازهێنانی و یان پشت گویێ خستنی ، دە بێتەو دلّ شکاوی یان پەشیمانی ، چونکە ساحیرە کان ناتوانن لە بەرانبەریدا بوەستن ، یان تواناکانیان نابێت بەسەر ئەو کەسە ی کە سورەتی (البقرە ) دەخوێنی دەبێتە تێك شکاندنی ساحیرە کان.

هەروها چەند ناوێکی تریشی هەیە کە زانایان وەك ئەجتهادی خۆیان ناویان ناوە  وەکو ئەم پێنچ ناوە : (( طيبة ) و سورتی (الامان ) و سورتی (الكنز ) و سورتی (المعينة) وسورتی (المجادلة ) و سورتی (الاستغار ) واتە: ئەم پێنچ ناوەشی هەیە ..!!

[١] -صحيح مسلم .

# چیرۆکی چێلە کەی یان مانگا کەی نەوەی ئیسرائیل

خوای گەورە دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُواْ بَقَرَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ فَٱفْعَلُواْ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾ قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا ۚ قَالُواْ ٱلْـَٰٔنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَٱدَّٰرَْٰٔتُمْ فِيهَا ۖ وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ كَذَٰلِكَ يُحْىِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾﴾ [البَقَرَة : ٦٧ - ٧٣]

واتە: ئەی نەوەکانی (یعقوب ) علیه السلام ، یادی ستەمی پێشینانتان بکەنەوە کە چەندە باریان لە خۆیان گران دەکرد یان خۆیان هیلاك دەکرد ، کە دەمەدەمیان لە گەل (موسی) علیه السلام ، دەکرد، کاتێك کە پێی فەرموون : بە دڵنیاییەوە (خوای گەورە ) فەرمانتان پێدەکات چێل یان مانگا یەك سەر ببرن ، ئەوانیش بە لووت بەرزی خۆ بەگەورە زانینەوە ، ووتیان : ئایا دەمانکەیتە جێگەی گالتە و سووکایەتی پێکردن ..؟! (موسی ) علیه السلام ، وەلامی دانەوە فەرمووی : پەنادەگرم بە خودای پەروەردگار لەوەی کە لە گالتە جاران بم ..!! وتیان : داوا لە پەروەردگارت بکە سیفەتی ئەو مانگایەمان بۆ ڕوون بکاتەوە، ئەویش وەڵامی دانەوە، خوای پەروەردگار پێتان دەفەرموێت : سیفەتەکەی ئەوەیە کە نابێت بە تەمەن و پیربێت، وە ناشبێت بچوك وکەم تەمەن بێت، بەڵکو ئەبێت لەو مامناوەندی ئەو دووە بێت، جا پەلە بکەن لەجێبەجێکردنی فەرمانی خوا . بەڵام دیسانەوە دەستیان کر بە دەمەدەمەکەی خۆیان وتیان : داوابکە لەپەروەردگارت ڕەنگی ئەو مانگایەمان بۆ ڕوون بکاتەوە، فەرمووی : خوای پەروەردگار ئەفەرموێ : مانگایەکی زەردی زۆر زەردە، هەر کەس تەماشای بکات . نەوەکانی یەعقوب بە موسایان وت : داوابکە لە پەروەردگارت جگە لەوانەی پێشو سیفەتی تریمان بۆ ڕوون بکاتەوە چونکە مانگای . لەم جۆرە . زۆرن ولێمان تێکچوە کە چی هەڵبژێرین ؟ وە بێگومان ئێمەش . ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت . ڕێنمایی دەکرێین و ئەو مانگایە دەدۆزینەوە کە فەرمانکراوە بە سەربڕینی . موسا پێی فەرموون : خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ئەو مانگایە دەسەمۆنەکراوە بۆ کێڵانی زەوی بە مەبەستی کشتوکاڵ، و بەکارنەهێنراوە بۆ ئاودان، و هیچ عەیبێکی تێدانیە، و هیچ نیشانە و پەڵەیەکی جیاواز لە ڕەنگی خۆیی پێوە نیە، وتیان : ئێستا هەقیقەتی سیفەتی مانگاکەت بۆ هێناین، جا ناچاربون سەری ببڕن دوای زۆر پێچ و پەناکردنیان، ئەگەرچی نزیك بوو سەریشی نەبڕن بە هۆی کەلە ڕەقیانەوە، ئابەم شێوەیە

توندیان کرد لەسەر خۆیان، لە بەرامبەردا خوای پەروەردگاریش لەسەری توندکردنەوە . وە یادی ئەوە بکەنەوە کاتێك کە کەسێکتان کوشت، و لە بارەیەوە جیاوازی کەوتە نێوانتانەوە، و هەریەکە و تومەتی کوشتنی لە خۆی دوردەخستەوە، و خوای پەروەردگاریش ئەوە دەردەخات کە دەتانشاردەوە سەبارەت بە کوشتنی کوژراوەکە . وتمان : بە پارچەیەك لەو مانگا سەربراوە بدەن لە کوژراوەکە، بەوە خوای پەروەردگار زیندوی دەکاتەوە و پێتان ئەڵێ کێ کوشتویەتی . ئەوانیش بەپارچەیەکی لەکوژراوەکەیان دا و خوای پەروەردگاریش زیندوی کردەوە وبکوژەکەی پێوتن . بەهەمان شێوەش خوای پەروەردگار مردوان . لە ڕۆژی دواییدا . زیندو دەکاتەوە، و موعجیزەکانی خۆی پیشانتان دەدات . ئەی نەوەکانی یەعقوب . کە بەڵگەن لەسەر تەواوەتی توانای ئەو . بەرز و بڵند و پایەبەرز بێت .، بەڵکو بەعەقڵتان بیر بکەنەوە، و واز لە سەرپێچیەکان بهێنن ..!!

بەلێ (خوای گەورە ) ویستی ئەم چیرۆکەمان دەربارەی باسەکانی جولەکەکان یان نەوەی ئیسرائیل مان بۆ بگێرێتەوە ، دەربارەی رق و خشم و قینە یان کە تێدا لە سنوور دەرچوو بوون یان لەو ئایینە دەرچوو بوون کە (موسی ) علیه السلام ، پەیامبەرە کەیان بوو ، کە چۆن هەموو شتێکیان لەسەر نەفسی خۆیان بەتووند وەر گرتبوو ، هەر بەم جۆرەشەوە کە (خوای گەورە ) لەسەر توند کرنەوەتەوە ، تاکو بزانن باشترین خیرو چاکە هەنگاو نانی خێرایە بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی (علیه السلام )، بەبێ دەمە دەم و گفتو گۆ و مناقشەو قول بوونەوەی زۆر لە شتە کان دا ، کە ئەمانەش دەبنە هۆی دروست بوونی بریاری توووند ، ئەوەش کە (خوای گەورە ) قەدەغەی یان نهی لێ کردوون ، کە قومەکەی یان ئومەتەکەی پرسیار زۆر بکەن ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت: قال تعالى: ﴿تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْـَٔلُواْ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُواْ بِهَا كَٰفِرِينَ ﴿١٠٢﴾﴾ [المَائـِدَة : ١٠١ - ١٠٢] واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان بەخوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی صلى الله علیه وسلم هێناوە و بەڕاستان زانیون و کردەوە بە شەرعەکەی دەکەن، پرسیار لەبارەی شتانێك مەکەن لە دیندا کە فەرمانتان پێ نەکراوە پێیان بەشتێك، وەکو پرسیارکردن سەبارەت بە شتگەلێك کە ڕوویان نەداوە، یان لەبارەی شتێك کە دەبێتە هۆی قورسکردنەوە و سەختکردنەوەی شەرع لەبارەیەوە، و ئەگەر تەکلیفتان لێ بکرێت لەسەری ناتوانن پێی هەستن، وە ئەگەر پرسیاری لەبارەی بکەن لەکاتی دابەزینی قورئاندا لە ژیانی پەیامبەردا صلى الله علیه وسلم بۆتان ڕوون وئاشکرا دەکرێتەوە، و ڕەنگە داواکاری ئەوەتان لێبکرێت و ئێوەش توانای ئەنجامدانیتان نەبێت، باس نەکردنی خوای پەروەردگار ڕەحمەتێکە بەرامبەر بەبەندەکانی . خوای گەورەش لێخۆشبووی تاوانی بەندەکانێتی کاتێك تۆبەدەکەن، و لەسەرخۆیە بەرامبەریان بۆیە سزایان نادات ئەگەر بگەڕێنەوە بۆلای . هاوشێوەی ئەو پرسیارانە خەڵکانێکی پێش ئێوە کردیان لەپەیامبەرانیان، بەڵام کاتێك فەرمانیان پێکرا نکۆڵیان لێکرد وجێبەجێیان نەکرد، جا ووریابن لەوەی وەکو ئەوان بن ..!!

هەروەك لەفەرموودەیەکی پیغەمبەری خوا ﷺ دا هاتووە کە لە مسندی ئیمامی احمد و سنن نسائی و ابن ماجە دا هاتووە دەفەرموویت :( وازم لیَ بهێنن لە پرسیار کردن لەوە دا کە بۆم جیهێشتوون ، بەراستی ئەوانەی کە پێش ئێوە لە ناو چوون ، بەهۆی پرسیار کردنی زۆر جیاوازیان لە سەر پێغەمبەرانیان بوو ، ئەگەر فەرمانم پیَ کردن بە شتێك ، ئەوا وەری بگرن فەرمانەکە جیَ بەجیَ بکەن ئەوەندەی کە دەتوانن ، وە ئەگەر قەدەغەی شتێکم لیَ کردن وازی لیَ بهێنن و ترکی بکەن )..!!

بەلیَ ئەم ئایەتانەی باس لەم چیرۆکە دەکەن ، بۆ نەوەی جوولە کەیە یان نەوەی ئیسرائیلە کە (خوای گەورە ) چەندین نازو نیعمەتی پیَ بەخشین و بەلام ئەوان هەر لووت بەرزو لە سنوور لایان دەدا لەسەر کوفر و خراپە کاری خۆیان بەردەوام بوون ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) زۆر سزاو ئازاری بۆ رەوانە دەکردن ، بەلام هەر بەم سزاو ناخۆشیانەی ئەو موعجیزانەی کە بە سەریان دا دەهات هیچ پەندو عیبرە تیان لیَ وەر نەدەگرت ، بەلیَ نەوەی ئیسرائیل بە چاکە و خراپە تاقی کراونەتەوە ، چونکە دەبێت چۆن قومێك بن دوای ئەم هەموو شوێنەوارەی کە بە هۆی خراپە کانیانەوە سزاو ئازار دەدران بەلام هیچ کات تۆبە یان نەدەکرد نەدەگەرانەوە ، بەلام (خوای گەورە ) بە موعجیزەکانی تاقی دەکردنەوە نازو نیعمەتی خۆی زۆر پیَ بەخشین ، بەلام ئەوانە قەومێکی ئەوەندە لاسارو خراپە کار بوون بە سزاو نیعمەت کان پەندو ئامۆژگاری عیبرەتیان وەر نەدەگرت هەر دەچوونەوە سەرخراپەکاری لادان لە سنوور دەرچوون کفرو خراپە کاری ، هۆی ئەم چیرۆکە ش ئەمە بوو کە پی دەوترێت چیرۆکی مانگا کە یان چێلە کە ئەوە بوو کە لە ناو نەوەی ئیسرائیل تاوانی کوشتنێك روویدا لە سەردەمی پێغەمبەر (موسا) علیە السلام ، ئالەم کاتەدا نەدەزانرا بکوژی ئەوکەسە کیَ بووە ..؟!! هەر یەکەو پارێزگاری لە خۆ دەکرد لەم مەسەلە یەدا ، وە خۆی تیَ دا بیَ بەری بیَ تاوان نیشان دەدا ، وە هەندێکیان هەندێکی تریان تاوان بار دەکرد ، ئەو بوو هەوالەکە گەیەندرایە لای (موسا ) علیە السلام ، تاوە کو بریار حوکم یان داد گەری لە نێوانیان دا بکات ، بەلام (خوای گەورە ) ویستی بکوژەکە دەربخات و ئاشکرای بکات بۆیان ، ئەویش بە هۆی نیشانەیەکی یان موعجیزە یەکی ماددی هەست پێکراو بۆیان ، هەروەك (خوای گەورە ) نیگا یان وەحی رەوانەکرد بۆ (موسا) علیە السلام ) ئەوە بوو کە فەرمانی پیَ کرد بە سەر برینی چێلێك یان مانگایەك ، بەلام هیچ مەرجی بۆ (موسا ) دانەنا ئاخۆ چ چێلێك یان مانگایەك بێت وە هیچ سیفەتێکی دیاری نەکرد کە لەم چێلە دا هەبێت ..!! واتە: ئەگەر هەر چێل یان مانگا یەك بیهێنن و سەری ببرن ئەوا تەواو فەرمانەکە ی (خوای گەورە ) و (موسا ) علیە السلام ، یان جیَ بەجیَ کردووە ، بەلام ئەگەر تێبینی جوولە کە بکەین یان نەوەی ئیسرائیل بکەن دە بینین بە درێژایی مێژوو و سەردەمەکان ئەوانەشی هاوشێوەی جوولەکەن لە مونافیقە کاندا سروشتیان وایە بەردەوام سستی دەنێونن لە کارە کانیان خیانەت لە کارە کانیان دەکەن ، بەردەوام بە بۆلە بۆل و دەمەدەم موناقشە دەکەن لە جیَ بەجیَ کردنی کارە کانیاندا وە فەرمانەکە رەت دەکەنەوە ،بە هۆی ئەوەی کە ناخ و دەروونیان زۆر پیسە و پرە لە خراپە کاری دا ، چونکە یهود یان جوولە کە هەمیشە کاور پیشە ی هەر وابووە ، هیچ کات بەلێنی خۆیان تا سەر نابەن هەر خەریکی خیانە ت ناپاکی پیلان گێری بوون لە هەموو سەردەمێك دا ، ئیستاش لەم سەردەم دا زۆر بەی بەناو موسلمانە کان کە سیفاتی جوولە کەیان وەرگرتووە لە وەلاتانی ئیسلامی دا هەمان رفتارو رەوشتی جوولە کەیان هەیە حوکم و بریارەکانیان هاوشێوەی جوولە کەیە بەناو ئیسلامن بەلکو لە روویەکی تریان ئەوەی کە نیفاق دوو روویان تێدا بەدی دەکرێت ، هەر بۆیە لەم سەردەم دا ئەوەند خراپەکاری

دەکرێت گەندەڵی فسادی زیاتر بووە ، هەر هیچان بۆ ناکرێ پر دەدنە ئاینی ئیسلام بە هۆی پرسیار کردنی زۆریان بە تانەو تەشنە لە ئیسلام دەدن وەك سەگ بە ئیسلام دا دەرشێنەوە ئەوە هۆکارە بۆ ئەوەی ئیلحادو مولحید لە وەلاتانی ئیسلام دا هەبێت ...!!!

بەڵێ ئەوە بوو کە جوولە کە کان پرسیاریان لە (موسا)علیە السلام ، کرد ..؟!! کە تەمەنی چێلە کە یان مانگا کە چەند بێت ..؟! (موسا) علیە السلام ، فەرمووی: نەبچووك بێت نە گەورە بێت ، بەلکو لە تەمەندا مام ناوەند بێت ..!! لە پاشاندا پرسیاریان لێ کرد دەبارەی رەنگە کەی واتە : رەنگە کەی چۆن بێت ..؟! (موسا) علیە السلام ، فەرمووی : چێلێکی یان مانگایەکی رەنگ زرد و تۆخ بێت ، وە تەماشاکەران دڵ خۆش بکات ..!! لە پاشاندا پرسیاریان لە (موسا ) علیە السلام ، کرد چەند کاری کردبێت..؟! (موسا) علیە السلام ، فەرمووی : چێلێك یان مانگایەك بێت لە لای خاوەنەکەی خۆشەویست بێت ..!! وە لە کێلگە و کیلان دا کاری نە کردبێت وە ئاودێری کوشتوکالیشی نە کردبێت ..!! لە کۆتایی دا سەریان سورماو خەریك بوو ئەو کارەش نەکەن لە پاشاندا (موسا) علیە السلام ، فەرمانی پێکردن ..؟! کە پارچەیەك لە لەشی چێلە یان مانگا سەر براوە کە بدەن لە لەشی کوژراوە کەیان ، ئەوانشی کارە کە یان ئەنجام دا ، (خوای گەورە)ش کوژراوەکەی زیندوو کردوە ، وە رووح و جستەی بۆ گەرایەوە هەوالی دا لەسەر بکوژە کەی خۆی دا ..!! ووتی فلان کەس بوو ..!! لە پاشاندا دوو بارە مردەوە ..!! کە بینیان لایان زۆر سەیر بوو ..!!

بەڵێ (خوای گەورە ) بۆ قومەکەی (موسا) علیە السلام ، لە سەر برینی ئەو چێلە یان ئەو مانگایە حیکمەتی درخست ، چونکە کەسێکیان لێ کوژار بوو ، دە یان ویست بکوژە کە بدۆزنەوە هەریەکەیان ئەوەی تری تاوان باردەکرد ، وە هیچ شایەتیە کیش لەوێدا نەبوو، (خوای گەورە ) ویستی کە حەق راستی و دادگەری دەرکەوێت ، لەسەر زمانی کوژراوە کە خۆی ، ئەوە بوو ئەم موعجیزەی بۆ نەوەی جوولە کە پێشاندا ، چونکە سەر برینی چێلە کە یان مانگا کە هۆکارێك بوو بۆ زیندوو بوونەوەی پیاوە کوژراوە کەی جوولە کە ، بەلام ئەگەر سەرنج بدەین بزانین چی لەم موعجیزە گەورە یە دا هەیە ، تەنها سەر برینی چێلە کە یان مانگا کە نیە ، بەلکو پەند و ئامۆژگارو موعجیزەیەکی هەر گەورە یە بۆ نەوەی ئیسرائیل ئەگەر پەند و عیبرەتی لێ وەرگرن ، چونکە (خوای گەورە ) توانان ودەسەلاتی خۆی پێشاندە دا بە جوولەکە کە هیچ شتێکی لێ ونابێت دادوەری هەموو دادوەرانە ، هەروەها مردوو زیندوو دەکاتەوە ،بێ گومان ئەوەش موعجیزەیەکی یەکجار گەورەیە بۆ بێ باوەران و مولحیدەکانی ئەم سەردەمە کە دەڵێن: ژیان نیە دوای ژیانی دونیادا لێ پرسینەوەش نیە یان ئەو کەسانەی کە گەندەل تاوان کارو فسادو دزو جەردو خراپە کارن ئازاری دەروونی وجستەیی خەلکی لاوازو بێ دەسەلات دەدان پێیان وایە کە مردن لێ پرسینەوە نیە لە سەر کارو کردەوەکانیاندا لە ژیانی دونیادا ، ئەوە تا نیشانەو موعجیزەی قورئانی پیرۆز پیاوێك کوژاو زیندوو کرایەوە لە ژیانی دونیادا پرسیاری لێکرا کە کێ کوشتوویەتی ..!!بەڵێ پارچەیەك لە کۆشتی چێل یان مانگە سەر براوە کە رووح ژیان دەخاتەوە بەر پیاوە کوژراوە کە ، بەلام تەنها پارچە کۆشتە کەی چێلە کە یان مانگاگە رووناخاتە بەر هیچ کەسێك تەنها هۆکارێکە بۆ هەولدان و دۆزینەوە بەلام ئەوەش لە راستی دا قودرەت و تواناو دەسەلاتی (خوای گەورە ) یە کە دەسەلات توانای خۆی نیشان دەدات بۆ نەوەی جوولەکە ، چونکە هیچ کە سێك لە نهێنی کارە کان ئەو شتانەی کە پاناهەو غیب کە دیارنیە لە دەسەلاتی (خوای گەورە ) خۆیەتی هەر بۆیە کە زۆر ئاسانە لە لای (خوای گەورە ) مردوو زیندوو بکاتەوە کە دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿كَذَٰلِكَ يُحۡيِ ٱللَّهُ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ [البَقَرَة : ٧٣] ...!!

## فەزل و گەورەیی سورەتی (البقرە ) لە چەند فەرموودیەکی پیغەمبەری خوا ﷺ

عن (ابى هريرة ) رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ : (( لاتجعلوا بيتكم مقابر إن الشيطان من البيت الذى تقرأ فيه سورة البقرة )) .[1] واتە: مالە کانتان نەکە بە گۆرستان یان مقابر ، چونکە کاتێك سورەتی (البقرە ) لە هەر ماڵێکدا بخوێنرێت ئەوا شەیتان نامێنی و پشتی پێ دەشکێت ..!!

عن (عبدالله بن مسعود ) رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ : (( أقرءوا سورة البقرة فى بيتكم ، فإن شيطان لايدخل تقرأ فيه سورة البقرة )) .[2] واتە: سورەتی (البقرە ) بخوێنن لە مالە کانتان ، چونکە شەیتان ناتوانێت بێتە نێومالە کانتان بە خوێندنی سورەتی (البقرە ) ..!!

عن (عبدالله بن مسعود ) رضي الله عنه قال : ((لقِيَ رجلٌ من أصحابِ النبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم رجلاً من الجنِّ فصارعَه فصرعه الإنسيُّ فقال له الجنِّي عاوِدْنى فعاودَه فصرعه الإنسيُّ فقال له الإنسيُّ إنى لأراك ضئيلاً شحيبًا كأن ذريعتَيك ذريعتَا كلبٍ فكذلك أنتم معاشرَ الجنِّ أو أنتَ منهم كذلك قال لا واللهِ إنى منهم لضليعٌ ولكن عاوِدْنى الثالثةَ فإن صرعتَنى علمتُك شيئًا ينفعُك فعاودَه فصرعه فقال هاتِ علِّمْنى قال هل تقرأُ آيةَ الكرسيِّ قال نعم قال إنك لن تقرأَها فى بيتٍ إلا خرج منه الشيطانُ له خبجٌ كخبجِ الحمارِ لا يدخلُه حتى يصبحَ)) .[3] واتە: پیاوێك لە هاوەڵانی ﷺ گەیشت بە پیاوێك لە جنۆکە وە لەگەڵی کەوتە زۆرانبازی یان مصارعە کردن واتە: زۆرانبازی مرۆڤ و جنۆکە ، ئەوە بوو مرۆڤە کە جنۆکە کەی دا بەزەویدا ،جا مرۆڤە کە پێ ووت : من دەبینم باریك لاوازو بێ هێزی باسکە کانت دەڵێ باسیکی سە گن رەق باریکن ، وە پیاوە کە پرسیاری لە جنۆکە کە کرد ئایا کۆمەلە جنۆکە کان هەر هەموویان وان ..؟! جنۆکە کەش ووتی نەخێر . سوێند بەخوا من لە ناویاندا زۆر گەورە زەبەلاحم ، بەڵام دوو بارە زۆرانبازیم لەگەل دا بکە ، جا ئەگەر تۆ منت دووبارە داوە بەزەویدا ئەوا شتێکت فێر دەکەم سوودت پێ دەگەیەنێت ..!! جا دوو بارە کردیەوە بە زەویدا و ، پیاوە کە واتە مرۆڤە کە ووتی : دەی جنۆکە کە شتکەم فێربکە ..؟! چونکە تۆ بەلێنت بە من داوە ..؟! جنۆکە کە ووتی : تۆ ئەم ئایەتە دەخوێنی واتە : ئایەتی الکرسی قال تعالى: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ﴾ [البَقَرَة : ٢٥٥] پیاوە کە ووتی : بەلێ جنۆکە کە ووتی : لە هەرماڵێکدا بخوێنریت بێ گومان شەیتان لێ دەچێتە دەرەوە ، بای لێ دەردەچێت وەك هی گوێدرێژ، دواتر هەتاکو بەیانی ناچێتە نێو مالە کە دا ..!!

---

[1] صحيح مسلم برقم (٧٨٠)
[2] - اخرجة الحام برقم (٢٠٦٣) والطبراني برقم (٨٦٤٣) حديث حسن .
[3]

عن (أبى سعيد الخدرى ) ﵁ : أنَّ اُسَيْدَ بنَ حُضَيْرٍ بيْنَما هو لَيْلَةً يَقْرَأُ فى مِرْبَدِهِ، إذْ جَالَتْ فَرَسُهُ، فَقَرَأَ، ثُمَّ جَالَتْ اُخْرَى، فَقَرَأَ، ثُمَّ جَالَتْ أَيْضًا، قالَ اُسَيْدُ: فَخَشِيتُ أَنْ تَطَأَ يَحْيَى، فَقُمْتُ إلَيْهَا، فَإِذَا مِثْلُ الظُّلَّةِ فَوْقَ رَأْسِى فِيهَا أَمْثَالُ السُّرُجِ، عَرَجَتْ فى الجَوِّ حتَّى ما أَرَاهَا، قالَ: فَغَدَوْتُ علَى رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، فَقُلتُ: يا رَسولَ اللهِ، بيْنَما أَنَا البَارِحَةَ مِن جَوْفِ اللَّيْلِ أَقْرَأُ فى مِرْبَدِى، إذْ جَالَتْ فَرَسِى، فَقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: اقْرَأِ ابْنَ حُضَيْرٍ قالَ: فَقَرَأْتُ، ثُمَّ جَالَتْ أَيْضًا، فَقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: اقْرَأِ ابْنَ حُضَيْرٍ قالَ: فَقَرَأْتُ، ثُمَّ جَالَتْ أَيْضًا، فَقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: اقْرَأِ ابْنَ حُضَيْرٍ قالَ: فَانْصَرَفْتُ، وَكانَ يَحْيَى قَرِيبًا منها، خَشِيتُ أَنْ تَطَأَهُ، فَرَأَيْتُ مِثْلَ الظُّلَّةِ فِيهَا أَمْثَالُ السُّرُجِ، عَرَجَتْ فى الجَوِّ حتَّى ما أَرَاهَا، فَقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: تِلكَ المَلَائِكَةُ كَانَتْ تَسْتَمِعُ لَكَ، ولو قَرَأْتَ لَأَصْبَحَتْ يَرَاهَا النَّاسُ ما تَسْتَتِرُ منهمْ )).[1] واته:

(اسیدی کوری حفر ) — خوا لیٚ رازی بێت - شەوێك لە باخەکەیدا خەریکی قورئان خوێندنەوە بوو ، ئەسپەکەی کەوتە سم کولان ، دووبارە دەستی کردەوە بە قورئان خوێندن ، دیسان ئەسپەکە کەوتەوە بە سم کولان ، (أسید ) دەلێت : ترسام لەوەی کە (یحیی ) بشێلێت منیش هەستام بەلایەوە ،کاتێك دەماشا دەکە یان دەبینم شتێك وەکو پەلە هەورێك بەسەرمەوەیە ، شتێکی لە ناو دایە وەکو چرا داگیرساوە یان وەکو چرا خان ، هیواش هیواش هەلکشا بەرەو ئاسماندا هەتاکو لە بەر چاوم دا وون بوو ، بەیانی زوو چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم باسەم بۆ گێرایەوە و پێم ووت : لە کاتێکدا من لە نیوە شەودا لە باخەکەمدا قورئانم دەخوێند ئەسپەکەم کەوتە سم کولان ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بخوێنە ئەی (کوری حفیر ) ئەویش دەلیٚ: دەستم کردوە بە قورئان خوێندنەوە ، هەم دووبارە ئەسپەکەم کەوتەوە سەم کولان ،پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بخوێنە ئەی (کوری حفیر ) دەلیٚ : خوێنمەوە هەم دووبارە ئەسپەکەم کەوتە سم کولان ،پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بخوێنە ئەی (کوری حفیر ) ، دەلیٚ : میش دەستم هەلگرت ، (یحیی ) لەویدا نزیك بوو ترسام بشێلێت واتە: پانی بکاتەوە ، شتێکم بینی وەکو پەلە هەور شتێکی وە کو چرا یان چرا خانی تێدا بوو ، بە ئاسماندا هەلکیشا هە تاکو لەبەر چاوم وون بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :ئەوە فریشتەکان بوون گوێیان لیٚ گرتبوویت ، ئەگەر بەدەوام بوویتایە خەلکی ئەو فریشتانەیان ئەبینی بۆ بەیانی ونەدەشادرانەوە ..!!

عن (عائشة ) –رضى الله عنها-: أن النبى ﷺ قال : ((من أخذ السبع الاول فهو حبر )) .[2]

واتە: هەر کەسێك پەیوەست بێت یان هەلگری حەوت سورەتی یە کەم بێت ئەوا دەبێتە زانا وەك: سورەتی (البقرە ، ال عمران ) .

---

[1] - صحيح مسلم برقم (٧٩٦).
[2] - اخرجه احمد برقم (٢٤٤٣).

📖 عن (بريدة بن الحصيب ) ﷺ قال :كنت جالسا عند النبى ﷺ فسمعته يقول : (( تعلموا سورة البقرة ، فإن أخذها بركة ، وتركها حسرة ، ولا يستطيعها البطلة ، ثم سكت ساعة ، ثم قال : تعلموا سورة البقرة ،وال عمران ، فإنهما الزهراوان ، وإنهما تظلان صاحبهما يوم القيامة كأنهما غمامتان أو غيايتان ، أو فرقان من طير صواف . وإن القرآن يلقى صاحبه يوم القيامة حين ينشق عنه القبر كالرجل الشاحب فيقول له : هل تعرفنى ..؟ فيقول : ما أعرفك ، فيقول : أنا صاحبك القرآن الذى أظمأتك فى الهواجر ، وأسهرت ليلك ، وإن كل تاجر من وراء تجارته ، وإنك اليوم من وراء كل تجارة فيعطى الملك بيمينه ،والخلد بشماله ، ويوضع على رأسه تاج الوقار ، ويكسى والداه حلتين لايقوم لهما الدنيا ، فيقولان : بم كسينا هذا ..؟ فيقال لهما : بأخذ ولدكما القرآن ، ثم يقال له : اقرأ واصعدفى درج الجنة وغرفها ، فهو فى صعود ما دام يقرأ هذا كان أو ترتيلا )).[١]

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : خۆتان فێری سورەتی (البقرە ) بکەن ، چونکە دەست پێوە گرتن و فێر بوونی برکە تە ، واز هێنانی لە سورەتی (البقرە ) حسرەت و دڵشکاوەو پەشیمانیە ، وە جادوو گەورە فالچی و ساحیرە کان توانایان بە سەر دانیە ، جا دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ ماوە یەك بێ دەنگ بوو ، دواتر فەرمووی : خۆتان فێری سورەتی (البقرە ) و وە سورەتی (ال عمران ) بکەن ، چونکە ئەم دووانە رووناکیە کەیان درەشاوەیە وەکو مانگ ، وە هەر دووکیان سێبەر لە خاوە نەکانیان دەکەن لە رۆژی قیامەتدا وەك دوو پارچە هەور یان دوو چەتر یان خێوت ، یان دوو پۆلە باڵندەی باڵ کراوە وان کە سێبەریان دێت بەسەر خاوەنەکانیان دا ، وە قورئان وە پیاوێکی رەنگ پەریو دەگات بە خاوەنەکەی لە رۆژی قیامەتدا ، کاتێ گۆڕەکەی یان قبرە کەی لە سەر شق دەبێت یان والادەبێت و پێی دەڵێت : ئای دەمناسی ..؟ خاوەنەکەشی دەڵێت : ناتناسم ، وە پیاوە رەنگ پەریوەکە دە لێت : من هاڕێکەتم ، ئەو قورئانەم کە تینووم دەکردی لەکاتی گەرما و ، شەوخونیم پێدەکردی بە شەوەکانت ، جا هەموو بازرگانێك بەدوای بازرگانیە کەیەوەیە ، تۆ ئەمرۆ دەدریچتە دەستی چەپی و ، تجای رێزیشی دەخرێتە سەر و ، دایك و باوکیشی پۆشتە دەکرێن بە دوو تاخمە جل کە بە دونیا نانرخینرێت یان قیمەت ناکرێت ،وە یان بە دونیا دا بەراورد ناکرێن ، وە دایك و باوکیشی دەڵێن : بەهۆی چ شتێك پۆشتە کراوین ..؟!! پێیان دەوترێت : بەدەست گرتنی منداڵە کنتانەوە بە قورئانی پیرۆزدا ، دواتر بە خاونی قورئان خۆێنکە ئەوەی دەستی بە قورئانەوە گرتووە دە وترێت : بخوێنە و بەرزبەرەوە بە پلە کانی بەهەشت و کۆشکەکانی دا ، جا هەر لە بەرز بوونەوەدایە مادەم قورئانە کە بخوێنیت بە خێرایی بێت یان بە هێواشی بێت ..!!

[١] -سنن الدارمي برقم ٣٤٤٣) أو (٣٢٥٧) في فضائل القران .

📖 عن (البعاس بن عبدالمطلب ) ﷺ قال : ((شَهِدْتُ مع رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ يَومَ حُنَيْنٍ، فَلَزِمْتُ أَنَا وَأَبُو سُفْيَانَ بنُ الحَارِثِ بنِ عبدِ المُطَّلِبِ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ فَلَمْ نُفَارِقْهُ، وَرَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ علَى بَغْلَةٍ له بَيْضَاءَ أَهْدَاهَا له فَرْوَةُ بنُ نُفَاثَةَ الجُذَامِيُّ، فَلَمَّا التَقَى المُسْلِمُونَ وَالْكُفَّارُ وَلَّى المُسْلِمُونَ مُدْبِرِينَ، فَطَفِقَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ يَرْكُضُ بَغْلَتَهُ قِبَلَ الكُفَّارِ، قالَ عَبَّاسٌ: وَأَنَا آخِذٌ بلِجَامِ بَغْلَةِ رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ أَكُفُّهَا إرَادَةَ أَنْ لا تُسْرِعَ، وَأَبُو سُفْيَانَ آخِذٌ برِكَابِ رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، فَقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: أَيْ عَبَّاسُ، نَادِ أَصْحَابَ السَّمُرَةِ، فَقالَ عَبَّاسٌ -وَكانَ رَجُلاً صَيِّتًا-: فَقُلتُ بأَعْلَى صَوْتِي: أَيْنَ أَصْحَابُ السَّمُرَةِ؟ قالَ: فَوَاللَّهِ لَكَأنَّ عَطْفَتَهُمْ حِينَ سَمِعُوا صَوْتِي عَطْفَةُ البَقَرِ علَى أَوْلَادِهَا، فَقالوا: يا لَبَّيْكَ، يا لَبَّيْكَ، قالَ: فَاقْتَتَلُوا وَالْكُفَّارَ، وَالدَّعْوَةُ في الأنْصَارِ يقولونَ: يا مَعْشَرَ الأنْصَارِ، يا مَعْشَرَ الأنْصَارِ، قالَ: ثُمَّ قُصِرَتِ الدَّعْوَةُ علَى بَنِي الحَارِثِ بنِ الخَزْرَجِ، فَقالوا: يا بَنِي الحَارِثِ بنِ الخَزْرَجِ، يا بَنِي الحَارِثِ بنِ الخَزْرَجِ، فَنَظَرَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ وَهو علَى بَغْلَتِهِ كَالْمُتَطَاوِلِ عَلَيْهَا إلى قِتَالِهِمْ، فَقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: هذا حِينَ حَمِيَ الوَطِيسُ. قالَ: ثُمَّ أَخَذَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ حَصَيَاتٍ فَرَمَى بهِنَّ وُجُوهَ الكُفَّارِ، ثُمَّ قالَ: انْهَزَمُوا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ. قالَ: فَذَهَبْتُ أَنْظُرُ، فَإِذَا القِتَالُ علَى هَيْئَتِهِ فِيما أَرَى، قالَ: فَوَاللَّهِ ما هو إلَّا أَنْ رَمَاهُمْ بحَصَيَاتِهِ، فَما زِلْتُ أَرَى حَدَّهُمْ كَلِيلاً، وَأَمْرَهُمْ مُدْبِرًا. وفي رواية: بهذا الإسْنَادِ نَحْوَهُ. غيرَ أنَّهُ قالَ: فَرْوَةُ بنُ نُعَامَةَ الجُذَامِيُّ، وَقالَ: انْهَزَمُوا وَرَبِّ الكَعْبَةِ، انْهَزَمُوا وَرَبِّ الكَعْبَةِ، وَزَادَ في الحَديثِ: حتَّى هَزَمَهُمُ اللَّهُ. قالَ: وَكَأَنِّي أَنْظُرُ إلى النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ يَرْكُضُ خَلْفَهُمْ علَى بَغْلَتِهِ )) .[١]

واتە: (عباس کوری عبدالمتلب ) —خوا لێ رازی بێت — دە لێت : من لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دا بووم لە جەنگی (حنین) دا ، من (ابو سفیانی کوری حارسی کور عبدالمتلب ) هاورێ و هاوەلی پێغەمبەری خوا ﷺ بووین ، وە لەوێدا لێ جیا نەبووینەوە پێغەبەری خوا ﷺ سواری ئەسپە سپیەکەی بوو ، کە (فروەتی کوری نفاسەی جزامی ) پێدا بوو ، هەر کە موسلمانەکان و کافرو بێ باوەرەکان بە یەك گەیشتن کردیان بەجەنگ کردن لە گەل یەکتری دا ، موسلمانەکان پشتیان هەلکردو هەلاتن ، ئا لەم جەنگە دا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەسپکەی تاوداوە روو بە کافرەکان (عباس) ووتی : منیش جلەوە ئەسپەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ گرتبوو ،هەر هێواشم دەکردەوە نەم دەویست پەلە بکات ، (ابو سفیان) نیش ئاوزنگی ئەسپەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ گرتبوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئادەی (عباس ) هاوەلانی (سمرە ) بانگ بکە ، (عباس ) کە پیاوێکی دەنگ بەرز بوو ،دەلێت : بە هەموو دەنگمەوە هاوارم کرد ، کوا هاوەلانی (سمرە ) دەلێت : سوێند بەخوا هەرکە دەنگە کەم بیست یەکسەر گەرانەوە یان بیان دایەوە ،هەروەك چۆن چێل بادەداتەوە بەلای بێچووەکەی دا ، زۆر بە پەل ووتیان : گوێرایەل تین گوێرایەل تین ، موسلمانان و کافرە کان کەوتنە جەنگ کردن ، بانگەواز کەران یارمەتیدەران دەیان ووت : ئەی کۆمەلی یارمەتی دەران ،ئەی کۆمەلی یارمەتی دەران ، پاشان بانگەوازەکە چربوویەوە ، لەسەر ئەوەی (حارس کوری خزرج ) ووتیان : ئەی نەوەی (حارس کوری خزرج ) ئەی نەوەی (حارس کوری خزرج ) پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر ئیسترە کەیەوە بوو ، وەکو هەنگاو بنێ بۆ کوشتار کردنیان ، ئینجا پێغەمبەری خوا ئەمە ئەوکاتەیە کە ئاگری جەنگ گلپەی سەند ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ووردە بەردیچکی هەلگرت بەرەو رووی کافرانی خستی ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سوێند بە پەروەردگار محمد ئەوان شکان (عباس) ووتی: رۆیشتم سەیر بکە م جەنگ کە هەر وەکو خۆی مایە ، سوێند بەخوا هەر ئەوەندە تا پێغەمبەری خوا ﷺ ووردە بەردەکانی تێ گرتن ، ئیتر بەردەوام دەمبینی کە هێزیان نەما بەردەوام بەروە تێکشکان دەچن و بارودۆخیان وەك جاران نەماو شەکەستیان هێنا لە جەنگە کەدا ..!!

[١] - صحيح مسلم برقم (١٧٧٥).

عن (أبی هریرة) رضي الله عنه قال : ((بعثَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ بعثًا ، وَهُم ذو عدَدٍ فاستَقرأَهُم ، فاستقرأَ كلَّ رجلٍ منهم ما معَهُ منَ القرآنِ ، فأتى على رجلٍ مِنهُم مِن أحدثِهِم سنًّا ، فقالَ : ما معَكَ يا فُلانُ ؟ قالَ : معی كذا وَكَذا وسورَةُ البقرةِ قالَ : أمعَكَ سورَةُ البقرةِ ؟ فقالَ : نعَم ، قالَ : فاذهَب فأنتَ أميرُهُم ، فقالَ رجلٌ من أشرافِهِم : واللَّهِ يا رسولَ اللَّهِ ما مَنعَنی أن أتعلَّمَ سورةَ البقرةِ إلَّا خشيةَ ألَّا أقومَ بِها ، فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ : تَعلَّموا القُرآنَ واقرءوهُ فإنَّ مَثلَ القرآنِ لمن تعلَّمَهُ فقرأَهُ وقامَ بِهِ كمثَلِ جرابٍ مَحشوٍّ مسكًا يفوحُ ريحِهِ فی كلِّ مَكانٍ ومثلُ من تعلَّمَهُ فيرقدُ وَهوَ فی جوفِهِ كمثلِ جرابٍ وكِئَ على مسكٍ)). [1] واتە: لە (ابی هریره ) – خوا لی رازی بیت – دە گیریتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی سوپایەك كۆمەلی موسلمانا رەوانە بكات ، داوای لیّ كردن قورئانی پیرۆز بخوێنن ، یەك بە یەك قورئانیان خوێند ، هە تكو هاتە لای گەنجێك كە لە هەموویان مندال ترو گەنج و بچووك تر بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی چەند قورئانت لە بەرە ..؟! ووتی : ئەوەندە سورەتم لەبەرە ، لەگەل سورەتی (البقرە ) ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سورەتی (البقرە) لەبەرە ..؟! ووتی : بەلیّ . پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : دەی برۆ تۆ سەر كردەیان بە یان ئەمیری ئەم كۆمەلە موسلمانە یان سەرۆكی ئەم سوپایە بە ، وە یەكی لە ئەشرەفە كانیان ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بە (اللە) ئەوەی رێگری لەمن كرد كە لەبەرم نە كردووە ترسی ئەوەم هەبوو هەلنەسم بۆ شەو نوێژ كردن سورەتی (البقرە ) نە خوێنم ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : قورئان فێربە بەرەوانی بیخوێنن و كاری پیّ بكات وەك كیسەیە یان توورە كەیە وایە پربیّ لە میسك و بۆنی بگاتە هەموو شوێنی و بلاوبێتەوە ، واتە : سنگی قورئان خوێن تورەكە وایە، قورئانەكەش تێدا وەكو مسكە ، هەرەوها نموونەی ئەو كەسەی كە فێری ببیّ ولیّ تێبگاو شەونوێژ نەكات و قورئانەكە لە سینگی دا بیّ ، وەك تورەكە یە وایە پربیّ لە میسك دەمی بەسترابیّ ..!!

عن (أبو مسعود الانصاری ) رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ : ((أنَّهُ مَن قَرَأَ بالآيَتَيْنِ مِن آخِرِ سُورَةِ البَقَرَةِ فی لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ)) .[2] واتە: لە (ابو مسعود ئەنصاری ) – خوا لی رازی بێت – دەگێریتەوە دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەمووی : هەر كەسێك لە شەودا دووئایەتی كۆتایی سورەتی (البقرە ) بخوێنیّ ئەوا ئەو شەوە ئەوندە خێرو پاداشتی بەسە ،یان هێندەی شەو نوێژ پاداشتی بۆ دە نووسرێت ..!!

عن (النعمان بن بشير ) رضي الله عنه عن النبی ﷺ قال : ((إنَّ اللهَ كَتَبَ كِتابًا قبلَ أنْ يَخلُقَ السَّمواتِ والأرضَ بألْفَی عامٍ، فأنزَلَ منه آيتَينِ، فختَمَ بهما سورةَ البَقرةِ، ولا يُقرَآنِ فی دارٍ ثلاثَ ليالٍ فيَقرَبَها الشَّيطانُ). [3]

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوای گەورە ) هەزار سالّ پێش ئەوەی كە ئاسمانە كان و زەوی دروست بكات پەراوێكی نووسیوە ،دوو ئایەتی دابەزاندووە سورەتی (البقرە ) كردۆتە كۆتایی ، لە هەر مالێكدا بیخوێنرێت هەتا سیّ شەو شەیتان نزیكی ناكەوێتەوە ..!!

---

[1] -سنن الترمذي برقم (٢٨٧٦).
[2] -صحيح البخاري برقم (٥٠٤٠) .
[3] -سنن الترمذي برقم (٢٨٨٢).

عن (سهل بن سعد الساعدی) رضي الله عنه قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : ((إنَّ لكلِّ شىءٍ سَنَامًا ، وإنَّ سَنَامَ القرآنِ ، سورةُ البقرةِ ، مَن قرأها فى بيتِه ليلاً لم يَدْخُلْهُ الشيطانُ ثلاثَ ليالٍ ، ومَن قرأها فى بيتِه نهارًا لم يَدْخُلْهُ الشيطانُ ثلاثةَ أيامٍ)) .[1]

واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : هەموو شتێك لووتكەی بەرزی خۆی هەیە ، لووتكەی بەرزی قورئان سورەتی (البقرە ) یە ، هەر كەسێك لە شەودا سورەتی (البقرە) بخوێنێت ئەوا سێ شەوان شەیتان ناچێتە ئەو ناو مالە كەی دا ، وە هەر كەسێك لە رۆژدا سورەتی (البقرە ) بخوێنێت ئەوا سێ رۆژ شەیتان ناچێتە ناو مالەكەی دا..!!

عن (ابی هريره ) رضي الله عنه قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : ((لِكلِّ شىءٍ سَنامٌ وإنَّ سَنامَ القرآنِ سورةُ البقرةِ وفيها آيةٌ هىَ سيِّدةُ آيِ القرآنِ.. آيةُ الكرسيِّ)) .[2]

واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی : هەموو شتێك لووتكەی خۆی هەیە ، لووتكەی قورئان سورەتی (البقرە ) یە وە لە سورەتی (البقرە ) ئایەتی الكرسی یە گەورەیی هەموو ئایەتەكانی قورئانە ئایەتی الكرسی ..!!

عن (معقل بن يسار ) رضي الله عنه : -أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال : ((البَقرةُ سَنامُ القُرآنِ وذُرْوتُه، نَزَلَ مع كلِّ آيةٍ منها ثَمانونَ مَلَكًا، واستُخرِجَتْ {اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ} [البقرة: ٢٥٥]، مِن تحت العَرشِ، فوُصِلَتْ بها -أو: فوُصِلَتْ بسورةِ البَقرةِ-، و{يس} قَلبُ القُرآنِ؛ لا يَقرَؤها رَجُلٌ يُريدُ اللهَ والدَّارَ الآخِرةَ إلاَّ غُفِرَ له، واقرَؤوها على مَوتاكم)).[3]

واتە: لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی : (البقرە ) بەرزی قورئانە و لووتكەی قورئانە ، لە گەل هەر ئایە تێكدا هەشتا فریشتە دێنە خوارەوە ، وە ئەم ئایەتە یان لە ژێر عەرش دا دەرهێنا {اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ} واتە ئایەت الكرسی گەیشتن پی ، یان گەیشتن بە سورەتی (البقرە ) و سورەتی (یس) كە دلّ ی قورئانە ، هەر كەسێك بیان خوێنێتەوە مەبەستی پێ رەزامەندی (خوای گەورە ) بێت و مەبەستی پێ رۆژی دوایی بێت ، ئیلا (خوای گەورە ) لێ خۆش دەبێت ، وە سورەتی (یس ) لە سەر مردوە كانتان بخوێنن ..!!

[1] -شيخ لالباني ضعيف الجامع برقم (١٩٣٣) .
[2] سنن الترمذي حديث ضعيف برقم (٢٨٧٨).
[3] -تخريج مسند شعيب الأرناؤوط برقم (٢٠٣٠٠) اسناده ضعيف .

عن (ابی أمامه الباهلی ) ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ : (( أقرءوا القرآن فإنه يأتى يوم القيامة شفيعا لأصحابه اقرءوا الزهراوين البقرة ال عمران فإنهما تأتيان يوم القيامة كأنهما غمامتان أو كأنهما غيايتان أو كأنهما فرقان من طير صواف تحاجان عن أصحابهما اقرءوا سورة البقرة فإن أخذ بركة وتركها حسرة ولا تستطيعها البطلة )) .[١] واتە: قورئان بخوێنن کە بەراستی لە رۆژی قیامەت دا دەبێتە تکاکارو شفاعەت بۆ خاوەنانی قورئان خۆێن ، ئەو دوو گولە یان ئەو دوو مانگە درەوشاویەی قورئان ، واتە: (البقره و ال عمران ) بخوێنن ، جا بەراستی رۆژی قیامەت ئەو دووانە دیچن وەك دوو پلە هەور یان وەك دوو سێبەر یان دوو کۆمەلە بالندە کە کە بالە کانیان کردۆتەو وەکو چەتر کە پشت گیری یارمەتی خاوەنانی قورئان خوێن دەدەن ، سورەتی (البقره ) بخوێنن کە بەراستی وەرگرتنی بەرەکەتە ، بەلام وازهێنانی و یان پشت گوێ خستنی ، دە بێتەو دلّ شکاوی یان پەشیمانی ، چونکە ساحیرە کان ناتوانن لە بەرانبەریدا بوەستن ، یان توانایان نابێت بەسەر ئەو کەسە ی کە سورەتی (البقره ) دەخوێنی دەبێتە تێك شکاندنی ساحیرە کان.

عن (النواس بن سمعان الکلابی) ﷺ قال : سمعت النبی ﷺ يقول : ((يُؤْتَى بالقُرْآنِ يَومَ القِيامَةِ وأَهْلِهِ الَّذِينَ كانُوا يَعْمَلُونَ به، تَقْدُمُهُ سُورَةُ البَقَرَةِ وآلُ عِمْرانَ، وضَرَبَ لهما رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ ثَلاثَةَ أمْثالٍ ما نَسِيتُهُنَّ بَعْدُ، قالَ: كَأنَّهُما غَمامَتانِ، أوْ ظُلَّتانِ سَوْداوانِ، بيْنَهُما شَرْقٌ، أوْ كَأنَّهُما حِزْقانِ مِن طَيْرٍ صَوافَّ، تُحاجَّانِ عن صاحِبِهِما)) .[٢]

واتە: قورئانی پیرۆز لە رۆژی دوایی دا یان لە رۆژی قیامەت دا دێت ئەوانەی هەلگری قورئان بوون یان قورئان خوێن بوون دەبێتە تکاکار بۆیان ، لە پێشد سورەتی (البقره ) و سورەتی (ال عمران ) ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ هەردووکیان کرد وە سێ نموونەی هێنایەوە هێشتان لە بیرنەچوون ، فەرمووی : وەك پارچە هەورە یان وەك سێبەری تاریك لە رۆژدا ، یان وەك کۆمەلێك لە خەلك یان وەك کۆمەلێك لە بالندە بالە کانیان کراوە بێت یان بالە کانیان وەك چەتر والا کردبێت بۆ خاوەنانی هەلگری قورئان..!!

عن (ابی هریره) ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ : (( اقرؤوا الزهراوين ، اقرؤوا البقرة و آل عمران ،فإنهما تأتيان يوم القيامة كأنهما غمامتان ، أو فرقان من طير صواف )).[٣]

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بخوێنن الزهراوین ، واتە: دوو داپۆشەرەکەی قورئان یان دوو کۆکەرەوەکەی قورئان ، واتە: بخوێنن سورەتی (البقره ) و (ال عمران ) چونکە دەبێتە پارچە هەورە بۆسەر سەری خاوەنەکەی لەرۆژی قیامەت دا ، یان دەبێتە کۆمەلە بالندە یەك لەرۆژی قیامەت دا بالە کانیان والا کردووە بۆسەر سەری خاوەنکەی واتە : ئەکەسانەی کە سورەتی (البقره) و (ال عمران ) دەخوێنن ..!!

[١] -صحيح مسلم برقم (٨٠٤).
[٢] -صحيح مسلم برقم (٨٠٥).
[٣] - اخرجه البزار – كشف الاستار (٢٣٠٣) الاسناده حسن .

عن (حذيفة بن اليمان ) ﵁ قال : ((صلَّيتُ معَ النَّبيّ ليلةٍ فافتتَحَ البقَرةَ ، فقُلتُ : يركَعُ عندَ المائةِ فمَضى ، فقلتُ : يركعُ عند المائتينِ فمضَى فقُلتُ : يصلِّي بِها في رَكْعةٍ فمَضَى ، فافتتحَ النِّساءَ فقرأَها ، ثمَّ افتتحَ آلَ عمرانَ فقَرأَها يقرأُ مُترسِّلاً ، إذا مرَّ بآيةٍ فيها تسبيحٌ سبَّحَ ، وإذا مرَّ بسؤالٍ سألَ ، وإذا مرَّ بتعوُّذٍ تعوَّذَ ، ثمَّ رَكَعَ فقال : سبحانَ ربِّيَ العظيمِ . فَكانَ رُكوعُهُ نحوًا مِن قِيامِهِ ، ثمَّ رفع رأسَهُ فقالَ : سمعَ اللَّهُ لمن حمدَهُ . فَكانَ قيامُهُ قريبًا من رُكوعِهِ ، ثمَّ سجدَ فجعلَ يقولُ : سُبحانَ ربِّيَ الأعلَى . فَكانَ سُجودُهُ قريبًا مِن ركوعِهِ)) .[1]

واتە: لە گەل پیغەمبەری خوا ﷺ نوێژم دەکرد دەستی پێکرد بە سورەتی (البقرە ) ووتم : لە سەد (١٠٠)ئایەت رکوع دەبات ، رکوعی نەبرد هەر بەردەوام بوو ، ووتم : لە دوو سەد (٢٠٠) ئایەت رکوع دەبات ، هەر بەردەوام بوو ، ووتم : تەواوی دەکات لە یەك رکعات دا هەر بەردەوام بوو ، ئینجا سورەتی (النسائی ) خوێندەوە ، پاشان سورەتی (ال عمران ) خوێند ، لە سەر خۆ دا دەی خوێند ، کاتێ بەسەر ئایەتێکدا تێ پەری بوویە تسبیحی تێدا بووایە (سبحان الله ) دەکرد ، کاتێکیش تێپەر بوایە بە سەر ئایەتێك کە دوعا پارانەوەی تێدا بوایە دەپارایەوە دوای دەکرد ، وە کاتێك تێپەر بوایە بەسەر ئایەتی پەنا گرتن ، پەنای دەگرت ، پاشان رکوعی برد ، فەرمووی : (سبحان ربی العظیم ) واتە: پاك بێگەر دی بۆ پەروەردگاری مەزن ، جا رکوعەکەی بە ئەندازەی وەستانەکەی بوو ، پاشان سەری بەرز کردەوە فەرمووی : (سمع الله لمن حمده )واتە: خوای گەورە ستایشی ئەوکەسە دەبیستی وەری دەگرێت ، کە ستایشی کردوە ، جا وەستا نزیك بوویەوە لە رکوعەکەی ن پاشان سووجدەی برد فەرمووی : (سبحان ربی الاعلی ) واتە: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری بەرزو بلند ، جا سووجدە کەی نزیك بوویەوە لە رکوعەکە ..!!

عن(عبدالله بن مسعود ) ﵁ قال : قال رسول الله ﷺ : ((ما خيَّبَ اللَّهُ تعالى عبدًا قامَ في جوفِ اللَّيلِ ، فافتتحَ سورةَ ( البقرَةِ ) و ( آلِ عمرانَ ) ونِعمَ كنزُ المرءِ ( البقرَةُ ) و ( آلُ عمرانَ ) )).[2] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوای گەورە ) هیچ کەسێك نائومێد ناکات ئەگەر لە نیوە شەودا سورەتی (البقرە ) و (ال عمران ) بکاتەوە بیان خوێنی ، بەلێ . گەنجینەی مرۆڤە یان پیاوە سورەتی (البقرە ) و ( ال عمران ) ..!!

[1] - سنن النسائي برقم (١٦٦٤).
[2] -شيخ الالباني في ضعيف الجامع برقم (٥٩٦٣).

عن(أبى أمامة الباهلى) ﵁ قال : قال رسول الله ﷺ : ((اسمُ اللهِ الأعظَمُ الذى إذا دُعِىَ به أجابَ فى ثَلاثِ سُورٍ: البَقرةِ، وآلِ عِمْرانَ، و(طه) )).[١] واتە: ناوی (خوای بەرزو بلندو گەورە و مەزنە ) ئەگەر دوای لێ بکەیت وەلامت دەداتەوە ، لە سێ سورەت دا وەکو : (البقرة ) و (ال عمران ) و (طه )..!!

عن (ابى بن كعب ) ﵁ قال : قال رسول الله ﷺ : ((يا أبا المُنْذِرِ، أتَدْرِى أىُّ آيَةٍ مِن كِتابِ اللهِ معكَ أعْظَمُ؟ قالَ: قُلتُ: اللَّهُ ورَسولُهُ أعْلَمُ. قالَ: يا أبا المُنْذِرِ أتَدْرِى أىُّ آيَةٍ مِن كِتابِ اللهِ معكَ أعْظَمُ؟ قالَ: قُلتُ: {اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ} [البقرة: ٢٥٥]. قالَ: فَضَرَبَ فى صَدْرِى، وقالَ: واللَّهِ لِيَهْنِكَ العِلْمُ أبا المُنْذِرِ)).[٢]

واتە: لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی باوکی مونزر ، ئایا دەزانیت ..؟! چ ئایەتێك لە کتابی خوای بالادەست لە هەموان گەورەو مەزنترە ..؟! دەڵێ ووتم : خواو پێغەمبەرەکەی زاناترە ..!!فەرمووی : ئەی باوکی مونزر ، ئایا دە زانیت..؟! چ ئایەتێك لە کتابی خوای بالادست گەورە و مەزنترە ..؟! دەڵێ ووتم : {اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ} [البقرة: ٢٥٥]. واتە: ئایەتی الكرسی ، دەڵێت : دەستی دا بە سینگما و فەرمووی : بە خوا پێکاوتە ،وە زانست و زانیاریت لێ پیرۆز بێت ئەی باوکی مونزر ..!!

عن (ابى امامة الباهلى ) ﵁ قال : قال رسول الله ﷺ : (( من قرأ آية الكرسى فى دبر كل الصلاة مكتوبة لم يمنعه من دخول الجنة إلا أن يموت )).[٣] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هەرکەسێك ئایەتی الكرسی بخوێنێت لە هەموو نویژە فەرزەکاندا بە چاکی ، ئەوا هیچ ریگری لە ناکرێت لە چوونە نێو بە هەشت دا تەنها ئەگەر بمرێت ..!!

[١] - شعيب الارناؤوط في تخريج زاد المعاد (١٨٨/٤) الاسناده حسن .
[٢] - صحيح مسلم برقم (٨١٠).
[٣] -اخرجه النسائي في الكبرى (٩٨٤٨).

📖 عن (ابی بن کعب ) ﷺ قال : (( أنَّه كان لهم جَرِينٌ فيه تمرٌ وكان ممَّا يَتَعاهدُ فيجِدُه ينقُصُ فحرسه ذاتَ ليلةٍ فإذا هو بدابَّةٍ كهيئةِ الغلامِ المُحتلِمِ قال فسلَّم فردَّ عليه السَّلامَ فقلتُ ما أنت جنٌّ أم إنسٌ قال جنٌّ فقلتُ ناوِلْني يدَك فإذا يدُ كلبٍ وشعرُ كلبٍ فقلتُ هذا خلقُ الجنِّ فقال لقد علِمتِ الجنُّ أنَّ ما فيهم من هو أشدُّ منِّي فقلتُ ما يحمِلُك على ما صنعتَ قال بلغني أنَّك تُحبُّ الصَّدقةَ فأحببْتُ أن اُصيبَ من طعامِك فقلتُ ما الَّذي يُحرِزُنا منكم قال هذه الآيةُ آيةُ الكرسيِّ قال فتركته وغدا أبي إلى رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم فأخبره فقال صدق الخبيثُ )) . [١]

واتە: ئیمە دوو جرە یان گۆزە خومامان هەبوو ، ئەوە بوو بەلێنم دا بوو بەلام کەمی کردبوو ، هەر بۆیە شەوێك پاسەوانیم دەکرد ، بینیم کە وەکو ئاژەلی لەسەر شێوەی گەنجێکی ریشدار ، سەلامی کرد ، میش سەلامە کەیم وەلام داوە ، ووتم : تۆ چی ..؟! یان تۆ جنۆکەی یان مرۆڤی ..؟! ووتی : نەخێر . من جنۆکەم ..!! منیش ووتم دەستم پیّ بدە ، کە دەستیم بینی وەك دەستی سەگ لاواز وباریك بوو ، وە دەستی سەگ بە موو داپۆ شرا بوو ، منیش ووتم : ئایا ئەمە جنۆکە هەمووی وا دروست کراون ، جنۆکە کەش ووتی : ئایا تۆ جنۆکەکان دەناسیت کە کەس لە نێوان جنۆکەکان دانیە لەمن بەهێزترو گەورە تربێت ، منیش ووتم : چی وای لیّ کردووی ئەم کارە ئەنجام بدەی ، ئەویش ووتی : من ئاگادار کرامەوە کە تۆ زۆر خێرو صدقە کە خۆش دەوێت هەر بۆیە منیش تۆم خۆش دەوێت ، ئەگەر بە خواردنی تۆ نەخۆش کەوتم ، هەر بۆیە منیش ووتم : ئایا چی ئێمە لە تۆ دە پارێزیت ..؟! ئەویش ووتی : ئایەت الکرسی ..!! ئەلیّ : منیش وازم لیّ هێنا بۆ بەیانی باوکم چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەوالەی بۆ گێرایەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووو: خراپە کار راست دەکات واتە : جنۆکە کە ..!!

📖 عن (عبدالله بن عباس ) ﷺ قال : بینما جبریل (علیة سلام) قاعد عند النبی ﷺ ،سمع نقیضا من فوقه ،فرفع رأسه فقال:

((بيْنَما جِبْرِيلُ قاعِدٌ عِنْدَ النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، سَمِعَ نَقِيضًا مِن فَوْقِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، فَقالَ: هذا بَابٌ مِنَ السَّمَاءِ فُتِحَ اليومَ لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إلَّا اليَومَ، فَنَزَلَ منه مَلَكٌ، فَقالَ: هذا مَلَكٌ نَزَلَ إلى الأرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إلَّا اليَومَ، فَسَلَّمَ، وقالَ: أَبْشِرْ بنُورَيْنِ اُوتِيتَهُما لَمْ يُؤْتَهُما نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فَاتِحَةُ الكِتَابِ، وَخَوَاتِيمُ سُورَةِ البَقَرَةِ، لَنْ تَقْرَأَ بحَرْفٍ منهما إلَّا اُعْطِيتَهُ)) . [٢]

واتە: کاتێك جبریل علیە السلام ، لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو ، گوێیی لە زنگێك یان جرەیەك بوو لە ژوور سەریەوە ، سەری بەرز کردەوە فەرمووی : ئەوا دەرگایەکی ئاسمان بۆ ئەمرۆ کرایەوە ، جگە لەم رۆژە دا هەر گیز نەکراوە تەوە ، فریشتە یەکی لێهاتە خوارەوە ، فەرمووی : ئەم فریشتە یەك دابەزیوتە سەر زەوەی هەر گیز دانە بەزیوە ئەم رۆ نەبێت ،سەلاوی کرد وو ووتی : مژدە بێت دوو رووناکیت بۆ خەلات کراوە یان دوو رووناکیت پیّ بەخشراوە ، بەهیچ پێغەمبەرێك پێش تۆ خەلات نەکراوە ، سورەتی فاتحە و وە کۆتایی سوەرتی (البقرە ) هەر پیتێك لە هەر کامیان دا بخوێنی هەر دا خوازیەکت هەبێت پێت دە بە خشێت ..!!

[١] -صحيح النسائي في الكبرى (٩٨٤٨) ،و ابن حبان برقم (٧٨٤).
[٢] -صحيح مسلم برقم (٨٠٦).

عن (حذيفة بن اليمان ) ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ : (( فضلت هذه الامة على سائر الامم بثلاث : جعلت لها الارض طهورا ومسجدا ، وجعلت صفوفها على صفوف الملائكة ، قال : كان النبى ﷺ يقول ذا : وأعطيت هذه الآيات مت آخر البقرة من كنز تحت العرش ، لم يعطها نبى قبلى )) .[1] واتە :پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : فەزلی ئومەتکە م هەیە لەسەر هەر سێ ئومەتەکانی تر ، وە زەویەکی پاك بێگەردم بۆ فەراهەم کراوە بۆ مەزگەوت خوا پەرستی کردنی ، وە ریزەکانمان واتە : ریزە کانی کۆمەلەی موسلمانان وەکو ریزەکانی فریشتە کان وان ، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئایەتێکە پێم بە خشراوە کە لەکۆتایی سورەتی (البقرە ) دایە کە گەنجینەیەکە لە ژێر عەرشەوە ، بە هیچ پێغەمبەرێك نە بەخشراوە یان نەدراوە ..!!

عن (ابى هريرة ) ﷺ قال : ((لَمَّا نَزَلَتْ علَى رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ {لِلَّهِ ما فى السَّماواتِ وما فى الأَرْضِ وإنْ تُبْدُوا ما فى أنْفُسِكُمْ أوْ تُخْفُوهُ يُحاسِبْكُمْ به اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشاءُ ويُعَذِّبُ مَن يَشاءُ واللَّهُ علَى كُلِّ شىءٍ قَدِيرٌ} [البقرة: ٢٨٤]، قالَ: فاشْتَدَّ ذلكَ علَى أصْحابِ رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، فأتَوْا رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ ثُمَّ بَرَكُوا علَى الرُّكَبِ، فقالوا: أىْ رَسولَ اللهِ، كُلِّفْنا مِنَ الأعْمالِ ما نُطِيقُ، الصَّلاةَ والصِّيامَ والْجِهادَ والصَّدَقَةَ، وقدْ اُنْزِلَتْ عَلَيْكَ هذِه الآيَةُ ولا نُطِيقُها، قالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: أتُرِيدُونَ أنْ تَقُولوا كما قالَ أهْلُ الكِتابَيْنِ مِن قَبْلِكُمْ سَمِعْنا وعَصَيْنا؟ بَلْ قُولوا: سَمِعْنا وأَطَعْنا غُفْرانَكَ رَبَّنا وإلَيْكَ المَصِيرُ، قالوا: سَمِعْنا وأَطَعْنا غُفْرانَكَ رَبَّنا وإلَيْكَ المَصِيرُ، فَلَمَّا اقْتَرَأَها القَوْمُ، ذَلَّتْ بها ألْسِنَتُهُمْ، فأنْزَلَ اللَّهُ فى إثْرِها: {آمَنَ الرَّسُولُ بما اُنْزِلَ إلَيْهِ مِن رَبِّهِ والْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ باللَّهِ ومَلائِكَتِهِ وكُتُبِهِ ورُسُلِهِ لا نُفَرِّقُ بيْنَ أحَدٍ مِن رُسُلِهِ وقالُوا سَمِعْنا وأَطَعْنا غُفْرانَكَ رَبَّنا وإلَيْكَ المَصِيرُ} [البقرة: ٢٨٥]، فَلَمَّا فَعَلُوا ذلكَ نَسَخَها اللَّهُ تَعالَى، فأنْزَلَ اللَّهُ عزَّ وجلَّ: {لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إلاَّ وُسْعَها لها ما كَسَبَتْ وعليها ما اكْتَسَبَتْ رَبَّنا لا تُؤاخِذْنا إنْ نَسِينا أوْ أخْطَأْنا} [البقرة: ٢٨٦] قالَ: نَعَمْ {رَبَّنا ولا تَحْمِلْ علَيْنا إصْرًا كما حَمَلْتَهُ علَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنا} قالَ: نَعَمْ {رَبَّنا ولا تُحَمِّلْنا ما لا طاقَةَ لنا بهِ} قالَ: نَعَمْ {واعْفُ عَنَّا واغْفِرْ لنا وارْحَمْنا أنْتَ مَوْلانا فانْصُرْنا علَى القَوْمِ الكافِرِينَ} قالَ: نَعَمْ )) .[2]

[1] - الطبراني في المعجم الاوسط (٢٧٨/٧).
[2] - صحيح مسلم برقم (١٢٥) .

واتە: لە (ابی هریرە ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : کاتێك (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابەزاند بەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ {لِلَّهِ ما فی السَّماواتِ وما فی الْأَرْضِ وإِنْ تُبْدُوا ما فی أَنْفُسِکُمْ أَوْ تُخْفُوهُ یُحاسِبْکُمْ به اللَّهُ فَیَغْفِرُ لِمَن یَشاءُ ویُعَذِّبُ مَن یَشاءُ واللَّهُ علَى کُلِّ شیءٍ قَدِیرٌ} [البقرة: ٢٨٤] واتە : موڵکی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشی کە تێیاندایە هەموو موڵکی خوای پەروەردگارن لە خاوەندارێتی و بەڕێوەبردن و دەورەدانی، و هیچ شتێکی لەلا شاراوە نیە . و هەرچیش کە ئاشکرای دەکەن لەوانەی دەرونتان یان دەیشارنەوە ئەوا بێگومان خوای پەروەردگار پێی دەزانێت و لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکات لەسەری، جا ئەوەی ویستی لێ بێت لێی خۆش دەبێت، و لە ئەوەش دەگرێت کە ویستی لێ بێت و سزای دەدات، و خوای پەروەردگار توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە . پاش ئەوەش خوای پەروەردگار ڕێزی لەموسڵمانان گرتوە بەوەی کە لە قسەی ناخ وختورەی دڵیان خۆش بووە، بەمەرجێ قسە یان کردەوەی بەدوادا نەیەت، هەروەکو لەپەیامبەری خواوە صلى الله علیه وسلم جێگیر و سەلمێنراوە...!! (ابی هریرە ) دەلیت: ئەم ئایە تە زۆر کاری گەر بوو لە سەر دڵ ی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بۆیە هاتنە خزمەتی چۆکیاندادا ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەند ئەرك وفەرمان دراوە بەسەرماندا لە توانامان دانیە ، نوێژو رۆژوو جیهاد و خیر کردن ئیستاش ئەم ئایەتە ، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئێوەش دەتانەوێت وەکو گاور جولە کەکانی پێش خۆتان بلێن : دەبیستین وە سەرپێچیش دەکەین ..؟! نا بەلکو ئێوە بلێن : بیستمان و گوێرایەلیشین ، دواوی لێ خۆش بوونت لێدەکەین ئەی پەروەردگارمان گەرانەوەشمان هەر بۆ لای تۆیە ، ئەوانیش ووتیان : بیستمان گوێرایەلیشین داوای لێ خۆش بوونت لێدەکەین ئەی پەروەردگارمان گە رانەوەشمان هەر بۆ لای تۆیە ،کاتێك خەلکە کە خوێندیانەوە زمانیان لەسەر لێ راهات و ئیتر (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابەزاند{آمَنَ الرَّسُولُ بما أُنْزِلَ إلَیْهِ مِن رَبِّهِ والْمُؤْمِنُونَ کُلٌّ آمَنَ باللَّهِ ومَلائِکَتِهِ وکُتُبِهِ ورُسُلِهِ لا نُفَرِّقُ بیْنَ أحَدٍ مِن رُسُلِهِ وقالُوا سَمِعْنا وأَطَعْنا غُفْرانَکَ رَبَّنا وإلَیْکَ المَصِیرُ}[البقرة: ٢٨٥] پەیامبەری خوا صلى الله علیه وسلم باوەڕی هێناوە ویەقینی هەیە بەو سروشەی بۆی هاتوە لەلایەن پەروەردگاریەوە و بەڕاستی دەزانێت، و هەقی خۆشیەتی کە یەقینی هەبێت، و باوەڕدارانیش بەهەمان شێوە باوەڕیان هێناوە بەقورئانی پیرۆز و کاری پێدەکەن، هەمویان باوەڕیان هێناوە بە ( الله ) کە پەروەردگار و پەرەستراویان بێت کە سیفاتی مەزنی وتەواوی تێدایە، وە بەوەی کە خوای پەروەردگار کۆمەڵێك فریشتەی بەڕێزی هەیە، وە بەوەش کە کتێبی دابەزاندوە، وە بەوەش کە پەیامبەرانێکی بۆ خەڵك ناردوە، . ئێمەی باوەڕداران . ئەوە نەبێت باوەڕمان بەهەندێکیان هەبێت و بەهەندێکی تریشیان باوەڕمان نەبێت، بەڵکو باوەڕمان بەهەمویان هەیە . پەیامبەر و باوەڕدارانیش وتوویانە : گوێمان لەوە بوو کە بەوەحی داتبەزاندوە، و گوێڕایەڵین لەهەموو ئەوانەدا، ئومێدەوارین . بەفەزڵی خۆت . لەتاوانەکانمان خۆش بیت، ئەوە تۆی پەروەردەمانت کرد بەو نیعمەتانەی کە پێمانت بەخشیوە، و تەنها بۆ لای تۆیە سەرەنجام و گەڕانەوەمان .

کاتێك ئەم ئایەتەیان خوێندەوە (خوای گەورە ) سەرەتایی ئایەتەکەی (نسخ ) کردەوە ، پاشان ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە کە دەفەرموویت : {لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إلاَّ وُسْعَها لها ما كَسَبَتْ وعليها ما اكْتَسَبَتْ رَبَّنا لا تُؤاخِذْنا إنْ نَسِينا أوْ أخْطَأْنا}[البقرة: ٢٨٦] واتە :ئاینی خوای پەروەردگار ئاسانە وگرانی تێدا نیە، خواش داوای شتێك لەبەندەکانی ناکات کە لەتواناياندا نەبێت، جا هەر کەس چاکە بکات چاکەی دەست دەکەوێت، وە هەر کەسێکیش خراپە بکات خراپەی دەست دەکەوێت . پەروەردگارا سزامان مەدە ئەگەر شتێکمان لەبیرچووەوە لەوەی فەرزت کردوە لەسەرمان، یان هەڵەمان کرد و شتێکمان کرد کە یاساغیت لێکردوە..!! .ئینجا دەڵێت : بەلیّ . {رَبَّنا ولا تَحْمِلْ علَيْنا إصْرًا كما حَمَلْتَهُ علَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنا} واتە : بە روەردگارا کارانێکی قورسی وامان نەخەیتەسەرشان کە خستتە سەرشانی سەرپێچی کارانی پێش ئێمە وەکو سزایەك بۆیان ..!! ئینجا دەڵێت : بەلی. {واعْفُ عَنّا واغْفِرْ لنا وارْحَمْنا أنْتَ مَوْلانا فانْصُرْنا علَى القَوْمِ الكافِرِينَ} واتە : پەروەردگارا داواکاری وامان بەسەرشاندا نەدەیت لە داواکاری و موسیبەت کەتوانای هەڵگرتنیمان نیە، و تاوەنەکانمان بسڕەوە، و عەیب وعارەکانمان بپۆشە، و چاکمان لەگەڵ بکە، و تۆ کاروباری ئێمەت بەدەستە وبەڕێوەی دەبەیت، سەرمان بخە بەسەر ئەوانەی نکوڵیکار و بێباوەڕن بەئاینەکەت و تاك و تەنهاییت، و پەیامبەرەکەت موحەممەد صلى الله عليه وسلم بەدرۆ دەزانن، و عاقیبەت وسەرئەنجام با بۆ ئێمە بێت بەسەریاندا لە دونیا و دوارۆژدا..!!

📖 عن (جبير بن نفير ) رضي الله عنه قال : أن رسول الله ﷺ قال : ((إنَّ اللَّهَ ختمَ سورةَ البقرةِ بآيتينِ ، أُعطيتُهُما مِن كنزِهِ الَّذي تحتَ العرشِ ، فتعلَّموهنَّ وعلِّموهنَّ نساءَكُم ؛ فإنَّها صلاةٌ وقُربانٌ ودعاءٌ)) .[1]

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوای گەورە ) سورەتی (البقرە ) کۆتایی هێناوە بە دوو ئایەت کە پێم بەخشراوە ، لە و گەنجینەی کە لە ژێر عەرشەوە يە ، کەواتە : خۆتان فێر بکەن ، ئافرەتانیشتان فێر بکەن ، چونکە ئەم دووئایەت نوێژ و قورئان و دوعاو پارانە وەيە ..!!

📖 عن (أسمأ بنت زيد ) – رضى الله عنها – قال : قال رسول الله ﷺ : ((اسمُ اللهِ الأعظمُ فى هاتين الآيتينِ { اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ} و{ إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ }البقرة )).[2]

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ناوی خوای بەرزو بلند گەورە ، لەم دوو ئایەتە دایە { اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ}البقرة ٢٥٥ و{ إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ }البقرة ١٦٣ ...!!!

---

[1] - سنن الدارمي برقم (٣٤٤٢).
[2] - سنن ابي داود برقم (١٤٩٦).

سُورَةُ البَقَرَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى
لِّلۡمُتَّقِينَ ٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ
وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ
إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ٤
أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥

# ئایەتەکانی (١-٥) سورەتی ( البقرە )

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٥﴾﴿

[البَقَرَة : ١ - ٥]

شعیب بۆتێگەیشتنی قورئان

بســـــــــــــم الله الرحمن الرحيم

قال تعالى: ﴿الٓمٓ ١﴾ [البَقَرَةِ : ١]

﴿الٓمٓ﴾ بێ گومان هەر وەکو زانراوە ﴿الٓمٓ﴾ چەند پیتێکە لە سەرتایی هەندێك لە سورە تەکانی قورئانی پیرۆز دا هاتوون کە ژمارە یان (١٤) پیتە ، نیوەی کۆی پیتەکانی زمانی عەرەبین ، بۆسەلماندنی (أعجاز) و مەزنی و گرنگی قورئان کە لە توانای هیچ کەسێك دا نیە ، بەو پیتانە کتێبی کی ئاوا بی وێنە دا بنێت ، بەرادەیەك هەتا ئەگە ر هەموو گرۆی ئادەمیزاد و پەری کۆببنەوە بۆ ئەم مەبەستە ، بێ گومان ناتوانن ، هەروەها چەندەها نهیچنی تریشی تێدایە ، زاناکان لە هەندێك دواون ، هەندێکیشیان وتوویانە : هەر پەروەردگار خۆی زانایە بە نهێنی و ئەو پیتانە ، ﴿الٓمٓ﴾ بێ گومان ئەم پیتانە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە (اعجازی) قورئانە وە بەلگەشە لەسەر ئەوەی کە قورئانی وەحی سروشی پەروەردگا، چونکە کە پیتەکانی ئەم قەرئانە هە ئەم پیتانە کە زمانی عەرەبی لێ پێکهاتووە ، کەچی وەك تحدایەك عەرەبەکان نەیانتوانی بەر هەلستی ئەم قورئانە ببنەوە ، وە بێ توانای عەرەبیش کە سەرباری ئەوەی کە پاراوترین خەلکی ناوچە کە بوون بە زمانی خۆیان بۆیان دا بەزیوە ، وە بێ گومان نەیاتوانی هاوشێوەی ئەم قورئانە بهێنەوە وە بێ گومان ناش توانن هەرچی گرۆی ئادەمیزاد جنۆکە هەیە ،بێ گومان زانایانی تەفسیری قورئان لە هاوەلان و شوێنکەوتوان و شوێن کەوتوویی شوێنکەوتوان وە شوێنکەوتووی ئەم ئومەتە لە زانایانی پێشینەکان زانایانی ئەم سەردەمەش راو بۆ چوونی جیاوازیان هەیە لەسەر ئەم پیتانەی سەرتایی هەندێك لەسورەتەکانی قورئان دا ، بێ گومان راو بۆ چوونی هەر هەموشیان لە جێ خۆی دایە بۆ چوونەکان نزیکن بۆ تێگەیشتن تەفسیری ئەم پیتانە ، هەروەك ووتمان سەرتایی سورەتی (البقرە ) بەم پیتانە دەست پێدەکات ﴿الٓمٓ﴾ وە پێنان دە ووترێت (الحروف مقطعة ) واتە: پیتە جیاکان یان پیتە پچراوە کان یان براوە کان ، کە پێك دێن لە (١٤) پیت لە سەرەتای (٢٩) سورەتی قورئانی پیرۆز دا هاتوون ، هەروەك بەشێك لە زانایان تەفسیر لە سەر مانای ئەم پیتانە راو بۆچوون و قسەی جیاوازیان لە سەر کردووە ، بۆنموونە هەندێك وتوویانە : ﴿الٓمٓ﴾ ... (الف) بەواتایی (اللّٰه) یە ، (لام ) بەواتای جبریل وەیە، (المیم ) بە واتاوی محمد ﷺ .وە هەندێکیش دەلێن : ئەم پیتانە بۆ ئاگادار کردنەوە ، بەلام ئەمانە هەر هەمووی راو بۆ چوون ئەجتهادە یان کۆششە هیچ سەنەدێکی راست و دروستیان لە سەر نیە ، چونکە زۆر بەی زانایان ئەمانە لە ئایەتەکان موتەشابیهە واتە : واتاکانیان نازانرێت لە ئیستا دا تەنها (خوای گەورە) نەبێت بەم ئایەتانە زاناو دانایە پێی ، بەلام لە هەمان کاتدا ئێمە موسلمانی راستە قینە باوەرمان بە تەواوی پیت بە پیتی قورئانی پیرۆز هەیە ، چونك پێمان وایە (خوای گەورە ) بێهودە و بێ هۆو حیکمەت ئەم پیتانەی لە سەرتای هەندێك لە سورەتە کانی قورئان بێ هۆ دا نە بەزیوە ، بێ گومان حیکمەت و هۆی خۆی هە بەلام تا ئیستا مرۆڤ نەگەیشتووتە ئەم ئاستەی کە زانا بێت بزانێت ئەم پیتانە کە مەبەستی تەواو روون بکاتەوە ،

هەروەك ووتمان كە حیكمەتی خۆی هەیە كە ئیمە پێ نازانین و لە كاتی خۆیدا مرۆڤ دەگاتە ئەم ئاستە كە روونی رەوانی تەفسیرێكی تەواو بۆ ئەم پیتانەی قورئانی پیرۆز بكات ، وە ئەگەر سەرنجێك بەدەین بە ووتەی زانایان لەسەر ئەم پیتانەی قورئاند هەندێك لە راو بۆچوونەكان بۆ نموونە وە ئیمامی (طبري ) – رحمەتی خوا لێ لێت – دەلێت : ئەم پیتانە وەكو ﴿الٓمٓ﴾ كە (خوای گەورە ) لە سەرتایی سورەتە كانی قورئان هێناویەتەوە ، دە یەوێ بلێ : بەتایبەتی بە كافرە كان یان ملحیدەكان بلێ : كە ئە قورئانەی محمد ﷺ كردوویەتی بە بەلگە بۆ پیغەمبەرایەتی محمد ﷺ ، وە موعجیزە و نیشانەیە پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ ، وە هەر گیزاو هەر گیزا هیچ كەسێك ناتوانێت لە گۆری ئادەمیزاد و جنۆكەش ناتوانێت هاوێنەی یان هاوشێوەی ئەم قورئانە بهێنێتەوە ، وە یان ناتوانێت سورەتێك لە سورەتەكانی بهێنێتەوە ، بەلكو ئەم قورئانە هەر لە و پیت و دەنگانە پێك هاتوون ، كە ئێوە قەسەیان پێ دە كەن و پێ یان دە نووسن ، وەكو ئەم پیتانە ( أ ، ل ، م ، ن ، ص ، ...هتد ) دەی ئێوەی كافرو ملحید ئەگەر راست دەكە كە محمد ئەم قورئانەی نووسیوە یان دەستی لە نووسینی دا هەیە ، ئەی كافر و مولحیدە كان خۆ ئێوەش مرۆڤن وەیان ئادەمیزادن دەی هاو وێنەی یان هاوشێوەی ئەم قورئانە بنووسن یان بهێنن ، بەلام ئەگەر نەتان توانی بهێنن ، بزانن ئەوا ئەم قورئانە نێرداوی پەروەردگارا كە لەم پیتانەی پێك هێناوە ، كەواتە نوسینی دەستی مرۆڤ نیە ، نە محمد ﷺ بۆ خی نووسیوە نەغیری محمد ﷺ ، بەلگەش لەسەر ئەم پیتان كە باسمان كرد لە سەرەوە دا ، هەر كە لە سەرتای هەر سوەتێك ئەم پیتانە هاتن ، ئەوا یەكسەر لەدوای پیتەكان (خوای گەورە ) باسی قورئان یان كتاب دەكات .[١] بە لێ بێ گومان ﴿الٓمٓ﴾ كە زانایان و پێشەوایانی ئیسلام دەلێن : ئەم پیتانە نەهێنیە لە نێوان (خوای گەورە ) و پیغەمبەری خوا ﷺ هەروەها وتویانە ئەم پیتانە نهێنی قورئانن ، بەلام تا ئێستا ئەم نهیننیە نەزانراوە وە كو ئەم ئایەتانەی تری قورئان كە موتەشابهن مانان مەبەستیان روون نیە تەنها (خوای گەورە ) پێی زاناو دانایە ، هەرەوەها هەندێك لە هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەكو ( ابو بكر ، عمر و ، عوسمان ، علی ، ابن مسعود ) – خوا لێیان رازی بێت – وتویانە : ئەم پیتانە ناوی سورەتەكانە ، هەروەها وتوایانە: ئەم پیتانە سەرەتای كرانەوەی قورئانە یان كلیلی كردنەوەی قورئانی پیرۆزە ، هەروەها (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : سەرتایی هەموو سورەتەكان بە ( ق، ص ، طم ، طسم ، الرا ) جگە لەمە حونجە كردنی دانراوە ( هجائی موضوع ) هەندێ لە عەرەبەكان وتویانە : ئەوانە چەند پیتێكن لە پیتەكانی فەرهەنگ ، بە باسكردنی هەندێكیان لە سەرتایی سورەتەكانەوە پێویستە بە باسكردنی ئەوانی تر ناكات ، كە لە تەواو كەری (٢٨) پیتە كەی ترن ، وەك : كەسێك دەلێت : ( كورە كەم ) دەنووسێ .[٢] بێ گومان ئەم پیتانە بێ هودە بێ سوود نەناردۆتە خوارەوە بێ گومان حیكمەتی خۆی تێدایە ، لێرە دا ئەو بلێن كە هەر شتێك لە خوا پیغەمبەرەكەی هات دەبێت تەواو باوەرو ئیمان مان پێی هەبێت دەستەوەستان بووەستێن چونكە لە خواو پێغەمبەرەكەیەوە هاتووە ، بۆ نموونە : مولحیدە كان دەلێن (المص ) یان (الم ) یان (الر) یان (حم ) یان (یس) یان (ق) یان (ص) یان (كهیعص) ئەم پیتانە هیچ مانایەكیان نیە ، بێ گومان ئەوانە هەلە یەكی زۆر گەورەیی عقلی یان كردووە ، وای دابنێ خۆی لە خۆیدا مانایان هەیە یان مانایان نیە ، بەلام خۆ لە (خوای گەورە ) وە هاتوون بە دلنیایی حیكمت و سوودی خۆیی هەیە وەكو ئەم موعجیزە گەورەیەی قورئان لە ئایەتەكانی تردا چەندە نیشان و موعجیزە گەورە

---
[١] -تفسير الطبري (٢٣٨/١).
[٢] - تفسیر ابن كثیر بە كوردی (٧٣/١).

هاتوون ،ئەوەی راستە ئەوەیە کە ئیمە باوەر مان پێی هەبێت وا ئیمان مان هەبێت کە هەموو پیتێك لە پیتەکانی قورئاندا موعجیزەیە و کە هیچ گومانێك هەلناگرێت ، خۆ ئەگەر لە خوا و پێغەمبەرەکەی دا شتێکمان بۆ باسکرابێت ئەوا باسی دەکەین روونی دەکەینەوە بە پەیی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەریش نەبوو ئەوا دەوستین و باوەرمان پێ هەیە تا رۆژی دوایی بەم قورئانە پیرۆزە دا هەر وەکو لە هەر کوێد وەستاین وە کو (خوای گەورە ) دەفەرموویت: قال تعالی: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٧﴾ [آل عِمۡرَان : ٧] واتە: ئەو خوا یە زاتێکە کە قورئانی بۆ سەر تۆ (ئەی محمد ﷺ ) ناردە خوارەوە ، بێ گومان بە شیچك لە ئایەتە کانی دامەزراوو پایە دا رو روون ئاشکران ، واتە : (محکمات ) کە ئەمانەش بچینە و بناغەی قورئانی پیرۆزن کە لە کاتی جیاوازی و ناروونیدا ئەوەی کە پێچەوانەیە دە گەرێنرێتەوە بۆ لای ئەو ،جا ئەندێکیش لە ئایەتە کاندا ماناو مەبەتسی جۆراو جۆر نەزانراوە هەلدەگرێت ناتوانرێت بە ئاسانی  مانابەتەواوی بکرێت چونکە ماناکانیان ناروون و زیاتر لە مانایەك هەلدە گرێت ، ناتوانرێت مانایەکی دیاری کراو و دروست دیار بکرێت واتە : (متشابهات ) چونکە دەبێیت بگەرێنەوە بۆ لای ئایەتە (محکمات ) واتە : ئایە تە روون ئاشکرا کان ، جا بۆیە ئەو کەسانە کە دل نەخۆشن و لادان لە حەق لە دلیاندا هەیە ، لەبەر نیەت خراپی خۆیان تەنها شوێنی ئەو ئایەتانە دەکەون کە نا روونن و چەندە واتایەك یان مانایەك هەلدە گرێت ، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە گومان لە لای خەلك دا دروست بکەن ، بۆ ئەوەی گومراو وێلیان بکەن ، وە بۆ ئەوەی مانایی ئایەتەکان بە شێوەیەك لێك بدەنەوە  کە لە گەل بۆ چوونی خۆیاندا بگونجێت،  کەچی حقیقەت و راستی مانای ئەم ئایە تانەش جگە لە خوای پەروەردگار کەسی تر نایزانێت ، وە ئەم کەسانەش کە بە تواناو رۆچوون لە زانست و زانیاری شەرعی دا دەلین : باوەرمان  هێنا  بەم قورئانە ، هەمووی لە لایەن پەروەردگارمانەوە بۆمان هاتووە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ و ئەو ئایەتانەی چەند واتا و مانایەك هەلدەگرێت دە گیرێنەوە بۆ لای ئایەتە روون ئاشکرا کان واتە : (محکمات )  وە تەنها ئەوانەی کە خاوەنی عەقل ژیریەکی ساغ و تەندروست و بە شێوەیەکی راست و دروست لە کاناکان تێدە گەن و بیری لێ دە کەنەوە ..!!

بێ گومان ئەم پیتانە (اعجاز) یان نیشانەی قورئانیە پیرۆزە کە لە سەرە تای هەندێك سورەت دا هاتوون  هەر وەکو نموونەی ئەم سورەتانە کە (خوای گەورە ) دە فەرموویت :

قال تعالی: ﴿الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢﴾ [البَقَرَةِ : ١ - ٢] واتە:  (الم ) ئەم قورئانە  ئەو کتێبە مەزن گەورە یە کە گومانی تێدانیە کە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە هاتووە ، بۆیە نابێت هیچ کەسێك لە هەر ئاستێك دا گومانی لەم قورئانە هەبێت ، ئەو مەش لە بەر روونیەتی ، پارێزگاران سودی لێ دەبینن  بەزانستی بە سود و کردەوەی چاك ، ئەوانیش ئەوانەن لە (خوای گەورە ) دەترسن یان (المتقین ) پارێزگاران ، شوێنی ئەحکامەکانی قورئانی پیرۆز دەکەون ..!!

قال تعالى: ﴿الٓمٓ ۝١ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ۝٢ نَزَّلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ۝٣﴾ [آل عِمۡرَان : ١ - ٣] واتە: (الم ) خوا زاتێکە جگە لەو زاتە هیچ خوایەکی تر نیە شایەنی پەرستن بێت ،وە ئەو زاتە بۆ هەمیشە زیندووە و راگرو سەرپەرشتیاری هەموو دروست کراوە کانیەتی ..!!

قال تعالى: ﴿الٓمٓصٓ ۝١ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ۝٢﴾ [الأَعۡرَاف : ١ - ٢] واتە: (المص ) ئەم قورئانە کتێبێکە و بۆت هاتووەتە خوارەوە ئەی محمد ﷺ ، کەوا بوو با سەغلەتی لە دڵ و دەروونتدا نەبێت لە گەیاند نی دا بۆ ئەوەی خەلکی پی بێدار بیکەیتەوە ، هەروەها یادەوەریشە بۆ ئیمان داران ..!!

قال تعالى: ﴿الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ۝١﴾ [إِبۡرَاهِيم : ١] واتە: (الر ) ئەم قورئانە کتێبێکە دامان بە زاندووە بۆت ئەی محمد ﷺ تاخەلکی لە تاریکیەکانی بێ باوەری و نەزانی و سەرلێ شێواوی دەربهێنێت ، بەرەو نووری ڕێبازی ڕۆشنایی ئیمان ، بەویستی پەروەردگاریان ، تا دەگەنە ڕێبازی راستی خوای بالادەست و شایستەی سوپاسگوزاری ..!!

قال تعالى: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ [السَّجۡدَة : ١ - ٢] واتە: (الم) دابەزاندنی ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە هیچ گومانی تێدانیە ..!!

قال تعالى: ﴿كٓهيعٓصٓ ۝١ ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ ۝٢﴾ [مَرۡيَم : ١ - ٢] واتە: (کهیعص ) ئەی محمد ﷺ ئەم باسە باسی رەحمەتی پەروەردگارتە ، دەربارەی بەندەی خۆی زکریا ..!!

قال تعالى: ﴿يسٓ ۝١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ۝٢﴾ [يس : ١ - ٢] واتە: (یس) سوێند بەو قورئانەی کە هەموو فەرمانێکی لە شوێنی خۆیەتی .

قال تعالى: ﴿صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ۝١﴾ [ص : ١] واتە : (ص) سوێند بەم قورئانە کە خاوەنی ئامۆژگاری وشکۆمەندی وقەدرە ..!!

قال تعالى: ﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٢ كِتَٰبٞ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ۝٣﴾ [فُصِّلَت : ١ - ٣] واتە: (حم) ئەم قورئانە دابەزێنراوە لە لایەن پەروەردگاری خاوەن بەزەیی و میهرەبانەوە ،کتێبێکە ، ئایەت و فەرمانەکانی بەش کراوە و جیاکراوەتەوە (ئیمان و کوفر ، حەلال و حەرام ، چاکە و خراپە ...هتد ، قورئانێکە بە عەرەبیەکی رەوان و پاراو بۆ کەسانێك کە دەیزانن و شارەزاییان هەیە لە زمانەوانی و زانستە کان ..!!

قال تعالى: ﴿حمٓ ۝١ عٓسٓقٓ ۝٢ كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٣﴾ [الشُّورَى : ١ - ٣] واتە: (حم ) (عسق) ئا بەم شێوەیە کە دەیزانیت خوای بالادەست و کاربەجێ وەحی و نیگا دەنێرێت بۆ تۆ ئەی محمد ﷺ و بۆ پێغەمبەرانی پێش تویش رەوانە کراوە ، لە لایەن خوایەکی بالادەست و داناو زانا ..!!

قال تعالى: ﴿ص وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ۝١﴾ [ص : ١] واتە: (ص) سوێند بەم قورئانە کە خاوەنی ئامۆژگاری و شکۆمەندی و قەدرە..!!

قال تعالى: ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ۝١﴾ [ق : ١] واتە: (ق) سوێند بەم قورئانە کە خاوەنی ڕێزو شکۆمەندیە ئەی محمد ﷺ نێردراوی لە لایەن پەروەردگارەوە ..!!

هەندێك لەووتەو راو بۆچوونی زانایان دەربارەی پیتە براوە كان یان پیتە پچراوە كانی قورئانی پیرۆز كە ئەمانەی خوارەوەن :

✍ عن (عبدالله بن عباس ) رضي الله عنه عن (جابر بن عبدالله بن رئاب ) رضي الله عنه قال : (( مر أبو ياسر بن أخطب فى رجال من يهود برسول الله ﷺ ، و هو يتلو فاتحة سورة البقرة : ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾ فاتى أخاه حي بن أخطب فى رجال من اليهود ، فقال : تعلمون – والله – لقد سمعت محمدا يتلو فيما انزل عليه: ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾. فقالوا : أنت سمعته ..؟!قال : نعم. فمشي حيي بن أخطب في أولئك النفر إلى رسول الله ﷺ ، فقالوا : يام محمد ﷺ ، ألم يذكر أنك تتلو فيما أنزل عليك : ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾..؟! قال: بلى . قالوا : قد جاءك بهذا جبريل من عند الله ..؟! قال : نعم . قالوا : لقد بعث الله قبلك أنبياء ، ما نعلمة بين لنبى منهم ما مدة ملكه ، وما أجل أمته غيرك . فقال : حيى بن أخطب – وأقبل على من كان معه – الألف واحدة ، واللام ثالاثون ، والميم أربعون ، فهذه إحدى وسبعون سنة ، أفتدخلون فى دين نبى إنما مدة ملكه وأجل أمته إحدى وسبعون سنة ..؟! ثم أقبل على رسول الله ﷺ ، فقال : يا محمد ﷺ ، هل مع هذا غيره ..؟! قال : نعم . قال: وما ذاك ..؟!قال : ﴿الٓمٓصٓ ۝١﴾ [الأَعۡرَاف : ١] قال :هذه أثقل واطول ، الألف واحدة ، واللام ثلاثون ، والميم أربعون ، والصاد تسعون ، فهذا إحدى وستون ومائة سنة ، هل مع هذا يا محمد ﷺ غيره ..؟! قال : نعم . قال : وما ذاك ..؟! قال : ﴿الٓر﴾ [إِبۡرَاهِيم : ١] قال: هذه أثقل وأطول ، الألف واحدة ، واللام ثلاثون ، والراء مائتان ، فهذه إحدى وثلاثون ومائتان سنة ، فهل مع هذا يا محمد ﷺ غيره ..؟! قال : نعم . ﴿الٓمٓر﴾ [الرَّعۡد : ١] قال : فهذه أثقل وأطول ، الألف واحدة ، واللام ثلاثون ، والميم أربعون ، والراء مائتان ، فهذه أحدى وسبعون سنة ونائتان . ثم قال : لقد لبس علينا أمرك ، يا محمد ﷺ ، حتى ما ندرى أقليلا أطيت أم كثيرا ..؟! ثم قاموا ، فقال أبو ياسر لأخيه حيى ومن معه من الأحبار : ما يدريكم لعله قد جمع هذا لمحمد كله ، إحدى وسبعون ، وإحدى وستون ومائة ، وإحدى وثلاثون ومائتان ،و إحدى وسبعون ومائتان ، فذالك سبعمائة وأربع وثلاثون . فقالوا : لقد تشابه علينا أمره . فيزعمون أن هذه الآيات نزلت فيهم قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ﴾ [آل عِمۡرَان : ٧] )).[1]

[1] اخرجه البخاري في التاريخ (٢/٢٠٨) برقم (٢٢٠٩) ، ابن كثير في التفسير القران العظيم (١/٢٥٧-٢٥٨) .

واتە: (ابو یاسر کوری ئەختب ) کە پیاوێك بوو لە نەوەی جوولە کەکان لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە کاتی کردنەوە و خوێندنەوەی سورەتی (البقرە) ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾ لە پاشان براکەی (حیی کوری ئەختب ) لە گەل هەندێك لە جوولە کەکان هاتە لای ووتی ئایا تۆ ئەمە دەزانیت ..؟! بە خودا گویم لە ﷴ بوو ئەم ئایەتەی بۆ دا بەزیو دەی خوێندەوە ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾ ئەوانیش ووتیان : ئایا تۆ گوێت لێ بوو کە دەیخوێندەوە ..؟! ئەویش ووتی : بەلێ . ئەوە بوو (حیی کوری ئەختب ) لەگەل ئەو کۆمەلە جوولە کەی رۆیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەوانیش پرسیاریان کرد ووتیان : ئایا جبریل (علیە السلام) ئەمەی لە خواوە بۆ تۆ هێناوە واتە : قورئانی پیرۆز ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بەلێ . ئەوانیش ووتیان : ئایا پێش تۆ (خوای گەورە ) پێغەمبەرانی (علیە السلام ) ناردۆتە خوارەوە ، ئەوەی کە ئێمە دەی زانین کە پێغەمبەرێك ماوەی فەرمانرەوایەکەی یان حوکمرانیە کە ی بۆ گەلە کە روون کردۆتەوە ، وە چی لە پێناوی گەلە کەی دایە جگە لە ئێوە ، وە (حیی کوری ئەختب) رووی کردە ئەو کەسەی کەلە گەی دا بوو ، ووتی : (الف ) یەکە (١) ، (اللام) سی یە(٣٠) ، (والمیم) چلە (٤٠) ، وە ئەوەش حەفتا یەك سالە (٧١) ئایا دەچێتە نێو ئاینی پیغەمبەرە کە کە ماوە کە ی تەنها فەرامانرەوایە یان حوکمرانیە ، کە پیناوەی گەلە کەی بۆ ماوەی حوکمرانی (٧١) سالە ، پاشان رووی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی : ئەی ﷴ ئایا کەشتیکی تر هەیە لەگەل ئەمە ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بەلێ هەیە ..!! ئەویش ووتی : ئەوە چیە ..؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوە ﴿الٓمٓصٓ ۝١﴾ [الأَعۡرَاف : ١] هەروەها فەرمووی : ئەمە زۆر قورسترو درێژترە (الف ) یەکە (١) ، وە (اللام) سی یە (٣٠)، وە (المیم ) چلە (٤٠) ، وە (الصاد) نۆهەتە (٩٠) ، وە ئەمەش سەدو شەشست یەکە (١٦١) ، وە (حیی کوری ئەختب ) ووتی : ئایا کەشتیکی تر هەیە لەگەل ئەم دا ئەی ﷴ ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بەلێ . ئەویش ووتی : ئمە چیە ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ﴿الٓر﴾ [إِبۡرَاهِيم : ١] فەرمووی : ئەمە قورسترو درێژ ترە ، (الف) یەکە (١) ، وە (اللام ) سی یە (٣٠) ، وە (الراء ) دوو سەدتە (٢٠٠) ، وە ئەمەش دووسەد و سی یەك سالە (٢٣١) ، ئەویش ووتی : ئایا هیچ شتیچکی تر هەیە لە گەلی دا ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بەلی . فەرمووی : ﴿الٓمٓر﴾ [الرَّعۡد : ١] قورەسترە و درێژترە ، (الف ) یەکە و (١) ،وە(اللام )سی یە (٣٠ ) ، وە (المیم ) چلە (٤٠) وە (الراء ) دوو سەدتە (٢٠٠) وە ئەمەش دووسەت و حەفتاو یەك سالە (٢٧١) سال ، پاشان ووتی : ئە ی محمد کارو بارە کانی تۆ بۆ ئێمە زۆر شلە ژاوە ، تەنانەت ناش زانین کەمێك بە ئێمەت داوە یان زۆر ، پاشان ئەبو یاسر بە حیی کوری ئەختب و ئەوانەی لە گەلی دا بوون لە ئەحبارەکان یان خاخامەکانی جوولە کە ،چۆن دەزانی رەنگە ئەمە بۆ ﷴ کۆ کرابێتەوە ..!! نۆهەد(٩٠) ، سەدو شەست یەك (١٦١) ، وە دووسەدو سی ویەك (٢٣١) ، وە دووسەدو حەفتاو یەك (٢٧١) وە ئەمەش دەبێتە بە حەوسەدوو سی و چوار (٧٣٤ ) ئەوانیش ووتیان : کارو باری ئەو هاو وێنەی یان هاوشێوەی ئێمە بووە ، کە بانگەشەی بۆ دەکات ئەمە راستە ،ئەم ئایە تە هاتە خوارەوە کە فەرموویت : ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞ﴾ [آل عِمۡرَان : ٧] )) ..!!

✍ عن (أبو بكر الصديق ) ﷺ قال : (( لكل كتاب سر ، وسر الله تعالى فى القرآن اوئل السور )).[١]

واتە: هەموو کتابێك نهێنی و یان سری خۆی هەیە ، وە نهێنی و سری (خوای گەورە ) لە قورئاندا لە سەرتایی سورەتەکان دایە.

✍ عن (على بن ابى طالب ) ﷺ قال: (( لكل كتاب صفوة ، وصفوة هذا الكتاب حروف التهجى )).[٢]

واتە: هەموو کتابێك نوخبەی یان تایبەت مەندی خۆی هەیە ، نوخبەی ئەم کتابەش واتە: قورئانی پیرۆز پیتە هیجائیە یان ڕێنووسە.

✍ عن (عبدالله بن مسعود ) ﷺ من طريق (مرة الهمدانى ) -رحمه الله –فى قوله :﴿الٓمٓ ﴾ قال: هو اسم الله الأعظم )) .[٣] واتە: لە سەر ووتەی ﴿الٓمٓ ﴾ (عبدالله بن مسعود ) – خوا لێ ڕازی بێت- دەڵێت : ئەوە ناوی خوای گەورە یە .

✍ عن (عبدالله بن عباس ) ﷺ من طريق (السدى ) عن (ابى مالك وابى صالح ) قالوا : ﴿الٓمٓ ﴾ حروف اشتق من حروف هجاء أسماء الله )).[٤] واتە : ﴿الٓمٓ ﴾ ئە پیتانەن وەر گیراوە لە پیتە هیجائی یەکان یان لە پیتە ڕێنووسە کان کە ناوە کانی (خوای گەورە یە ) .

✍ عن (عبدالله بن عباس ) ﷺ من طريق (أبى الضحى ) فى قوله : ﴿الٓمٓ ﴾ ، قال : (( أنا الله أعلم )) .[٥]

واتە: ﴿الٓمٓ ﴾ دەڵێت بە مانای تەنها خوای گەورە بە خۆی دەزانێت لە سر و نهێنی ئەم پیتانە ..!!

✍ عن (عبدالله بن عباس ) ﷺ من طريق (سعيد بن جبير ) فى قوله : ﴿الٓمٓ ﴾، ﴿حمٓ ﴾، ﴿نٓ﴾ ، قال: اسم مقطع)).[٦] واتە: ناوێکی دابراوە یان پچراوە ..!!

✍ عن (عبدالله بن عباس )ﷺ من طريق (على بن ابى طلحة ) فى قوله : (( ﴿الٓمٓ ﴾ ، ﴿الٓمٓصٓ ﴾ ، ﴿الٓر﴾ ، ﴿الٓمٓر﴾ ، ﴿كٓهيعٓصٓ ﴾ ، ﴿طه ﴾ ، ﴿طسٓمٓ ﴾ ، ﴿طسٓ﴾ ، ﴿يسٓ ۝١﴾ ، ﴿صٓ﴾ ، ﴿حمٓ ﴾ ، ﴿قٓ﴾ ، ﴿نٓ﴾ قال : هو قسم أقسمة الله ، وهو من أسماء الله )).[٧] واتە: ئەم پیتانە سوێنە لە سوێندە کانی (خوای گەورە ) بەناوە کانی خوا..!!

✍ عن (عبدالله بن عباس )ﷺ قال: (( فواتح السور أسماء من أسماء الله )) .[٨] واتە: کردنەوەی دەرگای سورتەکان بە ناوەکانی (خوای گەورە) ..!!

---

[١]- تفسير البغوي المعالم التنزيل (٥٨/١).
[٢] - تفسير البغوي المعالم التنزيل (٥٨/١).
[٣] - اخرجة ابن جرير (٢٠٦/١).
[٤] -البيهقي في الاسماء والصفات (١٦٨) واخرجه ابن جرير (٢٠٨/١).
[٥] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٢/١).
[٦] - اخرجه ابن ابي حاتم (٣٢/١).
[٧]-البيهقي في الاسماء والصفات ص (١٦٣) ، وابن جرير (٢٠٧/١).
[٨] اخرجه ابن ابي حاتم (٢٠٦/١).

ووتەی شوێن کەو تووان لە زانایانی پێشینە چاکە کانی ئەم ئومەتە :

✍ لە ڕێ (الربيع بن انس ) لە (أبى العاليه ) – ڕەحمەتی خوا یان لێ بێت – لە سەر ووتەی ﴿الٓمٓ﴾ دەڵێت : ((ئەم پیتانە بیست نۆ پیتە (٢٩) هەموو زمانەکان بەدەوری دا دەسورێنەوە ،هیچ پیتێك تێدا نیە تەنها ئەوە نەبێت کلیلی یان دەرگای کردنەوەی ناوە لە ناوەکانەوە ، هیچ پیتێك تێدا نیە تەنها ئەوە نەبێت کە ئامرازێکە بۆ بلائی زمان ، هیچ پیتێك نیە تەنها ئەوەنە بێت بۆ ماوەی یان مدەی سەردەمی گەلانە ، هەروەك (عیسی کوری مەریم ) دەڵێت : سەر سورهێنەرە کە ئەوانەی نطقیان هەیە و قسە دەکەن بە ناوەکان ، وە بە پێی ئەوە دەژین و بژێوی مەعیشەتی خۆیان پەیدا دەکەن ، وە چۆن کافر دەبن ..؟!!یان ئینکاری دەکەن ..؟! پیتی دەرگای کردنەوەی ناوی خوایە، واتە : (الله) ، وە پیتی (اللام ) دەرگای کردنەوەی ناوێکی جوان و میهرە بانە ، واتە : (لطيف) ، وە پیتی (الميم ) دەرگای کردنەوەی شکۆمەندیە ، واتە : (مجيد ) ، وەپیتی (الف) واتە : آلاء یان (الله ) ،وە (اللام ) میهرە بانیە واتە: (لطفه ) ، وە پیتی (الميم ) شکۆمەندی ئەو ، واتە: (مجده ) ، وە پیتی (الف) یەك سالە(١) سال ، وە پیتی (اللام ) سی سالە (٣٠ )سال ، وە پیتی (الميم ) چل سالە (٤٠) سال )).[1]

✍ لە ڕێ (عطاء بن السائب ) لە (سعيد بن جبير ) – ڕەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿الٓمٓ﴾ دەڵێت : واتە :(( خودا خۆی باشترینە دەی زانێت )).[2]

✍ لە ڕێ (شبل) لە (ابن ابى نجيح) لە (مجاهد ) – ڕەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿الٓمٓ﴾ دەڵێت : ناوێکە لە ناوە کانی قورئانی پیرۆز )).[3]

✍ لە ڕێ (ابن جريج ) لە (مجاهد ) – ڕەحمەتی خوا یان لێ بێت - لەسەر ووتەی ﴿الٓمٓ﴾ ، و ﴿حمٓ﴾ و ﴿الٓمٓصٓ﴾ و ﴿صٓ﴾ دەڵێت : ، واتە: ئەم پیتانە دەرگای کردنەوە خودا یە بۆ کردنەوەی قورئانی پیرۆز )).[4]

✍ لە (مجاهد ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ئەم پیتانە دەڵێت : (( ئەوە ناوی سورەتەکانە )) .[5]

✍ لە ڕێ (خالد الحذاء ) لە (عكرمة ) – ڕەحمەتی خوا یان لێ بێت – دەڵێت : ﴿الٓمٓ﴾(( (قسم ) واتە : سوێندە )) .[6]

[1] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٢/١) .
[2] -اخرجه ابن جرير (٢٠٩/١).
[3] - اخرجه ابن ابي حاتم ( ٣٣/١) ، وابن جرير (٢١٥/١).
[4] -اخرجه ابن جرير (٢٠٥/١).
[5] -تفسير البغوي معالم التنزيل (١٠٠/١).
[6] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٣/١) ، وابن جرير (٢٠٧/١).

✍ لە (سالم بن عبداللە )- رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت = دەڵیٚت : ﴿الٓمٓ ﴾ ، و ﴿حمٓ ﴾ و ﴿نٓ﴾ واتە: نموونەی ئەم پیتانەش کە ناویٚکن لە ناوە کانی خوای گەورە ، کە براون یان پراوەن لە سەرتایی هەندیٚك لە سورەتەکاندا )).[١]

✍ لە (داود بن أبی هند ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەڵیٚت : (( پرسیارم کرد دەربارەی ئەم پیانەی سەرتایی سورەتەکان یان کردنەوەی هەندیٚك لە سورەتەکانی قورئان بەم پیتانە لە (الشعبی ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەڵیٚت : ئەویش ووتی: ئەی (داود ) هەموو کتابیٚك سر و نهیٚنی خۆی هەیە ، سرو نەهیٚنی قورئانی پیرۆزیش دەرگای کردنەوەی سورەتەکانە بەم پیتانە ، هەر بۆیە بپرسە کە چیت بۆ دەرکەو تووە ..؟! )).[٢]

✍ لە (الحسن البصری ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەڵیٚت : ﴿الٓمٓ ﴾ و﴿طسٓمٓ ﴾ واتە: ئەم پیتانە دەرگای کردنەویە (خوای گەورە ) کردنەوەی سورەتەکان بەم پیتانە دە کاتەوە یان کردنەوەی کتابە یان کردنەوەی قورئانی پیرۆزە )).[٣]

✍ لەریٚ (أسباط) لە ( إسماعیل السدي ) – رە حمە تی خوا یان لی بیت – دەڵیٚت: ﴿الٓمٓ ﴾ ئەو پیتانەن وەر گیراوە لە ناوەکانی (خوای گەورە ) ).[٤]

✍ لە ریٚ (علی بن موسی الرضا) لە (جعفر الصادق ) – رەحمەتی خوا یان لیٚ بیٚت – پرسیاری کرد دەبارەی ئەم ووتانەی یان ئەم پیتانەی لەسەر تایی سورەتەکاندا یەهە وەکو ﴿الٓمٓ ﴾ دەڵیٚت : (الف ) شەش سیفاتە لە سیفەتەکانی (خوای گەورە ) ، سەرەتایە (الف ) چونکە (خوای گەورە ) سەرتایە بۆ هەموو دروست کراوە کانی یان بۆ هەموو بوونەوەرەکانی ، وە (الف ) سەرتایی هەموو پیتە کانی ، چونکە هاوتابوونە (الاستواء) یە عادل دادپەروەرە ، هیچ کات نادادپەروەر نیە یان نا داگەر نیە ، چونکە ریٚگای راستە یان تەختە لە زاتی خۆی دا ، وە تاکە ، (خوای گەورە) تاکە و تەنهایە ، وە چونکە (الف ) تاکە ، بە دورستکارە کە (اللە ) یە ، وە (اللە ) هیچ پەیوەندیەکی بە دورستکراوە کانیەوە نیە ، بەلام دروست کراوە کانی پیٚویستیان بە زاتی (اللە ) ، چونکە (اللە ) دولەمەندە لە ملك و دەسەلاتی خۆی دا دورست کراوە کانی پیٚویستیان پیٚ هەیە ، هەروك پیتی (الف ) پەیوەندی بە پیتەکانەوە نیە ، بەلکو پیتەکانی تر پەیوەندیان بە (الف ) هەیە ، وە ئەم پیانەش پچراوەن بە غی خۆیانەوە ، واتە: چونکە خودا لەهەموو سیفەتەکانی دورست کراوەکانی دا پاك بیٚگەردە ، ومانای (الإلفة) نزیکایەتی یە ، هەر وەکو (اللە ) هۆکاریٚکە بۆ ئینتمای دورست کراوەی دا یان دروست کردن یان نزیکایەتی دورستکراوەکانی دا ، هەروەکو (الف) نزیکایەتیە یان ئینتمایە بۆ سەر پیتەکانی تر ، وە ئەوە هۆکاریٚکە بۆ نزیکایەتی ..))[٥]

---

[١]- اخرجه ابن جریر (٢٠٧/١).
[٢]- عزاه السیوطي إلي ابن المنذر ، وابي الشیخ ابن حیان في التفسیر ، وة تفسیر المأثور (٥٦/٢).
[٣] -اخرجه ابن ابي حاتم (٢٧٤٧/٨).
[٤] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٢/١).
[٥] تفسیر الثعلبي (١٤٠/١).

﴿الٓمٓ﴾ بەلێ لە پێشدا باسمان کرد ، کە ئەم پیتانە لە بیست نۆ سورەتی قورئاندا هەن ئەویش کە ئەم پیتانەن : (الم ) ، (المص) ، (الر) ، (المر) ، (کهیعص) ، (طه) ، (طسم ) ، (طس) ، (ص) ، (حم ) (عسق) ، (ق) ، (ن) (یس) ، هەر وەکو (٦) سورەتە بە (الم) دەسی پێ کردووە ، وە(٦) سورەتی دیکەش بە (حم ) دەست پێکردووە ، بەلی ووتمان کە جیاوازی هەیە لە نێوان زانیانی ئەم ئومەتە دەربارەی ئەم پیتانە ، هەیان زۆر چاکیان پێکاوە هەشیانە نزیکن لە مانەکەی هەشیانە دوورن ، بەلام وە کو هەیانە دەلێن : ئەم پیتانە ئایەتن لە قورئانی پیرۆزدا هەشیانە دەلێن : ئایەت نین ..!! بەلام ئەگەر سەریری ووتەی (ابن تیمیە ) رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : ئەم پیتانە ئایەت نین لە لای زۆر بەی زانایان لە قورئان دا بەلام کوفیە کان کردوویانە بە ئایەتیان داناوە ، بەلام ئەم مصحفانەی ئیستا بە ریوایەتی (حفص ) چاپ کراوە ئەم پیتانە بە ئایەت هەژمار دەکرێن ، وەکو (الم) هەر وەك لە پێشدا باسمان کرد ئەم پیتانە کە زۆر بەی زانایان رای جیایان هەیە ، هەندێك دەلێن : ناوی خوای گەورە یە ، هەندێکی تریش دەلێن : ناوی سورەتەکانن ، یان ئاماژەیە بۆ ئەم ئومەتەی ئیسلام ، یان زۆر ترین مانا هەلدە گرن ، یان ووتوویانە کە ئەم قورئانە لە م پیتانە پێك هاتووە ، ئەمەش مانایەکی نزیك و پەسەندە ، هەروەك کە (خوای گەورە ) بە کافران دەلێت: کە ئەم قورئانە لەم پیتانە پێك هاتووە ، ئێوەش ئەگەر لە تواناتاندا یە قورئانێك وە ئەم قورئانە بنووسن ، بەلام هەر گیز ناتوانن ئایەتێکیش بنووسن وەك ئەم قورئانە ، چونکە هیچ کەسێك ناتوانێت هاوشێوەی قورئان بنوسێت و یان دانەری بێت جگە لە (خوای بالادەست ) بەلکو تەنها یەك سورەت یان یەك ئایەتیش ناتوانن ، کەواتە حیکمەت لەوە نیشانەو (اعجازی ) قورئانە ، هەروەك ( ابن قیم ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : ووتەی راست ئەوەیە کە (ن ) ، (ق) ، (ص) پیتی هیجائین ( خوای گەورە ) هەندێك سورەتی بەم پیانە دەست پێکردووە ، هەیانە لە یەك پیت ، هەیانە لە دوو پیت ، هەیانە لە سێ پیت ، هەشیانە لە چوار پیت پێك هاتووە ، وە هەشیانە لە پێنچ پیت پێك هاتووە وەکو (کهیعص) واتە : لە پێنچ پیت زیاتر نیە ، بەلام لەسەر تایی هەرسورە تێك هاتبن ئەوا بێ گومان دوای ئەم پیتانە باسی قورئان کراوە یان سوێندی پی خواردووە ،یان هەوالی داوە سەبارەت بەو سورەتە ، بەلام سورەتی مەریم (کهیعص) سەرتایە ، واتا (خوای گەورە ) قورئانە کەی لەم پیتان پێك هێناوە ، ووتەکانی لەم پیتانە پێك هێناوە ، وە بۆ پێغەمبەری خوا دا بەزاندووە ، هەروەکو (خوای گەورە ) هیدایەتی بەندەکانی داوە بەهۆی ئەم پیتانەوە وە رێ نیشاندەر و رێ نموویی بەندەکانی کردووە بەم پیتانەوە ، ئەم مەش گەورە ترین نیعمەتی خوایەبی گومان حیکمەتی ئەم پیتانە کەلێك زۆرن تەواو نابن ، بەلێ (خوای گەورە ) هەر بە هۆی ئەم پیانەوە ناو سیفەتەکان و کردەوەکانی خۆی پیشانی بەندەکانی داوە بە هۆی ئەم پیتانەوە ، هەروەها (خوای گەورە ) هەر بە هۆی ئەم پیانەوە نەهی کردووە لە خراپە کاریە کان و قە دەغەکراوە کان ، وە بەلێنی داوە بە بەندەکانی ئەگەر ئیمان بهێنن و کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدە ئەوا پاداشتان بە هەشتە ، هەروەها بەلێنی دا وە هەر بەم پیتانەوە ئەگەر لە خوا نەترسن خراپە کاری ئەنجام بدەن و ئیمان نەهێنن ، ئەو دزۆخ جێگەی کافرو مولحیدو زالم و ستەم کارانە ، بەلێ (خوای گەورە ) خێر و شەر پێشانی بەندە کانی دەدات بە هۆی ئەم پیتانەوە کە ئەم قورئانەی لێ پێك هاتووە ، بێ گومان ئەگەر بەندە تێفکری بروانێتە ئەم پیتانە چەند نیعمەتێکی گەورە یە کە (خوای گەورە ) بەخشی وەتی بە بەندە ئیمانداره کانی خۆی ، لە کۆتایی دا دەلێن : حیکمەتی ئەم پیتانە یەك جار زۆرن هەرگیز لە بن نایەن ، بەلام لە سەرووی هەر هەموویان (خوای گەورە ) خۆی زاناترە بەم پیتانە ..!!

قال تعالى: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢﴾ [البَقَرَة : ٢]

﴿ذَٰلِكَ﴾ واتە: ئەو ،﴿ٱلْكِتَٰبُ﴾ واتە: (کتاب) یان( قورئان) ، ﴿لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ﴾ واتە: هیچ گومانێکی تێدا نیە ( کە لە لایان (خوای گەورە ) وە رەوانە کراوە ، ﴿هُدًى﴾ واتە: رێ نیشان دەرە ،یان رینوویی کەرە ، ﴿لِّلْمُتَّقِينَ ﴾ واتە: بۆ پارێزو لە خوا ترسان ، چونکە پارێز کاران و لەخوا ترسان بە زانست و زانیاری بەسوود و کارو کردەوەی چاکە سوودی لێ وەردەگرن ، چونکە ئەوانە لە پەروەردگاری خۆیان دەترسن و شوێن فەرمان ورێنمایە کانی دەکەون ..!! (ذا) (اسم اشارە) واتە : ناوی ئاماژە پێکراوە بۆ دووری ئەمش لەبەر بەروز پیرۆز شەرف پلە و پایەی ئەم قورئانە ، وە پیتی (اللام للبعد ) واتە : بۆ دووری ، وە پیتی (الکا للخطاب ) بۆ قسە کردن ، هەر بۆیە ئاماژەی پێکراوە بۆ باشترین پیرۆز ترین و گەورە ترین کتێبە ، مەبەست لە کتێبە کەش قورئانی پیرۆزە کە لە سەر وزنی (فعال ) بەمانای (معفول ) دێت ، واتە : (مکتوب) واتە: نوسراوە ، هەر لەبەر ئەمە پێ دلێن : نووسراوە ، چونکە لە (لوح المحفوظ ) نووسراوە ،وە نێردراوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، ﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ﴾ واتە: ئەم کتابە هیچ گومانێکی تێدا نیە ، واتە : هیچ گومانێك هەلناگرێ یان هیچ شتێکی تێدا نیە قابیلی گومان شەك بێت ، ئەو سەرچاوەی کە ئەم کتێبەی لێوە دابەزیوە لە لایەن (خوای تاك و تەنهایە ) کە شوێنی راستەقینە ئەم کتێبە لە (لوح المحفوظ ) لە ئاسمان دا ، بێ گومان ئەم کتێبە کەهیچ شك گومانێك هەلناگری بە پێنووسی (خوای بالادەست ) لە (لوح المحفوظ ) نووسراوە ، لە ماوەی (٢٣) سال دا بۆ پێغەمبەری رۆشنای چاومان ﷺ دابەزیوە بە فریشتەی نێردراوە (جبرائیل ) – علیە السلام - ، چونکە هیچ شك و گومان هەلناگری یان شایەنی ئەوە نیە هیچ کەسێك لە گرۆی ئادەمیزاد شك و گومان لە کتابە دا بکە واتە : قورئان ، بەلێ لە راستی دا ئەم کتێبە گەورەیە ، کتێبێکە بە راستی و حەقیقەت و زانیاری روونی لە خۆ گرتووە ، کە کتێبە کانی پێش خۆی بە هۆی دەست کاری کردنیانەو یان گۆرینی ووشە ورستەکانیان زانیاری راست دروست لە خۆیان نەگرتووە، بەلام ئەم کتێبە یەکێکە لە هە کتێبە راست و دورستەکانی ئەم جیهانە ، چونکە نیشانە و موعجیزە کۆتا پێغەمبەرە ﷺ کە زۆرێك لە پێشاتە بە ناهەکانی تێدا بەدی دەکرێت وە کو نیشانەو موعجیزەکانی ئەم سەردەمە کە رۆژ بە رۆژ خوێنەرو شوێنکەوتووی ئەم کتابە روو لە زیاد بوون دەکات ، ئەمەش بەهۆی ئەم نیشانە موعجیزانەی کە بۆ بەندەی ئیمانداران روون دەبێتەوە لە کات و سەردمەی خۆی دا ، بەلی زانیاریە کان روون ئاشکران موعجیزەکانی روون ئاشکران کەلە کتێبە دا نووسراوە ، هەر بۆیە بە هۆی هیدایەت و رێنمووی کردنی ئەم کتابە رۆژانە خەلکی بە کۆمەل دەستە دەستە شوێنی دەکەوێت ، لە بەر درێژی باسە کە بۆیەباسی موعجیزەکانی ئەم قورئانە یان ئەم کتابە ناکەین لێرە دا بەلام لە شوێنی خۆی دا بەدرێژی باسی دەکات لە هەر موعجیزە نیشانەیە لەم کتابە دا هەبێت بەلام بە راو بۆچوونی من هەر پیتێك لەم قورئانەدا یان لەم کتابە دا موعجیزە نیشانەی (خوای گەورە ) بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ ...!!!

﴿لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾ واتە: جا هیچ گومانیچکی تێدا نیە ، بەهیچ جۆرێك لە جۆرە كان گومان هەڵناگرێ ، واتە : نفی كردنی گومان لە قورئاند دژەكەی دەچەسپێنی ئەویش (یقین ) واتە دلنیایی ، كەواتە دژی شەكە یان گومانە ، بەلێ ئەم كتابە زانیاری دلنیا كەرەوە لە خۆی دەگرێت ، چونكە هاوشێوەی هیچ كتابێكی ئاسمانی نیە كە دەست كاری كرابێت یان گۆڕ درابێت ، یان وەكو كتێبیكی تاریخی نووسرابێت لە خۆ را قەسە و باسی تێدا كرابێت و بۆ زیاد كرابێت ، چونكە لە كاتی دا هاتنە خوارەوەی دا تاكو رۆژی دوایی بەلینی (خوای گەورە) یە پارێز راوە (محفوظه ) هەر وەكو دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩﴾ [الحِجر : ٩] واتە: بەراستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و بێ گومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەكەیت ، وە نایەڵین دەستی ناپاك و خیانەت كاران بەهیچ جۆرێك دەستی تێ بخات و هەموو هەڵێك بۆ دەست كاری كردنی ئەم قورئانە نەزۆكە سەرناگرێ ..!! هەر بۆیە ئەم كتابە هەموو گومان و دوو دلی و شەكێك دە رەوەنێتەوە یان دەسرێتەوە لای دە بات ، بەلێ كاتێ ئەم كتابە یان ئەم قورئانە یەقین و دلنیایی لە خۆ گرت ئەوا بێ گومان هیدایەت و رێنمووی و رێ نیشادەریش لە خۆ دە گرێت بۆ ئیمانداران و لە خوا ترسان و پارێزگاران ئەوانەی بەندەی بە تقوان كە بۆ هەمیشە هیدایەت دەری بەندە پارێزگارە كانە ئەوانەی تەنها و تەنها بۆ خوا دلّ سۆزیان هەیە و لە خوا دەترسن هەموو كارو كردەوەیە كی چاكە ئەنجام دەدن لە پێناوی خوا دا ، وە لە هەموو خراپە كاریەك و قەدەغەكراوێكی ( خوای گەورە ) دوور دەكەونەوە هەر لە پێناوی زاتی (الله ) ، ﴿لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾ واتە: هیچ گومانێكی تێدا نیە ، نەكەم و نە زۆر لە خۆ هەڵناگرێ ، بەلام ئەگەر بروانینە ئەم رستەیە ﴿لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾ ئەم رستەیە رستەیەكی هەواڵە واتە : (خبریە ) بەلام بەلگەیە لە سەر نفی كردنی گومان دەكات لەم كتابە دا واتە : قورئان ، هەروەها مانای نهی كردنیش لە خۆ دەگرێت ، وە ئەوانەی بەمانای نهی تەفسیری دەكەن دەلێن : چونكە گومان هەبووە لەم كتابە دا لە لایەن كافرو دوو رووەكان دا، نەك گومان هەبێت لە لایەن ئیمانداران باوەردارنی موسلمان ، چونكە تەنها لەم سەردەمەشدا ئەوانەی كە كافرو موشركن و مولحید و علمانیە كان ئەوانەی كەپیان دەلێن ئازادی دەربرێن و یان بەناو ئازادی تاكە كەسی یان (حریە تعبیر) یان ئازادی بیرو راو یان وەلاتانی رۆژ ئاوا بۆنموونە وەلاتی (سویدی پەلكە زرینە ) كە زۆر ترین ریژەی ئیلحاد لە وەلاتە كەیان لەم سال دا لە رۆژی ٢٠٢٣/٦/٢٨ لە جەژنی قوربان‌دا لەبەردەم مزگەوتێكی گەورە دا لە وەلاتی سوید قورئانی پیرۆزیان سوتاند لە لایان كەسێكی مولحید و كەسێكی مەسیحی یان گاورە سەر بە حشدی سریان كە بەرگەز عیراقی لە لە دەشتی موصل لە قەرقوش لەدایك بووە ، ئەم كەسە قورئانی سوتاند هەر بۆیە باسی دەكە بۆ میژووی ئەم تەفسیری شعیب بۆ تێگەیشتنی قورئان بمێنی ، منیش هەر لەسەر ئەم رووداوە كە قورئان سوتێنرا لە لایەن وەلاتی سوید بەلێنم بە خوای خۆم دا كە ئەم قورئانە كە هیچ گومانێك لە خۆ هەلناگری بیخەمە نێو سینەم واتە : هەموو قورئان لەبەر بكەم لە سینگم دابێت بۆئەوەی ئەگەر قورئانیان سوتاند ئەم جارە بامنیش لە گەل قورئان بسوتێنی ناحەزان و خیانەت كارانی ئەم قورئانە ،بەلێ گومان لە قورئانە دا تەنها لەلای ئەو كەسانەیە كە كافرو موشریك دوو روو مولحید و بەناو مافی ئازادی را دەربرینە ، هیچ موسلمانێك یان ئیماندارێك گومان لە قورئانە ناكات ، بەلكو بە پێچەوانەوە یەقینی یان دلنیایی تەواوی هەیە بۆ ئەم قورئانە ، چونكە رێبەرێكە بۆ رێ نیشاندەر و رێنمووی و هیدایەتی ئیمانداران ...!!!

هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿إِنَّمَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾﴾ [التَّوْبَة : ٤٥] واتە: بەلکو بەراستی تەنها ئەوانە مولەتت لێ دەخوازن کە باوەر بە (خوای گەورە ) بە رۆژی دوایی ناهێنن ، ئەوانەش کە بۆ هەمیشە دوو دلن و گوماناوین و دلە راوکێیان زۆرە ، بە بەردەوام لە گومانی خۆیاندا سەر گەردان و وێل و دێن و دەرۆن ..!! کەواتە : ئە گەر ئەم کتابە یان ئەم قورئانە لە لای کافرەکان و مولحیدەکان و دوو روو ناحەزانی قورئان جێگای گومانە ، لە راستی دا خودی قورئانە کە لە لای باوەردار هیچ گومانێك هەلناگرێ ، چونکە کافرو مولحیدو دوو رووە کان ناحەزانی قورئان ، هەر بۆ خۆیان ژێری وعەقل هۆشەمەندیان لەدەست داوە ، بۆ خۆیان سەر لێشێواو سەرگەردان دوو دل و راران لە هەموو شتێك ، بەلام بۆ ئیماندار یان باوەردا لە هەر خوێندەوە پیتێکی قورئاندا باوەر یەقین و دلنیایی بۆ زیاد دەکات ، سات بەسات رۆژ بەرۆژ باوەری زیاتر دەبێت و دامەزراوتر دەبێت ، چونکە بێ گومان رێ نیشاندەر رێنمووی کارە بۆ ئیمانداران ، چونکە ئەگەر براونینە (شەك یان گومان ) هەلوەشینەوەی یەقین نە یان دلنیایە ، ئەویش ئەوە یە کە دوو دلە لە نێوان دووشت دا ، بۆ نمونە : بەشێوەیەکی یەك لا کەرەوە قورئان بەراست نازانێت دوو دلە یان  رارایە ، هەروەها نە ئەوە تە بەراستی دە زانێ نە ئەوەتە بەدرۆشی دەخاتەوە بەلکو هەر بە گومان سەیری دەکات ،کەواتە : ﴿رَيْبَ﴾ بەمانای شەك یان گومان دێت ، ئەویش شەك و گومان لە گەل ترس بێت ، یان تاوانبار کرابێت بە گومان یان بە شەك لێ بوون لە نێوان راست و نا راستی دایە ، یان قلق لە دەروونی دا بێت واتە : دژ بەیەك ، بەلام ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم قورئانە هیچ دژ بە یەکی تێدا بەدی ناگرێت کە جێگای شە ك گومان بێت ، ئەم کتابە  لە لایەن پەر وەرگارەوە هاتۆتە خوارەوە بۆ ﷺ کە بەدلنیاییەوە هیچ گومانێك هەلناگرێ ، بۆ ئەو کەسانەی باوەری تەواویان پێ هەیە ، چونکە تەواو دلنیان کە لە لایەن پەروەردگاریان هاتووە چەسپاوە کە ئەم قور ئانە یان ئە کتابە لە لایەن پەروەردگارەو هاتووە ،  هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَـٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢﴾﴾ [السَّجْدَة : ٢] واتە: بە دابەزاندنی ئەم کتابە یان ئەم قورئانە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە هیچ گومانێکی تێدا نیە ..!! هەروەها دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾﴾ [النِّسَاء : ٨٢] واتە : ئەوە بۆ ئەوانەی کەسەرنجی قورئان نادەن لێکی نادەنەوەو لێ ووردنابنەوە ..؟! خۆ ئەگەر لە لایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگە لە (خوای گەورە ) بێ گومان جیاوازی و دژایەتیە کی زۆریان تێدا دەۆزیەوە ..!! ئە گەر سەنجێك لە پێشدا بەدەینەوە کە باسمان کرد ووتمان ﴿الٓمٓ﴾ واتە: بە مانایی سوێند دێت کە زانایان کۆشیان کردووە ئەم دەگەیەنێ ،کەواتە (خوای گەورە ) بە زاتی خۆی سوێند دە خوات بەوەی ئەم قورئانە هیچ گومانێك هەلناگری هەروەك دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَـٰبُ لَا رَيْبَ﴾ [البَقَرَة : ١ - ٢]  واتە: سوێند بێت ئەم قورئانە هیچ گومانی تێدا نیە ، بێ گومان (خوای گەورە زاناترە ) ئەوەی کەتێدا باسی دەکەین تەنها وەك هەل و کۆششیچکە بۆ تێ گەیشتنی ئەم قورئانە بەرز بەرێزە ...!!!

﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ واتە: ڕێنموویی ڕێ نیشاندان سەرچاوەی هیدایەتە بۆ خواناسان یان بۆ لە خوا ترسان یان بۆ پارێزگاران ، لێرە ئەگەر سەیری ووشەی ﴿هُدًى﴾ بکەین ئەم هیدایەتەی تایبەت کردووە بە تقوا داران یان پارێزکاران دا ، چونکە پارێزکاران زیاتر لە هەموو کەسێك سوود لە هیدایەت وەردەگرێت ، هەر وەك (ابن قیم ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت: هیدایەت یان ڕێنمووی و ڕێ نیشاندان کۆتایی نایەت یان کۆتایی نیە ئەگەر بەندە بگاتە هە رپلە یە ك ،چونکە لە سەر ئەم هیدایەتە هیدایەتێکی تر هەیە هەاتکو بێ کۆتایی یە ، چونکە بەندە چەند پارێزکار بیت تەقوای (خوای گەورە ) بکات بەرز دەبێتەوە بۆ هیدایەتێکی تر ، هەر بۆیە بەندە بەردەوام بەرز دەبێتەوە بۆ هیدایەتێکی تر مادەم پارێزکاری یان تەقوا لە زیاد بوون بێت ، چونکە هەر کاتێك کە بەندە پارێزکاری یان تەقوا لە دەست بدات ئەوا بێ گومان هیدایەت و ڕێنمووی لە دەست داوە ، چونکە هیدایەت بە گوێرەی زیاد و کەم کردنی تەقوا کەیەتی ، هەر وەك (ابن عباس ) و (ابن مسعود ) – رحمەتی خوا یان لێ بیت – دەلێن : ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ واتە: ڕووناکیە بۆ لە خوا ترسان .[1] هەروەها (ابن عباس ) –رحمەتی خوای لێ بیت – دەلێت : ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ ئەو ئیماندارانە یان ئەو خاوەن باورانە خۆیان دەپارێزن لە شەریك دانان و بە پێ فەرمانەکانی کار دەکەن ، هەر دووبارە (ابن عباس ) – ڕەحمەتی خوا لێ بێت – دەلێت : ﴿لِّلْمُتَّقِينَ﴾ ئەوانە کە ترسیان لە تۆڵەی (خوای گەورە) یە دەترسن لە وازهێنان لەو شتانەی کە دەیزانن لە شارەزایی ،هەروەها لە (قتادە ) – ڕەحمەتی خوا ی لێ بێت – دەلێت : ﴿لِّلْمُتَّقِينَ﴾ ئەو کەسە یە کە (خوای گەورە ) وەسفی کردووە بەم سیفە تانە لەم ئایەت پیرۆزە دا کە دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣] وە ئەوانەن کە بڕوا بە پەنهانیەکان دەهێنن، ئەو پەنهانیانەی کە ئەندامەکانی هەست و عەقڵیان بە تەنها درکی پێناکات، چونکە ئەو شتە پەنهانانە بە سروشی خوای پەروەردگار نەبێت بۆ پەیامبەرانی نازانرێن، لەوانەش وەکو باوەڕ هێنان بە فریشتەکان، و بەهەشت، و دۆزەخ، و جگە لەمانەش کە خوا و پەیامبەرەکەی صلى الله عليه وسلم باسیان کردوە، ( وە باوەڕیش : وشەیەکی کۆکەرەوە و گشتگیرە، دانان بەخوای پەروەردگار و فریشتەکانی، و کتێبەکانی، و پەیامبەرانی، و دوارۆژ، و قەدەر بەچاك وخراپییەوە دەگرێتەوە، لەگەڵ سەر ڕاست کردنەوەی ئەو دان پێدانانە بەگوفتار وبەکردار، بەدڵ وزمان وجەستە ) لەگەڵ ئەو باوەڕ بونەشیان بە پەنهانەکان پارێزگاری لە بەجێگەیاندنی نوێژەکان دەکەن لەکاتی خۆیدا بەشێوەیەکی دروست و بە پێی ئەوەی خوای پەروەردگار بۆ پەیامبەرەکەی صلى الله عليه وسلم دایناوە..!! لە(ابن ماجە ) – رحمەتب خوای لێ بێت – ریوایەتی کردووە لە (عدی سعدی ) – خوا لی رازی بێت – دە لێت : ))پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بەندە ناگاتە پلەی تقوا یان خۆ پارێزکاران ، تا واز دێنی لەوەی خراپ نیە لە ترسی ئەوەی نەی کات ئەو شتە نەوەك خراپە کاری تێدا بێت ..!!)) .[2] بەلێ ( التقوا ) خۆ پارستنە لەوەی کە ناخۆشە ، چونکە ئەصلەکەی لە (وقى من الوقايە ) وە هاتووە ، دە گێرنەوە دەلێن : (عمری کوری خەتاب ) – خوا لێ رازی بێت – پرسیاری کرد لە(ئوبەی کوری کەعب ) دەربارەی (التقوا) ئەویش پێی ووت : ئایە تۆ ڕێگەیەکی پر درك ودالّ دا رۆیشتووی ..؟! ووتی : بەلێ . ئەویش ووتی : چێت دەکرد ..؟! ووتی : خۆم ئامادە دەکرد و خۆم هەلدە کرد و هەولم ئەدا کە هیچ درکێك بەرم نەکەوێت ..!! (عمری کوری خەتات ) – خوا لی رازی بێت – ووتی : ئا ئەمە یە خۆ پارێزیە بە واتایی (التقوى )..!!

---

[1] - تفسیر ابن کثیر بە کوردی (٧٥/١).
[2] - ابن ماجە (١٤٠٩/٢) حدیث ضعیف .

﴿هُدًى﴾ واتە: شارەزا بوون دوو جۆرە : (رێنمووییی ) و (هیدایەت یان رێ نیشاندان ) :

جۆری یەکەم : رێنمووی کردن بۆ رێگای راست و دورست ، مەبەست پێی بە رێنمووی ئەوەیە کە لە دڵ دا جێگیر بێت وەکو: باوەر یان ئیمان ، بیٌ گومان ئەم رێنموویە (خوای گەورە ) نەبێت هیچ کەس ناتوانێت جێگیرو دا مەزراوی بکات لە نێو دڵ وسینە دا بەندە کاندا ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾﴾ [القَصَص : ٥٦] واتە : بێگومان تۆ ـ ئەی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم ـ ناتوانیت کەسێك کە خۆشت دەوێت سەرکەوتووی بکەیت بۆ رێگای ڕاست، بەڵکو تەنها خوایە کە هیدایەتی هەرکەسێك دەدات بۆ باوەڕهێنان کە خۆی بیەوێت و تەوفیقی دەدات بۆی، وە هەر خوا خۆشی دەزانێت کێ شایستەی هیدایەتە و هیدایەتیشی دەدات ..!!هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۗ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٢٧٢] واتە : ئەی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم تۆ بەرپرسیار نیت لە تەوفیقکردنی کافران بۆ ئەوەی هیدایەت وەرگرن، بەڵکو تەنها خوایە خۆی ئەوەی ویستی لێ بێت لەبەندەکانی سنگی فراوان دەکات بۆ ئاینەکەی خۆی، و سەرکەوتویان دەکات بۆی . وە هەر ماڵێك کە بیبەخشن لەلایەن خواوە سودەکەیتان بۆ دەگەڕێتەوە، وە باوەڕداران نایبەخشنەوە تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای پەروەردگار نەبێت، وە هیچ ماڵ و سامانێك نابەخشن ـ بە ئیخلاصی لەپێناو خوای پەروەردگار ـ پاداشتەکەی وەردەگرنەوە، و هیچی شتێکی لێ کەم ناکرێتەوە، وە لەم ئایەتەدا سیفەتی ( ڕوو = وجه ) ی تێدا جێگیرکراوە و سەلمێنراوە بۆ خوای پەروەردگار بەو شێوەیەی کە لایقە بەخوای پەروەردگار ..!! هەروەها (خوای گەورە دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿مَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُ ۚ وَيَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٨٦﴾﴾ [الأَعْرَاف : ١٨٦] واتە : هەرکەسێك خوای پەروەردگار گومڕای بکات لە ڕێگەی ڕاست ئەوا هیچ کەسێك ڕێنمایکاری نیە، و لێدەگەڕێ لە ناو بێباوەڕی خۆیاندا بە سەرگەردانی بتلێنەوە ..!! هەروەها دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا﴾ [الكَهْف : ١٧] واتە : ئەوەی کە خوای پەروەردگار هیدایەتی بدات ئەوا سەرخراوە بۆ ڕاستی و ڕەوایی، وە ئەو کەسەش کە خوای پەروەردگار سەری نەخات بۆ ئەو کارە، ئەوا هیچ کەسێك نابێت کە یارمەتیدەر و ڕێنیشاندەری بێت بۆ پێکانی ڕاستی و ڕەوایی، چونکە سەرخستن و سەرنەخستن تەنها بەدەستی خوای پەروەردگارە. ..!!

جۆری دووەم : جاری واش هەیە مە بەست لە هیدایەت دان ، روونکردنەوەی حەق و راستیە بۆ ئاشکرا کردنی رێ نیشاندان وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾﴾ [الشُّورَى : ٥٢] واتە : وە تۆ ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - هیدایەتی خەڵکی ئەدەیت و ڕێنماییان ئەکەیت بۆ ڕێگای ڕاستی خوای گەورە ..!! هەروەها دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرٌ ۖ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾﴾ [الرَّعْد : ٧] واتە : ترسێنەریانی لەسزای خوای پەروەردگار . وە هەموو ئوممەتێکیش پەیامبەرێکی هەبووە ڕێنماییان بکات بۆ لای خوای بەرز و بڵند و پایەبەرز ..!!هەروەها دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَىٰ عَلَى الْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَاعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾﴾ [فُصِّلَت : ١٧] واتە : وە سەبارەت بە سەمودیش گەلەکەی ( صالح عَلَيْهِ السَّلَامُ ) بەڕاستی ڕێگای ڕاست و چاکەمان پشاندان، کەچی گومڕاییان بەسەر هیدایەتدا هەڵبژارد، جا بەهۆی ئەوەی کە ئەنجامیان دەدا لە باوەڕنەهێنان بە خوای پەروەردگار و بە درۆدانانیان بۆ پەیامبەرانی هەورەبروسکەی سزایەکی سەرشۆڕکار لەناوی بردن ..!! هەرەوەها (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾﴾ [البَلَد : ١٠] واتە: و هەردوو ڕێگای چاکە وخراپەشمان بۆ روون نەکردووەتەوە ؟

راو بۆچوونی زانایانی پێشینە چاکەکان لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان لە سەر ئایەتی (٢)سورەتی (البقرە)...

✍ لە ڕێ (ابن ابي نجيح ) لە (مجاهد )- رحمه تی خوای لی بیت- ده لیت : (( لە سەرتایی سورەتی (البقره ) چوار ئایەت لە سیفە تەکانی ئیماندارانە ، وە دوو ئایەت لە سیفەتەکانی کافرو بی باروە رانە ، وە سیانزە ئایەتە لە سیفە تەکانی دوو رووە کانە ، وە ئایەتی چل تاکو ئایەتی سەد و بیست لە سیفە تەکانی نەوەی جوو لەکە ن یان باسی نەوەی ئیسرائیل دەکات )) .[1]

✍ هەر لە (مجاهد ) – رحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : (( ئەو کەسانەن لە چوار ئایەتی سەرتایی سورەتی (البقره ) تاکو کۆتایی ئایەتی پێنج سورەتی (البقر )﴿ٱلۡمُفۡلِحُونَ ۝٥﴾ [البَقَرَةِ : ٥] دابەزیوە بەسەر سیفە تەکانی ئیمانداران ، هەروەها دوو یایەت لەدوای دێت دابەزیوە لە سیفەتەکانی واتە: یایەتی شەش و کۆتایی ئایەتی حەوت ﴿عَظِيمٌ ۝٧﴾ [البَقَرَةِ : ٧] دابەزیوە بە سەر سیفەتاکانی کافرو بێ باوەران ، لە ئایەتی حەوت تاکو ئایەتە بیست دابەزیوە بەسەر سیفەتەکانی دوو رووە کان )).[2]

✍ لە (عبد العزيز ) – رەحمەتی خوای لێ بیت – پرسیاری لە ( عطاء بن أبي رباح ) ((کرد دە ربارە ی ئەو کەسانەی کە شاهیدی لەسەر خەلك دەدەن بە هاوبەشی دانان و بێ باوە رای واتە : (شرك و كفر) ، بەلام باوکی رەتی کردەوە ، ئینجا ووتی : من خوێندمەوە کە بۆ ئیمانداران نێردراوە ، هەروەها ووتی : بۆ کافر و بێ باوەر کانیش نێردراوە ، وە بۆ دوو رووە کانیش نێردراوە ، کە ئەوەیە (بسم الله الرحمن الرحيم ) ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢﴾ تاکو ئایەتی( دە) قال تعالى: ﴿عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ۝١٠﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] ئینجا ووتی : نێردراوە بۆ ئیمانداران ، نێردراوە بۆ کافرو بێ باوەران ، نێردراوە بۆ دوو رووە کان )).[3]

✍ لە ڕێ (معمر ) لە (قتاده ) – رەحمەتی خوا لی بیت – دەلیت: (( لە ووتەی یان لە ئایەتی هەشت قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ۝٨﴾ [البَقَرَةِ : ٨] تاکو ئایەتی شانزە قال تعالى: ﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ۝١٦﴾ [البَقَرَةِ : ١٦] دەڵێت : ئەم ئایەتانە دا بەزیون دەربارەی دوو رووە کان )) .[4]

✍ (مقاتل بن سليمان ) – رحمە تی خوا لی بیت – دەڵێت : قال تعالى: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢] وە ئەم ئایەتە کاتێك دا بەزیی (كعب بن الاشرف ) و (كعب بن أسيد ) لە کاتە دا بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگە شەی بۆ ئیسلام دە کرد ، ئەم دوانە ووتیان : هیچ کتابێك دا نەبەزیوە دوای (موسا ) عليه السلام ، واتە: بە درۆیان خستەوە ، ئینجا (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دا بەزاندە خوارەوە کە دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾ [البَقَرَةِ : ٢] )) .[5]

---

[1] -تفسير مجاهد ص(١٩٥) .
[2] - اخرجة ابن جرير (٢٤٦/١).
[3]- اخرجه ابن ابي نعيم في حلية الأوليا (١٩٣/٨).
[4] -اخرجه عبد الرزاق (٣٩/١).
[5] - تفسير مقاتل بن سليمان (٨١/١).

✍لەرێ (ابن جريج ) –لە (عبدالله بن عباس ) لە سەر ووتەی : (( ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾ واتە : ئەوە کتێبێ کە )) .[١]

✍ لە رێ (ابي الضحى ) –رە حمە تی خوای لی بیت – لە (عبد الله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – دە لێت : ((مانای ئەوە کتابێکە واتە: قورئانی پیرۆز )).[٢]

✍ (سعيد بن جبير ) – رەحمەتی خوا لی بیت – دەلێت : واتە : (( اللوح المحفوظ )) .[٣]

✍ لە رێ (الهذيل بن حبيب ) لە ( ابي بكر الهذلي ) لە ( عكرمة ) – رەحمەتی خوا یان لی بیت – ئەوە (تورات ) و (ئەنجیلە ) وە کتابێکی پێشکەوتووە )).[٤]

✍ لە (الكسائی ) – رە حمە تی خوا لی بیت – دەلێت : ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئاماژەیە بۆ قورئان لە ئاسمانە وە نەهاتۆ تە خوارەوە هیچ کتابێك دوای ئەم قورئانە )).[٥]

✍ لە رێ ( ابي بكر الهذلي ) لە (الحسن البصرى ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دە لیت : لە سەر ووتەی ﴿ٱلۡكِتَٰبُ﴾ واتە: قورئان )) .[٦]

✍ لە (عطاء بن السائب ) –رە حمە تی خوای لی بیت - دە لیت : ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾ واتە : ئەم بەڵێنەیە کە لە رۆژی دوایی دا پێتان دراوە )).[٧]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلێت : ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾ واتە : مانای ئەو کتابە ئەوەیە کە جوولەکەکان یان بنی ئیسرائیل باوەری پێ نەکرد بان کافر بوو پێی )).[٨]

---

[١] - اخرجه ابن جرير (٢٢٨/١).
[٢] - اخرجه ابن جرير (٢٣٢/١) ، والحاكم (٢٦٠/٢).
[٣] -تفسير الثعلبي (١٤١/١)
[٤] -تفسير مقاتل بن سليمان (٤١/١).
[٥] -موسوعة التفسير الماثور(٦٥/٢).
[٦] - اخرجه ابن ابي حاتم (٣٤/١).
[٧] - تفسير الثعلبي (١٤١/١).
[٨] -تفسير مقاتل بن سليمان (٨١/١).

✍ لە ڕێ (السدی ) لە (ابی مالك ) و (ابی صالح ) لە (عبداللە بن عباس )- خوا لێ ڕازی بیت – لە سەر ووتەی : ﴿لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾ یعنی (لاشك فیه ) واتە : هیچ گومانێك نیە )) .[١]

✍ لەرێ (عبدارحمن بن سعود الفزاری ) لە (ابی الدرداء ) – خوا لی ڕازی بیت –دەلیت: (( واتە: گومان یان شك لە كفر ، یان باوەر نەبوون و گومان كردن )).[٢]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – ڕەحمەتی خوای لی بیت – لە سەر ووتەی ﴿لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾ دەلێت : هیچ گومانێكی تێدا نیە كە ئەم قورئانە كە لە لایەن (خوای گەورە )وە هاتۆتە خوارەوە بۆ سەر ﷺ )).[٣]

✍ لە ڕێ (السدی ) لە (ابی مالك ) و (ابی صالح ) لە (عبداللە بن عباس )- خوا لێ ڕازی بیت – لە سەر ووتەی ﴿هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ دەلێت : واتە : ڕووناكی پارێزكارانە )).[٤]

✍ لە ڕێ (عطاء بن دینار ) لە (سعید بن جبیر ) – ڕەحمەتی خوای لێ بیت – لەسەر ووتەی: ﴿هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ دەلێت : واتە : نیشاندان و ڕوونكردنەوە بۆ پارێزكاران )).[٥]

✍ لە (قتادە ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی :﴿هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ دەلێت : واتە: (خوای گەورە ) دەیكاتە ڕێنمووی ڕۆشنایی ،بۆ ئەوكەسانەی كە باوەرو یەقینی تەواویان پێ هەیە ، وە ڕووناكیشە بۆ چاكە كاران یان پارێزگاران )).[٦]

✍ لەرێ ( الهذیل بن حبیب ) لە ( ابو روق عطیة بن الحارث الهمداني ) – ڕە حمە تی خوای لی بیت – لە سەر ووتەی :﴿هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ دەلێت : واتە: كرامەت وشەرف و شكۆمەندیە بۆ هیدایەت و ڕێنمووی كردن )).[٧]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت- لە سەر ووتەی ﴿هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾: دەلێت: ئەوە قورئانە ڕێنمووی كەرە و ڕێ نیشاندەرە لە گومرایی و تاریكی دا )).[٨]

---

[١] -اخرجه الحاكم (٢/٢-٦٠).
[٢] - ابن ابي حاتم (٣٤/١) ، واخرجه احمد في الزهد ص ١٤١ .
[٣] تفسير مقاتل بن سليمان (٨١/١).
[٤] -اخرجة ابن جرير (٢٣٤/١).
[٥] -اخرجة ابن ابي حاتم (٣٤/١).
[٦] - اخرجه ابن جرير (٢٣٨/١-٢٣٩).
[٧] - تفسير مقاتل بن سليمان (٢٩/١).
[٨] - تفسير مقاتل بن سليمان (٨١/١).

✍ لە ریّ ( السدى ) لە (ابى مالك و ابى صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – رزاو رەحمەتی خوایان لە سەر بێت- لەسەر ووتەی : ﴿هُدًى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ دە لێت : واتە : ئیماندرانن )).[1]

✍ لە ریّ (ابن اسحاق ) بسندە لە ( عبدالله بن عباس ) – رزاو رەحمەتی خوایان لەسەر بێت – لەسەر ووتەی :﴿هُدًى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ دەلێت : واتە : هۆشداریە بۆ ئەوانە کە لەسزای (خوای گەورە ) ، وە وازهێنان و نەزانیان لە رێنمویی هیدایەت دان ، وە هیواو خۆزگەیان هەیە بەر رەحمەتی خوا بکەن ، وە پە سەند کردن وبەراستی زانینی کە بۆیان هاتووە واتە: (قورئان یان کتاب ..)).[2]

✍ لە ریّ (أبي روق ) لە (الضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) – رزاو رە حمە تی خوا یان لی بیت – لە سە ر ووتی: ﴿هُدًى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ دەلێت : واتە: ئیمانداران پارێزکارن یان خۆ پارێزن لە هاوبەشی دانان یان شرك ،وە گوێرایەلی کارو فەرمانەکانی منن)).[3]

✍ لەریّ (سفیان ) لە (رجل ) لە (الحسن البصری ) – رزاو رەحمەتی خوا یان لیّ بیت –لەسەر ووتەی : ﴿لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ دەلێت: واتە: خۆیان دەپارێزن لە حرام کراوە کانی (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، وە فەرمان و واجبە فەرزە کانی (خوای گەورە ) وپێغەمبەرەکەی ﷺ بە چاکی ئەدا دەکەن یان ئەنجام دەدەن )).[4]

✍ لە ریّ ( سعید بن ابي عروبة ) لە (قتادة ) – رزوا رە حمە تی خوایان لی بیت- لە سە ر ووتە ی : ﴿هُدًى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ دلیت: واتە: ئەوانەن کە ئاوەلناویچك یان وصف و سیفە تێکیان بە سەر دا سەلمێنراوە یان جێگیر کراوە بە م سیفە تانە کە ئەمانەن کە (خوای گەورە ) دە فەرمووی : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣﴾ [البَقَرَة : ٣] واتە : {هەندێك لە سیفاتی مرۆڤی خۆپاریزو موتتەقی} [ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ ] یەکێك لە سیفاتی موتتەقی ئەوەیە کە ئیمان بە غەیب ئەهێنن ئەو شتانەی کە شاراوەیەو نادیارەو خوای گەورەو پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەواڵیان پێ داوە باوەڕیان بە هەمووی هەیە [ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ ] وە نوێژەکانیان ئەنجام ئەدەن بە ڕوکن و مەرج و واجب و خشوع و سوننەت و شێوازەکانی و لەکاتی خۆیدا [ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ (٣) ] وە لەو ماڵەیشی کە پێیان بەخشیون نەفەقەی منداڵ و خێزانیان دەکەن و زەکاتی ماڵەکەیان ئەدەن..!!

---

[1] - اخرجه ابن جرير (٢٣٨/١).
[2] -سيرة ابن هشام (٥٣٠/١).
[3] -اخرجه ابن جرير (٢٣٨/١-٢٣٩).
[4] -اخرجه ابن جرير (٢٣٧/١).

✍ لە (ابى بكر بن عياش ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت: پرسیارم لە (الاعمش) كرد دەربارەی ووتەی : ﴿لِّلۡمُتَّقِينَ ﴾ دە لێت : ئا بەم شێوەیە وەلامی دامەوە ، ووتی : منیش پرسیارم لە (الكلبى ) كرد ووتی : ئەوانەی خۆیان دە پارێزن لە گوناهە گەورە كان )).[1]

✍ لە (سفيان ثوري ) –رەحمەتی خوای لی بیت = دەلێت : بۆیە ناویان لێنراوە (المتقين ) چونكە ترسیان لەوە هەیە ، كە ئەوەی لێ ناترسێت ، واتە: خۆیان دەپارێزن لەوی كە خۆیان لێی ناپارێزن )). [2]

📖 عن (عطية السعدى ) وكان من اصحاب النبى ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ : ((لا يبلغ العبدُ أن يكون من المتَّقينَ حتى يدعَ ما لا بأس به حذرًا لما به البأس )). [3] واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : پلە و پایەی بەندە ناگاتە پلە و پایەی لە خوا ترساوان و خاوەن (تقوا ) كان هەتا واز نەهێچنی لە شتانێ كە هیچی تێدا نیە ، لە ترسی ئەوەی نەوە كو بیكەوێتە نێو شتێكی حرامەوە ..!!

📖 لە رێ (أبى عفيف ) لە (معاذ بن جبل ) –رزاو رەحمەتی خوا یان لی بیت – دەلێت: ((لە رۆژی قیامەت دا خەلكی لە شوێنیك دا بەند دەكرێن یان قەتیس دەكرێن ، بانگ كەرێك بانگ دەكات : كوا لە خوا ترساوان ..؟! كوا (المتقون ) ..؟! ئەوانیش لە نێو قەفەزیك دا وەستاون یان لە شوێنیك وەستاون كە بە پەرژین یان سیاج دەورە دراوە ، لە بەرانبەر میهرەبانی خودا ، هەروەها (خوای گەورە ) هیچ شتێكی لێ شاراوە نیە هیچ شتێكیش پەردە پۆش ناكات ، دەفەرموویت : كێن لەخوا ترساوان یان (من المتقون ) ..؟! هەروەها ئەو خەلكانەی كە خۆیان دەپاراست لە شرك هاوبە شی دانان و بەندەیەتیان نە دە كرد بۆ بتەكان ، تنها باندایەتی (خوای گەورە ) یان دە كرد ، وە بە دلّ سۆزی بەندایە پەروەردگاری خۆیان دە كرد ، ئەوانە بۆ نێو پە هەشت دا تێ دە پەرن )).[4]

✍ لە (ابى الدرداء ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەلێت : باشترین (التقوى) یان خۆ پارێزی ئەوە یە كە بەندە لە خوا بترسێت ، هەتاكو خۆپارێزی لە (مثقال ذرة ) یەكیش بێت یان گەردیلە یەكیش بێت ، هەتاكو وازهێنان لە هەندێك شت دا دەیبینی ترست لە حەلال و حرام دا دەبێت ، ئەوا دەبێت پەردەیەك بیت لە نێوان حەرام و حەلال دا )).[5]

[1] - اخرجه ابن جرير (٢٣٨/١).
[2] -عزاه السيوطي إلى (ابن ابي الدنيا ) ، و موسوعة تفسير المأثور (٧٠/٢).
[3] -سنن الترمذي برقم (٢٤٥١).
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٥/١).
[5] - عزاه السيوطي غلى احمد في الزهد ، وابن ابي الدنيا ، موسوعة تفسير المأثورة (٧١/٢).

📖 لە (ابی هریرە ) – خوا لی رازی بت - لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((أتدْرون ما أكثرُ ما يُدخِلُ النارَ قالوا : اللهُ و رسولُه أعلمُ ، قال : ألاجوفانِ : الفرجُ و الفمُ ، و ما أكثرُ ما يُدخِلُ الجنَّةَ ؟ تقوى اللهِ و حُسنُ الخُلُقِ )).[1]

واتە: ئایا دەزانن زۆرینەی خەلیکی دەچنە نێو ئاگری دۆزەخ کێن ..؟! ووتیان (خوای پێغەمبەرەکەی چاکتر دە زانێت ) فەرمووی : ( الاجوفان) واتە: لەسەر زمانە کانیان کە بە خراپی بەکار دەهێنن یان لەسەر داوین پیسی و فسادی فاحیشە کردنیان ، وهەروەها فەرمووی : دەربارەی زۆرینەی ئەو کەسانە کە دەچنە نێو بەهەشتەوە ، ئەوانەن کە خۆپارێزن لە هاوبەشی بۆ خوا دانان خاوەنی تقوا و خۆ رەوشت ئاکاری بەرز و جوانن ..!!

✍ لە (ابی هریرە ) – خوا لی رازی بیت – دەڵێت : ((پیاوێك ووتی : (التقوی ) چیە ..؟! ئەویش ووتی : ئەگەر رێگایەکت گرتە بەر جەنگاڵ ودرك دار بوو ، ووتی : بەڵی. ووتی : کەواتە تۆ چی دەکەیت ..؟! ووتی : ئەگەر بینیت جەنگاڵ و درك و دارە لێ دوور دە کەیتەوە یان خۆت ئامادە دەکەیت بەلای دا تیپەر ناکەیت یان خۆتی لی هەلدەکەیت ، فەرمووی ئەمە (التقوی) یە یان خۆپارێزیە)).[2]

✍ لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت :((خۆپارێزی لە هاوبەشی دانان ، خۆپارێزی لە گوناهە گەورە کان ، خۆپارێزی لە فواحش و داوین پیسی و بلاو بوونەوەی فسادی و گەندەلی )).[3]

✍ لە (ابی العفیف ) هاوەلی (معاذ بن جبل ) بوو – رەزاو رەحمەتی خوا یان لی بیت – دەلیت : ئەو کەسانەی ئەهلی بەهەشتن ، ئەو خەلکانە لە چوار جۆر پێك دێن لە بەهەشت دا : پارێزگاران یان (المتقین ) ، لەگەل (سوپاس گوزاران یان (الشاکرین ) لەگەل (لە خوا ترساوان یان (الخائفین ) ، لەگەل خاوەنانی لای راست ئەوانە کردەوە کانیان بە لای راستەوە وەرگرتووە ..!!)).[4]

✍ لە رێ (عاصم ) لە (طلق بن حبیب ) رە زاو رە حمە تی خوا یان لی بیت – دە لیت: (( (التقوی ) کۆمان دەکاتەو بۆ قسەی ئاسان بۆ گیرانەوە کان ..؟ دەڵێت : (التقوی) کار کردن بە گوێڕایەلی فەرمانە کانی (خوای گەورە ) ، ئەمەش دەبێتە رووناکی خودای گەورە ، وە تکاکردن بۆ بە زەیی خوای گەورە ، (التقوی ) واتە : وازهێنان لە گوناهو خراپە کاری لە پێناوی (خوای گەورە ) دا ، ئەمەش دەبێت ە رووناکی خوای گەورە ، وە ترسان لە سزای (خوای گەورە ) ..!! )).[5]

[1] -صحيح الاداب المفرد برقم (٢٢٢).
[2] -عزاه السيوطي إلى (ابن ابي الدنيا ) في كتاب التقوى ، موسوعة تفسير المأثورة (٧١/٢).
[3] - تفسير البغوى (٦٠/١).
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (١٣٠٨/٤).
[5] -ارخرجة ابن ابي شيبة (٤٨٨/١٣).

✍ لە ( عمر بن عبدالعزيز ) - رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : (( (التقوى خوای گەورە ) تەنها ئەوە نیە بەرۆژوو بیت لە رۆژ دا یان هەستیەوە شەو نوێژ بکەیت لە شەو دا ، وە تێکەلاو بوونە لە نێوان ئەوانەدا ، بەلام خۆپارێزی بۆ خوا یان تقوى الله : وازهێنانە لەوەی کە خودا حرامی کردووە ، وە ئەنجامدانی واجب و فەرمان و فەرزە کانی (خوای گەورە ) لە دوای ئەوەش دەبێتە زیاد بوونی رزق و رۆزی خێر لەدوای خیری بەدوا دا دێت ..!! )).[١]

✍ لە (الحسن البصري) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : هێشتا (التقوى ) ب خواپەرستان پێویستە هەتا وازهێنانیان لە زۆرێك لە حەلال کراوە کان ، لەترسی ئەوەی نەك حەرام بن )).[٢]

✍ لە رێ (جعفر ) لە (ميمون بن مهران ) – رەزاو رەحمەتی خوا یان لێ بێت – دەلێت : پیاوێك نابێتە بە تەقوادار هەتاکو لێ پرسینەوە لەگەل نەفسی خۆیدا نەکان زۆر بە توندی لەوەی لە گەل هاوبەشە کەی دا دەی کات ، هەتاکو دە زانێت ئەو خواردنەی چۆنی دەست دەکەویت ..؟! یان لە کوێی پەیایی کردووە ..؟! یان هەتاکو دەزانیت ئەم جل وبەرگەی چۆن دەست کەوتووە چۆنی پەیدا کردووە ..؟! وە یان ئەو خواردنەوەیەکی چۆن دەست دەکەوێت و یان چۆن بەچی پەیدای کردووە بۆ خوا ردنەوەی ..؟! بێ گومان هە موو بەندەیەکی لە خوا ترس تقوادار دەبێت بزانێت جۆن پیداویستیە کانی پەیدا دەکات ..؟! ئایا بە حرام یان بە حەلال ..؟!

✍ لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لێ بیت – دەلێت : کاتێك (خوای گەورە ) بەهەشتی دروست کرد ، پێ فەرمو: قسە بکە ئەویش ووتی : خۆشبەختن تەقوا داران یان لە خوا ترسان یان خوا پەرستان یان چاکە کاران ...)).[٣]

✍ لە (مالك بن دينار ) – رەحمەتی خوا لی بێت – دەلێت : رۆژی دوایی یان قیامەت زەماوەندی تقوا دارانە یان لە خوا ترسان ، یان چاکە کارانە یان پارێزکارانە ...).[٤]

✍ لە (سفيان الثوري) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : ((المتقي : ئەوە کە سەیە کە لە دونیا دا کەمترین ترسی هەبووە بەلکو ترسی لە قیامەت بووە )).[٥]

✍ لە (عبدالله بن المبارك ) – رەحمەتی خوای لێ بێت- دەلێت: (( داود -عليه السلام- بە سلیمانی کوری – عليه السلام – ووت : ئەی کوری خۆم ، دەرئەنجامی تقوى لە هەرپیاوێك دا لە سێ شت دەر دەکەوێت : رەوشت و ئاکاری جوانی پشت بەستن بە (خوای گەورە ) ئەویە کە گرنگی بێت دە دات ، وە رەوشت ئاکاری جوانی رازی بوون بەوەی کە پێت دەدات ، وە بە رەشت و ئاکاری جوان و باش بەوە ی کە زاهیدێکی لەوەی کە لە دەست چووە ...).[٦]

---

[١] -عزاه السيوطي الى ابن ابي دنيا ، موسوعة تفسير المأثورة (٧٢/٢).
[٢] - عزاه السيوطي الى ابن ابي دنيا ، موسوعة تفسير المأثورة (٧٢/٢).
[٣] - اخرجة ابن ابي الدنيا في صفة الجنة ص(٣٩)،
[٤] - عزاه السيوطي الى ابن ابي دنيا ، موسوعة تفسير المأثورة (٧٣/٢).
[٥] -تفسير الثعلبي (١٤٣/١) .
[٦] - عزاه السيوطي الى ابن ابي دنيا ، موسوعة تفسير المأثورة (٧٤/٢).

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣﴾ [البَقَرَةِ : ٣]

﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ﴾ ئەوانەی کە باوەر دەهێنن ، ﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾ بە شتە پە ناهاکان و نادیارە کان ، ئەو شتە پەناهانەی کە بە (حواس خمسە ) واتە: پێنج هەستیارە کە یان عەقلی مرۆڤ هەستی پێ ناکرێت ، لە رێگەی وەحی و نیگایەوە نەبێت ، وەك : باوەر بە فریشتە کان و بە هەشت و دۆزەخ و شتی تریش ...) ، ﴿يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژە کانیان دەکەن بە رێك و پێکی لە کاتی خۆیدا ئەنجامی دەدەن ، ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣﴾ لەوەی کە کردوومانە بە رزق و رۆزیان دەب خشن لە بەر رەزامەندی( خوا ی گەورە ) ...

مەبەست لە ووشەی ﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾ واتە : شتە پە ناهاکان و نادیارە کان کە لە سەرووی عەقلی مرۆڤە وە یە هەستی پێناکات ، بەتایبەتی زاتی (خوای گەورە ) کە زۆر بەی خەلکی مولحید لە رابردوو دا وەکو فیرعەون و ستەم کارە کانی را بردوو ، یان لەم سەردەمەی ئیستا مولحیدەکانی ئەم سەر دەمە باوەری پێناکەن کە پێیان وا یە عەقل و زانست لە سەر ووی هەموو شتێکە ، یان باوەر بە قیامەت و رۆژی دوایی ناکەن یان باوەریان حەشر کردن زیندوو بوونەوە نیە ، یان باوەر یان بە بە هەشت و دۆزەخ پردی سیرات نیە ، هەروەها باوەر یان بە فریشتە کانیش نیە ، بەلکو تەنها باوەر یان بەم شتانەیە کە لە بەر چاومان دان ، ئەوانەی لەبەر چاو مان نیە باوەری پێناکەن ،بەلام ئیمەی ئیماندار یان باوەرداری موسلمانی راستە قینە باوەرمان بەهەموو ئەمانە هەیە کە لە قورئان و فەرموودە صحیحە کانی پێغەمبەری خوا ﷺ دا هاتووە ، بە وەحی نیگا بۆ پێغەمبەرەکەمان هاتووە باوەری تەواومان هەیە بە پیت بە پیتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو دەقی قورئان و فەرموودە بە ئیمە گەیشتووە ، هەر بۆیە ئێستا بۆ ئێمە (غیبە) شتە کان نادیار و ناروون بۆ ئێمە ، نازانین ئەمانەی کە قورئان و فەرموودە کان باسیان تیچدا کردووە چەندە ..؟! جۆنە ..؟! کات و شوێنی نازانرێت ..؟! بەلام باوەری تەواومان پی هەیە چونکە لە لایەن (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆ مان رەوانە کراوە باوەرو یەقینی تەواومان پێ هە یە ، هەروەك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئیمامی احمد – رەحمەتی خوا ی لێ بێت – ریوایەتی کردووە ، لە (انس بن مالك ) –خوای لێ رازی بیت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ دە فەرموویت : ((وَدِدْتُ أنِّي لَقِيتُ إخواني . قالَ : فَقالَ أصحابُ النَّبيِّ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ : نَحنُ إخوانُكَ ؟ قالَ : أنتُمْ أصحابي ، ولَكِن إخواني الَّذينَ آمَنوا بي ولم يَرَوني )) [١] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : زۆرم پێ خوشە کە براکانم ببینم ، هاوە لان ووتیان : ئەی ئێمە برای تۆ نین ..؟! ئەویش فەرمووی : ئێوە هاورێ و یاری منن ، بەلام براکانم ئەو کەسانەن کە لە دوایی ئێوە دێن و ب ئیمان و باوەرم پێ دەهێنن ، لە کاتێدا ئەوان منیان نەبینیوە ...!!

[١] -اخرجە احمد (١٢٥٧٩) .

ووشەی ﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾ لێرە دا بە تاك هاتووە نە وەك بە كۆ هاتبێت ، بەلام (ال ) مانای كۆ دە گەیەنێ ، واتە : هەموو پەناهەكان یان هەموو شتە نا دیارە كان دەگەیەنێ ،كە لە قورئان و فەرموودە باسكراوە یان بە دەق هاتووە ، بۆ (المتقین ) یان چاكە كاران و پارێزكاران ئەوانە باوەری تەواویان پی هێناوە ، هەروەها (المتقین ) نوێژە كانیان بە رێك و پێكی ئەنجام دەدەن ، وە ووشەی ﴿يُقِيمُونَ﴾ یان (الإقامە ) بە مانای بەردەوام بوون دێت لە سەر ﴿ٱلصَّلَوٰةَ﴾ واتە : هەلسان بەو كارو كردە وانەی كە نوێژ داوای دەكات ، بێ گومان نوێژە كان دەبێت بەندەی خوا بەرێك پێكی ئەنجامی بدەن ، هەر وەكو پاك و خاوێنی دەست نوێژ شووشتن و وە پاك بێگەردی لە بیرو باوەری راستەقینە ، وە دەبێت دلّ و دەروون دەست و دەمی دوور لە خراپە و فسادی و فاحیشە بێت ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ٤٥﴾ [العَنكَبُوت : ٤٥] واتە: ئەمە بخوێنەرەوە لەم قورئانەی كە بۆت دا بەزێنراوە ، وكاری پێ بكە ، و نوێژ بە رێك وپێكی بەجوانی ئەنجام بدەن ، چونكە بێ گومان پارێزگاری كردن لە نوێژ رێگری دەكات لە خاوەنەكەی لە سەر پێچی و خراپە كاری فسادو فاحیشە ،وە ئەوەی كە نوێژ بەجوانی ئەنجام بدات بە پایە و مەرجە كانیەوە ، دلی رووناك دەبێتەوە ، و باوەری زیاد دەكات ،وە ئارەزووی كردنیچاكەی زیاتر دەبێت ، وە ئارە زوو كردنی شەر خەراپە كاری كەم تر دەبێتەوە یان هەر نامێنێت ، وە بێگوما زیكرو یادی (خوای گەورە ) لە نوێژە كاندا وە جگە لە نوێژە كانیش گەورە ترو چاكتر باشترە لە هەموو شتێكە لەم دونیایەدا ، وە بێ گوما (خوای گەورە ) بە هەموو شتە كان زاناو دانایە كە ئەنجامی دەدات ، لە چاكەبێت یان لە خراپە ، وە لە سەر ئەمە ش تەواو ترین و كامل ترین پاداشت دە داتەوە بە بەندە كانی خۆی ..!! ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ ئینجا دەفەرموی ئەوەی كە پێمان داون دەبەخشن ، ئەم بەخشینە دوو بەشە :

یەكەم : ئەوەیە كە ئیماندار یان باوەردار پێی وایە هەرچی هەیەتی هەر هەمووی پەروەردگای خۆی پێ داوە وە كو ئەمانەتێك وەری گرتووە لای ئەوە ..!!

دووەم : ئەوەیە كە ئیماندار یان باوەردار لەوەی كە پێ دەراوە كەسانی تر لە بیر نەكات ، ئەمەش بۆ پەیوەندی مرۆڤە كان لەگەل مرۆڤە كان یان پەیوەندی باوك بۆ خێزانە كەی یان برا بۆ برا كەی یان خەرجی كردنی خاوخێزانی و فەقیر هەژاران لێ قەوماوان دەگەرێتەوە ، وە لە هەموو كردارێكی چاكە دا پەیوەندی نێوان بەندە بە (خوای گەورە ) هەیە چونكە ئەنجامدانی فەرمانی ئەو زاتە هەر وەك لە نوێژ دا بەندە دەلێت : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾ واتە : هەر تۆ دە پەرستین ، بەندە تەنها بۆ خۆی ناژیت و ئەگەر بەندەی راستە قینە ی خوا بێت بەلكو دەبێت بۆ سەرجەم كۆمەلی ئیمانداران و موسلمانان بژیت ..!!

جا ئەگەر سەرنجێك بدەین لە ووشەی ﴿يُنفِقُونَ﴾ مرۆڤەکان باش بزانن ئەوەی لەم سەر زەمینە دایە ئەوەشی لە ئاسمان و دەریاو زەریاکان دایە هەر هەمووی مولکی خودایە ،بێ گومان رزق رۆزیش هەر لە لای ئەو زاتەیە دە بەخشێت بە سەر هەموو مرۆڤەکاندا بە پێ قسمەت ونسیبیان کە جەندیان بۆ براوە تەوە ، چونکە هەموو رزق و رۆزیەکیش کە هەیە هەر هەمووی (خوای گەورە ) دەبەخشێت ، ئەوەی کە دیداتە بە مرۆڤەکان بە ندازەی پێویستی مرۆڤەکان رزق رۆزی دەنێرێت ، پاشان (خوای گەورە ) لەبەر ئەو (حیکمە) تەی کە خۆی زانا و دانایە پێی هەندێك دەولەمەند دەکات و هەندێکیش فەقیر وهەژار دەکات ، ئەمەش بێ گومان هەر دووکیان بۆ تاقی کردنەوەیە چونکە ژیانی دونیا تەنها وەك سەفەرێك وایە دێت و دەروات ژیانی هەتا هەتایی قیامەت و رۆژی دوایی یە کە ئەمە ژیانێکی هەیشەیە جا بەندەی هۆشمەند و ئیماندار لەوەی تێدەگان کە ژیانی دونیا بە م هەموو کات شتە سەر سورهێنەکانیەوە هیچ قیمەت و بەهای نیە ..!!بەلکو نەدولەمەندی و نەهەژاری نیشانەی رەق لێ بوونەوە خۆشەویستی نیە ، مرۆڤی دەولەمەند دەبیچت بزانێت ئەو سەروەت سامانەی هەیە هی خۆی نیە دەروات ، بەلکو بەشێکی هی خەلکی یە بە ئەمانەت لە لای ئەوە دەبێت بە بەخشێت ، چونکە وەك ئەمانەتێك لای ئەوە ، جا دەبێت بزانێت کە چی لەو ئەمانەتە دەکات کە (خوای گەورە ) پێ بەخشیوە ، جۆن چەند بەکێ دەبەخشێت چونکە بێ گومان پرسیاری لێ دەکرێت لەهەموو شتێك کە (خوای گەورە ) پێ بەخشیوە،

📖 لە(عبداللە بن مسعود ) ﷺ لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت : (( لا تزول قدم ابن آدم يوم القيامة من عند ربه ، حتى يسأل عن خمس ، عن عمره فيم أفناه ، وعن شبابه فيم أبلاه ، وماله من أين أكتسبه وفيم أنفقه ، وماذا عمل فيما علم )).[1] واتە: لەرۆژی قیامەت دا نەوەی ئادەم قاچی نابزوێت هەتا لەسەر پێنچ شت پرسیاری لێ دەکرێت ..؟! تەمەنی لە چی بە سەر برد ..؟! گەنجیەتی چۆن بەرێکرد یان بەسەر برد ..؟!، مال و سامانەکەی جۆن پەیدا کرد ..؟!وە لە چی دا خەرجی کرد یان صرفی کرد ..؟!چ کارێکی کرد بەو زانست زانیاریە کە فێر بوو ..؟!

📖 لە(أبی هريره ) ﷺ لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أتدرون من المفلس ..؟! قالوا : المفلس فينا يا رسول الله من لا درهم له ولا متاع ، قال رسول الله ﷺ : المفلس من أمتي من يأتي يوم القيامة بصلاته وصيامه وزكاته ويأتي قد شتم هذا وقذف هذا ، وأكل مال هذا ، وسفك دم هذا ، وضرب هذا فيعقد فيقتص هذا من حسناته ، وهذا من حسناته ، فإن فنيت حسناته قبل أن يقتص ما عليه من الخطايا أخذ من خطاياهم فطرح عليه ثم طرح في النار )).[2] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئایا دەزانن موفلیس کێ یە ..؟! ووتیان: موفلیس لای ئێمە ئەو کەسەیە مال و سامان و داریی پارە و شەمەکی نەبێت ، ئەویش فەرمووی : موفلیس راستەقینە لە ئۆمەتەکەی مندا ئەو کەسەیە، کە لەرۆژی قیامەت دا دێت بە نوێژو رۆژوو زەکاتەوە ،واتە: خاوەنی ئەو عیبادەتانەیە ، کە دێت جنێوی داوە بەوە، بووختانی کردووە بۆ ئەوە ، خوێنی ئەوەی رشتوە بەناحەق ،لەوی داوە بەناحەق ، موفلیسە کە دادەنیشێت وەك تۆ لە لێ کردنەوەیەك لە کردە وە چاکەکانی بەشی ئەوانەی لێ دەسێنن کە خراپەی کردووە بەرامبەریان ، ئەگەر کردووە چاکەکانی تەواوبوون ، لەپێش ئەوەی تۆلەی گوناهەکانی بە تەواوی لێ بکرێتەوە ،ئەوا گوناهی ئەوانە دەخرێتە سەر گوناهەکانی و فرێ دەدرێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە ..!!

---
[1] - سنن الترمذي رقم (٢٤١٦).
[2] - سنن الترمذي رقم (٢٤١٨).

📖 لە (حارثة بن وهب الخزاعي ) ﷺ لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( تصدقوا ، فإنه يأتي زمان يمشي الرجل بصدقته فلا يجد من يقبلها ، يقول الرجل : لو جئت بها بالأمس لقبلتها ، فأما اليوم ، فلا حاجة لي بها )). [١] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ببە خشن ، چونکە بەراستی رۆژێك یان زمانێك دا دێت ،کە پیاو بە مالە کەی خۆی دەیەویچت ببەخشێت دەکەوێتە رێ بەلام کەسێکی دەست ناکەوێت کە پێ بدات بۆ بەخشین ..!! جا پیاوێك پێ دەلێت : ئەگەر دوێنی بهاتایە ئەوە وەرم دە گرت ئەم بەخشینە ..!! بەلام ئەمرۆ پێویستم پێ نیە ..!!

جا لێرە دا بەندەی موسلمان با باش بزانێت کە فەقیر بوون یان هەژار بوون بۆ تاقی کردنەوەیە ، تاکو دەر کەویچت ئایا چەندە توانای ئارام گرتن خۆگری هەیە لەبەردەم ئەم تاقی کردنەوەیە دا ، ئایا بۆ بەدەست هێنانی بژیوی ژیان مال و سامان مەحیشەتی رۆژانەی هەموو ریچگەیەك دە گرێتە بەر بێ ئەوەی رەزامەندی (خوای گەورە )ی لەسەر بێت گوێی بە حەرام و حەلال نەدات هەرچی دەستی کەویت لە مال و سامان دەیخوات ، یان ئارام دە گرێت لە ژیر ئەم تاقی کردنەوەی (خوای گەورە ) فەرمانەکانی جی بەجێ دەکات لە ژیر فەرمانە کان دەر ناچێت بۆ بەدەست هێنانی رزق رۆزی مال و سامان چاوەری رەحمی خوا دەکات ئەگەر پاروێك نانی دەست کەوێت بە حەلالی بەلکو لە رۆژی قیامەت پاداشتەکەی بە سەد جار وەر گرێتەوە ،بەم تاقی کردنەویە بەسەر کەوتوویی پێ پەرێت.

﴿ٱلَّذِينَ﴾ واتە: ( اسم موصول ) واتە: ناوێکی پێویستکراوە یان ناوێکی گەیەنەرە ، مەبەست لێ بۆ ئەو کەسانەی کە لە ئایەتی پێش تردا باسمان کرد بۆ سیفە تەکانی ﴿لِّلۡمُتَّقِينَ ﴾ دە گەرێتەوە واتە : بۆ چاکە کاران و پارێزگاران ئەوانەی لە خوا دەترسن ، ئەوانەن کە ﴿يُؤۡمِنُونَ﴾ (يصدقون ) واتە باوەریان هەیە ، ﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾ وە ﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ وە ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾ واتە : ئەم سێ جۆرە سیفە تەیان تیچدا بە دی دەکرێت وەك : باوەر هێنانیان بە شتە پە ناهەکان یان شتە شاراوە کان و نا دیارە کان ، وە بەدەوام نوێژە کانیان بە رێك و بەجوانی ئەنجام دەدە ، وە ئەو رزق رۆزیە کەپێ یان بەخشراوە دەی بەخشن ..!!

﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾واتە : ئەو شتانەی نادیارە لە پێش چاوی بەندەکانی (خوا ی گەورە ) وەکو : الله و ملائکته و کتبه ، ورسله ، واليوم الاخر والبعث والجنه والنار... فهذا كله غيب ، واتە : (خوا و فیشتە و کتاب واتە: قورئان و پێغەمبەران و رۆژی دوایی زیندوو بوونەوە و بەهەشت و دوزەخ هتد ... ئەوانە هەر هەمووی پیان دەوترێت شتە پەناهەکان یان نادیارە کان ، ﴿يُؤۡمِنُونَ﴾ چونکە باورە بوون بەم شتانە واتە : پە سەندیان دەکات و دانیان پێ دادەنێت بۆ دا هاتوو ، مەبەست لێ ﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾ واتە: شتە نادیارە کان کە لەپێش چاویان پەناهەو نادیارو نا روونن ، ئەمەش بۆ داهاتووی باوەردارانە کە پاداشتی وەر بگرن لەسەری بەوەی کە پەسەندو دانیان پێدانەوە بۆ دا هاتوو خۆیان ، بۆ ئەوەی بە و ئیمانەی کە هەیان بووە بە (خوا ی گەورە ) و شتە ناروون و نادیارە کان لە فریشتەو قورئان و پێغەمبەران و رۆژی دوایی و رۆژی زیندوو بوونەوە پردی سیرات بەهەشت و دۆزەخ ، پاداشتیان دەست کەوێت کێن ئەوانەش بێ گومان باروداران ئەوانەی کە (المتقين ) لە خوا ترساوە کان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ رۆژی لێ پرسینەوە ..!!

[١] - صحيح البخاري برقم (١٤١١).

هەر لە سەر ووشەی ﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾ چونکە بابە تە کە زۆر هەڵدە گرێت دە بێتە بناغەو بن چینەی باوەر یان ئیمان بە شتە نا دیارو نا روون و پەناهاکان ، ئەویش باوەر بوو یان ئیمان هێنان بەم شتانە کە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە قورئان و فەرموودە کان باسیان کردووە ، ئیمە لێرە ا باسێك لە چەمك و واتای ئیمان و باوەر دە کەین ، هەروەها زانایان دەربارەی چەمك و واتای ئیمان ووتویانە (قول باللسان ، واعتقاد بالقلب و عمل بالجوارح ) واتە : قسەی زمان یان ووتەی زمان ، باوەر بە دڵ ، کردەوە بە ئەندامەکانی لاشە یان جستە یاسا یە ئەندازە دەکریت یان پێوانە دە کرێت ..!!

هەروەها ئیمان یان باوەر چەند ووشەیەك نیە کە بەزمان ووتە بووترێت ، چونکە مرۆڤی دووروووش دە توانێت ئەم ووتانە دەبرێت هەروەك خوای گەورە دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ [البَقَرَة : ٨] واتە : {هەندێك لە سیفاتی مرۆڤی مونافیق و دووڕوو} پاشان خوای گەورە دێتە سەر باسکردنی مونافیقان کە لە مەدینە دەرکەوتن ] :وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ لەناو خەڵكیدا كەسانێك هەن كە ئەڵێن: ئێمە ئیمانمان بەخوای گەورەو بە ڕۆژی دوایی هەیە بەڵام ڕاست ناكەن و لە حەقیقەت و ڕاستیدا ئیمانیان نیە..!! بەڵێ ئیمان دەبێت بەم یاسایە پێوانە بکرێت کە باسمان کرد ، هەروەها ئیمان یان باوەر تەنها تێروانینیچکی بێ بەرهەم و ، وراو سەرنێکی سارد سر نیە دەربارەی راستیەکان ، چونکە زۆر کەس پەیی بە راستییە کان بردووە دلنیا بووە کە ئەوانەی کە هەن راست و دەرستن درکیان پی کردووە بەراستیە کەی ، بەلام نکۆلی لەم راستیە دەکەن ستەم لە خۆیان دەکەن خۆیان بەزل و زاناو دەزانن ئینکاری دەکەن بە چاوی خۆیان تاریك کردووە لە راست راستیە کان دا ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ١٤﴾ [النَّمۡل : ١٤]واتە : بەڵام فیرعەون و گەلەكەی باوەڕیان نەهێنا بەو نۆ موعجیزە ڕوونانە كە بەئاشكرا بەڵگەبوون لەسەر ڕاستی پەیامبەرێتی موسا وبانگەوازەكەی و بەدرۆیان دانان، و بەزمانیان نكۆڵیان لەوە كرد كە لەلایەن خواوە هاتبێتن، لەكاتێكدا كە لەدڵ ودەروونیاندا دڵنیا و بێگومانبوون لێیان كە هەق و ڕاستین ئەوەش وەك ستەمێك لە هەق و ڕەوایی و خۆبەگەورەزانینیان لە دانپیانانیان بۆی، دەسا ـ ئەی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم ـ بڕوانە چارەنووس وسەرئەنجامی ئەوانە چۆن بوو كە ئایەتەكانی خوایان بەدرۆدانا وخراپەیان لەزەویداكرد، كاتێك كە خوا لە ئاوی دەریادا خنكاندنی ؟ بێگومان لەم بەسەرهاتەشدا پەند وئامۆژگاری هەیە بۆ كەسێك بیەوێت پەند وەربگرێت ..!!

هەروەها ئیمان یان باوەر چەند کردەوەیەکی دورشم نیە ئەگەر ئەنجام بدرێت بەلکو دەبێت بەزمان و بە دڵ و بە کردەوە ئەنجامی بەدەین ، چونکە هەموو مرۆڤیکی فێلباز و دوو روو یانر روو پەیمایی دەتوانێت هەمان کردوە ئەنجام بدات ، کە موسلمانێکی راستە قینە ئەنجامی دەدات ،هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ١٤٢﴾ [النِّسَاء : ١٤٢] واتە : بێگومان ڕێگەی ئەو دووڕووانە ـ بەگومانی خۆیان ـ هەڵخەڵەتێنەری خوای پەروەردگارە، بەو باوەڕەی كە لە ڕووكەشدا دەربدەبڕن ولەناخی دڵیانەوە دەیشارنەوە لەبێباوەڕی، گومانیان وایە كەشاراوەیە لەلای خوای پەرورەدگار، بەڵام لە ڕاستیدا خوای پەروەردگار هەڵخەڵەتێنەریانە وپاداشتیان ئەداتەوە بەهاوشێوەی كردەوەكانیان، وە ئەگەر ئەو دووڕوانە هەستان بۆ ئەنجامدانی نوێژ زۆر بەسستیەوە هەڵدەستن، ومەبەستیان لەنوێژەكانیان ڕووپامایی وشۆرەتە، ویادی خوای پەروەردگار ناكەن بەكەمی نەبێت ..!!

کەواتە : لێرە دا بۆمان دەر دەکەوێت (ئیمان یان باوەر ) ئەو هەست و نەستە بەرزو پیرۆزیە ، کە لە ناخی مرۆڤ دا جێگیر و دامە زراوە دەبێت وە تێگرای یان هەموو دەروونی داگیر دەکات واتە: دل و دەروونی دادەگرێت و پر دەبێت لە ئیمان و باوەر ، وە هەمیشە و بەردەوام بە زمان دەری دەبرێت ، وە تین هێز دەدات بە هەموو ئەندامەکانی لاشەی یان جستەی ، وا لە مرۆڤ دەکات هەر سەرمایەکی هەیە لە گیان یان لە مال و سامانی لە پێناوێدا بە ختیان بکات ، چونکە بەلایەوە نرخ بە های لە هەموو شتێك گرنگترە ئیمان و باوەری راستە قینە ..!!

ئیمانی راستە قینە بەندەی (خوای گەورە ) لەم چەند خالە دایە :

✍ دەبێت مرۆڤ تیگەیشتنی ژیرانەی دروستی هەبێت ، کە بەم هۆیەوە درك بە راستیە کانی (ژیان و بوونەوەر ) ببات ، سەرچاوەی ئەم تێگەیشتنەش بێگومان دەق و وەحی و نیگایە کە لە لایەن (خوای گەورە ) رەوانەکراوە بۆ پێغەمبەران — علیە السلام - هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ۝٢﴾ [المُلْك : ٢] واتە : ئەو خوایەی کە مردن و ژیانی بەدیهێناوە بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە ـ ئەی خەڵکینە ـ کە کامتان کردەوەی چاکتر و نیەت پاکترە ؟ وە هەر ئەویشە کە بەهێز و بەتوانایە و بەرامبەر بەهیچ شتێك بێ توانا نیە، و لێبوردەشە بۆ ئەو بەندانەی کە تۆبە دەکەن . لە ئایەتەکەدا هاندانی تێدایە بۆ ئەنجامدانی تاعەت و گوێڕایەڵیەکان، و سەرزەنشتیشی تێدایە بۆ ئەنجامدانی تاوان و سەرپێچیەکان ..!! **ئینجا سەرج دان و وورد بوونەوە لە بوونەوەر** ئیمان و باوەر زیاتر دەکات ، هەروەها (خوای گەورە) دەفەرموویت :قال تعالى: ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَـَٔايَـٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ۝١٩٠ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَـٰطِلًا سُبْحَـٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ۝١٩١﴾ [آل عِمْرَان : ١٩٠ - ١٩١] واتە : بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بە بێ نموونەیەکی پێشوو، وە لە بەدوای یەکدا هاتنی شەو و ڕۆژ، و جیاوازیان لەڕووی درێژی و کورتیەوە چەندین بەڵگەی گەورە هەیە لەسەر یەکتاپەرستی خوای پەروەردگار بۆ ئەوانەی کە خاوەن عەقڵ وژیریەکی ساغ وتەندروستن ..!! ئەوانەی کە لەهەموو حاڵ و باریکیاندا یادی خوای پەروەردگار دەکەن : بەوەستان و بەدانیشتنەوە و بەڕاکشانەوە، وە تێدەفکرێن و بیردەکەنەوە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و دەڵێن : ئەی پەروەردگارمان ئەم دروستکراوانەت بە بێ هودە نەهێناوەتە بوون، تۆ لەوە پاك و بێگەردیت، دەسا سزای ئاگرمان لێدوربکەرەوە ..!!

✍ بێ گومان ئەم تێگەیشتنە ژیرانە دەبێت بگاتە رادەی دلنیایی تەواو ، بە جۆرێك تەم مژی هیچ گومانێك لە دلّ دەروونی نەمێنێت هەروەك (خوای گەروە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟﴾ [الحُجرَات : ١٥] بێگومان باوەڕداران ئەوانەن کە باوەڕیان بە خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی هێناوە و کردەوەیان بە شەرعەکەی کردوە، و پاشان گومانیان بۆ دروست نەبووە لە باوەڕەکەیاندا..!!

✍ **بیٰ گومان دەبێت ئەو تێگەیشتنە ژیرانەیەی ، کە مرۆڤ باوەر و یەقینی تەواوی پیٰ بکات لەگەل ملکەچی و گوێرایەلی و پابەندە بوونی تەواو بە رێنموویەکانی (خوای گەورە ) و پیٚغەمبەرە کەی ﷺ ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی:**

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾ [النِّسَاء : ٦٥]

واتە : خوای بەرز و بڵند و پایەبەرز سوێند بە زاتی موبارەك و پیرۆزی خۆی دەخوات کەوا بێگومان ئەوانە لە دڵەوە بەڕاستی باوەڕیان نەهێناوە تا تۆ نەکەنە دادوەر لەو دووبەرەکی و ناکۆکیەی کە کەوتۆتە نێوانیانەوە لەکاتی ژیانتدا، و لەپاش مردنیشت بەگەڕانەوە بۆلای سوننەتەکەت، پاشان هیچ دڵتەنگیەك لەدڵ و دەروونیاندا دروست نەبێت سەبارەت بەو بڕیارەی کە تۆ داوتە، لەگەڵ ئەو پەڕی ملکەچییاندا، چونکە حوکمکردن بەوەی کە پەیامبەری خوا صلی اللہ علیه وسلم هێناویەتی لە قورئان و سوننەت لە هەموو بوارەکانی ژیان لە ناوکرۆکی باوەڕە لەگەڵ تەواوی ڕازیبوون و ملکەچی بۆی ..!!

✍ **هەروەها دەیٚت ئەو تیٰ گەیشتنە دامەزراو یان ئەو ملکەچیە تەواوە بێت کە هەست سۆزیکی گەرم و بەتینی لە گەلدا هەبێت ، وای لە بەندە بکات بە پیٰ داخوازی ئیمان و باوەر ەکەی مامەلە بکات ، بە هەموو ئاکارو رەوشت و کردەوە کانیەوە پابەند بێت ئامادەی خۆبەخت کردن و مال بەخشین جیهاد کردنیش بێت لە پیٚناوی (خوای گەورە ) دا ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویٚت :**

قال تعالی: ﴿تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾﴾ [الأَنفَال : ٢ - ٣] واتە : بێگومان باوەڕدارانی ڕاستەقینە بە خوای پەروەردگار ئەوانەن کە هەر کاتێك خوای پەروەردگاریان یادبخرێتەوە دڵیان ڕادەچەڵەکێت و ترسیان لێدەنیشیت، وە کە ئایەتەکانی قورئانیان بە سەردا ئەخوێنرێتەوە لەگەڵ ئەو باوەڕەی کەهەیانە هێندەی تر باوەڕیان زیاد ئەکات، چونکە لە ماناکانی ورد ئەبنەوە و ڕادەمێنن، وە تەنها پشت بەخوای پەروەردگار ئەبەستن، و ئۆمێدیان بە جگە لە خوای پەروەردگار نیە، و لەکەسی تریش ناترسن جگە لەو ..!! ئەوانەی کە هەمیشە بەردەوامن لەسەر نوێژە فەرزەکان و پارێزگارییان لێدەکەن و لەکاتی دیاریکراوی خۆیاندا ئەنجامیان ئەدەن، وە لەو ماڵ و سامانەش کە پێمان بەخشیون ئەبەخشنەوە لەوەی کە فەرمانمان پێکردوون ..!! **بیٰ گومان ئەگەر جیاوازی بکەین لە نیٚوان ئیسلام و ئیمان یان باوەر ئەوە واتاکەیەتی : ئیسلام واتە : کارو کردەوەی ئاشکراو روون و دیار کراوە ، بەلام ئیمان یان باوەر واتە : یەقین و دلنیایی دلٚ لە ناوەوە دا دامەزراوە ،هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویٚت : قال تعالی:** ﴿۞ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَٰلِكُمْ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾﴾ [الحُجُرَات : ١٤] واتە : عەرەبە دەشتەکیەکان ـ کە دەوار نشینەکان بوون ـ ووتیان : باوەڕێکی کامڵ و تەواومان بە خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی صلی اللہ علیه وسلم هێناوە، تۆش ـ ئەی پەیامبەری خوا صلی اللہ علیه وسلم ـ پێیان بڵێ : بانگەشەی تەواویێتی باوەڕ بۆ خۆتان مەکەن، بەڵکو بڵێن : موسوڵمان بوین، لە کاتێکدا کە هێشتا باوەڕ نەچووەتە ناو دڵەکانتانەوە، وە ئەگەر گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار و پەیامبەری خوا صلی اللہ علیه وسلم بن ئەوا خواش هیچ لە پاداشتی کردەوەکانتان کەم ناکاتەوە . خوای پەروەردگار لێبوردەیە لەوەی لە تاوانەکانی پەشیمان دەبێتەوە و تەوبە دەکات، و بە بەزەییە بەرامبەری . وە لە ئایەتەکەدا سەرزەنشتی ئەوانەی تێدایە کە باوەڕ و شوێنکەوتنی سوننەت بەڕووکەش دەردەخەن، کەچی کردەوەکانیان پێچەوانەی ئەوەیە ..!!

**هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویٚت : قال تعالی:** ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٥﴾﴾ [المَائِـدَة : ٥] واتە : وە هەرکەسێك نکوڵی لە دروشمەکانی ئاین بکات ئەوا کردەوەکانی پووچەڵ دەبێتەوە، و لەڕۆژی دوایيشدا لە خەسارۆمەنداندایە ..!! **بەلیٰ هەر وەك دەلیٚن : هەموو ئیمانداریٚك یان باوەرداریٚك موسلمانە ، بەلام هەموو موسلمانیٚك ئیماندار یان باوەر دار نیە ..!!**

بێگومان (ارکان ئیمان ستە ) واتە: ئیمان لەشەش پایەی هەیە کە ئەمانەن :

١-ئیمان بە (اللە ) واتە: خوای تاك و تەنها .

٢-ئیمان بە (ملائکتە) واتە : فریشتە کان .

٣-ئیمان بە (کتبە ) واتە: کتابە کانی وەحی یان نیگای (خوای گەورە ) وەك : قورئان ، تەورات ، ئینجل ، زبوور ...هتد.

٤- ئیمان بە (رسلە ) واتە : پێغەمبەران بە بێ جیاوازی ئەوانەی ناویان هاتووە لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر دا .

٥-ئیمان بە (الیوم الاخر ) واتە : رۆژی دوایی کە رۆژێکە کاتە کەی نادیارە .

٦-ئیمان بە (قەدر خیر وشر ) واتە: ئیمان هێنان بە چارەنووسی خۆشی و ناخۆشی .

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨٥﴾

[البَقَرَةِ : ٢٨٥] واتە : پەیامبەری خوا صلى الله علیه وسلم باوەڕی هێناوە ویەقینی هەیە بەو سروشەی بۆی هاتوە لەلایەن پەروەردگاریەوە و بەڕاستی دەزانێت، و هەق خۆشیەتی کە یەقینی هەبێت، و باوەڕدارانیش بەهەمان شێوە باوەڕیان هێناوە بەقورئانی پیرۆز و کاری پێدەکەن، هەمویان باوەڕیان هێناوە بە ( اللە ) کە پەروەردگار و پەرستراویان بێت کە سیفاتی مەزنی وتەواوی تێدایە، وە بەوەی کە خوای پەروەردگار کۆمەڵێك فریشتەی بەڕێزی هەیە، وە بەوەش کە کتێبی دابەزاندوە، وە بەوەش کە پەیامبەرانێکی بۆ خەڵك ناردوە، ـ ئێمەی باوەڕداران ـ ئەوە نەبێت باوەڕمان بەهەندێکیان هەبێت و بەهەندێکی تریشیان باوەڕمان نەبێت، بەڵکو باوەڕمان بەهەمویان هەیە . پەیامبەر و باوەڕدارانیش وتوویانە : گوێمان لەوە بوو کە بەوەحی داتبەزاندوە، و گوێڕایەڵین لەهەموو ئەوانەدا، ئومێدەوارین ـ بەفەزڵی خۆت ـ لەتاوانەکانمان خۆش بیت، ئەوە تۆی پەروەردەمانت کرد بەو نیعمەتانەی کە پێمانت بەخشیوە، و تەنها بۆ لای تۆیە سەرەنجام و گەڕانەوەمان . **بەڵێ ووتمان ئیمان شەش پایەی هەیە ، کە تێکرایی ئیمان پێك دەهێنن ، وە نکۆلی کردن ئینکاری کردە لە یەکێکیان دەر چوونە لە سنووری ئیمان و باوەر بە یەکجاری ، ئەمەش لە رێگەی فەرمایشتی (خوای گەورە ) و پێغەمبەری خوا ﷺ دە توانین راستەوخۆ لە هەر کام لەو شەش پایەیە ئیمان و باوەر حالی ببین ، پاشان لە رێگەی سەرنج دان لە بوونەوەر بە نار راستە وخۆ زانینما زۆر تر دە بێت بیرو هۆشمان فەرانترو قولتر دە بێتەوە بۆ تێ گەیشتنی ئیمان و باوەر ،بۆیە هەریەك لەم شەش پایەی ئیمان راستیەکی نادیارە یان (غیب ) و پەناهەیە ، بۆیە مرۆڤ بەهەستەوەرە کانی خۆی درکی پێ نابات یان پەی پێ نابات ،بۆیە پێویستە بزانین ئیمان بە (غیب ) چ رادەیەك مەنتیقیانەیەو یان لۆژیکی هەیە .؟! وە سنووری ئەو ئیمانە چەندە ..؟!**

فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی شەش پایەکەی ئیمان کە ئیمامي الترمذي ریوایە تي كردووە دە ربارە ی ئيمان .

لە (عمر بن الخطاب ) رضي الله عنه دە لیت : ((كنَّا عندَ رسولِ اللهِ فجاءَ رجلٌ شديدُ بياضِ الثِّيابِ شديدُ سوادِ الشَّعرِ لا يرى عليهِ أثرُ السَّفرِ ولا يعرفُه منَّا أحدٌ حتَّى أتى النَّبيَّ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ فألزقَ رُكبتَه برُكبتِه ثمَّ قالَ :يا محمَّدُ ما الإيمانُ قالَ أن تؤمنَ باللَّهِ وملائِكتِه وَكتبِه ورسلِه واليوم الآخرِ والقدرِ خيرِه وشرِّهِ قالَ :فما الإسلامُ قالَ شَهادةُ أن لا إلَه إلاَّ اللَّهُ وأنَّ محمَّدًا عبدُه ورسولُه وإقامُ الصَّلاةِ وإيتاءُ الزَّكاةِ وحجُّ البيتِ وصومُ رمضان قالَ فما الإحسانُ قالَ أن تعبدَ اللَّهَ كأنَّكَ تراهُ فإن لم تَكن تراهُ فإنَّهُ يراك قالَ فى كلِّ ذلِك يقولُ لَه صدقتَ قالَ فتعجَّبنا منهُ يسألُه ويصدِّقُه قالَ :فمتى السَّاعةُ قالَ ما المسئولُ عنها بأعلمَ منَ السَّائلِ قالَ :فما أمارتُها قالَ أن تلدَ الأمةُ ربَّتَها وأن ترى الحفاةَ العراةَ العالةَ رعاءَ الشَّاءِ يتطاولونَ فى البنيانِ قالَ عمرُ فلقينى النَّبيُّ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ بعدَ ذلِك بثلاثٍ فقالَ يا عمرُ هل منِ السَّائلُ ذاكَ جبرئيلُ أتاكم يعلِّمُكم أمرَ دينِكم)) .[1] واتە : جارێ کیان لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین ، کاتێ زانیمان پیاوێك دەرکەوت پۆشاکی سپی بلورین بوو ، مووی رەش و تۆخ بوو ، ماندویەتی رێگای پێوە دەبینرا ، هیچ کەسێك لە ئێمەدا نەی دەناسی ، هاتە پێشەوە هەتا لە بەرانبەر پێغەمبەری خوا ﷺ دانیش و هەردوو ئەژنۆی نا بە هەردوو ئەژنویەوە و ، هەردوو دەستی نایە سەر رانی پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی : ئەی ﷴ ئیسلام چیە ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (ئیسلام ئەوەیە کە شایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق جگە لە (الله) ﷴ دیش پێغەمبەری خوایە ، نوێژ بکەیت ، و زەکات بدەیت ، و رۆژووی مانگی رەمەزان بگریت ، و ئەگەر توانای مادی و جستەیی هەبوو حەجی مالی خوا بیکەیت ، پیاوە کە ووتی : راست دەکەیت ..!! ئێمە لامان سەیر بوو ..!! کە پرسیاری لی دەکردو دەیووت راست دەکەیت ..!! پیاوە کە ووتی : ئەی ئیمان یان باوەر چیە ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ( ئیمان ئەوەیە کە باوەر بەهێنی بە (الله ) یان(خوای گەورە ) ، وە بە (ملائكتە ) یان بە فریشتە کان ، وە بە (کتابەکانی پێغەمبەران – علیە السلام-) ، وە (یوم القیامە ) یان رۆژیی دوایی ، وە بە قەزاو قەدەر خیر شەریەوە ) پیاوە کە ووتی : راست دەکەیت ..!! پیاوەکە ووتی : ئەی (أحسان) یان چاکە چیە ..؟!! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (ئەوە یە کە بەم شێوە یە (خوای گەورە ) بپەرستی وەك ئەوەس لە بەر چاوتە و دەیبینی ، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەو تۆ دەبینیت ) پیاوە کە ووتی : راست دەکەیت ..!! پیاوەکە ووتی : ئەی چ کاتێ ئەم جیهانە کۆتایی دێت و قیامەت پەر پادەبێ یان رۆژی دوایی دادێت ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەمووی : (پرسیارلیکراو زاناتر نیە لە پرسیار کەر ) پیاوە کە ووتی : راست دەکەیت ..!! پیاوە کە ووتی : ئەی نیشانەکانی چین ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (ئەوە یەکە مندال بەچاوی نۆکەرو کارە کە تەماشای دایك باوکی دەکات ، یان ئافەرتی کۆیلە وەك گەورەکەی خۆیی لێ بیت ، پێ پەتی رەش و رووت و رەجال و شوان و کاوان بن یە خاوەن مولك و کۆشك و تەلاری لێ رابکێشن و ،فیز و دەعیە پێوە بکەن پێشەوا (عمر) ووتی : لە پاشان دا پیاوەکە دەرچوو یان رۆیشت ، منیش بۆ ماوەیەك مات و بێدەنگ بووم ، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێ فەرمووم : ئەی (عمر) دەزانی ئەو پرسیارکەرە کێ بوو ..؟! ئەلێ ووتم : نەخێر . خوا پێغەمبەرەکەی دەزانن ،دەلێ فەرمووی :ئەوە (جبریل) بوو – علیە السلام – هاتبوو کارو باری ئاینە کەتان فێر بکات ..!!

[1] - سنن الترمذي برقم (٢٦١٠).

قال تعالی: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ [البَقَرَةِ : ٣] بەڵێ ئەو کەسانەی کە باوەریان بە شتە پەناهەکان و نادیارە کان هەیە ، ئیمان بوونە بە نادیار ئە ئاسویەیە ، کە مرۆڤ دەیگاتێ ،ئاستی شایستەی مرۆڤانەی خۆیەتی ، کە پێی لە ئاستی نزمی ئاژەلیانە دەر دەچێت ، چونکە درك دەکات بەوەی کە ئەم گەردوون بوونەوەرە گەورەترو فەرەوانترە لەو جوغرە تەسك و رووبەرە بچووکەی ، کە هەستەوەرە کا درکی پێ دە بن ، لە کاتێك دا ئاژەل نازانێت نادیار چیە..؟! ئەوەی کە هەستەوەرە کانی دەرکی پێ نەبات نایزانێت نادیار شتە پە ناهەکان چیە ..؟! بێ گومان ئەم روانگەیە بۆ بوونەوەر کاریگەری راستەو خۆی هەیە لەسەر بیر کردنەوەی مرۆڤ ، هەلسەنگاندی ژیانی درك کردن بە راستیە کان و ناسینی خودی خۆی و چۆنیەتی مامەلە کردنی لە گەل شتە کانی دەور بەریدا ، چونکە دەزانێت کە دەسەلاتێکی بێ سنور و توانایەکی کار بەجێ لە پشت ئەم بوونەوەرە وەیە بە مەبەستێك بەدیهیچناوە و ژیانی لە زەیدا فەراهەم هێناوە و ئەو شتانەی ، کە تێیدان کە سەرجەمیان خزمەت بەو ژیانەی گەردوون دەکەن ، وە تەواو کەری رۆلی یەکترین سەردەستەش لەم گەردوونە دا یان لەم ژیانەدا مرۆڤە ، دەورە کەشی بەو ماوە کورتەی ژیانی دونیا کۆتایی نایەت ،یان ئەم دەورە ی مرۆڤ بەم شانۆ کورتەی ژیانی دونیا کۆتایی نایەت ، بێ گومان دەبێت ئەوەمان لە یاد نەچێت ، ئیمان هێنان بە شتە نادیارو پەناهەکان نابێ رەهایی بێ سنوور بێت ، بەلکو دەبێت زانست زانیاری لەسەر چاوەی بێگەردی خۆیەوە بێت ، ئەویش کە سروشتی پیرۆزی پەروەردگارە دەبارەیان وەربگیرێت ، چونکە بواری فیکری بیری مرۆڤ نیە ، تاکو بە ئامرازی بیر کردنەوەی خۆی درکی پێ بکات ،چونکە توانای زۆری تێدا بە فیرۆ دەروات ، وە هیچ چیش بەهیچ ناکات ، لە هەمان کاتیشدا نابێت بە پێی بۆچوونی خەلکی لە هەر بارێکە وە بێت و بۆ هەر بوارێك ئیمان بە نادیار بکەین ، چونکە ئەو کاتە لە راستییە کان لارێ دەبین و دەکەوینە ئەفسانەو شتی بێ سەرو بەرەوە ..!! ئینجا نموونەیەکی ئیمان هێنان دەهێنیەوە کە هەموو دورست کراوێك ئیمانی هەیە کە خودایەك دەرستی کردووە جا بەپێ بیرو باروەرو ئاینی خۆی ، هیچ مرۆڤێك ناتوانێت نکۆلی لێ بکات مەگەر ژیریی لەدەست دابێت ، هەموو کەسێك باوەری بەوە هەیە کە خوایە ك درووستی کردووە ، بەلام شێوازی پەرستنە کان جیاوازە ،ئیمەی ئیسلام ئیمان مان هە یە کە (اللە ) تاك و تەنها دەروست کەری هەموو گەردوون و بونەوەرێکە ، هیچ شریك هاوبەشی نیە لەدروست کردن،

نموونە یەکیش لە شتە نادیار وپەرناهەکان (ملائکتە) فریشتەکانی خوای گەورەن ، بەلێ فریشتەکان جیهانێکی نادیارن (خوای گەورە) لە رووناکی درەستی کردوون ، هیچ تایبەتمەدییەکی پەرستراویسەتیان نیە ، بە لکو خۆیان بەندە خواپەرستی دەکەن پابەندنی تەواویان بە فەرمانەکان (خوای گەورە ) هەیە ، توانای جێ بەجی کردنیان پێدراوە چاکە کارن ، هەر گیز سەر پێچی ناکەن ، پێویستە موسلمانی ئیماندار باوەری تەواوی بە فریشتەکان هەبێ چونکە نکۆلی کردنیان دەبێتە دوور خستنەوە لە پایە کانی ئیمان یان لە سنوور دەرچوون لە پایەکانی ئیمان ، هە چەندە فریشتە کان نادیارن مرۆڤ ناتوانێت بەهۆی هەستەوەرە کانیانەوە هەستی پێ بکەن بەلام لە روانگەی بیرو باوەری ئاینی ئیسلام وە کە لەدەقەکانی قورئان و فەرموودە کانی پێغەمبەری خوا ﷺ تەواو باوەر مان پێیەتی ، ئەویش بەە پێ بەلگە شەر عیەکان هاتووە لە قورئان و فەرموودەکان دا ، بەلێ بێگومان بەسەکە ئەگەر بەدرێژی باس بکەین زۆر هەلدە گریت بۆیە دەبارەی ئیمان هێنان یان باوەر بوون بە (غیب ) و شتە نادیار و پەناهەکان لێردا دەوە ستین ، پەنا بە (خوای گەورە ) لە تەفسیری ئایەتە کانی تری سورەتی (البقرە) باسی دەکەین بەدلنیایەوە ، (خوای گەورە ) زناترە بەشتە (غیبەکان).

## ووتەو راو بۆچوونی هاوەلان و شوێنکەوتوان و زانایان لە سەر ئایەتی (٣) سورەتی (البقرە)

﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ واتە: ئەو کەسانەی بروایان بە نادیارو شتە پە نهانە کان هەیە ، ئەوانەن کە باوەر داری راستە قینە،

✍ لە (ابو جعفر الرازی ) لە (العلاء بن المسیب بن رافع ) لە ( ابی اسحاق ) لە (الاحوص ) لە (عبدالله ) – خوا لیّ یان رازی بیت- دەلێت : ((ئیمان واتە: سەلماندن و بەراست زانین )).[1]

✍ لە ( علی بن طلحة ) وە جگە لەویش کەسانی تریش لە (عبدالله بن عباس ) – رازو رەحمەتی خوا یان لیّ بێت- دەلێن : (( ﴿يُؤۡمِنُونَ﴾ واتە : (یصدقون ) یان بەراستی زانین )) .[2]

✍ لە (معمر ) لە (الزهری ) – رەحمەتی خوا یان لی بیت – دەلیت: (( (الایمان ) واتە: کارو کردەوە یان کار کردن پیی ).[3]

✍ لە (ابو جعفر الرازی ) لە ( الربیع بن انس ) – رەحمەتی خوا یان لیّ بێت – دەلێت : (﴿يُؤۡمِنُونَ﴾ واتە: (يخشون ) یان دەترسن)[4]

✍ لە (ابن جریر) لە کەسانی تریش دەلێن : ( چاکتر ئەوەیە کە وسفکراون بەوەی کە بروایان هەیە بە شتە نادیار بە کردارو بە گوفتارو بیرباوەر ، جاری واش هە یە ترسیان لە خودا بە مانای ئیمان و باوەر دێت کە بریتیە لە : سەلماندن بە کردارو گوفتار ، دیارە (الایمان ) ووشەیەکی فرەوانە بۆ دان پێدانان و سەلماندن بە بوونی خودا و کتێبە کان و پێغەمبەران ، وە سەلماندنی ئەو دانپیادانانە بە کردارە ، منیش دەلێم : (الایمان ) لە زمانەوانی دا تەنها بۆ بەراست زانین بە کار دەهێنرێت ، جاری وا هەبووە لە قەرئاندا بەکار دەهێنراوە مەبەست پێی بە راست زانین بووە وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت: قال تعالى: ﴿يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤۡمِنُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ﴾ [التَّوۡبَة : ٦١] واتە : باوەڕی بەخوای پەروەردگار هەیە هەیە و باوەڕی بە قسەی باوەڕداران هەیە لەوەی کە هەواڵی پێدەدەن و بەڕاستی دەزانێت، و ئەو ڕەحمەتە بۆ ئەو کەسەی کە شوێنی بکەوێت و بیکات بەسەرمەشقی خۆی ..!!وە کو براکانی یوسف بە باوکیان ووت : قال تعالى: ﴿مَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ١٧﴾ [يُوسُف : ١٧] واتە: دڵنیاشین لەوەی کە تۆ باوەڕ بە ئێمە ناکەیت ئەگەرچی وەسفیش کراین بە ڕاستگۆیی، ئەمەش لەبەر خۆشەویستی زۆرت بۆ یوسف ..!! هەروەها ئەگەر بە کار هێنرا لەگە ل کردار دا وەك قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ٦﴾ [التِّين : ٦] واتە : بەڵام ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوەی باشیان ئەنجام دابێت، ئەوا پاداشتی گەورە و نەبڕاوە و کەم نەبوویان بۆ هەیە ..!!

[1] - تفسير الطبري (٢٣٥/١).
[2] تفسير الطبري (٢٣٥/١).
[3] تفسير الطبري (٢٣٥/١).
[4] تفسير الطبري (٢٣٥/١)

هەندێك (الايمان ) يان باوەر يان بە ترس تەفسير كردووە ، هەروەك (خواى گەورە) دەفەرموويت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ١٢﴾ [المُلْك : ١٢] واتە: بێگومان ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەترسن و دەیپەرستن، و سەرپێچی ناکەن کاتێك کە لە چاوی خەڵك ونن، و لە سزای دوارۆژ دەترسن پێش بینینی بەچاو، ئەمانە لە لایەن خواوە لێخۆشبون بۆ تاوانەکانیان هەیە، و پاداشتێکی گەورەشیان بۆ هەیە کە ئەویش بەهەشتە..!! هەروەها (خواى گەورە ) دەفەرموويت : قال تعالى: ﴿مَّنۡ خَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ وَجَآءَ بِقَلۡبٖ مُّنِيبٍ ٣٣﴾ [ق : ٣٣] واتە: ئەوانەی کە لە دونیادا لە خوای پەروەردگار دەترسن و لە قیامەتیشدا بە دڵێکی تەوبەکار و پەشیمان لە خراپە پێیدەگەنەوە ..!! يان وەك (خواى گەورە ) دەفەرموويت : قال تعالى: ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ﴾ [فَاطِر : ٢٨] واتە :

بێگومان تەنها ئەوانە لە خوا دەترسن و خۆ دەپارێزن بەگوێڕایەڵیکردنی ودوورکەوتنەوە لەسەرپێچیکردنی کە زانان بە خوای پەروەردگار و سیفەتەکانی و شەریعەتەکەی، و توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا، لەوانەش جۆراوجۆری ئەم دروستکراوانە لەگەڵ یەك هۆکاریان، وە ورد دەبنەوە لەو پەند وئامۆژگاریانەی کە تێیاندایە..!! ) . [١]

بەڵێ زانیایان و پێشینە چاكەكان راو بۆچوونی جیاوازیان هەیە لە سەر ووشەی (الغيب) كە لەپێدا باسمان كرد ئەوە هەندێك لەراو بۆچوونی زانايان :

✍ لە (الربيع نب انس ) – رەحمەتی خوای لی بيت – دەلێت: ( ﴿يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ واتە: باوەر هێنان بە (خوای گەورە) و فريشتە كان و كتێبەكان و پێغەمبەران و رۆژی دوايی و بەهەشت دۆزەخ ، وە باوەر هێنانيش ژيانی دوای مردن و زيندوو بوونەوە هەيە ئەمانە هەر هەمووی (غيب ) بن يان ناديارن ، قتادەش هەر وايی ووتووە ). [٢]

✍ لەرێ (ابن اسحاق بسندە ) لە (عبدالله بن عباس ) – رزاو رەحمەتی خوا يان لی بيت- لەسەر ووتەی ﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾ دەليت : واتە: ئەوەی هاتۆتە خوارەوە لە لايەن (خوای گەورە ) ). [٣]

✍ لە (نافع بن الازرق )لە (عبدالله بن عباس ) – رازو رەحمەتی خوا يان لی بيت – دە ليت : ووتم : لەسەر رستەی ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ هەوالم پێ بدە دەلێ ووتی : ئەوانەی نا ديارن وەكو بەهەشت و دۆزەخ . ووتی : ئايا عەرەبەكان ئەوە دەزانن ..؟! ووتی : بەلێ . من گوێم لە (ابو سفيان بن الحارث ) دەی ووت : ئێمە باوەر مان بەهەموو شتە (غيب) ناديارە كان هێنا ، گەلە كەمان نوێژيان بۆ هەموو بتە كان دەكرد پێش هاتنی ﷺ ). [٤]

[١] -تفسير ابن كثير (٨٤/١) .
[٢] -تفسير طبري (٢٣٦/١).
[٣] -سيرة ابن هشام (٥٣٠/١).
[٤] -مسائل نافع الأزرق (٢٧٢).

✍ لەرێ (عاصم ) لە ( زر بن حبيش ) – رەحمەتی خوا یان لێ بێت – دەلێت : ( (الغيب ) واتە : قورئان ).[١]

✍ لە رێ (عثمان بن الاسود ) لە (مجاهد ) – راحمە تی خوا یان لی بیت – لەسەر ووتەی: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ دەلێت : واتە باوەر هێنان بە (خوای گەورە ) ).[٢]

✍ لە (الحسن البصری ) – رەحمەتی خوای لێ بێت- دەلێت :( واتە : باوەر هێنان بە رۆژیی دوایی ).[٣]

✍ لە رێ (عثمان بن الاسود ) لە (عطاء بن ابي رباح ) – رە حمە تی خوا یان لی بیت - لە سەر ووتەی : ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ دلێت : ( باوەر هێنان بە (خوای گەورە ) واتە باوەر هێنانە بە هەموو شتە نادیارە کان یان غیبیەکان ).[٤]

✍ لە رێ (سعيد بن ابي عروبة ) لە (قتادة ) – رە حمە تی خوا یان لی بیت – لە سەر ووتەی : ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ دەلێت : واتە: باوەر هێنان بە رۆژی زیندوو بوونەوە (يوم البعث ) واتە : باوەر هێنان بە ژیان و زیندوو بوونەوە دوای مردن ، وە رۆژی لێپرسینەوە یان (يوم الحساب ) ،وە باوەر هێنان بە بەهەشت و دۆزەخ وئاگر ، وە بە راست زانینی ئەو پەیمانەی کە لە قورئانەوە باسکراوە لە لایەن (خوای گەورە ) دابەزیوە ).[٥]

✍ لەرێ (عبدالله بن جعفر ) لە (زيد بن أسلم ) – رزاو رەحمەتی خویان لێ بێت – لە سەر ووتەی ﴿يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ دەلێت : واتە: باوەر هێنان بە چارە نووس یان (قدر ) ).[٦]

✍ لە رێ لە (إبراهيم بن حمدى ) لە (إسماعيل بن ابى خالد) – رزاو رەحمەتی خوای لێ بێت- لەسەر ووتەی ﴿يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ دەلێت : واتە : باوەر هێنان بە ئیسلام ).[٧]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت- ﴿هُدًى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢﴾ واتە: لەگەل ئەو سیفەتانەی کە باوەریان هەیە ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ واتە: باوەر هێنان بە قورئانی پیرۆز کە هاتووە لە لایەن (خوای گەورە ) وە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیوە ، ئەو شتانەی کە حەلالە حەلا لی کردوون ، ئەوەشی کە حەرامە حەرامی کردوون ، وە کار پێ کردن بە حکم فەرمانە کانی قورنای پیرۆز ).[٨]

---

[١] -تفسير البغوي (٦٢/١).
[٢] - اخرجة الحربي في غريب الحديث (٦١١/٢).
[٣] - تفسير الثعلبي (١٤٧/١).
[٤] - اخرجه ابن ابي حاتم (٣٦/١).
[٥] اخرجه يحيى بن سلام في تفسيره (٢٣١/١).
[٦] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٦/١).
[٧] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٦/١).
[٨] -تفسير مقاتل (٨١/١).

له (تويله بن أسلم ) – خوا لی رازی بێت – دەلیت: ((صلَّيتُ الظهرَ أو العصرَ فى مسجدِ بنى حارثةَ فاستقبَلَنا مسجدَ إيلياءَ فصلَّينا سجدتَين ثم جاءَنا مَن يخبرُنا أنَّ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّم قد استقبل البيتَ الحرامَ فتحوَّلَ النساءُ مكانَ الرجالِ والرجالُ مكانَ النِّساءِ فصلَّينا السجدتَينِ الباقِيتَينِ ونحن مُستقبلونَ البيتَ الحرامَ قال إبراهيمُ فحدَّثني رجالٌ من بني حارثةَ أنَّ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّم حين بلغَه ذلك قال أولئكَ قومٌ آمَنوا بالغَيْب)) . [1] واته : ئێمە نوێژی نیوەڕۆمان یان نوێژی عەصر مان دە کرد لە مەزگەوتی (بني الحارث ) ڕووی قبلەمان لە مەزگەوتی ئەیلیاءبوو نوێژمان کردوو دووسجدەمان برد ، لە پاشاندا یەکێك هاتوو هەواڵێکی هێنا لە پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی : ڕووی قبلە تان وەر گێرن بۆ (البيت الحرام ) ئینجا ئافرەتەکان شوێنی خۆیان گۆری بۆ شوێنی پیاوە کان وە پیاوەکانیش شوێنی خۆیان گۆری بۆ شوێنی ئافرەتەکان ، ئینجا دوو سجدەمان برد ئەوەی مابوو بۆ (البيت الحرام ) وە (ابراهيم ) ئەم فەرموودەی گێراوە تەوە لە پیاوێك لە نەوەی (الحارثة ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویە تی : ( ئەوانە خەلکانێکن کە باوەڕیان بە غیب هەیە یان شتە نادیارە کان هەیە ..!!

له (عبدالرحمن بن زيد ) –رەحمەتی خوای لی بیت- دەلێت : ((كنتُ جالسًا عندَ عبدِ اللهِ فذكَروا أصحابَ النبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم وما قد سبَق لهم قال : إنَّ أمرَ محمدٍ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم كان بيِّنًا لمن رآه ، والذي لا إلهَ غيرُه ، ما مِن أحدٍ أفضلَ مِن إيمانٍ بغيبٍ ، ثم قرَأ : الم ذلكَ الكتابُ لا ريبَ فيه ... إلى قولِه : المُفلِحُون )) . واته: دانیشتبووین لە لای (عبدالله كوری مسعود ) – خوا لی رازی بێت – باسی هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ دە کرد وە لەو شتانەی کە پێش کەوتوون لە ئێمە (عبدالله كوری مسعود ) ووتی : فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر ئاشکرا بوو لە لای ئەوانەی کە چاویان پێ کەوت ، سوێند بە کەسەی کە هیچ شتێ بۆ پەرستن ناشێ جگە لەو هیچ کەس هەر گیز باوەری نەهێناوە ئەو باوەرە چاکتر بێ لە بروا بە نەدیار (الغيب ) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ ئە لف لام میم ، ئەم کتابە هیچ گومانێکی تێدا نیە ، بۆ ئەوانەی پارێزگارن و ڕێ نیشاندەرە ، ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پی هێناوە بە شتە نادیارە کان واتە (غیبەکان ) هەیە ، تاکو ئەگاتە ﴿ٱلۡمُفۡلِحُونَ ۝٥﴾ سەر فرازی یان رزگار بوون ) [2].

---

[1] -تفسير ابن كثير القران عظيم (٦٤/١) .
[2] -البوصيري في إتحاف الخير المهرة (١٠٧/١).

﴿يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ واتە : هەڵدەستن بەرەو نوێژە فەرزەکانیان ، لە بنچینە دا نوێژ یان (الصلاة) لە زمانی عەرەبی دا بە مانایی پارانەوە یە یان بەمانایی نزادێت ، پاشان نوێژ لە شەرعی ئاینی ئیسلام بە کار هاتووە بۆ رکوع و سجود و وە چەند کردارێکی تایبەت و لە چەند کاتێکی دیاری کراودا بە شەرت و مەرجانەی کە بە سیفەت و جۆرانەی کە مشهورە و پیٚ ناسراوە لە ئیسلامدا.

📖 لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – لەسەر ووتەی ﴿يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ واتە : (نوێژ دەکەن بە پێنج فەرزەکانیەوە).[1]

📖 لە (ضحاك ) لە (عبداللە ابن عباس ) – خوا لی رازی بیت – دە لیت : (﴿يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ واتە: نوێژ کردن واتە : رکوع یان کرنوش و سجود ، وە خوێندنەوەی قورئان و گەردن کەچی بە تەواوەتی یان ملکەچی تەواوە تی وە پێشوازی کردنی و بەتەنگەوە بوونی ).[2]

✍ لە (ابی سعید ) –رەحمەتی خوای لی بیت - دەڵیت لە سەر ووتەی خوا ﴿يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ گویم لە (الحسن) بوو دەی ووت : هەڵسان بۆ پێنج نوێژە فەرزە کە بە دەست نوێژیشەوە ، وە کرنوش بردن ، وە سجود بردن ، وە خشوع بردن ، نوێژ کردنیش لە کاتی خۆی دا ئەنجام بدرێت ).[3]

✍ لە (قتادة ) – رە حمە تی خوای لی بیت – دە لیت : ﴿يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ یان (اقامة الصلاة ) واتە: پارێزگاری کردن لە کاتە کانی نوێژ کردن و دەست نوێژ شوشتن و کرنوش و سوجدە بردن ).[4]

✍ لە (مقاتل بن حیان ) – رحمە تی خوای لی بیت – دەلیت : ﴿يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ واتە : (إقامتها ) هەڵسان و پارێزگاری کردن لە کاتەکانی نوێژ ،وە دەست نوێژ کردنێکی بە جوانی پوختی ، وە کرنوش بردن و سوجدە بردن و قورئان خوێند بەتەواویی لە نوێژ دا و وە شایە تومان و سلاوەت دان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە هەڵسانە بە نوێژ کردنی تەواو ).[5]

---

[1] -اخرجه ابن ابي حاتم (٢٦٢/٦).
[2] -تفسير الطبري (٢٤١/١) ص ٣٣.
[3] -اخرجه محمد بن نصر في تعظيم قدر الصلاة ص١٤٣.
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٧/١).
[5] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٧/١).

﴿مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣﴾ واتە: لە مال و سامانەکەی کە پێمان بەخشیون ، خێرو بەخشین لیٚ دەبەخشن ، بەخشینەکەش فەرز بێت یان سوننەت بێت ..!!

لە ریٚ (السدی ) لە (ابی مالك وابی صالح ) لە (عبداللە بن عباس ) – رزاو رەحمەتی خوا یان لیٚ بێت- دەلێت: نفقەی خاو خێزانە لەسەر پیاوە ، وە ئەوەش پیش ئایەتی زەکات بیتە خوارەوە ) .[1]

لە ریٚ (علی بن ابي طلحة ) لە (عبداللە بن عباس ) – رزاو رەحمەتی خوا یان لیٚ بێت- لە سەر ووتەی ﴿مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ دەلێت: واتە: دەرکردنی زەکات لە سەروەت مال و سامان ).[2]

لەریٚ (جوبیر ) لە (ضحاك ) لە سەر ووتەی ﴿مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ دەلێت : زەکات بەخشین شتێك بوو خۆیان پیٚ نزیك دە خستەوە لە (خوای گەورە ) بە پیٚ توانان و تیچ کۆشانی خۆیان تا فەرز بوونی زەکات هاتە خوارەوە ، کە حەوت ئایەت بوو لە سورەتی براءت کە باسی مال بەخشینی تیا باس کراوە ئەو ئایەتانەش بوونە نسخ یان جێگیر بووە کان ).[3]

بەلیٚ (خوای گەورە ) لە زۆر بەی ئایەتەکانی قورئان نوێژ کردن و مالٚ بەخشینی لە گەل یەك هێناوە ، چونکە نوێژ کردن حەقی (خوای گەورە ) یە و پەرستنیەتی کە بریتیە لە خوا پەرستی بە تەنها و سوپاس گوزاری و ستایش و دوعاو پارانەوە و هانا بردن و پشت پی بەستن بە زاتی خوا ، بەلام مال بەخشین مەبەست پیٚی چاکە کردنە لەگەل خەلکی و سوود پیٚگەیاندنیانە ، نزیك ترین کەسیش بەو بەخشینە خزم کەس و کارو بەندە و کەنیزەیە ، پاشان کەسانی بیٚگانەش واتە : کەسانی فەقیر هەژار و لیٚ قەوماوان و هەتیوان و ئەوانەی کە لەسەفەردا پیٚویستان پیٚیە یان خوێند کاران ئەوانە بەدوای زانستی شەرعی دا دەگەرێن ، بەلی هەر بەخشینێکی واجب و زەکاتی فەرز کراو ئەم ئایەتەی (٣) سورەتی (البقرە) دەی گرێتەوە کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣﴾ [البَقَرَةِ : ٣] بە لی ئەوانەی کە سیفەتی (المتقین ) یان هەیە لە و رزق و رۆزیە کە پیان دراوە دەبەخشن بە خاو خێزان و خزم و کەس و کارو ئەو پۆل دەستە موسلمانەی کە زەکات بەخشینیا بۆ رەوا کراوە بە پیٚ شەرعی ئاینی ئیسلام ، هەر وەکو لە هەردوو صحیح دا هاتووە کە بنچینە و بناغەی ئاینی ئیسلام پیٚنچە : یەکەم : شایەدوومان ، دووەم : نوێژ کردن ، سیٚ یەم : زەکات دان ، چوارەم : رۆژووی مانگی رەمەزان ، پیٚنچەم : حەجی مالی (خوای گەورە ) .[4]

---

[1] اخرجه ابن جرير (٢٥٠/١)
[2] اخرجه ابن ابي حاتم (٢٦٣/٦).
[3] - تفسير الطبري (٢٤٣/١).
[4] -صحيح مسلم (٤٥/١) ص ٣٣ .

قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ٤﴾ [البَقَرَةِ : ٤]

﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ واتە: ئەوانەی كە باوەر دە هێنن بەو قورئانەی كە بۆ تۆ ئەی ﷴ نێراوە، ﴿وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ واتە: بەو كتابانەشی یان بەو پەرتووكانەشی كە بۆ پێغەمبەران و نێر راوانی پێش تۆ نێر راوەتە خوارەوە ، ﴿وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ٤﴾ واتە: ئەوانەشی باوەریان هێناوە بە رۆژی دوایی ..!! ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ بەلێ ئەوانەی كە باوەریان هێناوە بەو قورئانە یان ئەم كتێبە ئەی ﷴ بۆ تۆ نێراوە تە خوارەوە ، ﴿وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ وە بەو كتێبە ئاێمانیانەش كە پێش تۆ بۆ پێغەمبەران دابەزێنراون ، واتە: (تەورات ) و (ئینجیل ) ...هتد

📖 لە (ابو نملە الانصاری ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ((أنَّهُ بينما هوَ جالسٌ عندَ رسولِ اللَّهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ وعندهُ رجلٌ منَ اليهودِ مرَّ بجنازةٍ فقالَ يا محمَّدُ هل تتكلَّمُ هذهِ الجنازةُ؟ فقالَ النَّبيُّ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ اللَّهُ أعلم قالَ اليهوديُّ إنَّها تتكلَّم فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ ما حدَّثَكم أهلُ الكتابِ فلا تصدِّقوهم ولا تكذِّبوهم وقولوا آمنَّا باللَّهِ ورسلهِ فإن كانَ باطلاً لم تصدِّقوهُ وإن كانَ حقًّا لم تكذِّبوهُ)).[1] واتە : جارێكیان لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین ،لەو كاتەدا پیاوێكی جوولە كە یان یهود لێ بوو ، جنازەیەك یان تەرمێك بەلایان دا تێپەری ، جوولەكە كە ووتی : ئەی ﷴ ئایا ئەو جنازەیە یان ئەو تەرمە قسە دەكات لە گەل دوو مەلائیكەتەكەی یان دوو فریشتە كەی ناو گۆر یان ناو قەبر واتە : نەكیر و مونكیر ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوای گەورە بۆ خۆی دەیزانیت ) جوولەكە كە ووتی : بێ گومان قسە دەكات ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەگەر خاوەن نامە كان یان كتێبە ئاسمانیە واتە : جوولەكە گاورە كان شتێكیان بۆ باس كردن نە بەراستیان بزانن ، نە بەدرۆشیان بخەنەوە ..!! بلێن : باوەرمان هەیە بە خواو بە پێغەمبەرەكەی ، جا ئەگەر قسە كەیان ناحەق بوو ئەوا بەرستیان نازانن ، خۆ ئەگەر قسە كەشیان حەق راست بوو بەدرۆیان نەخەنەوە ..!!

---

[1] -سنن ابي داود برقم (٣٦٤٤).

قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ۝٤﴾ [البَقَرَةِ : ٤]

ئەو کەسانەن کە باوەریان هەیە بەوەی کە روانە کراوە تە لای تۆ ئەی محمدﷺ کە قورئانە ، وە باوەریان هیە بەوەی کە رەوانە کراوە لە پێش تۆدا وەك (تەورات ) و (ئینجیل ) و صوحوف ك موسلمانان باوەریان بە هەموویان هەیەو ئەوانە شی باوەریان بە هاتنی رۆژی دوایی یان قیامەت یەقینیان هەیە ، بێ گومان ئەوانە دەزانن قیامەت یان رۆژی دوای هەر دێت ، وە لیپرسینەوە حیسابیان لە گەل دا دەکرێت ، جا ئەگەر سەرنج بدەین ئەوەی لە پێشدا باسمان کرد کە شتە نادیارە کان یان شتە (غیبیەکان ) ئەوە یە تایبەتە بە رۆژی دواییش یان قیامەت یەکێکە لەشتە نادیارە کان یان (غیبیە کان ) ، بەلێ لەدوای ئەوەی کە زانیمان کە قیامەت یەکێکە لەشتە (غیبیەکان ) دەبێت باوەری تەواومان پێ هەبیت هیچ گومانێکی لێ نەکەین هەر وەکو لە پیشدا باسی ئەوەمان کرد کە ئەم قورئانەی هیچ گومانێك لە خۆ هەلناگری ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ﴾ هەر واشە هیچ گومانی تێدانیە ، ئەو شتانەشی کەباسکراوە لە قورئاندا هیچ گومانێك هەلناگرێ ، هەروك رۆژی دوایی یان (یوم القیامە) باسکراوە لە شتە غیبە کان بە یەقین و دلنیایی هەر بەرپا دەبێت وە ئەو رۆژە هەر دا دییێت ، بیگومان ئیمان باوەر بە رۆژی دوای گرنگی خۆی هەیە بۆ بەندەی ئیمانداری موسلمان ، چونکە ئەم باوەر هێنانە بەراستی مرۆڤەکان دەگێریتەوە لە گوناهو تاوان فسادی خراپە کاری لە سەر رووی زەویدا ، چونکە مرۆڤ سروشتی وایە ئەگەر بزانێت لێ پرسینەوە نیە محاسبە ناکرێت و حیساب کتابی لە گەلدا ناکرێت وەك ئاژەل لەسەر زەوی رەفتاردەکات و دەست دەکات بە خراپە کاری ، بەلام ئەگەر بزانیت رۆژێك هەیە کە حیساب لێ پرسینەوە لە گەلدا دەکرێت ئەوا ترسی لێ دەنیشێت حیساب بۆ ئەم رۆژە دەکات خۆی بۆ ئامادە دەکات ، بێ گومان دووشت زۆر گرینگە لە ژیانی مرۆڤ دا ئەویش ئەمانەن:

یەکەمیان : باوەر بوونە بە خوای تاك تەنها ، بە توانا بە ئاگا زاناو داناو کار بەجێ یە ،وە بیسەر و بینەرە ،وە گەورەو داپەروەر کە هیچی لا وون نابێت زولمیش لە کەس ناکات و هیدایەت دەرو رێ نیشاندەری ئەوکەسانەی کە تقوا دارو لە خوا ترسن ...!!!

دووهەمیان:باوەر بوونە بە هاتنی رۆژی دوایی یان رۆژی قیامەت کەحیسابی لە گەلدا دەکرێت ، کە گرنگترین دافع وپالنەری مرۆڤە بۆ چاکەکاری و ، وە دوورکەوتنەوە لە خراپەکاری و فسادی زولم ستەم کردن ، جا ئەو کەسانەی کە ئەم پێچ سیفەتەیان تێدا بەدی بکرێت کە لەپێدا باسمان کرد ئەوا ئەو کەسانە لە (المتقین ) یان لە پارێزگارانن ..!!

بەلێ ئەگەر سەرنج بدین پێنج ئایەتی سەرەتای سورەتی (البقرە ) پێنج سیفەتی (المتقین) یان پاریزکاران باسدەکان ، ئەو سیفە تانەی کەلە پیشدا باسمان کرد دوو سیفەتیش لە ئایەتی چواری باسدەکا ئەوەی باوەرهێنانە بە قورئان و کتێبە ئاسمانیە کان وە ك : (تەورات ، ئینجیل ، زبور ، صوحوفی ابراهیم و موسا ) هەروەها سیفەتێکی تریش باوەر هێنانی یەقین یان دلنیایە بە رۆژی دوای یان رۆژی قیامەت ، چونکە ئە پێنج سیفەتە کە ئیمانداری یان باوەردا دەبێت یەقینی تەواوی پێ هەبێت ئینجا تەقواداری یان پارێزگاری راستەقینە هەژمار دەکرێت ، چونکە ئەم پێنج سیفەتە گرنگی و تایبەت مەندی خۆی هەیە بۆ باوەر داری راستە قینە لە ژیانی دونیادا ، ئەگەر ئەو سیفەتانی کە باسمان کرد تیایدا بەدی بکرێت ئەو سەر کەوتوو سەر فەراز دەبێت لەدونیاو لە ئاخرەتی دا ..!!

﴿وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ﴾ بەڵێ لەبەر گرینگی تایبەت مەندی بە رۆژی دوایی ، چونکە ئیمان هێنان بە رۆژی دوایی گەورەترین هۆکارە بۆ جیٚ بەجی کردنی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ چونکە دبێتە خۆپارستن لە قەدەغەکراوەکان یان نەهی کراوە کان ، چونکە هەر پاداشتێك لەسەر کردەوەکەی دەدرێتەوە ، هەر سزایەکیش لە سەر کردەوەکەی دەدرێتەوە ، لە ( عمری کور خەتاب ) — خوا لی رازی بێت — دەڵێت : ئەگەر ئیمان هیچنان بە رۆژی دوایی نەبوایە ئەوە خەلکیت دەبینی بە شتێك هەر گیز نەت بینیووە ، واتە : خەلکی بە ئارەزوو و هەواو نەفسی خۆیان شوێنی حەزەکانیان دەکەوتن ، هەر بۆیە پیٚ دەلێن (الاخرە) یان دوایی ، چونکە رۆژی زیندوو بوونەوەیە لەدوای بەجی هیشتنی ژیانی دونیا ، هەروەها (ابن قیم ) —رەحمەتی خوای لیٚ بێت — دەڵێت : یەقین یان دلنیای رووحی کردەوەی دڵە ، رووحی کردەوە کانی ئەندامەکانی لاشەیە ، راستەقینەی راست گۆییە ، هەر کاتێك (یەقین ) گەیشت دڵ ئەوا دڵ پردەبێت لە نور رووناکی ، چونکە نەریٚ یان نەفی هەموو گومانێك دەکات (یەقین )..!!

بەلیٚ سیفەتی (المتقین ) یان لە خوا ترسان ، باوەر هێنانی (یەقینە ) بە رۆژی دوایی ئەویش لە ناخی دلیەوە یەقین و دلنیایە هەیە کە ئەم رۆژە هەر بەر پادەبێت ، ئەم باوەرش دەبەستێتەوە بە رۆژی دواییەوە ، وە چونکە کردەوە سەر ئەنجام چارەنووسی لەم رۆژە دایە ئەم رۆژە پاداشت و سزایی تێدا بەدی دەکرێت ، هەر بۆیە ئادەمیزاد ئاگادرا دەکاتەوە بەوەی کە لە خۆرایی دورست نەکراوە ، هەرگیز بە بیٚ لیٚ پرسینەوە و حیساب کتاب و پاداشت و سزا لەم رۆژە دا تێپەر نابێت ، دەبێت هەموو کەسێك ئەم راستیە بزانێت یان ئەم حقیقە تە بزانێت ، هەر وەك چۆن مردن دەبێت هەموو کەسێك بی چێژی ، ئاواش دەبێت وەك مردن یەقیمان هەبێت رۆژی دوایی هەر بەرپا دەبێت ، خۆ ئەگە ر لە هەر وەلاتێك دا دادە یەکی نیمەچە راستە قینە بێت ئەوا رێژەیی گوناهو تاوان و خراپە کاری کەم دەبێتەوە زلم و ستەم کەمتر دەبیتەوە ، خەلکی لە ئارامی دادپەروەی دا دەژین و ، تۆلە و تۆ لە سنە وە رێژەی کەم تر دەبێت ،هەروەها بە پێچەوانەوە ئەگەر دادپەروەی نەبێت وەلات چی بەسەر دێت ، خراپە کاری روو لەزیاد بوون دەکان کشتن و دزی و جەردەیی بە پادەبێت چونکە ناترسن لەوەی کە لیٚ پرسینەوەیان لەگەل دا بکرێت و هەروەك دەڵێن : دزو خاوەن مال یەك بێت گایی لە کولانە ئاوا دەکەن ، ئیمەش دەبینین خراپە کای بۆیە لەم سەردەمە دا روو لە زیاد بوون بۆیە خراپی دادپەروەی حکومرانانی جیهانە بەتیبەتی وەلاتی خۆمان ، چونکە خەلکی متمانیان بەدادەپەروەی سەرکردەکانیان نیە ، هەر بۆیە ئەگەر لە ترسی رۆژی لی پرسینەوەنەبێت ئەم جیهانە دەبێتە جەنگەلەستان وەکو ئاژەل رەفتار لە گەل یەکتری دەکەن ، ترسی (خوای گەورە) گرنگی خۆی هەیە بۆ رۆژی دوایی چونکە (خوای گەورە ) دادپەروەری داداپەروەرانە هەر وەك دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ ٨﴾ [التِّين : ٨] واتە: ئایا (خوای گەورە ) چاکترین فەرمانرە وا نیە ..؟! داپەروەرترین فەرمانرەوا نیە ؟! کەچی تۆی سەر کەش پێی رازی نیت ..!! هەروەها رۆژی دوایی زۆر گرینگە مرۆڤ لیٚ بترسیت و بیری لیٚ بکاتەوە چونکە (خوای گەوە ) لە بەر گرنگی ئەم رۆژە دا سوێندی پیٚ خواردووە ، کە دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١﴾ [القِيَامَة : ١] واتە : سوێند خوادرنی (خوای گەورە ) بۆ رۆژیی دوایی یان رۆژیی قیامەت ..!!کاتێك (خوای گەورە ) سوێندی بەم رۆژە خوادووە مەبەست لیٚ ئەوەیە کە یەقیمان هەبێت ئەو رۆژە هەر بەر پادەبێت ، وە کو هاتنی رۆژیی دوایی و زیندوو بوونەوەو هەلسانەوە نێو گۆر ، هەروەها وەستانی لە رۆژی محشر چاوەروان کردن و ، بۆ لیٚ پرسینەوە حیساب کتاب وەرگرت ، دادپەروەی کردنی خەلکی لەم رۆژە.

قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ [البَقَرَةِ : ٤] بێ گومان سیفەتەکانی تقواداران ئیمان هێنانە بە قورئان کە دابەزیوەتە خوارەوە بۆ پێشەوایی مرۆڤایەتی ﷺ ، وە هەروەها ئیمان هێنانە بەو کتابانەی یان کتابە ئاسمانیەکانی پێش هاتنی وەحی و نیگا بۆ پێغەمبەری ئاخر زمان دابەزیوە ئەویش ئەو کتابانەن کە وەکو بۆ قەومی بنی ئیسرائیل هاتووە وەك (تەورات و ئینجیل و زەبوور ) هەروەها ئەوانەشی کەی بۆ قەومەکانی تری هاتۆتە خوارەوە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَـٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَـٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُ﴾ [النِّسَاء : ١٣٦] واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان بە خوای پەروەردگار و بەپەیامبەرەکەی صلى الله عليه وسلم هێناوە وبەڕاستان زانیوون وکردەوەتان بەشەرعەکەی کردووە، بەردەوام بن وسور بن لەسەر ئەو باوەڕ وبەڕاست زانینە یەکلایەی کە لەسەرین بەخوای پەروەردگار وپەیامبەرەکە موحەممەد صلى الله عليه وسلم، و لە گوێڕایەڵیکردنیان، وە بەو قورئانەی کە دایبەزاندۆتە سەری و بەهەموو ئەو کتێبە ئاسمانیانەی دایبەزاندووە بۆ پەیامبەران ..!!**هەروەها** دووبارە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ﴾ [العَنكَبُوت : ٤٦] واتە : وە بڵێن : ئێمە باوەڕمان هێناوە بەو قورئانەی کە بۆمان دابەزیوە، و باوەڕمان هەیە بەهەردوو تەورات و ئینجیلەی کە بۆتان دابەزیوە..!! قال تعالى: ﴿بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ۝٤﴾ [البَقَرَةِ : ٤] ئەوە ئیمان و باوەرە دامەزراوەیە کە پلەی یەقینی هەیە یان دەگاتە پلە دلنیایی تەواو کە هیچ شك یان گومانێك هەلناگرێت بەوە ی کە قیامەت یان رۆژی دوایی هەر بەرپادەبێت ،کە رۆژی پاداشت و سزایە ، وە رۆژی لێپرسینەوەو حیساب تەرازوو میزانە وە ، ﴿بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ﴾ ئەم ئیمان هێنانە بە رۆژی دوایی بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم رۆژە یان رۆژی قیامەت زۆر گرینگە و مهیمە رۆژێکی تایبەتە بۆگرۆی ئادەمیزاد ، چونکە لەم رۆژە دا حەق ناحەق لێك جیا دەکرینەوە دادپەروەیی راستە قینە بەدی دەکرێت ، ژیانێکی تازە دەست پێدەکات کە ژیانێکی هەمیشەیی بۆ هەتاهەتایی لێرەدا دە توانین بلێن : ژیانی راستەقینە دەست پێدەکات ، ژیانی دونیا وەکو شانۆیەکی پڕ لە تاقی کردوە بووە ، مرۆڤی چاك خراپ لەم رۆژە دا رووی راستەقینە یان ئاشکرا دەبێت کە جۆن ژیانی دونیا یان تێپەران بەم هەموو تاقی کردنەوەی (خوای گەورە ) وە کردەوەکانیا جۆن بووە لە دونیادا ، هەر بۆیە ئیمان هێنا بەم رۆژە واتە (یوم قیامە ) زۆر گرینگە چونك ئیمان ئامادەیە بۆ پابەند بوون بە کارو کردەوە چاکەکان وە دوور کردنەوە لە کارو کردەوە خراپە کان ، بۆیە ئەگەر دوو بارە دەربارەی ئیمان و باورە هیچنا بدوێن هیشتان هەر باسی هیچمان نەکردووە کە گرینگی چیە بۆ ژیانی مرۆڤ بۆ ئاخرە یان بۆ رۆژی دوایی ، ئەگەر بروانینە ووشەی: ﴿يُؤۡمِنُونَ﴾ واتە : ئیمان و باوەر، وە زانایانی فەرمووده پێ یان وایە (ئیمان ) سێ شتە :

١-باوەر هێنان بە دڵ بەوەی ك پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم قورئانەی بۆ هاتۆتە خوارەوە لە لای (خوای گەورە) و وەری گرتووە ، وە بە ئێمەی گەیاندووە ..!!

٢-ئیقرار یان دانپێدانان دەربرین بە زمان وەکو ووتنی (التوحید ) یان ووتنی (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمد رسول الله..!!

٣-بەجێ هێنانی ئەوەی کە واجب فەرزە موسلمان دەبێت بە کردەوەی لاشە یان جستە ئەنجامی بدات ، و دوور کردنەوە لە و کردەوانەی کە ئیسلام و شەرعی خوا و پێغەمبەرەکەی قەدەغەیان کردووە ..!!

هەروەکو راست و دروستی و حقیقەتی (ئیمان ) راست و دروستی دل و دەروونە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ١٧﴾ [يُوسُف : ١٧] واتە : تۆ هەمیشە باوەرمان پێناکەیت ئەگەر چی ئێمە راست گۆش بین ..!! هەر بۆیە (ئیمان ) دەبێت یەقین و باوەر راست گۆیی بێت بە دل ، هەروەها دەبێت دان پێدانان بێت بە زمان ، وە کار کردن بیت بە لاشە یان جستە کردەوەکان ئەنجام بدێت ..!! هەر وەکو ووتمان هەموو باوەر دارێك ئیسلامە ، بەلام هەموو ئیسلامێك باوەردار نیە.!

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡ﴾ [الحُجرَات : ١٤] واتە : عەرەبە دەشتەکیەکان ـ کە دەوار نشینەکان بوون ـ ووتیان : باوەڕیکی کامڵ و تەواومان بە خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی صلى الله علیه وسلم هێناوە، تۆش ـ ئەی پەیامبەری خوا صلى الله علیه وسلم ـ پێیان بڵێ : بانگەشەی تەواویتی باوەڕ بۆ خۆتان مەکەن، بەڵکو بڵێن : موسوڵمان بوین، لەکاتێکدا کە هێشتا باوەڕ نەچووەتە ناو دڵەکانتانەوە..!! ئەگەر سەرنجێك بدەین بە ووشەی ﴿وَبِٱلۡأٓخِرَةِ﴾ کە لەچەندین شوێن دا هاتووە لە قورئانی پیرۆزدا ، بە سیفەتی (الدار ) واتە : مال یان پێگە و پاناگە دێت ، هەرەکو (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٦٤﴾ [العَنكبُوت : ٦٤] واتە: بەڕاستی ئەم ژیانی دونیایە هیچ نیە جگە لە ڕابواردنێکی بێهودە و گاڵتە و گەپ نەبێت، دڵەکان تێیدا ڕادەبوێرن و جەستەکان تێدا یاری دەکەن، بەهۆی ئەو زینەت و جوانی و ئارەزووانەی کە تێیدایە، پاشان بە خێرایی لەناو دەچێت، وە بێگومان ماڵی دوارۆژ کە بەهەشتە ئا ئەوە ژیانی ڕاستەقینەی هەمیشەییە کە مردنی تێدا نیە، ئەگەر خەڵکی ئەوەیان بزانیایە ئەوا ماڵی لەناوچوویان ـ کە دونیایە ـ هەڵنەدەبژارد بەسەر ماڵی هەمیشەیی و بەردەوامدا ـ کە بەهەشتە ـ ..!! بەلێ وەصف کردنی دوا رۆژ بە مال ، ئەوە دەگەیەنی کە دوا مەنزلگای و سەر ئەنجامی هەموو کەسێك رۆژی دواییە ، چونکە مالی دونیان وەکو سراب یان خەونێك وایە بۆ هەمیشەیی نیە ، ئەگەر سەرنج بدەین بە ووشەی ﴿ٱلۡحَيَوَانُ﴾ لێرە دا بەمانای ژیانێکی هەمیشەیی دێت یان بە مانای زیندوو دێت بۆ هەمیشەیی ، چونکە ووشەی ﴿ٱلۡحَيَوٰةُ﴾ بە مانای ژیانی دنیا دێت واتە : ژیانێکی کاتی لەم جیهانە دا بەسەر دەبرێت ، بەلام ئەگەر سەرنج بدین دەبینین لە پێش ووشەی ﴿ٱلۡحَيَوٰةُ﴾ ووشەی (الاخرە) هاتووە کەواتە ژیانێکی هەمیشەییە بۆ هەتاهەتایی تێدا دە ژین، وە لە شوێنە دا یان لەم مالە دا زیندووین ، بەلام لە ژیانی دونیادا هەمیشەیی نیە بەلکو وەکو مردوو واین یان وەك خەونێك یان وەك سرابێکە لە بەر چاومان یان وە ك گەشت کردنیچکی کاتی دێت و بەسەر دەچیت ژیانی دونیا ، هەروەکو لەدوای ووشەی ﴿ٱلۡحَيَوٰةُ﴾ ووشەی (دونیا ) هاتووە یان ووشەی (لهو ) و (لعب ) هاتووە ، بۆیە ژیانی دونیا ژیانێکی کاتیە بۆ هەمیشە یی نیە ، پرە لە تاقی کردنەوە پەروەردگار بۆ بەندە کانی ، بەلام ئەوەی ژیانی راستەقینە یەو بۆ هەمیشە یی زیندوو دمێنێتەوە ئەوا ﴿ٱلۡحَيَوَانُ﴾ ژیانی قیامەتە یان ژیانی دوا رۆژە ،هەربۆیە دەبێت یەقین یان دلنیابین لەوەی ئەو رۆژە هەر بەر پادەبێت ، ﴿يُوقِنُونَ﴾ چونکە ووشەی (یوقنون ) هیچ گومانێك هەلناگرێت ، دەبێت تەواو دلنیا بین لەم رۆژە کە بەر پادەبیت ، هەرچەند ئەوانەی کە زالم و ستەم کار کافر و موشریکن یان مولحیدە باوەریان بەم رۆژە زۆر کەمە کە بەر پادەبێت ، هەر بۆیە تۆیی خراپە کاری و فسادی لە سەر رووی زەوی دا دەچێنن ، ئێمەی موسلمانی باوەرداری راستە قینە باوەری تەوامان هەیە بە (الله ) وە قورئان ، پێغەمبەران و ، کتێبەکانیان ،وە رۆژی دوایی و لێپرسینەو حیساب کاتب تەرازوو میزان پردی صراط و پاداشت و سزاو ، وە بەهەشت و دۆزەخ ، بە دل و بە زمان و بە کردەوە ئەی سەلمێنین باوەردارین ؟!

✍ لە رێ (ابن اسحاق بسندە) لە ( عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ دەڵێت : باوەر هێنان و بەراست زانین بەوەی کە لە لایەن (خوای گەورە ) رەوانە کراوە ، بەوەشی کە پێش ﷺ هاتووە بۆ پێغەمبەران – علیه السلام – هیچ جیاوازیە ك نیە لە نێوان پێغەمبەران – علیه السلام – وە هیچ ئینکار نابین بەوەی کە هاتۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەران – علیه السلام – کە لە لایەن (خوای گەورە ) هاتووە بۆیان ).[١]

✍ لە (قتادة ) – رە حمە تی خوای لی بیت – لە سە ر ووتە ی ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ دەڵێت : واتە : الفرقان ) ئەوەی کە (خوای گەورە ) جیاوازی لە نێوان حەق و باطل دە کات ، وە ﴿وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ دەڵێت : واتە : ئەو کتێبانەی کە پێشوو تر هاتوونەتە خوارەوە لە لایەن (خوای گەورە ) ..).[٢]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لی بیت - لەسەر ووتەی ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ دەڵێت : مانایی بەراست زانین بەوەی کە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە ئەی ﷺ ئەو قورئانە لە لایەن (خوای گەورە ) ، وە ﴿وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ دەڵێت : واتە : لە سەر پێغەمبەران دابەزیوە واتە: (تەورات، ئینجیل ، زبور ) ).[٣]

✍ لە رێ (ابن اسحاق بسندە) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت - لەسەر ووتەی ﴿وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ﴾ دەلیت : واتە : زیندوو بوونەوەی رۆژی حەشر ، وە (القیامە ) رۆژیی دوایی ، بەهەشت ، دۆزەخ ، لێپرسینەوە (الحساب ) ، تەرازوو (المیزان ) ، ئەو کەسانە ناگرێتەوە کە سەردەستەی ئەوەن کە باوەریان هێناوە بە پێش تۆ ، وە بێ باوەر بوونە بەوەی کە لە لایەن (خوای گەورە ) بۆ تۆ هاتووە واتە : بێ باوەر بوونە بەوەی کە لە قورئان هاتووە ..).[٤]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لی بیت – لەسەر ووتەی ﴿وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ﴾ دەڵێت : واتە : بەرست زانین بەوەی کە زیندووبوونەوە لەرۆژی مەحشردا ،بەوو=ەی کە پاداشت دەدرێنەوە بە گوێرەی کارو کردەوەکان بۆ هەموو شتەکان یان زیندووەکان یان کائن نەکان ...).[٥]

[١] -سیرة ابن هشام (٥٣٠/١).
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٨/١).
[٣] -تفسیر مقاتل بن سلیمان (٨١/١).
[٤] - سیرة ابن هشام (٥٣٠/١).
[٥] -تفسیر مقاتل بن سلیمان (٨٢/١).

قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ۝٥﴾ [البَقَرَةِ : ٥]

﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡ﴾ خاوەنیس ئەم سیفەتانە ئەوانەی کە لە پێشدا باسمان کرد پێنج سیفەت بوو ، ئینجا ئەو کەسانە لە سەر هیدایەت و ڕێنموویی ڕێگای راستن بە تەوفیق و یارمەتیدان لە لایەن پەروەردگاریانەوە ، ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ وە هەر ئەو کەسانە کە خاوەنی ئەم سیفەتەتانە رزگار بوو و سەرفرازن لە ژیانی دونیان لە دوارۆژ دا ، چونکە خاوەنی بەنرخترین و گرینگ ترین سیفەت لە ژیانی دونیادا ، بۆ ئەوەی بگەن بە پلە ی سەرفرازی و سەر کەوتنی یەکجارەکی کە ژیانی دوایی مردنە ..!

بێ گومان ووشەی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ وەسف کردنی ئەو کەسانەیە کە لە پێشدا باسمان کرد ، کە باوەریان هێناوە بە شتە نادیارە کان یان (غیبییەکان) ئەویش ئەمانەن : باوەر هێنان بە (خوای گەورە ) بە ( فریشتە کان ) بە (پێغەمبەران ) بە (کتێبە کان ) بە (یوم القیامە یان رۆژی دوایی ) بە ( بەهەشت ، دۆزەخ ) بە (رۆژی زیندوو بوونەوە ) بە (یوم الحساب ، رۆژی لێ پرسینەوە ) بە (المیزان ، تەرازوو ) ...هتد ) بەلێ بروا بوون یان ئیمان هێنان بەمانەی کە باسمان کرد ئەوانە پایەکانی ئیمانن لە ئاینی ئیسلام دا ن هەر لە بەر ئەوەش گەورەترین هاندەر لەسەر ئارەزوو (الرغبە ) و ترس (الرهبە ) کارکردن بە (الیقین ) واتە: دلنیایی : بریتیە لەو زانستە تەواوەی کە کەمترین گومان هەلناگرێ و وە کرداری چاکە کردن بەدوای خۆیدا دەهێنێ ، وە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ واتە: ئەوانەی وسف کران بەو سیفە تە ستایش کراوانە ، ﴿عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡ﴾ واتە : لەسەر ڕێنمایەکی مەزنن، چونکە (نکرە ) یان نەناسراو بۆ مەزن دانانە ، جا چ ڕێنماییەك مەزنترە لەو سیفە تانەی کە باسکران ، کە بیرو باوەری راستەقینە و کردەوەی راست تەندروست لە خۆ دەگرێ ، وە ئایا هیدایەت و ڕێنماییەکی راستەقینە هەیە جگە لە ریچنمایی برواداران ، جگە لەو رینماییە ئەوەی پێچەوانەی بێت ئەو گومرایی و سەر گەردانیە . بەلێ (علی ) بە حرف جر بە کار هێناوە لەم رەستەیە دا وەکو ﴿عَلَىٰ﴾ بەمانای بەرز بەلند یان سوودی (الاستعلاء ) بەلگە یە لەسەر بەرزی و بلندی ، هەروەها (الواو ) بەکار هاتووە وە کو حرف العطف ، ئەوەش لەزمانی عەرەبی دا دەبێتە (المبتدا الثاني ) ئەوە ش بۆ سەر بەخۆیی هیدایەت و ڕێنمویی بۆ سەر فرازیە کە دبێتە جیاکردنەوەی لەوەی کە خراپە کاری و تیاچوون هەلدەبژێریت ، وە قا﴿هُمُ﴾ (ضمیر منتصل الغائب في محل رفع ) بۆ (التأکید والحصر ) بۆ پشتراستکردنەوە سنوور دار کردنە بە کار هێنراوە ، واتە : سنوور داری کردووە تەنها بەو کەسانەی ئەم سیفەتانە یان هەیە لە پێشدا باسمان کرد ، ئەوانەش سەرفرازن ، ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ ئا ئەوانە سەفرازن ، ووشەی (الفلاح ) بریتیە لە : سەرکەوتن و بەدەستهێنانی دوا کراوە کان و رزگاربوون لە ترساوە کان ن سەرفرازی کورت کردۆتەوە لەوانەدا ، چونکە هیچ ڕێگایە ك نیە بۆ سەر کەوتن و سەرفرازی تەنها بە گرتنە بەری ڕێگاکانی ئەوانە نەبێت لە پێشدا بەسیفە تەکانیان باسکران ، جا جگە لەم ڕێگایە هیچ ڕێگایەکی

تر نیە ، هەر ێگایەکی تر بگریتە بەر ئەوا رێگای خراپە کاری و تیاچوون و خەسارەتمەندانە ، بێ گومان خاوەنەکەی بەرەو لە ناو چوون دەبات ، هەر لە بەر ئەمە کاتێ باسی سیفەتی ئیمانداری راستەقینە دەکات ، وە باسی سیفەتی بێ باورە کانیش دەکات ، ئەوانەی کوفرەکەیان ئاشکرا کردوەو نکۆلیان لی کردوە ، پەنا بەخوا لە ئایەتەکانی دوایدا باس و تەفسیری دەکەین کە لەدوای ئەم ئایەتەدا باسی سیفەتی کافران و موشریك و دوو روو و مولحیدە کان دەکات هەر لەسورەتی (البقرە ) دا ..!!

قال تعالی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ﴾ بەلێ واتە : ئەم خودا پێداوانە کە رێمووی ئەوانەی کردووە بۆ رێگای هیدایەت و رێگای راست ، ئەو کەسانە بەرنامەی ژیانیان بە تێگەیشتن و تێرامان وە بیرو هۆشیان دەخەنە گەر بۆ رێبازی راستە قینەی خوا پەرستی و وە باوەریان هیناوە بە شتە نادیارە کان و باوەرێکی راستە قینە دامەزراویان هەیە ، ئەوەش (پەروەردگاریان ) هیدایەتی داون رێنمووی کرد، ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾ بەلێ هەر ئەوانە لە ناخۆشیەکانی رۆژیی دوایی دا سەفراز دەبن سەکەوتوو دەبن ،چونکە لە پێشدا خاوەنی سیەفەتی بەرز و مەزن گرینگ بوو لە ژیانی دونیادا ئەوەی کە لەپێشدا باسمان کرد لە سیفە تەکان ئەویش باوەرهێنان بوو یان ئیمان هێنان بوو بە شتە نادیارە کان یان شتە (غیبیەکان ) ، چونکە ئەو کەسانە ئەوەی کە ئامانج مەبەستیان بوو یان لێ دە ترسان بەدەستیان هێناو سەفراز و سەر کەوتوو بوون لە رۆژی محشر یان لە رۆژی قیامەت دا ، بەلی ئەگەر سەرنج بدینە ئەم پێنج یایەتەی سورەتی (البقرە) دەبینین کە دوو شتی زۆر گرینگ باسکراوە ئەویش : -بناغەو دیوارە — بناغەکە بریتیە لە (ئیمان یان باوەر ) وە نوێژ کردن مال بەخشین ، دویوارە کەش بریتیە لە پەیرەوە کردنی قورئانی پیرۆز ، کۆی هەمووشیان دەبێتە (التقوی ) یان خۆ پاراستن ، هەر بۆیە خەلیکی زۆر لەم بارەیەو زۆر غافل بێ ئاگان ، هەر بۆیە کەمێك باوەریان بە قورئان هیە بە نیوە چلی نوێژە کان ئەنجامدەدن و بە نا دلی زەکاتی مالی خوا دەدەن ، کەچی خۆیان بە (المتقین ) دەزانن کەچی لە فەرمانە کانی تری قورئان زۆر بێ گان ..!!بەلێ ئەگەر سەرنجیچك بدەین لە ژیانی و سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە سەرکەوتوو سە رفرازان دە ناسینەوە ، ئەوانە کە بە شەو رۆژ هاوەلی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕواو ئیمانیان پێ هێنا بە شتە (غیبە کانی ) کە باسی بۆ دە کردن وە کو ( الله ) و (قورئان ) و (فریشتە کان ) و (کتێبەکانی پێش خۆی ) وە (پێغەمبەران ) وە (یوم القیام او یوم الحساب ) ...هتد نموونەی باشترین هاوەلی باوەر دار کە (ابو بکر صدیق ) بوو ، لە باسی (ئیسرا و میحراج ) بێ شەك و گومان باوەری پێ هێنا ، هەروەها هەئەوانە (التقوی) خۆپارستنیان ئەنجامدەدا ، لە مککە بەرانبە ر بەکافران بانگەوازیان دەکرد ، لە شاری مەدینە بە رانبەر بە کافر مونافیق و یهود جیهاد و تێ کۆشانیان دەکرد لە پێناوی بەرز راگرتنی (التوحید ) (لا إله إلا الله ) ، بەلی ئەو سیفەتانەی هاوەلان پێغەمبەری خوا ﷺ نیشانەی لە خوا ترسان بوو ، ئەوانەش بوون لە کۆچ کەور پیشتیوانیان کە لە شاری مەدینە دا بوو ، هەروەها (خوای گەورە ) ئەو کۆمەلە موسلمانەی کە لە سەرتایی هاتنی ئاینی ئیسلام هیدایەت دا رێنمووی کردن باوەری لە دلیان دامەزران بۆ بە هیدایەت بۆ هەموو گرۆی ئادەمیزاد لە سەر رۆی زەویدا ، جا هەر لەبەر ئەم هەلویستەی هاوەلانە بوو کە نیشانەی (التقوی ) داری راستە قینەیان لی بەدی دەکرا ، جا ئەوانە یەکەم شایەن بوون بە وەسف و سەنا موژدەبەخشین بە سەرفرازی و سەرکەوتن بۆیان ،چونکە هەموو سیفە تی (المتقین ) یان لە خۆ گرتبوو ، ئەوانیش کە (مفلحون ) یان سەفراز بوون..!!

بەڵێ پێنچ ئایەتی سەرتایی سورەتی (البقرە) پێنج سیفەتی گرینگی (المتقین ) لە خۆ دەگرێت ئەمانەی خوارەوەن :

یەکەم : ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ [البَقَرَةِ : ٣] واتە: ئەوانەی باوەر دەهێنن بەشتە نادیارو پەناهاکان یان غیبیەکان ، ئەوانە دە گرێتەوە : (الله ) وە (فریشتەکان ) وە (قورئان ،یان کتێبە ئاسمانیەکان ) وە (پێغەمبەران بی جیاوازی ) وە (رووح ) وە (رۆژی دوایی یوم القیامە ) وە (یوم الحساب یان رۆژی لێ پریسنەوە ) وە ( بەهەشت و دۆزەخ ) وە ( المیزان تەرازوو ) وە (پردی صراط)...هتد

بەڵێ یەکەم سیفەتی ئیماندار یان (المتقین ) ئەوەیە کە باوەر بەهێنی بە شتە غیبیەکان نادیارەکان لە ژیانی دونیادا چونکە قورئان و پێغەمبەری خوا ﷺ هاوالی پیداوین دەبێت ئیمان و باوەرەی راستەقینە مان هەبێت بە پلە ی (الیقن ) یان دلنیایی تەواو ..!!

دووەم : قال تعالی: ﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣] واتە : نوێژ بەرپادەکەن و نوێژەکانیان بەرێك وپێکی ئەنجام دەدن ، بۆ پەیوەندی بەستن بەزاتی (الله ) کە نادیارە ئەویش پەروەردگاری جیهانیانە ، دەبێت (المتقین ) لە نوێژە کانی بەردەوام بێت ..!!

سێیەم : قال تعالی: ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ۝٣﴾ [البَقَرَةِ : ٣] واتە : هەر ئەوانەن کە حەقی (خوای گەورە ) جێ بەجێ دەکەن ،بەلکو حەقی خەلکیش جێ بەجێ دەکەن ، لەوەی کە پێمان داون لە : سەر وەت سامان و مال و خواردن و خواردنەوە ، ئەوانەن جا هەرچی کە پێیان دراوە دەی بەخشن لەسەر وەت سامانیان بە خاو خێزان و کەس و کارو خەلکی هەژراو نەدارو فەقیر لێ قەوماو..!!

چوارەم : قال تعالی: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ [البَقَرَةِ : ٤] واتە: ئەوانەن کە ئیمان و باوەر دەهێنن کە بۆیان رەوانە کراوە کە ( قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا یە ﷺ چونکە ئەویش لە لایەن (خوای گەورە ) بە وەحی ونیگا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە ، وە ئیمان و باوەریش دەهێنن بۆ ئەوانەی کەپێش تۆ نێردراوە بۆ پێغەمبەران – علیە السلام – کە (کتێبە ئاسمانیە کان ) کەواتە : موسلمان هەر لە سەرتاوە خۆش رفتار و (المتسامح ) کراوەن ، ئەوە تا هەر لە سەرتاوە فێرمان دەکات قورئانی پیرۆز کە ئیمان باوەر بهێنن بە هەموو (ئاسمانیەکان ) هەلبەت راستەکانیان نەك ئەوانەی دەسکاری کراون و گۆران کە لە ئێستا دا یهود نصرانیەکان کتێبە ئاسمانیەکانیان دەست کاری کردووە لە بەرژەوەندی خۆیان و ئارەزووەکانیان بەکار دەهێنن .!!

پێنچەم : قال تعالی: ﴿وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ۝٤﴾ [البَقَرَةِ : ٤] واتە: ئەوانەی کە یەقین و دڵ دامەزراوییان هەیە بە رۆژیی دوایی یان یوم القیامە ) یان باوەریان بەزیندوو بوونەوە هەیە لە دوای مردنی ژیانی دونیادا ، یان باوەریان بەرۆژی لێ پرسینەوە (یوم الحساب ) هەیە ...!! بێ گومان ئەو کەسانە بەم پێنچ سیفە تە سەر کەو توو سەرفراز دەبەن لە رۆژی دوایی دا ،ئەوانە کە لەسەر رێنمووی هیدایەتی (خوای گەورە ) دەرۆن و پەیرەوەی دەکەن ، ئەوانەش سەرفراز و سەر کەوتوون ، وە لە رزگار بووە کانن..!!

قال تعالی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ۝٥﴾ [البَقَرَةِ : ٥] واتە: خاوەنانی ئەم سیفەتانە لەسەر نور ورووناکین لەلایەن پەروەردگاریانەوە، و بە تەوفیقی دروستکار و هیدایەت دەریان، وە هەرئەمانەش براوەن و ئەوانەشن کە ئەوەی ویستویانە دەستیان کەوتووە و ئەوەشی لێی هەڵاتوون ڕزگاربوون لێی ..!!

✍ لە ری (السدی) لە (أبي مالك وأبي صالح) لە (عبدالله بن عباس) – رازو رەحمەتیی خوا یان لی بیت – لە سەر ووتەی ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ دەلێت : واتە : مەبەست لێ باوەردارانی عەرەبە ، ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ واتە : مەبەست لێ باوەردارانی (أهل الکتاب) واتە: خاوەن نامە کان لە جوولە کە و گاورە کان یان (یهود و نصرانیەکان) کۆی ئەم دوو گروپە یان کۆی ئەم دوو کۆمەلە ، واتە : قال تعالی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى﴾ .[1]

✍ لە رێ (ابن اسحاق) لە (عبدالله بن عباس) – راز و رەحمەتی خوا یان لی بیت – لەسەر ووتەی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡ﴾ واتە: لەسەر روناکی یان رۆشنایی لە لایەن پەروەردگارەوە ، وە خۆراگری و بەردەوام بوون لە سەر ئەوەی نێردراوە لە لایەن (خوای گەورە) واتە : قورئان یان راسگۆیی لە گەل ئەوەی کە هاتووە ..!! ).[2]

✍ لەرێ (عطاء بن دینار) لە (سعید بن جبیر) – رە حمە تی خوا یان لی بیت – لە سە ر ووتە ی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡ﴾ واتە: لەسەر نیشانە و بەلگەی پەروەردگارە واتە : لەسەر قورئانی پەروەردگار هیدایەت دەدرێن )[3]

📖 لە (عبدالله بن عمر) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : (( قيل : يا رسول الله ، إنا نقرأ من القرآن فنرجو ، ونقرأ فنكاد نيأس . فقال : (( ألا أخبركم عن أهل الجنة وأهل النار ؟!)) . قالوا : بلى ، يا رسول الله . فيقال : ﴿الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢﴾ [البَقَرَةِ : ١ - ٢] إلى قوله : ﴿ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥﴾ (( هؤلاء أهل الجنة )) .قالوا: إنا نرجو أن نكون هؤلاء . ثم قال : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٦] . إلى قوله : ﴿عَظِيمٞ ٧﴾ [البَقَرَةِ : ٧] . (( هؤلاء أهل النار )) . قلنا : لسنا هم ، يا رسول الله ..؟! قال : ((اجل )) ...)).[4] واتە: ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من قورئانم دە خوێندەوە نزاو پارانەوەم دەکرد ، وە دم خوێندوە نزیك بوو بێ هیوا بووم ، ئینجا پێغەمبەی خوا ﷺ فەرمووی ( ئایا هوالتان پێ راگەیەنم دەربارەی خەلکی بەهەشت و ،وە دەربارەی خەلکی دۆزەخ ..؟! ) ووتمان : بەلی . ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ﴿الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢﴾ هە تاکو ووتەی ﴿ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥﴾ فەرمووی : (ئەوانە خەلکی بەهەشتن) ووتمان : تکا دەکەین ئێمە خەلکانێك بین لەوانە . پاشان فەرمووی : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ﴾ هەتاکو ووتەی ﴿عَظِيمٞ ٧﴾ فەرمووی : (ئەوانە خەلکی دۆزەخن ) ووتمان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لەو خەلکانە نین ، فەرمووی (بەلێ ) ).[5]

[1] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٥/١) ، ابن جرير (٢٤٤/١).
[2] -اخرجه ابن جرير(٢٥٦/١).
[3] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٩/١).
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (٣٩/١)
[5] - ابن ابي حاتم (٣٩/١) و انظر : ميزان الاعتدال (٤٧٥/٢).

سوودەکانی پێنج ئایەتی سەرتایی سورەتی (البقرە ) کە تێدا باسی ئیمانداران و (المتقین) دەکات :

١-قال تعالى: ﴿الٓمٓ ١﴾ کە ئەمە ئیعجازێکی قورئانی پیرۆزە تحدای هەمموو گرۆی زەوی دەکات لە جنۆکە و لە ئادەمیزاد کەلەم پیتانە ئەم قورئانە پێك هاتووە ،ئێوەش بتوانن کتێبێك بنووسن وەك ئەم قورئانە ، هەر گیز ناش توانن سورەتێکیش بنووسن ..!!

٢-قال تعالى: ﴿ٱلۡكِتَٰبُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢] ئەم قورئانە نووسراوە لە (لوح المحفوظ) دا ، هەروەها نووسراوە لە صوحوفی فریشتەکان ،ئێستا لە بەردەستی ئیمانداران دایە ئەم کتابە یان ئەم قورئانە ..!!

٣-قال تعالى: قال تعالى: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾ [البَقَرَةِ : ٢] ئەم کتێبە گەورە ترین کتێبی (خوای گەورە ) یە کە هیچ گومانێك هەلناگرێت ..!! (وهبە الزحیلی ) دەڵێت : وسفی قورئان کراوە بەسێ وەسف :

یەکەم: کتێبێکی تەواوە کە هەمووشتێك لە خۆ دەگرێت ، لە مانا و مەبەست وەکو چیرك وپەند ئامۆژگاری فقه یان تشریع .

دووەم: هیچ گومانی تێدانیە لەوەی کە بە حەق لەلای (خوای گەورە ) هاتووە ،بۆکەسێکی هۆشمەند بەجوانی سەیری بکات و بەدل بیری لێ بکاتەوە ..!!

سێیەم: قال تعالى: ﴿هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢﴾ [البَقَرَةِ : ٢] سەر چاوەی هیدایەت و رێنمۆیی ئیمانداران و تقوادارن ..!!

✍ لە (قاضي عیاض ) — رەحمەتی خوای لێ بێت —دەڵێت : بزانە هەر کەسێك قورئان یان هەندێك لە قورئان بە کەم دابنێت ، یان جنێو بە قورئان بدات ، یان ئینکاری و ئیلحادی قورئان بکات ، یان ئایەتێك بگۆرێت ، یان بەدرۆی بخاتەوە و یان شتێکی لێ بەدرۆ بخاتەوە ، یان شتێك لە حوکم یان هەوالێکی حەرام بەدرۆبخاتەوە ، یان شتێکی لێ جێگیر بکات و بۆی زیاد بکات یان بۆی کەم بکات ، یان نەفی ئەو شتەی کردووە ،یان نەفی شتێك دەکات کە قورئان جێگیری کردووە زانستی پێ هەیە ، یان گومانی لە پتێکی قورئان هەیە یان لەشتێکی قورئان هەیە ، ئەوا ئەو کەسە کوفری کردووە کافر بووەپێ یە یەك دەنگی زانایان ..!!

٤- ﴿هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢﴾ قورئان رێنمویی هیدایەتی ئیمانداران و باوەرداران وە پارێزگارانە (المتقین ) ..!!

٥- فەزل و گەورەیی تقوادار ئارەزوو خستنە سەری ،چونکە (خوای گەورە ) هیدایەتی تایبەت کردووە بە (المتقین ) پارێزکاران..!!

٦-پێدا هەلدانی (المتقین ) بەم سیفە تانەی کەلە پیشدا باسمان کرد کەپێنچ سیفەتەکان وەکو : ئیمان هێنان بە(غیب) و نوێژە کان بەرێك وپێکی ئەنجام دەدەن ، ئەو مال وسامانەی کە خوا پێداون دەی بەخشن ، ئیمان هێنان بەقورئان کتێبە کانی پێشتر ، وە یەقینیا هەیە کە رۆژی دوای هەر بە پادەبێت ..!!

٧-گەورە ی پلە و پایە ئیمان هێنان بە شتە (غیبیەکان یان شتە پەناهەکان ) وەکو ئەوی لەپێشدا باسمان کرد ..!!

٨-گەورەیی و گرینگی نوێژ لە ئاینی ئیسلام دا لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣]

٩-فەزل گەورەیی مال بەخشین بە خاو خێزان و کەس وکارو فەقیر هەژاران و لێ قەوماوان ئەوەی ك (خوای گەورە ) بەخشیتی بە بەندەکەی خۆ دەبێت ئەویش ببەخشێت بەو کەسانەی کە شایەنی بەخشینی (خوای گەورە) ن لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ٣﴾ [البَقَرَةِ : ٣] ..!!

١٠- دەبێت ئیمان بەو هەموو کتێبانە کە بۆ پێغەمبەران هاتووە لە پێشدا بی گومان بی دەست کاری کردنیان لە جوولەکە گاورەکان کەئێستا کتێبەکانیان گۆریوە وە ئەصلی خۆیان نەماون ، بێ گومان ئیمان مان بە ئەصلە کەیان هەیە لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ [البَقَرَةِ : ٤] ..!!

١١- فەرزو واجبە کە دلنیا بین یان یەقین مان هەبێت کە رۆژی دوایی یان رۆژی قیامەت هەر بەرپا دەبێت ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَبِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ٤﴾ [البَقَرَةِ : ٤] ..!!

١٢-شەریعەت ئاینی ئیسلام پاك و بێگەردو خاوێنی دیار و شاراوە پێکەوە کۆدەکاتەوە هەروەها کردەوەی دڵ و کردەوەی ئەندامەکانی جستە ولاشە ،هەروەها ئیحسان لە عیبادەتی خوا لەگەل بەندەکانی خوا ..!!

١٣- هیدایەت و رێنموویی (خوای گەورە) (حصر) کراوە لە تقواداران ئەوانەی ئەم سیفەتانەی تێدایە لەبەر ووتەی : قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ﴾ [البَقَرَةِ : ٥]..!!

١٤-جێگیر کردنی پەروەردگاریەتی تایبەت بۆ ئیمانداران ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿مِّن رَّبِّهِمْ﴾ [البَقَرَةِ : ٥] ..!!

١٥-(حصر) کردنی سەرکەوتن و بەدەست هێنانی خۆشی بەختەوەری لە دونیا ولە قیامەت دا بۆ ئیمانداران یان بۆ (المتقین ) ئەوانەی ئەم سیفەتانەی کە باسمان کرد لە پێشدا دتێدا بەدی دەکرێت لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ٥﴾ [البَقَرَةِ : ٥]..!!

١٦-خێر و بەخشین بە وماڵە کە بەستەم یان بە حەرام دەستی بە سەر دا گیراوە ، کە مافی خەڵکانیچکی ترە ، ئەو کەسە دەستی بە سەر داگرتووە بە حەرام دەی بەخشێت ، ئەم بەخشینە یان ئەم خێرە قبول ناکرێت و وەرناگیرێت یان پەسەند ناکرێت بەڵکو سزاش دەدرێت لەسە ر ئەم زلم و ستەمی کردوویەتی لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ۝٣﴾ البَقَرَة : ٣ چونکە ئەوەی دەستی بەسەر ماڵی خەلك دا گرتووە نابێتە خاوەنی ئەو ماڵە هەتا ببەخشێت و خێر بکات لێ قبول بکرێت هەرگیز وەرناگرێت..!!

١٧-دەبێت هەندێك ماڵ ببەخشێت نەك هەموو ماڵ ببەخشێت ، زانایان دەڵێن دورستە هەموو ماڵ ببە خشێت هەڵبەتە ماڵی حەلال نەوەك ماڵی حەرام ، هەروەکو (ابو بکر صدیق ) — خوا لی رازی بێت - هەموو ماڵە کەی بەخشی بە موسلمانان ، بەلام بە مەرجێك نەبێتە وازهێنان لە واجب ، یان نەبێتە هۆکارێك بۆخەرج کردنی مەسەرفی خێزان و مندال ، ئەگەر بووە هۆی وازهێنان لەو واجب ئەو کاتە واجب لە پێش سوننتە دایە ، چونکە نفقە کردنی ماڵ و خێزان واجبە ..!!

١٨-پارێزراوی و سەلامەتی بەرنامەو رێبازی (المتقین ) لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٥.

١٩- کردەوەو ئەندامەکانی لاشە یان جست مەرجی ئیمانە ، چونکە لەگەل ئیمان باسی کردەوەی ئەندامەکانی لاشەی کردووە ..!!

٢٠- ماڵ و سەروەت سامان هەر هەموو مولکی (خوای گەورە )ن ، خاوەنی راستەقینەی ماڵ سەروەت و سامان (خوای گەورە) یە ، (خوای گەورە ) ش ئەم مولکانەی بە بەندەکانی بەخشیوە لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ۝٣﴾ [البَقَرَةِ : ٣] واتە: لەو رزق رۆزییە حەلالەی پێمان بەخشیوت دەبەخشن ..!!

٢١-هیدایەت و رێنمووی دان تەنها لە لایە خوای گەورە بۆ بەندەکانی فەراهەم دەهێنی ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٥] چونکە ئەم ئایەتە وەلامێك بۆ قەدەرییەکان کە دەڵێن ، بەندە خۆی ئیمان و هیدایەت و رێنمووی بۆ خۆی فەراهەم دەکات یان دروست دەکات ، بەلام ئەمانە واتە قەدەرییە کان هەڵە یان کردووە لەم ووتەیە دا ، چونکە ئێمەی موسلمان لە رۆژێك بە نزیکەی (١٧) جار لە نوێژە کان مان دا دوای هیدایەت و رێنمووی لە (خوای گەورە ) دەکە ین ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت قال تعالی: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦﴾ [الفَاتِحَةِ : ٦] واتە : خوایە بەردەوام هیدایەت و رێنموویيمان بکە بۆ ئەم رێباز بەرنامەی راست دروستی ئاینی ئیسلام ، یان هیدایەت ورێنموویمان بکە بەرسەر بەرنامە رێبازی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بۆ ئەوەی لە کەسانە دابین کە سەر کەوتوو سەر فرازن لەدونیان و قیامەت دا، هەروە کو (خوای گەورە ) دەفەرموویت قال تعالی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ۝٥﴾ [البَقَرَةِ : ٥] ..!!

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٦﴾ [البَقَرَةِ: ٦]

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ واتە: بەرستی ئەوانەی کە بێ باوەر بوون ، ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ﴾ واتە: بۆ ئەوان وەك یەکە یان چوون یەکە ، ﴿ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ﴾ واتە: بیان ترسێنیت یان نەیان ترسێنیت ، ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٦﴾ واتە: هەر باوەر ناهێنن ..!!

بەڵێ لە ئایەتی (٦) تاکو ئایەتی (٢٠) ئایە تەکانی سەرەتای سورەتی (البقره ) دەگرێتە خۆ ، لەم (١٥) ئایەتەدا ، (٢) ئایەتی سەرەتای پێناسەی کافران دەکات ، ئایا ئەهلی کوفر کێن ..؟! وە ئەیەتەکانی تریش واتە : (١٣) ئایەت باسی مونافق و دوو رووە کان دەکات ، وە (٥) ئەیایەتی سەرتایی سورەتی (البقره ) باسی ئیمانداران دەکات یان باسی (المتقين) دەکات ئەوانە سیفە تەکانیان زۆر بەجوانی باس دەکات ، کە لە پێشدا باسمان کرد کە ئەهلی ئیمان یان ئەوانەی کە (المتقين ) چ جۆرە سیفەتێکیان هەیە بە چ جۆرە سیفەتێك دە ناسرێن ، هەر وەك باسمان کرد بە سێ کۆمەڵ سیفە تەکانیان باس دەکات ، ئیمانداران و کافران و مونافیقەکان.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ واتە: بەراستی ئەوانەی کەبێ باوەر بوون ، واتە : بەوەی بۆ تۆ دابەزیوە ئەی ﷺ ئەوانە بێ باوەر بوون پێی (کوفر ) یان هەلبژراد ، هەروەك ووشەی (الكفر ) لە زمانەوانی دا واتە : داپۆشین ، چونکە ئەو کەسە کە زاعەت یان کشتوکاڵ دەکات پێ دەڵێن : (کافر ) چونکە دانەوێڵەو شتی تر دا دەپۆشێت لە نێو ناخی زەویدا ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت :
قال تعالى: ﴿ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ۝٢٠﴾ [الحَدِيد: ٢٠] واتە: چاك بزانن ژیانی دونیا تەنها بریتیە لە یاری و گەمە و رازاندنەوەو خۆ هەڵکێشان لە نێوان یەکتریدا ، هەروەها زۆر کردنی سامان و ماڵ ومنداڵ ، جا ئەوانە هەر هەمووی وەك بارانێکی بە پیت وایە کەبێتە بەرهەمیچکی زۆر ، گەشتیارە کان سەر سام بکات ، لەوەودوا وشك ببێت و زەرد هەڵگەرێت ، پاشان وردوخاش ببێت و بکەوێت ، بێ گومان لە قیامەتیشدا سزای زۆر سەخت بۆ دونیا پەرستان ئامادەیە ، لەو لاشەوە لێ خۆشبوون و رەزامەندی لە لایەن خواوە ئیماندارانی چاکە خوازی لێ بەهرەوەر دەکرێت ، ژیانی دونیاش دوور لە خواناسی و دینداری جگەلەوەی کە بریتیە لە رابواردنیچکی کەم ، شتێکی تر نیە ..!! زۆر کەسیشی پێ غرور دەبێت ..!!

هەروەها بە (کفارة ) دەڵێن کفارەت چونکە تاوان دادەپۆشێت ، هەروەها بە شەو دەڵێن (کافر) چونکە رووی زەوی دادەپۆشێت بە تاریکی ، لە رووی شەرعەوە بە پیێ راو بۆچوونی زانیانی ئەهلی (التوحید ) یان زانایانی سلف (کفر ) یان (کوفر ) دوو جۆرە :
١- کوفری گەورە ٢- کوفری بچووك :

یەکەم : کوفری گەورە : ئەوەیە کە دژی ئیمان و باوەرە ئەمەیان خاوەنەکەی لە ئاین دەردەچێت یان لە ناو بازنەی ئیسلام نامێنیچ دەر دەچێت ،وە شوێنی نێو دۆزەخە بۆ هەتا هەتایی ئەگەر تۆبەی نەکردبێت لەسەری .

هەروەها (ابن قیم ) — رەحمەتی خوای لیێ بێت – کوفری گەورەی : دابەش کردووە بۆ پێنچ جۆرە کە ئەمانەی خوارەوەن :

١-کوفری بەدرۆخستنەوە ئینکاری ئیلحادی کردن ..!!

٢-کوفری خۆ بەزلزانین یان خۆ بە گەورە دانان ،لەگەل بە راست دانانی بەلام بەهۆی خۆ بەگەورە دانانی دان بەراستی دانەنێت وەکو ئیبلیس یان شەیتان یان ئەو ستەمکارانەی کە زولم ستەم لە خەلك دەکەن پیاوایە رۆژی لی پرسینەوە نایەت کەچی پەیامەکەشی بەراست دەزانن بەلام سەرپیچی لە فەرمانەکانی (خوای گەورە ) دەکەن بەهۆی خۆ بەگەورە زانینیان لە دونیادا ..!!

٣-کوفری پشت تیێ کردن ، وەك ئەوەی کە مرۆڤ پشت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات بە دلّ ، نەبەراستی بزانێت ، وە نەبەدرۆی خاتەوە ، وەك ئەوەی نەپشتیوانی دەکات نە دژایەتی دەکات ، هەر گیز ئاوەر لە ئاین خوا ناداتەوە ..!!

٤-کوفری گومان یان شەك ، ئەوەش ئەوەیە کە ئیستا بۆتە دیاردە لە نێو گەنجەکاندا بیرو باوەری ئیلحاد بۆ تە دیاردە ، ئەوەی کە گومان لە پێغەمبەرایەتی ﷺ دەکات ، نە بەدرۆی دەخاتەوە ، نەبەراستیشی دادەنێت ، هەر لە خۆیەوە گومانی سەیر سەیردەکات پرسیاری سەیر سەیر لە زانایان دەکات کە پرسیارەکانیان پرە لە کوفر گومانی نابە چیێ ..!!

٥-کوفری دوو روویی یان کوفری نیفاق ،ئەوەیە کە بەروالەت و زمان موسلمانە وا دەری بخات کە ئیمانداره ، بەلام لە دلّ دا بەدرۆی بخاتەوە درۆبکات ئەمە کوفری دوو رووی یان نیفاقی پیێ دەلێن ..!!

دووەم : کوفری بچووك : ئەم کوفرە یان دژی ئیمان نیە بە یەکجاری ، واتە : بەم شێوەیە نیە کە هەموو ئیمان ببات ، خاوەنەکەی لە ئاین دەرناچێت ، هەروەها لە ئاگری دۆزەخیش بۆ هەتا هەتایی نامێنێتەوە ..!! بەلیێ (کوفری بچووك ) واتە : بە کوفری نیعمەت یان (کفر دون کفر ) دەناسرێت : کە بریتیە لە و گوناهە گەورانە کە بەهۆیەوە خاوەنەکەی تاواتبار دەبێت و سزا دەدرێت لەسەری بەلام وەکوو وتمان لە بازانەی ئیمان یان ئیسلام ناچێتە دەروە ، وە لە دوا رۆژیشدا لەژێر وەیست و رەحمەتی پەروەردگار داەیە بەلام سەر ئەنجامی هەر چوونە بەهەشتە ..!!

زانایان دەڵێن: موسلمان تووشی (کوفر ) دەبێت یەکەم : (بە کردەوە) دووەم : (بە ووتە ) سێ یەم : (بە بیرو باوەر یان عقیدە):

یەکەم: نموونەی (کوفر ) کردن بە ووتە وەکو : جنێودان بە (خوای گەورە ) -والعیاذ باللە – جنێودان بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، جنێو دان بە پیرۆزیەکانی ئاینی ئیسلام ، یان جنێو دا بە یەکێك لە پێغەمبەران – علیە السلام – یان بە فریشە کان ، یان گالتە کردن بە ئاینی ئیسلام ، یان کەسێك بلێت : من خوام خۆش ناوێت -والعیاذ باللە – یان بلێت : من لە خوا ناترسم ، یان یەکێك بلێت : هەندێکەس دەتوانن تصرف لە هەمووشتێك دا بکەن یان لە هەموو زەویدا بکەن ، یان کەسێك بلێت : جوولە کایەتی یان گاورایەتی لە ئاینی ئیسلام باشتر ، یان کەسێك دوعاو نزا جگە لە خوا بکات ، دوای شتێك بکات جگە لە خوا ، کەهیچ کەس لە توانای دانیە تەنها (خوای گەورە ) نەبێت ، یان کەسێك بلێت : زیناو داوین پیسی حەلالە یان عەرەق خواردنەوە حەلالە ، واتە : حەرامێك حەلال بکات ، یان کەسێك بلێت خۆزگە موسلمان نەبوومایە ، یان کەسێك بلێت : خۆزگە جوولە کە بومایە یان گاور بوومایە ، یان کەسێك بلێت : ئاین پەروەردەو ئامۆژگاری ئیسلام بۆ ئەم سەردەم گونجاو نیە ، وە باوەری بەمە هەبێت کەدەیلێت ..

دووەم : نموونەی (کوفر ) کردن بە کردەوە وەکو : سوجدە بردن کرنۆش بردن بۆ جگە لە (خوای گەورە ) ، یان ئاژەل سەر برین بۆ جگە لە (خوای گەورە ) ، یان سووتاندنی بە ئەنقەستی قورئان یان فرێدانی لەوشوێنی پیس دا یان فرێدانی ئەو شتانەی ناوی (خوای گەورەی) تێدایە ، حوکم ودادپەروەری کردن جگە لە حوکم و دادپەروەی (خوای گەورە ) یان سحر کردن خەلیکی فێری سحر بکات وە باوەری وابێت کە دروستە ، تەواف کردن بەدەوری گۆری پیاوچاکان وەك بەگەورە دانانیان ، لەبەر کردنی شتێك شیعار و لۆگۆبێت لە شیعارە کانی (کوفر ) یان وەك ئیستا دەبینین لە نێو گەنجان جا ئەوەی بە ئەنقەست دەی ئەنجامی دەدات یان ئەوەی لە ئاینی ئیسلام شارەزانیە بەهەلە ئەنجامی دەدات وەکو لەمل کردنی صلیبی نصرانیەکان و یان گاوەرە کا یان شیعاری هاورەگەز خوازان کەئێستا دورشمیان بەرز کردۆتەوە لە نێو ولاتانی ئیسلام دا ، یان بەژداری کردنی لە عیبادەتانی ئەهلی کوفر وەکو جوولەکە گاوەرەکان و بتپەرستەکان ئاگر پەرستەکانی بەناو ئاینی زردەشتی ، یان بەژداری کردنیان لە بۆنەو ئاهەنگەکانیان وەکو سەری سالی زانینی لەدایك بوونی (عیسی ) – علیە السلام – ناوی دەبەن ، کەچی مێژووەکەی راست دورست نیە ،یان کەسێك هەستێت بە رووخاندنی مەزگەوتی موسلمانان ، بەئەنقەست ئەمە بکات ، یان بە ئەنقەست درەست کردنی پەرستگای بۆ کافرو موشریکەکان ،وەکو درەست کردنی (معبد ) بۆ جوولە کە و گاورو ئایەنە کانی تری بت پەرستان ...هتد

سێیەم : (کوفر ) بیرو باوەر وەکو : ئەو کەسەی کە بە بیرو باوەری خۆی ئاینیکی تر هەلبژێرێت ، لە ئاینی ئیسلام بچێتە دەروە ، یان بەبیرو باوەری خۆی بەنامەیەکی هەبێت جگە لە بەرنامەی ئیسلام پێ وابێت بیر و بەنامەی ئەو سەرکەوتوو ترە لە بەنامەی ئاینی ئیسلام ، ئەوا بێ گومان کافر دەبێت پێ ،لە ئاین دەر دەچێت ..!!

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٦﴾ [البَقَرَةِ : ٦] واتە : ئەوانە ی کە بێ باوەڕن ، بیان ترسێنیت یان نەیان ترسێنیت یەکسانە بۆیان ، چونکە هەر باوەر ناهێنن بەڕاستی دانانێن بەوەی کە بۆ تۆ هاتووە ئەی محمد ﷺ ..!! ئەم ئایەتە زانایان ووتویانە ئەمە شێوازێچکی گشتی هەیە کە مەبەستەکەی تایبەتە بەوانەی کە بریارو چارەنووسی بە کافر بوونیان بۆ دراوە هە بە بێ باوەری بە کافری سەر دەنێنەوە و دەمرن ، وە مەبەستی ئەوانە نیە کە بۆ ماوەیەك لە سەر کوفر بوون وەکو پێش هاتنی ئیسلام عەرە بەکانیی شاری مککە نیمچەدوورگەی عەرەبی دا ، ئەوانە لەسەر کوفر بوون بەلام بە هاتنی ئیسلام ئیمان وباوەریان هێنا (خوای گەورە ) هیدایەتی ان لەسەر ئاینی ئیسلام ، بەلکو مەبەست لەم ئایەتە تایبەتە بەوانەی کە بریاری کوفر بوونیان داوە بە یەکجار ، بۆ نموونە : وەکو (ابوجهل ) یان (ابو لهب ) ...هتد وەك لە پێشدا باسمان کرد ووشەی (کافر) بە مانای داپۆشین دێت یان شاردنەوە (الستر التغطية ) ، واتە: هەر کەسێك شتێك بشارێتەوە پێ دەوترێت (کافر ) یان دا پۆشەر جا هەر بۆیە کە فلاح یان جوتیار دانەوێلە لە ناو زەویدا دەشارێتەوە دوترێت(کافر ) ،بێ گومان ئەگەر سەرنج بدەین لەووشەی ﴿ءَأَنذَرۡتَهُمۡ﴾ واتە : (الإنذار : إعلام أو إخبار مع تخويف ) واتە : بریتیە لە ئاگادراکردنە وەیەك ، یان هەوال پێدانێك کە ترسانێکی لەگەل دا بێت ..!! قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٦﴾ [البَقَرَةِ : ٦]واتە : دەکرێت پسیار بکرێت و بەلێن : باشە (خوای گەورە ) باسی کافران دەکات و دەفەرمووی: ئیمان یان باوەر ناهێنن ، وەك یەکە یان یەکسانە کە بیان ترسێنیت یان نەیان ترسێنێت هە وەك یەکە و ئیمان ناهێنن جا ئایا حیکمەتی ئەوە چیە ..؟! لە راستیدا حیکمەتەکەی ئەوەیە کە (خوای گەورە ) باسی حالەتی ئاسایی ئەهلی کوفر دەکات ، کە ئەهلی کوفر حالەتی ئاسایی یان ئاوایە کە ئیمان ناهێنن ، جا دوایی هەیە ئیمان دەیچنی ، مانا وایە لە حالەتی ئاسایی خۆی چۆتە دەر ، وە بۆ ئەوشە کە پێغەمبەر ﷺ وە هەر کەسێ کە بەرێی پێغەمبەردا دەروات ، کاتێ کە دەبینێ ئەهلی کوفر زۆر کەلە رەقن و ئیمان ناهێنن ، زۆر تووشی دل نارحەتی نەبێ و تووشی شپرزەیی نەبێ و ، بزانێ کە سوننە تی (خوای گەورە ) ئاوایە کە ئەوانە ئیمان ناهێنن ، وە وانەزانێ کە زەرەری لێدەکەوێ بە هۆی ئیمان نەهێنانی ئەوانەوە ، واتە: ئەمە جۆرێکە لە دلدانەوەی مرۆڤی بانگ خواز ..!! هەر بۆیە وەسفی کافران دەکات بە بێ باوەری ، چونکە ختمی کوفریان لێدراوە هەر گیز ئیمان ناهێنن ، تاکو بۆتە وەسفێکی پەیویست پیانەوە ، هیچ ریچگەیەك ناتوانێت رێگریان لێ بگرێت ، وە هیچ ئامۆژگاریەك سوودی بۆیان نیە چونکە لە چارنووسیان بریاردراوە کە کوفر هەلبژێرن بۆ خۆیان وە بەردەوام لە سە کوفر بێ باوەریین ،جا بۆ ئەوانە وەك یەکە بترسێن و یان نە ترسێن ئەوا ئیمان و باورە ناهێنن ، بێ گومان حقیقەتی (کوفر ) بریتیە لە ئینکاری کردنی ئەو پەیامەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دا بەزیوە ، یان نەکۆلی لە هدێکی بیرو باوەریان بانگەواوی کردن هیچ سوودێکی بۆیان نیە ، تەنها ئەو بانگەوازیە دەبێتە ( ئەقامە حجە ) لەسەر یان ، هەروەها مانکەشی ئەوە دەگەیەنی واتە: ئەی محمد ﷺ هیچ کاتێك هەولیان بۆ مەدە خەمیان بۆ مە خۆ ئەوانە باوەر ناهێنن ، چونکە بریاری (کوفر ) بوونی خۆیان داوە ، بێ گومان ئەوەش ئەوە دەگەیەنی کە (خوای گەورە ) لە پێشە هاتەکان و چارەنووس هەموو نەفسێك زانا دانا بە ئاگایە بە هەمووشتێك قال تعالى: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا﴾

[الأَنۡعَام : ٥٩]واتە : کلیلی زانینی هەموو پەنهانی و خەزێنەکانی تەنها لەلای خوای شکۆدار و بەرزە، کەس جگە لە ئەو نایانزانێت، لەوانەش :کاتی هاتنی رۆژی دوایی، و داباریني بارانی ڕەحمەت، و ئەوەی لە ناو ڕەحمی دایکاندایە، و قازانج و دەستکەوتەکان لە ئایندەدا، و شوێنی مردنی مرۆڤ، وە هەموو ئەو شتانەش دەزانێت کە لەوشکانی و لەئاودان، وە هیچ گەلایەك لە ڕووەکێك ناکەوێتەخوارەوە ئیللا لێی بەئاگایە و پێی دەزانێت..!!

هۆی دابەزاندنی ئەم ئایەتی شەشەمی سورەتی (البقرە ) قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٦﴾ [البَقَرَةِ : ٦] بەڵێ کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارە وە دەربارەی ئەو کەسانە بوو کە (کوفر) (مطلق) یان رەهایان تێدا بەدی دەکرا وەکو : (ابو جهل ) ، (ابو لهب ) وە کەسانی تریش ، واتە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مککە کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە ، زۆر بیری لە خزم و کەس کارو ئەوانەی لە نێو شاری مککە بوون ، لە کافرە کان ، یان بەشێوەیەکی تر بلێن ئەوانەی کە بە سەر سەختی دژایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاینە تازە کەیان دەکرد ، وەکو (ابو جهل ) و (ابو لهب ) کەسانی تر لەشاری مککەدا ، بەلام کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە ، ئەوا بیری دەکردەوە لێ یان هەولی موسلمان بوونی بۆ دەدان بۆ ئەوەی بێن کە ملکەچی ئیسلام بن ، ئەلام (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە کە دەفەرمووی هەول و تەقلات بێ سوودە بێ هودەیە بەرامبەری بەم کەسانە چونکە (خوای گەورە ) بریاری لە سەر داون و چارەنووسیان هەر کافر بوونە ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) فەرمووی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوان هەرگیز ئیمان ناهێنن پێیان رابگەیەنی یان پێیان رانەگەیەنی ، یان بەواتایەکی تری ئەی ﷴ تۆ بیا ترسێنیت یان نەیان تر سێنیت هە وەکو یەکە یان یەکسانە چونکە ئەوانە ئیمان ناهێنن هەر گیز ،هەر بۆ دل خۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٦﴾ [البَقَرَةِ : ٦] لە راستی دا ئەو کافر بێ باوەرانەی سەر بۆ حەق دانانەوێنن زۆر باش دەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر حەق راستیە ، وە قورئان راست حەقە ، بەلام بەئەنقەست گوێ خۆیانی لێ کەر دەکەن وە چاوی خۆیانی لەراستیە کان دادەپۆشن ، یان هەول نادەن راستیە کانیان بۆ دەر بکەوێت خۆ لەهەموو شتێك گێل دەکەن ، هەر گیز بەدل گوێ بۆ بانگەوازی حەق ناگرن ، وە بەچاوی تێرامان و وورد بینیەوە تەماشای راستیە کان و قورئان ناکەن ، بەلێ ئەوە ئەوکافرانە کە یەکسانە لە لایان چ بیان ترسێنی چ نەیان ترسێنی هەر گیز باوەر ناهێنن ، وەك باسمان کرد لە پێشدا پرسیارێك دێتە پێشەوە لێرە دا ، مولحیدەکان یان کافرە کان و مونافیقە کان ئەوانەی رقیان لە ئاینی ئیسلام تا سەر ئیسکان دژایەتی ئاینی ئیسلام دەکەن ، دەلێن : کەوا بوو چ پێویست دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێشدا واتە لە سەرتایی هاتنی ئیسلام خۆیانی پێوە ماندوو بکات یان لەم سەردەمەی ئێستادا کەوانەی باوەر ناهێنن چ پێویست دەکات بانگەواز کاران خۆیان ماندوو بکەن پێیانەوە ، مادام هەر بە کافری سەردەنێنەوە ، لە کاتێك دا ئە کەسانە یان ئەو کافرانە لە زانستی (خوای گەوە ) بە کافری دەمێنەوە باوەرناهێنن..؟!

وەلام بۆ ئەو کەسانەی ئەم جۆرە پرسیارە دەکەن ، لە وەلامدا دەلێن : پێغەمبەری خوا ﷺ هەول تەقلاو کۆششی کرد لەگەل یان بۆ ئەوە ئەوانە لە رۆژی دوای دا هیچ بە هانەیەکیان نەمێنی واتە : ( إقامە حجە ) بێت لە سەر یان بە هەمان شێوە بۆ بانگەواز کارانی ئێستاش هەر وایە ، وە سەرە رای ئەوەی بانگەوازی ئیسلام گشتی یەو رووی لە هەموو گرۆی ئادەمیزادە بی جیاوازی رەگەز و رەنگ پێست و زمان ، بۆیە هەر یەکێك لە ئێمە واجبە ئەم ئاینە پیرۆزە بەگەیەنی ئەگەر تەنها بە ئایەتێکیش بێت ..!!

✍ لەرێ ( علی بن ابي طلحة ) لە (عبدالله بن عباس ) - رزاو رەحمەتي خوايان لێَ بێت -لە سەر ووتەی : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٦﴾ واتە : (ئەوە نموونەیەکی قورئانی پیرۆزە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر چاودێر بوو لەوەی کە کۆششی دەکرد بۆ ئەوەی کە هەموو خەڵکی باوەر بهێنن و شوێنکەوتەی بن بۆ هیدایەت دان یان رێنمووی کردنی ، هەروەها (خوای گەورە ) هەواڵی پێدا بەوەی تەنها ئەو کەسانە باوەر دە هێنن کە لەپێشدا خێرو بەختەوەریان پیّدراوە لە یەکەم جار ئاماژەی پێدراوە ،واتە : لەئەزەلە وە چارەنووی بۆ نووسراوە ، وە بەر چاویان تاریك نابێت و گومرا نابن تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە لە پێشدا شەر و ناخۆشی یان پێدراوە لەیەکەم جار ئاماژەی پێدراوە ، واتە : لە ئەزە لە وە چارەنووسی بۆ نووسراوە )[١]

✍ لە رێ (الربیع بن أنس ) لە (ابی العالیە ) – رحمەتی خوایان لێ بیت- لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ [البَقَرَةِ : ٦] دەڵێت : هاتنە خوارەوەی ئەم دوو ئایەتە بۆ سەر کردە کانی ئەحزاب هاتە خوارەوە ، وە هەروەها (خوای گەورە ) ئاماژەی بەم ئایە تەش کردووە کە دەفەرمووی قال تعالى: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرًا﴾ [إِبۡرَاهِيم : ٢٨]

دەڵیت : ئەم ئایە تەش دەربارەی کوژراوە کانی رۆژی بەدر دەکات ، هەروەها هیچ کام لە سەرکردەکانی کافران لە رۆژی ئوحدا ملکەچی ئیسلام نەبوو جگەلەم دووانە (ابوسفیا) و ( الحکم بن ابی العاص ) ..)[٢].

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لێ بیت – دەڵێت : هاتنە خوارەوەی ئەم دوو ئایەتە واتە : (ئایەتی (٦-٧) سورەتی البقرە ) بۆ موشریکە کانی عەرەب دابەزی وەکو : (شیبە بن ربیع ) ، (عتبە بن ربیعە ) ، (ولید بن المغیرە ) ، (أبوجهل بن هشام یان أبا الحکم وە یان ناوی عمرو ) بوو ، ( عبدالله بن ابی أمیە ) ، (أمیە بن خلف ) ، والعاص بن وائل ) ، (الحارث بن عمرو ) (والنضر بن الحارث ) ، (عدي بن معطم بت عدي ) ، (عامر بن خالد )، (أبو البختر بن هشام ) ئینجا دە گەرێنەوە بۆ دوو روو مونافیقە کان (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ [البَقَرَةِ : ٨] ...)[٣]



[١] - اخرجه الطبراني في الكبير (٢٥٤/١٢) .
[٢] - اخرجه ابن ابي حاتم (٤٠/١).
[٣] - تفسير مقاتل بن سليمان (٨٨/١).

قال تعالى: ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٧﴾ [البَقَرَة : ٧]

﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡ﴾ واتە: (خوای گەورە ) ختم یان مۆری ناوە بە سەر دڵ و گوێیاندا ، ﴿عَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞ﴾ واتە: وە پەردە بەسەر چاویانەوە یە ، ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٧﴾ واتە: وە سزایی زۆر گەورە یان بۆ هەیە ..!!

بەڵێ سە بارەت بە دابەزینی ئەم دوو ئایەت واتەك (٦-٧) سورەتی البقر ، راو بۆ چوونی جیاوازیان هەیە لەسەری لە پێشدا باسمان کرد کە دەربارەی کافران و موشریکانی مککە یان سەرکردەکانی قورەیش بوون ئەوانەی دوژمنی سەر سەختی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسلمانان بوون لە شاری مککە ، وە کو ئەوانەی لە پێشدا ناومان هێنان وەکو (شیبە ) و (عتبە ) (ابو جهل ) (ابو لهب ) ..هتد بەلام لە (عبداللە کوری عباس ) — خوا لێ رازی بێت — دەڵێت : ئەم دوو ئایەت دەربارەی گەورە سەرکردەکانی یهود یان جوولە کە دابەزیوە لەوانە ( حيي بن أخطب ) و ( كعب بن أشرف ) وە هاو شێوە کانی ئەمانە ، بەڵێ هەروەکو (خوای گەورە ) دەفەرموویت:

﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٧﴾ بەڵێ (خوای گەورە ) ختم یان مۆری دا بەسەر دڵ و گوێیانەوە ، وە پەردە شی نا بەسەر چاویاندا لەبەر ئیمان نەهێنان بووە ..!!

ئەگەر سەرنج بدەین وەسفی دڵ ی کافران کراوە بە دە (١٠) وسف :

١-(الختم ) واتە: مۆر .

٢--(الطبع ) واتە : نیشانە یان چێ پەنچە .

٣- (الضيق ) واتە : دڵ توندی .

٤-(الرين )واتە: بێ تواناو بێ هیز و ماندوو یان لە شێوەی مردوو .

٥- (الموت ) واتە : وە کو مردوون .

٦-(القساوة) واتە : دڵ رەق یان درندەیی .

٧-(الانصراف ) واتە : بەجێهیشت یان دوور کەوتنەوە لە ئاین و ئامۆگاری کردن .

٨-(الحمية ) واتە : دەمار گیری یان دەمارگیری سەردەمی نەفامی کوێرەوەری .

٩-(المريض ) واتە :دڵ یان نەخۆشە . ١٠- (الانكار ) واتە: نەکۆلی کردن لە حەق و راستی .

بەڵێ زانایان دەڵێن : (ختم یان مۆر ) تایبەتە بە دڵیی کافران دڵ یی موسلمانان ناگرێتەوە ن بەلام هەندێکی تر لە زانایان پێیا وایە ختم یان مۆر )دڵ یی کافر و دڵ یی موسلمان دە گرێتەوە ، بەلام دڵ یی کافر هەر هەمووی دەگرێتەوە ،دڵ یی موسلمانیشی هەندێکی دە گرێتەوە بە گوێرەی ئەو تاوانەی کە ئەنجامی داوە ، بەلگەی دڵیی موسلمانیش مۆر دەی گرێتەوە ئەم دوو فەرموودەیە :

لە (ابو الجعد الضمري ) – خوا لي رازي بيت – دەلیت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((مَن تركَ الجمعةَ ثلاثًا - من غيرِ ضَرورةٍ - طبعَ اللَّهُ على قلبِهِ)).[1]

واتە: هەر کە سێك سێ هەینی نەچێت یان ترك بکات بە بی هێچ حجە یەك ئەوا (خوا ی گەورە ) ختمی لە دڵی دەدات ..!!

لە (ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت = دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إن العبدَ إذا أخطأ خطيئةً نُكِتتْ فی قلبِهِ نُكتةً سوداءَ فإذا هو نزعَ واستغفرَ وتابَ سُقلَ قلبهُ وإن عادَ زيدَ فيها حتى تعلو قلبهُ وهو الرانُ الذی ذكرَ اللهُ (كَلاَّ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ) )) .[2]

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : کاتێك بەندە تاوان دەکات خەلێکی رەش لە سەری دروست دەبێت ، بەلام کاتێك توبە دەکات و پەشیمان دەبێتەوە ئەم خالە رەشە لادەچێت ، ئەگەر گەراوە سەر تاوان و بەردەوام بوو تەوبەی نەکرد دڵ ی دەپۆشرێت هەتا هەمووی رەش دەبێت ئەمەیان پێ دەڵێن ((الران ) هەروەکو (خوای گەورە ) باسی کردووە قال تعالی: ﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ١٤﴾ [الْمُطَفِّفِين : ١٤] واتە : بەلام کار بەو شێوە نیە کە ئەوان گومانی دەکەن، بەڵکو ئەو قورئانە ووتەی خوای پەروەردگارە و سروشێتی بۆ پەیامبەرەکەی صلی الله علیه وسلم، وە ئەوان تەنها دلەکانیان پەردەپۆشکراوە ـ بەهۆی ئەو هەموو تاوانەی کە ئەنجامی دەدەن ـ لەبەڕاست دانانی..!!

کەواتە : لێرە دا جیاوازی نێوان دڵ ی کافر و دڵ ی موسلمان ئەوەیە : کە دڵ ی کافر هەر هەمووی رەش دەبێت و ختم و مۆری پێوەیە واتە سەرتاپەی دڵ ی رەش دەبێت ، بەلام دڵ موسلمان ئەگەر تاوانێك بکات یەك خال یان نکتەیەك لە دڵ ی رەش دەبێت هەر هەموو دەلی رەش نابێت واتە سەر تاپەی دڵی ناگرێتەوە بەلکو یەك نکتە یان یەك خال رەش دەبێت ، بەلی ئە گە ر خەلکی پۆلین کەین و دەبینین چوار پۆلن یان چوار کۆمەلن ، (کافر) ، (موسلمان ) ، (دوو روو) ، (موسلمانی تاوان بار یان گوناھ کار ) هەر یەك لەمانە دلێکی تایبەتی هەیە ، (کافر ) ، (دوو روو ) دلیان ختم کراوە هەر هەمووی ، بەشێویەکی گشتی رووناکی ئیسلام ناچێتە نێو دڵی تاریکی و کوفری لێ دەر ناچێت ، بەلام دلی موسلمانی گوناھ کار بە گوێرەی تاوانەکەی ختم مۆری گردتووە ، هەشە بە ناو موسلمانە دلی هەر هەمووی گرتووە وەکو موسلمانی دوو روو مونافیق .!!

---

[1] - سنن النسائي برقم (١٣٦٨).
[2] -سنن الترمذي برقم (٣٣٣٤).

ووتەی : ﴿عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ واتە: بەلگەیە لەسەر فەزڵ و گەورەیی دڵ بەسەر هەموو ئەندامەکانی لاشە یان جستە ،چونکە پاکی بێگەرد هەموو ئەندامەکانی لاشە دەگەرێتەوە بۆ دڵ بۆیە دڵ بەرێزترینیانە دڵ شوێنی بیرکردنەوەیە بۆ هەموو شتێك ..!!

ووتەی : ﴿وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ﴾ واتە : فەزڵ و گەورەیی خۆی هەیە بەسەر بینین ، واتە فەزل ی بیستت بەسەر بینین هەیە ، هە لەبەر ئەمەش لەم ئایەتەدا بیستن پێش بینین خراوە ..!!

ووتەی ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ۝٧﴾ واتە: بەلگەیە لەسەر کوفر گەورە ، چونکە دەلێن : (جزاء من جنس عمل ) واتە : پاداشت لە جنسی کردەوەیە ، هەر بۆیە ﴿عَذَابٌ عَظِيمٌ ۝٧﴾ بە ناسراو باسکراوە ئەوە بەلگەیە لەسەر گەورەیی سزاکە دەکات ، چونکە وسفە کەشی کراوە بە سزایی گەورە ..!!

﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ بەلێ (خوای گەورە ) دڵ ی مرۆڤی بێ باوەری کردووە بە سێ جۆر : (ران ) ، (طبع یان ختم ) ، (قفل )

یەکەم : ( ران ) ئەوەیە کە مرۆڤ گوناه دەکات جا کەم کەم ئەم گوناهە دەبن بە خالێکی یان پەلەیەکی رەش لەسر دڵی تاوانکار دەبێت تاکو وای لێ دێت کە بەتەواوی دلی دادەپۆشێت ئیتر هیچ قەسەسەکی چاك نابیستێت هەروەك (خوای گەورە) دەفەر موویت:

قال تعالى: ﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ۝١٤﴾ [المُطَفِّفِين : ١٤] واتە: [ كَلَّا ] واتە: نەخێر نابێ وابن، وە وانیە وەکو ئەوان کە ئەیلێن بەڵکو ئەم قورئانە فەرموودەو کەلام و وەحی خوای گەورەیە بۆ پێغەمبەرەکەی - صلى الله عليه وسلم - [ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ] بەڵکو ئەوەی کە وای لێ کردوون ئیمان نەهێنن ئەوەیە (ڕان) لەسەر دڵیانە، (حەسەنی بەصری) ئەفەرمووێ: (ڕان): واتە: تاوان لەسەر تاوان ئەکەن تا دڵیان تەواو ڕەش ئەبێ و دڵیان دائەپۆشێ، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئەفەرمووێ: (کاتێك بەندە تاوانێك بکات خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی دروست ئەبێ، ئەگەر تەوبە بکات و داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکات ئەوە نامێنێت و سڕی ئەبێتەوە، بەڵام ئەگەر تاوان لەسەر تاوان بکات ئەوە خاڵی ڕەش لەسەر خاڵی ڕەش لەسەر دڵی دروست ئەبێ تا دڵی تەواو ڕەش ئەبێ ئەوە ئەو (ڕانە)یە کە خوای گەورە لە قورئاندا باسی ئەکات).

دڵ وەکو ئاوێنە یەکە چۆن ژەنگ و پیسی دەی گرێت ، وە کەم کەم وای لێ دێت هەرچی ژەنگ و پیسی هەیە تیچدا کۆدەبێتەوە هەر چۆنێك تەماشای ئاوێنەکە بکەیت بە جوانی نای بینیت ئاوایە و بە گوناه و تاوان وێنە دانەوەی نامێنێ رەش دبێتەوە و وە قسەی خیر و چاکە هەر گیز نابیستێت ..!!

دووەم : (طبع یان ختم ) ئەمانە پلەیان لە (ران ) گەورەتر  چونکە بەردەوامە لەسەر خراپە کاری و گوناه وتاوان ، هەر لەسەر ئەم تاوانە و خراپە کاریە (ختم ) یان مۆری رەشی بەسەر دلیانەوە دانراوە ، وەکو چۆن نامەیەکی دەنووسی پاشان مۆرێکی پێوە دەنێ ، واتە : تازە نووسینە کەی یان نامە کە تەواو بوو کۆتایی هێچ شتێکی بۆ زیاد ناکەیت لە کۆتایی دا مۆری دەکەت تاکو بناسرێتەوە و ، وە ختم یان مۆری یەکجاری پێوە دەنێت ..!!

سێیەم : (قفل ) دڵ یی دادەخرێت و هیچ ئومێدیك نیە بۆ کرانەوەی چونکە دلە کە (قفل)کراوە ،جا ئەم دڵە نە ژیریان نەبیرو هۆشیان کار دەکات نەدەبیستن نەدە بینن ، چونکە هیچ کام لەمانە سوودی بۆ ئەم جۆرە دڵە نابێت چونکە دا خراوە وەری ناگرن ، بەلی ئەم جۆرە دڵ  واتە : دلی (قفل ) نەگوێیان هەیە بۆ بیستن  کە حەق پێ ببیستن ، نەچاویان دەبینێت کە حەق تێدا ببینن چونکە بەر چاویان پەردە پۆشکراوە  راستیە کان وەك خۆی نابینیت ، بەلام وەنەبێت کە ئەو جۆرە دل لانە گوێیان کەر بێت یان چاویان کوێر بێت ، بەلام ئەو دلەی کە لەناوەوەی خۆیدا ئەو کەر بوو کوێر بووە ، کاتێك کە شتە کان دەبیستێت کوێیی بۆ راناگری وەکو خۆی نای بیستیت بەلکو حەق لە لای ئەو دلە یە رەت کراوەتەوە ، کاتێکیش کە شتە کان دەبینی وەکو خۆی وێنەی ناکات و بیری لێ ناکاتەوە و پەندی لی وەرناگرێت ئەم جۆرە دلە وەکو مرۆڤی کوێر وایە لەراست حقیقەتی ژیان ..!!

بەلێ لێرە دا ئاماژە بەوەی بکرێت کەیەکێك لە بنەماکانی  (ئیمان یان باوەر ) ئەهلی سوننە و جماعە ئەوەیە کە : ( الایمان قول وعمل یزید بالطاعة وینقص بالمعصیة )واتە: باوەر هێنانە ودان پێدا نانی بە دڵ ،وە بە  ووتە یان زمان و ، وە بە   کارو کردەوە ،

ئینجا ئیمان بە چاکە کردن زۆر دەبێت و بە خراپە کردنیش کەم دەبێت ..!!

وە ئیمامی شافعی – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەلێت : (( كان الاجماع من الصحابه والتابعين من بعدهم ، ومن أدركناهم يقولون : ( الإيمان قول وعمل ونية ، لا يجزي واحد من الثلاث إلا بالاخر) .[1] واتە: ئیمان ووتەو کردارو نیییەتە کە هیچ کامیان بێ ئەوەی تریان دروست نیە ..!! جا ئەگەر هات و کەسێك لە ناخی دا باوەری بە (الله ) و ئایین و راستی پێغەمبەران – علیه السلام ) بوو ،ەبەلام ئامادەیە نەبوو کە بە ووتە و زمان و کردار بیسەلمێنێت ئەوە پێ ناو ترێت ئیمان دار یان باوەردار یان(المؤمن )  بەلام خۆ ئەگەر هەر باوەر هێنان بە دڵ و دەروون بوایە ، ئەوا کافران هێچ کێشەیەکیان نەبوو لە ئیمانیان ئەو کات دە یان ووت : ئێمە بە دڵ و دەروون ئیمان مان هێناوە ، ووتە و زمان و کردارە پێویست ناکات ، بەلام نەخێر وانیە ئیمان یان باوەر دەبێت بە چەسپاندنی دڵ دەورون بێت ، دواتریش دەبێت بە ووتە و زمان دانی پێدانێت ، هەروەها بە کرداریش بیسەلمێنیت ، ئەو کاتە دەبێتە ئیمانداریێکی راستە قینە ، وە کو کە باسمان کرد ئەگەر هەر باوەرهێنان یان ئیمان هێنانی دڵ و دەروون بوایە ئەوا زۆر بەی کافران دەبوون بە ئیماندار یان باوەردا هەروە کو (خوای گەورە ) دەفەرموویت قال تعالی: ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾ [الزُّمَر : ٣]

[1] الامام الشافعي كتابي (الام ).

واتە : ئەوان ئەڵێن: ئێمە ئەزانین ئەمانە ئێمەیان دروست نەکردووەو رزقی ئێمە نادەن بەڵام نایانپەرستین تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە لە خوای گەورە نزیکمان بکەنەوەو شەفاعەتمان بۆ بکەن، (خەڵکی ئەم سەردەمەیش کە دەچنە سەر دارو بەردو گۆڕو پەرستگاکان کە پێیان بڵێیت بۆ ئەمانە دەپەرستن و عیبادەتیان بۆ دەکەن!؟ هەمان گومانی هاوبەشبڕیاردەرانی سەردەمی نەزانی و نەفامی دێننەوەو دەڵێن ئێمە نایانپەرستین تەنها بۆ ئەوە نەبێت لە خوامان نزیك بکەنەوەو شەفاعەتمان بۆ بکەن، قسەو نیەت و گومان و کرداریان یەکە، وە سزایشان یەك دەبێت لە رۆژی قیامەت)..!! **بەڵێ ئەگەر ووتە و روالەت بێ کارو کردارو کردەوە بەس بوایە ئەوا بێ گومان دە بوایە فیرعەون ئیبلیس یان شەیتانیش وە کو ئیماندار حیسابیان بۆ بکرایە ..؟! هەروەکو (خوای گەورە ) لە بارەی فیرعەونەوە دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ٩٠﴾ [يُونُس : ٩٠] واتە : هو کاتەدا فیرعەون زانی تەواو غەرق ئەبێ وتی: ئیمانم هێنا بەو خوایەی کە بەنی ئیسرائیل ئیمانیان پێ هێنا کە هیچ پەرستراوێك بەحەق نیە شایەنی پەرستن بێ تەنها ئەو خوایە نەبێ کە بەنی ئیسرائیل ئیمانیان پێی هێناوە وە من تەسلیمی فەرمانی خوای گەورە بوومەو منیش یەکێکم لە موسڵمانان...؟!**بێ گومان فیرعەون دار دەستە کەشی لە دلەو (خوای گەورە) یان ناسیوە به شاهیدی دان بەوەی ك نەوەی ئیسرائیل لە سەرینە ئەویش ملکەچی ئیسلام بوونیانە ، ئەوە دەگەیەنی کە فیرعەون (الله ) ناسیوە لە دلەوە بەلام بە ووتە و بە زمان و بە کردار مەرجی (لا إله إلا الله ) جی بەجی نەکرد بوو ، هەر بۆیە لە کۆتاییی دا دانی پێدانە بەوەی کە ئیسلام بووە بە زمان دەری بری ، بەلام لە پێشدا مەرجەکانی (لا إله إلا الله ) بەجێ نە هێنابوو ، بە ووتە و زمان و کردار ، بۆیە وەك باسمان کرد ئیمان ئەگەر ئەم سێ یانەی لەگەل نەبێت یەکێ کیانی لێ تەرك بکەیت ئەوا مەرجی ئیمان قبول نابێت ئیمانی کامل و تەواو نیە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى:** ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ١٤﴾ [النَّمل : ١٤] واتە : {فیرعەونو دەسەڵاتداران یەقینیان هەبوو کە موسا - صلى الله علیه وسلم - پێغەمبەری خوایە!} [ وَجَحَدُوا بِهَا ] وە لە رووکەشیدا ئینکاری و نکۆڵیان لێ کرد [ وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنْفُسُهُمْ ] بەڵام لە نەفسی خۆیاندا یەقینیان هەبوو کە موسا - صلى الله علیه وسلم - ڕاست دەکات و پێغەمبەری خوایەو موعجیزەی پێیە [ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ] بەڵام زوڵمیان لە خۆیان ئەکرد، یان بەهۆی شەریك دانانیان بۆ خوای گەورە، وە بەهۆی لووت بەرزیان ئیمانیان بە موسا - صلى الله علیه وسلم - نەهێنا [ فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ (١٤) ] ئەی محمد - صلى الله علیه وسلم - تەماشا بکەو بزانە سەرەنجامی ئاشووبگێڕان چۆن بوو چۆن خوای گەورە لەناوی بردن، (واتە: ئەی کافرانی قورەیش ئاگادار بن ئێوەیش ئەگەر ئیمان نەهێنن خوای گەورە وەکو ئەوان لەناوتان دەبات، ئەوان لە ئێوە زۆرترو بەهێزتر بوون، وە پێغەمبەرەکەی ئێوە لەوەی ئەوان باشترو چاکترە).

**بێ گومان ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین ئیبلیس یان شەیتانیش باوەری بە بوون و دەسەلاتی (خوای گەورە ) هەبوو ، هەروەها باوەری بە بەهەشت دۆزەخ رۆژی دوایش هەبوو ، وە باوەری هە یە کە (الله تعالى ) بەدیهێنەوری ئەو هەموو بوونەوەرەیە ، جا هەر بۆیە دوا لە (خوای گەورە ) دەکات کە جاری بی هێلێتەوە و نەی کوژیت تاکو رۆژی زیندوو بوونەوە یان رۆژی مەحشر رۆژی قیامەت ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى:** ﴿قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ٧٩ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ٨٠ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ٨١ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٨٢﴾ [ص : ٧٩ - ٨٢]

واتە: [ قَالَ رَبِّ فَأَنْظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ (٧٩) ] ئیبلیس وتی: ئەی پەروەردگار بمهێڵەرەوە تا ڕۆژی زیندوو بوونەوە لە ڕۆژی قیامەت..؟! [ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنْظَرِينَ (٨٠) ] خوای گەورە فەرمووی: ئەوە مۆڵەتت ئەدەمێ و تۆ ئەمێنیتەوە تا ڕۆژی قیامەت..؟! [ إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ (٨١) ] تا کاتی دیاریکراو کە فوو کردنە بە کەڕەنای یەکەمدا کە دونیا تێك ئەچێت تا ئەو کاتە ئیبلیس ئەمێنێ..؟! (قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ) (٨٢) ] ئیبلیس وتی: سوێند بێت بە عیززەتی تۆ ئەی پەروەردگار ئەبێ هەموویان لە خشتە بەرم وە گومڕایان بکەم..؟!

**هەروەها (خوای گەورە ) دەربارەی ئەهلی کتێب واتە : جوولەکەو گاورە کان ، باسی ئەوان دەکات کە زۆر چاك دەزانن کە ئەو پێغەمبەر بۆ ئەوانیش هاتووە وەکو چۆن منداله کانی خۆیان دەناسن ئەواش ئەم پێغەمبەرە کە ناوی ﷴ دیناسن وە ئاینەکەشی دەناسن کە تەواو کەری پێغەمبەرانە بەتایبەتی (موسا) و (عیسی ) – علیە السلام – بۆیە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی:** ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمُ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٢٠﴾ [الأنعام : ٢٠] واتە : ئەوانەی کە تەورات وئینجیلمان پێدان، موحەممەد صلی الله علیه وسلم دەناسنەوە بەهۆی ئەو وەسف وسیفەتە نووسراوانەی کە باسکراوە لایان هەروەکو چۆن منداڵەکانی خۆیان دەناسنەوە، و لێیان تێکەڵ نابێت لەگەڵ منداڵی تردا، هەر ئاوهاش موحەممەدیان صلی الله علیه وسلم لێ تێکەڵ نابێت بەکەسی تر لەبەر ووردی ئەو وەسفکردنەی کە لە کتێبەکانیاندا کراوە، بەڵام ئەوان شوێنی ئارەزووەکانیان کەوتن، بۆیە خۆیان دۆڕان وتووشی خەسارۆمەندی بوون کاتێك باوەڕیان بە موحەممەد صلی الله علیه وسلم و پەیامەکەی نەهێنا ..!! **بەلێ دیارە کە ناسین و باوەر هێنان بە دل هیچ سوودی بۆ خاوەنەکەی نابیچت بە تەنها بەلکو دەبێت بە دڵ و ووتە زمان کردار ئەنجام بدرێت ، جا بۆ ئەو کەسانەیە کە بانگەوازی خۆشەویست بۆ (الله تعالی ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن ، جا هەر کاتێك پێیان دەوترێت کوا بە دڵ و بە کردار و بە زمان دەری دەبرن ..؟! لە وەلامیان دا دەلێن تەماشای دڵ دەروونمان بکە ئێمە دڵ مان سافە و پاکە کردار و زمان مەرج نیە ، ئێمەش پێیان دەلێن ئێوە زۆر بە هەلدا چوون و نقومی گومرایی بوون ئێوە خەسارەت مەندن ، لە دونیاو لە دوا رۆژدا ، بەلێ راستە (الله تعالی ) بۆ وەرگرتنی کردەوەکان تەماشای نیەت دڵ دەکات ، بەلام نابێت ئێمە بلێن : نوێژ ئەنجام نادەین دڵ و نیەت مان پاك وسافە یان مەرجی (لا إله إلا الله ) جێ بەجێ ناکەین..؟! هە ربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەك دا ئاگادار مان دەکاتەوە کە لە نێو لاشە دا پارچە گۆتێك هەیە ئەگەر چاك بوو هەموو ئەندامەکانی لاشە چاك دەبێت ئەگەریش خراپ و فاسد بێت هەموو ئەندامەکانی لاشە خراپ و فاسد دەبێت ئەوە کە ئاگادار بن ئەوە (دڵە)..!!**

📖 **لە (نعمان بن بشیر ) – خوا لی رازی بێت – دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((ألا وإنَّ فی الجَسَدِ مُضْغَةً، إذا صَلَحَتْ، صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ، وإذا فَسَدَتْ، فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّهُ، ألا وهی القَلْبُ)).[١]**

[١] - صحیح مسلم برقم (١٥٩٩).

بەڵێ بیرو بۆچوونی ئەهلی سوننە و جماعە واتە : سلف صالح پێشینە چاکەکان پێیان وایە : مەرجی ئیمان بۆ کەمال و تەواو بوونی ئیمان دڵ و دەروون و ، ووتەو زمان و ، کردارە ، واتە هەریەك لە مانە وازلێ بهێنی ئەوا ئیمانەکەی کامل نیە یان تەواو نیە ، کەم و کوری لە ئیمانەکەی دا هەیە یان ئیمانی نقس کردووە ، هەروەها بەتەواو بوونی ئیمان دەبێت ئەم سێ مەرجەی تێدا بەدی بکرێت ، ئینجا کامل و تەواو دەبێت ، بەلام مرۆڤ کافر نابێت بە داوین پیسی و زیناکردن کە باوەری بە داوین پیسی زیناکردن هەبێت واتە حەلالی بکات بۆخۆی ، بەلکو ئیمانە کەی کەم دەکات و دەرناچێت لە بازنەی ئیسلام ، بەلام هەندێك کردار هەن مەرجی بۆ تەواو بوونی ئیمان ئەگەر ترك بکرێت یان وازی لێ بەهێنین ئەوا بە دلنیایەوە کافر دەبێت پێ لەبازنەی ئیسلام دەر دەردەچێت وە کو وازهێنان لە نوێژەکان بە ئەنقەست باوەر نەهێنان بە فەرز واجب ، یان یارمەتی دانی کافران دژی سوپای ئیسلام و موسلمانان ، یان وازهێنان لە شەرع و حوکمی (اللە تعالی ) بە گشتی دەتوانین بلێن : هەموو کردەوەیەك کە بەجێ هێنانەکەی مەرج بێت یان فەرزو واجب بێت بۆ راستی ئیمان ، ئەوا بەدلنیایەوە وازلێ هێنانی کوفرە ، وە هەر کردەوەیەکیش وازلێ هێنانی مەرج بێت بۆ راستی ئیمان بە جی هێنانی کوفرە ..؟!، واتە : قبول کردن و رازی بوون مەرجە بۆ شەرعی (اللە تعالی ) مەرجە بۆ راستی ئیمان جا بێ گومان نارازی بوون و پشت لێ هەلکردن و یان پشت تێ کردن وازلێ هینانی کوفرە ..؟!، یان وازهێنان بە گالتە کردن بەئاین مەرجە بۆ راستی ئیمان ، چونکە گالتە کردن ئاین و ئیسلام کوفرە ..؟!هەروەها لە کاتی سەرەمەرگی (ابو تالیب ) مامی پێغەمبەر ﷺ

📖 لە (ابو هریرە ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە (ابو تالیبی ) مامی : ((قالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ لِعَمِّهِ: قُلْ: لا إلَهَ إلاَّ اللَّهُ، أشْهَدُ لكَ بها يَومَ القِيامَةِ، قالَ: لَوْلا أنْ تُعَيِّرَنِي قُرَيْشٌ، يقولونَ: إنَّما حَمَلَهُ علَى ذلكَ الجَزَعُ لَأَقْرَرْتُ بها عَيْنَكَ، فأنْزَلَ اللَّهُ: {إِنَّكَ لا تَهْدِي مَن أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشاءُ} [القصص: ٥٦] ). [١] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەمامی خۆم بلێ : (لا إله إلا الله ) لە رۆژی قیامەتدا لەسەر ئەم ووتەیە شایەیت بۆ دەدەم ، (ابو تالیب ) ووتی : ئەگەر قورەیش نەیان ووتایە ئیش ژانی سەرە مەرگە وای لێ کردووە ، بەوتنی ئەم ووتەی چاوم رۆشن دەکرێتەوە ، ئەگەر چی (ابو تالیب ) باوەری بە راستی پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەبوو بەلام چونکە بە زمان ئقراری نەکر یان بەزمان دانی پێدانەنا جا هەر بۆیە بە ئیماندار یان باوەر دار حیساب ناکرێت ..؟!

📖 لە (العباس بن عبدالمطلب ) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : ((أنَّهُ قالَ: يا رَسولَ اللهِ، هلْ نَفَعْتَ أبا طالِبٍ بشيءٍ، فإنَّه كانَ يَحُوطُكَ ويَغْضَبُ لَكَ؟ قالَ: نَعَمْ، هو في ضَحْضاحٍ مِن نارٍ، ولَوْلا أنا لَكانَ في الدَّرْكِ الأسْفَلِ مِنَ النَّارِ)) . [٢] واتە: دەلێ ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا هیچ سوودێکت بۆ (ابو تالیب ) هە بووە جاران تۆی دەپارست و بەرگری لێ دەکردی لە سەر تۆ توورە دەبوو ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بەلێ . ئەو لە ناو تەنگە ئاگرێك دایە ئەگەر من نەبوومایە دەبوایە لە قولائی ئاگر دا بوایە واتە لە : (الدرك الاسفل من النار ) بوایە ..!!

---

[١] - صحيح مسلم برقم (٢٥).
[٢] -صحيح مسلم برقم (٢٠٩).

بەڵێ ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ واتە: ختم یان مۆری ناوە بەدڵ یانەوە ئەوانەی کە باوەریان نەهێنا بەوەی کە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن (خوای گەور ) رەوانە کراوە ، واتە : گوێیی دلە کانیان کەر بوو ، چاوی دلە کانیان کوێر بووە ، وەکو ئەوەی کە پێنج هەستەوەرەکەیان لە کار کەوتووبێت وایە ، دەلێ پەردەی گوێیان دراوە کەر بووە ، دەلێ چاوەکانیان پەردەی لەسەرە داپۆشراوە لەراست حەقیقەتی پەیامای ئیسلام ، هە ربۆیە لە کوفر و گومرایی خۆیاندا سەرگەردن بوونە ، هەربۆیە سزایی گەورە یان بۆ ئامادەیە لە رۆژی دوایی دا چونکە سزایەکی تایبەتە بەکافر و بێ باورانەو هەروەها ئەم سزایە ئامادەیەش بۆ ستەمکارانی جیهان، ووشەی ﴿خَتَمَ﴾ واتە: مۆر یان پێوە بکە یان پێوە بەستنەوە ، وەکو چۆنە پەلەیەکی رەش یان شتێیك پێوە بکەی یان ببەستیەوە بە شتێك..!! وە ووشەی ﴿غِشَٰوَةٌ﴾ واتە: روو پۆشین یان پەردە پۆش کردن یان شتێك داپۆشی فێری تێدا بکەیت بیشاریەوە ..!!

﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡ﴾ واتە: مۆری (خوای گەورە )ی لێدراوە لە سەر دڵ و بیستنیان ، چونکە بە هیچ شێوەیەم سوودی نیە بۆیان بۆ رێنمووی کردن و هیدایەت دانیان ، ﴿وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٌ﴾ واتە : پەردە یان بەسەر داپۆشێوە ، بەهیچ شێوەیەك حەق نابینن ،وە رێنموویی و هیدایەت وەرناگرن ، ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٧﴾ واتە: سزایەکی تایبەت و گەورەیان بۆ ئامادە کراوە ئەویش ئاگری دۆزەخە ..!!

✍ لە (قتادە ) -رەحمەتی خوای لی بێت – لە سر ووتەی ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ﴾ دەلێت : (شەیتان زاڵ بووە بەسەریاندا و بوونەتە گوێ لە مشتی شەیتان ، (خوای گەورە) ش مۆر یان ختم ی ناوە بەسەر دڵ و گوێیانداو پەردەشی کێشاوە بەسەر چاویاندا ، رێگەی راست نابینن و نە دەبیستن و نە تێدەگەن و نە بیرهۆشیان دە خەنە گەر ).[١]

✍ لە (ابن جریر ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی ﴿خَتَمَ﴾ دە لێت : واتە:( مۆر تاوانەکان لەسەر دڵ ئەچەسپێت و کۆدەبێتەوە لە هەموو لایەکەوە دەوری دەدان تاکو دەی گرێت یان پێوەی دەنووسێت ئە چاپە یان طبع لەسەری دادەنرێت واتە : مۆر یان ختم ).[٢]

✍ لە (ابن جریر ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی ﴿خَتَمَ﴾ دە لێت : واتە: (مۆرەکە یان ختمە کە لەسەر دڵ گوێیە ).[٣]

---
[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤١/١).
[٢] -اخرجة ابن ابي حاتم (٤٤/١).
[٣] -الطبري (٢٥٩/١).

✍ لە (سعید المقبري ) لە ری ( ابي معشر ) – رحمە تی خوا یان لی بیت – دە لیت : ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ واتە : (كافر بوون ).[1]

✍ لە( إسماعیل السدي) لە ( أسباط ) – رە حمە تی خوا یان لی بیت – لە سە ر ووتە ی ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡ﴾ دەڵیت : ئەوان بەهیچ شێوەیەك نابیستن ، وە بەهیچ شێوە یەك تێ ناگەن و بیرو هۆشیان ناخەنە گەر یان عەقلیان ناخەنەگەر ).[2]

✍ لە (مجاهد) رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : ووشەی (الران)واتە : ژنگ ، ئاسانترە لە ( ختم یانطبع )[4] هەروەها ووشەی (ختم یان طبع ) ئاسانترە لە ووشەی (قفل) دان بێ گومان (قفل ) دان لە هەموویان بەهێز ترە ).[3]

✍ (قرطبی ) – رە حمە تی خوا ی لی بیت – دە لیت : (زانایان ئەم ئومەت لە سەر ئەمە یەك دەنگن کە (خوای گەورە ) وەسفی خۆی کردووە بە (ختم یان مۆر چاپ یان طبع) لە سە ر دلی بێ باوەران یان كافرو خوانەناسان لە پاداشتی ئەو خوانەناسیە یان دا هەروەك دەفەرموویت قال تعالی: ﴿بَلۡ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيۡهَا بِكُفۡرِهِمۡ﴾ [النِّسَاء : ١٥٥] واتە : بەڵکو خوای گەورە بەهۆی کوفری خۆیانەوە مۆری لەسەر دڵیان داوە..!! ).

📖 لە (ابو هریرە ) – خوا لی رازی بیت = دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إن العبدَ إذا أخطأ خطيئةً نُكِتتْ فى قلبهِ نُكتةً سوداءَ فإذا هو نزعَ واستغفرَ وتابَ سُقلَ قلبهُ وإن عادَ زِيدَ فيها حتى تعلو قلبهُ وهو الرانُ الذى ذكرَ اللهُ (كَلاَّ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ) )) .[4]

📖 لە (أنس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەی جار دەی فەرموو : ((يا مقلِّبَ القلوبِ ثبِّت قلبى على دينِكَ فقلتُ: يا نبيَّ اللَّهِ آمنَّا بِكَ وبما جئتَ بِهِ فَهل تخافُ علَينا ؟ قالَ: نعَم إنَّ القلوبَ بينَ إصبَعَينِ من أصابعِ اللَّهِ يقلِّبُها كيفَ شاءَ)) .[5] واتە: ئەی هەڵسوڕێنەری دڵان دڵم جێگیر و دامەزراو بکە لەسەر ئیمان و باوەر ، (انس ) دەلیٚ ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوەر مان هێنا بە تۆ بەوەی كە بۆت هاتووە ، ئایا دەستری هەڵگەرێنەوە و بێ باوەر بین ..؟! فەرمووی : بەلێ . بێ گومان هەڵگەرانەوەی دلە كان بە ویستی خوایە هەلیدەگێریتەوە چۆن ویستی لێ بێ..!!

[1] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤١/١).
[2] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤١/١).
[3] - الطبري (٢٥٩/١).
[4] -سنن الترمذي برقم (٣٣٣٤).
[5] - سنن الترمذي برقم (٢١٤٠).

له (عبد الله بن عمرو ) – خوا لی رازی بیت – دە لیت : گویم له پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەی فەرموو : ((إنَّ قُلُوبَ بَنِي آدَمَ كُلَّهَا بيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِن أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ، كَقَلْبٍ وَاحِدٍ، يُصَرِّفُهُ حَيْثُ يَشَاءُ، ثُمَّ قالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ: اللَّهُمَّ مُصَرِّفَ القُلُوبِ صَرِّفْ قُلُوبَنَا علَى طَاعَتِكَ)).[١] واته : نەوەی ئادەم هەمووی له نێوان دوو پەنجە له پەنجە کانی خوای میهرەباندایە وەکو یەك دڵ ، چۆنی بویێ وای لێدەکات ، له پاشاندا فەرمووی ، بێگێری دله کان دڵ مان بێگێرە بۆ گوێرایەلی و پەرستنی تۆ ..!!

له ( جابر بن عبدالله ) – خوا لیێ رازی بێت – دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((غِلَظُ القُلُوبِ والْجَفاءُ فى المَشْرِقِ، والإِيمانُ فى أَهْلِ الحِجازِ)) .[٢] واته: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : دڵ رەقی ووشکی له رۆژ هەلاتەوەیە ، باوەریش له لای خەلکی حیجازە ..!!

له (حذيفة بن اليمان ) –خوا لی رازی بیت- دەلێت : ((قُلتُ: يا رَسولَ اللهِ، إنَّا كُنَّا بشَرٍّ، فَجاءَ اللَّهُ بخَيْرٍ، فَنَحْنُ فِيهِ، فَهلْ مِن وَرَاءِ هذا الخَيْرِ شَرٌّ؟ قالَ: نَعَمْ، قُلتُ: هلْ وَرَاءَ ذلكَ الشَّرِّ خَيْرٌ؟ قالَ: نَعَمْ، قُلتُ: فَهلْ وَرَاءَ ذلكَ الخَيْرِ شَرٌّ؟ قالَ: نَعَمْ، قُلتُ: كيفَ؟ قالَ: يَكونُ بَعْدِي أَئِمَّةٌ لا يَهْتَدُونَ بهُدَايَ، وَلَا يَسْتَنُّونَ بسُنَّتِي، وَسَيَقُومُ فيهم رِجَالٌ قُلُوبُهُمْ قُلُوبُ الشَّيَاطِينِ في جُثْمَانِ إنْسٍ، قالَ: قُلتُ: كيفَ أَصْنَعُ يا رَسولَ اللهِ، إنْ أَدْرَكْتُ ذلكَ؟ قالَ: تَسْمَعُ وَتُطِيعُ لِلأَمِيرِ، وإنْ ضُرِبَ ظَهْرُكَ، وَأُخِذَ مَالُكَ، فَاسْمَعْ وَأَطِعْ)) .[٣] واته: ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئێمە مرۆڤین ، بۆیە (خوای گەورە ) ئەم چاکە و خێرەی بۆ هێنایین ، ئایا له دوای ئەم چاکە یە خراپە هەیە یان شر هە یە ..؟! فەرمووی : بەلێ . منیش ووتم : ئایا له دوای خراپە و شەر خێرو چاکە هەیە ..؟! فەرمووی : بەلێ . منیش ووتم : ئایا له دوای چاکە و خیر خراپە و شر هەیە ، فەرمووی : بەلیێ. منیش ووتم : جۆن ..؟! فەرمووی : له دوای من دا قومانێك هەن شوێنی هیدایەت و رێنموویی من ناکەوە ، وە شوێنکەوتەی سوونەتی من نابن ، وە پیاوانێك پەیدادەبن کە دله کانیان دڵ ی شەیتانەکان له نێو لاشە مرۆڤ دا ، منیش ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر هەستمان بەمە کرد ئێمە چی بکەین ..؟! فەرمووی : ئێوە گوێ بگرن و گوێرایەلی ئەمیرەکانتان بن ، ئەگەر له پشتیشت درا ، سامان مالە کەشت بردرا یان لێ یان وەرگرتی ، هەر گوێ بگرن و هەر گوێرایەلی ئەمیرەکانتان بن ..!!

له ( عبدالله بن عباس ) له ریَ (السدی ) له ( ابي مالك وأبي صالح ) – رزاو رە حمە تی خوا یان لی بیت- له سە ر ووتە ی ﴿وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞ﴾ دە لیت: واتە: ( لەسەر چاوەکانیان بە پەردە داپۆشراوە بۆیە بەهیچ شێوەیەك نابینن ).[٤]

---

[١] - صحيح مسلم برقم (٢٦٥٤).
[٢] -صحيح مسلم برقم (٥٣).
[٣] صحيح مسلم برقم (١٨٤٧).
[٤] -اخرجه ابن جرير (٢٧٣/١).

✍ لە (مقاتل بن سليمان) – رەحمەتی خوا لی بیت = لەسەر ووتەی ﴿وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞ﴾ دەڵێت : ( واتە: بە پەردە چاوی داپۆشراوە نابینێت بۆ هیدایەت و رێنمووی کردن ).[1]

✍ لە (ابن جریج) لە ری (حجاج) – رەحمەتی خوا یان لی بیت – دەڵێت : مۆری نراوە بە سەر دڵ و بیستنی ، پەردەی نراوە بە سەر بینینی ، هەروەکو (خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخۡتِمۡ عَلَىٰ قَلۡبِكَۗ﴾ [الشُّورَى : ٢٤] واتە : - خوای گەورە ویستی لێبێت مۆر ئەدات لەسەر دڵت..!! هەروەها (خوای گەورە) دەفەرموویت قال تعالى: ﴿وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمۡعِهِۦ وَقَلۡبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةٗ﴾ [الجَاثِيَة : ٢٣] [ واتە :[وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ ] وە خوای گەورە مۆری لە گوێ و دڵی داوەو هیچ شتێك نابیستێت کە سوودی لێ ببینێت، وە هیچ شتێك تێناگات تا هیدایەتی پی وەرگرێت [ وَجَعَلَ عَلَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً ] وە پەردەی داوە بەسەر چاویداو حەق نابینێت لەبەر ئەوەی شایەنی بینینی حەق نیە..!! ).[2]

✍ لە (عبدالله بن عباس) لە رێ (ابن إسحاق) رزاو رەحمەتی خوا یان لی بیت – لەسەر ووتەی ﴿وَلَهُمۡ﴾ واتە : ئەوانەی کە دژایەتی تۆ دەکەن ئەی ﷺ ﴿عَذَابٌ عَظِيمٞ ۝٧﴾ دەڵێت : ئەوە بۆ ئەحبارە کانی جوولە کە یان یهودە ، کە بە درۆیان دەخستەوە ، کەچی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر حەق راستی بۆ لە لایەن (خوای گەورە ) بۆی هاتبوو ، ئەوانیش چاکیان دەزانی بەوەی کە بۆی هاتۆتە خوارەوە واتە قورئانی پیرۆ ، چونکە لە کتێبەکانی جوولە کەو گاورە کا ئاماژەی بەهاتنی کرا بوو)[3]

✍ لە (عبدالله بن عباس ) لەرێ (ابی روق ) لە (ضحاك ) – رزاو رەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿عَذَابٌ﴾ واتە: نکال واتە : سزا لە لایەن (خوای گەورە ) ).[4]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ۝٧﴾ دەڵێت : واتە (سزایەکی بێ هەژمارهیچ پچراندنی تێدانیە ).[5]

✍ لە (مقاتل بن حیان ) –رەحمەتی خوای لێ بێت – لە رێ (بكيرى بن معروف ) – رحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ۝٧﴾ دەڵێت : واتە سزایەکی بێ هەژمار ).[6]

---

[1] - تفسير مقاتل بن سليمان (٨٨/١).
[2] -اخرجه الن جرير (٢٧/١).
[3] - سيرة ابن هشام (٥٣١/١).
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤٢/١).
[5] -تفسير مقاتل بن سليمان (٨٨/١).
[6] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤٢/١).

قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ۝٨﴾ [البَقَرَةِ : ٨]

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ﴾ واتە: وە لە ناو خەلکی دا هەندێ کەس هەیە کە دەلێ: ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ واتە: بروامان هێناوە بە خوا و بە رۆژی دوایی ، ﴿وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ۝٨﴾ لە کاتێکدا ئەوان بروا دار نین ..!!

لەم سورەتە دا کە دە کاتە ئایەتی (٨) سورەتی البقرە دەست پێدە کان بە سیفە تەکانی موناڤقین یان دوو رووە کان کە (١٣) یائەت لە خۆدە گرێت ، لە ئایەتی (٨) دەست پێ دەکات تاکو ئایەتی (٢٠) باسی موناڤق و دوو رووەکان دەکات ، بەلێ دوا بەدوای سیفە تەکانی کافران دێنە سەر باسی دوو رووە کان یان موناڤیقە کان ، چونکە ئەم (١٣) ئایەتە زۆر گرینگە مرۆڤی موسلمان دەبارەیان بزانێت لە ماناو مەبەستی ئایە تەکانی تێ بگات ، دوو رووەکان چونکە بە راولە ت رووخساریان موسلمانان و بەئاسانی دەتوانن لە نێو کۆمەلی موسلمانان جێگای خۆیان بکەنەوە ، وە هەموو رازو نهێنی موسلمانان بزانن، هەر لەبەر ئەم هۆکارانەو چەندین هۆکاری تریش ، چونکە ئەمانە واتە موناڤیقەکان مەترسیان زیاتر لە کافرەکان و مولحیدەکان ، هەر بۆیە لە چەندین شوێنی تری قورئانی پیرۆز دا باسی دوو رووەکان یان موناڤیقە کان کراوە ، وەکو سورەتی (التوبە ) ، یان سورەتێك هەر بەناوی خۆیانەوەیە سورەتی (المنافقین ) وە هەندێك لە سورەتی (النور) وە سورەتی (النساء ) وە لەچەندین شوێنی تری قورئان ناوە بەناوە (خوای گەورە ) دەربارەی موناڤیقە کان باسمان بۆدەکات سیفەتەکانیان بۆمان روون دەکاتەوە ، بەلام لە سورەتی (البقرە) دا بە شێوەیەکی روون تر لە (١٣) ئایەتدا باسی دەکات ، بەلێ دوو رووەکان یان موناڤیقەکان خۆیان بە خاوەن باوەر دەردەخەن کەچی لە نێو دلیان خوانەناس و بێ باوەرن ، هەر لە بەر ئەوەی زۆرێك لەخەلکی لێان تێك دەچی وە باش نایان ناسن کە چ جۆرە مرۆڤێکن ، چونکە ئەمانە بە روالە ت موسلمانان بەلام لە دڵ ناخیان دا پرە لە دوو روویی یان موناڤقی ، وەکو گورگێك وان لەنێو پیستی مەردا ، هەر بۆیە بۆ موسلمانی راستەقینە زۆر پێویستە ئەو کەسانە بناسێتەوە لە ژیانی رۆژانەی خۆیدا ، چونکە سیفەتەکانیان ئاشکراو روونە ئەوەی کە لەم ئایەتانە روون بێتەوە لی تێ بگات بیرو هۆشی بخاتە گەر ، بۆیە (خوای گەورە ) فەرمانمان پێدەکات کە دوور بەکەوینەوە لەو کەسانە کە سیفەتی دوو روویان تێدا بەدی دەکرێت بۆ ئەوەی زیان بەموسلمانان نەگەیەنن ، وە کاتێك ئەو ئایەتانە هاتنە خوارەوە کە باسی موناڤیقە کان دەکات لە شاری مەدینە ئەم ئایەتانە دابەزینە خوارەوە ، چەنکە ئەگەر براونینە قورئانی پیرۆز دەبینین لە شاری مککە هیچ دوو روویەك تێدا نەبوو ئەوەی هەبوو تەنا یان کافر بوو وە یان موسلمان بوو، بەلام کاتێ پێغەمبەری خوا کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە چەندین کۆمەل چین و دەستە هەبوون ، وەکو موسلمانە راستە قینەکان ، کۆمەلی موناڤیقە کان یان دوو رووەکان ، هەروەها کومەلی جوولەکە و عەربە دەشتەکیەکان ئەوانەی کەبت پەرست بوون بۆیە ، ئایەتەکانی کە باسی موناڤقەکان دەکات هەر هەموویان لەشاری مەدینە هاتوونەتە خوارەوە ، (خوای گەورە ) سیفە تەکانیان روون دە کاتەوە.

بەڵێ وەکو باسمان کرد دوو روو یان مونافیقە ئەو کەسانەن  کە لەدوای کۆچ کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شاری مەدینە پەیدا بوون ، دوو روو یان مونافیقەکان ئەو کەسەیە کە بە روالەت  خۆی چاك بکات ، وە لە ناخی دا  یان لە دڵ ی شەوە دەروون پیس وناپاك بێت ،جا هەیانە نیفاقی عقیدیی یان دوو رووی بیرو باوەر ، وە هەشیانە نیفاقی عمل ی یان دوو رووی کرداری ، بەلام ئەگەر نیفاقی عقیدەیی یان دوو رووی بیرو باوەر لەسەری بەدی کرا وە بینرا ئەوە بێ گومان خاوەنەکەی تێدا کافر دەبێت ، مادەم  عقیدە بیرو باوەری بە بنەماکانی ئاینە نەبێت ، وەك ئەوەی بلێت: نوێژ پێویست نیە یان زەکات واجب نیە ، یان بە عقیدە حەرامێك حەلال بکات ، هەروەها خاوەنەکەی بە روالەت شتەکان دەکات بەلام لە ناخی دا باوەری پێ نیە پێچەوانەی دڵ و دەرونیە (فسق ) و(الظلم) هەرکات لە قورئان هات ئەوا بێ گومان باس لە نیفاقی عقیدەیی دەکات یان دوو رووی بیرو باوەر دەکات ، بەلام لە نیفاقی عمل ی یان کرداری خاوەنەکەی لە دڵ ی دا باوەری هەیە بەلام بە کارو کردار خرپەکاری دەکات ..!!وە کو باسمان کر پێناسەی دوو روو زۆرەن بەلام لێرە دا هەندێکی باس دەکەین ، دوو روو یان مونافیقە : بریتیە لە دەرخستنی چاکە و شاردنەوەی خراپە ، ئەمەش چەند جۆرێکە وەك باسمان کرد نیفاقی عقیدەیی یان دوو روویی بیرو باوەر ئەوەش خاونەکەی بۆهەتاهەتایی دەکات نێو ئاگری دۆزەخ ، ئەوەش لە گوناهە زۆر گەورە کان ، ئەمەش وەکو ئەمە وایە کە دوو روو قسە کانی پێچەوانەی کارو کرداریەتی ، وە نهێنیەکانی پێچەوانەی ئاشکرایەتی ، دەروەو ناوەوەی وەك یەکن نیە ، لە پاشەملە جۆرێکە لە روودا جۆێکی ترە ..!!بەلێ وەکو باسمان کرد لە سیفەتەکانی دوو روو لە شاری مەدینە هاتە خوارەوە ، چونکە لە ناو شاری مککەدا دوو روو نەبوو ئەوەی هەبوو یان موسلمان بوو بەنهێنی یان ئەوە تا کافر بوو بە ئاشکرا ، پێچەوانەی شاری مەدینە ، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە دوو هۆزی ناوداری تێدا بوو لە (ئەوس خەزرەج ) کە ئەوانیش بە ئەنصاریەکان ناسرابوون ، لە سەردمی نەفامی دا بت یان دەپەرست ، لە سەر بیرو باوەری بت پەرستانی عەرەب بوون ، وەتمان ئەهلی کتابیشی تێدابوون لە جوولەکەکان کە سێ تیرەی جوولەکەکان بوون ، وەکو (نەوەی قینقاع) هاوپەیمانی خەزرەج ، (نەوەی نضیر ، قریظة  )هاوپەیمانی ئەوس  بوون ، بەلام لەدوای غەزای بەدری گەورە ئەوە بوو (خوای گەورە ) موسلمانە کانی سەرخست بەسەر بت پەرستانی مککە ، ئەوە بوو دوو رووەکان پەیدا بوون لەوانە کە سەرۆکی هەر گەورەی دوو رووەکان کەپێشتر سەرداری مەدینە بوو ، هەروەها سەرۆك هۆزی گەورەی (خەزرەج ) ئەویش (عبداللە کوری ئوبەی کوری سەلول ) بوو ، کە گەورە مونافیقی یان گەورەیی دوو رووکان بوو لە پاش جەنگی بەدر دا ، بەلام کۆچ کەرە کان هیچ کەسێکیان لە نێو دا نەبوو کە دوو روو بێت ، ئەوەی هەبوو لە نێو شاری مەدینە لە ئەنصاریەکان بوون وەکو دوو هۆزە گەورە کە عەرەبە دەشتەکی یەکانی دەوربەری شاری مەدینە ، ئەوانە چەندین کەس و هۆزی تر، لە نێو شاری مەدینە دوو روو بوون ،بەلێ کۆچ کەرەکان دوو روویان لە نێوان دا نەبوو ، چونکە هیچ کەسێك بە زۆری لە شاری مککە دا بۆ شاری مەدینە کۆچی نەکرد بوو ، بەلکو بە مال و مندال سامان کانیانەوە کۆچیان کرد ،بۆ ئەوەی رەزامەندی خواو پێغەمبەریەکەی ﷺ بەدەست بهێنن ...!!

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ﴾ ئەگەر سەرنج بدین لە پیتی ﴿مِنَ﴾ بە مانای هەندێك دێت ، نەك هەموو خەلك ، واتە : هەندێك لە خەلك و کەسانێك هەن ، یان هەندێك هەن ، هەر بۆیە هەموو زانایان لە سەر ئەم ئایەتە یەك دەنگن کە دەربارەی دوو رووەکان دابەزیوە ، چونکە وەك باسمان کرد لە شاری مککە دا دوو چین هەبوو موسلمان و کافر ، بەلام بە گوێرەی ﴿مِنَ﴾ کە لە زمانی عەرەبی دا بە مانای هەندێك دێت ، واتە : هەندێك لە خەلکی شاری مەدینە یان کەسانێك لەشاری مەدینە دا ، لە ناخیان دا باوەر دار نین ، ئەوانیش بێ گومان مەبەست لێ دوو رووەکان بوون یان مونافیقە کان بوون، وە ك باسمان کرد لە سەرتایی یەکەمی سورەتی (البقرە ) کە بە (٥) ئایەت باسی ئیمانداران دەکات ، وە بە (٢) ئایەتیش باسی کافران دەکات ، ئینجا بە (١٣) ئایەتیش باسی دوو رووەکان دەکات ، کەواتە لە نێوان موسلمانان و کافرەکان دا ، دوو روو مونافیقە کانن ئەوانیش هەندێك لە خەلیکی نەوە هەموو خەلك ، ئەگەر سەرنج بدینە ووشەی ﴿ٱلنَّاسِ﴾ ئەصلی ئەم ووشە یە (الأناس )ە ، (همزە) رە شکراوەتەوە ، بۆ ئەوەی سووك بێت لە سەر دەربرینی زمان ، وەرگیراوە لە (النوس ) مانایی جولە هەلدەگرێت ، یان (الإیناس ) وەر گیراوە ، کە بە مانای بەرچاو دێت ، واتە : شتێك دیار بێت ، یان لە (الأنس ) وەرگیراوە ، چونکە مرۆڤ پەیوەندی لەگەل یەکتری هەیە و یەکتریان خۆش دەوێت ، هەموو ئەم واتاو ماناو مەبەستانە لەو خۆدی مرۆڤ دا هەن ، کە جولە دەکات بۆ بەرێوەچونیی پێداویستیەکانی ، هەروەها دیارە بەرچاوەو شاراوە پەناهە و نادیار نیە وەکو جنۆکە ،هەر سەبارەت بەوەی کە مرۆڤ لە ( النسیان ) هاتووە ، ئەمەیان (الله اعلم ) بەلام (ابن قیم ) — رەحمەتی خوای لی بێت - دەلێت : ئەگەر (الإنسان ) مەشتەقی یان سەرچاوەی (النسیان ) بوبایە ئەوا دە ووترا: (نسیان ) نە ك (إنسان ) ..!! قال تعالی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ [البَقَرَةِ : ٨] بەلێ ئەمانە دوو رووەکانن یان مونافیقەکانن ، وەسف نەکراون بە ئیمان ، یان وەسف نەکراون بە کوفر ، چونکە لە نێوان هەردووکیاندان ، بەلام سە بارەت بە حوکمیان دا ئەگەر لە سەر نیفاقی عقیدەی بێت ئەوا گومانی تێدانیە کافر بوون ، لە چینی ژێرەوەی دۆزەخ دان ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ١٤٣﴾ [النِّسَاء : ١٤٣] واتە : بێگومان هەمیشە حاڵی ئەو دوو ڕوانە دوودڵی و ڕاڕایی و شڵەژاویە، بۆیە لەسەر حاڵەتێك جێگیر نابن، نە لەگەڵ باوەڕدارانن و نە لەگەڵ بێباوەڕان . وە هەرکەسێك خوای پەروەردگار دڵی لە باوەڕهێنان و دەستگرتن بە شەرعەکەیەوە لابدات، ئەوا هەرگیز تۆ ناتوانی هیچ ڕێگایەکی بۆ بدۆزیتەوە بەرە و هیدایەت و دڵنیایی ..!! ئەمانە بە زمان دەلێن : ئیمانمان هێناوە بە خوا ، بەلام لە دلّ و ناخیاندا ئیمانیان نەهێناوە ، هەروەها زانایان دەلێن ووتەی : ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ ئیمان واتە: تەئکید ، ئەگەر نا دوو رووەکان زۆر لە کافران باوەریان بە خوا بە رۆژی دوایی هەیە ،بەلام باوەریان بەئیسلام دەسەهەلاتی ئیسلام نیە ، ووتەی ﴿وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ تەئکید کراوەتەوە بە پیتی (با) بۆ (مبالغە)یە چونکە بەدرۆخستنەوەیانە ..!!

لە (حذيفة بن اليمان ) – خوا لیَ رازی بیت – دە لیت : ((إنَّ المُنَافِقِينَ اليومَ شَرٌّ منهمْ علَى عَهْدِ النبيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ؛ كَانُوا يَومَئذٍ يُسِرُّونَ، واليومَ يَجْهَرُونَ)) .[١] واتە: دوو ڕووەکانی ئەمڕۆ لە دوو ڕووە کانی سەردەمەی پێغەمبەری خوا ﷺ خراپترن ، چونکە ئەوان دوو ڕووە کەیان دەشاردەوە ، بەلام دوو ڕووەکانی ئەمڕۆ ئاشکرایی دەکەن ...!!

لە (عبدالله بن عمر ) – خوا لی رازی بیت –دەلێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((مَثَلُ المُنافِقِ كَمَثَلِ الشَّاةِ العائِرَةِ بيْنَ الغَنَمَيْنِ؛ تَعِيرُ إلى هذِه مَرَّةً، وإلَى هذِه مَرَّةً. [وفي رواية]: تَكِرُّ في هذِه مَرَّةً، وفي هذِه مَرَّةً)) .[٢]واتە: وێنەی مونافیق یان دوو ڕوو وەك وێنەی مەری وێلی نێوان دوو ڕانە مەر وەهایە ن جارێك لە کۆمەلی ئەو لادەبێت جارێکی تر لەکۆمەلی ئەو لادەبێت ..!!

لە ( كعب بن مالك ) – خوا لی رازی بێت- دەلێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((مَثَلُ المُؤْمِنِ كَمَثَلِ الخامَةِ مِنَ الزَّرْعِ، تُفِيئُها الرِّياحُ، تَصْرَعُها مَرَّةً وتَعْدِلُها، حتَّى يَأْتِيَهُ أجَلُهُ، ومَثَلُ المُنافِقِ مَثَلُ الأرْزَةِ المُجْذِيَةِ الَّتي لا يُصِيبُها شيءٌ حتَّى يَكونَ انْجِعافُها مَرَّةً واحِدَةً )) .[٣] واتە : نموونەی ئیماندار وەك ڕووەکێکی تەرو تازە ڕواو وایە ، با دەیلەرزینی بەم لاو بەم لایدا دەبات لاریَ دەکاتەوە ، جارێك زۆری لار دەکاتەوە جارێکیش بەرزی دەکاتەوە ، هە تاکو ووشك دەبێت ، نموونەی کافریش وەکو داری سنۆبەر وایە لەسەر قەدەکەی ڕاوەستاوە ، وەهیچ شتێك نای جوولێنی هەتاکو بەیەکجاری هەلدەکەنیَ ، لەرێوایەتێکی تردا جارێکیش ڕاستی دەکاتەوە هە تا کۆتایی ژیانی دێت ..!! وەك نموونەی دوو ڕوو یان مونافق وەك سنۆبەرێکی بتەو وایە هیچ شتێك تووشی نابێت ،واتە : دوو ڕوو یان مونافیق تووشی دەردو بەلای دونیا نابێت تا ببێتە کەفالەتی گوناهەکانی..!!

لە (أنس بن مالك ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((آيَةُ الإيمانِ حُبُّ الأنْصارِ، وآيَةُ النِّفاقِ بُغْضُ الأنْصارِ)) [٤] واتە: نیشانەی ئیمان خۆشەویستی ئەنصارەکانە ، وەنیشانەی دوو ڕووی نفاق رق لێبوونەوەی ئەنصارەکانە ..!!

[١] - صحيح البخاري برقم (٧١١٣).
[٢] -صحيح مسلم برقم (٢٧٨٤).
[٣] -صحيح مسلم برقم (٢٨١٠).
[٤] - صحيح البخاري برقم (٣٧٨٤).

📖 لە (ابو امامە الباهلی ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إنَّ الكذبَ بابٌ مِن أبوابِ النِّفاقِ)) .[١] واتە: دۆر کردن ، کردەوەیەکە لە کردنەوەی هەموو دەرگاکانی دوو روویی یان نیفاق ..!!

📖 لە (ابو هريرە ) – خوا لیی رازی بیت – دەلێت : لەپیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((آيَةُ المُنافِقِ ثَلاثٌ: إذا حَدَّثَ كَذَبَ، وإذا وعَدَ أخْلَفَ، وإذا اؤْتُمِنَ خانَ)). [٢] واتە: نیشانەی دوو روو سێ یانە : ئەگەر قەسەی کرد درۆ دەکات ، ئەگەر وعد و بەلێنی دا ناباتەسەر واتە : لە بەلێنەکی خۆی پاشگەز دەبێتەوە ، وە ئەگەر ئەمانەتێکی یان سپاردەیەکی لە لابوو ئەوا خیانەتی یان ناپاکی لێدەکات ..!! (هەروە کو ئێستای بە ناو دەسەلات داران کە خیانەت ناپاکی لە ئەمانەتەکایان دەکەن لە دامودەزگای دەولەت خیانەت دەکەن ملك ومال و سامانی گشتی بە ناحەق دەدزن دەخۆن بێ گوێدان بە ئادابی مرۆڤایەتی چونکە ئەوانە وەکو ئاژەل رەفتار دەکەن لەدزینی سامانی خەلکی دا ئەوانە گەورە مونافق دوو رووی ئەم سەردەمەن ..!!

📖 لە (حذيفة بن اليمان ) – خوا لی رازي بیت – دە لیت : ((إنَّما كانَ النِّفاقُ علَى عَهْدِ النبيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فأمَّا اليومَ فإنَّما هو الكُفْرُ بَعْدَ الإيمانِ)) .[٣] واتە: لە راستیدا نیفاق یان دوو رووی تەنها لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ بوو ، بەلام ئێستا یان ئەمرۆ کافر بوون لە پاش ئیمان دا ..!! چونکە کابر لە بنەمالەیەکی موسلمان و لەدایك باوکێکی موسلمان لەدایك بووە، بەلام ئەمرۆ بە هۆی پلە و پایە و ئارەزووی خۆشی ژیانی دونیا ، دوو رووی نیفاقی تێدا بەدی دەکرێت بەهۆی پلە پۆست و پایەکەیەوە نەوە ك کورسیەکەی لە بن دەربهێنن ئەمەیە دوو رووی و نیفاق کرداری ..!!

📖 لە (عبدالرحمن بن مل النهدى ابو عوسمان ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت: لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إن أخوفَ ما أخاف على أمّتى كلُّ منافقٍ عليمُ اللسانِ)). [٤] واتە: ئەو شتەی کە بەراستی لی دەترسم بۆ ئومەتەکە ، کە هەموو دوو روویەمی یان مونافقێکی زمان زانایە ..!!

---
[١] -تخريج الإحياء للعراقي (٣/١٦٥).
[٢] -صحيح البخاري برقم (٦٠٩٥).
[٣] -صحيح البخاري برقم (٧١١٤٧).
[٤] -شيخ الالباني سلسلة صحيحة برقم (١٠١٣).

بەڵێ بەدەر خستنی ئیمان لە لایەن هەندێك یان بەشێك لە خەلكی كە خۆیان بە موسلمان ناوزەند دەكەن كەچی بە هۆی دوو رووی و نیفاقە كەیان هیچ پەیوەندیان بەئیسلام نەماوە چونكە لە ناخی دڵ یان نفاقی عقیدەیی تێدا بەدی دەكریت ئەوە ش وەك باسمان كرد دەبێتە كوفری گەورە ، هەركاتێك ئیسلام بالادەست بێت ئەوابێ گومان نیفاقەكەیان ئاشكرا دەبێت ، بەلام ئێستا بەهۆی لاوازی وەلاتانی ئیسلامە كە نیفاقە كەیان شاراوەیە ، بەلگە لەسەر ئەم ئەوەی كە لە شاری مەدینە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ وە بەهۆی بەهێزی دەولەتی ئیسلام لەو كاتەدا نیفاقە كەیان ئاشكراو روون بوو ، وەكو (عبداللە كوری ئوبەی كور سەلول ) چونكە دوو روو ومونافیقە كان هەركاتی موسلمانان یان دەولەتانی ئیسلام لاواز بن ، ئەوا ئەوان واتە : دوو رووە كان بە ئاشكرا كوفر بەرپادەكەن ئەو كات دوو روو نابن ، هەر بۆیە دوو رووی لەم سەردەمی ئیستا دا هەر هەمووی دەرچوونە لە بازنەی ئیسلام.

وەك لە پێشدا باسمان كرد مەرجی (ئیمان ) بریتیە لە ( اعتقاد بالقلب ، وقول باللسان ، وعمل بالجوارح ، ویزید بالطاعة ، وینقص بالمعصیة ) واتە : ئیمان بریتیە لە ( باورە هێنان بە دڵ ، ووتنی رستەی شاهیدو مان بە زمان ، ئەنجامدانی كارو كردەوە بە ئەندامەكانی لاشە ، ئینجا ئیمان بەكارو كردەوەی چاكە زیاد دەبێت ، بە تاوان و خراپە كاری و سەرپێچی كردن كەم دەكات ..!!

لەم پێنج خالە دا ئیمان هێنان و نەهێنان دەر دەكەوێت :

- هەر كەسێك ئەم بەرنامە ئاینەی لا راست بێت و بە دڵ باوەری بە پێغەمبەری خوا ﷺ هەبێت ، وە توانایی ووتنی رستەی شایەدومانی هەبێت ، بەلام شایەدومان نەهێنیت بێ گومان ئەمە ئیمان هێنان نیە یان نەبۆتە ئیماندار ئەگەر كردەوەی چاكەشی لە گەل دابێت ، (واتە: بە دڵ باوەری هەبووە كارو كردەوەی چاكەشی كردووە بە لاشە ، بەلام بە زمان شایەدومانی نەهێناوە ، كەواتە ئیماندار نیە بەلكو لە ناو بازنەی ئیسلام دەر دەچێت ..!!

- هەر كەسێك ئەم بەرنامە و ئاینەی لا راست نە بێت و بە دڵ باوەری بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێت ، بەلام رستەی شایەدومانی بە زمان هێنابێ ، ئەوا كارو كردەوەی چاكەشی ئەنجام دابێ ، بێ گومان ئەمە ئیماندار نیە ، (واتە: ئەمە دوو روو مونافیقە ) چونكە بە دڵ باوەری بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبووە ، بەلام بە زمان شایەدومانی هێناوە ، بە لاشەش كارو كردەوەی چاكەی ئەنجامدا ، چونكە بە دڵ باوەری بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهێناوە ، دەرچووە لە بازنەی ئیسلام نفاقی عقیدیە كوفری كردوە..!!

- هەر كەسێك ئەم بەرنامە و ئاینەی لا راست نە بێت ، بە دڵ باوەری پێ نەبێت ، وە رستەی شایە دومانیش نەهێنێت و كردوەوی چاكەش ئەنجام نەدات ئەمە ئیماندار نیە ، واتە : بە دڵ و باوەری نەبووە و شایەدومانیشی نەهێناوە و كردەوەشی ئەنجام نەداوە ..!!

- هەر كەسێك ئەم ئاین بەرنامەیەی لا راست بێت ، بە دڵ باوەری هەبێت بە پێغەمبەری خوا ﷺ شایەدومان بە زمان هێنابێت و وە كار كردەوە ی چاكەشی بە لاشە ئەنجام دابێت ، ئەوا پێ دەوترێت ئیمانداری راستە قینە ..!!

- هەر كەسێك ئەم بەرنامە و ئاینەی لا راست بیت بە دڵ باوەرەی بە پێغەمبەر ﷺ هە بێت ، بە زمانیش شایەدومانی هێنابێت ، بەلام كارو كردەوەی چاكەی بە لاشە ئەنجام نەداوە یان نەی كردووە ، (مەبەست لە پێنج روكنە كان یان پێنج پایە كەی ئیسلام وە تەنها شایەدومانی هێنابێت بەلام ئەم چوار روكنە یە پایە ی تری ئەنجام نەداوە وەك : نوێژ ، زەكات ، رۆژی ، حەج ) ئەمە ئەم كەسە نابێتە موسلمان یان ئیماندار بە یەك دەنگی زانایان ..!!

ئەگەر سەرنج بدەین بە ووتەی ﴿وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ کەواتە لێرە دا بۆمان دەر دەکەوێت ، کە دوو رووەکان ئیماندار نین ، چونکە دوو رووەکان ئیمانیان جێگیر نیە ، هەر بۆیە ووشەی ئیمان بە(فعل ) هاتوو ، (فعل ) یان کار ، واتە جولە کرد حرکە ، کەواتە ئەوانە واتە : دوو روو مونافیقە کان لە لای تۆ دا دەبن ئەوکاتە دەڵێن ئیمان مان هێناوە ، بەلام کاتێك دەرۆن دوور دەکەونەوە لە لات ئیمانیان نامێنێت باوەرت پێ ناکەن ، کەواتە : ئیمانیان جولە دەکات جێگیر نیە ، بەلام رەستەی ﴿وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ ئەوا (جملە الاسمیە ) رەستەیەکی ناوەلناویە ، بەلگەیە لەسە بەردەوامی دەکات ، واتە : ئەوانە بە بەردەوامی جێگیرن لە سەر بێ ئیمانی یان بێ باوەری ..!! هەروەك (خوای گەورە ) لە سورەتی (المنافقون ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ١﴾ [المُنَافِقُون : ١] واتە : کاتێك کە دووڕوان ئامادەی کۆڕ و مەجلیسەکانت بوون ـ ئەی پەیامبەری خوا صلی الله علیه وسلم ـ و بە زمانیان وتیان : شایەتی ئەدەین کە تۆ نێردراوی خوای، لە کاتێکدا کە خوای پەروەردگار خۆی دەزانێت کە تۆ نێردراوی ئەوی، وە خواش گەواهی ئەوە دەدات کە دووڕوەکان درۆزنن لەوەی کە دەری دەخەن لە شایەتییەکەیان بۆ تۆ، و بە زمان سوێندیان لەسەر شایەتیدانەکەیان خوارد، کەچی لە ناخەوە بێباوەڕیان حەشارداوە ..!! ئەگەر سەرنجێك لە ئایەتی سورەتی (المنافقون ) بدەین ، ئامرازی (إن) وە پیتی (لام ) هاتووە ئەمە بۆ تەئکید کردنەوە یە یان بۆ دلنیا بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی دلنیا بێت کە ئەوانە باوەر ناهێنن ..!!هەر وەها (خوای گەورە ) هەر لەم ئایەتەدا بەدریان دەخاتەوە دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ١﴾ [المُنَافِقُون : ١] واتە : (خوای گەورە) شایەت کە بەراستی هەرچی دوو روو یان مونافیقە درۆزنن ..!! بێ گومان بەزەیی و میهرەبانی زاتی (خوای گەورە ) ئەوەندە زۆر بە ژمارە نایەت ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) هەوالی بە موسلمانان دا وە یان موسلمانانی ئاگادارکردۆتەوە لە سیەفە تەکانی دوو رووەکان یان مونافیقە کان هەر وەکو دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ٦٤﴾ [التَّوۡبَة : ٦٤] واتە : دووڕووان ترسی ئەوەیان هەیە کە سورەتێك سەبارەت بە ئەوان دابەزێت و ئاکار و هەڵوێستەکانیان ئاشکرا بکات و دەربخات کە لە ناخ و دڵیاندا شاردوویانەتەوە لە بێباوەڕی، سا ـ ئەی نێردراوی خوا صلی الله علیه وسلم ـ پێیان بڵێ : بەردەوام بن لەسەر ئەو گاڵتەکردن و لاقرتێیەتان کە لەسەرین، بێگومان خوای پەروەردگار دەرخەری ڕاستی ئەوەیە کە لێی دەترسن ..!! قال تعالی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ [البَقَرَة : ٨]بۆیە ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین لەم ئایە تدا بە شێوەیەکی (المجهول ) واتە : نەناسراو باسیان دەکات ،دەفەرموویێت : لە نێوان خەلکی دا هەندێکە کەس هەن ، دەلێن : باوەرمان هێناوە بە خوا و بە رۆژیی دوایی دا ، کەچی ئیمانیشیان نەهێناوە ، بۆیە بە شێوەی المجهول ) یان نەناسراو باسیان دەکات ، چونکە بە کارو کردەوەی دوو روویان یان مونافیقەکەیان خۆیان نەناسراو دەکەن بە ئاشکرا کردەوە ئەنجامدەدان بەلام لە ناخیاندا شاردنەوەی راستیەکانە ، ئیتر ئەوانە سەد دەمامك بۆخۆیان دەروست دەکەن ، خۆیان لە بەرگێکی تر دا دەبینن ، وەك ئەوە نیە لە زمان یان بە کردار ئەنجامی دەدەن ، واتە : ئەوانە لە دڵ و دەروونیان دا ئیمانیان نیە باوەر بە ئاینی ئیسلام ناکەن ، بەلام بەکردار هەلسو کەوتیان خۆیان بە موسلمان هەژماردەکەن ، کەچی هیچ پەیوەندیان بە ئیسلامەوە نیە ، چونکە ئەوانە لە عقیدە ژی ئیسلام دەوەستەوە رەقیان لە ئیسلامە.

بێ گومان (نیفاق ) دوو رووی بریتیە لە ئاشکرا کردنی چاکە وە خۆ نیشاندا بە کردەوەی چاکە لە نێو خەلکدا ، بەلام شاردنەوەی شەر خراپە کاری لە نێو ناخی و دڵ یدا ئەنجام دەدات ، ووتمان دوو جۆرە نیفاق هەیە :

●-نیفاقی (اعتقادی ) یان بیرو باوەر : ئەوە یەکە خاوەنەکەی پێ دەچێتە دەرەوە لە بازنەی ئیسلام هەروەکو (خوای گەورە ) لەم دوو ئایەتەدا وسفی یان دەکات قال تعالی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ۝٨﴾ [البَقَرَةِ : ٨] واتە:وە هەندێ لە خەڵکی هەن دوودڵی و ڕاڕاییان تیاماوە لەنێوان باوەڕداران و بێباوڕان، ئەمانەش دووڕوەکانن کە بەدەم ئەڵێن : بڕوامان بەخوا و ڕۆژی دوایی هێناوە و بەڕاستیان دەزانین، بەڵام لە دڵەوە درۆدەکەن و باوەڕیان نەهێناوە ..!! هەروەها دەفەرموویت: قال تعالی: ﴿يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ۝٦٤﴾ [التَّوۡبَة : ٦٤] واتە: دووڕووان ترسی ئەوەیان هەیە کە سورەتێك سەبارەت بە ئەوان دابەزێت و ئاکار و هەڵوێستەکانیان ئاشکرا بکات و دەربخات کە لە ناخ و دڵیاندا شاردوویانەتەوە لە بێباوەڕی، سا ـ ئەی نێردراوی خوا صلی الله علیه وسلم ـ پێیان بڵێ : بەردەوام بن لەسەر ئەو گاڵتەکردن و لاقرتێتان کە لەسەرین، بێگومان خوای پەروەردگار دەرخەری ڕاستی ئەوەیە کە لێی دەترسن ...!!

●نیفاقی (عملی) کرداری : وەکو ئەوەی کەپێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت لە سێ کردار وەسفیان دەکات لەم فەرموودەیە ،

📖 لە (ابو هریرە ) – خوا لیی رازی بیت – دەڵێت : لەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((آيَةُ المُنافِقِ ثَلاثٌ: إذا حَدَّثَ كَذَبَ، وإذا وعَدَ أخْلَفَ، وإذا اؤْتُمِنَ خانَ)).[1] واتە: نیشانەی دوو روو سێ یانە : ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات ، ئەگەر وعد و بەڵێنی دا ناباتەسەر واتە : لە بەڵێنەکی خۆی پاشگەز دەبێتەوە ، وە ئەگەر ئەمانەتێکی یان سپاردەیەکی لە لابوو ئەوا خیانەتی یان ناپاکی لێدەکات ..!! (هەروە کو ئێستای بە ناو دەسەلات داران کە خیانەت ناپاکی لە ئەمانەتەکایان دەکەن لە دامودەزگای دەولەت خیانەت دەکەن ملك ومال و سامانی گشتی بە ناحەق دەدزن دەخۆن بێ گوێدان بە ئادابی مرۆڤایەتی چونکە ئەوانە وەکو ئاژەل رەفتار دەکەن لەدزینی سامانی خەلکی دا ئەوانە گەورە مونافق دوو رووی ئەم سەردەمەن ..!!

بێ گومان هێنانە تەنها بە ووتە و زمان نیە کە دانی پێدانێت ، بەلکو دەبێت بە دڵ و بە کرداریش بێت هەر سێ یان دەبنە تەواو بوونی ئیمان ،واتە : بە دڵ باوەریت هەبێت ، بە ووتە و زمان دانی پێدا نێت ، بە کارو کردەوەش ئەنجامی بدەیت ، چونکە راستی ئیمان بە ووتەو کردار نیە بەلکو بە دڵ یشە ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ۝٨﴾ واتە: ئە مانە ئیمانەکەیان جێگیر و دامەزراو نیە ، ئیمانیان نەهێناوە ..!!

[1] -صحيح البخاري برقم (٦٠٩٥).

✍ لە (عبدالله بن عباس ) لە ریٚ (السدی ) لە (ابی مالك و ابی صالح ( –رزاو رەحمەتی خوا یان لیٚ بیٚت – دەلیت : (ئەم ئایەتە لە شاری مەدینەدابەزی لەسەر دوو رووەکان یان مونافیقەکا ) .[١]

✍ لە (عبدالله بن عباس ) لە ریٚ (ابن اسحاق بسندە ) – رازو رەحمەتی خوا یان لی بیت – دەلیت : (لە صدری سورەتی (البقرە ) بۆ ئەم سەج پیاوە لە ناوەکانیان نەسب و رەچەلکەیان لە (الاحبارەکانی جوولە کە ) لە هەردوو هۆزی (ئەوس خەزرەج ) لە شاری مەدینەکەبە ئەنصاریەکان ناسراو بوون ، ئەوانە مونافقیان تیچدا بوو ).[٢]

✍ لە (ابی العالیە ) لەریٚ (الربیع بن أنس ) – رەحمەتی خوایان لیٚ بیت – لەسە ر ووتەی ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ دەلێت : ( واتە: ئەوانە لە خەلکی دوو رووەکانن یان مونافیقەکانن ).[٣]

✍ لە (قتادە ) لە ریٚ (معمر) - رەحمەتی خوا یانە لی بیت – لەسەر ووتەی ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ هە تاکو دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٦﴾ [البَقَرَةِ : ١٦] دەلیت:( واتە: لە ئایەتی (٨) ی سورەتی (البقرە ) تاکو ئایەتی (١٦) ی سورەتی (البقرە ) ئەو لە سەر دوو رووەکانە یان مونافیقەکان) .[٤]

✍ لە (الربیع بن أنس ) لەریٚ (ابی جعفر ) – رەحمەتی خوا یان لی بیت – لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿مِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ [البَقَرَةِ : ٨] تاکو ئایەتی قال تعالی: ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] دەلێت : ( بەمەبست لی دوو رووەکانە یان مونافیقە کانە ).[٥]

✍ لە (قتادە ) –رەحمەتی خوای لی بیت – لەسەر ووتەی ﴿مِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ دەلێت : ( ئەوە سیفەتی دوورەکانە ، سیفەنی بەندەیەکی خائین ناپاکە لە ژیانی دا ، زۆر ناپەك یان زۆر خیانەتکارە ،رەوەشتی بە زمان دەردەخات ، بە دلٚ پیٚچەوانەیە نەفی دەکات ، هەروەها راستی دەلیٚ بە ووتەو زمان ، بەلام بە کرداری پیٚچەوانەی زمانیەتی خراپەکاری دەکات ، وە دەبیٚتە کەسیٚکی باش بۆ حالی خۆیە ، بە لام ناوە رۆکی وانیە پیٚچەوانیە وە ئەمەش بەسە ، وە هاوتا بوونە لەگەل کەشتی ،بایەك تیٚدا هەلی کرد و لیٚدا ).[٦]

---

[١] - اخرجه ابن جرير (٢٧٦/١).
[٢] - سيرة ابن هشام (٥٣٠/١).
[٣] - اخرجه ابن ابي حاتم (٤٢/١).
[٤] -اخرجه عبدالرزاق (٣٩/١).
[٥] -اخرجه ابن جرير (٢٧٦/١) .
[٦] -عزاه السيوطي إلى بن حميد تفسير المأثور للسيوطي (٩٤/٢).

✍ لە _مقاتل بن سليمان )- رەحمەتی خوا لی بیت - لەسەر ووتەی ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ دەڵێت : ( واتە : باوەرمان هەیە ، کە (خوای گەورە ) یەك و تەنها یە هیچ شەریك و هاوبە شێکی نیە ، وە باوەرمان هەیە بە رۆژی زیندوو بوونەوە ، وە پاداشت لە کردەوە دابۆ هەموو بوونەوەرێك ) .[١]

✍ لە (ابن جيج ) لە رێ (حجاج ) – رەحمەتی خوا یان لی بیت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿مِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ۝٨﴾ [البَقَرَةِ : ٨] دەڵێت : ئەوە لەگەل مونافیقەکانە ، پیچەوانەی کردار رفتاریان هەلسو کەوت هەلسوکەوت دەکەن ، بە نهێنی لە کردەوە خراپە کانیان ، بە ئاشکرا لە کردەوەی چاکەکانیان ، وە نهێنی و ئاشکرایان هەیە لە کارو کردەوە کانیاندا ،وە هاتنە ناوە وەو دەرچوونیان ، وە سەیر کردن یان دیمەنەکانیان و یان نادیار نەهاتووە کانیان ).[٢]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوا لی بیت- لەسەر ووتەی ﴿وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ۝٨﴾ دەلیت : (خوای گەورە ) ئەمانە بەدرۆخستەوە کە دەڵێن : ئێمە باوەرمان هەیە بە توحید و یەکتاپەرستی (خوای گەورە ) هەروەها باوەریان بە رۆژی زیندوو بونەوە نیە یان پاداشت وەرگرتن لە سەر کردەوە چاکە کان وەیان سزادان لەسەر کردەوەی خراپە ).[٣]

✍ لە (ابى يحى ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : پیاوێك پرسیاری لە (حذيفة ) کرد من لە لای بووم ووتی : دوو رووی چیە ..؟! ئەویش ووتی : بە ناوی ئیسلام قسە دەککات ، بەلام کار ئاداب و رەشت و کردەوەی چاکی ئیسلام ناکات ).[٤]

✍ لە (محمد بن سيرين ) – رەحمەتی خوای لی بێت – دەڵێت : ئەوان هیچ ترسێکیان نەبوو ، واتە : (دووروووەکان ) لەم ئایەتە دا قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ۝٨﴾ [البَقَرَةِ : ٨] ).[٥]

[١] -تفسير مقاتل بن سليمان (٨٨/١).
[٢] - اخرجه ابن جرير (٢٧٦/١).
[٣] تفسير مقاتل بن سليمان (٨٩/١).
[٤] -عزاه السيوطي إلي بان سعد . تفسير المأثور للسيوطي (٩٤/٢).
[٥] - عزاة السيوطي إلى ابن المنذر ، تفسير المأثور للسيوطي (٩٤/٢).

قال تعالى: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ [البَقَرَةِ : ٩]

﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بە لای خۆیانەوە واتە : ( دوو رووەکان ) ، خوا و ئەو کەسانە دەخەلەتێنن کە بروایان هێناوە ، ﴿وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ﴾ هیچ کەس ناخەلەتێنن تەنها خودی خۆیان نە بێت ، ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ بەلام هەستی پیٚ ناکەن ..!!بەلیٚ وەك لە ئایەتی پێشتردا باسمان کرد ئەوانە درۆ دەکەن باوەر ناهێنن کە (خوای گەورە ) دفەرموویت: قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ [البَقَرَةِ : ٨]واتە : لە ناو خەلکیدا کەسانیچك هەن واتە : (مەبەست لیٚ دوو رووەکانە ) ئەوانە کە دەلێن : ئیمان و باوەرمان بە خوا وبە رۆژی قیامەت هێناوە لەراستیدا ئەوانە درۆ دەکەن ئەوانە هەمیشە باوەر دار نین ، بە لکو دەیانەوێت ئێوە فریو بدەن و وردە وردە لێتان نزیك ببنەوە لە دژتان پیلان بگێرن و پشێوی نا رامی بخەن نێوانتان ریزەکانی موسلمانان تیٚك بدەن هەربۆیە (خوای گەورە ) دەفەرموویت ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانە بە نیازی خۆیان دەیانەویٚ فیٚل و تەلەکە لەگەل خوداو ئەو کەسانە دا بکەن کە بروایان هێناوە ، ﴿وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ﴾ بەلام لەراستیدا لە گەل خۆیانندا فیٚل و تەلەکە بازی دەکەن ، وە زیانەکەشی هەر بۆ خیان ئەگەرێتەوە ، تەنها خۆیان دەخەلەتێنن ، ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ لە حالیٚکدا هەستیش بەم راستیە ناکەن واتە : هەست و شعوریان نیە ..!! بیٚگومان خۆپاراست لە دوو روو مونافقەکان پیٚویستە موسلمان هۆشمەند بێت خۆیان لە جۆرەکە درۆزنانە نزیك نەکەنەوە ، چونکە فرت و فیٚل و تەلەکە بازی و پیلان گێریانیان زیانەکەی هەر بۆ خۆیان ئەگەرێتەوەی ، (منافق ) یان دوو روو کە سانێکن کە بە زمان ئیمان و باوەر ئاشکرا دەکەن و ، کوفر و بیٚ باوەریی لە دلٚ و دە روونیاندا دەشارنەوە ..!!هەر وەکو (عبداللە کوری عباس ) — خوا لی رازی بێت دەلێت : لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ،( دوو رووەکان یان مونافیقە کان ) ژمارەی پیاوەکان نزیکەی (٣٥٠) کەس بوون ، وە ژمارەی ئافرەتەکانیش نزیکەی (١٧٠) ئافرەتی دوو روو بوون ، کە ئەوانیش پیٚك هاتبوو لە نەوەی (ئەوس ، خەزرج ) یان ئەنصارەکانی مەدینە ، کە سەرۆکی هەموویان ناوی (عبداللە کوری ئوبەی کوری سەلوول ) بوو ..!!

(المخادعة ) واتە: فێل کردن بریتیە لەوەی کە کەسی فێلکەر شتێك بۆ فێل لێکراو ئاشکرا بکات و پێچەوانە کەشی بشارێتەوە ، هە تا بگات بە ئامانجە کەی لەوەی کە دەیەوێ هەلبیخەلە تێنی ، جا دوو رووە کان لە گەل خواو بەندە کانیدا ئەم رێگایە یان گرتە بەر ، فر و فێل تە لەکە بازیە کانیان بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە ، بە راستی ئەمەش لە شتە سەر سوور هێنەرکانە ، چونکە فێلکەر یان ئەوەیە کە فێلەکەی سەر دەکەوێ ز ئەوەی مەبەستییەتی دەستی دەکەوێ ، یان سەلامەت دەبێ ، نە بۆی دەبێ و نەلەسەری دەبێ ، نەسوودی بۆی دەبێ و نەبەسەریدا دەشکێتەوە بەلام ئەوانە فێل و تەلەکە کانیان بەسەر خۆیاندا شکایەوە ، وەك ئەوەی کاربکەن بۆ لە نا بردن و فەوتانی خۆیان ، بێ گومان (خوای گەورە ) بە فێلی ئەو مونافیقانە یان دوو رووانە هیچ زیانێکی پێ ناگات ، هەر بە هەمان شێوە بەندە ئیماندارە کانی هیچ زیانێکیان پێ ناگات ، چونکە بەراستی زیانی دونیان ئەمە زیان نیە کە بەندەی خۆپارێز یان (المتقین )بەری کەوێت لە پێناوی خوا دا ،بەلکو دەبێتە سەرفرازی بۆ بەندە کە خۆی ، هەروەها ئیمانداران هیچ زیانێك ناکە ئەگەر دوو رووەکان باوەرەکەیان ئاشکرا بکەن ، تاکو بەم شێوەیە مال خوێنتان پارێزراو بێت ، وە فێل تە لە کە بازیان دەکەوێتە گەردنی خۆیان ، چونکە بە و دوو روو ویان نیفاقیان تەنها ریسوایی ئابروو چوونیان بۆ دەمێنێتەوە لە ژیانی دونیادا.

﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتە : ئە یانەوێ بەم شێوە (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ و موسلمانان بخەلە تێنن ،﴿مَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ واتە : وە لە واقیعا یان لە راستی دا ئەوانە فێل لە گەل خۆیان دەکەن و زیانی ئەم شێوە بۆ خیان ئەگەرێتەوە بەلام نەزان و کە عەقل و نەفامن ..!! بۆ نموونە گەورە منافق یان دوو رووی سەر دەمی پێغەمبەری خوا ﷺ (عبد الله کوری ئوبەی کوری سەلول ) چەندین جا موسلمانان دوای مۆلەتی کوشتنیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە بۆ ئەوەی کە بی کوژن یان وەکو ئەوەی کە (عمری کوری خەتاب ) دوای مۆلەتی کوشتنی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد بۆ کوشتنی (عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلول ) ، بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ دەی فەرموو : من باش دەزانم کە ئەو پیاوە مونافیقە یان دوو رووە ، وە حەقی کوشتنی هەیە ، بەلام دوژمنانی ئیسلام پرو پاگەندە دەکەن دەلێن : محمد ﷺ دۆسانی خۆی دەکوژیت هەر لە بەر ئەمە مۆلەتی نەداوە بی کوژن کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە یەکێك لە هاوەلانی خۆی کوشتوە ، بەلام نازانی ژەهرەکەی زۆر بەقەد دوژمنانی ئیسلام کاریگە ، کەس نازانی چەندە دوو روو مونافیقە بووە ، مەبەست ئەوانەی کە لە دەرەوەی ئیسلامن نازانن کە مونافیق چەندە دلْ رق و پیس و دلْ نەخۆشن ، بوونەتە میکرۆپ بۆ ئیسلام ، خەلکی کەم هەستیان بە نیفاقە کەیان وە دە کەن تەنا ئەوانە نەبێت کە ئەهلی ئیمان و ئەهلی تقواو ئەهلی علیم زانست هەستیان پێ دە کە چونکە مونافیقە کان بەچەند سیفەتێك لە ناو موسلمانان دا دە ناسرێنەوە ، پەردەی نیفاقیان لەسەر لادەچێت ئاشکرادەبێت ، وە لەسەر تا باسمان کرد ئەگەر دەولەتی ئیسلام بەهێز بوو ئەوە نیفاق زیاتر شاراوەتر دەبێت ، بەلام ئەگەر لاواز بوو ئەوا ئەوان خۆیان ئاشکرادەکەن بەلکو کوفر بە ئاشکرا ردەگەیەنن ، خۆیان یەك لا دەکەنەوە دەچنە پال بت پەرست و موشریك کافران ، ئیتر ئەوانە بە دلە نەخۆشە کانیان تۆی فسادی دەچێنن دەش لێن : ئیمە کەسانێ کین چاکە کارین چاکسازی دەکەین ، بەلام لەراستی دا وانیە ئەوانە هەر تۆی خراپەکاری فسادی لێیان چاوەرێ دەکرێت ، وە ئەی ئیستا دە بینین بەناوی چاکسازی بە بێ جیاوازی فکر حزب ئایدەلۆژیا هەر هەمووی تۆی فسادیە لەسەر رووی زەوی دا ، نیفاق لەم سەردەمەدا نفاقی عقیدەییە نەوە ك نفاقی کرداری چونکە هەر هەموو کوفرە تۆی خراپەکاری دەچێنن لەسەر رووی زەویە ئەگەر ئیسلام بەهیز بوو ئەوا نیفاقی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجام دەدەن ..!!

بەلام ئەگەر سەرنجێك بدەین لەم سەردەمەدا ، دەبینین نفاق کردن نفاقی کوفرە خۆیان ئازاد کردووە خۆیان دەخەن لای کافر موشریکان چونکە حوکم و یاساو ڕێسای ئەوان پەیرەوە دەکەن ، بە گوێرەی خواست حەزو ئارەزووی بیرو باوەری ئەوان حکم و بریاری یاسیایی دادگەری دەکەن ، نەوەك بەحوکمی ئیسلام ، بەلێ ئەگەر بەلێن ئێستا سەردەمی نیفاقە نەخێر ڕاست نیە چونکە ئیسلام ئێستا لە سەرانسەری جیهاندا لاوازە حکم ناکات و بریار بەدەست نیە ، بۆ ئەوەی هەیە پشت گیری کردنی کافر و موشریکەکانە پشت گیری کردنی ئەوانیە کە قورئانی پیرۆز دەستوتێنن وەکو وەلاتانی ڕۆژ ئاوا وەلاتی سوید وەلاتی دانیمارك ، وە ئەوەی کەسە گاورە عیراقیەی بەناوی (سلوان مومیکا ) لە سوید ئاگری لە قورئان بەردا لە سوید دواتریش لە دانیمارك ، هەلوێستی موسلمانان لەسەرانسەری جیهان بەراو بۆچوونی من زۆر لاواز بوون ئەوە دەگەرێتەوە بۆ لاوازی موسلمانان ئەوەی هەیە تەنها کەمێك نەبێت هەلوێستی مەردانەیان نواد ئەوانیش موسلمانانی ولاتانی ئەوروپا ئەو خەلکانەی کە لە ولاتانی غربەت بوون هەروەها (مقدر صدر) ئەو پیاوەش هەلوێستی مەردانەی جوانی بە رانبەر بە ولانانی رۆژئاوا نواند ئەوانەی کە قورئانیان سووتاند ، مەبەستی من لێرە دا ئەوەی بلێم : بە ناو موسلمانان کە ئەوانەی بەرژەوەندیات تێك نادەن لە گەل کافرو موشریکان یان بت پەرست و گاور جوولە کە ئاینە کانی تر یان علمانیەکان مولحیدەکان شوعیە مارکیسەکان ، ئەوانەی ڕێگای کوفریان هەلبژاردوە ، کەواتە : نیفاق بە ئاشکرایی دەکرێت و کوفر بە ئاشکرایی دەکرێت شاراوەیی نەماوە لە نیفاق کردن ، ئەوە تا وەلاتی سعودیا بە هێز ترین ولاتانی ئیسلامیە هەلوێتستی تەنا ئیدانەکردن بوو، هیچ تری نەکرد تەنا نێنەرایەتی خۆی نەکشاندەوە لەم وەلاتی سویدو و دانیمارك ، تاکە وەلات لە سەر ووی زەوی ولاتی عیراق بوو هەلوێستێکی جوامێرانەیان نواند کونسولخانەی سویدیان سوتاند نێنەرەکانیان دەرکردن لەولات ، خۆ مەزهەبی شیعە وەلات بەرێوە دەبەن بەلام بەراستی جێگای تێرامانە زۆر هەلوێستی جوامێرانە یان هەبوو ، منیش بە شانازیەوە دەلێم موسلمانێکی کوردستانی عیراقیم ، سەرەرای ئەو هەموو فسادی و گەندەلیەی لەوەلاتی خۆم دا ئەنجام دەدرێت ، بەلام بەراستی هەلوێستی جوان دەبێت شایستە بکرێت بە گرینگ بزاندرێت ، منیش ئەوەی لە توانام دابێت بۆ بەرگری کردن لە قورئانی پیرۆز درێخی ناکەم بە پشتیوانی (خوای گەورە ) بریارم داوە ئەگەر تەمەن بمێنی قورئانی پیرۆز لەبەر بکەم هەر هەمووی بە پشتیوانی (خوای گەورە) لە رقی ناحەزانی قورئان دەبێت هەموو موسلمانێك ئەگەر لە توانای دابێت ئەم هەلوێستەی هەبێ ، بۆ ئەوەی قورئان لە نێو سینگمان دا بێت ، ئەگەر هەولی قورئان سوتاندیان دا بابێن ئیمەش لە گەل قورئان بسووتێنن ، ئیجا قورئان بستوێنن ، ئیمە باسمە کەمان لەسەر دوو ڕووەکان بۆیە کوفر زال بووە بە سەر نیفاق کردن ، ئەوەی هەیە یان موسلمانێکی ڕاستە قینە یە یان کافرە ، ئەگینا نیفاق زۆر کەم بووە ، بەلێ ئیستا سەردەمیچکی زۆر خراپە چونکە بە ئاشکرا تاوان دەکرێت و مال و سامانی خەلکی بە تالان دەبردرێت ، هیچ کەس لە حەلال و حەرام ناپرسیتەوە و گوێی پێ نادە ، هەر لە هەولی پرکردنی گیفان و وەرگی و ئارەزووەکانی خۆیەتی ، ستەم چۆتە قیمە زولم و تاوان یەکجار زۆر بووە ، نیشانەی کوفرە کردن بە ئاشکرا دەکرێت لە نێو موسلمانان ، هەروەها فەرموودە بچووکە کانی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایی هەر هەمووی هاتۆتەجێ ، وە ئەوەی ئەفەرموودەیەی دەفەرمووی : بەیانی موسلمانە ئێوارە دەبێتە کافر ، ئێوارە موسلمانە بەیانی دەبێتە کافر ، (پەنا بخوا ) دەبێتە بەردەوام دوایی هیدایەت و ڕێنووی کردن لە خودا بکەین بۆ ئەوەی ڕێگای راستی تەوحیدو یەکتاپەرستی و خوا پەرستی ڕاستەقینەکان پێشاندە..!!

📖 لە (جابر بن عبدالله ) – خوا لێی رازی بێت – دەڵێت : ((كنا فى غزاةٍ قال سفيان يرونَ أنها غزوةَ بنِى المصطلِقِ فكسعَ رجلٌ من المهاجرينَ رجلا من الأنصارِ فقال المهاجرىّ ياللمهاجرين وقال الأنصارىّ يالأنصارِ فسمعَ ذلكَ النبى صلى الله عليه وسلم فقال ما بالُ دعوى الجاهليةِ قالوا رجلٌ من المهاجرينَ كسَعَ رجلا من الأنصارِ فقال النبى صلى الله عليه وسلم دعوهَا فإنها مُنتَنةٌ فسمع ذلكَ عبد الله بن أبى ابن سلولٍ فقال أوقدْ فعلوها واللهِ لئن رجعنا إلى المدينةِ ليخرجنّ الأعزّ منها الأذلّ فقال عمرُ يا رسولَ اللهِ دعنى أضربْ عنقَ هذا المنافقِ فقال النبى صلى الله عليه وسلم دعهُ لا يتحدثُ الناسُ أن محمدا يقتلُ أصحابهُ وقال غيرُ عمرَ فقال له ابنهُ عبد الله بن عبد الله والله لا تنقلبْ حتى تقرّ أنكَ الذليلُ ورسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم العزيزُ ففعلَ)) .[1]

واتە: (جابر كوری عبدالله ) دەڵێت : سیفان ووتی : پێیان وابوو غەزازی (بني مصطلق ) بوو ، پیاوێك لە كۆچ كەران شەقی هەڵدا لە پیاوێك لە ئەنصارەكان ، پیاوە كۆچ كەرەكە ووتی : ئەی كۆچ كەران ، پیاوە ئەنصاریەكەش ووتی : ئە ی ئەنصاریەكان ، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێ بوو فەرمووی : ئەم هات و هاوارەی سەردەمی نەفامی چیە ..؟! ووتیان : پیاوێك لە كۆچ كەران شەقی هەڵداوە لە پاشەلی پاوێكی ئەنصاری ، فەرمووی : واز لەم جۆرە پیشە پیسە بهێنن بەراستی خویەكی بۆگەنە ..!! (عبدالله كوری ئوبەی كوری سەلول ) گوێی لێ بوو ووتی : ئاوای لیهات ، ئەمەشیان كرد ..؟! سوێند بە (الله ) : قال تعالى: ﴿لَئِن رَّجَعۡنَآ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ لَيُخۡرِجَنَّ ٱلۡأَعَزُّ مِنۡهَا ٱلۡأَذَلَّ﴾ [الْمُنَافِقُون : ٨] واتە : ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە بێگومان دەسەڵاتدار و بەڕێزەكانی ئێمە كۆمەڵەی باوەڕداره زەلیلەكان دەردەكەن..!! ئینجا پێشەوا (عمری كوری خەتاب ) – خوا لێی رازی بیت – ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ رێگەم بدە با بدەم لە گەردنی ئەم مونافیقە یان ئەم دوو رووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : وازی لێ بیهێنە ، با خەلكی نە لێن ﷺ هاوەل و شوێنكەوتەكانی خۆی دەكوژێ ، جگە لە (عمری كوری خەتاب ) وە (عبدالله كوری ئوبەی كوری سەلول ) واتە : كورە كەی خۆی پێ ووت : سوێند بە (الله ) ناگەرێتەوە بۆ مەدینە هەتا دانی پێدا نەنێ كە ئەو سەر شۆرو بێ دەسەڵاتە واتە: (عبد الله كوری ئەوبە ی كوری سەلول ) بێ دەسەلات و سەر شۆرە ، پێغەمبەری خواش ﷺ دەسەڵاتدار و سەر بەرزە ، ئینجا (عبدالله كوری ئوبەی كوری سەلول ) ی گەورە مونافیق دانی پێدانا كە پێغەمبەری خوا دەسەلات دار و سەر بەرزە..!

[1] - سنن الترمذي برقم (٣٣١٥).

📖 لە (عبدالله بن عمر ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : ((لَمَّا تُوُفِّيَ عبدُ اللهِ بنُ أُبَيٍّ ابنُ سَلُولَ، جَاءَ ابنُهُ عبدُ اللهِ بنُ عبدِ اللهِ إلى رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فَسَأَلَهُ أَنْ يُعْطِيَهُ قَمِيصَهُ أَنْ يُكَفِّنَ فيه أَبَاهُ، فأعْطَاهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ أَنْ يُصَلِّيَ عليه، فَقَامَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ لِيُصَلِّيَ عليه؟ فَقَامَ عُمَرُ فأخَذَ بثَوْبِ رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فَقالَ: يا رَسولَ اللهِ، أَتُصَلِّي عليه وَقَدْ نَهَاكَ اللَّهُ أَنْ تُصَلِّيَ عليه؟ فَقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ: إنَّما خَيَّرَنِي اللَّهُ فَقالَ: اسْتَغْفِرْ لهمْ، أَوْ لا تَسْتَغْفِرْ لهمْ، إنْ تَسْتَغْفِرْ لهمْ سَبْعِينَ مَرَّةً، وَسَأَزِيدُ علَى سَبْعِينَ قالَ: إنَّه مُنَافِقٌ. فَصَلَّى عليه رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: {وَلاَ تُصَلِّ علَى أَحَدٍ منهمْ مَاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ علَى قَبْرِهِ} [التوبة: ٨٤] . وَزَادَ: قالَ: فَتَرَكَ الصَّلاَةَ عليهم )).[١]

واتە: لە (ابن عمر) – خوا لێ رازی بێت – دە لێت : لە کاتێك دا کە گەورە مونافیق (عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلول ) مرد ، ئەوە بوو (عبدالله ی کوری ) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دوای لێ کرد کراسە کەی خۆی بداتێ تا بی کات بە کفنی باوکی و دای پۆشێت ، ئینجا دوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە نوێژی لەسەر بکات ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بۆ ئەوەی کە نوێژی لەسەر بکات ، (عمری کوری خەتاب ) هەستاو جمکی جلە کەی گرت و ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر دەکەیت لە کاتێك دا (خوای گەورە ) نەهی لێ کردووی نوێژی لەسەر بکەیت ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوای گەورە ) سە پشکی کردووم و فەرموویەتی : قال تعالى: ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ﴾ [التَّوۡبَة : ٨٠]

واتە : [ اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - ئەگەر تۆ داوای لێخۆشبوون بۆ مونافیقان بکەیت لە خوای گەورە یان داوایان بۆ نەکەیت، یەکسانە [ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ ] چونکە ئەگەر حەفتا جار داوای لێخۆشبوونیان لە خوای گەورە بۆ بکەی، خوای گەورە لێیان خۆش نابێ..!! هەروەها فەرمووی : من لە حەفتا زیاتر دەکەم ،(عمر) ووتی : بێ گومان ئەوە دوو رووە یان مونافیقە واتە: مەبەست لێ (عبدالله کوری ئوبەی کوری سەلول ) ، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە سەر کرد (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابەزاند قال تعالى: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٖ مِّنۡهُم مَّاتَ أَبَدٗا وَلَا تَقُمۡ عَلَىٰ قَبۡرِهِۦٓ﴾ [التَّوۡبَة : ٨٤] واتە : ئە ی محمد- صلى الله عليه وسلم - نوێژ لەسەر هیچ کەس لەو مونافیقانە مەکە کە بمرێ، دیسان لەسەر (عبداللە¬ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) دابەزی، کە مرد کوڕەکەی هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - قەمیسەکەتم بدەرێ دەیکەمە کفنی باوکم، وە نوێژی لەسەر بکەو داوای لێخۆشبوونی بۆ بکە لە خوای گەورە، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - قەمیسەکەی پێداو فەرمووی دواتر ئاگادارم بکەوە نوێژی لەسەر دەکەم، دواتر هەواڵی پێداو پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ویستی نوێژی لەسەر بکات، ئیمامی عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - چۆن نوێژ لەسەر کەسێك ئەکەی کە

[١] - صحيح مسلم برقم (٢٤٠٠).

مونافیقه؟! پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - فەرمووی من سەرپشکم لە نێوان ئەوەی داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم یان نا، ئەگەر حەفتا جار زیاتر دوعای بۆ بکەم خوا لێیخۆش بێت بۆی ئەکەم و نوێژی لەسەر کرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی: ئەی محمد- صلی الله علیه وسلم - نوێژ لەسەر کەسێك مەکە کە لەسەر نیفاق مردووە [ وَلَا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ ] وە لەسەر قەبریشی ڕامەوەستە دوعای خێری بۆ بکەیت، لە دوای ئەم ئایەتە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - نوێژی لەسەر هیچ مونافیقێك نەکردو نەچوە سەر قەبریان تا کۆچی دوایی کرد، بەڵام لەسەر قەبری موسڵمان ڕاوەستاوەو نوێژی لەسەر کردووەو دوعای بۆ ئەکردو ئەیفەرموو: داوای لێخۆشبوون و دامەزراوی بۆ براکەتان بکەن چونکە ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت..!! ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ وازی هێنا لەوەی کە نوێژ لەسەر دوو ڕووە کان بکات ..!!بەلێ قال تعالی: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ۝٩﴾ [البَقَرَةِ: ٩] ئەوانە وادە زانن بە خەیالی خۆیان فێل لە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ و موسلمانان دە کەن و ، ئەوان دە خەلەتێنن هەر بۆیە وادەکەن تا کوشتن و گرتن و سەرانە لێ وەرگرتن لە خۆیان دوور بخەنەوە بە شە غەنیمەت و دەست کەوتی جەنگی بۆ خۆیان وەرگرن و ئاگاداری نهێنی سوپای ئیسلام بن و بیگەیەننە دەستی دوژمنانی ئیسلام کافران دا ..!! دەی ئەوانە با وا بزانن کە لە کارە پیس و چەپەلە کانیان دا سەر کەوتوون و خوداو پێغەمبەرە کەی ﷺ ئاگاداری کردارە کانیان نین ..!! بەلکو (خوای گەورە ) زانا و ئاگادارارە بە هەموو خەیال و بیرو بۆ چوون پیلان و خیانە ت کردارە پیس چە پەلە کانیان چونکە هەر فێلێك بکەن (خوای گەورە ) پێ دەزانێت ﴿وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ﴾ چونکە هەر فرو فێلێك بکەن بە خراپە بەسەریان دەشکێتەوە زیانی بۆ خودی خۆیان دەبێت ، کەوا بوو وەك فێل لە نفسی خۆیان بکەن وایە ، چونکە زیانی فێك کردنە کەیان هەر بۆ خۆیان دەگەرێتەوە ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ ۝٩﴾ چونکە ئەوانە لە بەر گومرایی و سەر گەردانی خۆیان رۆچوونیان لە خراپە کاری، هەست بە و زیانە لە خۆ کردنە ناکەن هەر دەلێت بی هەستن و هەستیان نەماوە شعوریان لە دەست داوە ، کاتێك مرۆڤ نقوومی خراپە کاری فسق و دوو رووی یان مونافقی بوو ئەوا بێگومان هەستە کانی لەدەست دەدات بیرو هۆشی نەخاتە کار ، هەر چی خراپە کاریە ئەنجامی دەدات بە بێ ئەوەی بیرێك بکاتەوە لەوەی کە ئەو خراپە کاریە بەسە رە خۆی دا دەشکێتەوە زیانە کە یبۆ خۆی دەبێت ، چونکە لە ژیانی ئاسایی هەر مرۆڤێك پێچەوانیە خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ رەفتار و ئاکاری خراپە ئەنجام بدە ئەوە زیانەکەی بۆ خۆی دەگەریتەوە ، هە رکەسێك دوو رووی بکات یان پیلان دابنێت یان خیانەتی لێ بکات ئەوا بێگومان پێچەونە دەبێتەوە بە سەرە خۆی دا دەشکێتەوە هەر وەکو ئەم پەندە کوردیە کە دەلیت : چالی بۆ هەر کەسێك لێ بدەی بۆ خۆت دەکیتە ناوی ، یان دەلێن : ( من حفر حفرة لأخيه وقع فيها ) بێ گومان خیانەن یان ناپاکی لە گە ل هەر کەسێك دا بکەیت بۆ خۆت دە گەرێتەوە بۆخۆت شکست دەهێنی ، سەر ئەنجام چارە نووسی خۆت لەم پیلان و خیانەتە ناپاکیە دایە کە خۆت داد رژتووە ، بۆخۆت سەرئەنجامەکەی دەچێژی.

بە لێ بێ گومان لێرە دا پرسیارێك دێتە ئاراوە ئەگەر كە سێك بلێت چۆن بزانین فلان كەس مونافیقە یان دوو روو هەتا خۆمانی لێ بپارێزین و لێ نزیك نەبینەوە خۆمانی لی دوور بەخینەوە بۆ ئەوەی زیانمان پێنەكات لە دەستی ئەو دوو رووە یان مونافیقە ..؟!

وەلام : بێ گومان دەزانین بە چاودێری كردنی هەلسوكەوتی لە ووتەكانی دا وە یان لە كردارەكانی دا ئایا ووتە و كرداری لە گەل یەك دا یەك دەگرنەوە یان دژ بە یەكن ..؟! یان جیاوازی هەیە لە كردار رەفتای دا ..؟! بەلێ ئەگەر زانیمان ئەو پیاوە وا خۆی نیشان دەدات كە ئیسلامی خۆش دەوێت ، ئاینی خۆش دەوێت ، بەلام كاتێك لێمان وون بوو گوێمان لێ بوو دژایەتی ئیسلام ئاین دەكات ئەوا زانیمان ئەوە دوو رووە دەبێت خۆمانی لێ بپارێزین ..!! بەلی هەموو كات فێل و تەلەكەبازیە كە بەسەر خۆیدا دەشكێتەوە لە بەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ [البَقَرَةِ : ٩] چونكە ئەم (حصر) كردنە بەلگەیە لەسەر ئەوە فێل و خەلە تاندنە كە هیچ زیانێك بە خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ و ئیمانداران ناگەیەنی ، هەروەها خیانەت ناپاكی فێل تەلە كە بینینی یان مرۆڤ كوێر دە كان یان هەستی مرۆڤ بە چاكە كردن نامێنیت بەروە خراپە دەچێت یان هەست بە شتی دیار و بەر چاو ناكات لە بەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ [البَقَرَةِ : ٩] ئەمەش بەلگەیە لە سەر ئەوەی كە هەست مرۆڤ نامێنی بینینی كوێر دەكات هەست شتی دیار و بەر چاو ناكات ، بەلێ دوو رووەكان ئەوانە ئەهلی مەكرو فێل و تەلە كەبازین لەبەر ئایەتیقال تعالى: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ [البَقَرَةِ : ٩] هەروەها (خوای گەورە ) لە سورەتی (المنافقون ) دا دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿هُمُ ٱلۡعَدُوُّ فَٱحۡذَرۡهُمۡۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ٤﴾ [المُنَافِقُون : ٤] واتە : [ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ ] ئەی پێغەمبەری خوا - صلى الله علیه وسلم - دوژمنی ڕاستەقینە ئەمانەن ئاگاداریان بە [ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ (٤) ] خوای گەورە بیانكوژێ و نەفرەتی خوای گەورەیان لێ بێت چۆن لە پاش ناسینی حەق لێی لائەدەن بۆ كوفر.

هەر لەم ئایەتە پیرۆزەشدا (خوای گەورە ) فێل و خەلە تاندنی مونافیقە كان یان دوو رووە كانی (حصر ) كردووە ، چونكە بە دلنیایەوە دوو روو یان مونافیق فێل بازە ، فێلی خۆی هەردەكات و سەر ئەنجامیش بەسەر رەخۆی دا دەشكێتەوە ، چونكە هەست بینیایی لە دەست داوە و شعوریان نامێنیت ، بۆیە هەموو كات لە ژیانی دونیادا دۆراون سەر نەكەوتون ، رەنگە بۆماوەیەكی كەم دا فێل تەلە كەبازیان سەر بگرێت ، بەلام سەر ئەنجام هەر لیان ئاشكرا دەبێت ، زیانە كەشی بۆ خۆیان دە گەرێتەوە ، چونكە هیچ شتێك وون نابیت لە چاكە خراپە كاری لە لای (خوای گەورە ) ئاگاداری هەموو شتێكە بە بەلگەی ئەم ئایەتە كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا﴾ [الأَنۡعَام : ٥٩] واتە: وە گەڵای هیچ دارێك هەڵناوەرێ و بەرنابێتەوە ئیلا خوای گەورە زانیاری پێیە گەڵای ئەو دارە كەی پێ ئەگات، وە كەی زەرد ئەبێ، وە كەی هەڵئەوەرێ، (ئینو عەبباس) دەفەرمێت هیچ دارێك نیە لە وشكانی یان دەریا ئیلا فریشتەیەكی پێ سپێردراوە كە دەینوسێت كەی گەڵای ئەو دارە چەكەرە دەكات و سەوز دەبێت و زەرد هەڵدەگەڕێت و وشك دەبێت و هەڵدەوەرێت..!!

✍ لە (ابن جريج ) – رحمەتی خوای لی بیت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ﴾ [البَقَرَةِ : ٩] دە یانەویّ (الله ) فریو دەن ، ووتی : بە زمان دەلّێن : (لا إله إلا الله ) دەیانەوێت بەم رستەیە تنها مال و گیان خۆیانی خۆیان بپارێزن ).[١]

✍ لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لیّ بیّت – دەلّیّت : لەم دوو ئایەتە دا (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ [البَقَرَةِ : ٨ - ٩] {هە ندێك لە سیفاتی مرۆڤی مونافیقو دووڕوو} پاشان خوای گەورە دێتە سەر باسکردنی مونافیقان كە لە مەدینە دەرکەوتن: [ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ (٨) ] لەناو خەڵكیدا کەسانێك هەن كە ئەڵێن: ئێمە ئیمانمان بەخوای گەورەو بە ڕۆژی دوایی هەیە بەڵام ڕاست ناکەن و لە حەقیقەت و ڕاستیدا ئیمانیان نیە..!! بە حسابی خۆیان فێڵ لە خوای گەورەو باوەڕداران ئەکەن بەڵام لە حەقیقەت و ڕاستیدا فێڵ لە هیچ کەسێك ناکەن تەنها لە خۆیان نەبێ لەبەر ئەوەی فێڵ لە خوای گەورە ناكرێ بەڵام خۆیان هەست ناکەن. وە مونافیق یان دوو روو وسف کراوە لە لای (ابن كثير ) رەوشت نزم بەدەم راست دەلیّ بە دلّ حاشا دەکات ، بە کرداریش دژایەتی دەکات ، بە بەیانی لە سەر حالیّکەو بە ئیّوارەش لە سەر حالیّکی ترە ، دووبارە ئیّوارە لە سەر حالیّکەو بەیانی لەسەر حالیّکی ترە ،خۆی ریّك دەخات وەك ریّکخستنی گەشتی هەر کاتیّ هەواو یان با بۆ کویّ هەلکا ئەویش لەگەل ئەو دەروات ).[٢]

✍ لە (الحسن البصری ) – رەحمەتی خوای لیّ بیت- دەلّیّت : واتە فیّل کردنە لە گەل پیّغەمبەری خوا ﷺ ).[٣]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لیّ بیّت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ﴾ [البَقَرَةِ : ٩] دەلّیّت : لە لای پیّغەمبەری خوا ﷺ ئیمانیان ئاشکرا دەکەن ، کەچی بەنهیّنی لە هەرکات لە لای پیّغەمبەر ﷺ و موسلمانان نەمان ئەوا درۆ دەکەن ئیمان ناهیّنن ).[٤]

[١] - اخرجه ابن ابي حاتم (٤٦/١).
[٢] اخرجه ابن ابي حاتم (٤٧/١).
[٣] -تفسير البغوي (٦٥/١).
[٤] -تفسير مقاتل بن سليمان (٨٩/١).

✍ لە (ابن وهب ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : پرسیارم لە (ابن زید ) کرد لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ۝٩﴾ [البَقَرَةِ : ٩] دەڵێت : هەست ناکە کە زیان بە نەفسی خۆیان دە گە یەنن ، بەو دوو ڕوویيان نیفاق کوفرەی کە بەنهێنی ئەنجامی دەدەن ، هەروەها ئەم ئایەتەشی خوێندەوە قال تعالی: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓاْ ۚ أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ۝٦﴾ [المُجَادلَة : ٦] لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە هەموویان زیندوو ئەکاتەوە وە هەواڵیان پێ ئەدات بەو کردەوانەی کە لە دونیادا کردوویانە لە کوفرو تاوان و سەرپێچی [ أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ ] خوای گەورە هەمووی سەرژمێری کردووەو هیچی نەفەوتاوە بەڵام ئەوان لە یادیان کردووە [ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٦) ] وە خوای گەورە ئامادەو شاهیدە بەسەر هەموو کردەوەکانی ئێوەوە. ئینجا ووتی : ئەوە موونافیقە کانە یان دوو ڕووەکانە هەتاکو ئایەتی (١٨) سورەتی مجادلە خوێندیەوە ووتەیەی قال تعالی: ﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ﴾ [المُجَادلَة : ١٨] ).[١]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ۝٩﴾ [البَقَرَةِ : ٩] دە یانەوێت فێڵ لە (خوای گەورە ) بکەن لە ڕۆژی دوایی هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت لە سورەتی (الحدید ) قال تعالی: ﴿ٱرْجِعُواْ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُواْ نُورًا﴾ [الحَدِيد : ١٣] واتە : کاتێك کە ئەبینن نووری ئەمان ئەکوژێتەوەو ئیمانداران نووریان بەردەوامەو بەرەو بەهەشت پێی بەرێ ئەکەون داوا ئەکەن کە ئێمەش سوودمەند بین لێی بەڵام باوەڕداران پێیان ئەڵێن: بگەڕێنەوە دواوە، واتە: بگەڕێنەوە بۆ دونیا لەوێ ئیمان بێنن و کردەوەی چاك بکەن تا لێرە نوورتان هەبێت، یاخود بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە نووری لێ دابەشکرا بەڵکو لەوێ دەستتان بکەوێت هەر چەندە نیەو دەستیان ناکەویت..!!هەروەها پیان دەڵێن : ئێوە گاڵتە تان دەکرد ، هەروەك گاڵتە کردن بە ئیمانداران لە ژیانی دونیادا ، دە تان ووت : ئیمانمان هێناوە ، بەلام ئیمان تان نەهێنا لە دونیادا هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ﴾ [النِّسَاء : ١٤٢] واتە : بە دڵنیایی مونافیقان لەبەر نەزانی و نەفامیان بەگومانی خۆیان فێڵ لە خوای گەورە ئەکەن [ وَهُوَ خَادِعُهُمْ ] لەبەرامبەر ئەو تاوانەیان خوای گەورە هاوشێوەی خۆیان لەگەڵیاندا دەکات وە ئەیانخەڵەتێنێ و فێڵیان لێ دەکات، تا بەردەوام بن لە گومڕایی خۆیان و نەچنە سەر ڕێگای ڕاست، (ئەم سیفەتە بەتەنها بۆ خوای گەورە بڕیار نادرێ بەڵکو لەبەرامبەر کافراندا وەکو تۆڵەسەندن و ئینتیقام بۆ باوەڕداران..!! ئینجا لە ڕێگای ڕاست لە لە ژیانی دونیادا پیان ڕاگەیاندرا بوو دەبێت ئیمان بەهێنن ئەوانە کە دەفەرموویت قال تعالی: ﴿ٱرْجِعُواْ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُواْ نُورًا﴾ [الحَدِيد : ١٣] ).[٢]

[١] -اخرجه ابن جرير (٢٨٦/١).
[٢] -تفسير مقاتل بن سليمان (٨٩/١).

📖 لە (پیاوێك لە هاوەلان ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : ((أنَّ قائلاً من المُسلِمِينَ قال يا رسولَ اللهِ ما النجاةُ غدًا قال لا تخادعِ اللهَ قال وكيف نخادعُ اللهَ قال أن تعملَ بما أمرك اللهُ به تريدُ به غيره فاتقوا الرياءَ فإنه الشركُ باللهِ فإن المرائىَ يُنادى يومَ القيامةِ على رؤوسِ الخلائقِ بأربعةِ أسماءَ يا كافرُ يا فاجرُ يا خاسرُ يا غادرُ ضل عملُك وبطل أجرُك فلا خلاق لك اليومَ عند اللهِ فالتمس أجرك ممن كنت تعملُ له يا مخادعُ وقرأ آياتٍ من القرآنِ { فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا } الآية و{ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ }...) .[1]

واتە: یەکیچك لە موسلمانان ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن رزگارمان دەبێت لە بەیانی ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : فێل نەکەن لە (خوای گەورە ) ، ئەویش ووتی : چۆن فێل نەکەین لە (خوای گەورە ) ..؟! پێغەمبەری فەرمووی : ئەوەی کە (خوای گەورە ) فەرمانی پیّ کردووی ئەوە بکەیت ، تۆش بتەوێت جگە لە فەرمانی خوا جیّ بەجیّ بکەیت ، خۆتان بپارێزن لە (ریاء ) بازی یان دوو رووی ، چونکە شریك و هابەشیە پەیدا کردنە بۆ (خوای گەورە ) ، چونکە لە رۆژی دوایی یان قیامەت دا (ریاء بازەکان ) یان دوو رووە کان بانگ دەکرین ، لە سەر سەری بوونەوەرە کان بە چوار ناوە وە پیان دەلێن : ئەی کافر ..؟! ، ئەی لە سنور دەرچوو ..؟! ، ئەی خەسارەت مەند ..؟! ئەی ناپاك یان خیانەتکار ، کردارە کانت هەر هەمووی گومرایی بوون ئەو ئەجرو پاداشتەی هەت بوو هەر هەمووی باتل یان پوچەل کرایەوە ..؟! ئەمرۆ هیچ کارێکت لە گەل خودا دانیە ، هەر بۆیە بەدوای ئەجرو پاداشتەکەت دا بگەریّ لە و کەسانەی کەپێشتر کرداری خراپت لەگەلدا دە کردن ، ئەی فێلّ باز ئەی تەلەکە باز ئەی فریو دەر ،ئینجا ئەم ئایەتانەی خوێندەوە قال تعالى: ﴿فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا﴾ [الكَهۡف : ١١٠] واتە : [ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ ] جا هەر کەسێك بە ئومێدی گەیشتنە بە خوای گەورە لە رۆژی قیامەت بە سەری بەرزو بە رووی سپی کە باوەڕدارانن [ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا ] با لە دونیادا کردەوەی چاك بکەن، (واتە: لەسەر سوننەتی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بێت و بیدعە نەبێت)..!! قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ﴾ [النِّسَاء : ١٤٢] واتە : بە دڵنیایی مونافیقان لەبەر نەزانی و نەفامیان بەگومانی خۆیان فێڵ لە خوای گەورە ئەکەن [ وَهُوَ خَادِعُهُمْ ] لەبەرامبەر ئەو تاوانەیان خوای گەورە هاوشێوەی خۆیان لەگەڵیاندا دەکات وە ئەیانخەڵەتێنێ و فێڵیان لێ دەکات، تا بەردەوام بن لە گومڕایی خۆیان و نەچنە سەر رێگای راست، (ئەم سیفەتە بەتەنها بۆ خوای گەورە بڕیار نادرێ بەڵکو لەبەرامبەر کافراندا وەکو تۆڵەسەندن و ئینتیقام بۆ باوەڕداران..!!

📖 لە (قيس بن سعد ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – دەلێت : ((سمِعتُ رَسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ يَقولُ: (المَكرُ والخَديعةُ في النَّارِ ) لكنت أمكر هذه الأمة )).[2]

واتە : گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی : فێکرد ن و مکر کردن لە ئاگردایە ، ئەوەش مکری ئەم ئومەتە ..!!

[1] -فتح القدير الشوكاني (٥٧/١).
[2] - اخرجه البيهقي في الشعب (٢٠٨/٧).

قال تعالى: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ١٠﴾ [البَقَرَةِ : ١٠]

﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ واتە: لە دڵ یاندا نەخۆشی و ناپاکی هەیە ، ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ واتە: خواش نەخۆش یەکەی زۆر تر کردن (بە هاتنی قورئان ) ، ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ١٠﴾ واتە : وە سزا سەختیان بۆ هەیە بە هۆی ئەو درۆیانەوە کە دەیان کرد وە دە یان ووت بروامان هەیە ، بەڵێ ئەوانە واتە : مونافیقە کان یان دوو رووەکان لە نێو دڵ یاندا حالەتێکیان بۆ خۆیان قبول کردوە بە روالەت ئیسلام و لە ژێرەوە یان لە ناوەوە ناموسلمان یان دوو روو و کوفر یان هەڵبژاردوە جا (اللە تعالى ) ئەم نەخۆشیە یان بۆ زیاد بکات وە بۆ ئەوان هەیە سزایەکی پر لە دەرد و نەخۆشی و ناپاکی بەهۆی ئەو درۆیانەی کە دەی کەن ، چونکە هەر خۆیان بوون بە هۆی ئەو نەخۆشیە ، هەروەها (خوای گەورە ) ش نەخۆشی بۆ زیاتر کردن لە دڵە کانیان،

بەڵێ قال تعالى: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] مەبەست لە نەخۆشیە لێرەدا: نەخۆشی دڵ دەروونە واتە: گومان درەست کردن لە دڵ و دەروونە ،واتە : گومان و دوو دلیی و دوو روویە ، چونکە دڵ روو بەرووی دوو نەخۆشی دەبێتەوە لە ساغی و هاوسەنگی دەبیەنە دەر ، ئەوانیش : نە خۆشی گومانە پووچەڵە کان (مرض الشبهات ) وە نەخۆشی حەزو ئارەزووەکان (مرض الشهوات ) جا لێرە دا بێ باوەری و دوو رووی و گومان و داهێنان لە ئاین یان بیدعە هەر هەموو یان لە نەخۆشیەکانی گومانە خراپە کانن ، (مرض الشهوات ) وە زیناو داوێن پیسی حەزو ئارەزوو بۆ بەد رەوشتی و سەرپێچی فەرمانە کان ئەوەش لە نەخۆشیە ئارەزووە کانە ، هەروە ك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلۡنَ قَوۡلًا مَّعۡرُوفًا ٣٢﴾ [الأَحۡزَاب : ٣٢][ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ ] ئەو کاتە کەسێك کە نەخۆشی نیفاق یان نەخۆشی شەهەوات و ئارەزوو لە دڵیدا بێ لەوانەیە تەماح بکات [ وَقُلْنَ قَوْلًا مَعْرُوفًا (٣٢) ] وە کاتێك کە لەگەڵ پیاوانی بێگانەو نامەحرەمدا قسەتان کرد قسەی جوان بکەن با قسەکانتان دوور بێت لە نەرمی و ناسکی و گومانەوەو وەکو پیاوی خۆتان قسەیان لەگەڵ مەکەن، (ئافرەت دەبێت لەگەڵ پیاوی خۆی بە نەرمی و ناسکی قسە بکات، وە لەگەڵ پیاوی بێگانەو نامەحرەم بە زبری قسە بکات، نەك بە پێچەوانەوە). کەواتە : ئارەزووی ئەوە دەکات کە لە دڵ ی نەخۆشدا هەیە ، وە ئارەزووی زینا و داوێن پیسی کردنە ، تەندروست و پارێزراو ئەو کە سەیە پارێزراو بێ لەم دوو نەخۆشیە ، دلنیایی و ئیمان و ئارامی بەدەست هێنابێ لە هەموو سەپێچیە کە ، ئەوە بەر بەرگی سەلامەتی لەش ساغی داپۆشراوە ..!! روونکردنەوەیەك بۆ کاربەجێی (خوای گەورە )دیاری کردنی سەرپێچیە کان بەسەر سەرپێچی کاراندا بێ گومان ئەو کەسانە بە هۆی تاوانە کانی پێشتریانەوە تووشی بەلا دەبن بە تاوانەکانی داهاتوویان ، کە تۆلە یان بۆ پێویست دەکات ، وە کو(خوای گەورە ) دەفەرموویت قال تعالى: ﴿نُقَلِّبُ أَفۡـِٔدَتَهُمۡ وَأَبۡصَٰرَهُمۡ كَمَا لَمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ﴾ [الأَنۡعَام : ١١٠] واتە: [ وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ ] وە دڵ و چاویان وەردەگێڕین و جێگیریان ناکەین لەسەر ئیمان هێنان، یان دڵ و چاویان لەناو گڕو بڵێسەی ئاگری دۆزەخدا وەردەگێڕین [ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ ] چۆن لە دونیادا یەکەمجار ئیمانیان پێ نەهێنا..!!

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ﴾ [الصَّف : ٥] واتە : کاتێك لە شوێنکەوتنی حەق لایاندا بەوەی ئازاری پێغەمبەرەکەیاندا خوای گەورە زیاتر دڵیانی لەسەر حەق و هیدایەت لادان ..!!هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ١٢٥﴾ [التَّوۡبَة : ١٢٥] واتە : بەڵام ئەوانەی کە دووڕووی و گومان لە ئاینی خوای پەروەردگار لە دڵیاندا هەیە، بێگومان ئەوانە دابەزینی سورەتەکە دووڕوویی گومان بۆ ئەو دووڕوویی و گومانەیان زیاد دەکات کە پێشتر لەسەری بوون، وە لەناوچوون ئەوانە لەکاتێکدا کە نکوڵی لە خوای پەروەردگار و ئایەتەکانی دەکەن ..!! بێ گومان سزایی سەر پێچی سەرپێچی تر بە دوای دا دێت ، هەر وەکو چۆن پاداشتی چاکە چاکەیەکی تر بەدوای دادێت ، هەروەك (خوای گەورە ) دفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ هُدًىۗ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيۡرٌ مَّرَدًّا ٧٦﴾ [مَرۡيَم : ٧٦] واتە : وە خوای گەورە ئەو بەندانەی کە هیدایەت دراون بۆ ئاینەکەی هیدایەتیان زیاتردەکات بە نوێکردنەوەی باوەڕیان بە فەریزەکانی خوا و کردەوە پێکردنی . وە ئەو کردەوە چاکانەی کە دەمێننەوە پاداشتیان خێرترە لای خوا لەدوارۆژدا و سەرئەنجامێکی باشتریشی هەیە ..!!

قال تعالى: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ [البَقَرَة : ١٠] بێ گومان لە دڵی ئەمانە واتە : مونافیقە کان یان دوو ڕووەکان نەخۆشی هەیە، وە دڵ یان هیچ کات سەلامەت نابێت ، ئەوەی هەیە نەخۆشی دڵ دوو جۆرە :

یەکەمیان : نەخۆشی جستە یان لاشە کە هەموو ئەندامەکانی جستە دەگرێتەوە خۆ، ئەگەر دڵ لاواز بوو ئەوا هەمو ئەندامەکانی لاشە لاواز دەبێت هە وەك ئەو نەخۆشیانەی کە پزیشکەکان بۆ مانی باس دەکەن لە نەخۆشیە دڵ یەکان ئێستاش جەندین نەخۆشخانە بەناوی نەخۆشی دڵ دورست کراوە ، چونکە دڵ ئەندامێکی سەرەکیە لە جستە دا وەکو ئەوەیە هەموو فەرمانێکی لە دڵ دەر دەچێت ، هەر وەك بەرز بوونەوەو نزم بوونەوەی زەخت و خوێن ، یان گرژبوونەوەی ماسولکەکانی دڵ وە شتی تر وەك ئەمانە... هتد

دووەمیان : نەخۆشی دەروونی ، ئەویش دابەش دەبێت بە دوو بەش :

(مرض الشهوات ) واتە: ئارەزووە کان ئەویش دابە ش دەبیت بە دوو بەش :

أ-(مرض الشهوات فرج ) نەخۆشی ئارەزووی زینا و داوێن پیسی ، (مرض الشهوات بطن ) نەخۆشی ئارەزووی وورگ پر کردن جا حەلال بێت یان حەرام بێت ، (مرض الشهوات اتباع الهوا ) نەخۆشی هەواو ئارەزووە کان ..!!

ب- (مرض الشبهات ) واتە: نەخۆشی گومانە کان ، بیدعەو داهێنراوەکان لە ئاین دا ، واتە : نەخۆشی گومان کوفر و نیفاق ..!!

بێ گومان ئەم دوو جۆرەی کە باسمان کرد لە نەخۆشیە دەروونیە کانی دڵ مەبەستی ئایەتە کە ئەمەیە لە راستی دا ...!!

✍ لە (ابن قیم ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : نەخۆشی دڵ ئەوەیە لە سەلامەتی دەردەچێت ز نە خۆش دەکەوێت ،وە سەلامەتی دڵ ئەوەیە حەق دەزانێت و حەقی خۆش دەوێت ، کاریگەریشی لە سەر دڵ و ئەندامەکانی تر دەبێت ، نە خۆشی دڵ یان گومانە کان ، یان بەوەی خۆی باشتر و زل تر دە بی نێت لە کەسانی تر ، وە نەخۆشی دوو رووەکان نەخۆشی گومانە ، نەخۆشی تاوانباران نەخۆشی شهوەتوو ئارەزوو بازیە ..!! هەروەها وتەی : قال تعالى: ﴿قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] ئەم رستەیە رستەیەکی (الاسمیە ) بەلگەیە لەسەر بەردەوام بوون و جێگیر بوونی ئەم نەخۆشیە لە دڵ یاندا ، هەروەها لە ناخی دڵ یان نەخۆشی هەیە نەك لە لایەکی دڵ یان لە رووکەشی دڵ بە لکو لە ناوەراستی دڵ ، چونك دڵ سەنتەری هەموو ئەندامە کانی جستە یە یان لاشە یە ، هەموو ئەندامەکانی جستە یان لاشە شوێنکەوتەی دلن ، ئەگەر دڵ نەخۆش کەوت ئەوا ئەندامەکانی تری جستە یان لاشە ش نەخۆش دەکەون لەئەنجامدانی کردەوەکان ، چونکە ئاسەواری نەخۆشیە کە دڵ یەتی ، هەروەها ووتەی قال تعالى: ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٠]ئەگەر سەرنج بدەین پیتی ( الفاء عاطفة ) مانای (السببیة) واتە : هۆکارێکە جۆتە سەری ئەو مانایە هەلدەگرێت ، جا ئەگەر هەندێك زانا وای بۆ دەچن کە ئەو رستیە ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] دەبینین ئەم رستیە رستیەکی (خبریە ) یان (هەوال پێدانە ) بەلام دە گونجێ بە مانای (إنشاء ) بێت واتە : دوعا و نزا بێت وەك مانا مان کرد هەر لە سەر ئەم ووتەیە دروست دوعا لە مونافیقە کان یان دوو رووەکان بیکەیت (والله أعلم ) ..!! قال تعالى: ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ۝١٠﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] بێ گومان (خوای گەورە ) سزایەکی سەختیش لە دونیا و قیامەتدا چاورێیانە بە هۆی درۆکردنیان و دژایەتیان بۆ ئیسلام ..!!

١-هۆی گومرا بوونی مونافیقە کان نەخۆشی دڵ یان بوو، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] چونکە مرۆڤ دەبێت ئاگادار بێت نەخۆشیەکانی دڵ هۆکارێکن بۆ گومرا بوون ، بۆیە دەبێت بەردەوام لی پرسینەوە لەگەل خۆی دا بکات دڵ ی خۆت چارە سەر بکەیت پیش گومرا بوونت .

٢- جێگیر کردنی زیاد کردنی کردەوەی باش وەك ئیمان ، یان زیاد کردنی کردەوەی خراپ وەك کوفر ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] بەلێ زیاد بوون لە بەرانبەر دا کەم بوون هەیە ، هەر وەك چۆن ئیمان زیاد دەبێت و کەم دەبێت ، ئەواش خراپە و تاوان زیاد دەبێت و کەم دەبێت وە ك کوفر و بێ باوەری ،واتە : نەخۆشی گومرایی کوفر بێ باوەری زیاد دەبێت کەم دەبێت .

٣-بەستنەوەی هۆکار بە سزادانەوە ، (خوای گەورە ) هیچ کەس سزا نادات مەگەر هۆی تاوانەوە نەبێت لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ۝١٠﴾ [البَقَرَةِ : ١٠]

٤- دەبێت بەندەی موسلمان خۆی بپارێزێ لە سیفە تەکانی دوو روو یان مونافیقە کان ، چونکە هەر سیفەتیکی مونافیق یان کافر باسکرا بێت لە قورئانی پیرۆزدا ئەوا ئاماژەیەکە بۆ بەندەی موسلمان کە خۆی لەم سیفە تانە بپارێزی ، چونکە مونافیقە کان بانگەشەی ئیمانداریان دەکرد ، کە چی درۆیان دەکرد .

٥-مرۆڤ ئەگەر رێگای حەق هەل نەبژێرێت ئەوا بێ گومان دڵ ی نەخۆش دەبێت و سزا دەدرێت بە زیاد بوونی نەخۆشیەکە، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] .

٦- هەرەشەیە کی توند جەرگ بر هاتووە بۆ دوو رووەکان یان مونافیقەکان ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ﴾ [البَقَرَةِ : ١٠].

٧-ئەم دوو روانە یان مونافیقانە درۆکردن و بەدرۆخستنەوەیان تێدا بەدی دەکرێت یان کۆ بیتەوە لە دوو رووەکان ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ١٠﴾ [البَقَرَةِ : ١٠].

٨- زم کردنی درۆ کردن یان باسکردنی بە شێویەکی خراپ ، ئەوەیە ئاماژەیە بۆ سزادان ، چونکە درۆ کردن ناشرین ترین سیفەتی مرۆڤە لە هەر ئاین و بیرو باوەڕێك دابێت ، لە بەر ووتەی قال تعالی: ﴿بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ١٠﴾ [البَقَرَةِ : ١٠]. هەروە ك ئەفەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە پێشدا باسمان کرد ، کە درۆ کردن کاری دوو روو یان مونافیقە کانە ..!!

📖 لە (ابو هریرە ) – خوا لیی رازی بێت – دەڵێت : لەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((آيَةُ المُنَافِقِ ثَلاثٌ: إذا حَدَّثَ كَذَبَ، وإذا وعَدَ أخْلَفَ، وإذا اؤْتُمِنَ خانَ)). [1] واتە: نیشانەی دوو روو سێ یانە : ئەگەر قەسەی کرد درۆ دەکات ، ئەگەر وعد و بەڵێنی دا ناباتەسەر واتە : لە بەڵێنەکی خۆی پاشگەز دەبێتەوە ، وە ئەگەر ئەمانەتێکی یان سپاردەیەکی لە لابوو ئەوا خیانەتی یان ناپاکی لێدەکات ..!! (هەروە کو ئێستای بە ناو دەسەلات داران کە خیانەت ناپاکی لە ئەمانەتەکایان دەکەن لە دامودەزگای دەوڵەت خیانەت دەکەن ملک ومال و سامانی گشتی بە ناحەق دەدزن دەخۆن بێ گوێدان بە ئادابی مرۆڤایەتی چونکە ئەوانە وەکو ئاژەل رەفتار دەکەن لەدزینی سامانی خەلکی دا ئەوانە گەورە مونافق دوو رووی ئەم سەردەمەن ..!!

[1] -صحيح البخاري برقم (٦٠٩٥).

✍ لە (عبداللە بن مسعو) – خوا لـی رازی بێـت – لەسـەر ووتـەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ دەڵێت : لـە نـاو دڵا یانـدا گومان هەیە قال تعالی: ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] (خوای گەورە ) گومانەکەیان زیاتر دەکات ) .[1]

✍ لە ( عبدالرحمن بن **زید بن أسلم** )- **رەحمەتی خوای لیٚ بێت - لەسەر** ووتە ی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ دە لێت : ئەم نەخۆشەیە لە داهاتوو دا نەخۆشی ناو جستە یان لاشە نیە ، ئەوانە دوو رووەکانن یان مونافیقەکانن ، ئەوە نەخۆشی گومانە کانە کە پێوە هاتوونەتە نێو ئاینی ئیسلام ، لەسە ووتەی ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ دەلێت : پیس و چەپەلیان زیاد دەکات ) لە پاشاندا ئەم دوو ئایەتە ی سورەتی (التوبە ) ی خوێندەوە ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿ءَامَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ۝١٢٤ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ۝١٢٥﴾ [التَّوْبَة : ١٢٤ - ١٢٥] واتە : ئەوانەی کە باوەڕداری ڕاستەقینەن ئیمانیان زیاد ئەکات بەدابەزینی سوورەتێك وە دڵیان پێی خۆشە وە موژدە ئەدەن بە یەکتری (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیمان زیادو کەم دەکات)..!! بەڵام ئەوانەی کە نەخۆشی گومان لە دڵیاندا هەیە لە مونافیقان بە دابەزینی هەر سوورەتێك ئەوان پیسیان زیاد ئەکات لەسەر پیسیان، وە گومانو نیفاقیان زیاد دەکات لەسەر گومانو نیفاقی پێشتریان [ وَمَاتُوا وَهُمْ كَافِرُونَ (١٢٥) ] وە کە بەردەوام بن لەسەر ئەو نیفاقە بەکافری ئەمرن ..) [2]

✍ لە (عبداللە بن عباس ) لەریٚ (ابن اسحاق ) – راز رەحمەتی خوایان لیٚ بیت – لەسەر ووتەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ دەڵێت : واتە :( گومان بردن یان شەك بردن ).[3]

✍ لە (عكرمە ) لەریٚ (مالك بن دینار ) – رزاو رەحمەتی خوا یان لیٚ بێت – لەسەر ووتەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ دەلێت : واتە: ( زینا کردن و داوین پیسی ).[4]

✍ لە (طاووس ) لەریٚ (ابنە ) – راز و رەحمەتی خوایان لیٚ بێت – لەسەر ووتەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ دەلێت : واتە: ( ئەوە لە هەندێك کاور بارو بابەتی ئافرەتان دایە ) .[5]

✍ لە (قتادە ) لەریٚ (سعید ) – رەحمەتی خوا یان لیٚ بێت – لەسەر ووتەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ دەلێت: واتە : گومان و شەك بردن بە فەرمانەکانی (خوای گەورە ) ).[6]

---

[1] -تفسیر الطبري (٢٨٠/١).
[2] - تفسیر الطبري (٢٨٠/١).
[3] -سیرة ابن هشام (٥٣١/١).
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤٣/١).
[5] -اخرجة ابن ابي حاتم (٤٣/١).
[6] -اخرجة ابن جریر (٢٨٩/١).

✍ لە (زيد بن علی ) لە ڕێ (سعد الإسكاف ) – رەحمەتی خوا یان لێ بێت – دەلێت : (المرض مرضان ) واتە: دوو نەخۆشی هەیە ، نەخۆشی زینا یان داوین پیسی و ، نەخۆشی نفاق یان دوو روویی ).[١]

✍ لە (الربيع بن أنس ) لەرێ (أبی جعفر ) – رەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ دەلێت : واتە : ئەو کەسانەن کە ئەهلی نفاق یان دوو روویین ، نەخۆشیە کانی ئەوانە لە سە دڵ یانە وەکو گومان بردن بە فەرمانەکانی (خوای گەورە ) ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ دەلێت : واتە: (شكا) مانای ئازاری نەخۆشیە کەیان زیاتر دەبێت یان سکالای نەخۆشیە کەیان زیاتر دەبێت ...).[٢]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ دەلێت : واتە : گومانی خراپ بردن بە (خوای گەورە ) و ﷺ ، هاوتایە لە گەل سورەتی محمد قال تعالى: ﴿أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخۡرِجَ ٱللَّهُ أَضۡغَٰنَهُمۡ ۝٢٩﴾ [مُحَمَّد : ٢٩] واتە : ئایا مونافیقان کە نەخۆشی گومان لە دڵیاندایە وا گومان ئەبەن کە خوای گەورە ئەو ڕق و کینەو ئیرەییەی کە لە دڵیاندایە بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان دەری ناکات و ئاشکرای ناکات و ئابڕوویان نابات..!! مانای : گومان وشەك دێت).[٣]

✍ لە (عبدالرحمن بن زيد بن أسلم ) لە ڕێ (وهب ) – رازو رەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ دەلێت : ئەوە نەخۆشیە لە ئاین دا ، نەك نەخۆشیە لە ئەندامەکانی جستە یان لاشە ، ئەوانە دوو رووەکانن ، کاتێك دوو رووە کان هاتنە ناو ئیسلام گومانیان لە ئیسلام هەبوو ).[٤]

✍ لە (عبدالله بن عباس ) لەرێ (ابن اسحاق بسنده ) – رازو رەحمەتی خوایان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ دەلێت : واتە: (شكا) مانای ئازاری نەخۆشیە کەیان زیاتر دەبێت یان سکالای نەخۆشیە کەیان زیاتر دەبێت ...).[٥]

✍ (عكرمه ) لەرێ (مالك بن دينار ) رازو رەحمەتی خوا یان لێ بێت - لەسە ووتەی ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ دەلێت : واتە : زنا یان داوێن پیسی ).[٦]

✍ لە (قتاده ) لەرێ (ابن المبارك ) لە (سعيد ) – رزاو رەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەرووتەی ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ دەلێت : واتە : (نفاقا ) یان دوو رووەکان ).[٧]

---

[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤٤/١).
[٢] - اخرجه ابن جرير (٢٨٩/١).
[٣] -تفسير مقاتل بن سليمان (٨٩/١).
[٤] -اخرجه ابن جرير (٢٨٩/١).
[٥] -في سيرة ابن هشام (٥٣١/١).
[٦] -اخرجة ابن ابي حاتم (٤٤/١).
[٧] - اخرجة ابن ابي حاتم (٤٤/١).

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوا لیّ بیّت – لەسەر ووتەی ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ دەلیّت : واتە: ئازاری نەخۆشە کەیان زیاتر دە بیّت یان توندتر دەبیّت لەسە ر دلە کانیاندا ).[1]

✍ لە (عبدالرحمن بن زید بن أسلم ) – رەحمەتی خوای لیّ بیّت – لەسەر ووتەی (خوای گەورە ) قال تعالى: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] دەلیّت : زیاد کردنی پیسی قیّزەونی ، وە هەروەها ئەم فەرموودەی (خوای گەورە ) ی خویّندەوە قال تعالى: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنًا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ۝١٢٤ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ﴾ [التَّوۡبَة : ١٢٤ – ١٢٥] دەلیّت : واتە : خراپە بۆ خراپە یان زیاتر دەبیّت ، گومرای بۆ گومرایان زیاتر دەبیّت ).[2]

✍ لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – (نافع بن الازرق) دەلیّت : پیّم ووت : دەربارەی ئەم ووتەیە ی (خوای گەورە ) باسم بۆ بکە قال تعالى: ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] دەلیّت : (الأليم) واتە :(الوجيع ) واتە : بە ئازار . دەلیّت : ئایا عەرەب ئەمە دەزانیّت ..؟! ووتی : بەلیّ . گویم لە ووتەی الشاعر بووە :

نام من کان خليا من ألَم وبقيت الليل طولا لم أنم [3]

✍ لە (عبداللە بن عباس ) لە ری (عکرمة ) – رزاو رەحمەتی خوایان لیّ بیّت – دەلیّت : هەموو شتی یان ووشەیەکی ﴿أَلِيمُۢ﴾ فهو الموجع واتە : بە ئازارە ).[4]

✍ لە (عبداللە بن عباس ) لە ری (ابي روق ) لە (الضحاك) – رزاو رە حمە تی خوا یان لی بیت – لە سە ر ووتە ی قال تعالى: ﴿بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ۝١٠﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] دەلیّت: دەی گۆرن بەوەی کە دیزانن ).[5]

✍ لە (قتادە) – خوا لی رازی بیّت – لەسە ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ۝١٠﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] دەلیّت : هەرگیز درۆمە کەن ، چونکە دەرگای دوو رووی دەکەیتەوە ، من – واللە – ئیّمە هەرگیز کاریّکی وا خیّرا مان نەبینیوە لە فسادی دلی بەندە بە قەد خۆ بە گەورە زانین و دۆر کردن ، واتە : دوو شت دلی بەندە خیرا دە کات بۆ گەندەلی فسادی ئەویش لووت بەزی و درۆکردنە ).[6]

[1] -تفسير مقاتل بن سليمان (٨٩/١).
[2] - اخرجه ابن جرير (٢٩١/١).
[3] -اخرجه الطستي – كما في لاتقان (٧٧/٢)، ١٠٣.
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (٦٢١/٢).
[5] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤٤/١).
[6] -تفسير المأثور (١٠١/٢) عزة للسيوطي إلى عبد بن حميد .

قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١﴾ [البَقَرَةِ : ١١]

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ﴾ واتە : وە كاتێك پێ یان بووترایە ، ﴿لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە : ئاشووب یان فیتنە مەنینەوە لە زەویدا، یان ئاژاوە بەرپامەکەن لە ولاتدا ،یان گەندەلی مەکەن لە ولاتدا ،یان تۆی خراپە مەچێنن لە ولاتدا، یان فسادی بە رپامەکەن لە ولاتدا، ﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١﴾ واتە: دەیان ووت : ئێمە هەر چاکە کارین (رێکخەرین ) خزمەت کاری خەلکەین..؟!

قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١﴾ [البَقَرَةِ : ١١] واتە: جا هەر کاتێك پێ یان بووترێت فسادی گەندەلی مەکەن لە سەر زەویدا یان لە ولاتدا ، خراپە مەکەن ، تاوان و گوناه بەد رەوشتی بلاو نەکەنەوە ، خەلك مەکوژن بە ناحەق ، مالی خەلکی مەخۆن و بەتالان مەبەن بە ناحەق ، دژایەتی ئیمانداران موسلمانان ئاین پەروەران مەکەن ، جاسوسی مەکەن لەسەر خەلك ، بوختان مەکەن بە خەلك ، ناپاکی خیانەت مەکەن لە وەلاتدا ،دزی وگەندەلی مەکەن لە وەلاتدا ، وەلات تالان فرۆش مەکەن، سەرخان و ژێر خانی بە تالان مەبەن ، تۆی گەندەلی فسادی مەچێنن لە ولاتدا یان لەزەویدا ، داوێن پیسی و بەدرەوشتی وەلاتانی رۆژ ئاوا بلاو مەکەنەوە بە ناوی جیاجیا لە ولاتدا ، یاساو رێسای بت پەرست و موشریکان و کافران بلاو مەکەنەوە لە وەلاتدا ، بەناوی ئەمانەتی وەلات بپارێزن ..؟! خیانەتی لێ مەکەن ، تۆی چەواشەکاری دۆر کردن بلامەکەنەوە لە وەلاتدا ، مافی خەلك پێشەل مەکەن ، ئازادی خەلك لە دەربرینی حەق دا پێشەل مەکەن ، خەلك ئازار مەدەن ، تۆمەتی نارەوا بۆ خەلك هەلمەبەستن ، زیندان و بەندیخانەکانتان پرمەکەن لە خەلکانی حەق و راست بێژ..؟! ، تاوان و بوختان بۆ خەلك هەلمەبەست بە نارەوا لە وەلاتدا ، پشتگیری گاور جوولە کەو کافران مەکەن ..؟!، دۆستایەتی لە گەل کافران دا نەکەن چونکە تێدا زیان بەخش دەبن ..؟!، هاورەگەز بازی لە وەلاتدا بلاو مەکەنەوە ..؟!، بۆ دلخۆش کردنی یان رازی کردنی دۆستە بێ باوەرکانتان ..؟!، مافی موسلمانان پێشەل نەکەن چونکە باجەکەی زۆر گەورە دەبێت لەسەر تان تۆلەی (خوای گەورە ) زۆر گەورەیە بۆتان ..؟!، دادپەروەری بکەن لەنێو خەلك دا بە بێ جیاوازی ، چونکە وەلات بە دادگایی دادپەروەران پێش دەکەوێت ، دادوەری بەناحەق مەکەن ..؟!دادپەروەرەکان بۆپارەیەکی یان خۆشیکی کەم بۆدەست هەلاتێکی زالم و ستەمکار..!! دەچنە رێزی موناقیقە کانەوە ، هەموو ئەمانە و چەندی تاوان خراپە کاری گەندەلی و فسادی کە هەن هەر هەمووی کردارو پیشەی دوو روو موناقیقە کانە کە باسمان کرد ، ئەو کەسانەی کە ئەمانە هەر یەکیان لە خۆدا بەدی بکات ئەوا با تۆبە بکات و بگەرێتەوە چونکە تاوانی دوو روو یان موناقیقە کان لە سەر رووی زەویدا فسادی گەندەلی بلاودەکەنەوە ، جا کە لەپێشدا باسمان کرد موناقیقە یان دوو رووی دووجۆرە : أ-نفاقی کرداری ئەمانە زۆربەیان دەگرێتەوە ، ب- نفاقی عقیدەیی یان بیروباوەرە کەدۆستایەتی کردن وهاوشێوەیی کافران بکەیت لە کردارو بیرو راو گومرایی و خراپە کاریەکانی بێ باوەران یان بە فیتی کافرو بێ باوەران هەلپەری ..!!

جا ئەوەی کە لە سەرەوەدا کە باسمان کرد لە فسادی و گەندەڵی و خراپەکاری سەر زەوی یان خراپەکاری لە وەڵاتدا ، ئەمانە وەڵامیان دەبێت ..؟! دەڵێن : نەخێر ئێمە لە پیاوچاکین ..!! ئێمە چاکسازی دەکەین ..!! ئێمە گەندەڵ کاران دەدەینە دادگا ..!!ئێمە پەرژەوەندی خەلکمان دەوێت ..!! ئێمەین دەمانەوێت خەلك بحەسێتەوە بە ئاسوودەی بژیت ..!! ئێمە درۆزن نین ..!! ئێمە چەواشە کاری ناکەین ..!! ئێمە بەد رەوشتی داوێن پیسی بلاو ناکەینەوە ..!! ئێمە مالی خەلك بەناحەق ناخۆێن ..!! ئێمە ئەمن ئەمان و ئاسایش لە نێو خەلك بلاو دەکەینەوە ..!! ئێمە وەلات تالان فرۆش ناکەین سەرخان و ژێر خانی وەلات نافرۆشین ، ئێمە هەموو شتێك قورغ ناکەین بۆ خۆمان ..!! ئێمە خاوەنی کۆمپانیان دزو جەردەیی نین ..!! ئێمە هەموو شتێکمان قورغ نەکردووە بۆ خۆمان ئەوەنیە خەلك هەوا هەلدەمژێت خۆ نەمان بریوە ..؟! ئێمە سەرچاوەی دۆزینەوەی کارو کاسبین بۆ خەلك ..!! ئێمە بە هەزاران گەنجامان خستۆتە سەر کار ..!! ئێمە هەرزانیمان بۆ خەلك بەدیهێناوە ..!! ئێمە داد پەروەیمان چەسپاندووە لە وەلاتدا ..!! ئێمە دژی ئاین نین بەلکو موسلمانین ..!! ئێمە ستەم وزلم لە خەلك ناکەین ..!! ئێمە مافی خەلك بۆ خاوەنەکانی دەگەرێنینەوە ..!! ئیمە لە وەلاتدا بەندیخانە مان نیە کەس نیە بەناحەق بەند کرابێت ..!! ئێمە یەکسانی و دادپەروەردی مان هەیە لە وەلاتدا ..!! ئیمە هۆکاری هەرزانین و خۆش گوزەرانی هاولاتیانین..!! ئێمە پارەی خەلك ناخۆین بەزیادەوە پیان دەدین لە حەقی خۆیان زیاتر ..!! ئێمە ئەوەندە چاکسازی و دادا پەروەریمان کردووە وەك نموونەی : (عمری کوری خەتاب ) – خوا لیّ رازی بێت – وەکو (عمری کوری عبدالعزیز ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت- ئێمە وە ك ئەم دووانە لە بەرێوە بردنی وەلاتدا چاك سازی و دادپەروەری دەکەین ..!! ئێمە دز وجەردە نین ئەوەی هەیە خەلکی لاوازو هەژارو فەقیر دزو جەردەیە ..؟؟!! ئێمە مال و سامانمان نیە فیلاو کۆشك تەلاری بەرزی مان نیە نەکۆمپانیان و نە بە ئۆتۆمبیلی گران بەهاو ، نەبە ملیارەها دۆلارمان هەیە..؟! چونکە موچە مان بەشی ژێویی و قوتی رۆژانەمان ناکات ..؟!!

وەك: ئەمانەی کە باسمان کرد بەم شێوەیە دێنە پێشەوە قسە بۆ خەلك دەکەن وادەزانن خەلك لە گوییی گا نووستوە ، بەم چەواشە کاری ئەوان نازانن ، بەلام ئەوەندە ستەم کارو زالم و بەد رەوشتن شەرم ناکەن چونکە شەرمیان نەماوە روویان نیە تاکو شەرم لەم درۆیانەی خۆیان بکەنەوە ، وەك لەم رۆژ گارەدا ئەوانەن بەناحەق روو بەرووی ئیماندارن و موسلمانان دەبنەوە بە ناوی جیاجیا تۆ مەتیان بۆ هەلدەبەست ، ژیان لە خەلك تێك دەن و بەرانبەر هەژارن وفەقیران دەوستنەوە ، هەروەها رێگا لە بلاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام دەگرن ، چونکە لە بەژەوەندی ئەوان دانیە ، چونکە دەلێن : دادپەروەری ئیسلام بۆ ئەم بارودۆخە ناگونجیّ یان ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بۆ ئەم سەردەمە نەهاتۆتە خوارەوە کوفری ئاشکرا ئەنجام دەدەن ، بەلام ئەوانە هەر وادەزانن هەتاهەتایی لە ژیان دا دەمێنەوە نازانن رۆژێك دێت کە زۆر نزیکە جاچ لە ژیانی دونیا دا بێت چ لە قیامەت دا بێت ، ئەوا لەبەردەم (خوای گەورە ) حیساب و لێپرسینەوەیان لەگەلدا دەکرێت ، جاری واش هەیە هەر لە دونیا دا باجەکە دەدن وەکو( فیرعەون و هامان و قاروون و ابو جهل و ابو لهب و عبتە و شیبەی کورانی ربیعە ، هەروەها وەك صدام حسین و قەزافی و حوسنی مبارك ) چەندین زالم و ستەم کاری تر چوونە تە نێو تەنەکەی زەبلخانەی مێژوو ..؟! کە مێژووی خۆیان تێدا قیزە ون ناشرین کرد ، چونکە ئەوکەسە دوو روو مونافیقان چاك بزانن زولم ستەم تاسەر ناچێتە سەر بەلکو کۆتایی دێت ، چارەنووس و سەر ئەنجامەکەشی بەدلنیایەوە زۆر خراپ دەبیّ بۆ گەندەلکاران ..؟!!

📖 لە (عبداللە بن عمر ) – خوا لی رازی بیت –دەلێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((مَثَلُ المُنافِقِ كَمَثَلِ الشَّاةِ العائِرَةِ بيْنَ الغَنَمَيْنِ؛ تَعِيرُ إلى هذِه مَرَّةً، وإلَى هذِه مَرَّةً. [وفى رواية]: تَكِرُّ فى هذه مَرَّةً، وفى هذِه مَرَّةً)) .[1] واتە: وێنەی مونافیق یان دوو روو وەك وێنەی مەری وێڵی نێوان دوو رانە مەر وەهایە ن جارێك لە كۆمەڵی ئەو لادەبێت جارێكی تر لەكۆمەڵی ئەو لادەبێت ..!!

پرسیارێك ئا دەی ئەگەر ئێوە پیاو چاك و چاكە كارن و چاكسازی و دادپەروەری لە زەوی ا ئەنجام دەدەن بەقسەی خۆتان ئە مە عەرزو ئەمە گەز كێ دەستی كرتوون ..؟!

لە گەل ئەوەشدا ئێستا حكم و دادپەروەری ئیسلام لە سەران سەری جیهان دا بە ولاتانی بە ناو ئیسلامیشەوە لاوازە وجودی كەمە ، جا ئەگەر پێ تان وایە ئیسلام فساد و گەندەلە جگە لە ئیسلام چاكە دەی بیهێنن چاكی بكەن ..؟!

پرسیار ..؟! ئەی بۆ تا ئێستا ئەو هەموو خراپەكاریەی هەیە ئەو هەموو گەندەلی فسادەی هەی بۆ چاكی ناكەن ..؟!

ئەی خۆتان حاكم دادپەروەی جیهان ناكەن ..؟! خۆ ئێستا حكم بەرێوە بردنی جیهان ولاتدان لە دەستی ئێوە دایە ..؟!

پرسیار كێ رێی لێ گرتوون ..؟! كێ دەستانی گرتووە بۆ چاكی ناكەن ..؟! بۆ دادپەروەری ئەنجام نادەن..؟! بۆ گەندەلی بن بر ناكەن ..؟! كێ بەدرەوشتی بلاودەكاتەوە لە جیهان دا ..؟! ئایا ئیسلام موسلمانان فەرمانتان پێ دەكات خراپە كاری بكەن لە سەر زەویدا..؟! ئایا تا ئێستا كامە دزی گەورەیە سزاتان داوە ..؟! ئایا تا ئێستا حەقی خەلكانی هەژارو نەدراتان داوەتەوە ..؟! ئێ خۆ ئێوەن حكم و بەرێوە برندی ولات ..؟! ئێ خۆ هێزو دەسەلات لای ئێوەیە كی دەستی گرتوون ..؟!

ئەم پرسیارانە چەندین پرسیاری تریش بۆ ئەوانەیە كە گەندەل كارو فسادن لەسەر رووی زەویدا لە هەر وەلاتێكی بەناو ئیسلامی دا هەبن لە ئێستا دا ، تەنها تەنها ئەو كەسانە دەگرێتەوە كە سیفەتی دوو رووی یان مونافقی تێدا بەدی دەكرێت ، جا هەر كەسێك و هەر سەركردەیەكی ولاتان ئەم سیفە تانەی دوور ووەكانی تێدا بەدی بكرێت ئەوا بێ گومان ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز دا كە لەسورەتی (البقرە ) دایە لە ئایەتی (١١) دا دەی گرێتەوە كە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١﴾ [البَقَرَةِ : ١١] واتە: ئەوانە ئەگەر ئامۆژگاری بكرێن وە پێیان بووترێت : گەندەلی فسادی گوناهو تاوان وخرپە كاری لەسەر زەویدا یان لە ولاتدا بەرپا مەكەن ..؟! بێ شەرمانە دەلێن : ئێمە چاكسازی دەكەین ، ئیصمە ریفۆرم خوازین ، كێ لە ئێمە دلسۆزترە بۆ گەل و ولات ..؟! یان كێ لە ئێمە ئاین دار ترو موسلمان ترە ..؟!

[1] -صحيح مسلم برقم (٢٧٨٤).

ئەی پیشەیان فێل کردنە لە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، وە موسلمانان هەروەك دەفەرموویت قال تعالى: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ [البَقَرَةِ : ٩] واتە: ئەوان بە هەست و بیرو هۆشی خۆیان فێل لە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ و موسلمانان دەکەن دەڵێن ئیمانمان هێناوە کەچی راستیش ناکەن درۆدەکەن ،قال تعالى: ﴿يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ [البَقَرَةِ : ٩] کەچی فێل لە خۆیان دەکە یان خۆیان هەل دەخەلەتێنن هەستی پێناکەن ..!!

ئەگەر کەسێك بلی جۆن دەبێت فێل لە (خوای گەورە) بکرێت..؟! کەچی (خوای گەورە ) دە زانیچت چی لە دڵ یاندا ..؟!

ئێمەش لە وەلامدا دەلێن : ئەوان کاتێك ئیسلامی خۆیان بە دیار خست وەك ئەوە وایە فێلیان لە (خوای گەورە ) کردبێت ، چونکە ئەو کاتە ئەحکامەکانی ئیسلامیان لەسەر جیٚ بەجیٚ دەکرێت ، خوێن و مال سامانیان پارێزراوە دەبێت بە کارەیان ..!!

وەکو ووتمان هەرکەسێك بە ناوی ئیسلامەوە بلێت و بانگەشەی چاکسازی بکات ﴿إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١﴾ ئەوا بیٚ گومان بانگەشە کەی راست نیە چونکە سیفاتی مونافقی یان دوو رووی تێدا بەدی دەکرێت هە با بۆ خۆی بانگەشی چاکسازس بکات راست ناکات ، لە دلەوە بوونەوەرێکی ترە ، یان لە ناخی دا وانیە بانگەشی خراپە کاری دەکات لە ژوورە تاریکەکان ئەوەی لەسەر زمانیەتی لە ژێر زمانی شتێکی ترە ، چونکە ئەوان بۆ هەمیشە بەردەوام بە قسەلوسە کانیان بە رفتارە نەرم نیان یەکانیان بەردەوام خۆیان وەکو مەر پێشان دەدەن ، وەك ئەوە وانە گورگێك لە نێو پیستەی مەر دا بن ، ئینجا پێیان دەلێن : قال تعالى: ﴿إِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ [البَقَرَةِ : ١١] ئێوە بۆ خراپە کاری و تۆی فسادی لە سەر زەویدا دەچێنن ، ئەوانیش بە متمانە بە خۆ بوونەوەیان زۆربیٚ شەرمانە دەلێن : قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١﴾ [البَقَرَةِ : ١١] ئەوە ئێمەین کەسانی چاکە کار ئێمەین چاکسازی دەکەین ، وەکو ئێستا لەم رۆژ گارەدا روو دەدات ، گە بانگەشی چاکسازی دەکەن کەچی چوونە دەسەلات و دەسەلاتیان گرتە دەست بیٚ بەزەیانە بەردەبنە گیانی خەلکی لاواز فەقیر هەژار ، یان بانگەشەی ریفۆرم دەکەن کەچی دەسەلاتیان گرتە دەست ئەوا بیٚ بیر کردنەوە لە حەلال و حەرام ولات تالان دەکەن ، هیچ بەرپرسیاریەتێکی مرۆڤانەیان نامێنیت وەکو گورگ پەلاماری خەلکی فەقیر هەژار ونەدار دەدەن ئەوەش لە ئێستا لە چەند سالی رابردوو دا بینیمان خەلکانێك بەناوی فەقیر هەژاران هاتنە دەست هەلات جیان بەم خەلکە کرد خەلکیان هەر هەمووی برسی کرد هەژارو نەدار کرد ، لە پێناوی ئارەزووە کانی خۆیان لە پێناوی بەرژەوەندیەکانی خۆیان خۆ نەهاتووە بۆ چاکسازی بەلکو هاتوون ویرانی بکەن بانگەشەکەیان سەرتاپەی درۆیە ، چونکە ئەوانە سیفاتەکانی دوو روو یان مونافیقە کانیان تێدا کۆبوویتەوە هەرگیزاو هەرگیز چاکە کار نین بەلکو ئەوانەن فسادی سەر زەوی ئەوانەن خراپە کاری بەپادەکەن ئەوانەن دوژمنی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ، ئەوانەن دژایەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەکەن ، هەر ئەوانەن خۆێنی خەلك بە ناحەق دەرێژن ، هەر ئەوانەن خوێنی خەلك دەمژن ، چونکە ئەوانە واتە: دوو رووەکان نەروویان هەیە نەشەرم عیبە دەزانن ، دەم درێژی دەکەن بە ئاشکرا درۆدەکەن هەموو رۆژێك درۆکانیان لیٚ سپی دەبێتەوە ، چونکە قسەو رەفتاریان پێچەوانەی راستیە ..!!

قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١﴾ [البَقَرَةِ : ١١] ئەگەر ئەو دوو ڕووانە بانگەشەکەیان وا پیشان دا کە ئەو کارەی ئەوان ئەنجامی دەدەن فیتنە ئاشووب فسادی خراپەکاری نیە ، بەڵکو ئەوەی ئەنجامی دەدەن چاکە کاریە یان چاکسازیە ، ئەوا بێگومان ڕاستیە کانیان پێچەوانە کردەوە ، کە خۆیان چاکەکارن ، کەچی لە ڕاستی دا درۆش دەکەن وانیە ، کۆیان کردەوە لە نێوا کاری خراپ و پوچ و بەتاڵ نارەوادا ، باوەڕیشیان وابوو ئەوەی ئەنجامی دەدەن حەق ڕاستیە ، ئەوا بێ گومان تاوانەکەیان گەورە تر دەبیچت نقوومی تاوان خراپەکاری دەبن ، لەو کەسانەی کە تاوان خراپە کاری دەکەن ، کەچی پێ وایە ئەمە تاوانە کە ئەنجامی دەدات ، ئەوکەس نزیکترە لە هیدایەت دان بۆ گەڕانەوە بۆ لای (خوای گەورە ) ئومێدی زیاترە کە (خوای گەورە ) لێ خۆشبیت ، چونکە ووتمان لەپێشدا ئەوانە تازە ختم موری (خوای گەورە ) دراوە بەسەر دڵ یاندا و بەسەر گوێیان و بە سەر چاویاندا ، هەر وەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞ﴾ [البَقَرَةِ : ٧] بەڵێ ئەوانە دڵ یان نەخۆشە نەخۆشیەکەشیان توندترو توندتر دەبێت زیاترو زیاتریٍ دەبێت ، یان وەك باسمان کرد خراپە لەدوای خراپە ئەنجام دەدن زیاتریش دەبێت ئەمانە نخرۆی یان نقوومی گوناهو تاوان دەبن ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت قال تعالى: ﴿قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗا﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] ئینجا ئەمانە لە ژیانی دونیادا خەسارەت مەند دەبن لە ژیانی قیامەتیش دا سەرگەردان ڕەنجەڕۆدەبن ، شوێنیکی تایبەتی یان بۆ ئامادە کراوە ، ئەم شوێنەیە نە ئەوەیە لە گەڵ موسلمانان دەبن لە قیامەت دا نە ئەوەشە لەگەڵ کافران دەبن ، چونکە لە ژیانی دونیا ئەمەیان بۆ خۆیا هەڵبژارد ، شوێنیان لە دۆزەخ دایە ئەویش کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ١٤٥﴾ [النِّسَاء : ١٤٥] واتە : بەدڵنیایی مونافیقان لە خوارترین پلەی ئاگری دۆزەخن، کە (دەرك) یان (دەرەکات) پلەیە بۆ خوارەوە بە پێچەوانەی (دەرەج) یان (دەرەجات) کە پلەیە بۆ سەرەوە، بۆیە بەهەشت (دەرەجاتی) هەیە پلەکانی بۆ سەرەوەیەو دۆزەخ (دەرەکاتی) هەیە پلەکانی بۆ خوارەوەیە، خوارترین پلەی ئاگری دۆزەخ کە سەختترین سزایە بۆ مونافیقانە [ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا) ] وە نابینی کەس پشتیوانیان بێ وە ڕزگاریان بکات لە ئاگری دۆزەخ..!!

بەڵێ بیگومان دەبێت خۆمان بپارێزین لە دوو ڕوو مونافیقە کان بۆئەوەی نەبنە زیان بۆ مان ، ئەمەشە بە پابەند بوون بە فەرمانەکانی (خوای گەورە ) پێغەمبەرەکەی ﷺ دەبێت ، چونکە هەرکاتێك دوو ڕوویێك ویستی زیان بەموسلمانان بگەیەنێت ئەوا بەدڵنیایەوە بە سەر خۆی دا دەشکێتەوە بۆ خی زیانی پێدەگات ، ئیجا خۆپاراستن لە دوو ڕووەکان ناسینەوەیان بەسیفاتەکانیان دەبێت ، چونکە مونافیق و دوو ڕوو کەسانێکن کە بە زمان ئیمان ئاشکرا دەکەن ، خراپە کاری فسادی و فتنە و ئاشووب کوفر بێ باوەڕی لە دڵ و دەروونیاندا دەشارنەوە ، چونکە ئەوان هەمیشە لووت بەزو لە خۆ باوین و خۆهەڵکێشانیان زۆرە ، ئەوانە هەمیشە خراپە کاری فتنە دزی و جەردەی فسادی و درۆکردن بە ، چاکسازی ئیسلاح و ڕێخەری کار دادەنێن ، هەمیشە بانگەشە ی چەواشەکاری لە نێو خەڵك دا بلاو دەکەنەوە ، زۆر بەی کاتی حەز بە بوختان درۆ هەڵبەست و ناو زڕاندین خەڵکی بێ تاوان دەکەن ، دیارە سیفەتەکانی مونافق دوو ڕووە کان زۆرن لەدوایی دا بە دێژی باسیان دەکەین بۆ خوێنەری تەفسیری شعیب إنشا الله بە پشتیوانی (خوای گەورە).

✍ لە (عبد الله کوری عباس ) – خوا لێ رازی بێت- لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١﴾ [البَقَرَةِ : ١١] دەلێت : ئاشووب فتنە و فسادی بریتیە لە خوا نە ناسی کارەبە تاوان و خراپە کاری گوناهکاری دەکەن ).[1]

✍ لە (ابو جعفر ) لە ( ربیعی بن أنس ) لە (ابو العالیە ) – رەحمەتی خوایان لیچ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿إِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ [البَقَرَةِ : ١١] دەلێن : واتە: ئەگەر پێیان بلێن : ئاشووبە فتنە بەدفەری و فسادی و خراپە کاری مەکەن لە زەویدا ..؟! ئەلێن : تاوان لە زەویدا مەکەن . یان فەمان مەدەن بە سەرپێچی کردنی فەرمانی (خوای گەورە ) چونکە فتنەو گەندەلی و ئاشووب و فسادی و خراپەکاریە کانیان سەرپێچی فەرمانی (خوای گەورە ) بوو ، هەر کەسێ سەر پێچی فەرمانی (خوای گەورە ) بکات ، ئەوە فسادی و فتنە و ئاشووب و گەندەلی لە سەر زەمیندا بە پا کردووە ، چونکە چاکە کاری کردن یان چاکسازی کردن لە زەوی ئاسماندا بە گوێرایەلی کردنی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) یە ..).[2]

✍ لە (ابن جریر ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : خەلکی دوو روو فسادو گەندەل و خراپە کارن لەسەر زەویدا ، بەهۆی تاوان و خراپە کاریەکانیانەوە ، وە سەرپێچی کردنی پەروەردگاریان وە رۆچوونیان لەو شتانەی کە (خوای گەورە ) لێ قەدەغە کردوون و بەردەوام بوون لەسەری و لەدەست دان و فەوتانی فەرزەکانی (خوای گەورە ) وە گومانیان لە ئاینەکەیە چونکە هیچ کردارێك وەرناگیری لە هیچ کەسی مەگەر بە باوەر بوونێکی تەواو راستەقینە نەبێت دلنیایی بەراست و رەوان بێت ،وە دۆرکردنیا لە گەل خاوەن باورە کان یان موسلمانان بەوەی کە خۆیان بە باوەر دار لە قەلەم ئەدەن کە چی پێچەوانەوە دلّ یان پر لە گومان قینە و رق و دلە راوکێ ، و بەردەوام دۆستایەتی و هاوکاری کردنی بێ باوەران و وە ئەهلی کوفر دە دن ئەوانە باوەریان بە خوداو پێغەمبەران و کتێبە کانیان نیە ، لە سەر دژایەتی کردنی دۆستانی (خوای گەورە ) ئیمانداران بەردەوامن ، هەرکاتێك هەلیان دەست کەوت و بۆیان رەخسا ، ئەوە فسادی دوو رووەکانە لەسەر رووی زەویدا ، کەچی لە خۆیان دلنیان کە کردارەکانیان چاکسازیەو چاکە کردنە لە زەویدا ..).[3]

[1] - تفسير الطبري (٢٨٨/١)ص ٣٧.
[2] -اخرجه ابن ابي حاتم (٥٠/١).
[3] -تفسير الطبري (٢٨٩/١) ص ٣٨.

✍ لە (حسن صبری ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەلیٚت : دۆستایەتی کردنی باوەر داران لە گەل خوا نەناساندا لە فسادی وفتنە کردنە لە سەر زەویدا وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۚ إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ٧٣﴾ [الأنفال : ٧٣] واتە : وە ئەوانەش کە بێباوەڕن هەندێکیان پشتیوان وسەرخەری هەندێکی تریانن، وە ئەگەر ئێوەش ـ ئەی باوەڕداران ـ لەناو خۆتاندا نەبنە پشتیوان و یارمەتیدەری یەکتر ئەوا فیتنە و ئاشووبێکی گەورە لەسەر زەویدا بەرپا دەبێت لە ئاینی خوادا بۆ باوەڕداران، و خراپەکاریی بەرفراوان سەرهەڵدەدات لە ڕێگەگرتن لە ڕێگەی خوای پەروەردگار و بەهێزبوون وچەسپاندنی کۆڵەکەی بێباوەڕی ..!! هەروەها (خوای گەورە ) دۆستایەتی لە نیٚوان ئیمانداران و بیٚ باوەراندا بریوە تەوە یان جیا کردۆتەوە وەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينًا ١٤٤﴾ [النِّسَاء : ١٤٤] واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان بەخوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی هێناوە و بەڕاستان زانیوون وکردەوەتان بەشەرعەکەی کردووە پشتیوانی ودۆستایەتی نکۆڵیکەران ئاینی خوا پەروەردگار مەکەن، و وازبهێنن لەپشتیوانی ودۆستایەتی باوەڕداران، ئایا بە دۆستایەتیتان بۆ دوژمنانی خوا ئەتانەوێت بەڵگەیەکی ئاشکرا لەسەر ناڕاستی باوەڕەکەتان بەخوا پەروەردگار بدەن ؟! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویٚت : قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١﴾ [البَقَرَةِ : ١١] ئەگەر کەسیٚ پیان بلیٚ : لەم زەویەدا فتنە و ئاشووب فسادی بە ر پامەکەن ، ئەوا دەلیٚن : ئیٚمە چاکە کارین یان چاکسازی دەکەین ، واتە: دەلیٚن : ئیٚمە دەمانەویٚت ئاشتی خۆش گوزەرانی بۆ خەلك بەر پا بکەین ،لە نیٚوان موسلمانان و ئەهلی کتیٚب ).[١]

✍ لە (عبدالله بن عباس ) لە ریٚ (السدی ) لە (ابی مالك وابی صالح ) – رزاو رەحمەتی خوا یان لیٚ بیٚت – لەسەر ووتەی : ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١﴾ دەلیٚن: سەبارەت بە ﴿لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: ئەوە( فسادە یان خراپەکاری و گەندەلیە ) ئەویش : کوفرە یان بیٚ باوەریە ، کارکردن بە خراپە کاریە ).[٢]

[١] - اخرجه ابن ابي حاتم (٥٢/١) .
[٢] -اخرجة ابن جرير (٢٩٧/١).

✍ لە (مجاهد) لەرێ (ابن جریج ) – رەحمەتی خوایان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ١١﴾ دەلێت : ئەگەر سواری تاوانێك بوون یان تاوانێکیان ئەنجامدا ، ئەوا پێیان دەلێن : ئەم کارە مەکەن یان ئەم کردەوەیە ناشرینە ئەنجامی مەدەن ..!! ئەوا ئەوان دەلێن : ئێمە لەسەر هیدایەت و رێنموییی کاردەکەین واتە: پارێزراوین ..).[١]

✍ لە(ضحاك) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت: واتە: هەلدەستێت بە گۆرینی ملەتی ئیسلام یان ئاینی ئیسلام ، وە گۆرینی سوننە و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە گۆرینی کتابی (خوای گەورە ) واتە: پیامی قورئانی پیرۆزبە کەم و زیاد کردنی).[٢]

✍ لە (عبدالله بن عباس ) لەرێ (ابن اسحاق بسندە ) – رزاو رەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ١١﴾ دەلێت : واتە : ئێمە مەبەستمان چاکسازیە و إصلاح کردنە لە نێوان دوو کۆمەل لە کۆمەلی ئیمانداران و لە کۆمەلی ئەهلی کتێب لە جوولە کەو گاورە کان ).[٣]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ١١﴾ واتە: مطعین : گوێرایەلی کردن ..).[٤]

✍ لە(ابن تیمیە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : ئەوانە وا خۆیان حیساب دەکەن پێ یان وایە ئەوەی دەی کەن کە چاکە کاریە لە نێوان موسلمانان و جوولە کەکان ، ئەم کارە وەك بانگەشە یەك بۆ چاکسازی رای دەگەیەنن یان بانگە شی ئاینی پێدەکەن ، کەچی خراپە کاریان گرتووە ئەوەی کە (خوای گەورە ) قەدەغەی کردووە ئەوان ئەنجامی دەدەن ...؛ چونکە وا یان دەزانی لە هەموو کارو بارە کانیادا لە گەل نفسی خۆیان چاکەیان ئەنجامداوە ، بەلام لە لای (خوای گەورە ) بە خراپە هەژمارە کراوە ، چونکە پێچەوانەی فەرمانی کانی (خوای گەورە ) کردەوەی خراپ یان ئەنجامداوە ).[٥]

---

[١] -اخرجه ابن جرير (٣٠٠/١).
[٢] -تفسير الثعلبي (١٥٤/١).
[٣] -سيرة ابن هشام (٥٣١/١).
[٤] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٠/١).
[٥] تفسير المأثورة (١٠٣/٢).

قال تعالى: ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ١٢﴾ [البَقَرَةِ: ١٢]

﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ﴾ واتە: ئاگادار بن هەر ئەوانە ئاشووب فتنە و فساد گێرن ، یان هەر ئەوانە تۆی خراپە دەچێنن ،قال ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ١٢﴾ واتە: بەلام هەستی پێناکان ، یان شعوریان ناخەنە گەر بیرو هۆشیان لە دەست داوە هەستی پیناکەن،

﴿أَلَآ﴾ لەرووی زمانەواوی عەربیدا ، بە مانای ئاگادار کردنەوە دلنیا کردنەوە یان (تکید) دێت ، هەروەها (ضمير الفص) واتە : دووپات کردنەوە یان (حصر ) دێت . هەروەها رستەی﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ﴾ ئەوا رستەیکی دلنیایە واتە : (مؤكدة ) بە چوار دلنیایی وەك : ﴿أَلَآ﴾ بۆ ئاگادار کردنەوە ، (إن ) بۆ دلنیایی، (ضمير الفصل ) ﴿هُمُ﴾ بۆ (تعريف الخبر (المفسدون ) وەك : قال تعالى: ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ [البَقَرَةِ: ١٣] . ئەگەر سەرنج بدین بە ووشەی (الفساد: خروج الشيء الإعتدال يضاده الصلاح ) واتە: بریتیە لە دەرچوونی هەر شتێك لە خەتی نیوە راست و حالەتی هاوسەنگیی ، پێچەوانەی (صلاح) بریتیە لەوەشتە حالەتی باش و هاوسەنگی هەبێ .[1]قال تعالى: ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ١٢﴾ [البَقَرَةِ: ١٢] واتە: بەراستی هیچ خراپە کاریەك مەزنتر نیە لەو کەسانەی کە کوفر بە ئایەتەکانی (خوای گەورە ) دەکەن وە رێگری دەکات لە بلاو بوونەوەی پەیامی (خوای گەورە ) ، جا سەیر لەوە دا بە هەموو بیرو هۆش و عەقلی خۆی دەلێت من چاکسازی و یان ئێمە لە کە سانی چاکە کارین ، دەیانەوێت خواو پێغەمبەران و دۆستانی خوا و تقواداران هەلبخەلەتێنن ، لە گەل ئەوەشدا دۆستایەتی خواو دوژمانی پیچغەمبەرەکەی ﷺ بکەن ، ئەوانە وادە زانن ئەو کارەی کە ئەنجامی دەدەن چاکەکاریە یان چاکسازیە کە دیکەن ، ئایا لەم خراپە کاریەوە خراپە کاریەکی تر هەیە لەم تاوانە گەورە تربێت ..؟! بەلام بێ گومان ئەوانە هیچ لە شتێك تێ ناگە کە سودو قازانجی هەبێت بۆیان لەدونیا لە قیامەت دا ، چونکە هەست و شعوریان نیە هەستی پێناکەن بیرو هۆشیان نیە بەرانبەر خراپە کاریە کانیان ئەو فسادی گەدندەلیەی کە ئەنجامی دەدەن ، ئەگەر کەمێکیش هەستیان هەبێت ئەوا بێگومان ئەم ئایەتانەی (خوای گەورە ) دەبێتە بەلگەو حجە بە سەریانەوە ، بێ گومان هەموو تاوانێك جا بچووك بێت یان لە تاوانە گەورە کان بێت ئەوا خراپە کاری و فسادی گەدەلیە لەسەر زەویدا ، هەر ئۆمەتێك و گەلێك لە سەر زەویدا تاوان خراپە کاری بە پا بکات ، ئەوا بێ گومان دەبێتە مایە دەرد و بەلاو لە ناوچوونی رزق و رۆزی و دانەوێلە و بەروو بوومی دارو درەخت کشتوکال ، هەروەها هاتنی نەخۆشی وەك لەم چەند سالەی رابردوو دا هاتنی نەخۆشیە کی ترسناك لە هەموو جیهاندا بەناوی نەخۆشی کرۆنا کە بە ملیونان کەسی کوشت وەك: نیشانەیەکی (خوای گەورە ) یان ئاگادار کردنەوەی (خوای گەورە ) لەوەی کە فسادی و گەندلی خراپە کاری زۆر تر بووە لەم سەردەمەدا، هاتنی

[1] -تفسيري قورئانی بە رزو بە بیز ماموستا علی بابیر (٧٩/١).

بەلاو بۆ وەلاتانێك كە فساد و گەندەلی تەنگیان پی هەل چنیوە ،یاو شەر ئاژاوە و كوشتنی زۆر لە نێو خەلك دا ، بێ گومان ئەوانەی پێچەوانەی فەرمانە كانی خوا بكات ، ئەوە بە دلنیایەوە فسادو گەندەلی و خراپە كاری لە سەر رووی زەویدا بلاو دەبێتەوە ..!!

﴿وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ۝١٢﴾ واتە: مردنی هەستی گەندەلكاران و فسادو خراپەكارانە ، ئەمەش بە كەر بوونی گوێیان و ، بە كوێر بوونی چاویان بە نەخۆش كەوتنی دەلەكانیا ، ئەمەش گەورە ترین بەلایە بۆ دوو روو و گەندەلكاران لەبەر ووشەیقال تعالى: ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ۝١٢﴾ [البَقَرَةِ : ١٢] بەراستی هەست و هۆشیان لە دەست داوە ، هەربۆیە هەموو مرۆڤێك تاقی دە كرێتەوە بە خراپە چاندن لەسەر زەویدا ، هەروەها خراپەكەشی لێ شاراوە دەبێت ، لەبەر ووتەی ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ۝١٢﴾ چونكە هەموو ئەوشتانەی كە بۆ نەفسی مرۆڤ جوانە مانای وانیە كە شتێكی باشە بۆی ، بەلكو بە پێچەوانەوە دەبێتە خراپە و هەستیشی پی ناكات ، وە كو ئەم سەردەمەی ئێستا هەموو شتە كانیان بۆ خۆیان رازادۆتەوە بە چاكی دەزانن ، كەچی پێچەوانەیە خراپە كاریە كە ئەنجامی دەدن لەسەر رووی زەویدا هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًاۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُۖ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ۝٨﴾ [فَاطِر : ٨] واتە، ئایا گەر كەسێك شەیتان كار و كردەوە خراپەكانی لا جوان كردبێتەوە وەك سەرپێچیەكانی خوای پەروەردگار و بێباوەڕی و پەرستنی بت وپەرستراوەكانی تری بێجگە لە خوا و خۆشی بەجوان وباشی ببینێت، وەك ئەو كەسە وایە كە خوای پەروەردگار هیدایەتی دابێت، و چاك بە چاك ببینێت وخراپیش بە خراپ ؟ وە بێگومان خوای پەروەردگار ئەوەی ویستی لێبێت گومڕای دەكات وئەوەشی ویستی لێبێت هیدایەتی دەدات، بۆیە خۆت مەفەوتێنە بەخەفەت خواردن بۆ بێباوەڕی ئەو گومڕایانە، بێگومان خوا زانایە بەكردەوە قێزەونەكانیان ولەسەریشی بەخراپترین شێوە پاداشتیان دەداتەوە . چونكە هەركارێكی خراپە كاری كە ئەنجام دەدرێت ئەوا دڵ ی هە یە حەقی پێ تێناگە چاوی هەیە پێی نابینێ ، گوێی هەیە كەر لە بەرانبەری دا ، وە هەست و هۆشی نامێنێت و شعوری پێناكات ، واتە : هەستەكانی لە دەست دەدات وەكو ئاژەل رەفتار دەكات هەروە كو (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ۝١٧٩﴾ [الأَعۡرَاف : ١٧٩] واتە : [ لَهُمْ قُلُوبٌ لَا يَفْقَهُونَ بِهَا ] كەسانێكن كە دڵیان هەیە بەڵام پێی تێناگەن لە حەق [ وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَا يُبْصِرُونَ بِهَا ] وە چاویان هەیە بەڵام حەقی پێ نابینن [ وَلَهُمْ آذَانٌ لَا يَسْمَعُونَ بِهَا ] وە گوێیان هەیە بەڵام حەق و پەندو ئامۆژگاری پێ نابیستن [ أُولَئِكَ كَالْأَنْعَامِ ] ئەمانە وەكو ئاژەڵ وان لەوەی كە سوود لە چاو و گوێ و دڵیان نابینن [ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ] بەڵكو لە ئاژەڵیش وێڵ و سەرگەردانترن چونكە ئاژەڵ بەقسەی شوانەكە دەكات ئەگەر چی لە قسەیشی تێنەگات [ أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ] ئەمە ئەو كەسانەن كە بێ ئاگان لە ئایەتەكانی خوای گەورە. قال تعالى: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ﴾ واتە: ئاگادارو ووشیار بن ، هە ئەوانن كە گەندەل و فسیدو خراپەكارو گێرە شێوێنن ، قال تعالى: ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ۝١٢﴾ واتە: بەلام بە هۆی لووت بەرزییانەوە بەخۆیان نازانن و هەستیش ناكەن كە ئەنجامی ئەو درۆیانە هەر ئاشكرا دەبێت و دەر دەكەویت ، بە سەر یان ناچێت جار هەیە لە ژیانی دونیادا تۆلە یان لێ دە كرێتەوە، جاریش هیە (خوای گەورە ) ئارامیان لەسەر دەگرێت لە ژیانی دوا رۆژدا حەق و حیسابیان لە گەدا دەكات ..!!

قال تعالى: ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ١٢﴾ [البَقَرَةِ : ١٢] بەلام خەلكینە بە قسەو پرو پاگەندەیان هەمەخەلەتێن بەلكو ئاگادار بن و وورییابن و سەرنج بدەن كە هەر ئەوانە خۆیان گەندەلن و تۆوی فسادو گەندەلی لە هەموو روویەكەوە دەچێنن ، بەلام هەستی پیً ناكەن و گوێی پیێ نادەن ، چونكە پارە و مال و ئارەزووە كانی خۆیان دەپەرستن بەچاویان گرتوون ..!!

بەلێ بێ گومان ئاگادار بن بە دلنیایەوە هەر ئەوانە ئاشوب گێرو فیتنە گێرن و فسادو خراپە كاری بلاودكەنەوە لەسەر زەویدا ..!!

بێ گومان چاكسازی ناكرێت لەسەر رووی زەویدا تەنها بە بەرنامەو منهج وپەیامی (خوای پەروەردگار) نەبێت ، هەر كەسێك یان هەر دەستە یەك هەولبدات ئەم بەرنامەو مەنهەجەو پەیمانی (خوای گەورە ) بگۆرێت كاری پی نەكات بە بە هانەی ئەوەی كە چاكسازی دەكات جگە لەم بەرنامە و مەنهەجەی (خوای پەروەردگار ) ئەوا بێ گومان ئاشوب فیتنە فسادی خراپە كاری بە پا دەكات ن چونكە لە سەر هیدایەت نەرۆیشتووە ..؟! هیدایەتی پەروەردگاریش بەرنامە و مەنهەج و پەیامەكەیەتی كەدای بەزاندووە بۆ پێغەمبەری ئاخر زمان ﷺ ، بەلام ئەوانەی ئەم رێچەكی فسادی و گەندەلیان گرتووە بیرو هۆشیان لە دەست داوە هەستی پێناكان و لێی تێنگەن ، چونكە (خوای پەروەردگار) دورست كاری هەموو بوونەوەرێكە ، هەر خۆی دەیزانێت جۆن كاری خۆی دەكات واتە : كاربە چێیە بۆ هەموو شتێك ، چونكە هیچ كەسێك لە توانای دانیە یان ناتوانێت لە نهێنی دروست كەر یان (خوای گەورە ) تێ بگات و هەستی پێ بات ، لە راستی دا ئێمە لە نێو كارو بەرنامەی ژیانی دونیادا ئەژین ، ئەگەر بمانەوێت چاكە سازبین و چاكسازی لە سەر ووی زەویدا بەر پا بكەین ، دەبێت هەدەف و ئامانج مان سەر خستنی بەرنامە و مەنهەج و پەیامی (خوای پەروەردگار ) بێت وەكو ئەوەی كە هاتووە لە لایەن پەروەردگار بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ وە كار پی كردنی فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێت بكەینە بەرنامەی ژیانی رۆژانە مان ئینجا ، ئەوا دەبێت كاری چاكسازی لەسەر رووی زەویدا ، هەلبەتە پێچەوانەی ئەم بەرنامەیە بێ گومان دەبێتە ئاشوب فتنە و فسادی و خراپەكاری و تاوان لەسەر رووی زەویدا ، چونكە ئەگە یاسایی پەیامی (خوای گەورە ) واتە : (یاسایی قورئانی پیرۆز ) پەیرەو نەكەین و كاری پێنەكەی ئەوا بێ گومان یاسایی دونیا واتە:(یاسایی الوضعي ) هیچ سوودێكی نابێت بەلكو دەبێتە زیاتری فتنە و ئاشوب و فسادی گەندەلی لە سە رووی زەویدا ، بێ گومان یاسایی (خوای گەورە ) هەمیشە و بەردەوام بۆ هەمووسەردەمێك گونجاوە دەشێت ، بەلام (یاسایی الوضعي ) پێچەوانیە ئەم رۆ كاری پێ دەكرێت و بەیانی هەدەوشێتەوە ئەمرۆ سوودی بۆ هەندێك كە هەیە بەلام زیان بۆ زۆرینە خەلك هەیە ، واتە : ئەیاساو بەرنامەیە بۆ بەرژەوەندی تاكە كەسی یان كۆمەلێك كەس دادنرێت ، ئەمرۆ راستە بەیانی یاساكە بە سەر دەچێت ، كەواتە : (یاسایی الوضعي ) داد پەروەرانە نیە بۆ گشت خەلكی ، بەلام یاسای قورئان هیچ كات لەبەرژەوەندی تاكە كەس دانیە بەلكو گشت گیرە بۆ هەموو چین توێژێك و كومە ل گەل و نۆمەتێك و زمان و كەلتورێك دەشێت ، هەر بۆیە بەرنامە و مەنهەجی قورئان دبێتە سەر فرازی هەموو كەسێكی هۆشمەندو عاقل ژیر بۆ ژیانی دونیا بۆ ژیانی قیامە ت ، چونكە سوودمەند ترین كەس لەئەوكەسەیە لە ژیانی دونیادا كە لە سەر رێچكەو بەرنامەو مەنهەجی قورئانی پیرۆز براوت ، لێرە دا بۆمان دەردەكەوێت ئەگەر دەست بە قورئانەوە بگرین ئەوا بێ گومان دوور دەكەوینەوە لە ئاشوب وفتنە و فسادی و خراپە كاری و تاوان لەسەر رووی زەویدا ، (إنشاءالله ) لەو كەسانەدا بین كە هەلگری پەیرەوی قورئان بین ،(خوای گەورە ) دەرگای كردنەوەی قورئانی پیرۆزمان لیێ بكاتەوە بۆ تێ گەیشتن و كار پێ كردنی ..!!

﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ﴾ ئەم وەلامەی (خوای گەورە ) وەلامێکی زۆر بە هێزە توندە بۆ دوو رووە کان ، لەبەر چی وەلامێکی زۆر بە هێزو توندە ..؟! چونکە کرانەوەی بە هۆی ئامرازی (ألا) کە سودی هەیە بۆ ئاگادار کردنەوە و دلنیایی کردنەوە ، هەروەها کە باسمان کرد ئامرازی (إن) بۆ (التوکید) واتە: دلنیایی یان دووپاتکردنەوەیە ، (هم) ضمیر فصل بۆ (حصر ) و توکیدە ..!! کەواتە : ئەم ئایەتە سوودی هەیە بۆ ئەو دوو رووانە بە وەی کە ئامۆژگاری دەکرین و ئاگادار دەکرینەوە بەوەی ئێوە تۆی فسادی و خراپەکاری لەسەر رووی زەوی دەچێنن بۆ هەستی پێناکەن ، بەلام بە هۆی گومانی خراپیان و پێ یان وایە کە ئەوانە چاکە کاری دەکەن لەسەر رووی زەویدا ، هەروەها سوودی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە مرۆڤ هۆشیار دەکاتەوە لەوەی کە دڵ و دەروونی کوێر بووە بینایی لە دەست داوە ، هەر کارێکی گوماناوی خراپە ئەنجامی دەدات پێ وایە کە چاکەیە و چاکسازی دەکات ، چونکە دڵ دەروونی ختم و مۆری (خوای گەورە ) لێدراوە هەستی پێناکات کە فسادی و خراپە کاری ئەنجام دەدات دڵ دەروونی نەخۆش پیس و بۆگەنە ، چونکە مرۆڤی گەندەل ئەو کە سە یە لە زیانمەترین خەلکانی سەر زەوی ، هەر کارێك ئەنجامی دەدات تێدا زەرەمەند دەبێت و خەسارەت مەند دەبێت ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا ١٠٣﴾ [الكَهۡف : ١٠٣] واتە : وەکو ئاگاداریەك تۆ.ئەی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم.بە خەڵکی بڵێ : ئایا هەواڵی ئەو خەڵکانەتان پێبدەم کە دۆڕاوترین کردەوە ئەنجام دەدەن ؟! قال تعالى:﴿ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا ١٠٤﴾ [الكَهۡف : ١٠٤] واتە : ئەوانە خەڵکانێکن کە کردەوەکانیان هەر لەژیانی دونیادا خراپەکاری و گومڕاییە.ئەوانەش هاوبەش پەیداکەرانی گەلەکەتن و جگە لەوانیش ئەوانەی کە ڕێگای ڕاستیان وونکردووە، و لەسەر نوور و حەق نین ،. لەکاتێکیشدا پێیان وایە چاکەکارن لە کاروکردەوەکانیاندا ..!! بەڵێ دوو رووەکان پێیان وایە : ئەو کارانەی ئەنجامی دەدن کارێکی باشە ..؟!! هەم ئیمانداران و هەم کارانیش پێ رازین و پەسەندی دەکەن ، وا گومان دەکەن کارێکی چاك ئەنجام دەدان ، بەلام راست ناکەن و هەستی پێناکەن شعوریان بێ ناشێت ، قال تعالى: ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ١٢﴾ [البَقَرَةِ : ١٢] واتە: ئەوانە فسادو فیتنە گێرو خراپە کارن هەستیشی پێ ناکەن ..؟! چونکە بەهۆی کوێری بینینیان ئەمەش یەکێکە لە هەستەوەرەکانیان لەدەست داوە یان بەلکو بیست نیشیان لەدەست داوە هەروەها دڵ شیان مۆری پێوە لکاوە بەهۆی نەخۆشی دڵ و دەروونیان ، چونکە مرۆڤی دوو روو تەنها باتل ناحەق دەبینێ ، یان دڵ کوێر بووە هەستی پێ ناکات هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت قال تعالى: ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ٤٦﴾ [الحَج : ٤٦] واتە : ئایا بەدرۆدانەر و بێباوەڕانی قورەیش بەسەر زەویدا نەگەڕاون تا شوێنەوار و پاشماوەی ئەو گەلە تیاچووانە ببین ؟ و بەو هۆیەوە بەبیر و مێشکیان بیرێك بکەنەوە و پەندوەرگرن، وە گوێبیستی هەواڵ و بەسەرهاتی ئەوان ببن و ئامۆژگاری لێوە وەرگرن ؟ جا بێگومان کوێر ئەو کەسە نیە کە چاوەکانی نابینان، بەڵکو کوێری تیاچوو ئەوەیە کە بینایی نیە لە هەستکردن و هەق وڕاستیەکان نابینێت، و پەندیان لێوەرناگرێت ...!!

قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَـٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾﴾ [البَقَرَة : ١٣]

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ﴾ واتە: کاتێك پێ یان بووترایە ، ﴿ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ﴾ واتە: باوەر بهێنن وەك ئەو خەلکانە ی کە باوەریان هێناوە ، ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ﴾واتە: دەیان ووت : چۆن ئێمە باوەر بهێنین ..؟! ﴿كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ واتە: وەك ئەو گێل و نەفامانەی کە باوەریان هێناوە ،﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ واتە: بێدار بن یان ئاگادار بن کە بەراستی هەر خۆیان گێل و نەفامن ، ﴿وَلَـٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾﴾ واتە: بەلام هیچ شتێك نازانن ..!! قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَـٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾﴾ [البَقَرَة : ١٣] واتە: کاتێك پێیان دەوترێت : وەرن باوەر بهێنن وەکو چۆن خەلکی باوەریان هێناوە ، ئەوان دەلێن : ئایا ئێمە باوەر بهێنین وەکو چۆن گێل و نەفامەکان باوەریان هێناوە ..؟! دیارە خۆیان زۆر پی هوشیارو عاقلە ، ئەهلی ئیمان و باوەریان پی نەفام و گیلە ، هە ر بۆیە (خوای گەورە ) ختم یان مۆری بە دلّ یان دا لکاندووە ، کە ختم و مۆری گێل و نەفامی بێ عەقلی ناوە بە سەر دلّ یاندا ، وە ك دەفەرموویت : ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَـٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾﴾ واتە: نەخێر ئاگادار بن هەر ئەوان واتە دوو رووەکان گیلّ و نەفام و بێ عەقلن ،بەلام پێ نازانن ..!! ئەگەر سەرنجێك بدەینە ووشەی ﴿ٱلسُّفَهَآءُ﴾ واتە : مانایی( گێل و نەفام و کەم عەقلە کان ) ، یان (السفهُ: خفة في البدن ، وثوب سفيه : رديء النسج واستعمل في خفة النفس النقصان العقل ) واتە: ووشەی (السفه ) بەمانای لاشە یان جستە یان بدن سووکی دێت ، یان قوماشێك زۆر باش نەچینرابێت (سفیه) پێ دەوترێت ، واتە : باش نەچێنراوە سووکە ،یان سەنگی زۆر کەمە ، پاشان بەکار هێنراوە بۆ سووکی یان کەم سەنگی دەروون یان نەفس ، هەر لەبەر عەقلی سووکی ، یان کەم عەقلی ، چونکە عەقل بریتیە لە حەقیقەتی مرۆڤ یان لە مێشکی مرۆڤ ، هەر بۆیە (خوای پەروەردگار ) ناوی لە عەقل ناوە (لب) یان کرۆك یان کاکل هەروەك دەفەرموویێت قال تعالى: ﴿يَـٰٓأُوْلِي ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾﴾ [المَائـِدَة : ١٠٠]واتە : [ فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ ] ئەی ئەو کەسانەی کە خاوەن عەقلّ و ژیرن تەقوای خوای گەورە بکەن و کردەوەی چاك و حەلالّ هەلّبژێرن و لەگەلّ پیاوچاکاندا بن و خۆتان لەحەرام بپارێزن [ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (١٠٠) ] بەلّکو سەرفرازی دونیاو قیامەت بن..!! واتە: بۆ خاوەن عاقلان ، چونکە عەقل لە کاکلی مرۆڤە و مرۆڤ کە عەقل ی بە کارنەهێنا ، وەك گوێزی بێ کاکل وایە کە کاکلی نەبێت یان وە ك کەلە سەری بێ مێشك وایە ئەگەر بەکاری نەهێنێ .؟! هەروەك دەلێن : (فكل لب عقل وليس كل عقل لب) واتە: هەموو ناوکێك یان کرۆکێك یان کاکلێك عەقل ی هەیە ، بەلام هەموو عەقلێك ناوکی یان کرۆك یان کاکلی نیە ..؟!

بە لام ئەگەر بروانینە ئەم دوو ووشەیە یەکەمیان لە ئایەتی پێشتر دا هاتووە قال تعالی: ﴿لَّا يَشۡعُرُونَ ۝١٢﴾ [البَقَرَةِ : ١٢] بەلام دووەمیان دەفەرمووێت قال تعالی: ﴿لَّا يَعۡلَمُونَ ۝١٣﴾ [البَقَرَةِ : ١٣] واتە : لە ئایەتی یەکەم دا ﴿لَّا يَشۡعُرُونَ ۝١٢﴾ واتە : ئەوەی کە مرۆڤ تەماشادەکات و هەستی پێ دەکات وەك پێنج هەستەوەرەکەی مرۆڤ درکی پێ دەکات واتە شعوری پێدەکات ، ئایا کە کێ چاکە کارە یان کێ خراپە کارە ئەمانە دەگەرێتەوە بۆ هەستە وەرەکان ..؟! پێویستی بە هەست کردن دەکات ، بەلام ئەوەی تریان ﴿لَّا يَعۡلَمُونَ ۝١٣﴾ پێویستی بە علم زانین دەکات ، ئەویش لەریگای ئەزموون تاقی کردنەوەکانی ژیان گەران بەدوای علم زانست بۆ ئەوەی بەدوای ناسین و زانینی دەقەکانی زانستی شەرعی کەوین ئەوەی کە (خوای گەورە ) رەوانەی کردەوە بۆ پێغەمبەرەکە ﷺ ئەوەش دەبێت بزانین کە کێ باوەری هەیە و کێش باوەری نیە ..؟! ئەوا پێویستی بە زانیاری تەواوی علم زاستی شەرعی هەیە، بۆ ئەوەی لەریگای زانست و دەقە ئاینە کانەوە چاك و خراپ باوردارو بێ باوەرو لێك جیا بکەینەوە ، یان هەر لە ریگای زانینەوە دەبێت حەق باتل لێك جیا بکەینەوە ، بۆیە دەبێت بەدوای زانستی شەرعی بکەوین بۆئەوەی سەرفرازبین ، نەبینە یەکێك لەو کەسانەی کە علم و زانست مان نەبێت ، هەروەك (خوای گەورە ) بە دوو رووەکان دەفەرمووێت : ﴿لَّا يَعۡلَمُونَ ۝١٣﴾ واتە : هیچ نازانن ..!! وەکو (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿إِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ﴾ [البَقَرَةِ : ١٣] واتە: ئەگەر سەرنج بدەین بەم ئایەتە دا کە پیتی (کاف ) واتە : بۆ لێکچوواندنە ، واتە : ئەگەر پێیان بوترێت ئیمان بهێنن وەکو ئیمان هێنانی خەلك واتە: وەك ئیمانی هێنانی هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆنموونە وە کو ( علی ، ابو بکر ، صهیب ، بلال ، عمار ) باوەرێك کە لە دل و رووالەت دا تەسلیم و دامەزراو بێت وەکو هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەموو مەرجێکی ئیمانی تێدا بەدی بکرێت ، هەر لەبەر ئەمەش ئەمە بە دوو رووەکان یان مونافیقە کان ووترا ..؟! چونکە باوەر هێنان یان ئیمان هێنان تەنها ووتە نەیە بە تنها بەلکو دەبێت بە دڵ و ، بە ووتە و زمان و ،بە کردەوەی لاشە یان جەستە بەسەلمێنی کە ئیمانداری ..!! چونکە ئەگەر ئەم سێ یانە بە یەکەوە نەبێت ئیمانەکە سوودی بۆت نابێت ، قال تعالی: ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ [البَقَرَةِ : ١٣] لێرەدا ووشەی ﴿أَنُؤۡمِنُ﴾ بە شێوەیەکی (الاستفهام للإنکاری و النفی للتحقیر ) واتە: ئایا ئێمە ئیمان بهێنین وەك : ئیمان هێنانی ئەم خەلکە گێل کەم عەقلە ..؟! هەروەها (همزە) ی (الاستفهام ) هاتووە ، واتە: بە شێوەیەکی نەرێ یان نەفی پرسیار باسکراوە ، نەرێ پرسیاری بەهێز ترە لە نەرێ بە تەنها ، بۆ نموونە کەسێك دەلێت : ئیمان ناهێنم ..!! یان کەسێکی تر دەلێت ئایا من ئیمان بهێنم ..؟! بە شێوەیەکی پرسیار کردن دەلێت : من ئیمان بەهێنم ، بەلکو بە شێوەی پرسیار کردن یان (استفهام ئینکاری بەهێز ترە ) چونکە ئیمان هێنان لە لای کەسە کە مەحال و گالتە پێ کردن و کەم نەفامی تێدا بەدی دەکرێت ، بەلێ لەم ئایەتەدا کەم عەقل ە گێل ی (حصر ) کردووە لە دوو روو یان مونافیقە کان چونکە ئەوەی ئیمان و باوەر نەهێنی ئیلا کەم عەقل و گێلە..!!

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت: قال تعالى: ﴿فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٨٢]واتە : هەگەر ئەو کەسەی کە قەرزت لەلایەتی کەسێکە سەفیهە زۆر عەقڵی تەواو نیە ناتوانێ تەسەڕوف و هەڵسوکەوت بکات..!!هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویّت : قال تعالى: ﴿وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥ﴾ [البَقَرَةِ : ١٣٠] واتە: کێ هەیە لە دینی ئیبراهیم کە دینی تەوحیدە لابدات وە نەیەوێ و ڕەتی بکاتەوە ئیلا مەگەر کەسێك گێل و نەفام و کەم عەقڵ بێت و ستەم لە خۆی بکات..!! بەلێ بێ گومان ئەوانە واتە : دوو ڕووەکان پێیان بوترێت : ئیمان بهێنن وەك جۆن ئەو خەلکە ئیمانیان هێناوە ..!! ئەوا دەلێن : ئێمە ئیمان بهێنن وەك ئەو خەلکە نەفام گێلّ و کەمژانە ..؟! واتە: بێ گومان لە گەل هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ یانە ، کە ئەوا بە گێل نەفام و گەمژە و کەم عەقل دەزانن ..!! بەلام لە راستی دا هەرگیز وانیە چونکە هاوەلانی پێغەمبەر ﷺ بە رووح و بەگیان خزمەتی ئەم ئیسلامەیان کردووە ئیمانێکی راستە قینە و دامەزراو بێ کەم و کوری یان هەبووە ، ئەوان واتە ئەو کەسانەی کەباوەریان هێناوە لە هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە شەو بەرۆژ سەختیان بینیوە رێگای سەختیان بریوە بۆ بلاو کردنەوە ئەم ئاینە پاك یان بۆ بلاو کردنەوە پەیامی حەق پەیامی قورئانی پیرۆز کەچی ئەوانیان بە گێل گەمژە داناوە ..؟!! لە م رۆژگارەی ئێستاش دا ئەو دوو رووانە یان مونافقە کان وموڵحیدەکان و کافرە کانی ئەم سەردەمە یان علمانیەکان و شوعویەکان و مارکسە کان ئەوانەی کە هاورەگەز خوازن دەلێن : ئاینی ئیسلام کۆن بووە بۆ ئێستا دونیا پێشکەوو ناگونجێت ئەوەی ئیسلام کاری پێدەکان کۆنە پەرستیە ..؟! وە ئیسلام بە نەفامی گەمژەیی جەهالەت حیساب دەکەن ..؟! کاتێك برایەکی موسلمان ووتە و گوفتاری دەبێت لە سەر دین ئاینی ئیسلام ، ئەوا زۆکەس لەو کەسانەی کە باسمان کرد بە نەزان گەمژە ناوی دەهێنن پێ دەلێن : تۆ خەریکی چیت دانیشە لەمالی خۆت وازی لێ بێنە بۆچی خۆت خەریکی ئەو ئیشانە دەکەیت شێت بوویت لێت گۆراوە یان ئەو کەسانەی ئاینی ئیسلام بلاودەکەنەو بە کەسانی گەمژە بێ عەقل و نەفام ساویلکە ناوی دەبەن ..؟! یان بەبراو خۆشکە موسلمانەکانمان دەلێن : بەراستی ئێوە دواکەوتوون نازانن ژیان بکەن خۆتان خەریکی چی کردووە ..؟! برۆن وەك فلان فیسکە زانا زیرەك ووریا بن ..!!، کەچی زانا و زیرەك ووریان لەلای ئەوان سەختەچیەتی درۆکردن و فێل بازی و خیانەت و ناپاکی و بەدرەوشتی داوێن پیسی و دزینی ملك و مالی دەولەت ناپاکی لە ئەمانەت وەرگرتن دەولەتە ..؟!،ئەلێن : بۆچی بۆخۆت مالی حەرام ناخۆیت کە تۆ گەمژە نێت یان نەفام نیت ..؟!!، ئەمانە و چەندین بەدرەوشتی تریش لەلای ئەوانەی دوو رووە کان یان مونافیقە کان و مولیحدە کان دزو جەردەکان فسادو گەندەلکارن ئەمانە کاری پاش و بەجێ و، وە زیرەك و ووریا ووشیاریە کە کەمژە و نەفام نێن ..؟! پرسیار ئایا بەدرەوشتی دزی داوێن پیسی خیانەت کردن و ناپاکی کردن لە وەلاتدا یان لە دولەت دا ، یان شخص پەرستی و یان بن پەرستی یان گومرا بوون و یان دواکەوتنی ئاداب و ئەخلاقی بەدرەوشتی رۆژئاوا ئەمانە زیرەکین یان ووریاو پێ شکەوتنە ، یان ئەگەر برای موسلمان لەسەر حەق راستی بێت راستگۆ و پاك و خاوەن رەوەشتی بەرزی مرۆڤایەتی بێت شەرم بکات لە کاری خراپەکاری ،دزوجەردەی نکات خۆی بەدوور بگرێت لە هەموو حەرام کراوێك یان خۆی بەدوور بگرێت لە هەموو خراپە کاریەك ئایا ئەم دوا کەوتنە یان گەمژییە یان ساویلکەییە یان گێلاتیە یان فە قیریە بەمانای نەزان..؟! بێ گومان وانیە ، ئەوانە خۆیان گەمژەو نەفام گێل سەر سەریی و سەر خۆشی ئەم ژیانەن لە بەر خۆشی برابواردنی خۆیان ، غافل بێ ئاگان لەم جیهانە، چونکە تەنها دونیایان خۆش دەوێت رقیان لە مردن قیامەتە ، چونکە حیساب کتابی راستەقینە ئەوان لەوێدایە ..؟!!

لەم رۆژگارە دا کەسی خراپەکار ئەوا بە زانا و زیرەك ووریا قارەمان حیساب دەکرێت ، چونکە وورده وورده سەردەمی جەهالەت دەگەرێتەوە بۆ ناو کۆمەلگای مرۆڤایەتی ئەوەی نەزانە بە زاناو بەلیمەت دادنرێت..؟! ئەوەشی زانا هۆشمەندە بە گەمژە و نەفام و کەم عەقل دادەنرێت.؟! زانایانی ئاینی ئیسلام یان لە کونجی زیدانەکاندان یان لە ژوورەکانی خۆیاندن بەبێ دەنگی ژیان دەکەن یان ئەوە تا دەیان کوژن یان ئەوەتا بۆ هەتا هەتایی لە زیدان دەیان هێلنەوە یان ئەوە تا ئازاریان دەدن بە جەستەی بە دەروونی ، بەلام لە رۆژگارە دا نەزان گەمژە لاف لێدەدن ناکەس بەچە دەسەلاتیان کرتووە فەرمانرەوایی وەلاتانن ، ئەوانە ی کە نەفام کەم عەقل کەم ئەزموون و کەم تەمەن کاربەدەستن فەرمان بەسەر زانایان دادەدن ، دژی ئاپینی ئیسلام دەوستنەوە دەلێن: ئەم ئاینە بۆ ئیستا نابێت.؟! ئەوانەی شوێن کەوتووی ئەم ئاینە هەر هەمووویان گەمژەو ساویلکە نەفامن ..؟! ئەوە ئێمەن بیرمەندو زانا ئێمە خاوەنی زانست مەعریفەتین ..؟! بەلام درۆ دەن هەر ئێوەن خەسارەت مەندی دونیا قیامەت هەرئێون نە فام گەمژەن ، هەرئێون دوو رووەکان؟!

بۆیە ئەوان دەلێن : رەوشت بەرزی ئیسلام خواناسی گرتنە بەری رێجکەی پێغەمبەران (علیه السلام ) هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ وە شوێنکەوتوانی وە پیاوچاکان بە گەمژەیی دواکەوتووی نەفامی دادەنێن ..؟! بەلام (خوای گەورە ) لەوەلامیاند دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ۝١٣﴾ [البَقَرَةِ : ١٣] واتە : ئاگادار بن ئەوانە هەر خۆیان گێل گەمژە و نەفام و کەم عەقل و بێ حورمەت و بێ ساسەتن ئەوەندە نەفامن وە گەمژەن ئەو راستیە نازانن ، ئەگەر نەزانن نەبونایە ئاورێکیان لە بێ باوەرانی پێش خۆیان وەر دەگرت، ئا بەم شێوەیە رەفتاریان نەدەکرد ، بەراستی ئەوانە بە خۆیان ئەوەندە گێل گەمژەن نازانن کە خۆیان کەوتوونەتە چ کۆمێکەوە و لە چ بارودۆخێکی خراپ نا هەبوار دان ، چونکە بە خۆیان سەریان لێ شێواوە گومراو سەرگەردانن ، چارەنووسی خۆیان وون کردووە نازانن دوا رۆژیان بەرەو کوێ دەیان بات ..؟! ئەگەر عەقل ژیریان بەمە بشکابایە ئاوا لە ژیانی دونیا رەفتاریان نەدەکردن چارەنوسی باش چاوەریان دەبوو..!! بەلام بەهۆی ئەو رفتارە خراپانەی کە کردوویان یان ئەم خراپە کاریە وتاوان زولم ستەمەی کە کردوویانەلەژیانی دونیادا، دەبیرە چارەنووسی دوا رۆژیان هەر ئەم شوێنەیە کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ۝١٤٥﴾ [النِّسَاء : ١٤٥] واتە : بەدڵنیایی مونافیقان لە خوارترین پلەی ئاگری دۆزەخن، کە (دەرك) یان (دەرەکات) پلەیە بۆ خوارەوە بە پێچەوانەی (دەرەج) یان (دەرەجات) کە پلەیە بۆ سەرەوە، بۆیە بەهەشت (دەرەجاتی) هەیە پلەکانی بۆ سەرەوەیەو دۆزەخ (دەرەکاتی) هەیە پلەکانی بۆ خوارەوەیە، خوارترین پلەی ئاگری دۆزەخ کە سەختترین سزایە بۆ مونافیقانە [ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا (١٤٥) ] وە نابینی کەس پشتیوانیان بێ وە رزگاریان بکات لە ئاگری دۆزەخ..!!

هەندێك سوودی ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئانی ئایەتی (١٣) ی سورەتی (البقرە ) :

١-سەر سام بوونی مونافیقە کان بە نەفسی خۆیان لە بەر ووتەی ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ .

٢-بانگ کردنی مونافیقە کان بۆ خێرو چاکە سوودی نیە لەبەر ووتەی ﴿قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ﴾ .

٣-مەبەستی ئیمان هێنان بە کردەوەی باش (توقیف ) دەبێت ئیمان وەکو ئیمان ئەم خەلکە بێت ، لێرەدا مەبەستی خەلك واتە: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئیمانێکی راست و دروست و دامەزراویان هەبوو ، لەبەر ووتەی: ﴿كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ﴾ .

٤-زۆری گومرایی مونافیقە کان ، کە چەندە ئیلحاد و ئینکار بوون ، یان نەکۆلیان لە حەق دەکرد لەبەر ووتەی ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ﴾.

٥-مونافیقە کان بە گالتە جاریەوە بە ئیمانداران دەلێن : ئێوە گەمژە و گێل کە ئیمانتان هێناوە لەبەر ووتەی: ﴿أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ .

٦- جێگیر کردنی نەزانی نەفامی بۆ مونافیقە کان چونکە (خوای گەورە ) نەرێ یان نەفی زانستی ئەوانی کردووە لەبەر ووتەی ﴿وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ١٣﴾ .

٧- هەر کەسێك ئیمان و باوەر نەهێنێت بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوا بەدلنیایەوە کەم عەقل گەمژە و گێلە لەبەر ووتەیقال تعالی: ﴿وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥ﴾ [البَقَرَة : ١٣٠]. واتە : کێ هەیە لە دینی ئیبراهیم کە دینی تەوحیدە لابدات وە نەیەوێ و ڕەتی بکاتەوە ئیلا مەگەر کەسێك گێل و نەفام و کەم عەقڵ بێت و ستەم لە خۆی بکات..!!

٨-(خوای گەورە ) بۆ هەمیشە بەرگری لە ئیمانداران دەکات لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ٣٨﴾ [الحَج : ٣٨] واتە: بەدڵنیایی خوای گەورە بەرگری لە باوەڕداران ئەکات و دەیانپارێزێت لە نەخشەو پیلانی کافران [ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ (٣٨) ] بەدڵنیایی خوای گەورە کەسانێکی خۆش ناوێت کە زۆر خیانەتکارو ناپاك بن وە زۆر کوفر بکەن..!!

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رە حمە تی خوای لی بیت – لە سە ر ووتە ی قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ﴾ [البَقَرَةِ : ١٣] دەڵێت: ئەم ئایەتە دا بەزیبە سەر (منذر بن معاذ ) ، (أبي لبابة ) ، (معاذ بن جبل ، (أسيد ) ، دەڵێت: جوولە کە کان ﷺ بەراست زانی کە پێغەمبەری خوایە ﷺ ، هەر وەکو بەراست زانینی (عبدالله بن سلام ) هاوەلە کانی ).[١]

✍ لە (ابن عطية ) – رە حمە تی خوا ی لی بیت – دەڵێت : ئەم ئایەتە دا بەزیوە لە سەر منافیقە جوولە کەکان ، مەبەست لە خەڵکی ئەویش مەبەستی لە (عبدالله بن سلام ) بووە کە یەکێك بوو لە نەوەی ئیسرائیل تسیلم بوو ، وە ئیمانی هێناوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ ).[٢]

✍ لە (عبدالله بن عباس) – خوا لی رازی بیت – لە ری (ابي روق ) لە (ضحاك ) – رە حمە تی خوا یان لی بیت- لە سە ر ووتە ی قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ [البَقَرَةِ : ١٣] دەڵێت : ئەگەر پیان بووترایە باوەر بهێنن وەکو باوەرهێنانی هاوەلانی ﷺ ، ووتیان : ئەوە پێغەمبەر و نێردراوی خوایە ، وە ئەوەی کە بۆی دابەزیوە لەسەر حەق و راستیە ، وە باوەر بهێنن بە رۆژی دوایی یان قیامەت ، وە ئێوەش زیندوو دەکرینەوە لەدوای مردتان ).[٣]

✍ لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – لەسەر ووتەی : قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ﴾ [البَقَرَةِ : ١٣] دەڵێت : باوەر هێنان وەکو (ابو بکر ) ، (عمر ) (عوسمان ) ، (علی ) ... ).[٤]

✍ لە (عبدالله بن عباس) – خوا لی رازی بیت – لە ری (ابي روق ) لە (ضحاك ) – رە حمە تی خوا یان لی بیت- لە سە ر ووتە ی قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ [البَقَرَةِ : ١٣] دەڵێت : ئەوان واتە : دوو رووەکان دەڵێن : ئێمە بلێن وەکو ئەم گەمژە و گێل و کەم عەقلانە ..؟! واتە : مەبەستیان هاوەلانی ﷺ ، کە ناکۆکیان لەگەل ئایینە کە یان دا هەیە ..).[٥]

---

[١] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٠/١).
[٢] -ابن عطية (١٢٣/١).
[٣] -اخرجه ابن جرير (٣٠٢/١) ، و ابن ابي حاتم (٤٥/١).
[٤] - اخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (ترجمة عثمان بن عفان ) ض ١٦٩).
[٥] اخرجه ابن جرير (٣٠٤/١).

✍ له (ابی العالیه ) لەرێ (الربیع بن أنس ) – رەحمەتی خوا یان لێ بێت – له سەر ووتەی: قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ دەلێت: مەبەست لێی ، هاوەلانی محمد ﷺ ..).[١]

✍ له (ابن جرير ) – رە حمە تی خوای لی بیت – دەلێت : هاتنی ووتەی﴿ٱلنَّاسُ﴾ واتە: بەم ووتەی دەناسرێت ، واتە : ناسراوە بە هۆی لکاندنی (الف ) و (اللام ) واتە : معرفه یان ناسراوە ، ئەوە مەبەستی لێ هەندێك له خەلكی نەوەك هەموو خەلك ، چونكە لە لای ئەوانە ناسراوە ، پیان دەلین: بەو نیشانانەی کە لە بەر چاویان دا هەن ، هەر وەکو مانای ئەوەیە ئێوە باوەر بهێنن هەر وەکو ئەم خەلکە باوەریان هێناوە ، دەناسرێن بە ئەهلی (الیقین ) یان باوەرداری بتەوە ، وە باوەر هێنان بە (خوای گەورە ) و بە پێغەمبەرەکەی محمد ﷺ ، وە بە وەشی کە لە لایەن (خوای گەورە ) هاتووە ، وە باوەر هێنا بە رۆژی دوایی ...).[٢]

✍ له ( مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : اليهود واتە : جوولەکەکان : ﴿أَنُؤۡمِنُ﴾ واتە : بە راست زانین یان باوەر هێنان ﴿كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ واتە: نە فامی یان گێل و گەمژەیی ، واتە: (عبدالله بن سلام )و هاوەلانی ...).[٣]

✍ له (عبدالرحمن بن زيد بن أسلم ) لەرێ (ابن وهب ) لەسە ووتەی قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ دەلێت: ئەمە ووتەی دوو رووەکانە یان مونافیقەکانە ، مەبەستیان لە : هاوەلانی پێغەمبەری خوایە ﷺ ، ...).[٤]

✍ له (عبدالله بن عباس) – خوا لی رازی بیت – له ری (ابي روق ) له (ضحاك ) – رە حمە تی خوا یان لی بیت- له سە ر ووتەی قال تعالى: ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ دەلێت : واتە: نەفامی و گەمژەیی ، قال تعالى: ﴿وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ١٣﴾ واتە: بێ عەقلیان نیە وەك ئاژەل وان نەزانن ..).[٥]

---

[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤٦/١).
[٢] - اخرجه ابن جرير (٣٠٢/١).
[٣] -تفسير مقتل بن سليمان (٩٠/١).
[٤] - اخرجه ابن جرير (٣٠٤/١).
[٥] - اخرجه ابن جري (٣٠٥/١) و ابن ابي حاتم (٤٦/١).

قال تعالى: ﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤﴾ [البَقَرَة : ١٤]

﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتە : وە کاتێك ناپاکان یان مونافیقەکان بگەیشتنایە بە وانەی کە ئیمانیان هێناوە ، ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾ واتە : دە یان ووت : ئێمەش ئیمان مان هێناوە ، ﴿وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ﴾ واتە:کاتێکیش بە تەنها بوونایە لە گەل گەورە شەیتانە فێل بازەکانیان ، ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ﴾ دەیان ووت : ئێمە هەر لە گەل ئێوەین ، ﴿إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤﴾ واتە : بێ گومان ئێمە هە ر گالتە کەرین بەوان ، یان ئێمە هەر گالتە یان پێدەکەین ، یان وەك بلێن : ئێمە سووکایەتیان پێدە کەین ..؟؟!!

بەلێ وەسفێکی تری دوو روو و مونافیقەکان ئەوەیە کاتێك کە دەگەن بە ئیمانداران دەلێن : ئێمە ئیمان مان هێناوەو ، وە هەر کاتێ لەوان دا بران و دەگەن بەسەرۆك و هاورێ و دۆستە کانیان و گەورە فێلبازو شەیتانەکانیان دەلێن : بێ گومان بن ئێمە لە گەل ئێوە داین ، هەروەها دەلێن : بە گەورە شەیتانە فێلبازەکانیان ئێمە گالتەو سووکایەتی بە ئیمانداران یان موسلمانان دەکەین و یان پێیان ردە بوێرین و هیچ کاتێ باوەرمان بە رێبازو رێچکەی ئەوانەوە نیە ، واتە : (پێغەمبەری خواو ﷺ هاوەلانی یان موسلمانان )..!!

مەبەست لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەوەیە کە (خوای گەورە ) پێغەمبەرو موسلمانان وشیار دەکاتەوە بەوەی کە کارو کردەوەی دوو رووەکان یان مونافیقەکان زۆر دژوارە کارو کردەوە کانیان ، واتە: ووشیار کردنەوە یان ئاگادار کردنەوەی لەو کەسانەی کە لە گەلیاندان ، ئەوانە دوو روویان هەیە ، لە گەل ئێوە دا رووکیان هەیە خۆیان بە ئیماندار هەژمار دەکەن ، کاتێکیش دەگەن بە کافران گەورە شەیتانەکانیان روویەکی تریان هەیە ..!!

لە (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ((تَجِدُونَ مِن شَرِّ النَّاسِ ذا الوَجْهَيْنِ، الذى يَأْتى هَؤُلاءِ بوَجْهٍ، وهَؤُلاءِ بوَجْهٍ)) .[١] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : دەبینن خراپترین خەلکانێك دوو رووەکانن یان مونافیقە کانن ، ئەوانەی دەچنە لای ئەم کۆمەلە بە روویەکەوە ، وە دەچنە لای کۆمەلێکی ترەوە بە روویێکی ترەوە ..!!

واتە : دوو دەم چاویان هەیە یان دوو روویان هەیە یان قناعیان بە ستووە کاتێك لە لای کافرانن قناعەکەیان لادەدەن کاتێکیش لە لای موسلمانان قناع دەبستن ، چونکە هەندێك مرۆڤ وەك شەیتان رەفتار دەکەن دوو روویان هەیە بۆ هەمیشە و بەردەوام بانگەشەی کوفرو بێ باوەری دەکەن خراپە کاری بلاو دەکەنەوە لە نێو خەلیکدا بەو زمانە لووسانەی کە هەیانە یان بەوو ماسکانەی یان قناعانەی کە بە ستوویانە ..؟!

[١] -صحيح مسلم برقم (٢٥٢٦).

## شی کردنەوەی هەندێك لە ووشەکان:

ووشەی ﴿خَلَوۡاْ﴾ (خلا الإنسان صار خاليا) واتە : مرۆڤ لە شوێنێکی چۆلە وانی بوو یان بە تەنها بوو ، (خلي فلان بفلان : صار معه في خلاء ) واتە: دە ووترێ فلان لەگەل فلان کەس خەلوەتی کرد ، واتە : بە یەکەوە بوون لە شوێنێکی چۆل دا یان (وخلا إليه أنتهى إليه في خلوة ) واتە: بە تنها چووە شوێنێکی چۆل ..!!

ووشەی ﴿شَيَٰطِينِهِمۡ﴾ لێرەدا واتە : (رؤساهم ) واتە: سەر کردەکانیان چونکە دەلێ: (الشيطان : كل راس في الباطل ) واتە: هەر کەسێك کە سەر کردەو دەم راست بێ لە باتل یان لە ناحەقی دایە ، وە لێرە دا ﴿شَيَٰطِينِهِمۡ﴾ واتە : سەر کردە کانیان لە نیفاق یان لە دوو رووی و کوفرو بێ باوەری دا ..!!

جا لێرە دا جیاوازی هەیە لە نیچوان زانایان لەسەر ووشەی ﴿شَيَٰطِينِهِمۡ﴾ هەندێك لە زانایان پێ یان وایە شەیتان مەبەستی پێ شەیتنانی مرۆڤە کانە ، هەندێکی تر پیان وایە سەرۆك گەورە کانیانە ، وە هەندێکی تریش بۆ ئەوە چوون کە مەبەست پێ شەیتانی جنۆکەیە ، هەندێکی تریش بۆ ئەوە چوون شەیانە کائنە کان جادوو گەرەکانە ، جا بە پێ سیاقی ئایەتەکە راو بۆ چوونی یەکەم پەسند ترە ئەو لە گەل سیاقی ئایە تەکە گونجاوترە ..!!

ووشەی: ﴿مُسۡتَهۡزِءُونَ﴾ ( الهزء : مزح في خفية ) واتە: بریتەیە لە گالتە پێ کردنێکی پە نهانیی ..!!

قال تعالى: ﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤﴾ [البَقَرَةِ: ١٤] واتە: هەر کاتێك دە گەن بە ئیمانداران دەلێن : ئێمە ش ئیمانداارین (نوێژ دەکەین ، رۆژوو دەگرین ، باوەرمان بە خوا هەیە ، باوەرمان بە پێغەمبەر ﷺ هەیە ، بە لکو دەگاتە ئاستێك کە لە ئیماندارانی راستەقین خۆیان بە چاکتر دەزانن و تحدای ئیماندارانیش دەکەن ، بەلام کاتێ لە گەل گەورە شەیتانەکانیان وەکو کافران و بت پەرستەکان یان بی دینە کاندا ، راوێژو گفتوو گۆ دەکەن یان لە گەل جوولەکە گاوروکاندان راوێژو گفتووگۆ دەکەن و کۆدەبنەوە ئەوا پێیان دەلێن : دلنیا بن ئێمە لەگەل ئێوەداین ، ئێمە فەرمان لە ئێوە وەردەگرین ، نەك لە موسلمانەکان ..؟!! بەلکو ئێمە گالتە یان پێ دەکەین ..؟!! پێ یان رادە بوێرین ..؟! لە لای موسلمانەکان دەلێن ئیمان مان هێناوە ، چونکە نامانەوێت ئەوان بزان ئێمە لە گەل ئێوە داین بێ باوەرین ستەم کارو بت پەرست و پشتی ئێوە دە گرین ، بۆیە ئێمە لە ژێر فەرمانی ئێوە هەرگیز دەر ناچین ..!! تەنها مەبەستمان گالتە کردنە بە موسلمانان ،بەلێ ئەم دوو روو و مونافیقانە ئەم پیشە یانە ئەم مە هەلوێستی نامەردانە یانە بەرانبەر بە موسلمانان ئاینی ئیسلام پەیامی خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ لە ئێستا دا لەم سەردەمە ، لە رابردووشدا هەر وا بووینە ، چونکە لە بەر بەرژەوەندی خۆیان ماسك و قیناعیان بەستووە خۆیان بە دیار نەخستووە کە بە ئاشکرایی لە گەل موسلمانان بن یان ئەوە تا لەگەل کافران و بێ باوەران بن ...!!

هەروەك(خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتە: كاتێك ئەم دوو رووانە بگەیشتنایە بە ئیمانداران و هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیان ووت : ئێمەش وەكو ئێوە ئیمانمان هێناوە ..!!

قال تعالى: ﴿وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ﴾ واتە: كاتێك بە تەنها بوونایە لە گەل سەرۆكە یان سەر كردە شەیتانەكانیان لە سەرانی كوفر و جوولە كە دا ئەوا دەیان ووت : قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤﴾ ئێمە لەگەل ئێوە داین ، بەلام كە لە گەل موسلمانان داین بێ گومان ئەمە تەنها بۆ گالتە كردن رابواردنە بەوان واتە : گالتە كردن بە موسلمانان ..!! هەر وەك دوو روو و مونافیقەكانی ئەم سەردەمە لەبەر راز دلی ولاتانی گاور جوولە كە یان ولاتانی رۆژ ئاوا ، هەموو بەدرەوشتیەكی نا مرۆڤانە لە ولاتدا بلاودەكەنەوە لە ژێر ناوی جیا جیا ، بە ناو دەلێن ئیمە موسلمانین بەلام فەرمان و حكم و یاسا دادگەری تەنها لە گەورە كانیانەوە وەردەگرن ئەوانیش كە ولاتانی هاورەگەز بازان گاور جوولە كە كان هەموو ئادابێكی ئەوانە لە وەلاتدا پەیرەو دەكەن ، چونكە بەلێنیان بە سەرانی رۆژئاوا داوە كە ناپاك بن لە گەل موسلمانان خراپە كاری گەندەلی بلاو بكەنەوە لە ولاتدا بۆ خاتری رازی بوونی گەورە شەیتانەكانی ولاتانی رۆژئاوا وەكو موشریكە كان و كافران مولحیدەكان علمانیە كان شوعیە ماركسیە كان هاورەگەز بازان رێخراوەكانی بەد رەوشتی بەناوی جیاجیا، هەموو كات دوو رووەكان هاو سۆزیان بۆ دەردەبرن دۆستایەتی خۆیان بۆیان دوو پات دەكەنەوە ، بەلام لە بیریان چووە (خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ٥١﴾ [المَائـِدَة : ٥١] واتە : ەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، هەرگیز جولەكە و گاورەكان مەكەن بە هاوپەیمان و پشتیوان بۆ سەر باوەڕداران، ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە ئەوان هەرگیز دۆستایەتی باوەڕداران ناكەن، هەندێك لەجولەكەكان دۆستایەتی وپشتیوانی هەندێكی تریانن، و گاورەكانیش بەهەمان شێوە، هەردووكیان ( جولەكە و گاور ) یەكڕا و پشتگری یەكترن لەسەر دوژمنایەتی ئێوە . وە ئێوە .ئەی باوەڕداران .شایستەترن بەوەی كە هەندێكتان پشتگیری هەندێكی ترتان بكات . هەر كەس لەئێوە دۆستایەتی وپشتیوانی ئەوان بكات لەسەر باوەڕداران ئەوا دەبێتە بەشێك لەوان وحوكمی ئەوانی هەیە . بێگومان خوای گەورەش هەرگیز سەرخەری ئەو ستەمكارانە نیە كە دۆست و پشتیوانی بێباوەڕانن ..!!

ئە گەر سەرنج بدەینە ئەو ئایەتە دەبینین كە (خوای گەورە ) چۆن وەسفی ئەم دوو روو و مونافیقانە دەكات ، جەند جوان صیفەتەكانیان باس دەكات ، بزانن ئەوانە واتە مونافیقەكان یان دوو رووەكان ، بۆنموون : جۆن وەك مسرحیەك یان شانۆگەریەك سیناریو یەك بۆ خۆیان چاك دەكەن ، وە ك ئەوە وایە كە ئەكتەریكی شانۆگەری دوو دەور دەبینیت ، لە برگەیەكی شانۆ گەریەكە دەوری پیاوێكی ئیماندارو تقوادار و چاكە كار دەبینێت ، بەلام لە برگەیەكی تری شانۆگەریە كەدا دوری پاوێكی خراپە كارو مونافیق خیانەت كا ناپاك و كافرو بێ باوەر دە بینێت ..!!

هۆكاری دابەزینی ئەم ئایەتی پیرۆزە قال تعالى: ﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾ [البَقَرَةِ : ١٤]

✍ لە (الكلبی ) لە (صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) رزاو رەحمەتی خوایان لێ بێت - دەلێت : ئەم ئایەتەدابەزیە خوارەوە بە سەر (عبدالله كوری ئوبەی كوری سەلول ) و رەفیقەكانی یان هاوریٚ كانی ، ئەوە هەر لە بەر ئەوەیە كە لە رۆژێكدا چووە دەرەوە لە لایەن كۆمەلێك لە هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشوازی لێكرا ، (عبداللە ی كوری ئوبەی ) ووتی : چۆن وەلامی ئەو گەمژانە یان گێلٚ و نەفامانە دەدەمەوە كە وە ، مەبەستی پێ هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ، هەر بۆیە رۆیشت و دەستی (ابو بكر صدیق ) — خوا لیٚ رازی بێت- گرت ، ووتی : بە خێر بیت ئەی گەورە راست گۆی بنی تیم ، وشیخ ئیسلام ، وە دووەمیش پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەشكەوت دایە ،تۆ نەفسی خۆت و مالە كەشت كردە قوربانی بۆی ،لە پاشاندا دەستی (عمر)ی گرت — خوا لی رازی بێت — ووتی : بە خێر بێت ئەی گەورەی بنی عدی بن كعب ، الفاروقی بەهێز بۆ دینی (خوای گەورە ) ، نەفسی خۆی مالەكەشی كردە قوربانی لە پێناوی پێغەمبەری خوا ﷺ ، پاشان دەستی (علی ) گرت ، (خوای گەورە ) رێزو تكریمی لە رووخساری گرتووە ، (عبدالله ی كور ئوبەی ) ووتی : بە خێر بێت ئەی كوری مامی پێغەمبەری خوا ﷺ یان ئەی هاوسەری كچەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، گەورە بنی هاشم جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ . پاشان لە وان دابرا جیا بوویەوە ، (عبداللە كوری ئوبەی ) گەورە مونافیق یان دوو روو لە لای هاوریٚ كانی دا ووتی : ئایا منتان بینی جۆن كارێكم كردن ..؟! ئەگەر ئێوە بینیتان وەكو من ئەم كارە بكەن ..!! هەر بۆیە ئێوە باش ستایشی بكەن ..؟! ئینجا موسلمانان گەرانەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەواله یان بۆ گێرایەوە كە (عبداللە كوری ئوبەی ) جۆن نمایشی خۆی ئەنجام دەدا بە هاوەلان وپێغەمبەری خوای هەلدە ووت بەدرۆ نیفاقی خۆی ، لە پاشاندا (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دا بەزاندە خوارەوە كە دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤﴾ [البَقَرَةِ : ١٤] ..).[1]

✍ لە ریٚ (جوبیر ) لە ( ضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) — رزاو رەحمەتی خوایان لیٚ بێت — دەلێت : ( عبد الله كوری ئوبەی كوری سەلول خەزرەجی ) گەورەی دوو رووەكان یان مونافیقەكان ، لە گروپ یان لە كۆمەل قبیلە ی (سعد بن عبادە ) خۆ گەیاندە لای (سعد) ووتی : بەلیٚ بۆ ئاین كە ئاینی محمد ﷺ ، بەلام كاتێك كە دەگەرایەوە لای گەورە سەركردەكانی كافران ، دەی ووت : زۆر بە توندی دەستان بە ئاینی باب و باپیراتان بگرن واتە: دین جاهیلیەت دین نەفامی ، ئینجا (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دا بەزاندە خوارە وە كە دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤﴾ [البَقَرَةِ : ١٤] ..).[2]

[1] اخرجه الواحدي في أسباب النزول ص(٢٤/١).
[2] -اخرجه الثعلبي (١٥٥/١).

✍ لەڕێ (السدی ) لە ( ابی مالك و ابی صالح ) لە ( عبدالله بن عباس ) – رزاو ڕەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا﴾دەڵێت : واتە: گەورە شەیتانە كان ، یان سەرۆك و سەركردە كانی كافران یان بێ باوەڕان ..).[١]

✍ لەڕێ (ابی روق ) لە (ضحاك) لە ( عبدالله بن عباس ) – رزاو ڕەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا﴾ دەڵێت : كاتێك پیاوێك لە پیاوە كانی نەوەی جوولەكە بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتبان ئەوا دەیان ووت : من لە سەر ئاینی ئێوەم .؟! وە ئەگەر بە تەنها بوونایە لە لای هاوڕێ شەیتانەكانیان ئەوا دەیان ووت : ئێمە لەگەڵ ئێوەین ..).[٢]

✍ لەڕێ (الكلبی ) لە (ابی صالح ) لە ( عبدالله بن عباس ) – رزاو ڕەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا﴾ واتە: ئەوانە لە دوو ڕووەكانی ئەهلی كتێب بن یان جوولە كە كانی شاری مەدینە كە خاوەنی كتێب بوون ، بۆیە باسی ئەوە یان دەكرد كە بۆ ستایش كردنە كەیان گاڵتەپێكردنە لە لای شەیتانە كانیان باسیان دەكرد كە ئێمە بۆ گاڵتە پێ كردن ستایشیان دەكەین ..؟! وە دەشیان ووت : ئێمە لە گەل ئاینی ئێوەین ..؟! ﴿إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤﴾ بەلام ئێمە گاڵتە بە هاوەڵانی ﷴ دەكەین ..).[٣]

✍ لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی ﴿وَإِذَا خَلَوۡا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمۡ﴾ دەڵێت : پێنج كەس لە كۆمەڵی جوولە كەكان ، وە: (كعب بن الأشرف ) سەر كردەیی جوولەكەكانی شاری مەدینە ، وە (ابو بردة ) لە بني أسلم ، وە (عبد الدار ) لە بني جهينة ، وە (عوف بن عامر ) لە بني أسد ، وە (عبدالله بن السوداء) لە شام ، وە هیچ قەشەیەك نیە لە گەل شەیتان نەبێت یان شوێن كەوتووی شەیتان نەبێت ..).[٤]

✍ لە ڕێ (ابی نجیح ) لە (مجاهد ) – ڕەحمەتی خوایان لێ بێت – لەسەر ووتەی: ﴿وَإِذَا خَلَوۡا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمۡ﴾ دەڵێت : مەبەست لێ هاوەڵەكانی دوو ڕووەكان موشریكانە یان هاوبەش بڕیاردانەكان ..).[٥]

✍ لە ڕێ (السدی ) لە (ابی مالك غزوان الغفاری) – ڕەحمەتی خوایان لێ بێت – لە سەر ووتەی ﴿وَإِذَا خَلَوۡا۟﴾ دەڵێت : واتە : بەردەوام بەنهێنی و شاراوەیی شوێن كەوتووی ﴿إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمۡ﴾ واتە: سەركردە وسەرۆكی جوولە كە كان ، (كعب بن الاشرف ) بوو .. ).[٦]

---

[١] - اخرجه ابن جرير (٣٠٧/١).
[٢] -الخرجه ابن ابي حاتم ( (٤٦/١-٤٧).
[٣] - اخرجه البيهقي في الاسماء ولاصفات (١٠١٨).
[٤] -تفسير الثعلبي (١٥٦/١)و تفسير البغوي (٦٧/١).
[٥] -تفسير مجاهد ص١٩٦.
[٦] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤٧/١).

✍ لە (ابن جریر ) — رەحمەتی خوای لێ بێت — دەڵێت : (الشیاطین ) واتە: هەر شتێك كە خراپە و لاساریەكەی لە رادە بەدەر بێت ، ئەوا شەیتانە ، هەروەها شەیتان لە جنۆكە مرۆڤیش دا هەیە ، وەكو (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿كَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا﴾ [ٱلْأَنْعَام : ١١٢] واتە: هەروەكو چۆن تۆمان . ئەی پەیامبەری خوا صلی الله علیه وسلم . تاقیكردۆتەوە بە دوژمنانت لە هاوەڵبڕیاردەرانی گەلەكەت بەهەمان شێوە هەموو پەیامبەرانمان . سەلامی خوایان لەسەر بێت . تاقی كردۆتەوە بە دوژمنانێك لەیاخیبووانی مرۆڤ و جنۆكە، هەندێكیان ئەو قسانە دەدەن بە گوێی هەندێكی تریاندا كە بەناڕەوایی ڕازاندویانەتەوە، بۆ ئەوەی ئەو كەسەی گوێبیستی دەبێت هەڵبخەڵەتێت وفریوبخوات، و لەڕێگەی خوای پەروەردگار لابدن و وێڵ ببن ..!! ).[1]

✍ لە ری (ضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) –خوا لی رازی بیت – لە سە ر ووتە ی قال تعالى: ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ١٤﴾ دەڵێت : واتە :ئێمە هەر گاڵتە و گەمە بەوانە دەكەین پێیان رادە بوێرین .. یان ووتیان ئێمە هەر گاڵتە و گەمە بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەكەین )[2]

✍ لە رێ (سعید ) لە (قتادە ) — رەحمەتی خوایان لێ بێت — لەسەر ووتەی: ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ١٤﴾ دەڵێت : ئەوان دەڵێن : ئێمە گاڵتە و گەمە یان پێ دەكەین بەو كەسانە ..).[3]

✍ لە رێ (ابی جعفر ) لە ( الربیع بن أنس ) — رەحەتی خوایان لێ بێت — لەسەر ووتەی ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ١٤﴾ دەڵێت : واتە : گاڵتە پێ كردن بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ..).[4]

✍ لە (ابن جریر) — رەحمەتی خوای لێ بێت — وەر گیراوە ، دەڵێت : هەموو زانایانی تەفسیری قورئانی پیرۆز لە سەر ئەم ووشەیە واتە: (الاستهزاء) كە لەم ئایە تەدا هاتووە ، بەمانای (السخرية ) دێت ، واتە : گاڵتە پێ كردن یان رابواردن دێت ، هیچ لە زانایانی تەفسیر خلافیان یان جیاوازیان لەسەر نیە لەم ووتەیەدا ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ١٤﴾ مانای : (إنما نحن ساخرون ) واتە: ئێمە گاڵتە جاریان پێ دەكەیت ..).[5]

[1] - تفسير ابن كثير بە كوردی (٩٦/١).
[2] تفسير الطبري (٣٠٠/١) ص ٣٩.
[3] -اخرجه ابن جرير (٣١٢/١) و فتح الباري (١٦١/٨).
[4] - اخرجه ابن ابي حاتم (٤٨/١).
[5] -ابن جرير (٣١١/١).

قال تعالى: ﴿ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾﴾ [البَقَرَةِ : ١٥]

﴿ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ﴾ واتە : خوا گالتە بەوان دەكات لە بەرانبەر گالتە كردنە كەیان ، ﴿وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾﴾ وە ماوەیان دەدات تاوەكو لە سەر سنووری خۆیاندا سەر لێ شێواو سەر گەر دان و رەنجە رۆ بن ..!! بەلێ لە پێشدا باسی دوو رووی ناپاكی مونافیقە كانمان كرد ، هەروەها (خوای گەورە ) لە ئایەتەدا دەنیشانی دەكات ، كە (خوای گەورە ) خۆی لە باتی موسلمانان یان ئیمانداران بە خاوەنی جەنگ كردن لە گەل دوو رووە كان یان مونافیقە كان ، هەر بە خۆی تۆلە یان لێ دەسێنێتەوە ، ئینجا ئیمانداران شادومان دەكات و دلیان ئارام دەكات بە كۆمەكی كردنیان بەرانبەر بە دوو رووەكان ، جا دوژمنانی ئاینی ئیسلام لەم ئایەتە دا بترسن كە بەلگەیە لەسەر ئەوەی (خوای گەورە ) بۆ هەمیشە و بەردەوام كۆمەكی موسلمانان و ئیماندران دەكات ، جەنگ رادەگەیەنی لە گەل ناپاكان و دوو رووەكان و كافران و بت پەرستان یان لە گەل ئەو كەسانی ئەم سەردەمە وەك مولحیدەكان علمانیەكان یان ئەوانەی دژی ئاینی خوا بە نامەردنی جەنگ بەر پا دەكەن ، ئینجا (خوای گەورە ) جەنگ رادەگەیەنی بەرانبەریان ..!!

﴿ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾﴾ جا ئەمە چارە نووسی ئەوانە یە كە لەسەر گالتە و گەمە كردن بە ئیماندران و موسلمانان یان بە بەندە باوەرداره كانی خوا ، جا گەمە و گالتە كردنە كەی (خوای گەورە ) بە وان دا ، ئەوەیە كە رازاندوویە تیەوە لەوەی تیایدان لە گومرایی و سەر لێشیواوی و ئەو حالەتە پیس و بۆگەنە ، هەتا وا گومانیان بردووە ئەوان لەگەل ئیماندارانن رووناكیەكی ئاشكرایان پی دەبەخشێت ، جا ئەگەر ئیماندران كەوتنە رێگە گرتن لە رووناكیە كەیانەوە ، ئەوا رووناكیە كەیان دەكوژێتەوە لە تاریكی دا دوو رووەكان دەمێنەوە ، پاشان رۆشنایی بە سەر لێشیوایی و دوو دلی دێت ، ئای چەندە ناخۆشە بێ ئومید بوون پاس تامەزرۆیی ، وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿١٤﴾﴾ [الحَدِيد : ١٤] واتە :دووڕووان بانگی باوەڕداران دەكەن و پێیان دەڵێن : مەگەر لە دونیادا ئێمە لەگەڵتاندا نەبووین، وەكو ئێوە دروشمەكانی ئاینمان جێبەجێ دەكرد ؟ باوەڕداران پێیان دەڵێن : ئێوە بە رووكەش لەگەڵ ئێمەدا بوون، بەڵام خۆتان بە دووڕوویی و تاوان لەناو برد، وە چاوەڕوانی مردنی پەیابەری خوا بوون وە خۆتان مەڵاس دابوو زیان لە باوەڕداران بدەن، وە بەگومان بوون لە زیندوو بوونەوەی پاش مردن، وە ئومێد و هیوا پووچەڵەكانتان فریویدان، وە لەسەر ئەو حاڵە مانەوە تاكو مردن یەخەی پێگرتن و شەیتانیش بە ڕەحم و بەزەیی و لێبوردەیی خوای پەروەردگار فریویدان ..!!

بەراستی (خوی گەورە) ئەوان سەر گەردان و ریسوادەكات ، بە بۆنەی ئەوەی كە ئەوان خۆیان گالتەجار خراپن و تاوانی نا بەجی ئەنجام دەدن ، بوونتە هۆی تاوانی خۆیان ، هەروەها ( خوای گەورە)ش زیاتر تاوانەكەیان بۆ گەورە دەكات ، تاكو زیاتر لە سنوور دەچن توغیانیان زیاتر بێت لە سەر كێشی گومرایی دا زیاتر بچنە خوارەوە نقومی گومرایی بن ، ئەوەیە سزای گالتە كردنیان بە موسلمانان ..؟! بەلیچ (خوای گەورە ) خۆی چاكەكارە بۆ چاكەكاران بەهێز بە توانایە ، بەرانبەر بە خراپە كاریش بەهێزو بە توانایە جاری وا هەیە كۆمەكی خراپە كار دەكات بۆ ئەوەی زیاتر سزاكە قورس كات ، وەك حجە یان بەلگە بۆ سزادانی ، لە نێو گوناهو تاوان دا نقومی دەكات گومراو سەر لێشواو سەرگەردان خەسارەت مەندی دەكات لە دونیان لە دوا رۆژدا بەهۆی تاوانە و خراپەكاریە قێزە وون پیس بۆ گەنەكانی ، چونكە خۆ ئەگەر (خوای گەورە ) هیدایەتی چاكە كار نەدات ئەوا بەدلنیایەوە ناتوانێت چاكە كار بێت ، ئەوەشی خراپە دەكات ئەگەر خوا رازی لەسەر نەبێت ناتوانێت خراپە بكات ، جا لێرە دا (خوای گەورە ) بە دڵ و دەروونی هەموو بەندە یەك دەزانێت كە چی لە نێو دلی دایە چونكە زانایە بە هەموو شتێك ، خۆ بەندە ناوانێت بیٚ فەرمانی (خوای گەورە ) هیچ كارێك ئەنجام بدات ، تەنها دەبێت رەزامەندی (خوای گەورە) ی لە سەر بێت جا چ بۆ چاكە كردن بێت جا چ بۆ خراپەكاری بێت ، بەلام (خوای گەورە ) خوای هەموو مرۆڤەكانە و یارمەتی هەموو مرۆڤێك بەستراوە بە هێزو توانا دەسەلاتی خواوە ، جا ئەگەر بێت و یارمەتی نەدات مانای وایە (خوای گەورە ) بە زۆر چاكە یان خراپە لە مرۆڤە كان قەدەغە دەكات ، كەواتە لێرە دا خوای گەورە یارمەتی مرۆڤە كان دەدات لە چاكەو خراپە ، ئەوەی نیازو ئەخلاصی تەواوی هەبێت بۆ چاكە كردن ئەوا بەدلنیایەوە یارمەتی كۆمەكی دەكات بۆ چاكەكردن ، ئەوەشی دڵ و دەروونی دا شەر خراپە ی هەبێت واتە نیازی بە خراپەكاری بێت ئەو بیٚ گومان یارمەتی دەدات بۆ خراپە كاری نقوم و نخرۆی تاوان و گوناهو خراپە كاری دەكات ، چونكە (خوای گەورە ) مرۆڤەكانی سەرپشك كردووە ، كە خۆی رێگایە ك هەلبژێرێت ، بەلام هێزی كار كردن یان ئیشكردنەكەی تەنها لە دەستی (خوای گەورە ) یە بە س كەواتە لە سەر سەرپشكێتیەكەشی مرۆڤ تۆلە و سزاو پاداشت خۆی وەری دەگرێت ، كەواتە پاداشت سزا بەگوێرەی كارەكەیتی.

📖 لە (عقبە بن عامر ) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((إذا رأيتَ اللَّهَ تعالى يُعطى العَبدَ مِنَ الدُّنيا ما يُحِبُّ وَهُوَ مقيمٌ على معاصيهِ فإنَّما ذلِك منهُ استدراجٌ)).[1]

واتە: ئەگەر بینیتان (خوای گەورە ) بەخشی بە كەسێك ، ئەوەی كە پێی خۆشە لە دونیا دا و ئەو هەر پێداگرو سوور بوو لەسەر خراپەكاری و یان تاوانكاری خۆی ، ئینجا بزانن كە ئەوە بەرزكردنەوە یەتی لەلایەن (خوای گەورە) وە بۆ پشت شكاندن لە ناو بردنی لە دونیا و لە ئاخیرەت یان لەدوا رۆژ دا ..!!

[1] - السيوطي الجامع الصغير برقم (٦٢٥)

شی کردنەوەی هەندێك لە ووشە كان :

﴿يَسۡتَهۡزِئُ﴾ ( الهزء : مزح في خفية ) واتە: بریتەیە لە گاڵتە پیٚ کردنیٚکی پە نهانیی ..!!

﴿طُغۡيَٰنِهِمۡ﴾ (الطغيان : تجاوز الحد في العصيان ) واتە: لە سنوور دەرچوون لە فەرمانەكانی (خوای گەورە ) بەرە و خراپەکاری بیٚ سنوور دا، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویٚت : قال تعالى: ﴿ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ٢٤﴾ [طه : ٢٤] واتە : دەسا. ئەی موسا.برۆ بۆ لای فیرعەون، چونکە لەسنوری خۆی دەرچووە و ئاستی خۆی بڕیوە و لەپەروەردگاری یاخیبووە، و بانگەشەی بکە بۆ یەکتاپەرەستی خوای پەروەردگار و پەرەستنی ..!!

﴿يَعۡمَهُونَ ١٥﴾ (العمه : التردد في الامر من التحير ) واتە: ئەوەیە کە مرۆڤ لە دوو دلی رارایی یان لە رەلەردا بیٚ دڵ لە دڵ بدا یان ئەنجامی سەر سامیەتی لە کاریٚك دا ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویٚت : قال تعالى: ﴿زَيَّنَّا لَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُمۡ يَعۡمَهُونَ ٤﴾ [النَّمل : ٤]واتە : [ زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَالَهُمْ ] کردەوە خراپەکانمان بۆ ڕازاندونەتەوە تا لە گومڕاییدا رۆبچن لە سزای ئەوەی کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیە، یاخود کردەوەی چاکمان بۆ ڕازاندونەتەوە بۆ ئەوەی ئەنجامی بدەن بەڵام ئەوان ئەنجامی نادەن و قبووڵی ناکەن [ فَهُمْ يَعْمَهُونَ (٤) ] وە ئەوان دوودڵ و سەرلێشێواون و هیدایەت و ڕێگای ڕاست نادۆزنەوە..!!

یان کەواتە :﴿يَعۡمَهُونَ ١٥﴾ واتە: گومرایەکی زۆر خراپ و نەمانی بینینی دڵ ، واتە : لە گومرایی و نەزانین و کوێریدا مانەوتەوە ، دڵیان کوێرە لە بینینی حەق و راستی و هیدایەتی (خوای گەورە ) ..!!

﴿ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ١٥﴾ واتە: (خوای گەورە ) گاڵتە یان پیٚدەکات ، جاریٚ ماوەی داون ، تاکو کوێرانە مل بنێن و درێژە بە گومرایەکانی خۆیان بدەن ، سەرنجێك لیٚرە دا ناوی (خوای گەورە ) لەم ئایە تەدا پیٚش گاڵتە کردن کەو تووە یان هاتووە ،ئەمەش ئەوە دەگەیەنیٚت لە بەر گرینگی و پشت گیری سەر سەختی (خوای گەورە ) بۆ ئیماندران دیٚت ، مەبەست لەم پیٚش کەوتنەی ناوی (الله ) ئەوەیە کە خۆی دەکاتە خاوەنی دوژمنایەتی کردن لە گەل دوو رووەکان یان مونافیقە کان یان مولحیدەکان یان کافران ئەوانەی دژایەتی ئاینی ئیسلام دەکەن ، بەلام لیٚرە دا گاڵتە کردن لەسەر رووکەشی خۆی نەك مجاز بیٚت مانای پاداشت دانەوە بدات ، ووتەی راست مجاز لە قورئانی پیرۆز دا نیە ..!!

بەلیٚ (خوای گەورە ) گاڵتە بەوانەدەکات کە گاڵتە بە ئاینی خوا دەکەن یان گاڵتە بە پیٚغەمبەرەکەی ﷺ و موسلمانان دەکەن ، چونکە ئەم سیفە تە دلالەت لەسە پیٚدا هەلدان یان مەدح کردن ناکات بە رەهایی و (مطلق ) دە بیت بەم شیٚویە بیٚت ...!!!

-نابێت وەسفی (خوای گەورە ) بکەیت بە (کید ) و (مکر ) و (الاستهزاء ) و (السخریە ) تەنها دەبێت بۆ بەرانبەر بێت ..!!

-نابێت لە داتاشراوەکە ی ناو بۆ (خوای گەورە ) جێگیر بکەیت ، چونکە بابەتی ناو سیفەت دەکات ، بەلام هەموو سیفەتێك ناو جێگیر ناکات ..!!

✍ لە (ابن تیمیه ) – رەحمەتی خوای لیٚ بێت – دەلیٚت : ئەم سیفە تانە وەك : (کید ) و (مکر ) و (الاستهزاء ) و (السخریە ) ئەگەر بکەیت بە بەرانبەر کەسێك دا شایستەی تاوان یان سزا نەبێت ئەو دەبێتە ستەم کردن بۆی ، بەلام ئەگەر بەرانبەر کەسێك بکەیت تاوانی کردووە بەرانبەر کەسێك ، ئەوا سزا بۆ کردەوەکەی دادپەروەرییە ..!!

✍ لە (ابن عثیمین ) – رەحمەتی خوای لیٚ بێت – دەلیٚت : سە بارەت بە سیفە تی کمال بە (قید) ، ئەمەیان (خوای گەورە ) پیٚ وەسف ناکرێت تەنها بە (قید ) نەبیٚ ، وەك : (المکر ) و (الخداع ) و (الاستهزاء ) و (السخریە ) ... شتی تری وەك ئەمانە ، ئەم سیفە تانە سیفەتی کمال بە (قید ) ئەگەر بەرانبەر ئەوانە بێت کە ئەمە دەکەن ، ئەوە سیفەتی کمالە ، بەلام ئەگەر بە (مطلق ) یان بە رەهایی باس بکەیت نابێت بدرێتە پال زاتی (الله ) ، چونکە ناکرێت وەسفی (خوای گەورە ) بکەیت بە (مطلق )ی بە (مکر ) یان بە (المستهزیء ) یان بە (الخداع ) وە شتی تریش وەك ئەمانە...بەلکو بە (تقید ) دروستە : واتە : ( ماکر بالماکرین ) یان (مستهزیءالمنافقین ) یان (خادع للمنافقین ، یان (کائد للکافرین ) ئەمانە دەبێت بە (مقید ) بێت چونکە نەهاتووە تەنها بە (مقید) ی نەبێت ..!!

پاداشت لە جنسی کردەوەیە ، (خوای گەورە ) گالتە بەوان دەکات کە گالتە ی پیٚ دەکەن ، ئەمەیە دادپەروەری و راستییە ..!!

بەلیٚ بیٚ گومان (خوای گەورە ) ماوە دەدات بە ستەم کاران و دوو رووان و مونافیقە کان و کافران ،تاکو کوێرانە مل بنێن بەتاوان و ستەکاری کردن ، وە ماوەی گومرایی کردنە نەکەیان درێژ دەکاتەوە بۆئەوەی نخرۆی تاوان گوناهو خراپە کاری بن ، بۆئەوەی سزای توندو بەئیش و ژانیان بدات جا چ لە ژیانی دونیادا بێت یان چ لە ژیانی قیامەت بۆ یان هەلدە گرێت لەوێدا سزا کە سەختره بە ئیش ئازارترە لەوەی ژیانی دونیاندا ، چونکە هەموو کەسێك پاداشت لە جنسی کردەوەکەی وەردەگرێت ، وە سزاسش لە جنسی خراپە کاریە کەی وەردە گرێت ،ئەوەیە حەق دادپەروەری (خوای گەورە ) هیچ کەس بیٚ بەش ناکات لە پاداشت وەرگرتنەوە لەوەی کە چاکەیەکی کردووە لە دونیادا جا چاکە کە هەرچەند بچووکیش بێت ، یان ئەوەی خراپەیکی کردوو جا خراپە کەش بچووکیش بیت بەقد ئەم خراپە یە سزای دەدات ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ۝٨﴾ [الزَّلۡزَلَة : ٧ - ٨]واتە : جا هەر کەسێك بەکێشی مێرووولەیەکی بچووك کردەوەی چاك بکات، پاداشتەکەی لەرۆژی دواییدا دەبینێت..!! و ئەو کەسەش بەکێشی مێرووولەیەکی بچووك کردەوەی خراپ بکات، ئەوا سزاکەی لەرۆژی دواییدا دەبینێت ..!!

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠﴾ [الشُّورَى : ٤٠] واتە: وە پاداشتی خراپەی خراپکار تۆڵەلێسەندنەوەیەتی بەئەندازە و شێوەی خۆی بەبێ زیادە، جا ئەوەی لەخراپکار خۆشبێت، و واز لە تۆڵەسەندنەوەی بهێنێت، و خۆشەویستی دروست بکات لەنێوان خۆی و کەسی لێبوراودا لەبەر ڕەزامەندی خوا، ئەوا پاداشتی ئەو لێخۆشبوونەی لەلای خوایە . بێگومان خوا ستەمکاری خۆش ناوێت ئەوانەی کە سەرەتا دەستپێشخەری دەکەن لە دەستدرێژیکردنە سەرخەڵك، خراپەیان بەرانبەر دەکەن ..!! وە هەر وەها (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ [البَقَرَة : ١٩٤]واتە: هەر کەسێك کە دەستدرێژی کردە سەرتان ئێوەش دەستدرێژی بکەنە سەری بە هاوشێوەی ئەوەی کە دەستدرێژی کردۆتە سەرتان نەك زیاتر، وە زوڵمیان لێ مەکەن..!!

✍ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو (عبداللە بن عباس ) و (عبدالله بن مسعود ) – رزای خوا یان لێ بیت لەسەر ووتەی : ﴿وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ١٥﴾ دەلێن : (خوای گەورە ) ماوە یان بۆ درێژ دەکات یان مل یان بۆ شل دەکات ..).[1]

✍ لە (مجاهد ) – رحمەتی خوای لێ بێت – ئەویش هەر وای ووتەوە لەسەر ووتەی : ﴿وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ١٥﴾ دەڵێت : واتە : (خوای گەورە ) ماوەیان بۆ درێژ دەکات و مل یان بۆ شل دەکات یان بەریان بۆ شل دەکات ..).[2] هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت: قال تعالى: ﴿أَيَحۡسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٖ وَبَنِينَ ٥٥ نُسَارِعُ لَهُمۡ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ بَل لَّا يَشۡعُرُونَ ٥٦﴾ [المُؤۡمِنُون : ٥٥ - ٥٦] واتە : ئایا وا ئەزانن ئێمە ئەو ماڵ و منداڵەی کە پێمان بەخشیوون هەروا بێهودەیەو لێیان ناپرسینەوەو وائەزانن لە خۆشەویستیدا پێیان دەبەخشین؟ نەخێر وانیە..!! هەر شتێك خێری تیابێت ئێمە بە پەلە پێیان ئەبەخشین بەڵام ئەوان هەست ناکەن کە ئەمە ئیستیدراجەو لەناکاو خوای گەورە لەناویان ئەبات..!!

✍ لە (ابن جریر ) – رە حمە تی خوای لی بیت – دە لیت: راستیە کەی ئەوە یە کۆمەکیان دەکەین و یارمەتیان ئەدەین و دەستیان بۆ شل دەکەین و وازیان لێ دەهێنین تا کو بەردەوام بن لە گومرای و سەرگەردانی و لە سنوور دەرچوون و لاساری یان ..).[3] وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفۡـِٔدَتَهُمۡ وَأَبۡصَٰرَهُمۡ كَمَا لَمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَنَذَرُهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ١١٠﴾ [الأَنۡعَام : ١١٠]واتە : وە ئێمە دڵ وچاویان وەردەگێڕین و دووری دەخەینەوە لەوەی کە سوود لە ئایەتەکانمان وەربگرن، بۆیە ئیتر باوەڕی پێ ناهێنن، هەروەکو چۆن باوەڕیان بەئایەتەکانی قورئان نەهێناوە کاتی سەرەتا و یەکەم جاری دابەزینی، وە بە سەرگەردانی لە یاخیبوونیان بۆ خوای پەروەردگار دەیانهێڵینەوە، و ڕێنمایی ناکرێن بۆ ڕێگەی هەق و ڕاستی ..!!

[1] -تفسیر الطبري ص ٣٩ .
[2] -اخرجه ابن ابي حاتم (٥٧/١).
[3] -تفسیر الطبري (٣٠٧/١) ص٣٩

✍ لە ری (ابي روق) لە (ضحاك) لە (عبدالله بن عباس) – رزاو رەحمەتی خوا یان لی بیت – لە سەر ووتەی ﴿ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ﴾ دەلیێت: واتە : گالتە یان پیێ دە کات بۆ تۆلە سەندنەوە انتقام لەوان واتە: دوژمانی ئیسلام ).[1]

✍ لە ری (الكلبی ) لە (ابی صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – رازاو رەحمەتی خوا یان لیێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ﴾ دەلیێت : واتە : لە ئاخیرەت یان لە رۆژی دوایی تۆلە یان لیێ دەكاتەوە ، دەرگای دۆزەخ یان لی دەگریتەوە ، لە بەهەشتەوە ، پاشان بەوان دەلێن : وەرن بە مە رازی بن كە مەلە لە ناو ئاگری دۆزەخ دا بكەن ..؟! وە ئیماندارانیش لە سەر قەنەفە كانیادا ، وە ئەوش نهێنی (الحجال ) واتە : (مالێك كە وەك قوبە داپۆشراوە یان بە نموونە بە عەبایەكی جوان رازاوە داپۆشراوە ، واتە : وەكو خیوەتگەیەكی جوان ورازاوە یە ) ئینجا ئیمادارات تەماشایان دەكەن ، پاشان بەر بەست دەدانریچت لەبەر دەرگاكانیان ، پاشان ئیمانداران پیێیان پیێ دەكەنن ، ئەوەش ئەوە یە كە (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : ﴿ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ﴾ لە رۆژی دوایی بەم شیێویە گالتە یان پیێ دەكات ، هەروەها ئیمانداران پیێیان پیێ دەكەن كاتیێ دەرگاكانیان لە سەر داخرا ..؟! ئەوەش ئەوە یە كە (خوای گەورە دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ٣٤﴾ [المُطَفِّفِين : ٣٤] واتە: بەڵام لە ڕۆژی دواییدا ئەوانەی خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەیان صلى الله عليه وسلم بەڕاست زانیوە، و کردەوەیان بە شەریعەتەکەی کردووە، گاڵتە بە بێ باوەڕان دەکەن، هەروەکو چۆن بێ باوەڕان لە دونیادا گاڵتەیان پێ دەکردن . ..).[2]

✍ لە ریێ (عطاء) لە (عبدالله بن عباس )- خوا لی رازی بیت – دەلیێت : ئەوە (خوای گەورە ) یە ئەگەر رووناكی یان نور دابەش كرا لە رۆژی قیامەت ریێگەی پیێدرا لە سەر ریێگا ئەوا دە بەخشریێت بە دوو رووە كان و ئیمانداران ، تەنانەت ئەگەر لەسەر ریێگا كەش برۆن رووناكیان یان نور یان لیێ دكوژیتەوە ئەوەش ئەم ئایەتە یە كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ﴾ واتە: (خوای گەورە ) پیێ یان دەدات بەلام تەواو نیە ، سوودی بۆیان نیە ، واتە : ریێگا نابینن رووناكیان لەسەر كۆژاوەتەوە بە كویێری ریێگا دە برن ، ئەمەش هۆكاری ئەم گالتە كردنەیە لە دوینا دا دەیان كرد ، (خوای گەورە )ش لە قیامەت دا بەم شیێوەیە گالتە یان پی دەكات و تۆلە یان لیێ دەسیێنیتەوە بە كویێرەوەی لە قیامە دا ریێ دەكەن كەچی رووناكی شیان پیێ دراوە بەلام لەتاریكی دادەبن ..).[3]

✍ لە ( ابن عطية) – رحمە تی خوای لی بیت – دە لیت: (الاستهزاء) دوو مانا دەگەیەنی یەكەمیان : (هي تسمية العقوبة باسم الذنب ) واتە: ئەو ناوی سزادان بە ناوی گوناهی گەورە ، ئەوە یان دە گەریێتەوە بۆ جمهوری زانایان ، دوومیان : (الاستهزاؤە بهم هو استدراجهم من حيث لا يعلمون ) واتە : گالتە كردن هە تاكو ریسوا دەبن و پیشتیان پیێ دەشكیێت لە كاتیێك دا پیێ نازانن ..).[4]

---
[1] -اخرجه ابن جرير (٣١٧/١).
[2] -اخرجه البيهقي في الاسماء والصفات (١٠١٨).
[3] علقة الواحدي في الوسيط (٩١/١).
[4] - ابن عطية (١٢٨/١-١٢٩).

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : لە رۆژی دوایی دا ، ئەگەر لە دیوارێك لێدرا لە نێچوان ئەوان و لە نێوان ئیمانداران ، کە درگایەك هەیە بۆ سیرات ، لەوێدا دەمێنەوە لە تاریکی دا ، ئینجا پێیان دەڵێن : قال تعالى: ﴿ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ فَٱلۡتَمِسُواْ نُورًا﴾ [الحَدِيد : ١٣] واتە: ئیمانداران پێیان دەڵێن : بگەرێنەوە دواوە ، لەوێدا ئیمان بهێنن و کردەوەی چاکە بکەن تاکو لێرەدا نورتان یان رووناکیتان بەرکەوێت ..!! ئەوە مانای (الاستهزاء ) یە ئینجا (خوای گەورە دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَيَمُدُّهُمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ١٥] واتە: ئینجا (خوای گەورە ) بۆ یان درێژ دەکاتەوە ..!! ..).[١]

📖 لە (الحسن ) – خوا لی رازی بیت – دەڵێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( يجاء بالمستهزئين يوم القيامة ، يفتح لهم باب من أبواب الجنة ، فيدعون ليدخلوا ، فيجيئون ، فإذا بلغوا الباب أغلق ، فيرجعون ، ثم يدعون ليدخلوا ، فيجيئون ، فإذا بلغوا الباب أغلق ، فيرجعون ، ثم يدعون ليدخلوا ، فيجيئون ، فإذا بلغوا الباب أغلق ، فيرجعون ، ثم يدعون ، حتى إنهم يدعون فلا يجيئون من اليأس )).[٢]

واتە: لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : لە رژی قیامەت دا ، ئەوانەی کە گاڵتە یان بە ئاینی ئیسلام و موسلمانان دەکرد واتە: (المستهزئين ) لە رۆژی قیامەت دەرگایەك لە دەرگاکانی بە هەشتیان بۆ دەکرێتەوە ، ئینجا بانگەشەی ئەوە دەکەن یان دوا دەکەن بچنە نێو بەهەشت ، بۆیە دێن دەیانەوێت بچنە نێو بەهەشت ، جا ئەگەر گەیشتن بەردەرگا بە دەرگا وانەکە دەوترێت دەرگا کە دابخە..!! ، پاشان دەگەرینەوە ، دووبارە بانگەشە دەکە کە بچنە نێو بەهەشت ، بۆیە داوادەکە کە بچنە ناو بەهەشت ، هەر بۆیە دێن دەیانەوێت بچنە نێو بەهەشت ، جا ئەگەر گەیشتنە بەر دەرگا ، بە درگا وانە کە دەترێت دەگا کە دابخە ..!!دووبارە دەگەرێنەوە ، پاشان دووبارە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بچنە نێو بەهەشت ، یان داوا دەکەن بچنە نێو بەهەشت ، بۆیە دێن و دەیانەوێت بچنە ناو بەهەشت ، جا ئەگەر گەیشتنە بەردەرگای بەهەشت ، بە دەرگا وانە کە دەوترێت دەرگا کە دابخە ..!! دووبارە دەگەرێنەوە ، دیسان بانگەشەی چوونە بەهەشت دەکەن ، هەتاکو تەنها بانگەشە دەکەن ،بە لام ناگەرێنەوە یان نایەنەوە هەتاکو بێ هیوا دەبن ).

[١] - تفسير مقاتل بن سليمان (٩١/١).
[٢] -اخرجه ابن ابي الدنيا في الصمت ص١٦٧-١٦٩ حديث مرسلا .و ابن ابي زمنين في تفسيره .

✍ لەرێ (الربیع بن أنس ) لە (ابی العالیە ) – رەحمەتی خوایان لێ بێت – لە سەر ووتەی ﴿وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ١٥﴾ دەڵێت : واتە : مانای دوو دڵی یان دلە راوکێ ، زیاد بوونی گومرایی بۆ ئەم گومرایەی کە هە یان بووە ، زیاد بوونی کوێری نابینایی بۆ ئەو کوێریەو نابینایەی کە هە یان بووە ..).[١]

✍ لە رێ (ابن جریج ) لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿وَيَمُدُّهُمْ﴾ دەڵێت : واتە: زیاد بوونی ماوەکەیان..).[٢]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : وایان لێدەکات کە زۆر دوور بکەونەوە ..).[٣]

✍ لە رێ (السدی) لە (ابی مالك و ابی صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – رزاو رەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿فِي طُغْيَانِهِمْ﴾ دەڵێت : واتە : بێ باوەری یان کوفر کردنیان ..).[٤]

✍ لەرێ (الربیع بن أنس ) لە (ابی العالیە ) – رەحمەتی خوایان لێ بێت – لەسەر ووتەی: ﴿وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ﴾ دەڵێت : واتە : لە گومرایی دان ..).[٥]

✍ لە رێ (السدی ) لە (ابی مالك و ابی صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – رزاو رەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿يَعْمَهُونَ ١٥﴾ دەڵێت : واتە: بەردە وام بوون لە بێ باوەری یان کوفر کردن ..).[٦]

✍ لەرێ (ابن جریج ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – لەسەر ووتەی ﴿يَعْمَهُونَ ١٥﴾ دەڵێت : واتە : دوو دڵ ی یان رارایی ..).[٧]

✍ لە رێ (سفیان ) لە (سلیمان الاعمش )- رەحمەتی خوا یان لێ بیت – لەسەر ووتەی ﴿فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ١٥﴾ دەڵێت : واتە : گەمە یان یاری..).[٨]

---

[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤٨/١).
[٢] -اخرجه ابن جرير (٣١٩/١).
[٣] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩١/١).
[٤] -اخرجه ابن جرير (٣٢١/١).
[٥] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤٨/١).
[٦] -اخرجة ابن جرير (٣٢٣/١).
[٧] - اخرجة ابن جرير (٣٢٣/١).
[٨] -اخرجه ابن ابي حاتم (٤٩/١).

قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٦﴾ [البَقَرَةِ : ١٦]

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ﴾ واتە: ئەوانە ئەو کەسانەن کە گومرایان کری ، ﴿بِٱلۡهُدَىٰ﴾ واتە: بە هیدایەت و رێنموویی، ﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ﴾ واتە: جا لە بازرگانیە کەیان قازانجی کردو ، ﴿وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٦﴾ واتە: نە رێبازی راست یان گرت ، یان نەچوونە ریزی هیدایەت دراوان ..!! لێرە دا مەبەست لە ووشەی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ مەبەستی پێ ئەوانە واتە : دوو روو یان مونافیقە کان یان مولیحدو کافرە کان ، ئەوانەی دژایەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەکەن ، ئەویش بەم سیفە تانە وەسفیان دەکات یان بەم سیفەتانە دەیان ناسێنێت وە ناسراویان دەکات ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ﴾ [البَقَرَةِ : ١٦] واتە : حەزیان لە گومرای بووە ، وەك چۆن کریار حەزی لە شتومەکە کە بی کرێت ، بێ گومان لە حەزو ئارەزووی دا پارە و سامانی زۆر تصرف دەکات بۆ ئەوەی ئەو شمەکە یان ئەو شتە بەدەست بێ نێت ..؟! بۆ ئەم مەبەست ئەمەش لە باشترین نموونە کانە ، بێ گومان (خوای گەورە ) گومرایی و ئەو پەری خراپە کاری بە شتومەك چواندووە ..!! وە رێنمایی ئەو پەری چاکە کردن بە نرخ بەها چواندووە ..!!چونکە هەموو مرۆڤێك حەزی لە ئارەزووە کانیەتی کەبێتە دێ بەو پەری توانای بۆ هەولدەدات ، جا لێرە دا دوو رووەکان حەزیان لە بازرگانیە بەلام بە خراپە کاری کردن ، ئا ئەمە بازرگانیە کەیانە ، بەراستی خراپترین بازرگانی ، خراپترین کرین و فرۆشتن ، کرین و فرۆشتنی ئەوانە ، ئەگەر هەر کەسێ هەزاردینار ببەخشی بەرانبەر بە سەد دینار ئەوا بێ گومان زەرەری کردوە ..!! یان جۆن بەخشینی پارچە گەوهەرێك لە بەرانبەر سەد دینار زەرەر نیە ..؟! جا جۆن کەسێك هیدایەت ببەخشێ لە بەراننبەر گومرایی دا ..؟! جا سەیر لەوە دایە نەگبەتی بەدبەختی سەرگەردانی هەلبژێرێ لە بەرانبەر بەختەوەری و خۆشبەختیدا ..؟! بێ گومان لە بازرگانیەکەی دا قازانجی نەکردووە بەلکو گەورەترین زەرەریی تیدا کردووە ، وە ك ئەوە وایە بلێن لەم بازرگانیە دا پیاوە کە ئی فلاسی هێناوە یان موفلیس بووە بە هۆی نەزانینی لەم گالو گۆریە یان لەم مامەلە کردنەی لە بازریگانیە کەی دا تووشی زیانێکی زۆر گەورە بووە ، زەرەری تێدا کردووە ..؟! وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَٱعۡبُدُواْ مَا شِئۡتُم مِّن دُونِهِۦۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ١٥﴾ [الزُّمَر : ١٥] واتە : جا ئێوەش .ئەی هاوەڵبڕیاردەران .هەرچی دەپەرستن جگە لە خوا لەهاوەڵ و بت و پەیکەر و جگە لەوانەش لە دروستکراوەکانی بیپەرستن، و بێگومان بن کە هیچ زیان بە من ناگەیەنێت . وە ئەمەش هەڕەشە وترساندنە بۆ کەسێك جگە لەخوا بپەرستێت، و هاوەڵی بۆ بڕیاردەدات لەگەڵیدا . ئەی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم بڵێ : بێگومان زیانبار وخەسارۆمەندان تەنها ئەوانەن کە خۆیان و خاوخێزانیان دۆڕاندووە لە دوارۆژدا، ئەوەش بە هەڵخەڵەتاندنیان لەدونیادا و سەرلێشێوانیان و وێڵکردنیان لەباوەڕهێنان . دەسا بێداربنەوە و بشزانن کە دۆڕانی ئەو هاوەڵبڕیاردەرانە بۆ خۆیان وخێزانەکانیان لەدوارۆژدا دۆڕانێکی ڕوون وئاشکرایە ..!!

له (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت: له پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت : ((أَتَدْرُونَ ما المُفْلِسُ؟ قالوا: المُفْلِسُ فِينا مَن لا دِرْهَمَ له ولا مَتاعَ، فقالَ: إنَّ المُفْلِسَ مِن أُمَّتي يَأْتي يَومَ القِيامَةِ بصَلاةٍ، وصِيامٍ، وزَكاةٍ، ويَأْتي قدْ شَتَمَ هذا، وقَذَفَ هذا، وأَكَلَ مالَ هذا، وسَفَكَ دَمَ هذا، وضَرَبَ هذا، فيُعْطَى هذا مِن حَسَناتِهِ، وهذا مِن حَسَناتِهِ، فإنْ فَنِيَتْ حَسَناتُهُ قَبْلَ أنْ يُقْضَى ما عليه أُخِذَ مِن خَطاياهُمْ فَطُرِحَتْ عليه، ثُمَّ طُرِحَ في النَّارِ)).[1]

واتە: ئایا دەزانن مفلس کێ یە ..؟! ووتیان: لە ناو ئێمە دا (مفلس) ئەو کە سەیە کە پارەو دەرهم مال سامان شت ومەکی نەبێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بەراستی (مفلس ) لە نێو ئومەتی من دا ئەوانە لە رۆژی قیامەتدا، کە دێن بە نوێژو رۆژی و زەکات ، بەلام لە کاتێك دا جوێنی داوە بەوە و تۆمەتی خستووتە پال ئەوە و ، مالی ئەوی خواردووەو ، خوێنی ئەوی رێژتووەو ، بە ناحەق لەوی داوە ، جا لە چاکە کانی دەدرێت بەم بەو ..؟! ئەگەر چاکەکانی تەواو بوو پێش ئەوەی قەرزەکانی بداتەوە ، ئەوا لە تاوانە کانی ئەوان وەردەگرێت دەخرێتە سەر شانی ئەو ، واتە : (مفلیس )کە ، پاشان فرێدەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ..!!

له (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((ما مِن مَوْلُودٍ إلَّا يُولَدُ علَى الفِطْرَةِ، فأبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ وَيُنَصِّرَانِهِ وَيُمَجِّسَانِهِ، كما تُنْتَجُ البَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِن جَدْعَاءَ؟ ثُمَّ يقولُ: أَبُو هُرَيْرَةَ وَاقْرَؤُوا إنْ شِئْتُمْ: {فِطْرَةَ اللهِ الَّتي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ} [الروم: ٣٠] الآيَةَ )).[2]

واتە: هەر منداڵێك کە لە دایك دەبێت ، پاشان دایك و باوکی یان دەیکەن بە یەهودی یان جوولە کە ، یان گاور یان مسیحی ، یان مجوس یان ئاگر پەرست ، هەر وەك ئاژەڵێك بێچوو وەکی تێل و تەواوی دەبێت ، پاشان (ابو هريره ) دەڵێت ئەگەر دەتانەوێت ئەم ئایەتە پیرۆزە بخوێنەوە کە ئەمە ماناکە یەتی کە (خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَاۚ لَا تَبۡدِيلَ لِخَلۡقِ ٱللَّهِ﴾ [الرُّوم : ٣٠]واتە : ئەم دینە پاکە ئەو فیترەتە پاکەیە کە خوای گەورە خەڵکی خستۆتە سەری، واتە: خەڵکی کە لە دایك دەبن لەسەر فیترەتی پاکی ئیسلامن، دواتر دایك و باوك و دەوروبەر دەیانگۆڕن و کاریگەریان لێدەکەن [لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ] هیچ گۆڕانێك بەسەر دروستکراوی خوای گەورەدا نایات، واتە: ئەوەی لەسەر فیترەتەکەی خۆی بمێنێتەوە لەسەر تەوحیدە، یاخود خەڵکی لەسەر فیترەتی پاکی ئیسلام و یەکخواپەرستی لامەدەن و وازیان لێبێنن..!!

[1] -صحيح مسلم برقم (٢٥٨١).
[2] -صحيح مسلم برقم (٢٦٥٨).

📖 لە (عبيد الله بن سلمان )دە گێڕێتەوە لە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ گێڕاوەتەوە ووتی : ((لَمَّا فتحنا خيبرَ أخرَجوا غَنائمَهُم منَ المتاعِ والسَّبيِ فجعلَ النَّاسُ يتبايعونَ غَنائمَهُم فجاءَ رجلٌ حينَ صلَّى رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ فقالَ : يا رسولَ اللَّهِ لقد رَبِحْتُ ربحًا ما رَبحَ اليومَ مثلَهُ أحدٌ من أَهْلِ هذا الوادي قالَ : ويحَكَ وما ربحتَ قالَ ما زلتُ أبيعُ وأبتاعُ حتَّى رَبِحْتُ ثلاثَ مائةِ أوقيَّةٍ. فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ : أنا أنبِّئُكَ بخيرِ رجلٍ ربحَ. قالَ : ما هوَ يا رسولَ اللَّهِ ؟ قالَ : رَكعتَينِ بعدَ الصَّلاةِ)).[1] واتە: كاتێ كە قەلای خیبر مان فتح كرد هەر كەس لە پێشی خۆی لە غەنیمەتە كە وەرگرت ، خەلكەكەش بەشە غەنیمەتەكەی خۆیان دەفرۆش مامەلە یان پیێ دە كرت بە یەكتری ..!! كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەركد ، پیاوێ هات ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ قازانجێكی وەهام كردوە ، هیچ كەسێ لە خەلكی بەم شێوە ئەمرۆ ئەوەندە قازانجی نەكردوە ..!! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هەوالت پیێ بدەم كە چاكترین قازانجی پیاو كامەیە ..؟! ئەویش ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا چاكترین قازانج كامە یە ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : دوو ركعات سوننەتی دوای نوێژە فەرزەكانە ..!!

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُاْ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْأَخِرَةِ ۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٨٦] واتە : ئا ئەمانەن ژیانی دونیایان پێشخستووە بەسەر ژیانی دوارۆژدا، بۆیە سزایان لەسەر سوك ناكرێتەوە، و هیچ سەرخەرێكیشیان نیە سەریانبخات لە سزای خوای پەروەردگار ...!!

هەروەها (خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُاْ ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِ ۚ فَمَآ أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٥]واتە : ئەوانەی ئەو سیفەتانەیان تێدایە ئەوانەن كە گومڕاییان گۆڕیوەتەوە بە هیدایەت، و سزای خوای پەروەردگار بە لێخۆشبونی ئەو، ئای چەند بوێرن لەسەر ئاگر بەو كارانەیان كە كرداری ئەهلی ئاگرە !! خوای پەروەردگار سەیری دێت كە دەستیان بۆ كاری وا بردوە، ئێوەش . ئەی خەڵكینە . سەیرتان لە بوێری، و خۆڕاگریان لەسەر ئاگر، و مانەوە تێیدا بێت . ئەمەش وەكو ڕیسواكردنیان و بەسوك و كەم تەماشاكردنی كاروباریان ..!!

هە روە ها دە فە رموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُاْ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَـٰنِ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٧﴾﴾ [آل عِمۡرَان : ١٧٧] واتە : بەڕاستی ئەوانەی كە باوەڕیان گۆڕیەوە بە بێباوەڕی هیچ زیانێك بە خوای پەروەردگار ناگەیەنن، بەڵكو زیانی كارەكەیان دەگەڕێتەوە بۆ خۆیان، وە لە دوارۆژیشدا سزایەكی بەئێشیان بۆ هەیە ..!!

[1] -سنن ابي داود برقم (٢٧٨٥).

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١٠٨﴾ [البَقَرَة : ١٠٨]واتە : جا هەر کەسێك واز لە ئیمان بهێنێ و بیگۆڕێتەوە بە کوفر ئەوە بەڕاستی گومڕا بووەو لە ڕێگای ڕاست لایداوە..!!

جا بێ گومان ئەوانە واتە: دوو روو کافر و مولحیدەکان و هاورەگەز بازان ئەوانەی پەیرەوی ڕێبازی کافران و موشریکان دەکەن وەك علمانیە کان ، جا باش لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ یان روون دە بیچتەوە کە چ زەرەرێکی گەورە یان لە خۆ داوە ، چونکە ئەوانە گومرایان کری لەجیاتی هیدایەت و پەیرەوکردنی پەیام و بەرنامەی (خوای گەورە ) و پێغەمبەرکەی ﷺ ، ئەو بازرگانیە کە ئەنجامیاندا سوودی نەبوو بۆیان زەرەرێکی یەکجار گەورەیان کرد تەنانە ت تووشی ئیفلاس یان موفلیس بوون تێدا ، هیچ قازانجی نە بوو بۆیان ،ئەگەریش سەرمایەیان هەبێت ئەوا بەرنامەی خوا و پێغەمبەرە کەیەتی ﷺ ، چونکە ئەم بەرنامەو پەیامەی (خوای گەورە ) پێغەمبەرکەیان لەدەست دا ، هە ر بۆیە مایە پووچ بوون وئیفلاسیان هێنا ، چونکە ئەوان ڕێبازی هیدایەت ڕێنمووی (خوای گەورە ) یان نەگرتەبەر و هیدایەت نەدران ، لەراستی دا گەورە ترین دەسمایە یان دەست کەوت لە ژیانی دونیا دا سەرمایە و دەست کەوتی ئیمان باوەرە یان پەیرەوە کردنی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ ، سەرمایە ئیمان ئیسلام کە ژیانی بەردەوام و گەنجیەتی هەمیشەیی و تەندورستی تەواو و دەولەندی دڵ و دەروون ، وە ئاسوودەی رەها پی دەستەبەر دەکرێت ، بەراستی بەدلنیایەوە قازانجترین بازرگانیە ، ئەوەی لەدەستی بدات هەموو شتێکی لەدەستداوە و دۆزەخی بۆ خۆی دەستەبەر کردووە ..!!

لە (ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((مَن دَعا إلى هُدًى، كانَ له مِنَ الأجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَن تَبِعَهُ، لا يَنْقُصُ ذلكَ مِن أُجُورِهِمْ شيئًا، ومَن دَعا إلى ضَلالَةٍ، كانَ عليه مِنَ الإثْمِ مِثْلُ آثامِ مَن تَبِعَهُ، لا يَنْقُصُ ذلكَ مِن آثامِهِمْ شيئًا.)).[1]

واتە: هەر کەسێك بانگی خەلکی بکات بۆ ڕێگای هیدایە ت ڕێنمووی کردن ،ئەوا بە ئەندازەی پاداشتی ئەوانەی کە شوێنی هیدایەتەکەی دەکەن ، پاداشتی دەست دەکەوێت ، هیچ لە پاداشتی ئەوانیش کەم ناکات ، هەر کەسێکیش بانگر خەلکی بکات بۆ گومرایی کردن ،ئەوا بێ گومان تاونی لەسەر وەك ئەوانەی شوێنی گومرایەکەی دەکەون ، هیچ لە تاوانی ئەونیش کەم ناکات ..!!

[1] - صحيح مسلم برقم (٢٦٧٤).

✍ لە ری (السدی ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – لە سە ر ووتە ی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ﴾ دەڵێت : ئەوان واتە : مونافیقە کان، گومراییان گرت و ، وازیان لە هیدایەت هێنا ..).[١]

✍ لەری (ابی نجیح ) لە (مجاهد ) – رەحمەت یخوای لیّ بێت – لەسەر ووتەی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ﴾ دەڵێت : ئەوان ئیمانیان هێنا پاشان کوفریان کرد ..).[٢]

✍ لە (الحسن البصری ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – لەسە ر ووتەی : ﴿ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ﴾ دەڵێت : ئەوان گومرایان هەڵبژارد بە سەر هیدایەت و رێنموویی ..).[٣]

✍ لەری(معمر ) لە (قتادە ) –رەحمەتی خوای لیّ بێت – لەسەر ووتەی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ﴾ دەڵێت: ئەوان گومرایان خۆش ویست لە جیاتی هیدایەت و رێنمووی ..).[٤]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – لە سەر ووتەی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ﴾ دەڵێت: ئەوە وەك ئەم باسە وایە ، کاتێك پێش هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ، جوولە کەکانی شاری مەدینە زۆر باش سیفە تەکانی ئەم پێغەمبەرە یان دەناسی کە باس کرا بوو لە کتێبە کانیان وەك (تورات ) ، پێش هاتنی باوەڕیان پی هێنا بوو ، چونکە ئەوان واتە : جوولە کەکان پێیان وابوو ئەم پێغەمبەرە لە نەوەی (ئە سحاقی کوری یعقوب ) (علیە السلام ) بێت ..؟! بەڵام کاتێك هات بۆ گەلی عەرب وە لە نەوەی (اسماعیل ی کوری یعقوب ) دەرچوو ..!! ئینجا ئەوان بە هۆی حسودی یان ئیرەیی پیّ بردنیان، بیّ باوەری و کوفر یان هەڵبژارد ، ئینجا گومرایان کری لە جیاتی هیدایەت ، دەیان ووت: ئێمە شوێن کەتەی محمد ﷺ بین و ئیمان و باوەر بە بەهێنن ..؟!چونکە باوەریان هەبوو پێش هاتنی ، بەڵام کاتێك هات لە بەڵێنەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە ، دوای هاتنی گومرایان هەڵبژارد لە جیاتی هیدایەت ، پاشان بە درۆیان خستەوە ، بە بازرگانیە کی خراپ پیس بۆگەنی گومرایی ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : ﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٦﴾ واتە: وە ئەم بازرگانیەی کە کردیان بە شوێنکەوتنیان بۆ کوفر لە جیاتی ئیمان نەیانبردەوەو قازانجیان نەکرد [ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ (١٦) ] وە هیدایەت دراویش نەبوون و هیدایەتیان وەرنەگرت لەبەر ئەوەی هیدایەتەکەیان گۆڕیەوە بە گومڕایی..!! ..).[٥]

✍ لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – لەسەر ووتەی ﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٦﴾ دەڵێت : سوێند بەخوا !! بە چاوی خۆتان بینیتان لە ریّ راست دەرچوون بەرەو گومرایی و لە ناو کۆمەڵەوە بۆجیابونەوە و لە دلیانەوە بۆ ترس و لە سوونەت وە بۆ بیدعە ..).[٦]

---

١ -اخرجه ابن جرير (٣٢٥/١).
٢ -اخرجه ابن ابي حاتم (٥٠/١).
٣ - تفسير ابن ابي زمنين (١٢٤/١).
٤ -اخرجه ابن ابي حاتم (٤٩/١).
٥ -تفسير مقاتل بن سليمان (٩١/١).
٦ -تفسير الطبري (٣١٦/١) و ابن ابي حاتم (٦٠/١).

قال تعالى: ﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧﴾ [البَقَرَةِ : ١٧]

﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا﴾ واتە: دوو ڕووەکان وێنە یان وەك یەکێك وایە کە لە شەوێکی تاریکدا ئاگرێك هەڵگیرسێنێت..!! ﴿فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ﴾ واتە: کە لە گەڵ دەوروبەری ڕووناك کردەوە ..!! ﴿ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ﴾ واتە : (خوای گەورە ) خێرو ڕووناکی یە کەیان لێ بکوژێنە تەوە ..!! ﴿وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧﴾ واتە: وە بیان هێڵێتەوە لە ناو چەند تاریکیەکی وا کە هیچ نەبینن ..!! بەڵێ نموونە وێنەی دوو ڕووەکان و دڵ دەروون نەخۆشەکان وەك کەسێك وایە کە ئاگرێك بکاتەو ( بەخەیالی خۆی بۆ سوود وەرگرتن و سوود بەخشینە ) بەلام هەر کە ئاگرەکە دەورو بەری خۆی ڕووناك کردەوە ، لە پر (خوای گەورە ) ڕووناکیە کەی لێ دە سێنێتەوە یان ڕۆشنایەکەی لێ دە کوژێنێتەوەو ، وە دونیای لێ دەکاتە تاریکەستان ، ئیتر هیچ شتێك نابینن ... بەڵێ ئەم نموونەیە کە (خوای گەورە ) هێناویەتەوە لەم سورەتەدا هەر دەڵێ لە گەل دوو ڕوو یان مونافیقە کانی ئەم سەردەمەی ئێستایە ، وەکو ئەم سەردەمە دوو ڕووەکان یان ئەوانە ی بەناو دەسەلات فەرمان ڕەواوی ئەم وەلاتەن ، بە پرو پاگەندەی دۆرینەکانیان ، بیرو باوەری ناپووت نا بەجێ لە نێو خەلکی دا دورست دەکەن بۆ بەرژەوەندی خۆیان ، وەکو مەشخەل و ئاگرێك یان شیعارێکە دەی ڕازینەوەبەقسەی لووس وبریقەدار ..؟!!، دواتریش ئەم شیعارەیان لێ دەبێتە درۆ و پوچ وبێ نرخ بێ بەها دەبێت ..؟!،خەلکی ماوەیەك لە دەوریاندا دەبن ، بەلام کاتێك (خوای گەورە ) ڕووناکی یان شیعارو مەشخەلە کەی لێ کوژاندنەوە ڕووناکی لێ ساندنەوە ئەوا ئیتر لەنێو خەلکیدا ریسوا دەکرێن سەر شۆری دونیا و قیامەت دەبن ، وە ئەوەیە هەرکەسێك (خوای گەورە ) هیدایەتی نەدات یان بەرزی نەکاتەوە بەهیچ کەسێك بەرز نابێتەوە ، هەر کەسێکیش (خوای گەورە ) تووشی گومرایی سەر گەردنی بکات نزمبێتەوە بەهێچ کەس بەرز نابێتەوە ، بەڵێ ئەوانە خەلکی تەنها بۆ ماوەیەکی کەم لە دەوریاندان ، بەلام هەرکات (خوای گەورە) ڕووناکی لێ کوژاندنەوە ، ئەوا دەبنە گالتە جاری خەلك و لە تاریکی دا دەمێنەوە بۆ هەتا هەتای هیچ ڕووناکی یەك نابینن، چونکە بارودخی لە کۆمەلێك دەچێت لە شەوێکی تاریك دا بن ..!!، یەکێکیا ئاگرێکی گەورە بکاتەوە بۆ ڕووناك کردنەوەی دەروبەری خۆیان ، کە ئاگرە کە ڕۆشنایی پێدا کرد یان گەش بوویەوە ئەوا دەرو بەری خۆی پێ ڕووناك کردەوە ، لە ناکاو یان لە پردا ڕووناکیەکە بکوژێتەوە نەمێنی ، تاریکی دابێت ، وە کەسە کانی نزیکی یان دەوربەری لە تاریکی دا دەمێنەوە وە هیچ نابینن ، وەك هیچ ڕێگە یەك نیە بۆ دەرباز بوونیان لەم تاریکی یە دا..!!، هەر بۆیە قورئانی پیرۆز چەندین نموونەی هێناوە تەوە بۆ کافران و دووڕووەکان ، چونکە ئەو کاتی سەردەمی دابەزاندی سەردەمی بلاغە و فصاحە بوو ، بۆیە قورئان بە نموونە دوو ڕووەکانمان بۆ دەناسێنی وەسفیان دەکات..!! چونکە دوو جۆرە نموونە دەهێنیتەوە هەر یەکەیان (تەشبیە) دەکات بە حال و بارودۆخێکەوە ..!!

قال تعالى: ﴿مَثَلُهُمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] واتە: نموونە و وێنەی ئەوانە ، مەبەست پێی دوو رووەکان یان مونافیقە کان ، یانیش دەستەیەك لە کافران ئیمانیان هێناوە دواتریش کافر بوون ..؟! ﴿مَثَلُهُمۡ﴾ ووشەی واتە: وێنەی ئەوان ، (مثل ) بەمانانی لێك چوواندنی شتێك بەشتێك دێت ، واتە : (شبە ) دێت ، یان لە زانی عەرەبی دا دەووترێت : (هذا مثل هذا او مثل هذا ) واتە: ئەو شتە وەك ئەو شتە وایە ، لێرەدا ووشەی (مثل ) بەکار هاتووە ، کە حالە تێك بە حالە تێکی دی چووێنراوە ، دیارە لە زمانی عەرەبی دا ووشەی (مثل ) بە (أمثال ) کۆدە کرێتەوە وەکو (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ ٤٣﴾ [العَنکَبُوت : ٤٣] واتە : وە ئەم نموونانەی کە بۆ خەڵکی دەهێنینەوە، بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرن و لێیەوە فێرببن، وە جگە لە زانا و شارەزایان بە خوا و بەئایەت و بەشەرعەکەی لەم نموونانە تێناگەن ..!!

قال تعالى: ﴿كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] واتە: وەك کەسێك وایە داوا لە کەسێکی تر بکات ئاگرێك دا گیرسێنێت بۆ سوودی خۆی کە سە نزیکەکانی لە شەوێکی تاریکدا ، یان دوا لە کەسێك بکات ئاگری پیٚ بدات کە خۆی ئاگرە کە دابگیرسێنێت یان رووناکیەکە دابگیر سێنێت ، ئەگەر سەنج بدەین لەم ئایەتە دا نموونەی کۆمەڵێکی بەتاك هێناوەتەوە ، قال تعالى: ﴿فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] واتە: کاتێك رووناکیەکە هەڵگیرسا و دەوربەری خۆی رووناك کردەوە راست و چەپ و پێش پاش ، سوودیان لیٚ وەر دەگرت بە بینینی دەوروبەر ،قال تعالى: ﴿ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧]واتە: (خوای گەورە ) رووناکی یەکەیان لیٚ بکوژێنێتەوە ، ئەمە دەبێتە وەلامی مەرج ..؟! واتە: (خوای گەورە ) ئەو رووناکی یەی کە سوودیان لیٚ وەردەگرت لیٚ وەربگرێتەوە ، ئەو هیچ نامێنێتەوە تەنها ئەوەیە کە زیانێکی زۆری بۆیان هەیە ، ئەویش سووتان دووکەلە کەی بۆ دەمێنیتەوە ، هەر لەبەر ئەمە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] یان دەفەرمووێت :قال تعالى: ﴿وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧﴾ [البَقَرَةِ : ١٧]

واتە: ئەگەر سەنج بدەین دەبینین (خوای گەورە ) تاریکی بە کۆ هێناوە بە لام رووناکی بە تاك هێناوە ، بەلیٚ تاریکی بە کۆ باسکردووە چونکە تاریکیە کان ئەمانەن : یەکەم: تاریکی شەو . دووەم : تاریکایی کەش هەواو هەور باران و خۆل وتۆز. سێیەم : هەروەها تاریکی تریش دەگریتەوە ئەویش تاریکی دوای کوژانەوەی ئاگر بێت یان هەر رۆشنایەك بێت . ئینجا (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] واتە: هیچ نابینن ..؟! ئەمە ش دبێتە دووپاتکردنەوە بۆ ئەم مانایە ووتەی قال تعالى: ﴿فِي ظُلُمَٰتٖ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] واتە : بەلگەیە لەسە توندی زۆری تاریکی یەکە کە هیچ نابینێت ، ئەو زانایانە کە دەچنە ژێرّ دەریاکان ناتوانن بچنە ژێری ژێرەوەی دەریا چونکە ئەوەندە تاریکە هیچ رووناك کەرەوەیەك یان هیچ رۆشن کەرەوەیەك ناتوانێت رووناکی بکاتەوە ئەم دیاردە سروشتیە بە بەلگە سەلمێنراوە بۆ خەلکی سەر زەوی ، هەربۆیە ئەم ووتەیەی (خوای گەورە ) بۆ دووپات کردنەوەیە ﴿لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧﴾ واتە: ئەوەندە تاریك دەبێت هیچ شتێك نابینێت جا چ بچووك نزیك بێت یان دوور بێت یان چ لە دەروو بەری دا بێت ، هیچ شتێك نابینێت وە کو کوێرێکی نابینایی تەواوی لیٚ دێت ، واتە چاوە کانی لەدەست دابێت ..!!

ئەم نموونەی سورەتی (البقرە ) کە (خوای گەورە ) هێناویە تەوە ، زانایانی تەفسیر راو بۆچوونی زۆریان لەسەر هەیە، بەلام رایەکی تریش هەیە ئەوەیە کە ئاینی ئیسلام چواندوە یان (تشبیە) بە ئاگر  رووناکی و رۆشنایی  دەدات ، ئیسلامیش ئەوها رووناکی رۆشنایی یە یان چرایەکی داگیرساوە هەر گیز ناکوژێتەوە ..؟!

هەندێکی رتیش لە زانایان دەلین : ووشەی ﴿ٱسۡتَوۡقَدَ﴾ واتە: (الف ) و (السین ) بە تاك هاتووە زیادەیە ..!! وە هەندێکی تریش دەلێن : خۆی (وقد ) یە واتە : خۆی هەلگیرسێنەری ئاگرە کەیە ..!بەلام ﴿ٱسۡتَوۡقَدَ﴾ واتە: دوا دەکات بۆ هەلگیرساندنی (الله اعلم ) چونکە هەموو کەسێك لە سەرتاوە داوای هیدایەت و رێنمووی خێرە دەکات ، هەر وەکو چۆن جوولە کەکان بە خەلکی شاری مەدینەیان دەووت : لە مەو دوا پێغەمبەرێك دێت ئێمە دوای ئەو دەکەوین و هەر هەمووتان دەکوژین یان دەردەکەین ، واتە هەموو جوولە کە کانی شاری مەدینە هەر لە سەرتاوە چاوەروانی ئەم پێغەمبەرەیان هەبوو ، کە پێغەمبەرێك دێت ، هەر وەك لە هەموو سەردەمێك دا لە هەموو چەرخ زەمانێکدا مرۆڤ پێ خۆشە چونکە سروشتی مرۆڤ وایە کە مرۆڤێکی تر بێت یان کەسانێکی تربێت رزگاریان بکات لەدەست ئەم زولم ستەمەی یان ئەم نا دادگەریەی کەبەرانبەریان دەکرێت ، کەواتە : ﴿ٱسۡتَوۡقَدَ﴾ خۆی داوای پەیدا بوونی روونکیان دەکرد ، بەلام کاتێ کە پەیدا بوو ، پەیرەوەیان نەکرد ، واتە : خۆیان رووناکی وئاگرەکەیان کوژاندەوە و ، لەتاریکی کوفر و بێ باوەری مانەوە ئەمە نموونەی یەکەمە ، با ئێمەش نموونەیەکی ئەم سەردەمە بهێنینەوە بەوەی کە زۆر روون ئاشکرایە لە بەر چاوی خەلك هەرگیز وون نابێت ئەم خەلکانەی کە بیرو هۆشیان دەخەنە کار زاناو عاقل و هۆشمەندن ، خەلکی لەم وەلاتەدا لە دەستی زولم ستەمی (صدام حسین ) کە فەرمان رەوایەکی رەها بوو سیستەمێکی دیکتاتوری بوو ، چەندەها خەلکی بێ تاوانی کوشت و ختیە ژێر خاك بەزیندووی تەنانەت کیمیا بارانی چەند شارێکی کورستانی کرد نموونەی شاری هەلبجە ، ئەم دەسەلاتە زۆر زالم و ستەم کار بوو ، بەلام کاتێك خەلکی هیوایان دەخواست نەمێنی و لە ناو بچێت کۆتایی بە زولم وستەمی ئەو بێت ، (خوای گەورە ) هەر وای کرد کردیە پەندی زمانە ، بەلام خەلکی هیوایان بەوە بوو خەلکانێك بێنە دەسەلات کۆتایی بەم زولم ستەم و نا داپەروەریە بێنیت ، کەچی ئەم هیواو داویەیان پووچ بوویەوە ، بەلکو خەلکانێك لەم ولاتدا دەسەلاتیان گرتە دەست بەلکو زۆر لەمەی پیشوو خراپ تر بوون ، ئەوان هەر زۆر دوو روو منافیق بوون گەندەلی دزی جەردەی ستەم کردن زۆرتر زیاتریش بوو ، نەك هاتن ستەم نەهێلن بەلکو بەخوینی خەلکی دەژیان ، ئەوەی کە لە سالانی (٢٠٠٩) حزبێك لە حزبەکان بە خوێنی خەلك هاتە دەسەلات بەلکو هەر زۆر خراپتری کرد ژیانی خەلکیان تێکدا خەلکیان تووشی فسادی گەندلی خراپەکاری کرد ، نە بوونە چرا یان رۆشنایی بۆ خەلکە کە بەلکو بوونە مایەی تاریکی زولم ستەم مووچە بڕینی خەلك ، ئەوانە هاتن ووتیان ئێمە چرای رووناکی بۆ خەلك دەگەرێنی نەوە بەلکو شیعارەکەشیان مۆمێك بوو ، نە ك نەبوونە رووناکی بەلکو (خوای گەورە ) زۆر چاك دەیان ناسی ئەوان مۆمەکەیان کوژایەوە بۆ هەتاهەتایی بوونە پەندیش بۆ ئەوانەی کە خەریکی پروپاگەندە دۆر فێل و تەلکە بازین ، بەلێ بوونە بە پەندی زمانە ،هەر کۆمەلێك یان هەرکەسێك دوو رووی یان نیفاقی لەگەل خەلکی دا بکات ئەوا (خوای گەورە ) بەرنامە شیعار پرو پاگەندەکەی دەکوژێنێتەوە بۆ هەتاهەتایی لە تاریکی دا دەی هێلیتەوە لە دونیاو لەدوا رۆژدا ، هەر بۆیە ئەوانەی پەندو ئامۆژگاریە کانی قورئانی پیرۆز وەرنەگرن و لە سەر رێبازی راستەقینەی ئیسلام و پەیامی قورئان نەرۆن ،ئەوا بەدلنیایەوە رووناکی

یان نامێنیت لەماوەیەکی کەدا چرای ڕووناکیان لێدەکوژێتەوە ئەوچرایەی کە بە درۆ دروستیان کرد بوو بۆخەلك ، ئینجا چارە نووس سەر ئەنجامیان وەکو ئەوانە لیٚ دیت کەلە رابردوو دا (خوای گەورە) ڕووناکی ڕۆشنایان لیٚ کوژاندوە بۆ هەتا هەتایی ..!!

قال تعالی: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴿١٧﴾﴾ [البَقَرَةِ : ١٧]واتە: وێنەی دوو ڕووەکان یان مونافیقە کان ، ئەگەر بتەوێت لیٚ یان تیٚ بگەیت لە باررد‌ۆخیان و سیفە تەکانیان ، وەك هی کەسێك وایە ، کە ئاگرێك دەکاتەوە ، دوای ئەوە ئاگرە کە مەشخەل پەیدا دەکات و دەورو بەری رۆشن یان رۆشنایی دەکاتەوە ، وا دیارە کەمێك لیٚ ی سوود مەند و بەهەرمەند دەبێت لەم رۆشنایە ، بەلام لە ناکاو داو کوتو پر ئاگرە کەی لیٚ دە کوژێتەوە رووشنایی نامێنیت و بەلکو دە بێتە تاریکە ستانی بە هیٚ ڕووناك کەروەوەیە کی پێش کەو توو یان داهێنانی ئادەمیزاد بۆی ڕووناك نابێتەوە هەر چیەك بکات هەر لە تاریکی دا دەمێنیتەوە ، ڕووناك لە دەست دەدات بۆی نامێنی بۆ هەتا هەتایی ، ئەگەر سەرنجێك بدەین لەم ئایەتەدا دەبێنین (خوای گەورە ) نەی فەرمووە : خوا ئاگرەکە یانی کوژاندەوە ، بەلکو سەر ئەنجامی ئاگرە کوژانەوەی باس دەکات یان چارە نووسی ئاگر درنەوەکەی باس دەکات ، بۆ نموونە : وەك ئەو کەسەی ئاگرێك دەکاتەوە بۆ خەلك بۆ خەلك بەلام مەبەستی نیازی ئاگر درنەوەکەی سوود وەگرتن نیە وەك رۆشنایی یان خۆ گەرم کردنەوە ، بەلکو تەنها مەبەستی چەواشە کاری کردنی خەلکە یان پروپاگەندەیە بۆ خەلك کە نیازو مەبەستی لەم ئاگردنەوەیە خراپەکاری فەسادی و گەندەلی لە دوایەوە بێت ، ئینجا (خوای گەورە ) سەر ئەنجام چارە نووسی ئەم ئاگرە یان مەشخەلە دیار دەکات ئەوەی مەبەست و نیازی خراپی هەبێت ئەواو دەی کوژێنێتەوە ، وە باسی سەر ئەنجامی کوژانەوەی ئاگرە کە دەکات کە بریتیە لەوە کە ڕووناکی یان رۆشنایی نامێنی ، هەروەها ڕووناکی یان رۆشنایی کوژانەویەکە یان دەبێتە لە ناو چوونیان و یان مردنیان ، وە یان دەبێتە کۆژانەوەی بیروفکر و بەرنامەو ڕێبازە کەیان ، وە بیٚ گومان (خوای گەورە ) نەی فەرمووە : (ضوء ) یان نەهێشت ، بەلکو فەرموویەتی : (نوور) یان دە کوژێنێتەوە ، واتە : هیچ ڕووناکی یان رۆشنایان نامێنی ،ووشەی (ضوء ) بە مانای تیشك دەکا ، ئیتر ئەگەر روناکی نەما کەوات تیشك بەهیچ شێویەك نامێنی ، واتە: قال تعالی: ﴿وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴿١٧﴾﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] بەلیٚ دوای ئەوەی کە ڕووناکیە کەیان لیٚ دە کوژێتەوە لیٚ یان دەگەرێن لە چەند تاریکی یەك دا دەمێنەوە ، کە هیچ شتێك نابینن ، وەك باسمان کرد لە قورئاندا هەمیشە ووشەی (نور ) بە تاك هاتووە ، بەلام ووشەی (ظلمات ) بەکۆ هاتووە ، چونکە (نور) یان ڕووناکی هێماو رەمزی حەق راستیە رۆشنایی یە ، هەر بۆیە حەقیش هەمیشە یە کە ، بۆیە (خوای گەورە ) ووشەی (نور ) بە یەك هێناوە بەلام ووشەی (ظلمات ) کۆ هێناوە ..!! جا ئەو کەسانەی کە بە پرو پاگەندە کانیان مەشخەلێك دادەگیرسێنن و بەلام ئەم ئاگرە بۆ ماوەیەکی زۆر کەمە دواتر چارە نووس سەر ئەنجامە کەی زۆر خراپ دەبێت بۆیان ، لە پرو لە ناکاو لیٚ یان دە کوژێتەوە ، تەنها زیان و خەسارە مەندە بن دووکەل زیانیان ئەم ئاگرەیان بۆ دەمێنیتەوە ، سەر ئەنجامیان هەمووی دەبێتە تاریکەستانی بە هیچ شێوەیەك ناگەرێتەوە ڕووناکی بۆیان بەلکو بە نابینایی دەمێنەوە ، چونکە خۆیان لە ژێر دروشمی ئەم ئاگرە دا حەشاردا بوو بە پرو پاگاندەی چەواشەگاری ، وە گەندەلی فسادی و خراپەکاری و زولم سەتە میان ئەنجام دەدا ، بەلام لە نا کاودا ئەم ئاگرە دەکوژێتەوە ، تاریکیان بەسەر دادێت ، بینایی یان بە هیچ شێوەیەك بۆ ناگەرێتەوە ، بەلکو هیچ شتیك نابینن ، لە تاریکی دا دە ژین ...!!!

بەڵێ چوواندنی ئیمان بە ئاگر ئاماژیە بۆ دوو شت :

یەکەم : ئەگەر زێر تێکەڵ بە مس شتی تر بکرێت ، ئەوا لە ئاگر دا بیسووتێنی هەموو شتەکان لە زێر جیا دەبێتەوە تەنها زێر پاك و بە سلامەتی دەمێنێتەوە لە سووتان ، لە رۆژی قیامەتیشدا ، خراپەکارو تاوانبار ئەگەر چووە ناو ئاگر ئەوا بێ گومان تاوان و خراپە کاریە کانی هەر هەمووی دەسوتێت ، تەنها ئیمان و باوەری دەمێنیتەوە بە سەلامەتی لێ دەردەجێت ..!!

دووەم : ئاگر هەموو شتێك دە سووتێنی ، ئیمانیش ئە گەر نوورەکەی بەهێز بیت هەموو شتێك دەسووتێنی لە دلدا جگە لە(خوا )

ئیمان رووناکیە یان نورە هەتاکو کاریگەری لە سەر دڵی دوو رووەکانیش یان مونافیقە کانیش هەیە لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] . هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت: قال تعالی: ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٠]واتە : ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بێت هەستەوەری بیستن و بینینیان لێئەسەنێتەوە..!!

قال تعالی: ﴿ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] واتە: (خوای گەورە) ئاگرو ڕووناکییەکەیان لێ ئەکوژێنێتەوە وە بەجێیان دێڵێ لە تاریکییەکدا کە بەرچاوی خۆیان نەبینن..!! هەر وەك ئەوانەی ئیمانی راستە قینەو دامەزراویان هێناوە (خوای گەورە ) لە تاریکی دا دەریان دەهێن و بەروە روشنایی و رووناکی دا ، هەروەك دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٥٧] واتە: پەرستراوی بەهەق ( الله ) یە کە دۆستی باوەڕدارانە بەسەرخستنیان و موەفەق کردنیان و پاراستنیان، دەریاندەکات لەتاریکیەکانی کوفر، بۆ ڕوناکی باوەڕ ..!!

بێ گومان رووناکی یان رۆشنایی لە دەستی (خوای گەورە ) دایە ، کە دیدات بە هەر کەسێك بی یەوێت بە فەزل و چاکەی خۆی ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت: قال تعالی: ﴿يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ [النُّور : ٣٥]واتە: خوای گەورەش ویستی لێ بێت هیدایەتی هەر کەسێك ئەدات بۆ نووری خۆی کە شایانی بێت..!! هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ۝٤٠﴾ [النُّور : ٤٠] واتە : وە هەر کەسێکیش کە خوای گەورە نووری پێ نەبەخشێ و هیدایەتی نەدات [ فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ ] ئەوە هیچ نوورو ڕووناکیەکی نیە، ئەمە دڵی کافرە بەو شێوازە تاریکە بە پێچەوانە ی دڵی باوەڕدار کە لە ئایەتەکەی پێشتر باس کرا..!!

هەروەها ووتەی قال تعالی: ﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] واتە: ئاماژەیە بۆ ئەو مونافیقەکانە کاتێك بە زمان ئیمانیان هێنا ، بەلام بە دڵ ئیمانیان نەهێنا هیچ رووناکیان نەبوو ، بەلکو ئەوەی بەدەستیان هێنا بە هۆی ئەوە بووە لە نێوان موسلمانان بوونە ..!!

✍ لە ڕێ (السدی ) لە (ابی مالك وابی صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – ڕزاو ڕەحمەتی خوا یان لێ بێت – لە سەر ووتەی :

قال تعالى: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] دەلێت : (لە کاتێك دا لە شاری مەدینە خەلکی دەهاتنە ناو ئیسلام و دەهاتنە بەردەم یان پێش پیغەمبەری خوا ﷺ ئیمان و باوەڕیان پیێ دەهێنا ، لە گەل ئەوە شدا ئەوان هەندێکیان دوو ڕوو و موونافیق بوون ، وێنە وەك پیاوێك لە تاریکی دا ، ڕووناکی یەك یان ڕووشنایەك دابگریسێنێت ، ئینجا شتیکە کەیان یان ڕۆشنایە کەی دەوروبەری خۆی زیانی پیێ بەگەیەنی یان ئازار بدات ، ئارام دەگرێت تاکو دەزانێت و ترسی لێ هەیە یان خۆی لێ دەپارێزی ، کەواتە کاتێك لە نێوانیاندا ئاگرەکە کوژایەوە ، هەر بۆیە ڕازی دەبێت یان قبولی دەکات ، وە نازانیت لە چی زیانی پێگەیشتوە یان ترساوە یان ئازاری پیێ دەگات ، ئەوە ئەوانەش دوو ڕووەکانن یان موونافیقە کانن ، چونکە ئەوان لە تاریکی یان گومرایی کوفر دان ، لە کاتێك دا بە ئیسلام ڕازی بوون یان قبول یان کرد ، ئەو کاتیش زۆر چاك دەیان زانی حەلال لە حەرام جیا بکەنەوە ، هەورەها چاکەش لە خراپە جیا بکەنەوە ، ئەگەر ئەنجامی بدات حەلال بە حەلال نەزانی و حەرامیش بە حەلام نەزانی و چاکە و خراپە لێك جیانە کاتەوە ، ئەوا بێ گومان کوفری کردووە واتە : بێ باوەر بووە پیێی، ئەوا بەدلنیایەوە ، کەر لار دەبێت ، یان گێل گەمژە دەبێت ، ئینجا ناگەرێتەوە نێو ئاینی ئیسلام ، یان ئەو ڕووناکی ئیمانەی بۆ ناگەرێتەوە ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی هاتووە ، ئەوا بەدلنیایی لە تاریکی دوو ڕوویی یان موونافقی دایە ..).[١]

✍ لەڕێ (علي بن أبي طلحة ) لە (عبدالله بن عباس ) – ڕەزاو ڕەحمەتی خوا یان لێ بێت- لە سەر ووتەی : قال تعالى: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] دەلێت : ئەو وەك ئەوە یە لێدانێکە لە دوو ڕووەکان ، لە کاتێك دا ئەوان شانازیان بە ئیسلام دە کرد یان خۆیان بەخاوەنی ئیسلام دەزانی ، کاتێك لە گە ل موسلمانان گفتوگویان دەکرد یان قسە یان لەگە ل دا دەکردن ، وە ئەوان خۆیان بە میرات گری ئیسلام دەزانی ، وە ئەوان هاوبەشی هەموو شتێکیان لە گەل موسلمانان دا دەکرد ، وەك نوێژی بە کۆمەل و جیهاد کردەوەی تریش ، بەلام کاتێك کە مردن چوونە ژێر گل دا ئەوا (خوای گەورە ) ئەو شکۆمەندیان لە دەستێنێتەوە لە دونیادا کە فخ فەخەیان پیێ دەکرد ، هەر وەك خاوەنی ئاگر ڕۆشنایی لی بسێنێتەوە ، قال تعالى: ﴿وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] وە دە لێت : ئەمەش سزاو ئازارە ..).[٢]

[١] -اخرجه ابن جرير (٣٣٧/١).
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم (٥٠/١-٥٢).

✍ لە ڕێ (العوفی ) لە (عبد الله بن عباس ) – رزاو رەحمەتی خوا یان لێ بێت – لە سەر ووتەی : قال تعالى: ﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسۡتَوۡقَدَ نَارًا﴾ دەلێت : ئەم نموونەیە لیّدانە لە دوو رووەکان ، کە دەفەرموویّت : قال تعالى: ﴿ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ﴾ دەلیّت: (النور) یان رووناکی ، واتە : ئە ئیمانیە کە پیّ گفتو گۆ دەکەن یان پیّ قسە دەکەن ، بەلام (الظلمة ) واتە : ئەو تاریکی وگومرایی و بیّ باوەریە یە کە گفتو گۆدەکەن یان قسەی پیّ دەکەن ، ئەوان بە حیسابی خۆیان لە سەر هیدایەتن ، بەلام وانیە پیّچەوانەی راستیەکان کارو کردەوە ئەنجام دەدەن لە سەر ریّگای راست لادەدەن ، کاتێك کە لیّ یان دوور کەویتەوە ..).[١]

✍ لە ڕێ (سعید ) لە (قتادە ) – رەحمەتی خوا یان لێ بێت- لەسەر ووتەی : قال تعالى: ﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسۡتَوۡقَدَ نَارًا﴾ دەلێت : ئەم نموونەیە لیّدانە لە دوو رووەکان ، چونکە دوو رووەکان بە زمان شهادە دە هێنن دەلێن : (لا إله إلا الله ) ، کاتێك لە گەل موسلمانان دا گفتو گۆ یان قسە یان دە کرد دە گەرانەوە لای موسلمانان ، بۆ ئەوەی مال و سامان و خوێنیان حەرام بێت لە لای موسلمانان چونکە ئەو کەسەی کە بە زمان بلێت (لا إله إلا الله ) ئەوا مال سامان خوێنی حەرام دەبێت لە موسلمانان ، بەلام لە کاتێك دا ئەوان واتە : دوو رووەکان دەمردن ئەوا هیچ ئیمان و باوەرێکیان لە دلّ دا نەبووە ، بەلکو هیچ راستیەکیان نەبوو لە کارو کردەوەکانیاندا ، هەروەکو چۆن کوێر بوون لە دونیادا حەقی (خوای گەورە ) یان نەدەدا وە گوێرایەلی فەرمانەکانی نەبوون..).[٢]

✍ لە ڕێ (ابی شیبە شعیب بن رزیق ) لە (عطاء الخرساني ) – رەحمەتی خوا یان لێ بیت – لە سەر ووتەی : قال تعالى: ﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسۡتَوۡقَدَ نَارًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] دەلێت : ئەوە نموونەیە لەسەر دوو رووەکان ، هەندێك جار چاویان دەبینێ ، پاشان هەست بە کوێر بوونی دلە کانیان دەکەن ..).[٣]

✍ لە (یحیی بن سلام ) دە لیت : (الحسن ) ووتي : واتە: وێنەی وەك پیاوێکە دەرواتە لە شەوێکی تاریك دا ، لە دەستی دا ئاگرێکی دەگیرساوی پیّ یە ، بۆ ئەوەی پیش پیّ یەکانی خۆی ببۆ رووناك بێتەوە و ببینێ ، بەلام لە کاتێك دا ئەم رووناکی یە نەمێنی و بکوژێتەوە ..؟! هیچ بەر چاوی خۆی نا بینی چۆن دە توانێت ریگا بکات ..؟! مونافیقەکان یان دوو رووەکان بە زمان قسە دەکەن شهادەت دەێنن دەلێن : (لا إله إلا الله ) قسە لە گەل موسلمانان دا دەکەن ، تەنها بۆ ئەوەی کە مال سامان خوێنیان لە لای موسلمانان حەرام بێت ،بەلام کاتێك دەمرن (خوای گەورە ) ئەم رووناکیە یان لیّ وەردەگریتەوە ، چونکە لە نێو دلیاندا بەراستیان نەزاینوە یان لە نێو دلیان دا پێچەوانیە راستیە دان بە ئیمان هێنان دانانێن دل یان پر لە کوفر شرك بێ باوەری ..).[٤]

[١] -اخرجه ابن جرير (٣٣٨/١).
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم (٥١/١).
[٣] - اخرجة ابن ابي حاتم (٥٠/١).
[٤] -تفسير ابن ابي زمنين (١٢٤/١).

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : ئەم نموونەیە لێدانە لە دوو رووەکان وەك: قال تعالى: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ﴾ واتە : رووناکیان لێ دە کوژێتەوە ، هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرمووی : وێنەی وەك دوو رووە یان مونافیق کاتێك کە قسە دەکات ، بەئیمانەوە قسە دەکات ،پێگەی یەکی رووناکی وەکو رۆشنایەکی هەلگیرساوی هەیە ، لە گە ل ئەم رووناکی یە دا دەروات ، تا ئەو کاتەی ئاگرە کە هەلبگیرسێت، ئینجا کاتێك ئیمانی نەما و ئەوا تاریکی یەك بە سەری دادێت وەك ئەو تاریکی یەی کە رووناکی لە سەری دا کوژابێتەوە ، ئینجا نە هیدایەت دە درێت و نە چاوی دەبینێ ،هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ﴾ واتە: نەمانی ئیمان و باوەر ، وەك ئەم ئایەتە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ۝٤٠﴾ [النُّور : ٤٠] واتە: ئیمان یان باوەر ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ﴾ [الأَنْعَام : ١٢٢] واتە: هیدایەت دانی ئەو کەسانەی کە بە قسەو زمان ئیمانیان هێناوە ..).[1]

✍ لە رێ ( عبيد بن سليمان ) لە (الضحاك بن مزاحم ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ﴾ واتە: (النور) یان رووناکی بە مانای ئیمان و باوەر ئەوکەسەی کەقسەی پێ دەکات ، بەلام (الظلمات ) واتە : تاریکی یەکان بەمانای بێ باوەری یان کوفرو گومرایی دێت ..).[2]

✍ لە رێ ( عبيد بن سليمان ) لە (الضحاك بن مزاحم ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەیقال تعالى: ﴿وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ﴾ واتە: ئەوانە خەلکی ئاگرن یان دۆزەخن ..).[3]

✍ لە رێ (عباد بن منصور ) لە(الحسن البصرى ) – رەحمەتی خوا یان لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ۝١٧﴾ دەلێت : واتە کاتێك دوو رووەکان مردن ، ئەوا کارو کردەوە کانیان گومرایی یە یان تاریکی یە ، وەك کردەوەی خراپە ، هیچ کارو کردەوەیە کی چاکەی نیە بۆ بەراست زانینی (لا إله إلا هو ) ..).[4]

---
[1] -تفسير مقاتل بن سليمان (١/٩١-٩٢).
[2] -اخرجه ابن ابي حاتم (١/٥١-٥٢).
[3] -اخرجه ابن ابي حاتم (١/٥١).
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (١/٥٢).

قال تعالى: ﴿صُمٌّ بُكۡمٌ عُمۡيٌ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨﴾ [البَقَرَةِ : ١٨]

﴿صُمٌّ بُكۡمٌ عُمۡيٌ﴾ واتە: کەرو لاڵ و کوێرن ، ﴿فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨﴾ واتە: هەر بۆیە لە گومرایی خۆیاندا ناگەڕێنەوە ..!!

قال تعالى: ﴿صُمٌّ بُكۡمٌ عُمۡيٌ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨﴾ واتە: لە بیستنی قەسەی چاك ، لاڵ لە ووتندا ، یان لە قسەی حەق دا زمانانیان نیە و لالە کە قسەی باشی پیَ بکەن ، کوێرن حەق نابینن و هەموو بەلگە گرینگە کان هیچ کاریان تیَ ناکات و نای بینن ،جا بۆ یە ئەمانە واتە: دوو ڕووەکان یان مونافیقەکان ناگەڕێنەوە بۆ ڕێگای ڕاست ، بەلیَ بێگومان دوو ڕووەکان لە ئەنجامی ئەوە دا کە کوفرو گومرایی یان لە دلی خۆیاندا جێگیر کردووە وایان لیَهاتووە قال تعالى: ﴿صُمٌّ بُكۡمٌ عُمۡيٌ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨﴾ واتە: وەك کەسانێك بن کە کەرو لاڵ و کوێر بێت ، ئەم دوو هەستەوەرەی کە هەیان هەر گیز بۆیان ناگەڕێتەوە ، واتە: ئەو هێزانەی کە (خوای گەورە ) بە مرۆڤی داوە یان بە مرۆڤە کانی بەخشیوە وەك پێچ هەستەوەرەکە ، بیستن و بینین ، بۆئەوەی حەقیان پیَ ببیستیَ ، وە شتیان پی ببینیَ ،وە بۆ ئەوەی دەربڕینیان پیَ بکات لەوەی کە لە دڵ و دەروونیاندایە ، ئەو هێزانە یان لە کار خستووە و نەحەق دەبیستن و نەحەق دەبینن ، نە هیچ کات حەق دەلیَن ،وا دیارە ئەو دوو کەسەش یەکسانن ، کە یەکێکیان کەر و لال و کوێر بێت لە حقیقەت دا ، ئەوەی دیکەشیان کە گوێیی هەبێت و چاوی هەبێت زمانی هەبێت قسەی پیَ بکات ، بەلام نەگوێیی هەبێت بۆ بیستن نە چاوی هەبێت بۆ بینین نە زمانی هەبێت حەق بلیَ ، چونکە سەرئەنجامی کردەوەی هەردووکیان وەك یەکە ..!!

قال تعالى: ﴿فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨﴾ واتە: لە ئەنجامی ئەوە دا گوێیان نیە حەقی پیَ ببیستێت ، وە چاویان نیە حەقی پیَ ببینێت ، وە زمانیان نیە حەقی پیَ بلێت ، بەهیچ شێوەیەکیش ناتوانن بگەڕێنەوە ، بەلیَ لەم ئایەتەدا بۆمان دەردەکەوێت ، ئەگەر مرۆڤ لەسەر کوفرو گومرایی تاوان و گوناه بەردەوام بوو ، وای لیَدیت بەربەستێکی وای بۆ پەیدا دەبێت ، لەدوایدا ناتوانێت بگەڕێتەوە ، وەکو چۆن کەسێك لە سەرەتادا ئیرادەی هەلبژاردن یان ئخیتاری بەدەست خۆیەتی ، بەلام کە دەکەوێتە لیَژیی دوای ئەوە لە ئەنجامی بەردەوامی دا تەماشادەکەی خۆی بۆ ناگیرێتەوە دوای ئەوەی کە دەکەوێتە خێرایی ، وەك چۆن سەیارەیەکە برێکی نەمێنیَ دپچرێت و لە سەرو لیَژدا دێتە خواریَ ، دیارە خۆی بۆ ناگەڕێتەوە ..!!

شکردنەوەئ هەندێك ووشە :

﴿صُمٌّ﴾ واته: کەر یان بەواتای (کەرە کان ) دێت ..!!

﴿بُكۡمٌ﴾ واته: لال یان بە واتای (لالە کان ) دێت ..!!

﴿عُمۡيٌ﴾ واته: کوێر یان بە واتای (کوێرەکان ) دێت ..!!

واته: ئەوەیە کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت:﴿صُمٌّ﴾ واته : لەبیستنی خێرو چاکە کەرن ، ﴿بُكۡمٌ﴾ واته: لە قسەی چاکە کردن لاڵن زمانیان نیە ، ﴿عُمۡيٌ﴾ واته: لە بینینی حەق و راستی کوێرن ، ﴿فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨﴾ واته: چونکە ئەوانە وازیان لە حەق و راستی هێنا پاش ئەوەی حەق یان ناسی بوو ، ناگەرێنەوە بۆ لای حەق و راستی ، بەلکو بە پێچەوانەی ئەو کەسەی کە وازی لە حەق هێناوە بە هۆی نەفامی گەمژەیی نەزانی و گومراییەوە ، بە راستی ئەو کەسانە هەر گیز عاقل هۆشمەند نابێت ..!!

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى:﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ٤٦﴾ [الحَج : ٤٦]واته : ئایا بەدرۆدانەر و بێباوەڕانی قورەیش بەسەر زەویدا نەگەڕاون تا شوێنەوار و پاشماوەی ئەو گەلە تیاچووانە ببین ؟ و بەو هۆیەوە بەبیر و مێشکیان بیرێك بکەنەوە و پەندوەرگرن، وە گوێبیستی هەواڵ و بەسەرهاتی ئەوان ببن و ئامۆژگاری لێوە وەرگرن ؟ جا بێگومان کوێر ئەو کەسە نیە کە چاوەکانی نابینان، بەڵکو کوێری تیاچوو ئەوەیە کە بینایی نیە لە هەستکردن و هەق وڕاستیەکان نابینێت، و پەندیان لێوەرناگرێت ..!!

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت: قال تعالى: ﴿فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ ٣﴾ [المُنَافِقُون : ٣]واته: بەهۆی بێباوەڕیانەوە خوای پەروەردگار مۆری دا بەسەر دڵیانەوە، بۆیە تێناگەن و نازانن هۆکاری چاکبوونیان چیە ..!!

لێرە دا ئەگەر سەرنج بدەین بەم دوو ئایەتەدا ئایەتی (١٨) سوورەتی (البقرە ) ، وە ئایەتی (٣) سورەتی المنافقون ، بۆمان دروون دەبێتەوە کە هۆکاری نەگەرانەوەیان چیە بۆ هیدایەت دا ، کە لەم ئایەتەدا دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨﴾ [البَقَرَةِ : ١٨] واته: لەم ئایەتەدا پیتی (الفاء) هاتووە بۆ (عاطفة ) هەروەها مانای (السببیە) تێدایە یان دە گەیەنیّ ، واته : دوو رووەکان لەبەر ئەم هۆکارانە بەهیچ شێوەیەك ناتوانن بگەرێنەوە و بۆ هیدات و تۆبە بکەن ، هۆکارە کانیش ئەمانەن : قال تعالى: ﴿صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ﴾ واته : ئەوانە کەڕن لە ئاستی بیستنی هەق بیستنی لێوردبونەوە وتێڕامانی، و لاڵن لە ئاست وتنی هەق، و کوێریشن لە ئاست بینینی روناکی هیدایەت.،؟!!

هەروەها لەم ئایەتەی سورەتی (المنافقون) نیش دا هاتووە (خوای گەورە ) دەفەرموویت: قال تعالى: ﴿فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ۝٣﴾ [المُنَافِقُون : ٣]واتە: بەهۆی بێباوەڕیانەوە خوای پەروەردگار مۆری دا بەسەر دڵیانەوە، بۆیە تێناگەن و نازانن هۆکاری چاکبوونیان چیە .،!! واتە: لەم ئایەتەشدا (الفاء) بۆ (عاطفة ) هاتووە کەواتە : (السببیە ) هۆکارێك هەیە کە تێ ناگەن بەهیچ شێوەیەك ئەویش لەبەر ئەم هۆکارانەیە کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت قال تعالى: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ [المُنَافِقُون : ٣] واتە : لەبەر ئەوەی ئەمان تەنها بەسەر زارەکی ئیمانیان هێنا پاشان لە دڵەوە کوفریان کرد، یاخود کەسانێك بوون بەڕاستی ئیمانیان هێنا پاشان مورتەد بوونەوەو بوون بە مونافیق [ فَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ ] خوای گەورە یش مۆری لەسەر دڵیان دا بۆ ئەوەی هەرگیز ئیمان نەچێتە دڵیان لەبەر ئەوەی ئیمان و هیدایەت و ڕێگای ڕاستیان ناسی پاشان لێی پاشگەز بوونەوە ..؟! ئینجا دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ۝٣﴾ [المُنَافِقُون : ٣] واتە : وە ئەوان لە هیچ شتێك تێناگەن کە سوودو بەرژەوەندی دوارۆژیانی تیادا بێت..!!

بەڵێ بێ گومان ئەو کەسانەی بیستینان و بینینیان لەدەست دەدن بۆ ڕێگای هیدایەت ، ئەوا بەهیچ شێوەیەك ناگەرێنەوە بۆ سەر شێوەی جارانی خۆیان ، چونکە لە پێشدا هیدایەت و ڕێنموویی بەرنامە ڕێبازە کەیان ناسی بوو ، لە ڕاست ئەم هەموو حەق ڕاستی و حەقیقە تەی ئیسلام دا ، خۆیان کەر لال و کوێر کرد، کەسێکیش ئامرازی بیستنی لەدەست بدا یان ئامرازی بینینی لەدەست بدات ئەستەم جارێکی تر هیدایەت وەربگرێت بۆی بگەریتەوە وەکو جاران ، چونکە خۆی هەتێدا ئەوەی هەلبژارد ، لە بەرنامە وئاینی ئیسلامی لادا چووە سەر بەرنامەو ڕێبازی بێ باوەران و ڕێبازی موشریکان ، بە خۆی لە سنوور دەرچوو مورتە یان پاشگە بوویەوە لە ئیسلام دەرچوو ، ئینجا جارێکی تر ناتوانێت بگەرێتەوە بۆ ئەو ڕێبازە ڕاست و دورستەی ئیسلام ، یان ناتوانێت تۆبە بکات و بگەرێتەوە ، کە ووتمان لە سەرتادا هیدایەتی وەرگرتبوو بەلام بە هۆی کەمژەیی و نەفامی خۆی ، بەرەو گومرایی بێ باوەری هەنگاوی نا ، لە ڕاست بیستنی ووتەی حەق دا خۆی کەر لال کرد ، وە لەڕاست حەق بینی دا خۆ کوێر کرد ، هیچ کات ووشەی خێر بە زای دانایەت و لالە لە ڕاست حەق بیژی دا ، ئیتر ئەوانە ناتوانن جارێکی تر بگەرێنەوە نێو ئیسلام واتە : بۆ نێو حەق و ڕاستی ، بەڵێ سەرتا کە ئیسلام هات ئەو دوو ڕووانە قۆزتیانەوە خەریکبوو لە گومرایی و تاریکستانی دا خۆیان ڕزگار بکەن، بەلام پاشان پاگەز بوونەوە لە سەر ڕێبازی ئیسلام لایاندا و لە سنوور دەرچوون بە هۆی کوفر بێ باوەری هاوبەش بریاردا نیان گەرانەوە سەر نەریتی باب وباپیرانیان تینی تێ کردنوو پشتیان لە ئیسلام هەلکردەوەو کەوتنەوە گومرایی تاریکستانی و بێ باوەری دا ، هەر وەك ئەونموونەی لە پێشدا باسمان کرد کە ئەو کەسانەی مەشخەل ئاگردەنەوە ، دواتر لە پر یان لە ناکاو (خوای گەورە ) ئاگرە کەیان یان ڕووناکی یەکەیان لێ دەکوژێنێتەوە بەهیچ شێوەیەك ڕووناکی یان ڕۆشنایی نابینن هەر لەتاریکی دەمێنەوە.!

له (ابو الدرداء ) – خوا لیّ رازی بیّت –دەگیرێتەوە دەلێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((حبُّكَ الشَّيءَ يُعمي ويُصِمُّ)).[1] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : کە تۆ شتێکت خۆش ویست لەئاستی کەر و کوێری دە بێت و هەست بە خراپەی ناکەی ..!!

هەر بۆیە مرۆڤ دەبێت زۆر گرنگی بە بیستن و گوێی گرتن بدات بۆ کاری چاکە و زکر و یادی (خوای گەورە ) هەر وەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ۝٣٧﴾ [ق : ٣٧] واتە: بەڕاستی لەناوبردنی ئوممەتانی پێشوو پەند و ئامۆژگاری تێدایە بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن دڵێکی ژیرن، یان کاتێك گوێڕا دەگرێت لە دڵی ئامادەیە و غافڵ و سەرقاڵ نیە ..!!

بێ گومان ئیمانداری راستە قینە کە دڵ ی دامەزراوە بە زکرو یادی خوا ، ئەوا هەمیشە و بەردەوام گوێی دەگرێت بۆ حەق راستی ، بەلام ئەگەر سەریری دوو رووەکان بکەین ، بۆ ئەمیشە گوێیان کەر و بۆ بیستنی حەق گوێی ناگرن لە ئاست ووشەی حەق دا گوێچەکەیان نیە خۆیان کەر دەکەن ..؟! کاتێك لە مجلسی ئیمانداران یان لە کور کۆمەلێکی زانستی شەرعی دا ، دادەنیشت ئەوا وەك ئەوەیە کە مس لە نێو گوێچەکەیاندایە هیچ قسەی حەق وەرناگرن خۆیان کەر کوند دەکەن لەئاست زانستی شەرعی دا یان لە ئاست بەرنامەو رێبازی خوا پەرستی راستە قینە و رێبازی ﷺ ، بەلێ دوو رووەکان تەنها بیر لەوە دەکەنەوە کە چۆن ناحەقی بکەن و بەدر رەوەشتی و خراپە کاری بلاوبکەنەوە لە نێو خەلکی دا ، دڵ یان بەهیچ شێوە یەك ناچێت بۆ رێگای راست و دورستی خوا پەرستی یان ووشەی حەق ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾ [التَّحْرِيم : ٤] واتە: پاشان خوای گەورە گفتوگۆ لەگەڵ عائیشەو حەفصەدا ئەکات (خوایان لێ ڕازی بێ) ئەگەر ئێوە هەردووکتان تەوبە بکەن و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێنەوە ئەوە دڵتان بەلای خوای گەورەدا گەڕاوەتەوە، یاخود بەلای تەوبەدا گەڕاوەتەوە، واتە: تەوبە بکەن و جارێکی تر شتی وا مەکەن..!!

بەلێ زۆر جار هەیە تۆ لە شوێنیك دادەنیشیت باسی چۆنیەتی خواپەرستی کردن ئیمان و باوەر وچاکە و چاکە کاری دەکەیت ، هەندێك کەس گالتە بە قسەکانت دەکەن و دەلێن بە خوا دواکەتوو یان فەقیرە هیچ نازانی بۆ حالی خۆی ، ئەوان باسیکی تر دەکن وەك ئەو پەندە کوردیە یە کە دەلێت : ئاش لە چ خەیالێك و ئاشەوان لەچ خەیالێك دە دەژیت ، ئەوان گوێی بۆ قسەکان یان ووتارە ئاینیەکان ناگرن خۆیان تێدا کەر کوند کردووە ،ئەوان تەنا باسی بارزگانی مامەلە کردن خۆشی دونیا گەشت و گوزار خۆیان و هەروەها باسی ئافرەتان ئارەزووکانی دونیادەکەن ، هیچ کات گوێی ناگرن بۆ ووتەی حەق راستی دا ، دیارە ئەو کەسانە واتە: مونافیقە کان شوێنیان لەرۆژی دوای دا نێو ئاگری دۆزەخە ..؟!

[1] - سنن ابو داود برقم (٥١٣٠).

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَقَالُواْ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ١٠﴾ [المُلك : ١٠] واتە: جا وەك دانپیانانێك دەڵێن : ئەگەر ئێمە وەكو بیستنی كەسێكی بیسەر بۆ حەق بمانبیستایە، یان بیرمان بكردایەتەوە لەوەی بانگ دەكرێین بۆی لە ڕیزی دۆزەخیەكان نەدەبوین ..؟!

بەڵێ نابینی كە قورئانی پیرۆز بۆ گوێ گرتنە ، بۆ ئەوەی گوێی خۆت بدەیتە ئەو كەسەی كە دەی لێت ، ئەوگوێگرتنەش ئەو ویستە و مەبەستەیە كە جێ بەجێ كردنی فەرمانەكانی (خوای گەورە ) بەدوا دا دێت ، هەروەك (خوای گەورە ) دفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ قَالُواْ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ٢١﴾ [الأنفَال : ٢١]واتە: وە نەكەن .ئەی باوەڕداران .لە سەرپێچی كردنی خوای پەروەدگار و پەیامبەركەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم وەكو ئەو بێباوەڕ و دووڕوانە بن كە گوێیان لە كتێبی خوا دەبێت و بۆیان ئەخوێنرایەوە دەیانوت : بەگوێیەكانمان بیستمان، كەچی لەڕاستیدا وردبینی ناكەن لەوەی ئەیبسن، وبیری لێ ناكەنەوە ..!!

بێ گومان ئەوە كارەساتێكی یان بەلاو نصیبەتێكی زۆر گەورەیە مرۆڤێك بێتە نێو وانەیەكی یان دروسێكی یان مجلسێكی زانستی شەرعی و مەجلسی دۆستانی (خوای گەورە ) گوێی بۆ قەسە مەترسیدارە كان ئەوانەی كە چارەسنووی دیار دەكەن لە رۆژی دوایی دا ، وە گرینگیان پێ نەدات گوێی خۆی بۆ كەر بكات ، وە نەزانێت كاری باشە و كاری خراپە چیە ، كە (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەكەی ﷺ لە قورئان و فەرموودەكاندا بۆیان زۆر بەجوانی رێك و پێكی روون كردۆتەوە ، ئەو كەس گرنگی بەم كۆرە یان مەجلسە زانستیە شەرعیە نەدات ،بێ گومان ئەو كەس چارەنووس دەرئەنجامی زۆر مەترسی دارە بەرەو هەڵدێرو سەر گەردانی و گومرایی دەروات ، ئەمەش نیشانەی گوێی نەگرتنە لە قەسەی چاكە مجلسی شەرعی دا ،هەروەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت :

قال تعالى: ﴿فِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٍ ٤٤﴾ [فُصِّلَت : ٤٤] واتە: وە ئەوانەیشی كە باوەڕ ناهێنن ئەوە گوێیان كەڕە لە ئاست بیستنی ئەو قورئانەو لێی تێناگەن، وە چاویان كوێرە لە ئاست بینینی و نایبینن [ أُولَئِكَ يُنَادَوْنَ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ ] ئا ئەمانە وەك ئەوە وایە لە شوێنێكی دوورەوە بانگ بكرێن و نەیبیستن و لێی تێنەگەن..؟!

قال تعالى: ﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ [البقرة : ١٩]

﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە: یان وەك كەسانێك لە چۆڵییە كدا بارانێكی لێز مە و بەخۆرین دەدات لە ئاسمانەوە ، ﴿ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ﴾ واتە: كە تاریكی زۆر و هەورە تریشقە و بروسكەی تێدابێت ، ﴿يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ﴾ واتە: بە جۆرێك كەپەنچە كانیان دەكەن بە گوێیاندا لەبەر گرمەی هەورە تریشقەكان ، ﴿حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِ﴾ بۆ خۆ پارستن لە مردن، ﴿وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ ،واتە: (خوای گەورە ) دەوری بێ باوەرە كانی داوە ..!!

بەلێ وەكو لە ئایەتی پێشتر دا باسمان واتە: ئایەتی ١٦ی سورەتی (البقرە) ، كە (خوای گەورە ) نموونەی هێناوە لەسەر دوو رووەكان، بە (ئاگر) ، بەلام لەم نموونەی هێناوە تەوە بە (ئاو) دێنە سەر باسی سەرگوزشتەی نموونەی دووەم ، ئالەم نموونەی دا حال یان بارودۆخی دوو رووەكان باس دەكات كە چۆنیەتی شپرزەیان باس دەكات لە چ حالە تێكدان ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەر موویت : قال تعالى: ﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ [البَقَرَةِ : ١٩] واتە: بارودۆخیان یان چۆنیەتیەكەیان وەكو كەسانێك وایە كە لە دەشتێكی چۆلدا یان دەشتێكی كاكی بەكاكی دا ،لە شەوە زنگێكی زۆر تاریكە ستان دا ، لێزمە بارانێكی بە خۆر یان بەهێز لێ یان بدات ، بە هۆی بەلە هەوری بارانە كە ئەوەندە تاریكتر بێت ، ئینجا لە دەنگ نالە و گەرمەی هەورە تریشقە ، هەرەوەها بروسكە كانیش یان بریق ئەوندەی تر كەش و هەواو كە سامناك بكەن و وە بكەونە نێو ترس و لەرز بیمەیەكی زۆرەوە ،هیچ دەسەلاتێكیان نە مێنی لە ترساندا ، جگە لەوەی پەنچەكانیان بخەنە نێو گوێیەكانیا ، یان بەشێوەیەك كە پەنچەی گەورە بخەنە ناو گوێیان بۆئەوەی كە گوێیان لەو دەنگی هەورە تریشقە یان بروسەكان نەبێت، لە ترسای مردن ئەمە بارودۆخیان بێت..؟!! بەلام كوا ئەمە چارە یان دەكات ..؟! جۆن لە هێزو دەسەلات و سەربازە كانی (خوای گەورە ) رزگاریان دەبێت ..؟! خۆ لە هەموو لایە كەوە دەوریان داوون ..؟! بەلێ ئەم وێنەی وەك بارانێكی بە لێزمە و بەخور وایە كە دەفەرموویت قال تعالى: ﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە: ئەم بارانە بەخورە لە ئاسمانەوە زۆر بەخێرایی دەێتە خوارە وە ، ئینجا كاتە كەی شەوێكی زۆر تاریك و سامناك بێت هەروەها بەهۆی پەلە هەورەكان تاریك تریش بێت كە دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فِيهِ ظُلُمَٰتٞ﴾ جا سەرەرای ئەو تاریكیە زۆرە ، هەورێكی تریش لە ناپلە هەورە كان دا بیت كە زیاتر تاریك تر بێت ،قال تعالى: ﴿وَرَعۡدٞ﴾ ئینجا لێدانی بروسكە بە ساماناكی كە تیشكە كەی یانر رووناكیە كەی یەكجار سامناك بێت ، هەوە گەرمەشی لە گەل دا بێت ، جا حال و بارودۆخی دوو رووەكان یان مونافیقە كان دەبێت چۆن بێت ..؟!!!

شی کردنەوەی هەندێك ووشە كان :

﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ﴾ واتە: (صیب ) ئەم (كاف ) بۆ (التشبیە ) واتە : لێك چواندن ، ووشەی (صیب ) دوو : مانای هەیە ، یەكەم : مانای (مطر ) واتە : باران دێت ، دووەم : بە مانای (غیم ) یان (غیوم ) دێت واتە : هەور یان هەورەكان ، بەلام لێرە دا بەناوی باران دێت چونكە لە ئاسمانەوە بە خور یان بەخێرایی دێتە خوارەوە ، بەلی (صیب ) لەم ئایە تەدا سێ تاریكی دەگرێتەوە یەكەم : تاریكی شەو ، دووەم : تاریكی باران ، سێ یەم : تاریكی هەورەكان

﴿وَرَعۡدٞ﴾ واتە: هەورە تریشقە ، یان دەنگی بەهێز لە گەل هەورەكاندا ،یان گەرمە گرمی بەهێز ، كاتێك هەور گەرمەی دەكات زۆر دەنگی بەهێزە زۆریش سامناكە ، مرۆڤ لە تاو دەنگە بەهێزەكەی دا بە پەنچەكانی هەردوو گوێیە كانی دەگرێت لە ترسا .

﴿وَبَرۡقٞ﴾ واتە: برووسك ، كە بریتیە لە لە تیشكە بەهێزانەی یان ئەو رۆشناییەی ، كە لە ئەنجامی پێك كەوتنی هەورە كان پەیدا دەبیّ ، وادیارە كە زۆر برووسكەی یان تیشكە كانی بەهێزو سامناكە .

﴿أَصَٰبِعَهُمۡ﴾ واتە: بەكۆ (پەنچەكانیان ، یان پەنچەكانی دەست دێت )، بە تاك واتە(أصبع ) پەنچە . هەندێك دەلێن : ئەم ئایەتە مجاز چونكە ناكرێت هەموو پەنچەكان بخەیتە نێو گوێیەكانت ، تەنها دوو پەنچە دەبێت ، بەلام لەراستی دا كاتێك گەوارە لێدەدات یان هەورە گرمە پەیدا دەبێت هەردوو دەستەكانت دەخەیتە بەرگوێیە كانت ..!!كەواتە هەر گیز مجازی لە قورئان دانیە ..؟!

﴿مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ﴾ واتە: (من ) سببیە واتە : هۆی پەنچە خستنە نێو هەر دوو گوێیەكان لە ترسی گەوارە و یان هەورە گرمە یان هەورە تریشقە بووە ، (الصواعق ) واتە :كۆیە كەیەتی بەلام بەتاك دەكاتە (الصاعقة )یە معنى : ( هي الصوت الشديد من الجو ، ثم قد يكون فيها نار فقط ، أو عذاب أو موت ، وهيفي ذاتها شيء واحد ) واتە: بریتیە لە دەنگێكی هەر زۆر بەهێز كە لە سەرووی ئاسمانەوە دێت ، جا جاری وا هەیە تەنها ئاگرەكەی تێدایە ، جاری واش هەیە دەبێتە ئازار و مردن یان مەرگ ، هەر بۆیە بەمانای ئاگریش دێت وە بەمانای مردن یان مەرگیش دێت ، چونكە مردن شتێكە (خوای گەورە ) بۆ هەموو دروست كراوەكانی نووسیوە ، هەر وەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَمَا يَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَلَن يُكۡفَرُوهُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ١١٥﴾ [آل عِمۡرَان : ١١٥] واتە : وە هەر كردەوەیەك لەكردەوە چاكەكان كەم بێت یان زۆر ئەم كۆمەڵە باوەڕداره ئەنجامی بدەن ئەوا لای خوای پەروەردگار ون نابێت و بەفیڕۆ ناچێت، بەڵكو سوپاسی لەسەر دەكرێن، و پاداشت دەدرێنەوە . وە خوای پەروەردگاریش زانایە بەو پارێزكار و لەخواترسانەی كە كردەوەی چاكەیان ئەنجامداوە و خۆیان بەدوورگرتووە لە حەرامكراوەكان، بەمەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار و وەرگرتنی پاداشتی ..!!

بەلێ باس کردنی هەر نموونەیەك لە قورئانی پیرۆز ، بەلگەیە لە سەر راست دورستی قیاسی کردن لە شەرعدا ، کە ئەم ووتەیە ووتی زۆربەی زانایانی تەفسیرە ، ئالەم نموونەیە دا ، روون کردنەوە و حال و بارودۆخی دووروەکان لەو پەری ناخۆشی دان ، چونکە بەردەوام لە ناو گومان و کوفر و نیفاق دان ، لە ترس و دلەراوکێیەکی زۆر گەورە دا دەژین ، بەرانبەر بە هەرەشەکانی قورئانی پیرۆز ، ئا لێرە دا لاوازی مرۆڤ مان بۆ دەر دەکەوێت کە دەوێتە ئاستی زۆر لاواز لە بەرانبەر دیاردە گەردونیەکان یان دیاردە سروشتیەکان دا ، بێ گومان ئەوەش بە هێزی و تواناو دەسەلاتی (خوای گەورە ) دەسەلمێنی بەرانبەر بە بەندە کانی ، چونکە شەو تاریکی و باران و هەورە تریشقە یان گەرمەی هەورە ،یان دەنگ و رووناکی برووسکە ، هەمووی ئەمانە بە ویستی (خوای گەورە ) روودەدن ، دەبێت بەندە روو لە خوا بکات و بگەرێتەوە بۆ لای زاتی (اللہ) کە هیچ رزگار بوونێك نیە جگە لە زاتی (اللە ) نەبێت.

دیارە دوو رووەکان ئەوەندە ترس و دلە راوکێ لە دڵ یاندایە هەر شتێك ببینێت ئەوەندە لێ دەترسن لە خۆیان بە گومانن ،وەك بلێ لە ترپەیەك دەترسن زۆر لە خۆیان لەشك گومانن ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡ﴾ [المُنَافِقُون : ٤]واتە: لە ترسنۆکیاندا هەموو دەنگێك یان شتێك روو بدات وائەزانن بۆ ئەوان هاتووەو دژی ئەوانە، یان ئایەتەکانی قورئان کە دائەبەزێ ئەزانن کە ئابرووی ئەوان ئەبات..؟! بۆیە ﴿وَبَرۡقٞ﴾ ئەو رووناکیە یان تیشکە سامناکەیە کە دەدات لە دڵ ی دوو رووەکان لە هەندێ کاتدا ، هە ر بۆیە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ واتە: لە ترسی هەورە تریشقە گەرمەی هەورە و تیشکی برووسك پەنجەکانیان دەخەنە ناو گوێیان نەکا بمرن ..؟! هەر بۆیە ئەم ترس ولەرزەی دوو رووەکان هیچ دادێگیان نادات ، چونکە ئەوانە لە ژێر دەسەلاتی (خوای گەورە ) دان بە هیچ شێوە یەك لێ دە رناچن هەر وەك دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلۡوَدُودُ ١٤ ذُو ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡمَجِيدُ ١٥ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ١٦ هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡجُنُودِ ١٧ فِرۡعَوۡنَ وَثَمُودَ ١٨ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكۡذِيبٖ ١٩ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ ٢٠﴾ [البُرُوج : ١٤ – ٢٠] واتە: وە خوای گەورە زۆر لێخۆشبووە بۆ تاوانی بەندەکانی، هەر کەسێك تاوانی کرد تەوبە بکات و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوەو پەشیمان بێتەوەو دەست لە تاوان هەڵگرێت و عەزیمەتی هەبێت نەگەڕێتەوە سەری ئەوا خوای گەورە زۆر لێخۆشبووەو لە تاوانەکانیان ئەبووریێت، وە خۆشەویستی زۆری هەیە بۆ بەندە گوێڕایەڵەکانی و دۆستانی خۆی ئەوانە ی گوێڕایەڵی و عیبادەتی خوای گەورە ئەکەن..!! وە خوای گەورە خاوەن عەرشی پیرۆزە، بە (ضهم)ی مەجیدەکە ئەخوێندرێتەوە (ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ) واتە: سیفەتی خوای گەورەیە، وە بە جەڕیش (ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدِ) سیفەتی عەرشەکەیە، خوای گەورە خۆی پیرۆزە یان عەرشەکەی پیرۆزە، وە هەردوو ماناکە تەواوە، خۆیشی و عەرشەکەی مەجیدو پیرۆزو بەڕێزن..!! خوای گەورە هەر شتێکی بوێ ئەنجامی ئەدات هیچ کەسێك نیە کە خوای گەورە بگەڕێنێتەوە لە کارێك کە بیەوێ ئەنجامی بدات..!! هی محمد - صلی اللە علیە وسلم - ئایا هەواڵ و بەسەرهاتی ئەو سەربازە زۆر کافرانەت بۆ هاتووە کە بۆ کوشتاری پێغەمبەرانیان کۆبوونەوە کە خوای گەورە چۆن لەناوی بردن..!! مەبەست پێی بەسەرهاتی قەومی فیرعەونە کە خۆی و سەربازانی بۆ موسا - صلی اللە علیە وسلم - کۆبوونەوە، وە قەومی ثەمودیش کە بۆ صاڵح پێغەمبەر - صلی اللە علیە وسلم - کۆبوونەوە کە خوای گەورە چۆن سزای دان و لەناوی بردن..!! بەڵکو کافرانی قوڕەیش و سەرجەم کافران بەردەوام و هەمیشە لە بەدرۆزانین و گومان و کوفردان..!! وە خوای گەورە دەوری ئەوانی داوەو لە ژێر تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە دەرباز نابن..!!

بەڵێ دوو ڕووەکان ، کاتیچك کە باران دەبارێت لە ئاسمان دا،وە تاریکی یان تاریکی هەور دێت ،وە هەورە تریشەقە و برووسك بەسەریان دادێت خێر و بەرکەت نیە بۆیان چونکە ئەوان زۆر لێ دە ترسێن ، چونکە هەموو کات بۆ بەندەی ئیماندار باران بارین ، وە دابەزینی لە ئاسمان خێر بەرکەت و نیعمەتە ، کە هەروەك زانایان دەڵێن : هەرەکان بەنزیکەی یەك ملیۆن تۆن ئاویان هەلگرتووە ، ئەو ئاوەش لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە بۆ سەر زەویدا ، هەموو ئەم ئاو و بارانە خێر بەرەکەت بۆ سەر زەوی دا ، چونکە گیاو دەرخت کان پێی سەوز دەبێت ، هەروەها دەرخت و دارە کانی پێ بەرهەم دار دەبێت بەرهی مێوەکان زیاد دەکات ، هەروەها کانیو کانیاوەکان شەلال و تاڤگە کان و گۆماوە کان ڕووبار دروست دەبێت ئاو لە سەر ڕووی زەوی دا زیاد دەکات هەر هەمووی بنچینەی خێر برکەت نیعمەتی (خوای گەورە ) یە ، بەلام کاتێك کە زستان دادێت لە ولاتی ئێمەدا یان لە هەندێك وەلاتی تر جیاوازە بەم شێوەیە نیە تەنها لە زستان بارانی زۆر ببارێت بەلکو بەردەوام هەورە تریشەق باران هەیە وەك ولاتە کانی باکوری ئەوروپا سویدو نەرویج و یان لە هەندێك ولاتی تریش دا ، بۆیە هەندێك جار بارانی بە خۆرو هەوری تاریك و یان هەورێکی زیاتر تاریك ترسناك و سامناك پەیدا دەبێت ، مرۆڤ لە خۆدی خۆیدا هەست بە ترس و دلە ڕاوکی دەکات ، جا سەرە رای ئەوی کە گەرمەی هەور یان تریشقەی هەورە ، تیشکی برووسك پەیدا دەبێت ، کاتێکی زۆر ترسناك و سامناکە ، ئا لەم کاتە دا دوو ڕووەکان زیرە دەکەن لە ترسان ، پێیان وایە ئەم باران و هەورە تریشقە یە خێری بۆیان نیە بەلکو هەر هەمووی شەرە ، ئینجا لە کاتێك دا یە کە هەورە بەری تیشکی رۆژی گرتووە تاریکی بە سەر زەویدا داپۆشراوە بە تاریکی یەکی یەکجار زۆر ، بێ گومان زۆر بێزار کەر ئەم تاریکی یە ، هەروەها دەنگی هەورە تریشقە ، یان ڕووناکی بەهێزی برووسك ،ئەمانە زۆر بێزار کەر بۆ دوو ڕووەکان لە رۆژە دا ، بەلام لە لای موسلمانان چاویان داپۆشراوە زیانیان پێ ناگات بەهۆی پێ دانی زەکات بە فەقیرو هەژاران دا ، هەروەها ڕێك پێکی دەربرنیا لەم رۆژە دا بە زمانە کانیان ئەمەش بەهۆی ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکان لە ڕۆژێکدا ،یان بە هۆی بەرۆژوو بوونیان لە مانگی ڕەمەزان و رۆژە کانی تریان ، بەلی موسلمانان ترسیان نیە لەوەی کە ویستی (خوای گەورە) لە سەر بێت ، چونکە باوەریان بە خوا ی تاك تەنها بە پێغەمبەرەکەی ﷺ هێناوە ،باوەریان بە پەیامەکەی هیناوە.

📖 لە (انس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((مثلُ أُمَّتِي مثلُ المطرِ ، لا يُدْرَى أوَّلُه خيرٌ أم آخرُه ..؟! )).[1] واتە: لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ئۆمەتی من وەك باران وایە نازانرێت سەرەتایەکی باشە یان کۆتایە کەی ..!!

📖 لە (عائیشە ام المومنون ) – خوا لی رازی بێت – دەلێت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((أنَّ رَسولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ كانَ إذَا رَأَى المَطَرَ، قالَ: اللَّهُمَّ صَيِّبًا نَافِعًا)) .[2]

واتە: لە (دایکی ئیمانداران ) – خوا لێ رازی بێت – دە گێرێتەوە دەلێت: لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەگەر بارنتان بینی ببارێت دوعاو نزا بکەن کە بارانێکی بە سوودتان بۆ ببارێت ..!!

[1] - شيخ الالباني في هدية الرواة برقم (٦٢٤١).
[2]

له (عائیشه ام المومنون ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : ((كانَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ إذَا كانَ يَوْمُ الرِّيحِ وَالْغَيْمِ، عُرِفَ ذلكَ في وَجْهِهِ، وَأَقْبَلَ وَأَدْبَرَ، فَإِذَا مَطَرَتْ سُرَّ به، وَذَهَبَ عنْه ذلكَ، قالَتْ عَائِشَةُ: فَسَأَلْتُهُ، فَقالَ: إنِّي خَشِيتُ أَنْ يَكونَ عَذَابًا سُلِّطَ علَى أُمَّتِي، ويقولُ، إذَا رَأَى المَطَرَ: رَحْمَةٌ )).[1] واتە: ئەگەر رۆژێجك هەرو باو هەلی کرد بایە ،بۆیە ئەمە بە رووخساریەوە دەناسرا ، ئینجا دهاتوو دەچووە ، کە بارانەکە دەباری دواتر ئاسایی دەبۆیەوە ، پاشان عائیشە دەلێت : پرسیارم لێ کرد ، من ترسام نەوە سزایەك بە سەر ئۆمەتەکەدا بێت ..؟! فەمووی : ئەگەر بارانت بینی رەحمەتە ..!!

له (ابی سعید الخدری ) – خوا لی رازی بێت – دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لو أمسَكَ اللَّهُ عزَّ وجلَّ المطَرَ عن عبادِهِ خمسَ سنينَ ثمَّ أرسلَهُ لَأصبحَتْ طائفةٌ منَ النَّاسِ كافرينَ ، يقولونَ : سُقينا بنَوءِ المِجدَحِ))[2]

واتە: ئەگەر پێنچ ساڵ باران بگرێتەوە لە بەندەکانی ، پاشان بێ بارانی کۆمەلێك لە خەلکانی کافر و بێ باوەر دەبن ، وە دەلێن بارانمان بۆ بباریێ بە هۆی (المجدح ) (کە یەکێکە لە و ئەستێرانەی لای عەرەب بەلگەیە لەسەر باران بارین ).

له (انس بن مالك ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : ((قحَطَ المطرُ عامًا ، فقامَ بعضُ المسلِمينَ إلى النَّبيِّ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ في يومِ الجمُعةٍ فقالَ يا رسولَ اللَّهِ قحَطَ المطرُ وأجدَبتِ الأرضُ وَهلَكَ المالُ قالَ فرفعَ يدَيهِ وما نَرى في السَّماءِ سَحابةً فمدَّ يدَيهِ حتَّى رأيتُ بَياضَ إبطيهِ يستَسقي اللَّهَ عزَّ وجلَّ قالَ فَما صلَّينا الجُمعةَ حتَّى أهمَّ الشَّابَّ القريبَ الدَّارِ الرُّجوعُ إلى أهلِه فدَامَت جُمُعةً فلمَّا كانتِ الجمعةُ الَّتي تَليها قالوا يا رسولَ اللَّهِ تَهدَّمتِ البيوتُ واحتُبِسَ الرُّكبانُ قالَ فتبسَّمَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ لِسُرعةِ مَلالةِ ابنِ آدمَ وقالَ بيَدَيهِ : اللَّهمَّ حَوالَينا ولا علَينا ، فتَكشَّطَت عنِ المدينةِ)).[3]

واتە: سالێك باران نەباری ، هەندێ لە موسلمانان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی هەینی دا ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، باران گیراوە و ،وە زەوی ووشك بووە مەرو مالات تیاچوون ، ووتی : دەستەکانی بەرز کردەوە هەتاکو سێنەی بن بالی دەرکەوت دوای باران بارینی لە( خوای گەورە ) کرد، پێشتر لە ئاسماندا هیچ هەورێکمان بەدی نەدە کرد ، کاتێ نوێژی هەینی مان کرد ، گەنج ولاو هەبوو مالی نزیك بوو دەی ویست بچێتەوە بۆ ناو خێزانەکەی بە هۆی سەختی بارانە کەوە نەیدەتوانی بگەرێتەوە ، کاتێ هەینی داهاتوو هاتەوە ، ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، مالە کان رووخان و سوارەکان گیریان خوارد ، ووتی : پێغەمبەری خوا بزەی پێکەنینی کرد بەهۆی ئەوەی نەوەکانی ئادەم چەند زوو بێزار دەبن ، دەستەکانی بەرزکردەوەو فەرمووی : لە دەوربەرمان ببارێنە نەك لەسەر مان ، دواتر بارانەکە لەسەر شاری مەدینە نەما ..!!

---

[1] -صحيح مسلم برقم (٨٩٩).
[2] -سنن النسائي برقم (١٥٢٥).
[3] -سنن النسائي برقم (١٥٢٧).

﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ [البَقَرَة : ١٩] بی گومان باران بارین بۆ سەر ئۆمەتی ﷺ نیعمە و برەکەتی (خوای گەورە ) یە ، بەلام نموونەی ئاو یان باران بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و ئیمانداران هیدایەت و رێنموویە ، باران زانستە ، چونکە زانست هیدایەت بۆ ژیانی هەموو رووحەکان ، هەروەك باران گیان بە بەر هەمو لاشەیەك دەبەخشێت ، کە (خوای گەورە ) دەفەر موویت : قال تعالی: ﴿وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَٰتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ ۝٥٨﴾ [الأَعۡرَاف : ٥٨] واتە : وە زەوی وخاکی پاك وبەپیت کاتێك کە باران دادەبارێتە سەری بەفەرمان و ویستی خوای پەروەردگار ڕووەکێکی چاك و ئاسایی دەردەهێنێت، بەهەمان شێوە باوەڕداریش ئەگەر قورئانی بەسەردا بخوێنرێتەوە پێی سوودمەند دەبێت، و ژیانێکی بۆ خوا صوڵحاوی تێدا بەرهەم دەهێنێت، بەڵام وە ئەو زەوییەی پیس و خراپە ئەوا جگە لە ڕووەکی خراپ و بێ سوود نەبێت هیچی تر ناڕوێنێت، بەهەمان شێوە کەسی بێباوەڕیش سوودمەند نابێت لەئایەتەکانی خوای پەروەردگار . بە هاوشێوەی ئەو هەمەجۆریە لە هێنانەوەی نموونەکاندا بۆ ڕوونکردنەوە بەڵگە و نیشانەکان هەمەجۆر دەکەین بۆ چەسپاندنی ڕاستی و ڕەوایی بۆ کەسانێك کە شوکرانەبژێری نیعمەتەکانی خوای پەروەردگارن و گوێڕایەڵی دەکەن ..!!

لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لێ رازی بیت – دەگێریتەوە دەلێت : ((أَقْبَلَتْ يهودُ إلى النبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم ، فقالوا : يا أبا القاسِمِ أَخْبِرْنا عن الرَّعْدِ ، ما هو ؟ قال : مَلَكٌ من الملائكةِ مُوَكَّلٌ بالسَّحَابِ ، معه مَخَارِيقُ من نارٍ يَسُوقُ بها السَّحابَ حيثُ شاء اللهُ . فقالوا : فما هذا الصوتُ الذي نَسْمَعُ ؟ قال : زَجْرُهُ بالسَّحَابِ إذا زَجَرَه حتى يَنْتَهِيَ إلى حيثُ أُمِرَت . قالوا : صَدَقْتَ . فقالوا : فأَخْبِرْنا عَمَّا حَرَّمَ إسرائيلُ على نَفْسِهِ . قال : اشْتَكَى عِرْقَ النَّسَا فلم يَجِدْ شيئًا يُلاَئِمُهُ إلا لُحومَ الإبِلِ وألبانَها ، فلذلك حَرَّمَها . قالوا : صَدَقْتَ)).[1]

واتە: جوولەکەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ووتیان :ئەی باوکی قاسم ، هەورە تریشقە چیە ..؟! فەرمووی : (مەلائیکەیە لە مەلائیکە کان ناوی (رعد ) هەوری پیّ سپێراوە ، گورزێکی ئاگرینی پێیە هەوریپی لی دە جوولیّ نیّ یان دەخورێنیّ ، بۆ ئەو شوێنانە ی (خوای گەورە) ویستی لە سەر بێت ، ووتیان : ئەو گرمە نالە یە چی یە کە دەبیستین ..؟! فەرمووی : ئەوە دەخرێتە هەورە کە هە تاکو براوات بۆ ئەو شوێنەی فەمانی پیّ کراوە ..!! ووتیان : راست دەکەیت ، ووتیان : ئەی نەوەی ئیسرائیل واتە یەعقوب چی لەسەر خۆی حەرام کرد، ئەو گرمە نالە یە چی یە دەبیستین ..؟! فەرمووی : (یەعقوب (علیە السلام ) باداری دەردە لاقی هەبوو هیچ خواردنی گونجاو نەبوو بۆی جگە لە گۆشتی ووشتر و شیرەکەی نەبیّ لەبەر ئەوە حەرامی کرد ) ووتیان : راست دەکەیت ..!!

[1] -سنن الترمذي برقم (٣١١٧).

بەڵێ ئەم ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ لەسەر ئەوەی کە باران بارین بۆ دوو رووەکان دەبێتە دەردو بەلاو نصیبەت، هەروەك دەفەرموویت:

قال تعالى: ﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ [البَقَرَة : ١٩] واتە : یان حاڵی کۆمەڵێکی تر لەدوورِوان. کە جارێك هەقیان بۆ دەردەکەوێت وجارێکیش بە گومان دەبن لە ئاستیدا. وەکو حاڵی کۆمەڵە کەسێکە کە بە چۆڵەوانیەکدا دەڕۆن و بارانێکی توندیان بەسەردا دادەبارێت، هاوکات لەگەڵ تاریکیەکی زۆر کە ئەو ناوچەیەی داپۆشێت، لەگەڵ شریخە وچەخماخەی هەورە بروسکە وچریکەی سوتێنەر، بە ڕادەیەك ئەوەندە ساتەکە نارِەحەتە پەنجەکانیان دەخەنە گوێیان، لەترسی تیاچوون، و خوای پەروەردگاریش دەوری کافرانی داوە بۆیە لێی دەرباز نابن و لێی وون نابن ..!!

ئەم ئایەتەش بەڵگەیە بۆ تێگەیشتنی ژیان بۆ بەندەی ئیمانداری دامەزراو (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ٤٥﴾ [الكَهۡف : ٤٥] واتە : وە سیفەتی دونیا وەك نموونە. ئەی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم. بۆ خەڵك بهێنەرەوە. بەتایبەت بۆ خۆبەزلزانەکانیان. ئەو دونیایەی کە ئەوان پێی سەرسام بوونە و هەڵخەڵەتاوون بەهۆیەوە، کە چەند ڕووکەشیە و زووناميێنێت و لەدەست دەچێت، بەوەی کە وەکو ئاوێك وایە کاتێك خوای پەروەردگار دایدەبەزێنێت لە ئاسمانەوە و بەهۆیەوە . بەویستی خوای پەروەردگار . ڕووەك و درەخت دەردەچێت، و هەتا سەوز دەبێت و پێدەگات و دەگەشێتەوە، ئەوەش تەنها کاتێکی کەم بەردەوام دەبێت ودواتر دەبێتە پوش وپەڵاشی ووشك وتێکشکێنراو با بەملاولادا دەیبات و فڕێی دەدات . وە بێگومان خوای پەرەردگاریش بەدەسەڵات وبەهێزە بەسەر هەموو شتێکدا. واتە : خاوەن دەسەڵات و توانایەکی زۆر گەورەیە بەسەر هەموو شتێکدا..!!

ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لەسەر ئاینی جولە کە و گاورە کان مونافیقە کان و موشریکەکان یان ئەوانەی گومرا بوونە ، (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ بِئۡسَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥﴾ [الجُمُعَة : ٥] واتە : حاڵ و نمونەی ئەو جولەکانەی کە کردەوەکردن بە تەوراتیان پێ ڕاسپێردرا و پاشان کردەوەیان پێ نەکرد، وەك نمونەی ئەو گوێدرێژەیە کە کتێبێکی زۆری لەسەر پشتی هەڵگرتبێت و نەزانێت چیان تێدایە، بەڕاستی نموونەی ئەو گەلەی کە باوەڕیان نەهێنا بە ئایەت و نیشانەکانی خوای پەروەردگار بەدرۆیان زانین، و سودیان لێوەرنەگرتن زۆر ناشرین و قێزەونە، خوای پەروەردگاریش ڕێنمویی و سەرکەوتووی خەڵکی ستەمکار ناکات ئەوانەی کە سنورەکانی خوا دەبەزێنن، و لە گوێڕایەڵی ئەو دەردەچن ..!!

📖 لە (ابي هريرة) – خوا لی رازی بیت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ووتەی ((إنَّما الصَّيِّبُ هاهنا)) .[1] واتە: ئاماژەی بەدەستی کرد بۆ ئاسمان ..!!

✍ لە (عبدالله بن مسعود )- خوا لی رازی بیت - لە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە لەسەر ووتەی :﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ دەڵیت : واتە : باران ..).[2]

✍ لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – لەسەر ووتەی: ﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾دەڵیت : واتە : باران ..).[3]

✍ كۆی زانایان لەسەر ئەم ووتەیە ﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾یەك دەنگن کە بە مانای (باران ) دەکات ، زانایان وەکو : (ابی العاليه ) ، (مجاهد ) ، (الحسن البصری) ، ( عطية العوفي ) ، (عطاء بن ابي رباح ) ، (قتادة ) ، (اسماعيل السدي ) ، (عطاء الخرساني ) ، (مقاتل بن سليمان ) ..).[4]

✍ لە ری (ابي الهيثم ) لە (سعيد بن جبير ) رە حمە تی خوا یان لی بیت – دەڵیت : واتە : هەورە بارانی لە گەل دا بێت ..).[5]

✍ لە ری (جوبير ) لە (الضحاك بن مزاحم ) – رە حمە تی خوایان لی بیت – لە سە رووتە ی ﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ دەڵێت : واتە : هەورەکان ..).[6]

✍ لەرێ (ابن وهب ) لە (عبدالرحمن بن زيد بن أسلم ) – رەحمەتی خوا یان لی بێت – لەسەرووتەی: ﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ دەڵێت : واتە : وەك باران لە ئاسمانەوە ..).[7]

✍ لە (ابن كثير ) رە حمە تی خوا ی لی بیت – دەڵیت: (الصيب ) ئەو بارانە ، باشترینە ووتە لەسەری ئەم ووتەیە کەدەڵێت : (ئەوە بارانە لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە لە بارو دۆخێکی یان لە حالێکی هەورێکی زۆر تاریك دا ..).[8]

[1] -الهيثمي في مجمع الزوائد (٢١٩/٢).
[2] -اخرجه ابن جرير(٣٥٢/١).
[3] -اخرجه ابو يعلى في مسنده (٢٦٦٤).
[4] - موسوعة التفسير المأ ثور (١١٨/٢-١١٩).
[5] -اخرجه ابن جرير (٣٥٣/١).
[6] -اخرجه ابن ابي حاتم (٥٤/١).
[7] -اخرجه ابن جرير (٣٥٣/١).
[8] -تفسير القران العظيم ابن كثير (٣٠٠/١).

✍ لە ری (علی بن ابي طلحة ) لە (عبداللە بن عباس) – خوا لی رازی بیت – لە سە ر ووتە ی ﴿فِيهِ ظُلُمَٰتٌ﴾ واتە : (ابتلاء ) ناخۆشی ..)[1]

✍ لە ری (ابن اسحاق ) لە (عبداللە بن عباس ) — خوا لی رازی بیت —لەسەر ووتەی ﴿فِيهِ ظُلُمَٰتٌ﴾ واتە : بە مانای بیَ باوەری نایەت لێرە دا ، بەلکو ئاگادار کردنەوە یە بۆ مردن ، لە نێوان ئێوە دا کە مشتوو مری لەسەرە ، وە ك ئەو کەسەی کە لە تاریکی بارن دا وە سفی دەکات ..).[2]

📖 لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لیَ رازی بیت – دەگێریتەوە دەلێت : ((أَقْبَلَتْ يهودُ إلى النبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم ، فقالوا : يا أبا القاسِمِ أَخْبِرْنا عن الرَّعْدِ ، ما هو؟ قال : مَلَكٌ من الملائكةِ مُوَكَّلٌ بالسَّحَابِ ، معه مَخَارِيقُ من نارٍ يَسُوقُ بها السَّحابَ حيثُ شاء اللهُ . فقالوا : فما هذا الصوتُ الذي نَسْمَعُ ؟ قال : زَجْرُهُ بالسَّحَابِ إذا زَجَرَه حتى يَنْتَهِيَ إلى حيثُ أُمِرَت . قالوا : صَدَقْتَ . فقالوا : فأَخْبِرْنا عَمَّا حَرَّمَ إسرائيلُ على نَفْسِهِ . قال : اشْتَكَى عِرْقَ النَّسَا فلم يَجِدْ شيئًا يُلاَيِمُهُ إلا لُحُومَ الإبِلِ وألبانَها ، فلذلك حَرَّمَها . قالوا : صَدَقْتَ)).[3] واتە: جوولەکەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ووتیان :ئەی باوکی قاسم ، هەورە تریشقە چیە ..؟! فەرمووی : (مەلائیکەیە لە مەلائیکە کان ناوی (رعد ) هەوری پیَ سپێراوە ، گورزێکی ئاگرینی پێیە هەوریپی لی دە جوولیَ نیَ یان دەخورێنیَ ، بۆ ئەو شوێنانە ی (خوای گەورە) ویستی لە سەر بێت ، ووتیان : ئەو گرمە نالە یە چی یە کە دەبیستین ..؟! فەرمووی : ئەوە دەخرێتە هەورە کە هە تاکو براوات بۆ ئەو شوێنەی فەمانی پیَ کراوە ..!! ووتیان : راست دەکەیت ، ووتیان : ئەی نەوەی ئیسرائیل واتە یەعقوب چی لەسەر خۆی حەرام کرد، ئەو گرمە نالە یە چی یە دەبیبستین ..؟! فەرمووی : (یەعقوب (علیە السلام ) باداری دەردە لاقی هەبوو هیچ خواردنی گونجاو نەبوو بۆی جگە لە گۆشتی ووشتر و شیرەکەی نەبیَ لەبەر ئەوە حەرامی کرد ) ووتیان : راست دەکەیت ..!!

✍ لە ریَ (عمیرە بن سالم ) لە (ابیە ) لە (علی بن ابی طالب ) لە سە ر ووتە ی ﴿وَرَعْدٌ﴾ واتە: ملائکە یان فریشتە ..).[4]

✍ لە (ابی هریرە ) — خوا لی رازی بیت - دەلێت : (خوای گەورە ) هیچ شتێکی بە هێز تر لە گورزی هەورەکان دروست نەکردوە ، فریشتە دەی جوولێنیت یان لیَ دە خورێت ، و (رعد ) ئەودەگە یە کە فریشتە هەورەکەی جوولە پیَ دەکات ،هەروەرکانی لیَ دە خوریَ ..).[5]

---

[1] -اخرجە ابن ابي حاتم (٥٤/١).
[2] -سيرة ابن هشام (٥٣٣/١).
[3] -سنن الترمذي برقم (٣١١٧).
[4] -اخرجە البيهقي (٣٦٣/٣) ، ابن ابي الدنيا في كتاب المطر (١٢٦).
[5] -اخرجە ابن ابي حاتم عزاه السيوطي .

✍ لە (عبداللە بن عمرو ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت: پرسیار کرا دەربارەی (الرعد ) ووتی : فریشتەیە کە هەموو هەورەکانی پێ سپێنراوە لە لایەن (خوای گەورە ) ، وە ئەگەر (خوای گەورە ) ویستی لەسەر بێت بۆ هەر ولاتێك بیان بات فەرمان دەکات لێ بخورن یان بی جوولێنن ئەگەر هەورەکان جیا بوونەوە بەدەنگی خۆی کۆیان دەکاتەوە ، وەکو ئەوەی سوار چاکێك ئەنجامی دەدات ، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە قال تعالى: ﴿وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعۡدُ بِحَمۡدِهِۦ﴾ [الرَّعۡد : ١٣]. واتە: وە هەوره بروسكەش تەسبیحاتی خوای گەورە ئەکات وە خوای گەورە بە پاك و مونەززهە ڕائەگرێت و حەمدو سەناو ستایشی خوای گەورە ئەکات ).[١]

✍ لە ری (عکرمه ) لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : (الرعد ) فریشتە یەك هیواش هەورەکان لێ دە خوری وەکو ئەوەی شوان بە هێواشی مەرکانی لێ دە خوری ..).[٢]

✍ لەری (ابی روق ) لە (ضحاك ) لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بیت –دەلێت : (الرعد ) فریشتەیەکە لە فریشتەکانی (خوای گەورە ) ناوی (الرعد ) ئەو فریشتەیە کە دەنگی دەبیستن ..).[٣]

✍ لەری (السدی )لە (ابی مالك ) لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : (الرعد ) فریشتەیەکە هەورەکان لێ دە خورێ یان دە جوولێنێت بە (بالتسبیح والتکبیر ) ..).[٤]

✍ لەری (موسی سالم مولی ابن عباس ) لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : (الرعد) فریشتەیە ، (البرق) ئاوە ..).[٥]

✍ لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت: پیاوێك پرسیاری دەربارەی (الرعد ) ووتی : فریشتەی بۆ (تسبیح بحمده ..).[٦]

✍ لە ری (جوبیر ) لە (ضحاك بن مزاحم ) لە سە ر ووتە ی قال تعالى: ﴿وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعۡدُ بِحَمۡدِهِۦ﴾ [الرَّعۡد : ١٣] دەلێت :ئەوە فریشتیە ناوی (الرعد ) وە ئەمەش دەنگی (تسبیحە ) واتە : دنگی تسبیحات تیەتی ..)[٧]

✍ لەری (عتاب بن زیاد ) لە (عکرمه مولی ابن عباس ) – رەحمەتی خوا یان لی بیت – دەلیت : (الرعد) فریشتەیە لە فریشتە کانی (خوای گەورە ) هەموو هەورەکان دە جوولێنیت یان لێ دەخوری ، هەروەك شوان ووشترەکانی لێ دە خورێ یان دەجوولێنیت..).[٨]

✍ لەری (سعید) لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : (الرعد ) دروست کراوێ کە لە دروست کراوەکانی (خوای گەورە ) گوێ گرو گوێڕایەلی (خوای گەورە ) یە واتە: (سامع ومطیع اللە ) ..).[٩]

---

[١] -عزاه السيوطي موسوعة تفسير الماثورة (١٣١/٢).
[٢] -اخرجه البخاري في الأدب المفرد (٧٢٢)
[٣] -اخرجه ابن جرير (٣٥٧/١).
[٤] -اخرجه ابن جرير (٣٥٧/١).
[٥] اخرجه ابن جرير (٣٥٨/١).
[٦] -عزاه السيوطي ،موسوعة تفسير المأثورة (١٣١/٢).
[٧] - عزاه السيوطي ،موسوعة تفسير المأثورة (١٣١/٢).
[٨] -اخرجه ابن جرير (٣٥٧/١).
[٩] -اخرجه ابن جرير (٣٥٩/١).

✍ له ری (عميرة بن سالم ) له (ابيه ) له (على بن ابي طالب ) – خوا لی رازي بيت – ده ليت : ده رباره ی (البرق ) واته :گورزێکی ئاگرین ، له دەستی فریشته هەورەکان دایه ، بۆ لیٚ خورینی یان جولاندنی هەورەکان ..).[1]

✍ لەری (شهر بن حوشى ) له (ابى هرير ) – خوا لی رازی بيت – پرسیاری لیٚ کرا دەربارەی (البرق ) دەلیت : هەزه یان به تەندی لیٚدا له سارد ..).[2]

✍ لەری (السدى ) له (ابى مالك ) له (عبدالله بن عباس )- خوا لی رازی بیت – دەلیت: (البرق) واته: گورزێك به دەستی فریشته کانه ، بۆ لیٚ خورینی یان جولاندنی هەوره کان ..).[3]

✍ لەری (ابى روق ) له (الضحاك ) له (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : ئەوە قامچیه که له ئاگر ، فریشته هەورەکان پیٚ لیٚ ده خوری یان جوولەی پیٚ دەکات ..).[4]

✍ له (شهر بن حوشب ) – رەحمەتی خوای لی بيت دەليت : (عبدالله بن عمر )- خوا لی رازی بیت دەلیت : به پیاوێك : پرسیار له (كعب ) بکه دەربارەی (البرق) ئەویش ووتی : (البرق) واته: لیٚدانی هەزەیه بەدەستی فریشته له ساردی ، ئەگەر بۆ خەلکی زەویه دەرکەوت با یه وا تووشی شۆك ده بوون ..).[5]

✍ له (الشعبى ) – رەحمەتی خوای لی بيت دەليت : (ابن عباس )- خوا لی رازی بیت - نووسی بۆ (ابى الجلد ،﴿جيلان بن فروه ﴾ ) پرسیاری کرد له (البرق ) ووتی : زانا یەك بۆ کتیٚب ده خوێنێتەوه ، بۆیه بۆی نووسی (البرق : واته: بريقه داری ئاوه ) ..).[6]

✍ له ری (ابن أشوع ) له (ربيعة بن الأبيض ) – ره حمه تی خوای لی بيت- ده ليت : ( البرق ) واته : گورزێکه لەدەستی فریشته بۆ لیٚ خورینی یان جولاندنی هەوره کان ..).[7]

[1] -اخرجه ابن ابي الدنيا في كتاب المطر ، موسوعة ابن ابي الدنيا (٤٤١/٨).
[2] اخرجه ابن جرير (٥٥/١) .
[3] - اخرجه ابن جرير (٣٦٣/١).
[4] - اخرجه ابن جرير (٣٦٣/١).
[5] - اخرجه ابن ابي الدنيا في كتاب المطر ، موسوعة ابن ابي الدنيا (٤٤٢/٨).
[6] - اخرجه ابن ابي الدنيا في كتاب المطر ، موسوعة ابن ابي الدنيا (٤٤١/٨).
[7] - اخرجه ابن ابي الدنيا في كتاب المطر ، موسوعة ابن ابي الدنيا (٤٤١/٨).

✍ له‌رى (ابي الخطاب البصري ) له (شهر بن حوشب ) – ره حمه تى خواى لى بيت – ده ليت : (الرعد) گورزێكه له لاى فريشته بۆ لىَ خورينى هه‌وره‌كانه ، وه‌ك ئه‌وه‌ى كه شوان ووشتره‌كان لىَ ده خورىَ ، كه‌واته ئه‌گه‌ر هه‌ورێك نائاسايى بوو ئه‌وا ده خرێته‌وه ناوى ، وه ئه‌گه‌ر تووره‌يى توند تر بوو ئه‌وا ئاگرى لى ده‌فرێت ، ئه‌وه‌ش (الصواعق ) واته : برووسكى به‌هێز ..).[1]

✍ له (عطية العوفي ) – ره حمه تى خوا ى لى بيت – ده‌لێت : (الرعد )واته: فريشته‌يه ، ئه‌وه‌ش تسبيحات ده‌كات ، (البرق) واته: قامچى يه گورزێكه بۆ لىَ خورينى هه‌وره‌كان ..).[2]

✍ له‌رى ( حجاج ) له (ابن جريج ) – ره‌حمه‌تى خواى لى بيت – ده‌ليت : (الصواعق ) واته: برووسك ، فريشته لێده‌دات به شتێك وه‌ك مه‌تره‌ق له هه‌وره‌كان ،ئينجا باران ده‌بارىَ ، بۆيه هه‌ر هه‌ورێك بى يه‌وێت لێده‌دات ..).[3]

✍ له رى (هشام بن عبدالله ) له (محمد بن مسلم الطائفي) – ره‌حمه‌تى خواى لى بيت – پىَ راگه‌ياندين : (البرق ) فريشته‌يه له چوار رووخسار دا ، رووخسارى مرۆڤ ، رووخسارى گا ، رووخسارى باز ، رووخسارى شێر ، كه‌واته ئه گه‌ر گوناهه‌كان به‌رزببنه‌وه ، ئه‌و (البرق) واته : برووسكه ..).[4]

✍ له (ابن جريج ) – ره‌حمه‌تى خواى لى بيت – له سه‌ر ووته‌ى قال تعالى: ﴿يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ﴾ [الرَّعۡد : ١٢] واته: (خواى گه‌وره) (هه‌وره تريشقه يان برووسك نيشانده‌دات )، (شعيب الجبائى ) -ره‌حمه‌تى خواى لى بيت ده‌ليت :له كتێبى (خواى گه‌وره) دا ، فريشه كان عه‌رشى (خواى گه‌وره) يان هه‌لگرتووه ، ناوه‌كانيان له (كتێبى (خواى گه‌وره ) (الحيات ) ، هه‌موو فريشته يه‌ك رووخسارى له مرۆڤ و له شيرَ و له باز ده‌چێت (الله اعلم ) ، كه‌واته ئه‌گه‌ر باله كانيان جوولاند ئه‌وه پىَ ده‌لێن : (البرق ) هه‌روه‌ك شاعير (اميه بن الى الصلت ) : رجل وثور تحت رجل يمينه ------ والنسر للأخرى و ليث مرصد ..).[5]

---

[1] -اخرجه ابن جرير (٣٧٢/١).
[2] - تفسير الثعلبي (٢٧٩/٥).
[3] -اخرجه ابن جرير (٣٦٦/١).
[4] -تفسير ابن كثير (٣٦٣/٤) ، و في كتاب البداية والنهاية (٨٧/١).
[5] -عزاه السيوطي ، موسوعة تفسير المأثورة (١٣٦/٢).

📖 لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لێ رازي بێت – دە لێت : ((عنِ ابنِ عباسٍ وابنِ مسعودٍ ؟(أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّمَاءِ فِيهِ ظُلُمَاتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ؟ إلى ؟إنَّ الله على كلِّ شيءٍ قديرٌ؟ أما الصيِّبُ والمطرُ كانا رجلان من المنافقين من أهلِ المدينةِ هربا من رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ إلى المشركين ، فأصابهما هذا المطرُ الذى ذكر اللهُ فيه ، رعدٌ شديدٌ وصواعقُ وبرقٌ ، فجعلا كلما أضاء لهما الصواعقُ جعلا أصابعهما فى آذانهما من الفرَقِ أن تدخل الصواعقُ فى مسامعِهما فتقتلُهما ، وإذ لمع البرقُ مشَوا فى ضوءِه ، وإذا لم يلمع لم يُبصرا وقاما مكانهما لا يمشيان ، فجعلا يقولان : ليتنا قد أصبحنا فنأتى محمدًا فنضعَ أيدِيَنا فى يدِه ! فأصبحا فأتيا فأسلما ووضعا أيدَيهما فى يده وحسُن إسلامُهما . فضرب اللهُ شأنَ هذَينِ المُنافقَين الخارجَين مثلاً للمنافقين الذين بالمدينةِ ، وكان المنافقون إذا حضروا مجلسَ النبيِّ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ جعلوا أصابعَهم فى آذانِهم فرَقًا من كلامِ النبيِّ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ أن ينزلَ فيهم شىءٌ أو يذكروا بشىءٍ فيُقتَلوا ، كما كان ذانك المنافقان الخارجان يجعلان أصابِعَهما فى آذانهما ، وإذا أضاء لهم مشَوا فيه ، فإذا كثُرت أموالُهم ووُلِدَ لهم الغلمانُ وأصابوا الغنيمةَ مشَوا فيه ، وقالوا : إنَّ دينَ محمدٍ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ دينُ صدقٍ ، فاستقاموا عليه ، كما كان ذانك المنافقان يمشيان إذا أضاء لهم البرقُ مشَوا فيه ، وإذا أظلم عليهم قاموا ، فكانوا إذا هلكتْ أموالُهم ، وولِدَ لهم الجوارى ، وأصابَهم البلاءُ قالوا : هذا من أجلِ دينِ محمدٍ ، فارتدُّوا كفارًا ، كما قام ذانك المنافقان حين أظلم البرقُ عليهما..)).[1]

[1] -اخرجه ابن جرير (٣٦٨/١).

✍ لە ری (معمر ) لە (قتادة ) – رە حمە تی خوای لی بیت – لە سە ر ووتە ی ﴿حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ﴾ دەڵێت : واتە: رزگار بوون لە مردن ..).[١]

✍ لە ( مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لی بیت – لەسەر ووتەی ﴿حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ﴾ دەڵێت : واتە : پێچەوانەی مردنە ، خۆ رزگار کردنە لە مردن ، وەك رەق لێ بوونەوەی لە مردن و رزگار بوون ، هەروەهاش رق لێ بوونەوەی بێ باوەرە لە قورئان ، بەلام مردن خیرترە لە بێ باوەر بوون بە (خوای گەورە) و قورئانی پیرۆز ..).[٢]

✍ لەری ( ابن اسحاق بسندە ) لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – لەسەر ووتەی ﴿وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ دەڵێت : ئەمە پێگە و مالی تۆلە سەندنەوەیان دەبێت ..).[٣]

✍ لەری (ابن جریج ) لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی ﴿وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ دەڵێت : کۆدەکردێنەوە لە نێو دۆزەخدا ..).[٤]

✍ لەری (ابی جعفر) لە (الربیع بن أنس ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ دەڵێت : (خوای گەورە ) زیندوویان دەکاتەوە لە دوای مردنیان ، وە زیندوو بوونەوەی دۆستانی ، وەهەروەها زیندوو بوونەوەی دوژمنەکانیشی ، ئینجا لە کارو کردەوەکانیان ئاگاداریان دەکاتەوە یان هەوال یان پێ دەدات ، وە ئەم ووتەیە﴿وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾..).[٥]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ دەڵێت : واتە : دەورەی کارەکانی بێ باوەرانی دا ..).[٦]

---

[١] -اخرجه عبدالرزاق (٤٠/١).
[٢] - تفسير مقاتل بن سليمان (٩٢/١).
[٣] -سيرة ابن هشام (٥٣٣).
[٤] -اخرجه ابن ابي حاتم (٥٧/١).
[٥] -اخرجه ابن ابي حاتم (٥٧٩/١).
[٦] -سيرة ابن هشام (٥٣٣/١) .

قال تعالى: ﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ قَامُواْۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ۝٢٠﴾ [البَقَرَة : ٢٠]

﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ﴾ واته : نزيك بوو ئەو برووسكە يە ، ﴿يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡ﴾ واته : بينايى چاويان بفرێنێ ، ﴿كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم﴾ واته: هەر كاتێ رووناكى بۆ بدا نايەتەوە، ﴿مَّشَوۡاْ فِيهِ﴾ واته : تيايدا بچوونايە يان برۆشتنايە ، ﴿وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ﴾ واته: وە كاتێ تاريكيشى بكردايە لێ يان ، ﴿قَامُواْ﴾ واته: لە جێگەی خۆيان رادەمان يان (دە وەستان ) ، ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ﴾ واته: ئەگەر (خواى گەورە ) بيويستايە ، ﴿لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ واته: بە و هەورە گرمە و تريشقە و برووسكانە كەر كوێرى دەكردن ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ۝٢٠﴾ واته: بێ گومان (خواى گەورە ) بەسەر هەمووشتێكدا دەسەلاتدارە ..؟!!

قال تعالى: ﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ قَامُواْۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ۝٢٠﴾ [البَقَرَة : ٢٠] بەڵێ ئەو برووسكەی كە لە نێو ئەو هەورو بارانە دا هەيە ، نزيكە چاويان دەر بكات جا هەر كاتى رووناكى يان تيشك بگاتە ئەوان ئەمانە چەند هەنگاوێك دە نێن ، بەلام هەر كاتێ كە تاريكى بدات بە سەرياندا ئەوانە رادەمێنن و دەوەستن ..؟! ناتوانن هيچ تەكانێك بخۆن ، جا (خواى گەورە) ئەگەر ئارەزووى لێ بێت گوێيە كانيان كەر دەكات و چاوەكانيان كوێر دەكات ، بەلام نازانن بيستن و بينيان بەدەستى (خواى گەورە ) يە ، ئەگەر ئارەزووى لێ بيت هەردووكيان لە ناو دەبات ..؟! دەبێ زۆر چاك بزانن كە (خواى گەورە ) دەسەلاتى بەسەر هەموو شتێك دا هەيە ..؟!

لێرەدا ئاينى ئيسلام بە تشبيە يان جووێندراوە بە باران ديارە ئەو ئاينە وەك بارانێك وايە كە مايەی خێر و خۆشبەختى ژيانى هەموو گيان لەبەرانە ، چونكە هەموو شتێك لە بوونەوەردا ژيانى بە هۆی ئاوە وەيە كەواتە ئيسلام ژيانە وەك (خواى گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡ﴾ [الأَنفَال : ٢٤] واته: ئەی باوە ڕداران وەڵامى خواو پێغەمبەرى خوا - صلى الله عليه وسلم - بدەنەوە كاتێك كە بانگتان ئەكەن بۆ شتێك كە ئێوەی پێ بژێننەوەو ژيانى ئێوەی پێ چاك بكەن كە ئيسلام و قورئانە، پێغەمبەرى خوا - صلى الله عليه وسلم - ئەگەر بانگى صەحابەی بكردايە تەنانەت لە نوێژيشدا بوونايە ئەبوايە وەڵامى پێغەمبەرى خوايان بدايەتەوە - صلى الله عليه وسلم - (ئەبو سەعيدى كوڕى موعەلا) دەفەرمێت: نوێژم دەكرد پێغەمبەرى خوا - صلى الله عليه وسلم - بانگى كردم وەڵامم نەدايەوە تا نوێژەكەم تەواو كرد، فەرمووى بۆ وەڵامت نەدامەوە ئەوە نيە خواى گەورە دەفەرمێت: وەڵامم بدەنەوە..؟!!

بەڵێ لە ئایە تی پێشتر دا باسی دەنگی هەورو برووسك دەكات یان گەرمەی هەور تیشكی بەهێزی برووسك كە رووناكی یە كەی یەكجار بە هێزو توندە، بەلام ئەوانە بۆ ئاگادار كردنەوەی بیّ باوەران و دوو رووەكان ، دەنگ واتە : ئاگادار كردنەوە ، بەلام لە جیاتی ئەوەی كە لەو ئاگادار كردنەوەیە بترسن و خۆیان بپارێزن لە گوناهو خراپە كاری و بیّ باوەری فسادی و گەندەلی فەرهووت كردنی مالی خەلك ئازاردانی خەلكی بیّ دەسەلات ، ناداگەری و زوڵم ستەم كردنیان لە خەلك ، كە لەم سەردەمەیە یەكجار باوە زڵم ستەمی مونافیقان چووتە ئەو پەری خراپی بەد رەوەشتی و سنوور بەزاندنی فەرمانەكانی (خوای گەورە ) لەجیاتی ئەوە گویّ و چاویان بگرن لە ترسان با خۆیان لەم خراپە كاریانە بپارێزن ، كە بەدرەوەشتیان جۆتە قیمە ، لە سالانی رابردوودا چەندین بلاو نصیبەت لافاو هەورە برووسكە روویدا هەر هەموویان زیرەیان كرد لە ترسان یان نەخۆشیەك هات بەناوی كرۆنا لە سالی ٢٠٢٠ ،ئەوكات ئەوەندە دەترسان هەر هەموو زیریان كرد زرقیان چوو بوو ، خەلكیان یەكجار بێزار كرد ،ئازاری خەلكیان دەدا بەس بۆ ئەوەی بە خۆیان لە ژیاندا بمێنن ، نەشیان دەزانی چونكە شعوریان نە بوو ئەوا ئاگادار كردنەوەی (خوای گەورە) یە لەم بەد رەوشتی و خراپە كاری گەندەلی فسادیە و دزو جەدەیەی كە ئەنجامی دەدن ، بەلی ئاگادرا كردنەوەی (خوای گەورە ) ئەویە كە بەندە خۆی بپارێزی لە گوناهو تاوان و خراپەكاری نەك وەك ئەم نموونەی قورئان كوێی خۆیان بەپەنچەكانیان بگرن ..؟! چونكە ئەوان بەخیالی خۆیان ئەو ئاگادار كردنەوەیە ئەوان دەكوژێت ..؟! هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿قَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآ﴾ [القَصَص : ٥٧]: واتە : وە كافرانی قورەیش ئەیانووت: ئەی محمد - صلی الله علیه وسلم - ئەگەر بێتوو ئێمە شوێن ئەو هیدایەت و دینەی تۆ بكەوین ئەوە عەرەب دێن و ئەدەن بەسەرماندا وە ئێمەش شەڕی هەموو عەرەبمان پێ ناكرێ، وە لە زەوی خۆمان دەرمان ئەكەن و شاربەدەرمان دەكەن..؟! بەلیّ كاتێك بەهۆی ئیسلامەوە سوودیان دبینی بەهۆس بروسكەی قورئان رووناكیان دەبینی بەر چاویان رۆشن دەبوویەوە ، دلیان ئارامی دەگرت ، بەلام هەر ناخۆشیە بهاتایە بەردەمیان خۆیان مات دەكرد و پەیوەندیەكیان بە ئیسلامەوە نە دەما ..؟! بەلیّ ئێستا لەم سەردەمەدا كە دبینین باسی ئیسلام خواپەرستی بە تاك تەنها دەكرێت ، دوو رووەكان یان مونافیقە كانی ئەو سەردەمە دەلێن : ئەمە چی یە كەی باوی ئەم قسانە ماوە..؟! یان دەلێن : بۆمان زەحمەت و ناكرێ ..!! چونكە لە بەر دزی جەردەی خۆیان و خواردنی مالی خەلكی لە هەتیو فەقی هەژاران و دزینی بەملیاران مالی خەلك ، بەدرەوشتی كردن بلاو بوونەوەی داوێن پیسی لە شارە كانی دورستیان كردووە لە فیلاو بالە خانەكانیان لەسەر گیفانی خەلك یان خوێنی خەلك بینایان كردووە ، هەر لە بەر ئەمانە ئاینی ئیسلامیان لا قورس گرانە بۆیان ناكرێت ..؟! جا نەك ئەم قسانە كەدی كەن بەلكو چەندین قەسەی تریش دەكەن بە پەیرەوانی ئاینی ئیسلام ، هەندێك دەلێن : ئەوانە كۆنەپەرستن یان دوا كەوتوون ، بیّ گومان ئەم قسانە هەر هەمووی بەلگەی دوا كەوتن و گەمژەیی و نەفامی و نەزانی خۆیانە..؟! خۆ ئەوەی ئەوان كە ئێستا بانگەشەی بۆ دەكە بە هەزارن سال پێش ئیستا كراون ، لە هەموو سەردەمێك دا پێغەمبەرانێك و پیاوچاكان بە گژیاندا چوون ، ئەی پێم نالێن : شتە تازەكانتان كامەیە ..؟! ئەوەیە كە یاسای هاورەگەزبازی جیّ بە جیّ بكە لە بەر خاتری رۆژئاوا ..؟! بەلیّ لەو كارانەی كەئێستا پی دەنازن و شانازی پێوە دەكەن بریتیەلە : دزی كردن و جەردەیی مافیایی و داوێن پیسی بەدرەوشتی ، خراپە كاری و فسادی گەندەلی ، قورمار كردن شەراب خواردن تێر كردنی ئازرەوەكانتان ، هەروەها دوو روویی و نفاقی بیّ باوەریی و خوانەناسی و ناپاكی و هەروەها رەوشتی رووتكردنەوەی پوشاكی ئافرەتان ، دیسكۆ مەلها و قومار و شەراب خواردنەوە ، بەرنامەی بەدەرەوشتی

لە تەلەفزیونەکانتان ، هەروەها هزرو فکری حیزبایەتیە کانتان ، کە خەلکیتان بەرەو بەدرەوشتی دزی جەردەیی درۆکردن بردووە ، یان پاشە کەوتی موچەکانی خەلك ، یان برسی کردنی خەلکی فەقیر هەژار بە ناحەق ، بە هەزارن خێزانتان هەلوشاندەوە ، بەهێنانی تەکنلوجیایی سەردەم ، بە هەزاران ئافرەتان فێری بەدرەوشتی کردن بەناوی رێخراوی ژنان وئافرەتان ، هەورەها بە هەزاران خەلك تان زیندانی کرد بەناوی دیمکراسی ، ئەی کوا دیمکراسی تان ..؟! ئەی کوا مافی مرۆڤ تان ..؟! بانگەشەی بۆناکەن یان زیندان بەندینخانەکاتان لەبیر جوەتەوە ، یان خوێن مژینی خەلك بە ناوی حیزبایەتی تان ..؟! هیچ خەلك نەما بوختنی پیدانەکەن و ئابرووی نەبەن یان جاسوسی سیخوری بەسەر دا نەکەن ، پروپاگەندی بریقەدار بلاودەکەنەوە وادەزانن خەلك گەمژەیە ناتان ناسێ ..؟! سەرەرای ئەو خراپەکاریە و زلم وستەمەی کە ئێوە ئەنجامی دەدان بەلام رۆژ بە رۆژ و سات بە سات ئیسلام گەشە دەکات تەنانە دێتە نێو مالە کانیشتان بەهۆی ئەو زلم وستەمەی کەئەنجامی دەدن ، وادیارە لە بیریان چووە کە (الله) تاك تەنها بۆ هەمیشە لە پشتی موسلمانە هەروەك دەفەرموویێت قال تعالی: ﴿لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ﴾ [التَّوۡبَة : ٤٠] واتە: خەفت مەخۆ (خوای گەورە ) مان لەگەلدایە ،ئینجا (خوای گەورە ) هێمنی ئارامی دابەزاند بە سەریان ..!! ئەی لەبیریان چووە دەبێت ئەم ئاینە بلاو بێتەوە بە گشت جیهاندا ، یان ئەوەی نیە کە (الله ) بەلێنی سەرخستنی داوە بە موسلمانان ، قال تعالی: ﴿ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ٢٨﴾ [الفَتۡح : ٢٨] واتە: هەر ئەو زاتیە کەپێغەمبەرەکەی ﷺ رێنمووی کرد بە ئاینی ئیسلام ئاینی راستی نارد تا سەری بخان بەسەر تەواو رێچکەی خوارو خێچ و بەرنامەی نادروست بیری چەوت نابەجێ و ئاینە کانی تردا ، وە (خوای گەورە ) بەسە کەشایەت بێت بۆیان ..!! بەلام ئەوانە واتە: دوو رووەکان نەخۆش و قینە لە دلن ، چونکە نەخۆش بە ئاوی شرین یان بە گەنگوێن دەلێ تالە ..؟! ئاینی ئیسلام بە نزیکە دوانزە سەدە فەرمانرەوایی کردووە لێرەو لەوێدا کەم کوری لە فەرمانرەواکانی ئیسلام هەبووە بەلام بە رێژەیی ، نەکو وەك ئیستا سەرتاپەی فەرمانرەواکانی ئێستا دزو گەندەل و جەردە مافیان بە زەمانی ئێستا ، فەرمانرەوای خوێن مژن و گەمژەیی ساسەت رامیارین ، بەلێ ئەگەر لە سەر بەنامە رێبازی قورئان و ئیسلام برۆین ،ئەوا بەدلنیایەوە سەرفرازی دونیا قیامەت دەبین ، بەلام ئەگەر لە سەر ئەم رێبازە لاماندائەوە تووشی بەلاو نصیبەت هەلدێرو سەرگەردنی و گومرایی دەبین ، هەر بۆیە سەردەمی ئێستای مرۆڤ چونکە لای داوە لە سەر ئەم رێباز راستەی قورئان ، تووشی ئەو بلاو نەهامەتی نصیبەت وکارەساتە دل تەزێنانە بووین ، چەندین کارەساتی سورشتی دل تەزێن روویداوە جا جگە لەوەی کە کارەساتی نەمانی عیب و شوریی بێ ئابرووی یان کارەسانی مرۆیی چەنگ و کوشتارو کوشتنی بەناحەق دزی جەردەیی خیانەت ناپاکی کردن لە گەل یەکتری دا ، هەروەها نەمانی متمانەکردن لە ناو تاکە کانی کۆمەلگادا ، ئەمەش بەهۆی لادان لە سنوور دەرچوون لە رێبازی قورئان ، بەلێ خەلکی لە بەر رابواردن ئارەزووی هەوای خۆی غافل بووە لە ئیسلام ، لەجیاتی بێ گوێ راگرێ لە ووتاریکی ئاینی یان ووتاری هەینی دەچێتە بۆ گشت و گوزارو رابواردن ، ئەگەر خەلکی خراپ بێت بیر لەدوارۆژی خۆی نەکاتەوە کارو کردەوەی چاکە ئەنجام نەدان ئەوە بەدلنیایەوە (خوای گەورە ) سزای دەدات لە دونیا و ئاخیرە تدا ، ئەوەی لەدونیا سزای بۆ رەوانە دەکات فەرمانرەوی خراپە گەندەل دەکات فەرمانرەوایەتی ئەم گەل ئۆمەت ،ئەوانیش هەر خەریکی خوێن مژینی ئەم خەلکە ستەمکارەن چونکە بەخۆیان زولم یان لە نفسی خۆ کردووە بۆیە ئەم دەسەلات وایان بەسەر دەهێنێت ..؟!

لێرەدا با بگەڕێینەوە سەر باسەکی خۆمان کە (خوای گەورە ) دوو نموونە لەسەر دووڕووەکان دەهێنێتەوە ، لە ئایەتی (١٧)وەك ئایەتی (١٩) دا لە نموونەی یەکەم: کە دەفەرمووێت قال تعالى: ﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] وە لە نموونەی دووە: کە دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ [البَقَرَةِ : ١٩] بەلی ئەم دوو نموونەیە لە سەر دووڕووەکانە ئەم ئایەتەی (٢٠) تەواو کەری نموونەی دووەمە کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ قَامُواْۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠﴾ [البَقَرَةِ : ٢٠] واتە : نزیکە تیشکی برووسك بیناوی چاوی بەرێت ، هەر کاتێك بینایی چاویان ڕووناك دەکاتەوە ، ئەوان دەڕۆن و ڕێ دەکەن ، بەلام کاتێك دونیایان لێ تاریك دەبێت ، ڕادەوەستن ڕادەمێنن هەلوێست دەکەن ، خۆ ئەگەر (خوای گەورە ) نیازی بووبایە یان بیویستایە دەزگای بیستن و بینینیان لە دەسەندەوە یان لە کار دەخست ..؟! چونکە ئەو (الله ) یە دەسەلاتی بە سەر هەموو شێك دا هەیە ، بەلام ماوەیان دەدات ، سا بەلکو بەخۆیاندا بچنەوە ..؟! بەلێ هەندێك لە دووڕووە کان و مولیحدە کان یان ڕۆژ ئاوایەکان دەلێن : ئە ئایەتە لە گەل کە ئەم ئایەتدا دژبە یەکە ، منیش دەلێم : نەخێر درۆتان کرد شەکرتان خوارد ئەی نەفام و گەمژە کەم عەقلینە ..؟! کاتێك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨﴾ [البَقَرَةِ : ١٨] واتە: ئێوە لەڕاست ڕێباز بەرنامەی قورئان و هیدایەت ، دەزگای بیستن تان کەر بۆ بیستنی حەق و هیدایەت ، زمان تان لار بووە لەووتەی حەق ، چاوتان نابینێ بۆ حەق ڕاستی ، تازە ئێوە هیدایەت و ڕینموویی وەرناگرن ناگەڕێنەوە بۆ بەرنامە و ڕێبازی قورئان ، چونکە لەڕاست قورئان گوێتان کەر کرد ، زمان تان لار کرد لەووتەی حەق قورئان ، چاوتان نابیناکرد لە بەرانبەر ئەو هەموو نیشانە و موعجیزانەی قورئان بۆیە هەر گیزاو هەرگیز دەزگای بیستن و دزگای ووتن و دەزگای بینین تان بۆ ناگەڕێتەوە چونکە لە سەر بەرنامەی قورئان نەرۆیشتن.؟! چونکە مەبەست ئەوەیە هیدایەت نادرێن و ڕێگای ڕاست نادۆزنەوە ، بۆیە بیستن بینینیان بۆ ناگەڕێتەوە ، چونکە لەڕاست بیستنی حەق و ووتەی حەق دا وهەروەها بینینی ئەو هەموو نیشانە و نیعمەتە (خوای گەورە ) کە ژراندوویەتی چاویان نابینێ ، بۆیە ئەم سێ دەزگایە لە کار کەوتن ، سودی یەك فولسی سووتایان نیە بۆیان ، ئەوەی حەق نەبیستێت یان حەق نەلێ یان حەق نەبینی ئەوا بێ گومان لە تاریکی یەك دایە بەهیچ شێویەك گەرانەوەی بۆنیە چونکە سەر گەردان گومراو بێ باوەر بوو ، هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ هیدایەت و بەرنامەو ڕێبازی خوا پەرستی ڕاستەقینە ،بۆیە قورئان بەم شێویە باسی دوو ڕوو مولحید و کافران دەکات ، ئەوانە لە دلّ و دەروون دا گوێرو کەر کوێرن ، کەسێك دلێ نەخۆش بێت یان موریی ڕەشی دوو ڕوویی نیفاقی پێوە بێت هەرگیز بۆی ناگەڕێتەوە دزگای بیستنی حەق ووتنی حەق بینینی حەق ، بۆیە ئامانجیان تاریکی گومرایی سەرگەردانیە ..؟!

هەروەها (خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٠]

لەم ئایەتە شدا (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : ئەگەر ویستی لە سەر بوو بایە یان (خوای گەورە ) ویستی لیٚ بایە ئەوا بیست و بینینی لە ناو دەبردن ، واتە : ئەم دوو دزگایە لیٚ دەساندنەوە لە کاری دەخست ، بەلام (خوای گەورە ) ماوەیان دەدات یان مۆلەتیان دەدا ، لەکاریان ناخات بۆ ئەوەی ببێتە حجە یان بەلگە لەسەریان لە رۆژی دوایی دا ،بۆ ئەوەی شاهید بن لەسەریان ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامیانداوە ، هەر بۆیە ئەم دوو ئایەتە هەرگیز دژ بە یەك نیە ئەوەی دوژمانی ئیسلام دەی لێن سەرتاپای دۆریە..؟!

﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡ﴾ واتە: نزیکە (خوی گەورە ) کوێریان بکات بەهەورە برووسکە یان تیشکی برووسك ..!! ﴿كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ﴾ واتە: کاتێك رووناکیان بۆ هات ئینجا دە کەونە رێ ..!! ﴿قَامُواْ﴾ واتە: بەلام کاتێك تاریکی یان بەسەر دا هات ، دەوەستن سەر سورمان دە بن یان هەلوێست وەردەگرن ..!! ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ واتە: ئەگەر خوا ویستی لە سەر بێت بیستن وبینینیا لە ناو دەبات ..!! ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠﴾ واتە: (خوای گەورە) بە تواناو دەسەلاتە بەسەر هەموو شتێك دا ..!! بەلیٚ لێرە دا بۆمان روو دەبێتەوە کاتیٚ کەسیٚ بازراکانیەکی تەواو سەرکەتوو ئەنجام دەدات سوودو قازانی زۆر بۆی دەبێت ، ئەوا ئەو کاتە ئاینی و ئیسلامی خۆش دەوێت ، بەلام کاتیٚ لە بازرگانیەکەی سەرناکەوێت و توشی زەرەو زیان دەبیت ، ئەو کاتە هەروەستەدەکات رادەوستێت ، بەلکو پێچەوانە دەبێتەوە ، ئاینی خۆش ناوێت و لە نوێژەکانی کەم تەرخەم دەبێت ، هەروەها متمانەی نامێیٚ و تەنانەت متمانەی لاواز دەبێت بەرامبەر بە پەروەردگاری خۆشی،

کەواتە لێرە دا بۆمان دەرکەوت مرۆڤ دووروو لەسەر پێوەریکی چەسپاو دانیە یان نا هاوسەنگە ،هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت:﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ١١﴾ [الحج : ١١] واتە: هەندێك خەلکی هەیە تەنها لە یەك حالە تدا خوا پەرستی دەکات ئەویش ئەو حالەتەیە کە دونیا بە دلٚ ی ئەو بێت ..؟! ئەگەر تووشی خێرو خۆشی بوو دلی پیٚ خۆشە ، خۆ ئەگەر تووشی تاقی کردنەوە یەك هات ، ئەوا رەخنە و نارازەوی لە خۆی دەگریٚ ویان سواری سەرۆ خۆی دەبێت و یان هەلدەگەرێتەوە یان پاشگەز دەبێتەوە ، ئەمانەی هەموو تێدا بەدی دەکرێت ، ئا بەم بارودۆخەیدا دونیا و قیامەتی خۆی لە دەست دەدات و خەسارەت مەند یان زیامەندی هەر دوو لایە ، هەر ئەوەشە خەسارەتمەندی روون و ئاشکرا ..؟!

بەڵێ هەر بەم شێوەیە لە ڕۆژی دوایی دا، کاتێ خەلکی ڕووناکیان پێ دەدرێت ، هەر کە سە و بە پێی پێوەر ئەندازە و ئیمان و باوەری خۆی ڕووناکی پێ دەدرێت ، هی وا هەیە ئەواندەی ڕووناکی پێ دەرێت ، دەورو بەری خۆی هەمووی پێ ڕووناك دەکاتەوە ، هی واش هەیە کەم تر و هی واش هەیە زیاتری پێ دەدرێت ..؟! بەلام هی وا هەیە ڕووناکی لە سەر دە کوژێتەوە جارێکی تر بۆی ڕووناك دەبێتەوە ..؟! بۆ ماوە یەك لە سەر رێگا دەروات پاشان دەوستێت ، هی واش هەیە هەر ڕووناکی یەکەی بە یەکجاری و بەتەواوی لەسەری دەکوژێتەوە ، ئەو کە سانەش دوو ڕوو و مونافیقە کانن ، کە (خوای گەورە ) دەربارەیان دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾﴾ [الحَدِيد : ١٣] واتە: ئا لەم ڕۆژە دا ئیمانداران بەرەو بەهەشت بەرێ دەکرێن ، پیاوان ئافرەتانی دوو ڕوو یان مونافیق دەهێنرێنە سەر ڕێگا یان ، زۆر بە خەم باری خەفەت باری بۆ ئیمانداران دەروانن ، دەلێن : دوا کارین تەنها تەماشایەکمان بکەن با تۆزێك لە نوری یان لە ڕووناکی ڕووخسارتان بە هرەمەند ببین ..؟! بەلام پێیان دەوترێت: بگەرێنەوە دواوە واتە: (ئەگەر دەتوانن جاریکی تر بگەرێنەوە ژیانی دونیا نور ڕووناکی بۆ خۆتان بەدەست بێنن کەچی خەسارەت مەند بوون لەدەستان دا) ئا لەم کاتەدا دویوار یان بە ربەستێك لە نێوانیاندا بەرپادەبێت ، وە درگایەکیشی هەیە ، دیوی ناوەوەی رەحمەت ئاسوودەیی ئارامی هێمن و دڵ رفێنە بۆ ئیمانداران ، هەروەها دیوی دەرەوەشی نەهامەت و دەردەسەری سزاو ئیش و ئازارو ناخۆشی سەرگەردانی لێ دەبارێت ..؟! دەرباری ئیماندارانیش (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾﴾ [الحَدِيد : ١٢] واتە: ڕۆژێك دێت کە دەبینن پیاوانی ئیماندار و ئافرەتانی ئیماندار بەرەو بەهەشت بەرێ دە کرێن نوور و ڕووناکی یەکی ئاشکرا لە بەردەم لە لای ڕاستیانەوە دەر وات فریشتە کان پێیان دەلێن : مژدەۆ ئێوە ئەمرۆ باخەکانی بەهەشتە کە چەندەها ڕووبار بە ژێریان دادەڕوات یان بە ناویاندا دەڕوات ، هاورێ لەگە ژیانی هەمیشەیی و نە براوە تیایدا ، ئا ئەوەیە سەر کەتن و سەرفرازی گەورەو بێ سنوور ..؟! بەلام (خوای گەورە ) باسی بێ باوەران کافران و دوو ڕووەکان دەکات ، ئەم ئایەتەدا کە خۆیان بە شتێك پروپووچ خەریك دەکەن ، (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾﴾ [النُّور : ٣٩] واتە: نموونەی ئەو بێ باوەرانە وە سەرابێك وایە لە شوێنێکی چۆلدا یان لە بیابانێکی فراوانی تەخت دا ، کاتێك لە دوورەوە کەسێکی تێنوو سەیری دەکات وا دەزانێت ئاوە ، کاتێك کە دەگاتە سەری هیچ شتێك نیە تەنها سەرابێکە لە بەر چاوی بووە بە ئاو ، بێ باوەران یان کافرو دوو ڕووەکانیش هەر وان ، چونکە ئەگەر لە دونیاش کردەوەی چاکە بکات لە قیامەت ئەجر پاداشتەکەی وەرناگرێت لەسەری ، چونکە ئەوانە ئەم سیفەتانەیان هەبووە کافر و دووروو موشریك بوونە ،چونکە لەبەر ئەوەی بۆ خوا نەی کردووە ، بۆ دونیا بووە ، وە ئەبینی کە (خوای گەورە ) حیسابی لەگەل دا دەکات بەلام هیچ سوودی پێ ناگەیەنی لەبەر ئەوەی بۆ (خوای گەورە) نەی کردووە یان ئەنجامی نەداوە ، ولێپرسینەوەی (خوای گەورە ) زۆر خێرایە.؟!

✍ لە ریێ (ابی روق ) لە (ضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٠] دەڵێت : چاوەکانیان درەوشانەوە کە نزیك بوو بینایی چاویان نەمێنی ، وە هەموو شتێك لە قورئاندا : (کاد ، وأکاد ،وکادوا ،ئەوە هەر گیز نەبێت ..).[1]

✍ لەریێ (علی بن طلحة ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازي بیت – دە لیت : جوولە کەکان کاتێك کە بینیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی بەدر سەر کەوتنی بەدەست هێنا ،ئیجا تەماع چاویانی کوێرە کرد ، ووتیان : سوێند بە خوا ئەو پێغەمبەری خوایە کە (موسی ) – علیە السلام – موژدەی هاتنی دابوو ، ئالای پیێ مەدە ، بەلام کاتێك لە ئوحد خەمار بوون ،پاشگەز بوونەوەو ، وە رەخنەو گەلەییان دەکرد ..)[2]

✍ لەریێ (علی بن طلحة ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازي بیت – لە سە ر ووتە ی ﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡ﴾ دەڵێت : (یکاد ) محکم لە قورئاندا ،ئاماژەیە بۆ هەڵی دوو رووەکان ، هەروەها قال تعالى: ﴿أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ﴾ دەڵێت : کاتێك ئیسلام سەر کەوتنی بەدەست هێنا ئەوا دوو رووەکان دڵیان ئارام دەبێت ، بەلام کاتیێ ئیسلام تووشی شکست خەمباری هات ، ئەوا دەوستن تیێ دەروانن ، دە گەرێنەوە سەر بیێ باوەری و کوفری خۆیان ، دەڵێت : ﴿وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ قَامُواْ﴾ هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت: قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ﴾ [الحج : ١١] واتە : ەناو خەڵکیدا کەسی وا هەیە بە لاوازی بیروباوەڕ و گومانەوە دێتە ناو ئیسلامەوە و موسڵمان دەبێت، و بەدوودڵی وگومانەوە خواپەرستی دەکات، وەکو کەسێك وایە کە لە لێواری شاخێك یان دیوارێك وەستابێت کە خۆڕاگرنیە لەوەستانەکەیدا، باوەڕەکەی بە دونیاوە بەستووە، جا ئەگەر لە خۆشگوزەرانی وبەختەوەریدا بژێت ئەوا بەردەوام دەبێت لەسەر خواپەرستیەکەی، وە ئەگەریش تووشی بەڵاو تاقیکردنەوەیەك هات ئەوا شوومی دەداتە پاڵ ئاینەکەی..؟!

✍ لە ری (ابن اسحاق ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – لە سە ر ووتە ی ﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡ﴾

دە لیت : واتە : رووناکی یەکی یان رۆشنایەکی راست یان حەق ، ﴿كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ﴾ واتە: حەق دەزانن و قسەشی پیێ دەکەن، وە لەوەش تیێ دەگەن کە ئەو قسە یە لەسەر راستە ، بەلام کاتێك گەرانەوە بۆ بیێ باوەری خۆیان ،﴿قَامُواْ﴾ ئەوا سەر سورماو دەبن تیێ تیێ دروانن و دەوستن ، ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ وازیان لە حەق راستی هێنا ، پاش ئەوەی کە رۆز چاك دەزانن ..).[3]

---

[1] -اخرجه ابن ابي حاتم (٥٧/١) .
[2] -تفسير الثعلبي (١٦٦/١).
[3] -سيرة ابن هشام (٥٣٣/١).

✍ لە ری (الربیع بن أنس ) لە (أبی العالیه) – رحمه تی خوای لی بیت – لە سەر ووتەی : ﴿كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ﴾ دەڵێت: وێنەی وەك ئەو قوم و کەسانەیە کە دەرۆن لە شەوێکی زۆر تاریك دا ، ئینجا باران و هەورە گرمە یان گەوارە برووسك بۆسەر رێگا ، پاشان تیشکی برووسك رێگایان بۆ بینین رۆشن دەكات ،بەلام كاتێك ئەم برووسکە نەما یان ئەم رووناکی و ۆشنایە نە ما ، ئەوا سەر سورماو یان سەر لێ شێواو دەبن ، ئەو ئەوانە دوو رووەکانن ، کاتێك بە نیازپاکی وئەخلاص وە قسە یان کرد ،ئەوا ئەم رشنایی و رووناکی یە یان پێگەیشتووە ..؟! وە کاتێك ئەوتنە شك و گومان و سەر سورمان و سەر لێ شێوایی ئەوا بە دلنیایەوە ئەو لە کاتێك راوەستاون کە تاریکی دان ، ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ دەڵێت : بیستن بینیان بیربکەوە بۆ ئەوەیلە ناوی خەلکی دا بژین ..).[١]

✍ لەریٚ (سعید ) لە (قتادە) – رەحمەتی خوا ی لیٚ بیت – لەسەر ووتەی ﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡ﴾ دەڵێت : (البرق) یان برووسك ئەو ئیسلامە ، (الظلمة )یان تاریکی وە فتنە ئاشووب بلاو نصیبەت ، کەواتە ئەگەر ئیسلام سەرکەوت ئەوا دوو رووەکان دل یان ئارام دەبێت و لە تەندروستی خۆش گوزەرانی باش دەژین ، بیٚ گومان ئەوا دەڵێن : ئێمە لەگەل ئێوە داین هەر لەگە ل ئێوەشین ، بەلام ئەگەر ئیسلام سەر نەکەوت و شکستی هێناو تووشی بلاو نصیبەت ئاشووبی توند زۆر هات ، ئەوا رادەکەن ، ئارام و صبر ناگرن لەسەر ئەو بلاو ئاشووبە هاتووە ، چاوەریی ئەجر پاداشت ناکەن ، وە چاوەری سەر ئەنجام ناکەن ،یان چارە نوسیان بەچی دەگات ، بەلام ئەمانە تەنها خاوەنی دونیا ، ئەو توورە دەبیت ، وە ئەوە لیٚ رازی دەبیت ، ئەوەش ئەوەیە کە (خوای گەورە) سیفەتەکانیانی باس کردووە ..).[٢]

✍ لەریٚ (معمر ) لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لی بیت - پاشان نموونەیەکەی تری هێناوە دەڵێت : ﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ﴾ دەڵێت : دووروەکان ئەگەر مال و سامانیان زۆر بوو ، وە هەموو شتێکی رۆژانەیان بۆ جیٚ بەجیٚ بوو هیچ کەم و کوریان نەبوو ، هەمووشتێك باش بوو ، ئەوا دەڵێن : ئێمە هیچ بلاو نصیبەتێمان بۆ نەهاتووە لەوەتەی چووینە ناو ئاینی ئیسلام تەنها خیرو خۆشی نەبێت ..؟! ﴿وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ قَامُواْ﴾ بەلام دووروەکان کاتێك مال و سامانیان لە دەست داو نەما تووشی بلاو نصیبەت بوون و ، تووشی هیلاکەت بوون ، ئەوا دەوەستن سەرسورمان سەرلیٚ شێواو دەبن ..؟! ).[٣]

[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٩٥/١)
[٢] -اخرجه ابن جرير (٣٧١/١).
[٣] - اخرجه عبدالرزاق (٤٠/١).

# سوودە كانى بيست ئايە تى سە رە تايى سورە تى (البقرة)

١. جێگرکردنی ئیعجازی قورئانی پیرۆز و گەورەیی قورئان ، وە تەحەدا کردن کە کەس ناتوانێت قورئانیچکی هاوشێوەی ئەم قورئانە بنووسێت لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿الٓمٓ ١﴾ [البَقَرَةِ : ١]

٢. قورئانی پیرۆز نووسراوە لە (لوح المحفوظ ) ، هەروەها نووسراوە صوحەفی فریشتەکان و وە نووسراوە لەو قورئانانەش کە لەبەر دەستی ئیمانداارانن ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿ٱلۡكِتَٰبُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢]

٣. قورئانی پیرۆز گەورە ترین و پایە بەرزترین کتێبە ، هەروەها پیرۆز ترین کتێبی (خوای گەورە )یە چونکە کتێبکە کە هیچ گومان هەڵناگری یان هیچ گومانی تیدانیە ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾ [البَقَرَةِ : ٢]

٤. قورئانی پیرۆز هیدایەت و ڕێنموویی و ڕێ نیشاندەری ئیماندارانە یان تەقوادارانە ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢﴾ [البَقَرَةِ : ٢]

٥. گەورەیی و پلە و پایە نوێژ لە ئاینی ئیسلامدا ، لە بەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣]

٦. دەبێت ئیمان بە هەموو ئەو کتێبانە بهێنین کە بۆ پێغەمبەران دا بەزیوە ، بە مە ئیمان کامل تەواو دەبێت لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ [البَقَرَةِ : ٤]

٧. فەرزو واجب کە دلنیابیت هیچ گومانت نەبێت کە ڕۆژی دوایی هەر دادێت و یان هەر بەرپادەبێت ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ٤﴾ [البَقَرَةِ : ٤]

٨. بەدەست هێنانی بەختەوەری و سەرفرازی لە دونیاو لە دوا ڕۆژدا ، لە بەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥﴾ [البَقَرَةِ : ٥]

٩. خێرو بەخشین بەو مالە ی کە بە دزی جەردەیی ستەم دەستی بە سەر داگیراوە خێرو بەخشین قبول نیە ، چونکە نابێتە خاوەنی ئەم مالە ، لەبر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣﴾ [البَقَرَةِ : ٣]

١٠-هەرکەسێك (خوای گەورە ) گومرایی بکات بەهیچ کەسێك هیدایەت نادرێت ، یان هەرکەسێك (خوای گەورە ) نزمی بکاتەوە بە هیچ کەسێك بەرز ناکرێتەوە یان هەر کەسێك (خوای گەورە ) بەرزی بکاتەوە بە هیچ کەسێك نزم نابێتەوە، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٦﴾ [البَقَرَةِ : ٦]

١١- شوێنی تێگەیشتن دڵە لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٧]

١٢-فەزل و گەورەیی دڵ بەسەر هەموو ئەندامەکانی لاشە ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٧]

١٣-بیست فەزل و گەورەیی زیاتر لە بینین لە بەر ئەوەی بیستن بە پیش بینین خراوە ، لە بەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٧]

١٤- گەورەیی سزایی کافران یان بێ باوەران ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٧﴾ [البَقَرَةِ : ٧]

١٥-رۆژی قیامەت کۆتا رۆژی هەموو رۆژە کانی دونیایە ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ [البَقَرَةِ : ٨]

١٦-ئیمان هێنان بە رۆژیی دوایی یان رۆژی قیامەت یەکێکە لە روکنە کانی ئیمان، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ [البَقَرَةِ : ٨]

١٧- دوو روو یان مونافیقەکان ئیماندار نین ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ [البَقَرَةِ : ٨]

١٨-ئیمان هێنان بە (ربوبیه ) بە (ألوهیه ) و (اسماءوصفات ) ئەصلی ئیمانە و گەورەترین رووکنەکانی ئیمانە ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ [البَقَرَةِ : ٨]

١٩- فێل تەلە کە هەخەلەتاندن تەنها بەسەر خاوەنە کەی دەشکێتەوە ، دوو رووە کان واگومان دەبەن خۆیان سەر کەوتوون و خەلکیان هەخەلەتاندووە فێلە کەیان سەری گرتووە ، بەلام زۆر گەمژەو نەزانن فێل تەلکە بازیە کەیان بۆ خودی خۆیان دەشکێتەوە، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ [البَقَرَةِ : ٩]

٢٠-کارو کردەوەی باش و چاکە ، بینینی مرۆڤ بە هێز دەکات بۆ راستییەکان هەست بەشتی روون وبەچاو شتی وورد دەکات ، بەلام کردەوەی گەندەلی و فسادی خراپەکاری ، بینینی مرۆڤ کوێر دەکات ، مرۆڤ هەست بە شتی دیار نادیار ناکات هەستی نامێنیت لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ [البَقَرَةِ : ٩]

٢١-هۆی گومرایی هەموو دوو ڕووەکان نەخۆشی دڵ یان بووە ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٠]

٢٢- تاوان و خراپە کەم دەبێت و زیاد دەبێت ، هەروەك چۆن ئیمان زیاد و کەم دەبێت ، لە بەر ووتەی قال تعالی: ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ [البَقَرَةِ : ١٠]

٢٣-بەستنەوەی هۆکار بە سزاوە ، چونکە (خوای گەورە ) سزای هیچ کەسێك نادات ، بە گەر بە هۆی تاوان و خراپە کاریەوە نەبێت ،لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ ١٠﴾ [البَقَرَةِ : ١٠]

٢٤-حەرامی چاندنی تۆی فسادی گەندەلی لە سەر زەویدا ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُواْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ [البَقَرَةِ : ١١]

٢٥-نەمان و مردنی هەستی دووڕووەکان یان مونافیقەکان ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ١٢﴾ [البَقَرَةِ : ١٢]

٢٦-هەرەشەیەکیٚ توند هاتووە بۆ ئەوانەی دووڕوو مونافیق و گەندەل و فسادن ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمُۢ﴾ [البَقَرَةِ : ١٠]

٢٧-هەر کەسێك بانگەشەی شتێك بکات مەرج نیە بانگەشەکەی ڕاست و دورست حەق بێت قال تعالی: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ١١﴾ [البَقَرَةِ : ١١] ،یان هەر کەسێك بانگەشەی چاکسازی بکات مەرج نیە ڕاست بکات بەڵکو درۆ دەکات ، دوو ڕووی دەکات لە بانگەشە کەی دا وە ك لەم سەردمە دا بانگەشە ی چاکسازی بەخەڵك دەفرۆشنەوە بەڵام لە ڕاستی دا وانیە ، هەر خۆیانن فساد و گەندەل دزو جەردە مافیان ، بەردەوام خەریکی مژینی خوێنی خەڵك و برسی کردنی خەڵکەن ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ١٢﴾ [البَقَرَةِ : ١٢]

٢٨-مرۆڤ تاقی دەکرێتەوە بە خراپە چاندن لەسەر زەوی ، هەروەها خراپەکەشی لیٚ دەشاراوە دە بێت ،لە بەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ١٢﴾ [البَقَرَةِ : ١٢]

٢٩- سەرسام بوون و فەخ فەخە کردن خۆ بە زل وگەورە زانین و خۆ بە شت زانی خۆیان ، دوو رووەکان پێیان وایە دونیا و خۆشی دونیا بە بۆ ئەوانە ، چونکە زۆر سەر سامن بەنەفسی خۆیان ئەم سیفەتی دووروو یان مونافیقەکان ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ [البَقَرَةِ : ١٣]

٣٠- بانگ کردنی دووروو یان مونافیقە کان بۆ چاك و خێر و چاکسازی هیچ سوودی نیە ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ١٣﴾ [البَقَرَةِ : ١٣]

٣١- توندی زۆری گومرایی وبێ باوەوری دووروو یان مونافیقەکان ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ﴾ [البَقَرَةِ : ١٣]

٣٢- هەر کەسێك ئیمان و باوەری بە خوا و پێغەمبەرەکەی و بە کتێبەکان و فریشتەکان و بە رۆژی دوایی بەهەشت دۆزەخ نەهێنێ ئەوا بێگومان گەمژە و نەفامە لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥ﴾ [البَقَرَةِ : ١٣٠]

٣٣-بەراست زانینی بەلێنی (خوای گەورە ) بە بێ گومان لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ٣٨﴾ [الحَج : ٣٨]

٣٤-جیچگیر کردنی نەزانی بۆ دوو روو یان مونافیقەکان ، چونکە (خوای گەورە) نەفی زانست یانی کردووە ئەوان نەزان و گەمژەن ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ١٣﴾ [البَقَرَةِ : ١٣]

٣٥- زەلیل و ترس و دلە راوکی دووروە کان یان مونافیقەکان ، کە لە نیوان کوفر ئیماندان ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ١٤]

٣٦- لە ناو مرۆڤە کانیش دا شەیتان هەیە ، هەر وەك چۆن لە نێو جنۆکەکان شەیتان هەیە ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ١٤]

٣٧-فیلّ تە لەکەی دووروە کان یان مونافیقەکان ، کە گالتەیان بە ئیمانداران دەکرد ، بەلام کە دەچوونە لای سەرۆك شەیتانەکانیان دەیان ووت ئێمە لە گەل ئێوە داین ، ئەوەش فرو فێل و تەلەکە بازی دووروی ناپاکی خیانەتی دوو رووەکان ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤﴾ [البَقَرَةِ : ١٤]

٣٨-بێ عەقلی گەمژەیی نەفامی دوو رووەکان یان مونافیقە کان ، بە جۆرێك بازرگانی دەکەن کە تێدا خەسارەت مەندو زیانی زۆریان پێ دەکەویت هیچ سودێکیان دەست ناکەوێت لەم بازرگانیە دا ، جگە لە خەسارە ت زیان گەیشتن بۆ خۆیان ، بەم بازرگانیە

چوون گومرایی و بێ باوەریان کری ، لە جیاتی هیدایەت و ڕێنموویی ڕێ نیشاندر و ئیمان و باوەر ، لەبەر ووتەی قال تعالی:
﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٦﴾ [البَقَرَةِ : ١٦]

٣٩- بلاغەتی قورئانی لە باس کردنی نموونە یان وێنە هێنانەوە لە قورئاندا بۆ نزیکی مانا یان (التشبیه) چواندنی هەندێك شت معقول و نابە رجەستە بە هەندێکی شتی بەرجەستە بۆ زیاتر روونکردنەوەو تێگەیشتنی خوێنەری قورئانی پیرۆزە ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا﴾ [البَقَرَةِ : ١٧]

٤٠-ئەم دووروو یان مونافیقانە هیچ ڕۆشنایی یان ڕووناکی یەکیان لە دڵ دانیە ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا﴾ [البَقَرَةِ : ١٧]

٤١-ئیمان نوورە یان ڕووناکی و ڕۆشنایی یە ، هەتا کاریگەری لەسەر دڵ ی دوورووەکان مونافیقەکانیش دا هەیە ، لە بەر ووتەی قال تعالی: ﴿فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧]

٤٢-ڕووناکی و هیدایەت بەدەست (خوای گەورە) هەر کەسێك بیبەوێت ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ [النُّور : ٣٥]

٤٣-هەرشە کردن لە کافران یان بێ باوەرەکان و دووروو مونافیقەکان و مولحید و هاورەگەز بازان و علمانی و شوعیە مارکسیەکان و بێ دین ئاینە پووچە گومرا کان ئەوانەی وەك ئاینی جولەکە گاورەکان ،ئاینی هندو بوزی ئاگر پەرستان ، ئەم هەرەشەیە بۆ ئەوانەی کە دوژمانیەتی ئاینی ئیسلامی پیرۆز دەکان دوژمنایەتی قورئان و پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن ،بەڵێ هەرشەیە کە ئەگەر بیری لێ بکەونە هۆشیان هەبێت ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ [البَقَرَةِ : ١٩]

٤٤-سروشتی مرۆڤ وایە کە خۆ بە دوور دەگرێت لەو شتانە کە زیانی بۆ هەیە و هیلاکی دەکات ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ قَامُواْ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٠]

٤٥-جێگیر کردنی ویست بۆ (خوای گەورە ) لە بەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٠]

٤٦- جێگیر کردنی توانای هێز قدرەتی (خوای گەورە ) بەسەر هەموو شتێك دا دەسەلاتی هەیە ، لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠﴾ [البَقَرَةِ : ٢٠]

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ۝٢١﴾ [البَقَرَةِ : ٢١]

قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] واتە: ئەی خەلکینە ،قال تعالى: ﴿ٱعْبُدُواْ رَبَّكُمُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] واتە: پەروەردگارتان بپەرستن ..؟! قال تعالى: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] واتە: کە ئێوە و ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردووە..؟! قال تعالى: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ۝٢١﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] واتە: بەلکو بەو پەرستنە خۆتان بپارێزن ..!!

بەلێ ئێمە لە باسە کانی پێشتر دەربارەی بیست ئایەتی سەرەتای سورەتی (البقرە) دواین ، کە پێنج ئایەت باسی ئیمانداران یان باوەرداران دەکات ، هەروەها دووئایەتی تریش دەربارەی کافران باس دەکات ، وە سیانزە یایەتی تریش باسی دوورەکان یان موونافیقەکان دەکات ، کەواتە دەکاتە بیست ئایەت لەسەرەتایی سورەتی (البقرە) دا ئیستاش دێنە سەر باسی ئایەتی بیست و یەك.

## یەکتاپەرستی الوهیە یان التوحید الوهیە :

لەدوای ئەوەی کە لە بیست ئایە تی سەرەتای سورەتی (البقرە ) دا ، باسی سێ جۆر سیفات لە ئادەمیزادمان کرد ئەویش کە قورئانی پیرۆز باسیان دەکەن کە ئەم سێ جۆرە خەلکە هەن ، وەکو ئیمانداران و کافران ، وە دوو درووەکان یان مونافیقە کان ،ئەم سێ دەستەیەی ئادەمیزاد کە بانەغەی هەموو کومەلگایەکە لەسەر پێك دەهێنرێت ، بەلام لەم ئایەتەدا خوای گەورە باسی هەموو خەلکی دەکات لە ئامیزاد لەم سێ دەستەیە واتە بانگی هەموو مرۆڤەکان یان ئادمیزاد دەکات بۆ خوا پەرستی راستە قینە ، یان بانگی خەلکی دەکات بۆ کتاپەرستی (خوای گەورە ) بە تاك و بەتەنها ، واتە ئیمان یان باوەر هێنانی تەواو ئەم سێ خالە دەگرێتەوە:

١-(خوای گەورە ) بەتاك و تەنهایی بپەرستی ویەکتا پەرستی بە خلاصی تەواو راستەقینە، وەگەرانەوە تەنها بۆ لای (خوای گەورە ) یان روو لە خوا کردن .

٢-باورە هێنام بە کۆتا پێغەمبەر ﷺ کە نبێرداوی (خوای گەورە ) ، وە باورە هێنان بە هەموو پێغەمبەران (علیە السلام ) ،وە باورە هێنان بە هەموو فریشتە کانی (خوای گەورە ) ، وە باوەر هێنان بە هەمووکتێبە کانی (خوای گەورە ) کەکۆتا کتێبی (خوای گەورە ) کە قورئانی پیرۆز ، بۆسەر هەموو خەلکی جیهان لە مرۆڤ و جنۆکە ، بۆ ﷺدابەزیوەتە خوارەوە .

٣-باوەر هێنان بە رۆژی دوای و حیساب و کتاب لێپرینەوە ، بەهەشت و دۆزەخ پردی سیرات ، هەروەها رۆژی زیندوو بوونەوەی هەموو ئادەمیزاد .

هۆی دابەزینی ئایەتی (٢١) سورەتی (البقرە ) :

✍ لە (علقمە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : هەموو ئەو ئایە تانەی دابەزی وون بە ووتەی ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ئەوا بێ گومان ئەو ئایە تانەن کە لە شاری مککە دابەزیوە ، پیان دەڵێن : ئایەتە مکیە کان ،وە پەیامە بۆ خەڵکی شاری مککە ، هەروەها ئەو ئایەتانەی دابەزی وون ، بە ووتەی﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەو ئایەتانە لە شاری مەدینە دابەزیون ، واتە : پیان دەڵێن : ئایە تە مدنی یەکان ، وە پەیامە بۆ خەڵکی شاری مەدینە ، هەروەها چونکە ووتەی قال تعالی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] واتە: ئەوا پەیامی (خوای گەورە ) بە بۆ هاوبەش بریاردانی شاری مککە یان موشریکانی شاری مککە ، هەتاکو ووتەی قال تعالی: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ [البَقَرَةِ : ٢٥]

بەڵێ ووتەی : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ بێ گومان ئەم ووتەیە بانگ کردنە بۆ هەموو خەڵکی لە مرۆڤ جنۆکە ..؟! لە گەل ئەوەشدا کە سورەتە بە ووتە هەموو زانایان کە کۆدەنگی لەسەر هەیە ئەم سورەتی (البقرە) دابەزیوە لە شاری مەدینە ، کەواتە سورەتەکە پێی دەڵێن : مەدینی ..؟! ئەگەر یەکێك بلێ لەوانیە ئەم ئایەتە مکی بێت لە سورەتی مەدنی دایە ..؟! وەلام ئەصل وایە ئایەتی مەکی لە ناو سورەتی مەدنیدا نیە ..!! یان بە پێچەوانەوە بێت ..؟! وە نابێت لە ئەصلە لابدیت مەگەر بەلگە (صحیح ) هەبێت ، ئەصل وایە سورەتەکە مەدینە بە هەموو ئایەتەکانیەوە ، یان سورەتەکە مەکیە بە هەموو ئایەتەکانیەوە ، مەگەر لەگەی جێگیر هەبوو بێت ..!! بەڵێ زانیان ئەم ئۆمەتە سەبارەت بە جیاوازی نێوان سورەتی مەکی و مەدنی ووتەیان هەیە ، سەبارەت بە سورەتە مەککیە کان بەم چەند نیشانەیە دەناسرێن :

١- لەرووی شێوازەوە سورەتە مککیە کات توندترن لە دەربرینان واتە پەیامەکە گشت گیر ترە، چونکە بەزۆری باسی ئەوانەدەکات کەپیشتیان لەئاینی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە ، وە خۆیان بە گەورە دادەنێن .

٢-لە رووی شێوازی کورت درێژی ئایە تەکانی سورەتە مەککی ئەوا بەزۆری ئایەتەکانی کورترن .

٣-لە رووی باس و بابتەکانەوە ،سورەتەمککیە کان بەزۆری باس بابەتی بیرو باوەر عقیدە یەکخوا پەرستی ، زیندوو بوونەوە و بەهەشت دۆزخ دەکات ، چونکە موشریکان یان کافرانی ئینکاری زیندوو بوونەوە و یەکخواپەرستیان دەکرد .

٤-وە دلێن : بەشێوەیەکی گشتی هەر سورەتێك لە قورئاندا ئایەتی سوجدەی تێدا بێت ئەوە بەدلنیایەوە سورەتەکە مککیە .

٥-وەدلێن :بەشێویەکی گشتی هەر سورەتێك ووتەی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ تیدا بێت ، وە ووتەی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ی تێدا نەبێت ئەوە مككیە ، جگە لەسورەتی نەبێت . ئەواجیاوازی هەیە لەسەر ووتەی زانایان لە سورەتی حەج دا .

٦-بەشێوەیەکی گشتی هەر سورتێك باسی پێغەمبەران و ئادم شەیتان بکات وە ئۆمەتەکانی پێشرت بکات ، ئەوا مککیە ، جگەلە سوورەتی (البقرە) نەبێت کە سورەتێکی مەدنیە ..!!

نیشانەکانی سورەتە مەدنیە کان ئەم چەند نیشانەی هەیە پێ دەناسرێت :

١-لە رووی نەرم نیانی شێوازی پەیامەکە ئاسانە چونکە بۆئەوانەیە کە ئیمانیان هێناوە وەك ووتەی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ چونکە بۆ ئەوانەیە کە تەسلیم بوون و باوەریان هێناوە .

٢-لە روووی کورتی درێژی ئایە تەکانی درێژن .

٣-لە رووی باس بابتە کانەوە بە زۆری باسی دوو رووەکان یان مونافیقە کان ، ئەحکامی شەرعی وەك مامەلە کردن و کرین وفرشتن ، هەوەرها بابەتی کۆمەلایەتی وەك هاوسەر گیری کێشەکانی نێو خێزانەکان ، هەروەها عیبادەتەکان و ئەحکامی جەنگی و دابەش کردنی غەنیمەتەکان .

٤-هەر سورەتێك فەرز و واجبی تێدا بێت یان حەد تێدابێت ئەو سورەتی مەدینە .

٥-وەك باسمان کرد هەر سورەتێك باسی مونافیق یان دوو روو بکات ، ئەوا سورەتی مەدەنییە ، جگە لە سورەتی (العکبوت ) نەبێت کە سورەتێکی مککییە .

٦-هەر سورتێك باسی موجادەلە ئەهلی کتاب ئەوا مەدەنییە .

بەلێ ﴿ٱعۡبُدُوا۟ رَبَّكُمُ﴾ واتە : پەروەردگاری خۆتان بپەرستن ، بێ گومان ئەمە فەرمانێکی خوایە ، بەدلنیاییەوە واجبە ، کە واتە پەرستن یان عیبادەتی خوا واجبە بۆ هەموو کرۆی ئادەمیزاد یان هەموو مرۆڤێك جنۆکەیە ، کە پەروەردگاری خۆیان بپەرستن ،چونکە مەبەستی دورستی کردنی ئادەمیزاد تەنها عیبادەت کردنی (خوای گەورە ) یە بە تەنها ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفرمووێت : قال تعالى: ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ۝٥٦﴾ [الذَّارِيَات : ٥٦] واتە : من مرۆڤ و جنۆکەم دروست نەکردووە، و هەموو پەیامبەرانیشم نەناردووە ئیللا بۆ ئامانجێکی بەرز وبڵند نەبێت، ئەویش بە تاك و تەنها پەرەستنمە دوور لە پەرستنی جگە لە خۆم ..!! ✍ (ابن تیمیه ) — رەحمەتی خوای لێ بێت — دەلێت : (عیادەت ) : ناوێکی گشتیە بۆ هەموو شتێك کە (خوای گەورە ) خۆشی بۆێت پیی رازییە لە ووتە و کردەوەی دیار و شاراوە ، واتە : (عبادەت ) کردنی فەرز واجبە ، بەلام (عبادەت ) کردنی سوونەت (مباح ) دەگرێتەوە ئەگەر نییەتی باشی هەبوو ، هەروەها (عیبادەت ) لە وازهێنانی واجب دەبێتە حرام لە سەر خاوەنەکەی یان مکروهیش دەگرێتەوە ،هەروەها ✍ (ابن تیمیه ) — رەحمەتی خوای لێ بێت — دەلێت : (ئیماندار ئەگەر نییەتی باشی هەبووبۆ هەموو کردەوە کان ، ئەوە شتە (مباح ) کان هەموو دەبنە کردەوەیە باش لەبەر ئەخلاص کەی یان

نیەتە کەی . ووشەی ﴿رَبَّكُمُ﴾ رب: (خالق ) و (مالك ) و بەڕێوەبەری دروست کراوەکان ، واتە : (رب) دانەپاڵە ضميري مخاطب کە خە لکە ، وە بە برير هێنانەوەی پەروەردگاریەتی خوای گەورەیە ، بۆ ئەوە تەنا بەندایەتی خوابکەن ، چونکە دانپێدانن یان دانان بە یە کخوا پەرستی یان (التوحيد ) ی پەروەردگاریەتی بەندایەتی کردن دەکات . بەلێ ئەو زاتەی کە ئێوە و پێشینانی ئیوەشی بەدیهێناوە لە نەبوونەوە ﴿ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ ، بۆ ئەوەی ڕێبازی تقواداری خوا ناسی بگرنە بەر ..!!

بەلێ بێگومان لە باسی یەکخواپەرستی یان (التوحيد) الوهیە ، دوو بابەتی گرینك باس دەکەین ئەوی لە ئایەتی ٢١تاکو ئایەتی ٢٤ ئەم دوو بابەتەیە دەگرێتە خۆ : یەکەمیان : (خوای گەورە ) بانگی هەموو مرۆڤێك یان جنۆکەیەك دەکات ، کە تەنها پەروەدگاریان بپەرستن بە تەنها ، دووەمیان بوونی و گەورەیی (خوای گەورە ) لە دورستکراوەکانی دا ، هەروەها زاناو دانی پەروەردگا و ، هەروەها تەحدای پەروەرگار بۆ کافران و موشریکان مولیحدەکان ، کە ئەو قورئانەی رەوانەی کردووە بۆ پێغەمبەری سەروەرمام ﷺ ئێوەش بێن وەك ئەم قورئانە بێنن یان سورەتێك لە سورتە بچووکە کان یان کورتەکانیش بهێنن ، بەلێ هەروەك دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٢١]

ئەمە بانگ کردنی (نداء ) بۆ خەلکی بەگشتی ، واتە : فەرمانێکی گشتیە بۆ هەموو خەلکی سەرووی زەویە بە مرۆڤ جنۆکەوەش ،ئەویش بریتیە لە (عیبادەت ) یان پەرستن ، واتە : کۆکەرەوەیە بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) وە دوور کەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکانی دا ، وە بەراست دانانی هەوالەکەی کە پەروەردگاریان فەرمانی پێیان کردووە ، وە لە پێناویدا بە دیهێناون هەروەك (خوای گەورە دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾﴾ [الذَّارِيَات : ٥٦] واتە : من مرۆڤ و جنۆکەم دروست نەکردووە، و هەموو پەیامبەرانیشم نەناردووە ئیللا بۆ ئامانجێکی بەرز وبڵند نەبێت، ئەویش بە تاك و تەنها پەرەستنمە دوور لە پەرستنی جگە لە خۆم ..!! بەلێ ئەگەر سەرنێج بەدەین بە ووشەی ﴿خَلَقَكُمْ﴾ واتە: (الخلق : التقدير المستقيم ، ويستعمل في إبداع الشيء من غير أصل ولا احتداء )واتە: ووشەی (خق ) بریتیە لە ئەندازگیری راست و دورست ، وە بە کاردێ بۆ هێنانەدی شتێك لە نەبوونەوە ، بێ گومان تەنها (خوای گەورە ) بە دیهێنەرە یان (خالق)ە بەم تێ گەیشتنەیان یان بەم مەفهوومەیان ، بەلام مەفهوومیچکی تریش هەیە ، ئەوەیە کە بریتیە لە گۆرینی شتێك لە حالە تێکەوە بۆ حالە تێکی ترەوە ، بۆیە ئەو پالدراوەتەوە لای عیسی (علیە السلام ) وە دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿...أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى بُيُوتِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾﴾ [آل عِمۡرَان : ٤٩]واتە: وە دەیکاتە پەیامبەرێك بۆ نەوەکانی ئیسرائیل .واتە : یەعقوب ،. و پێیان دەڵێت : من نیشانەیەکم بۆ هێناون لەلایەن پەروەردگارتانەوە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی من لەلایەن پەروەردگاروە نێدراوم، و ئەو نیشانەیەش بریتیە لەوەی کە : لەقوڕ شتێکتان بۆ دروست دەکەم لەسەر شێوەی باڵندە، ئینجا فووی پێدا دەکەم بەویستی خوای پەروەردگار دەبێتە باڵندەیەکی ڕاستەقینە، و کوێری زکماك و

نەخۆشی بەڵەکیش چاك دەکەمەوە، و مردووش زیندوو دەکەمەوە بە ویستی خوای پەروەردگار، و هەواڵتان دەدەمێ لەبارەی ئەو خواردنانەی کە دەیخۆن و ئەوانەشی کە پاشکەوتی دەکەن لەماڵەکانتاندا . بەڕاستی ئەم کارە گەورانە کە لەتوانای مرۆڤدانیە نیشانە وبەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە من نێردراوی خوای پەروەردگار و پەیامبەری ئەوم، ئەگەر ئێوە بەڵگە ونیشانەکانی خوای پەروەردگار بەڕاست دادەنێن، ودانەدەنێن بەیەکتاپەرستی ئەودا ..!!

وە ووشەی قال تعالى: ﴿لَعَلَّكُمْ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١]واتە: (لعل) : طمع وإشفاق ، واتە : بریتیە لە هیوا یان خۆزڤە یان ئومێدە واری بە بوونی شتێك ، وە ترسانیشە لە نەبوونی ، جا لێرەدا ئەوە بۆ (خوای گەورە ) لایەق و گونجاو نیە نابێت ، بۆ هەندێ لە زانایان دەڵێن :(لعل ) : من الله واجبە ، واتە : هەرکاتێ فەرمووی (لعل ) واتە : ئەوە تان بۆ بکەن ، مانای وایە ئەو شتە (خوای گەورە ) ئەنجامی دەدات یان واجبی کردوە کە بیکات ، یانئێوە وا بکەن ، ئان ئومێد وایە ئەو شتەتانبۆ بکرێ ، یان ئومێد وایە ئەنجامەکەی وابێت ..!!

وە ئەگەریش سەرنجێك بدەینە ووشەی ﴿تَتَّقُونَ ٢١﴾ لە ئەصلدا لە (وقایە) هاتووە ، واتە : پارێزکردن ، هەروەها (خوای گەورە) جاری وا هەیە تقوی پالداوە لای خۆی ، وە جاری واش هەیە پالداوە جگە لەخۆی یان غیری خۆی ، بۆ نموونە دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ٢٤﴾ [البَقَرَةِ : ٢٤] واتە: دەی کەواتە بە ئیمان هێنان و کردەوەی چاکتان خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە سووتەمەنییەکەی خەڵکی و بەردی گۆگردە، کە ئامادەکراوە بۆ کافران، (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئێستا دۆزەخ دروستکراوە)..!!یان (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ [النِّسَاء : ١]واتە: ئەی خەڵکینە لە خوای پەروەردگار بترسن و پابەند بن بە فەرمانەکانیەوە، و دوربکەونەوە لە یاساغی لێکراوەکانی، چونکە ئەو خوایەیە کە ئێوەی لە تاکە کەسێکەوە هێناوەتە بوون کە ئادەمە .سەلامی خوای لەسەر بێت .وە هەر لەو هاوسەرەکەشی دروستکردوە کە حەوایە، وە لەو دوانەشەوە پیاو و ژنێکی زۆری دروستکردووە و بەناوچەکانی زەویدا بڵاوی کردنەتەوە، وە چاودێری ئەو خوایەتان لەیاد بێت کە بەناوی ئەوەوە داوا لەیەکتر ئەکەن، وە ئاگاداربن لەوەی کە پەیوەندی و صیلەی خزمایەتی بپچڕێنن . و بێگومان بن کە خوای پەروەردگار چاودێری هەموو حاڵ و بارێکدا ..!! کەواتە : ئەصل و بنچینەی ووشەی (تقوی ) لە زمانەوانی دا دەگەرێتەوە بۆ سەر (وقایە ) پارێزکردن ، ئینجا خۆ لە خوا پاراستن ئەوەیە ، خۆی لە توورەییە کانی بپارێزی ئەوانەی کە قەدەغەی کردوون تورە دەبێت لەسەر هەر کەسێك ئەنجامی بدات ، نەك وەك ئەوەی ئەنجامی بدەیت خوا لێت توورە بێت ..؟! با بلێن : کەسێك پرسیار دەکات ئایا (خوای گەور ) بەجی لێمان توورە دەبێت ..؟! ئێمەش لەوەلامی دا دەڵێن : بەدوو شت زۆر تورە دەبێت ..!! یەکەم :

ئەوەیە كە فەرمانی پێ كردووی كەزاتی (خوا بە تاك تەنها بپەستی ) نەبێ فەرمانی بكەیت و غیری (خوای گەورە ) بپەرستی شریك هاوبەشی بۆ بریاربدەی ، دووەمیش : یان ئەوەی كە لێ قە دەغەی كردووی ئەنجامی بدەیت ، هەروەك زانایان ووتویانە : ( التقوی : جماع خصال الخیر كلها ) واتە: پارێزگاری هەرچی سیفاتی چاكە كۆدەكاتەوە ، چونكە بەندە هەرچی (خوای گەورە ) پێ خۆشە ئەنجامی بدات ، وە هەرچی (خوای گەورە ) پێ ناخۆشە خۆ لێ دوو بكاتەوە ، مانایی وایە تۆ شەریعەتی (خوای گەورە) ت بەتەواوی جێ بەجی كردووە ،یان هەر هەموویت ئەنجام داوە ..؟!

بەلێ لێرە دا با دەربارە ی ئەم سێ كۆمەلە ی كە لە پێشتر دا باسمان كرد ، واتە: ئیمانداران و كافران و مونافیقە كان ،هەر كۆمەلگایەك ئەم سێ پێك هێنەرەی تێدایە ، ئەوانەی كە بە ئاشكرا خۆیان بە كافر دادەنان باوەریان نەدەهێنا ئەو دیار و روون ئاشكرا بوو ، ئەوانەشی كە لە نێوان ئیمانداران و كافران دا قەسیس ماوە نە ئەوەیە لەگەل ئیماندرانن نە ئەوەشە لە گەل كافران دان ئەوانە دوو رووكان یان مونافیقە كان نن ..؟! بەلی هەمیشە هەركۆمەلگایەك ئە سێ دەستەیەكی تێدا بەدی دەكرێت ، وە لێرە شدا بۆ مان دەردەكەوێت كە كافرەكان بە هەموو جۆرە كانێ دەتوانن لە ژێر ئالای ئیسلامدا بژین و ژیان بكەن ، بەلام دەبێت جزیە بدەن بە مەرجی ئیسلام دەسەلاتد داربێ ، كەواتە خەلیكی ناچار ناكری ببێتە مونافیق ..؟! وە ئەوانەش كە خۆیان ئەم رێگا ناپاكی یە هەلدەبژێرن ئەوە مەسەلەكی ترە ..؟! هەر بۆیە (خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالی: ﴿فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ﴾ [الكَهۡف : ٢٩] واتە : [ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ ] جا هەر كەسێك ویستی لێیە با ئیمان بێنێ [ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ] وە هەر كەسێكیش ویستی لێیە با كوفر بكات..؟! بەلیچ هەموو ئادەمیزاد درست كراوی (خوای گەورە) یە پێویستە لەسەر هەر ئادەمیزادێك پەروەردگاری خۆی بپەرستی بە تاك تەنها..؟!!قال تعالی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١]

هەربۆیە لێرەدا چەند پرسیارێك دێتە ئاراوە ئەی براو خۆشكی بەرێز ئەی خوێنەی خۆشەوێت ئێمە دەبێت چەند پرسیارێك لەخۆمان بكەین ..؟! یەكەم : ئێمە بۆچی هاتووینەتە ئەم دونیایەوە ..؟! دووەم : بۆچی دروست كراوین ..؟! سێ یەم : بۆچی لێرەم لەسەر زەویدا ..؟! چوارەم : هیواو ئامانج مان چیە لەم ژیان ..؟! پێنچە : بۆ كوێی هەنگا دەنێین ..؟! دوا مەنزل مان بە كوێ دەگات ..؟!

شەشەم : ئایا بەردەوام دەبین بۆ هەمیشە لەم دونیایەدا دەێنیەوە ..؟! حەوتەم : ئایا پاش مرد مان هەر وا پێ لێ پێچینەوە حیساب كتاب دەخرینە ژێر گل تەواو ..؟! هەشتەم : ئایا سوودت چیە لە دونیایە دا..؟! نۆیەم : ئایا بۆچی دەبێت ئێمە خوا بە تەنها بپەرستین ..؟! دەیەم : ئایا (عیبادەت ) سوودی بۆ ئێمە بۆ دەبێتە فەرمانەكان ئەنجام بدەین و دوور كەوینەوە لەقەدەغەكراوكان..؟! ئەم پرسیارانەو چەندین پرسیاری تریش هەندە دەبێت مرۆڤی ژیرو هۆشمەند لە خۆیان بكات ، بۆ ئەوەی رێرەوەی ژیانی راستەقینە خۆی بدۆتەوە ، بێ گومان ئێمە لەم جیهانە دا بۆ ماوەیەكی زۆر كورت و كەم دەژین ، بەلام هەستیان پێناكەین كە كاتەكەی چەند كورتە تەمەنی مرۆڤ لەم ژیانی دونیایەدا چەندە كەم كورتە ، بۆیە ئێمە بە پێچەوانەوە مرد دووین لەم ژیاندا ئەوانەی مردوون ژیانی هەمیشەیی یان هەیە ، وە بێ گومان ژیانی هەموو مرۆڤێك لەدوای مردنەكەی دەست پێ دەكات بەلام بە ژیانەی دونیا وەك وێسگەیەی تاقی كردنەوە وایە بۆ ژیانی هەمیشەیی هەتاهەتایی ، بۆیە (خوای گەورە ) بانگ لە هەموو مرۆڤە

کان دەکات ئەوانەی کە لەم ژیانەی دونیا دا پێیان دەفەرمووی : قال تعالی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] واتە : پەروەردگاری خۆتان بپەرست ، کەواتە بۆمان روون دەبێتەوە ئێمەی مرۆڤ تەنها دروست کراوی بۆ پەرستنی (خوای گەورە ) ، کەواتە لێرە دا زانیمان بۆچی دروست کراوین هەروەك دەفەرمووێت: قال تعالی: ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ٥٦﴾ [الذَّارِيَات : ٥٦] واتە : من مرۆڤ و جنۆکەم دروست نەکردووە، و هەموو پەیامبەرانیشم نەناردووە ئیللا بۆ ئامانجێکی بەرز وبڵند نەبێت، ئەویش بە تاك و تەنها پەرەستنمە دوور لە پەرستنی جگە لە خۆم ..!!

ئەی براو خوشکی بەرێز: ئەگەر سەرنج بدەینە خەلکەی سەر زەوی دەبینین رۆژانە بە ملیارەها خەلکی جوولە دەکەن بەدوای خۆش گوزەرانی خۆیان کارو کاسبی دەکەن وجوولە دەکەن ، هەروەها کارو کردەوەکانیان جا قورس گرانە و یان هیلاکەتە ، بۆ بەدەست هێنانی خۆش گوزرانی خۆیان کارو کاسبی پەیدا کردنی بژێوی ژیان بۆ خۆیان مال مندالیان ، هەروەها سەفە رو گەشت گوزاو مال پێك هێنان هاوسەر گیری یان بازرگانی کردن ، بەرز کردنەوەی خانوو ڤیلاو فەندقی چەند قات ، هەروەها دامەزراندی کۆمپانیا ، گەران بەدوای کار کردن بۆ بژێوی ژیان و مال سامان کۆکردنەوە و هەروەها هەولدانی پورست پلە دەسەلات ، ماندو بوون بەدوای شهادە و خوێندنی بەرزو ، ئەمانە هەر هەموو مرۆڤ دەزانی خۆی بۆ ماندوو دەکات هەولی بۆ دەدات ، بەلام لە کاتێك دا نازانی بۆچی دوست کراوە.؟! خۆ لەبیر چۆتەوە ..!! لەبەر هیلاکەت ژیانی دونیایی کەچی هەر ماوەیەکی زۆر کورتە ئەم دونیایەلە ناکاو لە غەلەتێك دا بەسەر دەچێت ، نموونەیەك : ئەگەر کەسێك سەفەر بکات بۆ وەلاتێك دەبێت لەسەر تا بچێتە فندەقێك و ژوورێك بە کرێ بگرێت : ئیتر لەوەی دە دەمینێتەوە دەخەوەی تابەیانی هەلدەستێتەوە ، ئینجا دەست بەنان خوادرنی بەیانی دەکات ، پاشان جلەکانی لەبەر دەکات ، ئەو کاتە پرسیا لەخۆی دەکات من بۆچی هاتوومە ئەم ولاتە ..؟! ئامانجم لە سەفەر کردنە چ بووە ..؟! پاشان بە خۆی دەلێت : من بۆ کی بچم ..؟! وەئێمەش دە پرسین بۆچی هاتووینە ئەم ژیانە ..؟! ئەگەر هاتوو بۆ بازرگانی دەبێت بە زرگانیەکی سەر کەوتوو ئەنجام بدەیت بۆ ئەوەی خەسارەت مەند نەبێت ، چونکە رێگایەکی زۆرت بریوە بۆئەوە بەئامانجەکەت بگەێت ، بێگومان دەبێت سر یانی نهێنی بوونی خۆت بزانی لەم شوینەی کە بۆی هاتووی ، بەلیٚ بێگومان ئەوا پرسیارێکی زۆر ووردو گرینگ و کاریگەرە ، بۆیە هەر یەکێك لە ئێمە دەبێت بزانی بۆ چە ئامانێك هاتووینە ئەم جیهانە ..؟! وە بۆچی دروست کراوین ..؟! هەرکاتێك تۆی بەندەی (خوای گەورە ) زانیت بۆچی هاتووی ،یان بۆچی دورست کراوی ئەوا بەدلنیایەوە نیعمەتێکی زۆر گەورە یە کە (خوای گەورە ) بە تۆی مرۆڤی بە خشیوە ..!! وە ئەگەریش نەزانی بۆچی هاتووی و ، بۆچی دورست کراوەی ، ئەوا (خوای گەورە ) هەوال مان پی دەدات ، هەروەك دەفەرمووێت: قال تعالی: ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ٥٦﴾ [الذَّارِيَات : ٥٦] واتە : من مرۆڤ و جنۆکەم دروست نەکردووە، و هەموو پەیامبەرانیشم نەناردووە ئیللا بۆ ئامانجێکی بەرز وبڵند نەبێت، ئەویش بە تاك و تەنها پەرەستنمە دوور لە پەرستنی جگە لە خۆم ..!! بەلیٚ بیگومان براو خوشکی بەرێز ، گەورەترین پرسیار ئاراستەی نەفسی خۆت بکەی ، ئەوەیە بلیٚ بۆی من هاتوومەتە سەر ووی زەوی ..؟! هەرکاتێك زانیت ئەوا بەدلنیایەوە راستیەکی روون وگەشاوەیە ، وا دامان نا کە فریشتەی مردن دێت ..؟! ئینجا دەلێت : خوایە بگەرێنەوە بۆ ئەوەی کارو کردەوەی چاکە جارێکی تر ئەنجام بدمەوە ، ماوەم پێدەوە یەك جاری تر ..!! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ

ٱلۡمَوۡتُ قَالَ رَبِّ ٱرۡجِعُونِ ۝ لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحًا﴾ [المُؤمِنُون : ٩٩ - ١٠٠]واتە : {کافران داوای گەڕانەوە دەکەن بۆ دونیا!} [ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ ] تا یەکێك لەوان لە کافران کاتێك کە مردن بۆی دێت و دەمرێت [ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ (٩٩) ] ئەلەو کاتە هاوار ئەکات ئەی پەروەردگار بمگەڕێنەوە بۆ دونیا..!! [ لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ] بەڵکو لە دونیادا کردەوەی چاك بکەم کە پێشتر نەمکردبوو (داوا ناکات بگەڕێتەوە بۆ دونیا تا رابوێرێت و تاوان بکات بەڵکو تا کردەوەی چاك بکات، کەواتە ئەوەی لە ژیاندایە با کردەوەی چاك بکات پێش ئەوەی بمرێت و داوای گەڕانەوە بکات و نەگەڕێنرێتەوە..؟!

به دلنیایەوە گرینگ ترین کارو کردەوە لە ژیانی دونیا ، کاری چاکە یە ، چونکە هەر کردەوەیەکی چاکە رێگا یە بۆ چوونە نێو بەهەشت ، بەڵێ کاورە کردەوەی یەکێك لە بەرهەمەکانی بەهەشت ، چونکە لە بنچینەدا تۆ ئەی مرۆڤ دورست کراوی بەهەشتی ، بەگەر بەدەستی خۆت رێگای بە هەشت هەلن بژێری ، رێگای دۆزەخ چەوت بگریە بەر ..؟! قال تعالی: ﴿ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ﴾ [البَقَرَة : ٢١] بێ گومان دەبێت گوێرایەلی کردنی پەروەردگارمان بکەین ، بەلام گوێرایەلی کردن دەبێت هەموو کات ئارەزوو مەندانە بێت ، واتە : ئیمان هێنان یان باوەر هێنان لە دلە ویە نەك وەك بە زۆری ئیمان بچێتە دلە وئەم ئیمانە تەواو نابێت ، هەروەك گوێرایەلی کردن عیبادەت کردنیش نابێت بە زۆری بێت چونکە نابێت گوێرایەلی یان عیبادەت کردن ، ئەو کاتە نا تەندورست دەبێت ، گریمان عیبادەتێکت بە تورە بوون وقهرخوادنەوە کرد ئەوا بەدلنیایەوە نابێتە عیبادەت ، یان گریمان مرۆڤی کی بەهیزو بە ئیمانیچکی دامەزراوەوە ، عیبادەت ئەنجام بدات ئەوا بەدلینایەوە بەندایەتی و پەرستنەکەی بۆ (خوای گەورە ) راستەقینەیە عیادەتەکەی وەرگیراوە ، گوێرایەلی تەواوی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) کردووە ، چونکە گوێرایەلیەکەی تەواو خۆشەویستیە لە دلّ ی دا ، چونکە لەسەر بنەمایەکی زانراو یقین دامەزراوە؟! ئەوەش بەدلنیایەوە بەروە بەختەوەری هەمیشەیی دەدبات ، ئەواش ئەو تێ گەیشتنە دەگەیێنێ کە ئیسلام وە کۆلێژی زانستی وایە ، یان کۆلێژی سلوکیە یان رفتارگەرای ، هەروەها لە کۆلێژی زانست دەست پێ بکەین ، دەبێت دوای زانست بکەین بۆ بەدێهێنانی ئامانجەکەمان ، نزمترین پلەی ئیمان زانینە ،یان نزمترین پلەی ئیمان زانستە ..!! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ [مُحَمَّد : ١٩] واتە : دەسا. ئەی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم .بزانە کە هیچ پەرەستراوێك نیە بە هەق شایستەی پەرەستن بێت جگە لە ( الله )..!!

هەروەها دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ [الزُّمَر : ٩]واتە : {زاناو نەزان یەکسان نین} [ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ] ئایا زانایان وەکو نەزانان وان لە دیندا؟ واتە: هەرگیز یەکسان نین..؟! قال تعالی: ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ۝﴾ [المُجَادلَة : ١١]واتە : ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە لە ئێوە وە زانستی شەرعیان وەرگرتووە خوای گەورە پلەو پایەیان بەرز

ئەکاتەوە لە دونیاو قیامەتدا [ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ] وە خوای گەورە زانیاریەکی زۆر وردی هەیە بە کردەوەکانی ئێوە وە هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە..!!

لە (عبدالله بن عمرو ) خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((طَلَبُ العِلمِ فَريضةٌ على كلِّ مُسلمٍ)).[1] واتە: دواکردنی علم و زانست واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك ..!!

بنچینەی ئاین ئەوەیە دبێت (خوای گەورە ) بناسین ، ئینجا ئەگەر (خوای گەورە ) ناسیی ئەو کات دەزانی بۆچی دەی پەرستی..؟! ، بۆچی لە (خوای گەورە ) دە ترسی ..؟!، بۆچی خۆشت دەوێت ..؟! بۆچی تکای لێ دەکەیت یان لێ دەپاریەوە ..؟! بێ گومان ئەگەر خوای خۆت ناسی ئەوا بەدڵنیایەوە فەرمانە کانیش دەزانی چی یەو چۆنن ؟!!، هەروەها قەدەغەکراوەکانیش دەزانی چی یە چۆنن؟!! بەڵێ (خوای گەورە ) فەرمان دەکات بە هەموو خەڵکی کە پەروەردگارتان بپەرستن ، قال تعالی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] بەڵێ پێویستە ئەو خوایە بپەرسترێت ، بەلام پرسیار دەبێت بزانین بۆچی بی پەرستین ..؟! دەبێت بزانین بۆچی تکایی لێ بکەین ..؟! دەبێت بزانین بۆچی بۆچی لێ دەترسین ..؟! دەبێت بزانین بۆچی هیوامان بەوەیە کە (خوای گەورە ) لێمان رازی دەبێت یان لێ مان خۆشدەبێن ..؟! دەبیت بزانی ماڵ و سامان مان دەبەخشین لە پێناوی خودا ..؟! دەبێت بزانین ئەو پەرستنەی دەکەین کە هەموو تەمەن مان تێدا صرف دەکەین لە پێ ناوی چی دایە ..؟! بەڵێ ئەو کاتە کە (خوای گەورە ) مان ناسی بە ناوە جوانەکانیەوە وەك ئەوەی کە (خوای گەورە ) بە ناوەکانیەوە بناسین بۆ نموونە بڵێن : چۆن خوا میهرە بان ..؟! یان چۆن خوا دانایە .؟! یان چۆن خوا زانایە ..؟! یان چۆن خوا بە توانایە ..؟! یان چۆن خوا بیسەرە ..؟! یان چۆن خوا بەهێزە ..؟! ئیتر جەنید سیفەتی تر کە لە (الاسماو الحسنى ) دا هەن ، کاتێیك کە ئەمانەت زانی ئیتر خوای خۆت دەناسی ئینجا دەزانی ئەم پەروەردگارە شایستەی پەرستنە قال تعالی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] بەڵێ بەدڵنیایەوە ئەگەر خوای خۆت ناسی ئەوا پەیام وئاینە کەشی دەناسی کە ئیسلامە ، چونکە ئیسلام خۆ بە دوور گرتنە لە هەموو قەدەکراوە کان کە زیان بە مرۆڤ دەگەیەنی لە ژیانی دونیاو لە دوارۆژ دا ، ئیسلام تەماع کاری ناکات لە ژیانی دونیادا هەمووشتێك بۆخۆی قورغ ناکات وەك ئەو سەردەمە زاڵم ستەم کار کار بەدەستەکان تەنها هەوا ماوە قوغی بکەن ، ئەوانیە کە (خوای گەورە ) رزق رۆزی بە هەموو بوونەوەرێك داوە لەسەر رووی زەوی ، ئیسلام راست گۆیی یە ، ئیسلام ئەمانەتە ، ئیسلام پاکیەتی یە ، ئیسلام شکۆمەندیە ، ئیسلام ئازایەتیە ، ئیسلام زانستە ، چونکە ئیسلام سیتەمیچکی زۆر توکمە و بەهێز ، لەرووی عیبادەت پەرستنی (خوای گەورە ) دا ، هەروەك لە پەرستنی دا ، رەفتاری مرۆڤ رێك دەخات ، وەرێك خستنی ئەندامەکانی لاشە ، رێك خستنی ووتەی و زمانی مرۆڤ کە بەدوو دەبێت لە هەر ووتەیە کی نەشیاو ، رێك خستنی چاوی مرۆڤ بۆ شتی حرام و گوناهو تاوان ، رێك خستنی دەستی مرۆڤ

[1] -ابن حبان في المجروحين (١٥٢/١) ليس صحيح .

لە دزی کردن و کاری خراپە ، رێك خستنی کارو کاسبی لە کار بحرام قەدەغە کراو ، رێك خستنی نفقە ی خاو خێزانە کان ، هەموو ئەمانە بنەمایی بەرزی رەوشتی مرۆڤەکانن لە هەر ئاینی و نەتەوەیەك دا بن ، بەلام هەمووی ئەمانە لە ئیسلام راستەقیە نە بەدی دەکرێت ، هەمووی ئەمانە لە پەیام قورئان فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەم بەرنامە رێبازی خوا پەرستی راستە قینە پەیرەوە دەکرێت ، بۆیە ئیسلام بۆ مرۆڤی عاقل هۆشمەند بەختەوەریە بۆ ژیانی دونیا ژیانی دوا رۆژ دا ، چونکە ئە گەر کەسێك بلێ من خوا ناپەرستم وە ئیسلام ئاینم نیە ، سەر ئەنجام و چارە نووسی ئەوەیە کە بەهەشت لی قە دەغە دەکرێت ، چونکە بەناسینی (خوای گەورە) پەرستنی ئەو زاتە ، هەروەها پەیرەو کردنی ئاینەکەی کەئیسلامە ئەوا بەختەوەری هەمیشەیی بۆ دەستە بەر دەبێت لە ژیانی دونیا لە ژیانی دوارۆژ دا سەر فراز و سەرکەوتن دەبێت بۆ هەمیشەیی لە بە هەشت دا دەبێت ..؟!

✍ لە رێ (عقلمە ) لە (عبداللە بن مسعود ) – خوا لی رازی بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ [المَائـِدَة : ١٠٥] دەلێت: لە شاری مەدینە دابەزیوە ، بەلام لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] دەلێت : لە شاری مککە دابە زیوە ..).[١]

✍ لە ری (ابن إسحاق) لە (عبد الله بن عباس) – خوا لی رازی بیت – لە سە ر ووتە ی ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ دەلێت : ئەوە ئایەتە بەسەر دوو دەستە دابەزیوە ، بەسەر بێ باوەران و دوو رووەکان ..).[٢]

✍ لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – لە سەرووتەی ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ دەلێت : ووتار یان قسە کردن بۆ ئەهلی مککە یە ،بەلام ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ووتار یان قسە کردن بۆ ئەهلی مەدینە ..).[٣]

✍ لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – لە سەرووتەی قال تعالى: ﴿ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] دەلێت : واتە : پەروەدرگا بە تاك بپەرستە ..).[٤]

✍ لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – دەلێت : هەموو ئەوانەی کە لە قورئاندا هاتووە سەبارەت بە عیبادەت یان پەرستن باسکراوە ، بە مانای یەکخواپەرستی دەکات یان (التوحيد ) ..)[٥]

[١] -اخرجه البيهقي في الدلائل النبوة (١٤٤/٧).
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم (٥٩/١).
[٣] -تفسير البغوي (٧١/١).
[٤] - اخرجه ابن جرير(٣٥٨/١).
[٥] -تفسير بغوي (٧١/١) .

✍ لە ری (مسعر ) لە (عون بن عبدالله بن عتبه ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿لَعَلَّكُمْ﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] یان (لعل ) دەڵێت : لە (خوای گەورە ) وە هات واتە لە قورئاندا هات واجبە فەرزە ..).[1]

✍ لە ری (ابن ابی نجیح ) لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لی بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ٢١﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] دەڵێت : واتە : گوێڕایەڵی کردن ..).[2]

✍ لەری (جویبر) لە (ضحاك ) – رە حمە تی خوا لی بیت – لە سە ر ووتە ی ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ٢١﴾دەڵێت : واتە : بە هۆی پێنج نوێژەكە خۆت لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزی ..).[3]

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ٢٢﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢]

﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا﴾ واتە :ئەو خوایە كە زەوی بۆ ڕاخستوون ، ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً﴾ واتە: وە ئاسمانی كردووە بە كۆشك بۆ گیراون بە گومەزی، ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ واتە: ئاوی بارانی لە ئاسمانەوە هێناوەتە خوارەوە ، ﴿فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ﴾ واتە : ئینجا دەری هێناوە بە ئاوە هەموو جۆرە میوە و بەرو بوومێك بۆ رزق رۆزیی ئیوە ، ﴿تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا﴾ واتە: كەواتە هاوتا بۆ خوا پەیدامەكەن ، ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ٢٢﴾ واتە: كە ئێوەش خۆتان دەزانن كە بێ هاوتایە ..!!

بەڵێ لە پاشان بەڵگە هێنانەوەتەوە لەسەر پێویست بوونی بەندایەتی بە تاك و تەنها ، بەوەی پەروەردگارانە كە پەروەردەی كردوون بە جۆرەها نازو نیعمەت بە دیهێناوە ، لە دوای یان لە پاش نەبوونەوە ،بە لێ هەرە ئەو زاتەیە كە هەموو شتێكی دورست كردووە بۆ پێویستیە كانی ئادەمیزاد ، هەروەك دەفەرموویت : [ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا ] ئەو خوایەی كە ئەو زەویەی بۆ ئێوە كردووە بە ڕاخەرو لەسەری جێگیر بوونە [ وَالسَّمَاءَ بِنَاءً ] وە ئەو ئاسمانەشی وەكو سەقفێكی پارێزراو بەسەر زەویەوە داناوە [ وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ ] لەو ئاسمانەیشەوە بارانتان بۆ ئەبارێنێ بەهۆی ئەو بارانەیشەوە لە زەوی جۆرەها بەروبووم و بەرهەمتان بۆ ئەڕوێنێ و بۆ دەرئەكات [ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَادًا وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ ] دەی ئێوە هیچ هاوەڵێك بۆ خوای گەورە بڕیار مەدەن لە كاتێكدا كە ئێوە ئەزانن ئەو كەسانەی كردووتانن بە شەریك بۆ خوای گەورە ئەوان ئێوەیان دروست نەكردووەو زەویان بۆ ڕانەخستوون و ئاسمانیان بۆ ڕانەگرتوون و بارانیان بۆ

[1] -لخرجه ابن ابي حاتم (١/١٠٨).
[2] - اخرجه سفيان ثوري ص٤٢،لە ری (ابن جرير ) (١/٣٨٦).
[3] -اخرجه ابن ابي حاتم (١/٦٠).

نەباراندوون و ڕووەك و بەروبوومیان لە زەوییەوە بۆ دەرنەکردوون و ئەزانن کە خوای گەورە شەریکی نیە..!! بێ گومان پێش ئادەمیزادیش دورستی کردووە بە ناز نیعمەتی ئاشکراو نهێنی و ، ئینجا ئاوی بران داوە بەسەرتان و ، زەوی راخستوون و کە لەسەر ئۆقرە بگرن ، سوود وکەلکی لێ وەردەگرن وەك مال و کشتوکال و کیلان ن گشت و گوزارو ، جگە لەمانەش جەندها جۆرە بەروبوومی بەهەمەی لێ وەردەگرن ، وە ئاسمانیشی کردۆتە بینا سەقفێك بۆ حەسانەوەتان ، سوود قازانجی زۆر تیچدا داناوە کە تێدا وەك خۆر مانگ ئەستێرەکان ، ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ واتە: بریتیە لە هەر شتێك کە لەسەرووی ئێمەوە بێت ، بەلام هەندێك لەزانایانی تەفسیر دەلێن : لەم ئایەتە دا مانای هەورە چونکە هەر لە هەوردا باران ئاو دێتە خوارەوە ..!!

مانەی هەندێك لە ووشە کان :

﴿فِرَٰشًا﴾ واتە : (الفرش : بسط ، ویقال للمفروش وفراش وجمع فراش ن فرش )واتە : پۆشاکیچك بلاو بکەیەوە ، پێ دە ووترێت (فرش) کە دەفەرمووێ :خوا زەوی بۆ کردوون بە (فراش ) و فراش ، کۆیە کەی (فرش ) ، کە دە فەرمووی زەوی بۆ کردون بە (فراش ) واتە: بۆی کردوون بە رایەخێك و بۆی راخستوون یان خود ن زەوی بۆ پان راخستوون ..!!

﴿بِنَآءً﴾ واتە: (والبناء) : اسم لما یبني بناء) واتە: ووشەی (بناء ) ناوە بۆ هەر شتێك کە بیناکەی بکەی ، وە مەبەست لێرە دا بە مانای سەقف یان سەربان دەکات ..!!

﴿أَندَادًا﴾ واتە : کۆی (ند)ە بە (ند الشيء مشاركة في جوهره ، فإن المثل یقال في أي مشاركة كانت ن فكل ند مثل ولا عكس ) واتە: (ندا)ی هەرشتێك هاوبەشیەتی لە ماهیەت و لە نێوەرۆکیدا ، بەلام (مثل ) وانیە ، (مثل ) واتە: هەندێك شتیچك پێ بچێ یان لێ نزیك بێت ، بەلام (ندا) ئەوەیە کە لە جوهرەکەیدا بەشدار بێ ، بۆیە هەموو (ند) ێك (مثل )ە بەلام هەموو (مثل ) ێك ، (ند) نیە ..!! بەلێ ﴿أَندَادًا﴾ واتە: هاوتا ، یان هاوتاکردن ، یان هاوبەشی بۆ دانانا یان شریك بۆ دانان ، کەواتە : ﴿أَندَادًا﴾ بە ناسراو هاتووە لە سیاقی نەهی هەموو جۆرەکانی هاوبەشی یان شیریك دەگرێتەوە ،

✍ لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – سە بارەت بەم ئایەتە یان ئەم ووتەیە ﴿أَندَادًا﴾ دەلێت : واتە : هاوتا ، یان شیریك یان هاوبەشی بۆ دانانە ، ئەوەش شاراوەتەوە لە تەپەی لاقی مێروستانێك لەسەر بەردێکی سافی رەش لە شەوە زنگدا ،ئەوەش ئەم چوار نموونەیە : دەگرێتەوە کە بلێت : سوێند بەخوا و ژیانی تۆ ئەی فلان ، یان سوێند بە ژیانی خۆم ، یان بلێت : ئەگەر سەگەکە نەبوایە دەزەکان دەهاتنە سەرمان ، یان ئەگەر مراویەکە لەم مالە نەبوایە دزەکان دەهاتنە سەرمان ، یان ئەوەش کە پیاوێك بە

هاوەڵەکەی بلێت : ئەگەر خوا ویستی و تۆش ویستت ، یان ووتەی پیاوێك کە دەڵێت : ئە خوا و فلان کە نەبووایە ، ئەم ووتانە هەر هەمووی شیریکن ..).[1] (شیخ صالح بن فوزان ) –خوا بیپارێزی لە دەرو بەلا- دەڵێت : (ئەم ووتانەی (ابن عباس ) باسی کردووە کەبەسەر زمانی خەلیکی دادێت هەر هەمووی شیریکن ، بەلام ئەوانە شیریکی بچووکن ، پێیان دەلێن : شیریك لەووتەدا ، ئەگەر چی بە دڵ مەبەستی نەبێت ) . هەروەها سەبارەت بە ووتنی (ماشاءالله وشئت ) دوو جۆری هەیە یان دوو حەڵەتی هەیە : ١-ئەگەر کەسە کە باوەری وابێت کەسە کە یەکسانە لە گەل (خوای گەورە ) لە ویست و بەرێوەبردندا ، ئەوا بەدلنیایەوە شیریکی گەورەی ئەنجامداوە ..؟! ٢- کەواتە ئەگەریش کەسە کە باوەری وانەبێت و مەبەستی وانەبێت ، وە باوەری وابێت کە (خوای گەورە ) لەسەر رووی هەموو شتێکە ئەوا شیریکی بچووکی ئەنجامداوە ..؟!

بەلگەی عەقلانی ولۆژیك راست و دورست ،لە سەر بوونی(خوای گەورە )بۆسەلکاندنی ئەم راستیە دورست کراوەکانیەتی ..؟!

زۆربەی زانایان ئەم ئۆمەتەی ئیسلام بەلگەیان لەسەر بوونی (خوای گەورە ) هێناوەتەوە ، چونکە هەر کەسێك بە وورد و دەقیق سەیری ئەم بوونەوەرە بکات لەسەر رووی زەوی و ئاسمانەکاندا و جیاوازی شێوە ورەنگ و سروشت و سوودەکانی و دانانی بە و شێوە پر سوود و پێتەوە ، تواناو دەسەلاتی ئەو بەدی هێنەرە کارزان و کار بەجێ یە بۆ دەر دەکەوێت بە روون ئاشکرایی و بە چاکی تێ دەفکری یان تێ دەگات لە زانیارو جوانی و وورده کاری ئەم دەسەلاتە گەورەیەیی مەزنی خوا ..؟! وەکو هەندێك لە عەرەبەکان ووتیان : پرسیار کراوە بەلگە چیە لەسە ر بوونی خوا ی گەورە ..؟! ووتیان : پاك وبێگەردی بۆ خودا : پاشەرۆی ووشتر دەبێتە بەلگە لەسەر ووشتر ..؟! جێ پێ دەبێتە بەلگە لەسەر ئەوەی کەسێك رۆیشتووە ..؟! ئەم ئاسمانە بەم هەموو خۆر زەوی مانگ ئەستێرە کانەوە، ئەم زەویە بەم هەموو رێگا پانتایی دەریاو زەریاکان و رووبارە کان شەپۆلە کانەوە ، وە چیاو دۆلە دەشتایی بیابانە کانەوە ، پرسیاۆ ئایا ئەمانە هەر هەمووی بەلگە نیێن لەسە روونی خودا یەکی کار بەجێ زانا دانا بەهێز بە توانا ..؟! .[2] بەلێ بەدلنیایەوە هەر کەسی بە ووردی تێرامابێ لە بەرزی ئەم ئاسمانە و فراوانیان و بوونی ئەو هەموو ئەستێرەیە کە هەر دانیەکی چەندجار بەقەد زەوەی خۆمانە ، وە ئەم هەموو ئەستێرەیە کە رووناکی بۆمان دەدنەوە ، ئەمانە هەر هەمووی سەرسوورهێنەرن بۆ هەرکەسێکی هۆشمەند عاقل بیرتیش ..؟! جا سەیری ئەم هەموو دەریاو زەریایەو رووبارە بکەن کە بە جەندەها بوونەوەری سەیر سەیر تێدا ژیان دەکەن ، یان ئەو کێو چیایانە جۆن جێگیر کراون بەناخی زەویدا بۆئەوەی هاوسەنگی زەوی راوەستێك ، چەندە بوونەوەر بە رەنگ شێوە جیاواز لەسەر ئەم زەویەدا ژیان دەکەن ، هەروەك قال تعالی: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ۝٢٧﴾ [فاطر : ٢٧]واتە: ئایا نەتبینیوە کە چۆن خوای پەروەردگار لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ دابەزاندن، و بەهۆیەوە ئاوی دارەختەکانی سەر زەویمان داوە، و لەوانیشەوە

[1] اخرجة ابن ابي حاتم (٦٢/١).
[2] -تفسير الرازي (٩١/٢).

جۆرەها بەروبومی ڕەنگ جیاوازمان لێدەرهێنان، لێیان هەیە سورە و هەشیانە ڕەشە وجگە لەوەشی تێدایە ؟ وە لە شاخەکانیشدا چەندەها جۆر ڕێگەی سپی و سورمان دروستکردووە، کە ڕەنگیان جیاوازە لەیەکتر، و هەندێکیشمان بە ڕەشێکی زۆر ڕەش دروست کردووە ...!! یان دە فە رمووی : قال تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾﴾ [فاطر : ٢٨]واتە: وە بەهەمان شێوە جۆرەها شتی ڕەنگ جیاوازمان دروستکردووە لە خەڵك و ئاژەڵ و وشتر و مانگا و مەڕوماڵات، لەوانەش سور و سپی و ڕەش و جگە لەوانیش وەکو جیاوازی ڕەنگی بەروبوم و شاخەکان . بێگومان تەنها ئەوانە لە خوا دەترسن و خۆ دەپارێزن بەگوێڕایەڵیکردنی ودوورکەوتنەوە لەسەرپێچیکردنی کە زانان بە خوای پەروەردگار و سیفەتەکانی و شەریعەتەکەی، و توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا، لەوانەش جۆراوجۆری ئەم دروستکراوانە لەگەڵ یەك هۆکاریان، وە ورد دەبنەوە لەو پەند وئامۆژگاریانەی کە تێیاندایە . بێگومان خوای پەروەردگار بەدەسەڵات و بەتوانایە وکەس بەسەریدا زاڵ نابێت و سەرناکەوێت، و لێخۆشبوە و پاداشتی گوێڕایەڵیکارنی دەداتەوە، و لێیان دەبورێت ..!!

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾﴾ [البقرة : ٢٢]واتە: کە زەوی بۆ ئێوە کردووە بە ڕایەخ یان فرش وای ڕاختستووە و ئاسمانی کردووە بە سەقفێك یان سەربانێك بۆتان و ، هەر لەسەرەوەدا باران تان بۆ دەبارێنی یان ئاو تان بۆ دێتە خوارەوە ، ئینجا بە ئاوە هەموو بەرووبوومێکی کوشتوکاڵ سەروشتی ژیان سەوز دەکات ، بۆ ئەوەی رزق ڕۆزی لێوە بۆ هەموو بوونەوەرێك دەست کەوێت ، یان رزق ڕۆزی لە م ئاو بارانەی دێتە خوارەوە دەربهێنیت ، بۆیە ئەم مانە هەر خۆی (خوای گەورە ) بە تەنها کردوویەتی هیچ هاوبەشی یان هاوتای نیە، لەدروست کردندا ، کەواتە: پێویستە لەسەر هەموو ئادەمیزادێك هیچ هاوتا هابەش بۆ بریارنەدەن ،هەر لە گەل ئەوەشدا ئێوە خۆتان زۆر چاك دەزانن کە هاوتاو هاوبەش شیریك دانان بۆ زاتی (خوای گەورە ) شتێکی بیهوودەو بێ سوودە ، چونکە هێچ سووتان پی ناگات ..؟! بەلێ ئەگەر سەرنج بدەین ووشەی ﴿لَكُمُ﴾ دەبینین کە ووتارە یان خطابە یان قسە یەکە بۆ خەلکی بە گشتی واتە: هەموو خەلکی دەگرێتەوە بە ئیماندار و بێ ئیمان یان بە موسلمان و کافرو مولحید و موناڤیق ، هیندۆسی و بووزایی یهوود نصرانی هەموو ئاینەکان یان هەموو بوونەوەرێك دەگرێتەوە بێ جیاوازی ئاین و رەنگ رووخسارو باش خراپ بە موسلمان و غیری موسلمانیش دەگرێتەوە ، بەلام فەزلی (خوای گەورە ) بۆ ئیمانداران لە ئاخیرەت واتە: لەرۆژی دوایەوەیە ، کەچی فەزلی کافرو بێ باوەر لە دونیا دایە ..؟! جا لەبەر ووتەی ﴿لَكُمُ﴾ جا ئەم بانگە وازە گشتیە و قورئان داوای لە تەواوی مرۆڤ کردووە کە روو بکەن ئاینی ئیسلام ، کەواتە ئەوانەی بانگەوازی ئیسلام دەکەن یان داعی یان با بزانن ئیسلام تەنها بۆ کۆمەلێکی تایبەت نیە ، بەلکو بۆ هەموو خەلکی جیهانە ،چونکە ئەم بانگەوازی دەبێت بە گوێی هەموو خەلکی جیهان دا بچێت تبلیغ کرێت ، تاکو ببێتە حجە لەسەر هەموو خەلکی دا ، چونکە ئەوەی کە ئەم بانگەوازیەی پێ نەگان نابێتە حجە لەسەری ، هەر بۆیە کە باسمان کرد بوونی (خوای گەورە ) لە دورستکراوەکانی بەدی دەکرێت ، چونکە هیچ کەسێك لە ئادەمیزاد توانا و دەسەلاتی ئەم هەموو بوونەوەرو زەوی وئاسمان ژیانەوەی درخت گیاو سەوزایی نیە یان ئەو هەموو پێداویستە کە بۆ مرۆڤەکانی بێ جیاواز فەراهەم

هێناوە هەروەك دەفەرموویێت قال تعالى: ﴿وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ۝٨﴾ [النَّحل : ٨]واتە: وە ئەسپ و قاتر و گوێدرێژی بۆتان دروستکردووە تاکو سواریان ببن، وە دەبنە جوانی و دیمەنی دڵفرێن بۆتان، وە هەروەها هۆکار گەلێکی تر بۆ سواربوون کە هیچ زانیارییەکتان لەسەریان نیە، بۆ ئەوەی باوەڕ و سوپاسگوزاریتان زیاتر بێت ..!!

هەروەها دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلۡأَخۡضَرِ نَارٗا فَإِذَآ أَنتُم مِّنۡهُ تُوقِدُونَ ۝٨٠﴾ [يس : ٨٠]

واتە: ئەو زاتەی کە لە دار و دەرەختی سەوز و تەڕ ئاگری سوتێنەری دەرهێناوە، و ئیتر ئێوە لە دار ئاگر دەکەنەوە، هەر ئەو زاتەیە کە بەتوانایە دژ لە دژەکەی دەربهێنێت، و لەوەشدا بەڵگەی تەنهایی خوا و تەواوێتی توانای دەردەکەوێت، و هەر لەوانەشە کە مردووەکان بە زیندووی لە گۆڕەکانیان دێنێتە دەرەوە ..!!

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢] واتە: حقیقەتی فراش یان رایەخ واتە : ئاسوودیی لەسەری کەواتە ئاسوودەیەك هەموو شتێك تێدا فەراهەم بێت ، وەك پاك وخاوێنی رایەخ یان فراش ، یان نەرم مورتاح بوون بۆ ئەوەی بگونجی لە گەل لاشە جسمی خۆت دا ، بۆ نموون مرۆڤێك لە نزیك ترین شوێن دەخەوێن لە سەر رایەخێك دایان فارشێك دا ، دەبێت گونجاو بێت لە گەلی دا ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) زەوی بۆمانی راخستووە ، بۆئەوەی تێدا ئاسوودە بژین ، ناکرێت سەرتاپە ی زەوەی تەخت بوایە ، یان پر لە کۆسپ و تەگەرە بوایە ..؟! ئەگەر شوێنیك بۆ حەوانەوە ئاسوودەیی خۆمان دەرست بکە ین لە دامێنی چیایەك یان شاخێك دەبێت بە کەرستانەی لە بەردەستمان دایە ئەو پارە مال سامنەی هەمان بۆ ئەوەی تێدا شوێنە دا بژین ، بێ گومان دەبێت بە میلونان دۆلار تێدا سەرف بکەن تەنانەت مادوو بوونێکی زۆریشی دەوێت وە کاتێکی زۆریش دەبات ، بۆ ئەوی شوێنیك تەخت بکەین مالێك تێدا دروست بکەی ، ئەی بۆ مرۆڤ ئەو نیعمەتەی (خوای گەورە ) نابینی کە زەوی بۆی تەخت کراوە وە رایەخ فرش رایخستووە ، ئوانیش بە جوان ترین شێوە مال و خاان بینایی جوان فیلای تێدا دورست دەکەن ، ئەمە یەکێکە لە نیعمەتە کانی (خوای گەورە ) ئەگەر زەوی تەخت نەبوایە بیری لیّ بکەوە چی دە بوو..؟! وە ئەگەر زەوی هەمووی بەردی رەق بوایە ..؟! ئەو کاتە مال دروست کردن و کوشتوکال زەحمەت دەبوو ..؟! ئەی بۆ بیر ناکەیتەوە کە زەوی خاك خۆلی تێدایە ..؟! بۆ کشتوکل مال دروست کردن رێگاو بان ئاسان دروست کردن دەکرێت ..؟! هەروەها هێزی کێش کردنی تۆی جێگیر کردووە بە چیاو دۆل و ئاو کانزاکانی ژێر زەوەی دا ..؟! بێ گومان ئەو کەرەستانەی کە لەسەر ئەم زەویە دا زۆرن جۆراو جۆرن هەریەکیەیان تایبەت مەندیی سوودی خۆی هەیە ، ئەگەر هەموو زەوی رەق بوایە ..؟! یان ئەگەر هەموو زەوی شل بوایە ..؟! یان هە موو زەوەی غاز بوایە ..؟! بیر لیّ بکەوە تێرمانە ئەی هۆشمەند لە دورست کراوە کانی (خوای گەورە ) دەفەرموویێت قال تعالى: ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢] واتە: کردوویەتی بە فرش رایەخ بۆ ئەوەی کە تێدا بە ئاسوودەی بژین بۆ جیجگیر کردن و بەردەوام بوون لە ژیاندا ،ئەگەر

لە ماڵە کەت ئاو نەبێت بۆ ژیان ..؟! ئەگەر لە ماڵەکەت هیچ گەرم کەرەوەیەك نەبێت بۆ زستان لە ساردی ..؟! ئەگەر لە ماڵەکەت هیچ فێنك کەرەوەیەك نەبێت لە هاویندا ..؟! ئەگەر لە ماڵەکەت هیچ دۆشەکێك یان رایەخێك و فراشێك نەبێت چۆن دە خەوێت لە سەر زەویدا ..؟! بەڵام ئەگەر هەموو ئەو پێداویسانە هەبوون لە نێو ماڵەکەت ئەوا ئەو ماڵە تێدا ئاسوودەی بەدی دەکرێت و جیگیر دەبێت و بەردەوام بۆ ژیان تێدا ، هەر بۆیە ئەمەیە ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا﴾واتە: لە زەویدا هەوا هەیە ، چونکە هەوا هاوسنگی تێدایە لە زەوی دا ، ئەگەر تەنها ئوکسجین بێت لە زەویدا، ئەوا هەوای بەرزە هەمووشتێك دەسووتێت ..؟! ئەگەر ئاستی غازی خەلوز زۆر بوایە ئەوا ئاگرە کە بەهیچ شێوەیەك دا نەدەگیرسا ..؟!

بەڵێ ئەگەر شەو سەد سەعات بوایە ..؟! بەرگەی ئەو ژیانەت دەگرت ..؟! بخەوت بای هەڵسا بایەوە بخەوت بای هەڵسا بایەوە ..؟! توانای نووستن هەشت سەعاتە ، بەڵام ئەگەر سەد سەعات بوایە ..؟! چونکە ئەو کات خەڵکی کار کاسب یان دەکرد بەشە و، کە چی (خوای گەورە ) کە چەندە زاناو دانا کار بەجێ یە شەو رۆژی کردووە بە بیست چوار سەعات، شەودوانزە سەعات رۆژیش دوانزە سەعات ، کە دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾﴾ [النَّمل : ٦١] واتە: ئایا پەرستنی ئەوانەی کە دەیکەنە هاوبەش بۆ پەروەردگارتان باشتر وچاکترە یاخود پەرستنی ئەو خوایەی کەزەوی ئارام و ڕامکردووە بۆتان ولە نێوەندیشیدا ئاوی دەریا و ڕووبارەکانی بەدیهێناوە، و چیا بەرز و زەبەلاحەکانیشی کردۆتە هۆی ڕاگیرکردنی و وەستاندنی، و لە نێوان ئەو دوو دەریایەدا کەیەکێکیان سوێر و ئەوی تریان شیرینە لەمپەر و بەربەستێکی داناوە بۆ ئەوەی تێکەڵ بەیەکترنەبن ؟ ئایا پەرستراوێکی تری جگە لەخوا بەم کارانە هەستاوە تاکو بیکەن بەهاوبەش لەپەرستندا ؟ بەڵکو زۆربەی ئەو هاوبەش پەیداکەرانە ئەندازەی گەورەیی و بڵندی خوا نازانن، بۆیە هاوبەشی بۆ ڕەوادەدەن وەکو لاسایی کردنەوە و ستەم کردنێك ..!! هەروەها دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً﴾ [البَقَرَة : ٢٢] واتە : سیستەمێکی کێش کردنە لە نێوان هەسارەکان دا یان ئەستێرە کاندا ، خۆ ئەگەر جوولەی ئەستێرە کان لە رێرەوەی خۆیدا خراو نەبوایە ، ئەوا گەردوون دەبووە یە بارستە ..؟!چونکە لەگەڵ ئەم خولانەوەیە گونجاوە بۆ خێرایی هێزی کێش کردن ئەستێرەکانی تر ، لەرووی میکانیکی هاوسەنگی جوولەوە هەر هەمووی جوولە ی خۆی دەکات هاوسەنگی هەیە ، بۆیە بنایەکی گەورە یە بۆ سەر زەوەی هەروەك دفەرمووێت قال تعالى: ﴿وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ﴾ [الزُّمَر : ٦٧]واتە : وە هەر حەوت ئاسمانەکە لوول ئەکات و لەناو دەستی ڕاستی خوای گەورەدایە، پێغەمبەری خوا -صلى الله علیه وسلم - دەفەرمێت: (لەرۆژی قیامەت خوای گەورە زەوی دەخاتە ناو دەستییەوەو ئاسمانەکان لوول دەکات بە دەستەکەی

تری پاشان دەفەرمێت: تەنها من مەلیکم، کوا مەلیك و پاشاکانی دونیا)، کە ئەمیش جێگیر کردنی سیفاتی دەست و مشت و پەنجەیە بۆ خوای گەورە بە شێوەیەك کە لە دەست و مشت و پەنجەی هیچ لە دروستکراوەکان ناچێت وە چۆنیەتیەکەیشی خوای گەورە خۆی نەبێت کەسی تر نایزانێت، دەبێت وەکو خۆی باوەڕمان پێی هەبێت چونکە ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەری خوایە -صلی الله علیه وسلم- بە بێ گۆڕینی ماناکەی بۆ مانایەکی تر، وە بەبێ نکوڵی کردن لێی و چواندنی بە سیفاتی دروستکراوەکانی و پرسیار کردن لە چۆنێتیەکەی..!! کەواتە ئەگەر ئەستێرەکان جوولە هاوسەنگی خۆیان نەبێت ڕێرەوەی خۆیان نەبێت ئەوا بەدلیایەوە ئێستا ئێمە لە ناو دەچووێن ئاسمانیش نەد بووە بە سەربان یان سەقف بومان بۆ پاراستنی زەویە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت: قال تعالی: ﴿جَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗا﴾ [ٱلۡأَنبِيَاء : ٣٢] واتە : وە ئاسمانیشمان داناوە بە سەقفێکی پارێزراو کە ناکەوێتە سەر زەوی، یاخود پارێزراوە بە ئەستێرەکان لە بەرز بوونەوەی شەیتان..!!

هەروەها دەفەرمووێت قال تعالی: ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢] واتە: بێ گومان ئەو حیکمەت نیعمەتێکی (خوای گەورە ) یە کە رزق و رۆزی بەدێهیانەوە بۆ هەموو بوونەوەرێك لە ڕێگای دابەزینی ئاو لە ئاسمان دا ، یان وەك باران بارین ، بەدلنیایەوە ئەو یەکێك لە نشانە موعجیزە هەر گەورە کانی (خوای گەورە ) چونکە لە ئاو سەر چاوەی هەموو شتێکە ، قال تعالی: ﴿وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ٣٠﴾ [ٱلۡأَنبِيَاء : ٣٠] واتە: وە لە ئاویش هەموو شتێکمان زیندوو کردووەو دروست کردووە وەکو ئاژەڵەکان و ڕووەکەکان، وە ئاو هۆکاری ژیانی هەموو زیندەوەرێکە [ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ (٣٠) ] ئەی ئیتر بۆ ئیمان ناهێنن بە خوای گەورە..!! پرسیارێك ئایا ئەم دەریا و زەریا یانە لە کوێ هاتوونە ..؟! لە روانگەیەکی زانستی لە ئەورپادا کەتیشکیك بەکاردهێنن بۆ دیار کردنی ئەستێرە کان لەسە رووی بنەوشەی لەیەك هەوری گەردنووی لە هەزاران هەوری دا کە دەتوانێت ئەم کارە ئەنجام بدات ،بۆ پرکردنەوەی دەریاکان شەست جار بە ئاوی شیرین ، ئەم وەلامە بۆ ئەو کەسانەی کە دەڵێن : رزق رۆزیمان دیار کراوە ، یان بلێت : قەیرانی ئاو دەبێت لە سەر رووی زەوەی ..؟! ئەوا بەدلنیایەوە وەلامەکەی لە قورئان دەست دەکەوێت ، کە دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ٥٨﴾ [الذَّارِيَات : ٥٨] واتە : بێگومان تەنها خوای پەروەردگارە ڕۆزیدەری تەواوی دروستکراوەکانی، وپێدەری بژێویانە، و خاوەن هێز و توانایە و پتەویشە، بەشێوەیەك کە هەرگیز کەس ناتوانێت زاڵبێت بەسەریدا، و بەسەریدا سەرکەوێت، بۆیە هەموو توانا و هێزێك هەر بۆ ئەوە و هی خۆیەتی ..!! هەرەوها دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿۞وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٖ مَّا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرُۢ بَصِيرٞ ٢٧﴾ [ٱلشُّورَى : ٢٧] واتە : وە ئەگەر خوا ڕزق و ڕۆزی فراوان برِژێت بەسەر بەندەکانیدا، ئەوا دەستدرێژی و خراپەکاری لەسەر زەویدا دەکەن و لووت بەرز دەبن و ستەم لەیەکتر دەکەن، بەڵام خوای کاردروست ڕزق و ڕۆزیان بەئەندازەی پێویستی خۆیان بۆ دادەبەزێنێت . بەڕاستی خوا بەئاگا و زانایە بەوەی بەندەکانی پێ چاك دەبێت، و بینەریشە بۆ بەڕێوەبردنیان و حاڵ وگوزەرانیان ...!! ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین لە ٧١٪ ڕێژەی ئاو لە زەوەی دا پێك

دەهێنیت کەواتە لە ٢٩٪ ڕێژەی ووشکانیە ، هەروەها لە ووشکانیش هەرێم هەیە هەموو سەوزە هەرێم هەیە هەرمووی چیاو دۆلە ، هەرێم هەیە هەمووی بیابانە ، ئەم بیابانەش زۆر گەرم وشە هیچ رووکی زۆر کەم بەلام حیکمەتی بیابان ئەوەیە کە هەوا یەکی زۆر پاك بێگەردی هەیە ، هەرێمیش هەیە زۆر ساردە و جامدو سەهۆل بەندانە هەواوی زۆر سارد توندی تێدایە هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾﴾ [النَّبَإِ : ١٤] واتە : وە لە هەورەکانەوە ئاوێکتان بۆ دائەبەزێنین کە ئەو ئاوە زۆر بەلێزمەو بەخوڕ دێتە خوارەوە بەردەوام..!! هەر بۆیە هەموو شتێك لەم گەردوونەدا مسخر کراوە بۆ مرۆڤ بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بزانێت و دڵ خۆش بێت پی سوود و قازانجی بۆ هەبێت ، هەروەها ئەم هەموو شتە ی کە بۆ مرۆڤە کان مسخر کراوە ، بۆ ئەوەی لە دواجار خوای خۆی بناسێ ، وە پەروەردگای خۆی بپەرستێت ، بە راست و دروستی کە (خوای گەورە ) فەرمانی پێ کردووە جۆن خواپرستی بۆ بکات بە بەلگەی قورئان فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها فەرمانەکان ئەنجام بدات ، دووریش کەوێتەوە لە قەدەغە کراوەکان ، واتە : خوا پەرستیەکی پاك بێگەر ، دوور لە بیدعە بیدعەکاری ..؟!

✍ لە رێ (السدی) لە (ابی مالك وابی صالح ) لە(عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – لەسەر ووتەی : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢] دەلێت: ئەوە رایەخە یان فرشە بۆ ئەوەی لەسەری برۆین ، وە ئەو زەویەی وەك شوێنگە یان قرارگەیەکە جێگیر کراوە ..).[1]

✍ لە ری (الربیع بن أنس ) لە (ابی العالیە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا﴾ دەلێت: (مهاد ) واتە: شوێنگە یان قرارگە ..).[2]

✍ لە ری (سعید) لە (قتادة )- رە حمە تی خوای لی بیت - لە سە ر ووتە ی ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا﴾دەلێت : (مهادا) واتە: شوێنگەی ئێوە ..).[3]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) –رە حمە تی خوای لی بیت- لە سە رووتە ی ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا﴾ دەلێت : (بساطا) واتە: زەوی بۆ راخستون یان زەوی بۆ فرش کردوون ..).[4]

---
[1] -اخرجە ابن جریر (٣٨٨/١).
[2] -اخرجە ابن ابي حاتم (٦٠/١)
[3] -اخرجە ابن جریر (٣٨٨/١).
[4] -تفسیر مقاتل بن سلیمان (٩٣/١)

✍ لە ڕێ (السدی) لە (ابی مالك وابی صالح ) لە(عبداللە بن عباس ) – خوا لێی ڕازی بێت – لەسەر ووتەی : قال تعالى: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢] دەڵێت : ئاسمان لەسەر زەویدا وەك قبە یەك دروست كراوە ، وە ئەوەش سەقفێكە لەسەر زەویدا..).[١]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) –رە حمە تی خوای لی بیت- لە سە رووتە ی ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً﴾دەڵێت : واتە سەقف یان سەر بان..).[٢]

✍ لە ری (سعید) لە (قتادة )- رە حمە تی خوای لی بیت - لە سە ر ووتە ی ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً﴾دەڵێت: واتە سەقف یان سەر بان..).[٣]



📖 لە (جبیر بن مطعم ) – خوا لی رازي بیت – دەگێڕێتەوە دەڵێت : ((أتى رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ أعرابيٌّ، فقال: يا رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، جَهِدَتِ الأنفُسُ، وضاعتِ العِيالُ، ونُهِكَتِ الأموالُ، وهَلَكَتِ الأنعامُ، فاسْتَسْقِ اللهَ عزَّ وجلَّ لنا؛ فإنَّا نَستَشفِعُ بكَ على اللهِ، ونَستَشفِعُ باللهِ عليكَ، قال رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم: وَيْحَكَ! أتَدْري ما تقولُ؟ وسبَّحَ رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فما زالَ يُسبِّحُ حتى عُرِفَ ذلك في وُجوهِ أصحابِه، ثُمَّ قال: وَيْحَكَ! إنَّه لا يُستشفَعُ باللهِ على أحَدٍ من خَلقِه، شأنُ اللهِ أعظَمُ من ذلك، وَيْحَكَ! أتَدْري ما اللهُ، إنَّ عَرشَه على سَمَواتِه لهكذا -وقال بإصبَعِه مثلَ القُبَّةِ عليه- وأنَّه ليَئِطُّ به أطيطَ الرَّحْلِ بالرَّاكِبِ، قال ابنُ بشَّارٍ في حديثِه: إنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ فوقَ عَرشِه، وعَرشُه فوقَ سَمَواتِه، وساقَ الحديثَ)).[٤]

واتە: عە رە بێكی دەشتەكی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەلكەكە كەوتونەتە زەحمەت و نارەحەتیەوە ،خاو خیچزان و مندالان فەوتان و تیاچوون ، مال و سامان كەمی كردو بەرەو نەمان دەچێت ، ئاژەل و مالات فەوتان و لە ناو چوون ، دوابكە لە (خوای گەورە ) بارانمان بۆ ببارێنی ،ئێمە تۆ دەكەینە تكا كار لای (خوای گەورە) هەروەها (خوای گەورەش ) دەكەینە تكا كار لە لای تۆ ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (وەیل بۆ تۆ ..!! ئەوە تۆ ئەزانی دەڵێ چی ..؟!

[١] -اخرجه ابن جرير(٣٨٩/١).
[٢] - تفسير مقاتل بن سليمان (٩٣/١)
[٣] -اخرجه ابن ابي حاتم (٦١/١) .
[٤] - سنن أبي داود برقم (٤٧٢٦).

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە (سبحان الله ) ی کرد هەتا هاوەڵە کانی زانیان کە تووڕە بووە لە قسەی کابرای دەشتەکی بۆیە ئەوانیش ترسان بەروخسارياندا دەزانرا ، لە پاشاندا ، فەرمووی : (وەیل بۆ تۆ ..!! خوای گەورە زۆر زۆر لەوە گەورە ترە پێویستی بە یەکێ لە دروستکراوەکانی بێت )، (وەیل بۆ تۆ ..!! تۆ ئەزانی (خوای گەورە ) عەرشەکەی لە سەرووی ئاسمانەکانەوەیە ئەویش لە سەر عەۆش بەم شێوەیە ) . بەدەستی ئاماژەی پێدا وەك: ( قوبەیەك) ، عەرش دەنگی لێوە دێت ، (رحل ) ئەو تەختەیە بە سەر پشتی و لاخەوە سوار لە سەری دادەنیشێ ئەگەر سوارە کە قورس بێت دەنگی لێوە دێت ، ئەمە وێکچواندنە بەلام بۆ ئەوەی دشتەکیە کە تێ بگات ، ئەمەی فەرموو: بێ گومان فەرموودەکەش لاوازە (خوای گەورەش خۆی باش دەیزانێ ) ئیبن بەشار لە فەرموودەکەیدا ووتی : (خوای گەورە لە سەر عەرشە ، عەرشیش لە سەروی ئاسمانە کانەوەیە ..)

✍ لە (القاسم بن ابی بزە )- رەحمەتی خوای لی بیت- دەڵێت : ئاسمان چوار کۆشە نیە ، بەڵکو لە شێوەی (قبا) وایە ، خەلکی بە سەوزی دەی بینن ..).[1]

✍ لە (مقاتل بن سليمان )- رەحمەتی خوای لی بیت - لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢] دەڵێت : واتە:( باران )، قال تعالى: ﴿فَأَخۡرَجَ بِهِۦ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢] واتە: باران دەهێنرێتە خوارەوە بۆ سەر زەوەی جۆرەها مێوە یان رزق بەر هەم و بەربوو بوو دە رووێت قال تعالى: ﴿رِزۡقًا لَّكُمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢] ..).[2]

📖 لە (المطلب بن حنطب ) – خوا لی رازی بیت – دەگێڕیتەوە دەڵێت : (( أن النبی ﷺ قال: ( ما من ساعة من اليل ولا نهار إلا والسماء تمطير فيها ، يصرفه الله حيث يشاء ).[3] واتە : ساعە تێکی شەو رۆژ نیە کە لە ئاسمان باران نەبارێت ، (خوای گەورە ) بۆ هەر شوێنیك بیەوێت ئاراستەی دەکات ..) . مەبەست لە فەرموودەیە ئەوەی ، کەواتە : سەعاتێك نیە لە سەر زەوەی بارانی تێدا نەبارێت ، واتە : باران دەبارێت جا لە هە رشوێنیك بێت لەسەر زەوەی دا ..؟!

✍ لە ری (عمران بن القطان ) لە (الحسن البصري ) – رەحمەتی خوای لی بیت – پرسیار کرا ، ئایا باران لە ئاسمانەوە یە یان لە هەورە وەیە ..؟! دەڵێت : لە ئاسمانەوەیە ، بەلام هەورە کان نیشانەیە یان ئاماژەیە ، هەروەها ئاو لە ئاسمانەوە دەێتە خوارەوە ..).[4]

---

[1] -عزاه السيوطي الى ابن ابي حاتم .
[2] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٣/١).
[3] -اخرجه الشافعي كما في مسنده (٨٢/١).
[4] -اخرجه ابن ابي الدنيا في كتابه المطر ص ٥٤-٥٤ .

✍ لە ریٚ (السدی) لە (ابی مالك وابی صالح ) لە(عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – لەسەر ووتەی : قال تعالى: ﴿فَلَا تَجْعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢] دەلێت : واتە : هاوتا بوونی پیاوە ، کە لە حرام کراوە کان یان خراپە کاریە کان کە (خوای گەورە ) حرامی کردووە ، گوێڕایەلی ئەوان دەبی ..).[1]

✍ لە ریٚ لە (ابی اسحاق بسندە) لە(عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – دەلێت : ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بە سەر دوو دەستە دا ، کە ئەوانی لە بیٚ باوەران و دووروەکان یان مونافیقە کان ، بەلام دەربارەی ئەم ووتەیە کە (خوای گەورە ) دەفەرمووی : قال تعالى: ﴿فَلَا تَجْعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢] واتە: شیرك هابەشب بریار نەدەن بۆ (خوای گەورە ) کە هیچ هاوتایە ك دانەنێن بۆ (خوای گەورە ) چونکە نە سووتان پیٚ دەگات نە زیان تان پیٚ دەگات ..).[2]

✍ لە ریٚ لە (ابی روق ) لە ( ضحاك ) لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – لە سەر ووتەی : قال تعالى: ﴿أَندَادًا﴾ واتە: (اشباە ) واتە : چواندن ، یان هاوتا بوون ..).[3]



✍ لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – سە بارەت بەم ئایەتە یان ئەم ووتەیە ﴿أَندَادًا﴾ دەلێت : واتە : هاوتا ، یان شیریك یان هاوبەشی بۆ دانانە ، ئەوەش شاراوەتەوە لە تەپەی لاقی مێروستانێك لەسەر بەردێکی سافی رەش لە شەوە زنگدا ،ئەوەش ئەم چوار نموونەیە : دەگرێتەوە کە بلێت : سوێند بەخوا و ژیانی تۆ ئەی فلان ، یان سوێند بە ژیانی خۆم ، یان بلێت : ئەگەر سەگەکە نەبوایە دەزەکان دەهاتنە سەرمان ، یان ئەگەر مراویەکە لەم مالە نەبوایە دزەکان دەهاتنە سەرمان ، یان ئەوەش کە پیاوێك بە هاوەلەکەی بلێت : ئەگەر خوا ویستی و تۆش ویستت ، یان ووتەی پیاوێك کە دەلێت : ئە خوا و فلان کە نەبووایە ، ئەم ووتانە هەر هەمووی شیریکن ..).[4]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان )- رەحمەتی خوای لی بیت - لەسەر ووتەیقال تعالى: ﴿فَلَا تَجْعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا﴾ دەلێت : لە گەل (خوای گەورە ) هیچ شیرك هاوبەشێك دورست مەکە ..؟! ).[5]

📖 لە (عون بن عبداللە ) – خوا لی رازی بیت – دەگیرێتەوە دەلێت: شەوێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو لە شاری مەدینە ، گوێی لە بانگ دەریچك بوو ن بانگی دا بۆ نوێژی بەیانی ، ووتی : ( اللە أکبر ، اللە أکبر ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەمە لەسەر (الفطرة) و سروشتی ئیسلامە، فەرمووی : ( أشهد أن لا إله إلا الله ) فەرمووی: (خلع الانداد ) .[6]

---

[1] -اخرجه ابن جرير(٣٩١/١).
[2] -سيرة ابن هشام (٥٣٣/١).
[3] -اخرجه ابن ابي حاتم (٦٢/١).
[4] اخرجة ابن ابي حاتم (٦٢/١).
[5] - تفسير مقاتل بن سليمان (٩٣/١).
[6] - اخرجه البزار (١٥٤/١٠).

✍ لە ڕیٚ (ابن اسحاق ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت – لە سەر ووتەی : قال تعالی: ﴿وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٢٢﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢] دەڵێت : واتە : هیچ پەروەردگارێك نەیە جگە لە زاتی (اللّه ) کە رزق ڕۆزی تان پیٚ ببەخشیٚ ، وە زۆر چاك دە زانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگتان دەکات بۆ (توحید) ئەوەش حەق ڕاست و دروستە هیچ گومان شەك لە خۆ هەڵناگرێت ..).[1]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتە ی ﴿وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٢٢﴾ دەڵێت : واتە : ئەمە ئەوەی کە باسکراوە لایەن زاتی (اللّه ) دورست کراوە ، چۆن جگە لە زاتی (اللّه ) شتێکی تر دەپەرستن ..؟! ..).[2]

قال تعالی: ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٣﴾ [البَقَرَةِ : ٢٣]

﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ﴾ واتە: ئە گەر ئێوە گومانێك تان هەیە ..؟!، ﴿مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا﴾ واتە: لەم قورئانە یان لەم کتێبە ، کە ئێمە ناردوومانە تە خوارەوە بۆ بەندەی خۆمان (ﷺ) ..!!، ﴿فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ﴾ واتە: سورەتێك بێنن بە وێنەی ئەو ..؟!، ﴿وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ واتە: بانگی هاوکارەکانتان بکەن ( لە ڕەوان بێژان و شاعیرە کانتان ) بیٚ جگە لە خوا..؟! ، ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٣﴾ واتە: ئەگەر ڕاست دەکەن بە کلامی یان فەرموودەی خوای نازانن ..؟! بەڵیٚ ئەگەر ئێوە ئەی کافرە کان ..؟! ئەی موشریکان ..؟! ئەی موڵحیدەکان ..؟! ئەی مونافیقە کان ..؟! ئەی جوولەکەو گاورەکان ..؟! ئەی علمانیە کان ..؟! ئەی هاورەگەز بازان ..؟! ئەی بەناو ڕێخراوەکانی مافی مرۆڤ ..؟! ئەی زانایان کافران و موشریکان موڵحیدەکان ..؟! ئەی گرۆی ئادەمیزاد ..؟! گومان لەم کتێبە یان لەم قورئانە دەگەن ، وە یان لە گوماندان لەم کتێبە یان لەم قورئانە ..!! کە بۆ سەر بەندەی خوا (ﷺ) ناردوو مانەتە خوارەوە ، وە پێتان وایە کە کلامی خوا نیە ..!! جا ئێمە تەحداتان دەکەین ئێوەش وەرنە پێشەوە یەك سورەتێك بهێنن بە ئەندازەی سورەتی ئەم کتێبە یان ئەم قورئانە ..؟! یان وەك کورترین سورەتە (٣) ئایەتە کە سورەتی

[1] -سیرة ابن هشام (٥٣٣/١).
[2] - تفسیر مقاتل بن سلیمان (٩٣/١).

(الكوثر) كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَـٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ۝١ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ۝٣﴾ [الكَوْثَر : ١ - ٣] ، بەلێ كورت ترین سورەتە بێنن جگە لە خودا ، هەر كەستان بۆ ئامادە بێت بانگی بكەن ، لە (روان بێژان و شاعیرەكانتان ) با یارمەتیتان بدات ئە گەر راست دەكەن ..؟! هەروەها (خوای گەورە ) لە شوێنێكی تریش تەحدای كافران و موشریكان و مولحیدەكان دەكات ، دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿قُلْ فَأْتُوا۟ بِكِتَـٰبٍ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَآ أَتَّبِعْهُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ۝٤٩﴾ [القَصَص : ٤٩] واتە: جا ئێوە گومان تان هەیە هەر دوو دلن ، لە راستی و دروستی ئەم قورئانەی كە ناردوومانە بۆ بەندەی خۆمان ﷺ ، دە ئێوەش هەو لە كانتان بخەنە گەر و كۆشش بكەن وێنەی سورەتێكی قورئان دارێژن ..؟! كە سورەتێكی وەكو (الكوثر ) یان (النصر ) بێنن ..؟! هەرچی هاورێ هاوپەیمانیشتان و هاوكاریشتان هەیە جگە لە سوود وەرگرتن لە ئایەتەكانی قورئانی پەروەردگار ، پشتی پی ببەستن ، ئەگەر ئێوە راست دەكەن لە گومان و دوو دلیە تاندا، ئەم تەحدایە بەردەوام دەبێت تارۆژی دوای ..!!

بێ گومان (خوای گەورە ) تەحتدای مرۆڤ و جنۆكەش دەكات كە دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ۝٨٨﴾ [الإِسْرَاء : ٨٨] واتە : ئەی ﷺ بە خەلكە بلێ : ئەگەر سەرجەم مرۆڤە كان لەگەل هەموو جنۆكە كانیش دا، وە لە هەموو زمان سەردەمێكیش دا كۆببنەوە ، هەر هەمووشیان شهادەی بەرزیان هەبێت لە دكتورا و پرۆفیسۆریش ، وە زانای پرۆفیسۆر بن لە زمانی عەرەبی دا ، هەولبدن قورئانێكی وێنەی ئەم قورئانە دارێژن لە رووی زمانەوانی و زانستی و ، هەر گیز ناتوانن كاری وا ئەنجام بدەن و لەوێنەی ئەو قورئانە دارێژن ، بۆ هەمیشە و بەردەوامیش تا رۆژی قیامەت ، كە س هیچی بۆ نەكراوە ، لەبەر ئەوە ناچار بە شێوازی جۆراوجۆری تر دژایەتی دەكرێت و خەلكی لی وێل دەكرێت وەكو سەر گەرم كردنیان بە ئارەزوەكانەوە ..!! هەروەها لە شوێنكی تریش تەحدایان دەكات، واتە: یان هەندێك لە كافر و دوو رووەكان بەتایبەتیش لەم سەردەمەی ئێستا (مولیحدەكان ) وا دەلێن ..؟!! كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت قال تعالى: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَـٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ۝١٣﴾ [هُود : ١٣] واتە: یان هەندێك لە كافر و دوو رووەكان بەتایبەتیش لەم سەردەمەی ئێستا (مولیحدەكان ) وا دەلێن : واتە: هەندێكی تریان دەلێن : ئەم قورئان ﷺ هەر خۆی هەلی بەستووە ..!! جا پێیان بلی : باشە ئێوەش دە سورەتی وێنەی ئەم قورئانە هەلبەستن ، داوای كۆمەكیش بكەن لە هەركەس كە دەتوانن جگە لە (خوای گەورە ) بۆ ئەوەی هاوكاریتان بكات ، ئەگەر ئێوە راست دەكەن لەو بوختانە دا ..!!

دووبارە لە سورەتی یونس دا تەحدای ئەو کەسانە دەکات ، کەدەڵێن : ئەم قورئانە هەڵبەستراوە یان دروست کراوی دەستی ﷺ کەواتە خۆی دایرژتووە ، بەلام (خوای گەورە ) دووبارە وەلامیان دەداتەوە دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٣٧ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ۝٣٨﴾ [يونس : ٣٧ - ٣٨]واتە: هەر گیز رەوا نیە کە ئەو قورئانە پیرۆزە ، بەم هەموو دارشتنە شکۆمەند و راوانێژی یەوە ، کەسێك یان کەسانێك جگە لە (خوای گەورە ) دایان رشتبێت کە یەکێك لە تایبە تمەندیەکانی ئەوەیە کە بەراستدانەری کتێبە کانی پێش خۆیەتی ، هەرچیش کە پێویستە بۆ کاروباری ئاین یان دین و دونیا لە قورئاندا روون کراوەتەوە کە ئیتر هیچ گومان و دوو دلی یەك نا هێڵێت کە لە لایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە نازل کراوە ..!! یاخود ناحەز دژە قورئانیە کان یان مولحیدەکان ، لە هەموو سەردەمێك دا دەڵێن : ئەم قورئانە ﷺ خۆی هەڵی بەستووە و خۆی دایرشتووە ، تۆیش پییان بلێ : دەی خۆ ئێوەش ئادەمیزادیکن وەکو من ، دەی ئێوش سورەتێك لەوێنەی سورەتێکی ئەم قورئانە داڕێژن و هەر کەسیش جگە لە (خوای گەورە ) بۆتان دەکرێت بانگی لێ بکەن و داوای یارمەتی کۆمەکی لی بکەن، ئە گەر ئێوە لە بوختانە کانتان راست دەکەن ..!!

بەلێ ئەم تەحدایە قورئان بە سورەتێك دوو جار لە قەرئان دا هاتووە ، واتە مەبەست لەوەی ئەگەر دەتوانن سورتێك بەهێنن ، دوو جار (خوای گەورە ) ئەم تەحدایەی کردووە ، بەلێ ئەم تەحدایە بەردەوامیشە تا رۆژی قیامەت ، بە دلنیایەوە کافران و موشریکان ومولحیدەکان و هەموو گرۆی زەوی نەیانتوانیوە ، بە بەدلنیایەوەش هەر گیز ناشتوانن جورئەت خیرەت بدەن بەر خۆیان سورەتێکی وە ك سورتی (الکوثر ) بهێنن ..؟! بەلێ بەراستی قرار یان بریاری ئەوها کە تەحدایەکە تەنها (خوای گەورە ) لە توانای دایە تەحدای هەموو گۆی زەوی یان گرۆی ئادەمیزادی پێ بکات ،چونکە (خوای گەورە ) زۆر بە توانایە لە هەمووشتێکدا ،کەسیش ناتوانێ جگە لە زاتی (اللە ) ئەم تەحدایە بکات ..!! بەلێ بێ گومان بەلگەی ژێری (عاقل ) یە لەسەر راست و دروستی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، وە راستی ئەو پەیامەی کە هاتۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرمووی قال تعالى: ﴿وَإِن كُنتُمْ﴾ ئەی گەل و هۆزی ئینکار ئەی کافران ئەی موشریکان ئەی مولحیدەکان ، ئەی مێشك پووچەکان ، ئەوانەی دژ بە پەیامەکەی ﷺ دن ، یان ئەوانەی بانگەوازیە کەی رەت دەکەنەوە و ، وادەزانن ﷺ درۆدەکات، بەلێ هەردەم ئێوەی دڵ بۆگەن قینە لە دل لە گومان دان و لە دوو دلی و رارایی دان ، لەوەی کە دامان بەزاندووە بۆ سەر بەندە کەمان ، ئایا ئەو حەق ، یان جگە لەو ..؟! ئا ئەمە لێرە دا کارێکی دوو لەتکەرە ، کە جیاکاری لە نێوان ئێوەو ئەوی تێدایە ، ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەر وەکو ئێوە مرۆڤە ..!! لە ئێوە زمان پاراو ترو خوێنەوار تر نیە ..؟! ئێوەش باش دەزانن ئەی کافران ..؟! هەروەها ئێوە ئەو باش دەناسن ئەی کافران ..؟! وە لە نێو ئێوە دا گەورە بووە و پێگەیشتووە ..؟! هەروەها باش دەی ناسنن کە نەدەنووسێت و نەدە خوێنیتەوە واتە نەخوێنەوارە (أومیە

)..؟! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت قال تعالی: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ...﴾ [الأَعْرَاف : ١٥٧] واتە :هەروەها ئەوانەی کە لە ئایندە دا باوەرد دەکەن بە پێغەمبەروفرستادەی نەخوێندە وارمان (ﷺ ) وەکو موعجیزەیە ك ئەم قورئانە ریّك وپێکە پر لە علیم وزانستەی پێدا رەوانە کراوە ، جوولە کەو گاورەکانیشناونیشانە کانی دەبینن کە تۆمار کرواوە لە کتێبەکانیان وەك (تەورات ، ئینجیل ) دا ، (لە گەل دەستکاری کردنیشدا ) کە هەندێ سیفاتی ئەوەیە : کە فەرمانیان پێدەدات بە چاکە و چاکە کاری ، هەرچی شتێکی چاك و پاك و بە سوودە بۆیان حەلال دەکات ، هەرچی شتێکی پیس و خراپە و نا پوختە لیّ یان حەرام دەکات ..!! ئینجا ئەی کافران ئەی مولحیدەکان خۆ ئێوە زانیتان کە نەخوێندەوارە ..؟! هەروەها کتێبێکی بۆ هێناون کە بە دلنیایەوە لە لایەن (خوای گەورە ) بۆ ﷺ رەوانە کراوە ، ئێوەش دە لێن : ئەو قورئانە قسەی خۆیەتی ..؟! ئێوە دەزانن بوختانێکتان هەل بەستیووە ..؟! جا ئەگەر ئەوەی دەلێن : وایە ..؟! یان ئەوەی دەلێن : راست دەکەن ..؟! ئەوا ئێوەش سورەتێك لە وێنەی ئەم قورئانە بهێنەوە ..؟! هەر کەسێکیش کە خۆتان حەز تان پێیەتی لە هاوکار و هاوری زاناکاتان ئەوانەی کە شهادەی بەرز بەرزییان هەیە ،یان ئەوانەی لە زمانی عەرەبی دا زۆر پاراو راون بێژن ، یان شاعیرە کانتان ، هەر هەموویان بێن باکۆمەك و هاوکاری تان بکات ، تەنانەت گرۆی ئادەمیزادیش بێت پیان ناکرێت و هەرگیزاو هەرگیزیش پێیان ناکرێت ..؟!

جا ئەگەر توانی تان سورەتێك بەهێنن وەك وێنەی ئەم قورئانە ئەوا راست دەکەن ..!! وە ئە گەر نەتان توانی بیهێنەوە ئەو ئێوە بێتوانا بوونە و لەو پەری بێتوانایی دان ، بەلیّ ئا ئەم ئایەتە بەلگەیەکی زۆر روون وئاشکرایە ، لە سەراست و دروستی پێغەمبەری خوا ﷺ و راستی ئەم پەیامەی هێناوە تەوە ، بۆ یە پێویستە لەسەر هەموو ئادەمیزادێك باوەرەی بە پەیامەکەی بهێنیت شوێنی فەرمانەکانی بکەوێت وە دوور کەوێتەوە لە قەدەغەکراوە کانی ..!! قال تعالی: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٣] بەلیّ ئەم پەیامە بۆ ئەوانەی کە ئیحادی دەکەن یان ئینکاری دەکەن ، هەروەها شیرك بریاردەدن و بە گومانن لە قیامەت ، هەروەها ئینکاری پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن ، وەك باسمان کردن دەلێن : ئەم قورئانە هەلبەستراوە ، لەم ئایەتە دا باسی نەکردووە بۆ ﷺ دابەزیوە ، بەلام لە ئایەتێکی تردا باسی کردووە ،هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ﴾ [مُحَمَّد : ٢] واتە: دامان بەزاندووە بەسەر بەندەی ئێمە ﷺ ، لە ئایەتی یەکەم دا دە فەرمووی : قال تعالی: ﴿عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٣] بەلام لە سورەتی محمد ئایەتی (٢) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿عَلَىٰ مُحَمَّدٍ﴾ [مُحَمَّد : ٢] کەواتە : جیاوازی هەیە لە یەکەم دا دە فەرمووێت : بەسەر بەندەکەم یان (رسولنا ) ، بەلام لە ئایەتی دووەم دا دەفەرمووی : ﴿عَلَىٰ مُحَمَّدٍ﴾ کەواتە: بەسەر بەندەکەم دا ﴿عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾ چونکە بەندایەتی باشتری وەسفە کە مرۆڤ وەسفی پیّ بکرێت ، چونکە بەندایەتی بۆ (خوای گەورە ) ئازادیە ، لەبەر ئەوەی لە دەست بەندایەتی دروست کراوەکانی (خوای گەورە ) ئازاد دەبێت ، تەنها بەندایەتی دەکاتی بۆ زاتی (اللە ) ، هەروەها لە سورەتی الاسراء و میعراج (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ﴾ [الإِسْرَاء : ١] واتە: پاکی و بێگەردی و تەسبیحات وستایش و بۆ ئەو زاتەی کە شەو رەوی کرد بە

بەندەکەی خۆی ﷺ ..!! ﴿مِّن مِّثۡلِهِۦ﴾ واتە: ئەم ضمیرە دوو ئەگەر دە گرێتەوە ، یەکەم : هەول بدەن سورەتێکی وەك وێنەی قورئان بهێنەوە واتە: بۆ قورئان دەگەرێتەوە ، دووەم : وەك ئەوەی کە محمد پێ هاتووە ، چونکە قورئان نیشانە و موعجیزیە ، هەر دوو ئەگەر کەش راستن ، هەروەها جێگیر کردنی و بەرزی (خوای گەورە ) ، لەبەر ووشەی ﴿نَزَّلۡنَا﴾ کە بەسەر بەندەکانی یان دروست کراوەکانیدا ، دابەزاندن لە شوێنی بەرزەو بۆ نزم ، قورئان و سوونەت ، ئیجماع و عەقل و فیترە ، بەلگەیە لەسەر بەرزی (خوای گەورە ) ..؟! لێرە دا گرینگی بە باسە کەمان دەدین لەبەر تەحدا کردنی ئەم ئایە پیرۆزەی قورئان ، قال تعالی: ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٣﴾ [البَقَرَةِ : ٢٣] بەلێ بێ گومان قورئان تەحدای هەموو مرۆڤایە تی دەدات کە وێنەی ئەم قورئانە دارێژ ئەگەر ئێوە راستە کەن ..؟! ئەی خوێنەری بەرێز ئێمە لە بەر گرینگی ئەم تەحدایەی قورئان درێژە بە باسە کەمان دەدین ، بەلگە کانی تەحدا کردنی قورئان دەخەینە روو ، بە بەلگەی دەقەکانی قورئان یان بەلگەی عەقل لۆژیکی ئەم سەردەمە ، چونکە قورئانی پیرۆز کە دابە زیوە بۆ هەموو سەردەمێك دابەزیوە ، هەروەها بە دلنیایەوە کلام و ووتەی (خوای گەورە ) و هەروەها رەوانە کراو بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ ، وە بەدلنیایەوە ئەو تەنها پەیامەکەی (خوای گەورە ) دەگەیەنی ، بەلکو نووسەرو دارێژەری قورئان (خوای گەورە )یە ...!!

لە (ابی هریرە ) – خوا لی رازی بێت- دەلێت : ((ما مِنَ الأنْبِياءِ نَبِيٌّ إلَّا أُعْطِيَ ما مِثْلُهُ آمَنَ عليه البَشَرُ، وإنَّما كانَ الذي أُوتِيتُ وَحْيًا أوْحاهُ اللَّهُ إلَيَّ، فأرْجُو أنْ أكُونَ أكْثَرَهُمْ تابِعًا يَومَ القِيامَةِ)).[١] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : لە پێغەمبەراندا هیچ پێغە مبەرێك نەبووە ،کە بەلگەو سەرسامی وای پێ بەخشرابێت ،کە وێنەی ئەو خەلکە ئیمانیان پێ هێناوە ، وە ئەو پامەی منیش هێناومە (وحی) یە (خوای گەورە) ناردویەتە سەرم ، هیوادارم یان خوازیارم ، لەهەموویان شوێنکەوتووم زیاتر بێت لە رۆژی قیامەت دا ..؟! واتە: ئەوەی من پێم دراوە لە نێوان پێغەمبەران ، قورئانە کە گەورەترین نیشانە موعجیزیە (خوای گەورە ) یە چونکە لە توانای هیچ مرۆڤێك دانیە، واتە : ئەم قورئانە لە سەرووی خەیالی مرۆڤە ..؟! بەلێ مرۆڤ بە هیچ شێویەك ناتوانێت بەرنگاری ئەم قورئانە ببێتەوە ، چونکە پێچەوانەی هەموو کتێبەکانی ترە ، کە (خوای گەورە ) ناردوویەتی ، چونکە ئەو کتێبانەی تر موعجیزە نین لە لای زۆر بەی زانایا (واللە اعلم ) ، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ بەلگەی پێغەمبەرایەتی زۆر ، راستی ئەو پەیامەی بۆی رەوانە کراوە کە لە ژمارە نایەت ، سوپاس ستایش بۆ (خوای گەورە ) کە ئەم رەحمەتەی بۆ رەوانە کردووین ئەم ئیسلامە جوانەی پێ بەخشین ..!!

لە (قتادة بن النعمان ) – خوا لی راز بیت – دەلێت : (([ أنه قال ] كان أهلُ بيتٍ منّا يقالُ لهم بنو أُبَيرِقٍ بِشرٌ وبُشَيرٌ ومُبَشِّرٌ وكان بُشَيرٌ رجلاً منافقًا يقولُ الشِّعرَ يهجو به أصحابَ رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ ثم يَنحَلُه

[١] - صحيح البخاري برقم(٤٩٨١).

بعضَ العربِ ثم يقولُ قال فلانٌ كذا وكذا قال فلانٌ كذا وكذا فإذا سمع أصحابُ رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ ذلك الشِّعرَ قالوا واللهِ ما يقولُ هذا الشِّعْرَ إلا هذا الخبيثُ أو كما قال الرجلُ وقالوا ابنُ الأُبيرقِ قالها قال وكان أهلَ بيتِ حاجةٍ وفاقةٍ فى الجاهليةِ والإسلامِ وكان الناسُ إنما طعامُهم بالمدينةِ التمرُ والشَّعيرُ وكان الرجلُ إذا كان له يَسارٌ فقدِمتْ ضافطةٌ من الشّامِ من الدَّرْمَكِ ابتاع الرجلُ منها فخصَّ بها نفسَه وأما العِيالُ فإنما طعامُهم التَّمرُ والشعيرُ فقدمتْ ضافطةٌ من الشامِ فابتاع عمّى رفاعةُ بنُ زيدٍ حملاً من الدَّرْمَكِ فجعله فى مشرُبَةٍ له وفى المشربَةِ سلاحٌ ودِرعٌ وسيفٌ فعُدِىَ عليه من تحتِ البيتِ فنُقِبَتِ المشرُبَةُ وأُخِذَ الطعامُ والسلاحُ فلما أصبح أتانى عمِّى رفاعةُ فقال يا ابنَ أخى إنه عُدِىَ فى ليلتِنا هذه فنُقِبَتْ مَشربتُنا فذُهِبَ بطعامِنا وسلاحِنا فتحسَّسْنا فى الدار وسألْنا فقيل لنا قد رأينا بنى أُبيرقٍ استوقَدوا فى هذه الليلةِ ولا نرى فيما نرى إلا على بعضِ طعامِكم قال وكان بنو أُبَيرقٍ قالوا ونحن نسأل فى الدارِ واللهِ ما نرى صاحبَكم إلا لَبيدَ بنَ سهلٍ رجلٌ منا له صلاحٌ وإسلامٌ فلما سمع لَبيدٌ اخترط سيفَه وقال أنا أسرقُ فوالله لَيُخالطنَّكم هذا السيفُ أو لتبيِّنُنَّ هذه السرقةَ قالوا إليك عنها أيها الرجلُ فما أنت بصاحبِها فسألْنا فى الدارِ حتى لم نشكَّ أنهم أصحابُها فقال لى عمّى يا ابنَ أخى لو أتيتَ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ فذكرتَ ذلك له قال قتادةُ فأتيتُ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ فقلتُ إنَّ أهلَ بيتٍ منا أهلُ جفاءٍ عمدوا إلى عمِّى رفاعةَ بنِ زيدٍ فنقبوا مشربةً له وأخذوا سلاحَه وطعامَه فلْيَرُدُّوا علينا سلاحَنا فأما الطعامُ فلا حاجةَ لنا فيه فقال النَّبِىُّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ سآمرُ فى ذلك . فلما سمع بنو أُبَيرِقٍ أتوا رجلاً منهم ، يُقالُ له : أُسَيرُ بنُ عروةَ ، فكلَّموه فى ذلك ، واجتمع فى ذلك ناسٌ من أهلِ الدارِ ، فقالوا : يا رسولَ اللهِ إنَّ قتادةَ بنَ النُّعمانِ وعمَّه عمدا إلى أهلِ بيتٍ منا أهلِ إسلامٍ وصلاحٍ ، يرمونهم بالسرقةِ من غيرِ بيِّنةٍ ، ولا ثبْتٍ . قال قتادةُ : فأتيتُ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ فكلَّمتُه فقال : عمدتَ إلى أهلِ بيتٍ ، ذُكِرَ منهم إسلامٌ وصلاحٌ ، ترميهم بالسرقةِ على غيرِ ثَبتٍ وبينةٍ ؟ . قال : فرجعتُ ولوددتُ أنى خرجتُ من بعض مالى ولم أكلِّمْ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ فى ذلك ، فأتانى عمى رفاعةُ ، فقال : يا ابنَ أخى ما صنعتَ ، فأخبرتُه بما قال لى رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ ، فقال : اللهُ المستعانُ ، فلم يلْبَثْ أنْ نزل القرآنُ . إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلاَ تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيمًا بنى أُبَيرِقٍ ، وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ مما قلتَ لقتادةَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا.وَلاَ تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنْفُسَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ مَنْ كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلاَ يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ.... إلى قوله رَحِيمًا . أى لو استغفروا اللهَ لغفر لهم . وَمَنْ يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُ عَلَى نَفْسِه إلى قوله وَإِثْمًا مُبِينًا – قولهم للبيد – وَلَوْلاَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ

وَرَحْمَتُه إلى قوله فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا فلما نزل القرآنُ أتى رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ بالسلاحِ فردَّه إلى رفاعةَ . فقال قتادةُ : لما أتيتُ عمِّي بالسلاحِ ، وكان شيخًا قد عشا أو عسا – الشك من أبي عيسى – في الجاهليةِ ، وكنتُ أرى إسلامَه مدخولاً ، فلما أتيتُه قال : يا ابنَ أخي هو في سبيل اللهِ ، فعرفتُ أنَّ إسلامَه كان صحيحًا . فلما نزل القرآنُ ، لحق بشيرٌ بالمشركين ، فنزل على سُلافةَ بنتِ سعدِ بنِ سميَّةَ ، فأنزل اللهُ تعالى : وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا . فلما نزل على سُلافةَ رماها حسَّانُ بنُ ثابتٍ بأبياتٍ من شعرٍ ، فأخذَتْ رحلَه فوضعتْه على رأسِها ، ثم خرجتْ به فرمتْ به في االأبطحِ ، ثم قالت : أَهدَيتَ لي شِعرَ حسانٍ ، ما كنتَ تأتيني بخيرٍ)).[١]

واتە: لە (قتادە کوری نعمام ) — خوا لی رازی بێت — دە گێرێتەوە دەڵێت : خزم و کەس و کارێکمان هەبوو ، ناسراو بوون بە (بنی ئەبریق بیشر و بەشیر و موبەشیر ، بەشیر پیاوێچکی شاعیر و مونافیق یان دوو روو بوو ، ئەو پیاوە شیعری دەووت ، وە جنێوی بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد،واتە: بەناوی خەلکەوە بە شیعر هیچرشی دەکردە سەریان ناو ناتۆرەی خراپی لێ دەنان ، وە بە خراپە باسی دەکردن ، لە پاشاندا دەی ووت : ئاواو ئاوای ووتوە ..؟! کاتێك هاوە لانی پێغەمبەری خوا ﷺ شیعرە کانی ئەو پیاوە یان بیست ، ووتیان : سوێند بە (الله) ئەمە جگە لە شیعری ئەو پیسە نا پیاوە ..!! شیعری هیچ کەسێکی تر نیە ..؟! واتە: شیعری بەشیرە ، (قتادە) دەڵێت : نەوەی ئەبریق لە سەردەمی نەفامی دا و لەسەردەمی ئیسلامیشدا خانەوادەیەکی هەژارو نەدرا بوون ..!! وە خواردنی خەلکی شاری مەدینە بریتی بوو لە خورما جۆ ، کاروانی بازرگانی لە وەلاتی شامەوە دەهات بۆ شاری مەدینە کەل وپەل ئاردو زیتیان دەهێنا ، ئەگەر کەسێك دەولەمەند بوایە بەشی خۆی لێ دە کری ..!! جارێکیان مامم کە دەکاتە (ریفاعەی کوری زید ) هەندێك ئاردی کری ، لە ژوورە کەی خۆی داینا ، ژوورە کەشی کەرەسەی جەنگی کەل پەلی وەك چەك و قەلغان وشمشیری تێدا بوو ، شەو دز هات هەر هەموویانی برد ، کاتێ کە رۆژ بوویەوە مامم (ریفاعە ) هات بۆ لام ، ووتی : ئەی برازاکەم ، ئەمشەو چەکە کانم و خواردنەمەنیە کان میان دزیوە ..؟! (قتادە) ووتی : رۆیشتن گوزەر گەراین پرسیارمان کرد ، پێیان ووتین : ئەم شەو نەوەی ئەبریق ئاگریان ئەگرا لە ناوچەکەدا ..!! پێمان وایە ئەوان بوون ، (قتادە) ووتی : نەوەی ئەبریق ، ووتیان: ئێمە لە کۆلان دەوربەری پرسیارتان بۆ دەکەین ، سوێند بە (الله ) پێمان وایە (لبیدی کوری سەهل ) بردوونی کە پیاوێکە لە ئێمە ، ووتیان : پیاوێکی باشە و موسلمانە ، کاتی (لبید کوری سەهل ) ئەو هەواڵە بیست ، شمشیری لە کالان دەرهێنا هات ووتی : من دزیومە ئێوە من دەکەن بە دز ..؟! سوێند بە (الله ) یان ئەم شمشێرە لە جستەتانداون دەکەم ، یان ئەوە تا ئەم دزیە ئاشکرا دەکەن ، ووتیان : چیت داوە لێمان ئەی پیاو برۆ بەرێیی خۆتەوە وازمانی لێ بێنە ، تۆ نەت دزیوە ..!! مامم واتە (ریفاعە ) پێ ووتم : برازاکەم خۆزە بچوویتایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئە بە سەر هاتەن پێ رادەگەیاند ، (قتادە ) ووتی : منیش چووم بۆ

[١] -سنن الترمذي برقم (٣٠٣٦).

خزمەتی ووتم : کە سوکارەکەم جافین و ئاگای پەیوەندی خزمایەتی و چاکە نازانن ، چەك و خۆراکی مالی (ریفاعەی) مامم دزیوە ، با چەکەکانمان بۆ بگەرێنەوە پێویستمان بە خۆرا کەکە نیە ، فەرمووی : (بریار دەدەم لەو بارەوە ) کاتێ نەوەی ئەبریق هەوالە کەیان بیست ، پاوێکی هۆزەکەی خۆیان بەناوی (ئوسیری کوری عمرەوە ) نارد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە قەسەی لە گەل بکات ، چەند کەسێ لە خەلکی گەرەکە کۆ بوونەوە ووتیا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (قتادە ) مامی واتە : (ریفاعە ) ئەم کەس وکاری ئێمەیان کردووە بەدز بەبێ بەلگە و نیشانە ..؟!(قتادە ) ووتی چووم : بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ قسەم لەگەل کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بە بێ بەلگە و شایەت تۆ تۆمەتی دزی دەدەیتە پال خێزانێکی باش و موسلمان ..؟! (قتادە) ووتی : ئیتر منیش بە پەشیمانی گەرامەوە ئاواتە خواز بووم و لە دلەوە حەزم دەکر زیانێکی مالی گەورەم لێ بکەوتایە ، بەلام لەو بارەوە قسەم لە گەل پێغەمبەری خوا ﷺنەکردایە ، مامم ریفاعە هات بۆ لام ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێ فەرمووم بۆم گێرایەوە ، ئەویش ووتی بیان دەستی خوا بە پشتیوانی خوا هەموو شتێ روون دەبێتەوە ئەوەندەی پێ نەچوو (خوای گەورە ) ئەم یایەتەی رەوانەکرد قال تعالی: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ١٠٥﴾ [النِّسَاء : ١٠٥]

واتە : ئەی پەیامبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئێمە قورئانمان بۆ دابەزاندویت کە هەموو هەق و ڕاستیەکی لەخۆ گرتووە، بۆ ئەوە دادوەری بکەیت لەنێوان هەموو خەڵکی بەوەی خوای پەروەردگار بەسروش بۆی ناردوویت، و بەرچاوڕوونی کردوویت پێی، بۆیە بەرگریکار مەبە بۆ ئەوانەی . بە شاردنەوەی هەق . خیانەتیان لەخۆ کردووە، بەوەی بۆتیان دەربڕیوە لەگوفتاریان کە پێچەوانەی ڕاستیەکانە ..!! واتە : بۆ نەوەی ئەبریق ، قال تعالی: ﴿وَٱسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ﴾ [النِّسَاء : ١٠٦] واتە: دوای لێ خۆشبوون لە خوا بکە ، لەوەی فەرمووت بە (قتادە) ، قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١٠٦﴾ [النِّسَاء : ١٠٦]واتە: بە راستی خوا لێ خۆشبوو و بە بەزەی یە ، قال تعالی: ﴿لَا تُجَٰدِلۡ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمٗا ١٠٧ يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمۡ﴾ [النِّسَاء : ١٠٧ - ١٠٨]واتە : وە بەرگری و پشتیوانی لەو کەسانە مەکە کە بەسەرپێچی کردنی خوای پەروەردگار خیانەت لەخۆیان دەکەن . بێگومان خوای پەروەردگار ئەو کەسانەی خۆشناوێت کە خیانەتیان گەورە بووەتەوە، و تاوانیان زیادی کردووە ..!! لەکاتی ئەنجامدانی تاوان خۆیان لەخەڵکی دەشارنەوە لەترسی ئەوەی بەکردەوە خراپەکانیان نەزانن، کەچی خۆیان لەخوای پەروەردگار ناشارنەوە و شەرمی لێ ناکەن، لەکاتێکدا کە خوای پەروەردگار بە زانیینی لەگەڵیاندایە و بینایە پێیان کاتێك شەوان پلانی وتەگەلێك دائەڕێژن کەخوای پەروەردگار پێی ڕازی نیە..!!واتە: ئەگەر تەوبە یان بکردایە و داوای لێ خۆشبوونیان بکردایە لە خوا ، لییان خۆش دەبوو ، قال تعالی: ﴿وَمَن يَكۡسِبۡ إِثۡمٗا فَإِنَّمَا يَكۡسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ﴾ [النِّسَاء : ١١١]واتە: وە هەرکەسێك کە بەئەنقەست تاوانێك ئەنجام بدات ئەوا بەو تاوانە تەنها زیان لەنەفسی خۆی ئەدات..!! هەتاکو قال تعالی: ﴿وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ١١٢﴾ [النِّسَاء : ١١٢]واتە: گوناهێکی ئاشکرایە ، ووتەکەی (لبید ) : قال تعالی: ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ وَرَحۡمَتُهُۥ﴾ [النِّسَاء : ١١٣]واتە: وە ئەگەر بەخششی خوای بەرز وبڵند وپایەبەرز نەبوایە بەسەرتەوە . ئەی پەیامبەری خوا صلی الله علیه وسلم. کەڕەحمی لێکردوویتوو ونیعمەتی پەیامبەرێتی پێ بەخشیویت..!! هە تاکو دە کاتە : قال تعالی: ﴿فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ١١٤﴾ [النِّسَاء : ١١٤]واتە: کە ئایەتەکە دابەزی چەکە کانی (ریفاعە) یان هێناوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش

گەراندنیەوە بۆ (ریفاعە ) ، (قتادە) ووتی : کاتێ کە چەکەکانم هێنایەوە بۆ مامم ، پیاوێکی پیر بوو لە سەردەمی نەفامی دا زۆر لە خوا یا خی بوو ، گومانم هەبوو لە موسلمانەتیە کەی ، بەلام کاتێ چە کەکانم بۆ بردەوە ووتی : برازاکەم کە قورئان دابەزی بەشیر ریسوا بوو پەیوەندی کرد بە هاوبەش بۆ خوا دانەرانەوە ، لە مالی (سەلافەی کچی سەعدی کوری سومەیە ) دابەزی ، (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابەزاند : قال تعالى: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾﴾ [النِّسَاء : ١١٥ - ١١٦] واتە: وە هەرکەسێك پاش ئەوەی کە هەق بۆ ئاشکرابوو پێچەوانەی پەیامبەری خوا صلى الله عليە وسلم بکات، ورێگەیەك جگە لە ڕێگەی باوەڕداران و ئەو هەقەی کە لەسەریبوون بگرێتەبەر، وازی لێئەهێنین لەگەڵ ئەوەی کە بۆی دەچێت، و سەرکەوتووی ناکەین بۆ چاکەکاری، ودەیخەینە ئاگری دۆزەخەوە بۆ ئەوەی گەرمیەکەی بچێژێت وئەمەش خراپترین دەرئەنجام و ئاکامە ..!! بێگومان هەرگیز خوای بەرز وبڵند وپایەبەرز خۆش نابێت لەوانەی کە هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار دەدەن، بەڵام خۆش ئەبێت لەو تاوانانەی لەهاوەڵبڕیاردان وشیرك بچوك تر بن بۆ هەرکەسێك خۆی ویستی لەسەر بێت لەبەندەکانی . وە هەرکەسێك یەکێك لەبەدیهێنراوەکانی بکاتە هاوەڵی خوای تاك وتەنها ئەوا لەڕادەبەدەر گومڕابووە و لە ڕێگای ڕاست دوورکەوتۆتەوە ..!! کاتێ بەشیر لە مالی (سولاف ) دابەزی (حسانی کوری ثایت ) بەچەند دێرە شیعرێك هێرشی کرد سەر (سولاف ) هەجیوی کرد، (سولافش) کەلوپەلە کەی بەشیری خستە سەر سەری بردی لە (اتبح ) فرێدا ، لە پاشاندا ووتی : شیعری هەجیوی (حسانت ) بەدریای بۆ هێناوم تۆ هەرگیز خێرت بۆ من نە هێناوە ..!!

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلێت : جوولە کە کان ووتیان : لە نێوانیان دا (رفاعە بن زید ) – (زید بن عمر ) ئەم جۆرە ووتانە یان قسانە وەك (وحی ) یان نیگا وایە ، وئێمەش گومانمان لێ هەیە ، ئینجا (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابەزاند دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ ...﴾ [البَقَرَةِ : ٢٣] .[١]

✍ لە ری (ابن اسحاق ) لة (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازي بيت – لە سە ر ووتە ی قال تعالى: ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا﴾ دە لیت : واتە: گومان دە کەن بەوەی رەوانەکراوە بە سەر بەندەی خوا ﷺ ..).[٢]

✍ لەرێ (عباد بن منصور ) لە (الحسن البصری ) – رەحمەتی خوای لی بیت – لەسەر ووتەی : ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا﴾ دەلێت : ئەوە ووتەی (خوای گەورە ) یە کە کافرەکان گومانیان هەیە لەوەی کە بۆ ﷺ هاتووە ..).[٣]

[١] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٣/١).
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم ((٦٣/١).
[٣] -اخرجه ابن ابي حاتم ((٦٣/١).

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – ڕەحمەتی خوای لی بیت – لەسەر ووتەی ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ﴾ واتە: گومانیان لیّ یە ، وە لەسەر ووتەی ﴿مِّمَّا نَزَّلۡنَا﴾واتە: (القران ) ، وە لەسەر ووتەی ﴿عَلَىٰ عَبۡدِنَا﴾ واتە: بەندەی خوا ﷺ ..).[1]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – ڕەحمەتی خوای لی بیت – لەسەر ووتەی﴿فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ﴾ واتە: وێنەی ئەو قورئانە بێنن).[2]

✍ لە ری (ابن اسحاق ) لة (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازي بيت – لە سە ر ووتە یقال تعالى: ﴿وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم﴾ دەڵێت : واتە : یارمەتی دەرەکانتان یان هاورێکانان یان هاوکارەکانتان ..).[3]

✍ لە ری (السدی ) لە (أبی مالك غزوان الغفاري ) – رەحمەتی خوای لی بیت – لەسەر ووتە ی قال تعالى: ﴿وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ دەڵێت : واتە : هاوبە شە کانتان ، واتە: (لەشريك برياردان ) ..).[4]

**چەندبەلگەیەك لەسەر ئەوەی كە قورئانی پیرۆز كلامی (خوای گەورە ) ، هەروەها ﷺ تەنها پەیامبەری خوایە ،نووسەری قورئان نیە ، بەڵكو نووسەر و دارێژەی قورئان زاتی (الله )، ﷺ تەنهاو تەنها پەیامەكەی گەیاندووە بۆ هەمووجیهان ..؟!**

١-وورد بوونەوەیەکی سادەو سارکار دەری دەخات ، کە وقورئان لەرووی زمان و دەربرینەوە لە هیچ یەکێك لە کتێبەکانی مرۆڤ ناچێت ، جگە لەمەش قورئان لە رووی شێواز ماناو ناوەرۆکیشەوە بیّ وێنە و بیّ هاوتایە ، کەواتە قورئان ووتەی مرۆڤ نیە ..؟!

٢-قورئان کلامی (خوای گەورە ) ، ووتەی پێغەمبەری خوا ﷺ نیە ، چونکە پێغەمبەر پێشتر هیچ خوێنەواری نەبوو ، هیچ کتێبیکی نەخوێندووە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ٤٨﴾ [العَنکَبُوت : ٤٨] واتە: وە لە موعجیزە ڕوونەکانی تۆ. ئەی پەیامبەری خوا صلی اللە علیه وسلم. ئەوەیە کە تۆ پێش ئەوەی قورئانت بەسەردا دابەزێت هیچ کتێبێکت نەخوێندووەتەوە و هیچ پیتێکیشت بە دەستی

[1]- تفسير مقاتل بن سليمان (٩٣/١).
[2] - تفسير مقاتل بن سليمان (٩٣/١).
[3] -سيرة ابن هشام (٥٣٣/١).
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (٦٤/١).

ڕاستت نەنوسیوە، و ئەوانیش ئەمە دەزانن، وە ئەگەر تۆ لەپێش ئەوەی وەحیت بۆ بێت خوێنەر یان نوسەر بوویتایە ئەوا بێباوەڕە کارپووچەکان دەکەوتنە گومانەوە، و دەیانوت : لە کتێبە پێشووەکانەوە فێری بووە و لەوانەوە وەری گرتووە ..؟!

٣- بەڵێ لەو ڕۆژەی کە قورئتنی پیرۆز دابەزیوە تا ئەمرۆش ، هیچ کتێبێك نەنووسراوە کە تەحدای هەموو مرۆڤایەتی بکات ،لە خوێندەواران زانا دانایان و هەروەها ئەوانە لە ئاستی خوێندن شهادەی یان بروانامەی بەرزیان هەیە لە دکتورا و پرۆفیسۆلە کان ، زانا هەرە مەزنەکانی جیهان ، لە رووی رەوان بێژی ، هونەری دەربرین و زانستی زمانەوانی ، بەڵێ سەرجەمی مرۆڤایەتی لە گشت سەردەمەکاندا ، وە لەم سەردەمەدا کە بەسەردەمی عەولەمە یان سەردەمی زانستە کان کە گیشتووە بە لوتکە ..؟! هەروەك قورئان ئەم تەحدایەیان دەکات دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٣﴾ [البَقَرَةِ : ٢٣]واتە : خۆ ئەگەر ئێوە. ئەی بێباوەڕە کەلەڕەقەکان. لەگوماندان بەرامبەر ئەم قورئانەی کە دامانبەزاندوە بۆ سەر بەندەی خۆمان موحەممەد صلی الله علیه وسلم، و لاف و گەزافی ئەوە لێدەدەن کە ئەم قورئانە لە لایەن خواوە نیە، دەی سورەتێك بهێنن هاوشێوەی سورەتەکانی قورئان بێت، و هەتا دەتوانن داوای یارمەتی بکەن لە هەموو هاوکارەکانتان وکەم تەرخەمی مەکەن، ئەگەر ڕاست دەکەن لەو لاف و گەزافەی کە دەیدەن ..؟!

٤- پرسیار ئایا لە قسەی چ مرۆڤێکدا ،هەلە و کەم و کورتی ، لادان و دژیەکی بوونی نیە ..؟! بەلام ئەگەر سەیری قورئان بکەین کە تەحدادەکات یان بنچە بۆ ئەو راستیە درێژ دەکات ، کە بچووکترین هەلە نارێکی دژ بەیکی تێدا نیە ..!! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ٨٢﴾ [النِّسَاء : ٨٢] واتە : ئایا ئەوانە بۆ بەتێڕامان و لێوردبوونەوە ناڕواننە قورئان، وئەو هەق وڕاستیەی کە پێی هاتووە، کە بەشێوەیەکی ڕێك وپێك ومەحکەم هاتووە یەکلایی ئەوە دەکاتەوە کەتەنها لەلایەن خواوەیە ؟ چونکە ئەگەر لەلایەن جگە لەخواوە بوایە ئەوا جیاوازیەکی زۆریان تیا ئەبینی ..؟!

٥-بێ گومان جیاوازی لە نێوان شێوازی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدی دەکرێت ، بە ئاسانی هەستی پێدەکرێت ، چونکە هیچ مرۆڤێك ناتوانێت بگاتە ئەو ئاستە زانستیە قورئان ، هەورەها لە رەوان بێژی پاراوی قورئان ..؟!

٦-بەلێ دورست کردنی ئاسمانەکان و زەوەی ، تەنها و تەنها دەربرینی قورئانە ، یان دەربرینی (خوای گەورە ) هیچ مرۆڤێك ناتوان خۆی بکاتە بەرێوەبەری هەموو گەردوون ، چونکە هەر تەنها (خوای گەورە) خاوەنی ئەم گەردوونەیە هەر خۆشی دروستی کردووە ، هەر خۆشی بەخاوەنی دەزانێت ، بۆیە دەربرینەکەی قورئان خاوەندارەیتی (خوای گەورە ) هەر بۆیە قورئان کلامی خوایە ..؟! هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ ١﴾ [الأَنۡعَام : ١]واتە: ستایش لەسەر خوای پەروەردگار بە سیفەتەکانی کە هەموو سیفەتی تەواو و بێ کەم وکوڕیە، وە بەنیعمەتە دیار و شاراوەکانی، ئاینی و دونیاییەکانی، ئەو پەروەردگارەی کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشە کە لە نێوانیاندایە، و تاریکییەکان و ڕووناکیشی دروستکردووە، ئەوەش بە بەدوای یەکداهاتنی شەو و ڕۆژ . وە ئەمەش نیشانە و ئاماژەیەکی ڕوونە لەسەر گەورەیی خوای پەروەردگار، و شایستەبوونی تەنها ئەو بەپەرستن، بۆیە بۆ هیچ کەسێك دروست نیە

کەس بکات بەهاوبەشی و هاوەڵی بۆ بڕیاربدات . کەچی لەگەڵ ئەم هەموو ڕوونیە بێباوەڕان جگە لەخوای پەروەردگار یەکسان دەکەن بەخوای پەروەردگار، و هاوەڵی بۆ بڕیاردەدەن ..؟!

٧- قورئانی پیرۆز پێش دورست بوونی گەردوون مرۆڤیش داڕێژراوە ، بەپێ ئەم ڕیز بەندیە قورئان ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموێت قال تعالی: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ۞ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ۞ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ۞ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ۞﴾ [الرَّحۡمَٰن : ١ - ٤]:واتە: پەروەردگاری تۆ ڕەحمانە ...!! کە مرۆڤی فێری قورئانی کردووە، ئەوەش بە ئاسانکردنی خوێندنەوە و لەبەرکرن و تێگەیشتنی ..!! مرۆڤی بەدیهێناوە ..!! و فێری دەربڕینی ئەوەی کردووە کە لەناخیدایە، بۆ جیاکردنەوەی لەجگە لەخۆی ..!

٨-لە سەردەمی دابەزینی قورئاندا ، شیعر ئەدەب زۆر پێش کەوتوو بوو، تەنانەت شاعیرە کان بۆ گفتو گۆ وەلامدانەوە شیعریان بە کاردەهێنا ، هەروەها شەرەکانیان بەشیعر دەکرد ،سا لان پێشبرکێی شیعریان دەکرد، ئەوەی شیعرەکانی سەرنج ڕاکێش بوایە ، ئەوا بیتە شیعرەکانی بە زێڕ دەنووسرا ، بەدیواری کەعبە هەلدەواسرا ، کەچی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوانیان دا گەورە بوو بوو ، کەچی لە ڕۆژێکیش دا خۆی بە شیعرەوە خەریك نەکرد ..؟! ئەمە ڕاستەیە کە قورئان کلامی خوایە ..؟!

٩- ئایا تا ئێستا کتێبێك نووسراوە هەموو کە سێك تامەزرۆ بێت . لە خوێندنەوەی ..؟!، بەلکو لە خوێندەوار نەخوێندەواریشدا هەر هەمووی دی خۆێنن ، لە هەموو ئاستەکانی پلەی خوێندەواری و نەخوێندەواری ، تەنانەت ڕۆژی حەفدە جار سورتی فاتحە دەخوێنین لە نوێژەکانماندا ، هەر گیزاو هەرگیز لێ بێزار نابیت ، چونکە هیچ کتێبێکی تر نیە چەند جارێك بخوێندرێتەوە ، دووبارە و سەد بارەو بەلکو هەزار بارەش زیاتر ، خەلکی دەی خوێنن ، بەلام هەرگیز هەست بە بێزاری ناکرێت ..؟!

١٠- هیچ کتێبێك هە یە کە هەموو بوارە کانی ژیان لە خۆ بگرێت ..؟! ئەم تەنها لە قورئانی پیرۆز دا یە، وەك لایەنەکانی مادی و مەعنووی مرۆڤ ، لە بوارە کانی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری زانستی ، بەلی سەرجەم بوارەکانی ژیان ڕۆشن دەکاتەوە ..؟!

ئایا دەگونجێت کەسێك لە سەرجەم بوارە کان دا شارەزا بێت و هەموو بوارەکان لە کتێبەکەی دا کۆبکاتەوە ، هەروەها لە هەموو سەردەم یان زەمەنێك و شوێنێکدا یەك بگرنەوە دژ بەیەك نەبن ..؟! ئە گەر کەسێك ئەم ڕۆ قسەیەك بکات سبەینی قسە کەی پێچەوانەدەبێتەوە دژ بەوەی دوێنی کرد دەبێتەوە ، چونکە دوێنی زەمەنیچکی جیاواز بوو لە گەل ئەم ڕۆدا یان شوێنکی جیاواز بوو کە قسە کەی لی کرد ، بەلام لە ڕستی دا قورئانی پیرۆز بۆ هەموو سەردەم و زەمەنێك شوێنیکە دەگونجی دەژ بە یەکیش نیە ، ئا ئەواتا لەو سەری دونیا بۆ ئەوسەری دونیا وەك یاسارێسا کاری پێ دەکرێت لە بەرژەوەندی هەموو مرۆڤەکاندا یە ، هەر بۆیە دەلێن : قورئان کلامی خوایە ..؟!

١١-هیچ مرۆڤێك ناتوانی لەبەر هەم و کارەکانیدا هەموو لایەنکانی خۆی باس بکات و ، بەروونی گوزارشت لە هەست و بیر کەسایەتی و ڕەوشت وئامانج ومەبەستەکانی بکات، ئەگەر لە چرکە ساتێکیشدا ئەمەی بۆ برەخسێت ، ئەوا هەر گیز بە ئاسانی ناتوانێت لەسەر ئاستی فیکری و ڕەوشت ئەخلاق و هەلسوکەوت بە نەگۆری بمێنێتەوە ..؟! بەلام وەرن با تەماشای قورئانی پیرۆز بکەین لە لایەك ژیان و ئەخلاق و ڕەوشت و کەسایەتی و پەیامەکی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەین ..!! دەبینین ئەم دووانە بەتەواو

لەیەکتر دەچن ، بەلیچ راستیە کانی قورئان لە کەسایەتی ناوازە و ژیانی نموونەیی ئەودا بەرجەستە بوون ، هەر رەوشتەکەشی راستەخۆ لە قورئان پێك هاتووە ، جگە لەمەش دەبینین بەدرێژایی ٢٣ سال بچووکترین گۆران لە ووتە و کردار و هەلسوکەت و کەسایەتی و ئامانجە کانیدا روونادات ، سەرجەم گوفتارەکانی قورئان لە ژیانیدا رەنگیان داوەتەوە و جیٚ بەجێکراون ، لە یەکەم رۆژدا چی ووتبێت ، لە دواین رۆژە کانیشی هەمان شتی ووتووە ..؟!

١٢- هەموو نووسەرێکی کتێب لە بەرهەمی نووسینەکانیدا بە گشتی دەکەوێتە ژێر کاریگەری هەلومەرج و ژینگە کەی دەوروبەری خۆی ناتوانێت لە چوارچێوەی تەسکی کات و شوێنکەی خۆی بە گشتی بچێتە دەرەوە ..؟! ئەگەریش چووە دەرەوە ئەوا بەدلنیایەوە بەرهەمەکانی یان کتێبەکەی لە زانستی خەیالی دەچن ..؟! کەچی کاتێك تەماشای قورئان دەکەین دەبینین دەربارەی سەرتا و کۆتایی گەردوون باس دەکات ، هەروەها بەدێهاتنی مرۆڤ و ژیانی داهاتووی ئادەمیزاد دەستەواژەی روون و قەتعی بەکاردەهێنیت ، بەم بەلگەیەش ناچار دەبین بلێن : نا گونجێت ئەمە ووتەی مرۆڤ بێت ..؟!

١٣- ئەگەر سەرنج بدەین هەر نووسەرێك کتێبێك زیاتر بەرهەمەکانی دەربارەی بوارەکەی خۆیەتی ، بۆ نموونە شیعر بێت یان بەتایبەتی لەم رۆژگارەی ئێستا دا کە پسپۆری گەشەیان کردووە ..؟! هەموو نووسەرێك لە بازنەی تەسکەکەی خۆیانن ، کەچی سەیرە قورئان گشت بوارە کانی ژیان دەگرێتە خۆ ..؟! تۆ سەرنج بدە قورئان لە مەر رابردوو دا کە چیرۆکی پێغەمبەران و پیاو چاکان دەگێریتەوە هەروەها لەسەر کتێبە ئاسمانیە کانی تریش دەدوێت ، هەروەها دەربارەی دا هاتووش دەدوێت ..؟! ئەی ئەم نیشانەی داهاتوو نیە کە قورئان فەرموویەتی ..؟!! (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝ فِىٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ۝ فِى بِضْعِ سِنِينَ ۗ لِلَّهِ ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُ ۚ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝﴾ [الرُّوم : ٢ - ٤] واتە: فارسەکان بەسەر رۆمەکاندا سەرکەوتن ..؟! لە نزیکترین زەوی ( شام ) لە ( فارس ) ـەوە، بەڵام لە دوارۆژدا و لەسەردەمێك لەسەردەماکان. کە لە دە ساڵ زیاتر و لەسێ ساڵ کەمتر نابێت. ڕۆم بەسەر فارسدا سەردەکەوێت ..؟! بێگومان کار وکردەوە وفەرمانەکان پێش سەرکەوتنەکە وپاش ئەویش هەر هەمووی بەدەست خوای پەروەردگارە، و لەو ڕۆژەدا. کە ڕۆم سەردەکەوێت بەسەر فارسەکاندا. باوەڕداران خۆشحاڵ دەبن بەسەرخستنی خوای پەروەردگار بۆ ڕۆمەکان بەسەر فارسەکاندا ..؟! وە چ عەقل و ژیریەك دە توانێت قبولی ئەوە بکات کە ئەو کتێبە لە لایەن نەخوێندەوارێك نووسرابێت ..؟!

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ﴾ [الشُّورَى : ٥٢]واتە : ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - تۆ پێش ئەوەی قورئانت بۆ بێت نەتدەزانی قورئان چیەو چی تیادایە وە ئیمان هێنان و درێژەی ئیمان چیە..؟

١٤- ئایا چ نووسەرێکی کتێب تحدای ئەوە دەکات کە بەرهەمەکەی یان کتێبەکەی لەداهاتوودا هیچ جۆرە رەخنە یەکی لیٚ ناگیریت ، یان هیچ هەلەیەکی نیە لە دارژتنی کتێبەکەی دا ..؟!

١٥-ئایا لە توانای هیچ مرۆڤێك دا هەیە کتێبێك بنووسێت بە ناوی هەموو جن وتوێژەکانەوە قسە بکات بۆ هەموو سەردەمێك وەك یاساو دادوەری بەکار بهێنرێت ..؟! وە بە یاسای ئە کتێبە بریار دەر بکەی ..؟! هەروەك (خوای گەورە ) دفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝٤﴾ [النَّجم : ٣ - ٤] واتە : وە لە هەواو ئارەزووی خۆیەوە قسە ناکات بەڵکو ئەوەی کە دەیڵێ قورئانەو..!! تەنها وەحیەو لەلایەن خوای گەورەوە بە وەحی بۆی هاتووە..!!

١٦-ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ نووسەری قورئان بوایە ، دەبایە لە کتێبەکەی دا ، هەر یەك لە بەدەست هێنانی مال و سامان دارایی و دەولەمەندبوون بکاتە ئامانج ..؟! بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ مال و سامانی نەبووە لە ٢٣سال پێغەمبەرایەتیە کەیدا ، تەنهانەت کاتێك لە ناو هاوەلە کانیش دا بووە ، گەراوە تەوە مالەوە ئەوەی هەیبوو بەخشیتی بە فەقیر و هەژاران ، جاری واش هەبووە سێ رۆژ نانی نەخواردووە ، جاری واش هەبووە لە برسان بەردی لە سەر زگی خۆی داناوە ..؟! تەنانەت وورد ووردە ژیانی هاوەلان لە مەدینە باش دەبوو ، خێزانە کانی پێغەمبەری خوا ﷺ داوی ژیانی باشتریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد ، ئەویش بۆ هەلبژاردن ژیانی دونیاتان بەلاوە گرینگتر یان ژیانی قیامەت ، ئەوانیش ژیانی قیامەتیان هەلبژارد ..؟! سەرە رای ئەوەش کاتێك جەنگی حونین بەر پا بوو ، موسلمانەکان دەست کەوتی جەنگی یەکجار زۆریان دەست کەوت ،دە گێرانەوە بۆ ئەو کات هەشت هەزار ئۆقە زیو بە سەدان ووشتر ، هەزاران مەر ومالات بۆ نەغەنیمەت ئەی لە جەنگی خەیبر ..؟! سەیرە بەلام لە کاتی وەفاتی دا پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئامانجی دابین کردنی هەندێك خۆراك بۆ خیزانە کەی قەلغانەکی لە رەهن دانابوو بەقەرز ، هێشتا نەیتوانی بوو وەری بگرێتەوە ..؟! ئایا قورئان کلامی خوایە ..؟! یان ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیویەتی ..؟!

١٧- چ مرۆڤێك یان چ نووسەرێك دە توانێت ئەوەندە متمانەی بە خۆ هەبێت ئەم دەربرینە بلێت : کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ۝١٦﴾ [البُرُوج : ١٦]واتە : خوای گەورە هەر شتێکی بوێ ئەنجامی ئەدات هیچ کەسێك نیە کە خوای گەورە بگەڕێنێتەوە لە کارێك کە بیەوێ ئەنجامی بدات..!! بەڵێ هەر بۆیە دەڵێن : قورئان کلامی خوایە ..؟!

١٨- ئایا ئەم ئایەتەی قورئان پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن زانستی پێ هەبووە ، رۆژێك لە رۆژان گەشتی دەریایی ئەنجامداوە ..؟! کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ يَلۡتَقِيَانِ ۝١٩ بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٞ لَّا يَبۡغِيَانِ ۝٢٠﴾ [الرَّحۡمَٰن : ١٩ - ٢٠] واتە: دوو دەریا هەیە کە بە یەك ئەگەن لە پێش چاو کاتێك تەماشا ئەکەی بە یەك گەیشتوون و تێکەڵ بوونە بەڵام.. !! لە نێوانیاندا پەردەو بەربەستێك هەیە کە نایەلێ تێکەڵ بن، ئاوی دەریاکە شوێرو سوێرە، وە ئاوی ڕووبارەکە سازگارەو تێکەڵ نابن..؟!

١٩-ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتی ئاسمانی ئەنجامداوە ئەم دەزگایانەی کەئێستا ئاژانسی سانا هەیە تی ..؟! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ۝٣٣﴾ [الأَنبِيَاء : ٣٣] واتە: وە پەرستراوی بەهەق ( اللَّه ) یە ئەو خوا باڵادەستەی کە شەوی دروستکردووە، بۆ ئەوەی خەڵکی تێیدا ئارام بن و پشوو بدەن، و ڕۆژیشی بەدیهێناوە بۆ ئەوەی داخوازی ڕزق وگوزەران بن تێیدا، و خۆری دروستکردووە وەکو

نیشانەیەك بۆ ڕۆژ، و مانگیش وەكو نیشانەیەك بۆ شەو، وە بۆ هەریەكەیان ڕێڕەو و خولگەیەكی تایبەت هەیە كە مەلەوانی ئاسا پێیدا دەڕۆن و لێی لانادەن ..؟!

٢٠- ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ ئ زانستی پزیشكی خوێندوە ..؟! (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ۝٤٥ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ ۝٤٦﴾ [النَّجم : ٤٥ - ٤٦]واتە: وە هەرخۆشی هەردوو جووتی . نێر و مێی . مرۆڤ و گیانلەبەرانی دروست كردووە و بەدیهێنانوە ..!! ئە وەش لە تۆوێك كە دەڕژێنرێتە ناو منداڵدانەوە ..؟!

٢١- ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ پسپۆری جیولوجی زەوەی ناسی بووە ..؟! كە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣﴾ [الرُّوم : ٢ - ٣] واتە: {جەنگی نێوان فارس و ڕۆم} [ غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) ] ڕۆمەكان بەسەركردایەتی (هیرەقل) تێكشكێندران لەسەر دەستی فارسەكان بەسەركردایەتی (سابور)..؟! [ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ ] لە نزیكترین زەوی لە زەوی عەرەبەوە [ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣) ] بەڵام ڕۆمەكان لە پاش تێكشكاندنیان سەر ئەكەونەوە بەسەر فارسەكاندا وە زاڵ ئەبن بەسەریاندا..؟!كەواتە : ئێستا زانستی جیولوجی دەری خستووە نزم ترین شوێنی سەر زەوی لە خاكی وەلاتی شامە یان لە (إن منطقة أغوار وادي عربة /البحر الميت/ الأردن) ...؟!!

قال تعالى: ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٢٤]

﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ﴾ واتە: ئینجا ئەگەر ئەم تان نەکرد ..؟! ﴿وَلَن تَفْعَلُواْ﴾ واتە : وە هەر گیز ناشی کەن (ئیتر بێ بروا مەبن) ، ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي﴾ واتە: دی خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی ..؟! ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ﴾ واتە : کە سوتەمەنیەکەی خەلکی( بەدر کار بەردە ) ﴿أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾ واتە : بۆ بێ بروایان ساز کراوە ، ئامادە کراوە ..!!

بەلێ جا ئەگەر نەیانتوانیوە تا ئێستا بهێنن ..؟! وە ناشتوانن لە مەو دواش بیهێنن ..؟! مادەم ئێوە کە دەزنن ئەم قورئانە فەرموودەی (خوای گەورە) یە ، دە کە وایە داواتان لێ دەکات تەنها (اللّٰه ) بپەرستن و ژاپەتی ئەم قورئانە نەکەن ، دە بترسن لەم ئاگرەی کە سووتەمەنیە کەی مرۆڤ بەردە ..؟! ئەم ئاگرەوش ئامادە کراوە بۆ کافران و خوا نەناسان ..!! لە راستی دا مرۆڤ ئەگەر بیەوێت ئاگرێت بکاتەوە دەبێت شتی بێ هێز بهێنین بۆ ئەوەی ئاگرەکە دا گیرسێت و بکاتەوە ، وەك پووش و پەلاش جیلکە داری بچووك هەروەها ئەو شتانەی کە زۆر گردە گرێت ، وەك : پووش و پەلاش ، غاغەز ، چیلکە داری بچووك ، نەفت ، بەزین ، غازی

شل ، بەلام لەم رۆژە دا داگیرساندنی یان گر گرتنەی ئاگر ، بە جستە و ئێسك پیستی مرۆڤە كان بەرد گر دەگرێت ،سە بارەت بە (بەرد ) زانایان دوو راوو بۆچوونیان هەیە لەسەر (بەرد ) ١-دەلێن : واتە : بەردی كبریتی رەشە . ٢- دەلێن : واتە : ئەو پەیكەرو بتانەیە كە لەدوونیان دەیان بەرستن ،لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ٩٨﴾ [ٱلۡأَنبِيَاء : ٩٨] واتە: ئەو كاتە پێیان دەوترێت : بێ گومان ئێوە ئەمرۆ لەگەل ئەو كەس و شت و بتانەی كە لە جیاتی (خوای گەورە ) دەتان نپەرست سوتەمەنی ئاگری دۆزەخن و دەبێ هەمووتان بچنە ناوی ..؟! بەلام (بە راو بۆچوونی خۆم مەبەست لە بەرد كە بۆ سووتەمەنی گر گرتنی ئاگری دۆزەخ ، ئەوا دەبێت (بەردی خەلووز) بێت ،ئەمە ش دە گونجێت ، كە لەگەل جستە ئێسك پیستی مرۆڤ ئاگری دۆزەخی پێ خۆش دەكەرێت ، جا دەبێت ئەو ئاگرە چەندە بەهێز بە تین و بە گر بێت ..؟! (الله اعلم ) واتە : (خوای گەورە ) زانا ترە ..!! ئەوەشی كە ئێمەی (ئەهلی سوننە و جماعە ) كە بروامان پێ یەتی بە ئاگری دۆزەخ كە ( خوای گەورە ) ئامادەی كردووە یان داینواە بۆ كافران و مولیحدەكان و مونافیقە كان ،كە زۆر بەهێزو بەتین و بە گرو پرشنگ هاوێژە ، بە چەندەها پلە لە ئاگری دۆزە بەهێزترە و بە تین ترە ، هەر خواش خۆش ئەزانێ چۆن چۆنیەتیە كەی چی یە ..؟!

هەروەها لەم سورەتەدا دە فەرموویێت قال تعالى: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ﴾ بێ گومان ووشەی ﴿ٱلنَّارَ﴾ هاتووە بە ناسراو ، بەلام لە سوورەتی التحریم دا بە نەناسراو هاتووە ..؟! قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ﴾ [التَّحۡرِيم : ٦] واتە : ئەی باوەڕداران خۆتان و ماڵ و منداڵتان بپارێزن لە ئاگرێك كە سووتەمەنیەكەی خەڵكی و بەردە، یاخود بەردەكە مەبەست پێی بتەكانە، خەڵكیش ئەچێتە ئاگری دۆزەخ وە ئەو بتانەیش كە ئێوە ئەتانپەرستن و كردبووتانن بە خوای خۆتان هەمووی لە دۆزەخدا ئەبن بە سووتەمەنی بۆ ئێوەو ئاگری جەهەننەمی پێ خۆش ئەكرێ و ئێوەی پێ ئەسووتێنرێ، جا خۆتان و ماڵ و منداڵتان بپارێزن لەو ئاگرە بەوەی پەروەردەیەكی جوانیان بكەن و فێرە دینیان بكەن و فەرمانیان پێ بكەن بە چاكەو ڕێگریان بكەن لە خراپە بۆ ئەوەی نەچنە ناو ئەو ئاگرەوە..!! هەروەها زانایانی تەفسیری قورئان دەلێن : ئایەتی سورەتی (البقرە ) بەلگەیە لەسەر ئەوەی كە ئاگرەكە لە لایەن ناسراوە ..!! كەواتە : دەیان زانی چ ئاگرێكە ، وە سووتەمەنیەكەی بەرد و خەلكە ، چونكە ووشەی ئاگر (ال ) چووتە سەر ووشەی﴿ٱلنَّارَ﴾ ، كە (ال ) العهدیە دێتن ، واتە : ئاگرە كە زانراوە ، بەلام ئەگەر سەرنج بدین لە ئایەتی سورەتی (التحریم ) (ال) نە چۆتە سەر ووشەی ﴿نَارٗا﴾ ئاگر ، واتە : نەناسراوە هاتووە كە بەلگەیە لەسەر ئەوە دەكات لە لایەن زانراو نەبووە ، واتە : ئاگرە كە نەناسراو بووە ..!! كە واتە : لێرە دا

بۆمان دەر دەكەوێت لە ئایەتی سورەتی (التحريم ) ئاگرە كە نە ناسراوە بەلام لە سورەتی (البقرە ) ئاگرە كە ناسراوە ، كەواتە : سیەفەتی چۆنیەتی پێك هاتەی گرو بلیسە ئاگرە كە روون دەكاتەوە كە دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٤] بەلێ پێك هاتەی ئاگرە كە لە خەلك بەردی كبریتە یان بەردی خەلووزە ، چونكە زۆ ئەم دوو پێك هاتەیە گر دەگرن ..؟! لێرە دا ووشەی ﴿أُعِدَّتۡ﴾ واتە: ئامادە كراو هەلدەگرێت ، كەواتە : بە كۆ دەنگی زانایانی( ئەهلی سوننە و جماعە) بەهەشت و دۆزەخ دورستكراوە یان ئامادەكراوە ، ئێستا بوونیان هەیە ..؟! ئەم ئامادە كردنە تەنها بۆ ئەو كەسانەیە كە كافران واتە : بێ باوەر كان مولیحدە كان موناfیقە كان زلم و ستە مكارەكان ئەوانەی دژایەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەكەن بە هەموو جۆرە كانیانەوە دەخرێنە نێو ئەم ئاگرەی كە لە پێشدا باسمان كرد ، واتە : ئاگرە كە زۆر بەهێز بەتین بە بلیسە و پرشنگ هاوێژە ، وە پێك هاتەی سووتەمەنیە كەشی لە خەلك و بەردی كبریت ،یان بەردی خەلوزە، كە گری ئاگرەكەی یەكجاز توند بەهێزە ، ئەوانەیش كە دە خرێنە ناوەی وە ك (خوای گەورە ) دفەرمووێت : قال تعالى: ﴿أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ٢٤﴾ واتە: ئاگر بۆ كافران ئامادە كراوە، دەبێت بە مال و دوا شوێنی كافرەكان ، بەلێ پاداشت لە جنسی كردەوەیە ، هەر كەسێك دلی رەق بێت وەك بەرد سزا دەدرێت بە بەرد ، لە بەر وتەی قال تعالى: ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ﴾ ...؟!

ئامرازی (لن) دەچێتە سەر فەرمانی رانەبردووە ، وە سوودی بۆ داهاتوو هەیە ، بەلێ ئامرازی (لن ) بۆ نەفی یان نەرێ كردنی هەمیشەیی یان ئاینده بە كاردێت ، واتە ئەم كارە بۆ بەردەوان هەر گیز رووناداتت لە ئێستا و لە ئایندەشدا ، بەلام ئامرازی (لم ) ناچێتە سەر فەرمانی رانەبردوو، بەلام(لم ) سوودی بۆ رابردوو و دا ئێستا هەیە ، واتە : هەر گیز لە رابردوو روونادا ، وە لە ئێسات ناتوانن ئەم كارە ئەنجام بەدەن ..؟! بێ گومان ١٤٤٥سالە ئەم موعجیزەیە گەورەو پایەدارە تا ئێستاش بەلكو لە ئایندەش دا هیچ كە سێك ناتوانێت وینەی سورەتێكی كورتی وە كو (الكوثر) بهێنێتەوە وە هەر گیز كەس نەیتوانیوە زەفەر بەم قورئانە ببات..؟! واتە رۆژی دوایش هەر وە بە پایەداری دەمێنێتەوە ، وە ك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ﴾ واتە: ئەگەر نەتانتوانی تاقە سورەتێك وەك قورئان بێنن ..؟! قال تعالى: ﴿وَلَن تَفۡعَلُواْ﴾ واتە : لە مەو لاش لە رۆژی دوایش هەر ناتوانن ..؟!

بەلێ بۆ دا هاتوو یان ئاینده ، واتە : مانای ئەم قورئانە لە رابردوو دا دابەزیوە كە ١٤٤٥ساڵ لەمەو بەر،بەلام لە كاتی دابەزینی دا تاكو ئێستاش رۆژ بە رۆژ زانست و علم پێش دەكەوێت ، تا كو ئێستاش زانستی مرۆڤایەتی هەر لەو پەری پێش كەوتن دا ، كە بەخیالی مرۆڤ دانەدەهات ئەو هەموو زانست تەكنەلۆجیا پێشكەوتنە گەشە بكات ، وەك : رەوانە كردنی كەشتی ئاسمانی بۆ ئەستیرەكان یان زانستی پیشە سازیی كانزایی یان زانستی تەكنەلۆجیا وەك تەلەفزیون سەتەلایت مۆبایل و كۆمبیتەر، تۆرەكانی كۆمەلایەتی ، هەروەها بە تەكنەلۆجیا كردنی كتێبەكان كە زۆر بە ئاسانی بەدەست دەكات ، هەرەها كۆپی كردنی ئاژەل جەندین زانستی پزیشكی پێشكەوتوو ..هتد

پرسیارە کە لێرە دایە ئایا هیچ کەسێك هەیە بلێ من داهاتوو یان ئاینده پێشبینی دەکەم ..؟! بێ گەمان وەلامی ئەم پرسیارە ئەوە یە دەلێین بۆ ئێمەی مرۆڤ (غیر منطق ) واتە: نا لۆژیکە یان نا زانستیە ..!! کەسی پێش بینی دورستی هەبێت بۆ داهاتوو یان ئاینده ، بێ گومان خەلکی گالتەی پێدەکات دەلێین یان ئەوە تا شێت بووە هورێنە دەکات ، یان ئەوە تا سحرو جادوو گەورو یان فالجیە جنۆکەکان یارمەتی دەدان ، کە جی جنۆکەش ناتوانێت پێش بینی داهاتوو بکات ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى:

﴿فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ١٤﴾ [سَبَإ : ١٤]واتە : جا کاتێك کە بڕیاری مردنی سولەیمانماندا جنۆکەکان نەیانزانی مردووە بە هۆی مۆرانەوە نەبێت کە لەگۆچانەکەیان دەخوارد کە خۆی دابوو بەسەریدا، و بەو هۆیەوە سولەیمان کەوتە سەر زەوی، لەو کاتەدا جنۆکەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەگەر غەیب وپەنهانیان زانیبایە ئەوا لەو ناڕەحەتی و سەرشۆڕی و کارە قورسانەدا نە دەمانەوە بۆ سولەیمان، کە گومانیان وابوو ئەو هێشتا زیندووە . ئەم ئایەتە بەڵگەی پووچەڵکاری ئەو بیروباوەڕەیە کە هەندێك خەڵکی تێدایە کە گوایا جنۆکە پەنهان دەزانن، چونکە ئەگەر پەنهانیان زانیبا ئاگایان لەمردنی سولەیمان دەبوو .عَلَيْهِ السَّلَامِ . و لەو سزا ڕیسواکارەدا نەدەمانەوە ..؟!



بێ گومان ئەوە تحدیەکی زۆر گەورە یە کە قورئان دەفەرمووێت قال تعالى: ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ وَلَن تَفْعَلُوا۟﴾ [البَقَرَةِ : ٢٤] واتە : خۆ ئەگەر لە ئێستادا نەتانتوانی .و لە ئاینده‌شدا هەر ناتوانن و مەحاڵە..؟!وە هەرگیزاو هەرگیز گرۆیی زەوی هەر هەمووی کۆ ببنەوە ناتوانن تحدیەکی ئاوا بهێنن ، هەروەك دەفەرمووی : قال تعالى: ﴿قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ٨٨﴾ [الإِسۡرَاء : ٨٨] واتە: بڵێ ئەگەر مرۆڤ وجنۆکەش هاودەنگ بوون لەسەر هەوڵی هێنانی هاوشێوەی ئەم قورئانە ئەوا ناتوانن هاوشێوەی بهێنن، ئەگەرچی هاریکار و پشتیوانی یەك بوون لەو کاردا ..؟! یان تحدایەکی تر دەکات بۆ هەموو زانست زانەکانی ئەوانەی لە بوارەکانی زیندەوەر ناسی زانستیان هەیە ناتوانن مێشێك دروست بکەن ..؟! کە دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ٧٣﴾ [الحَج : ٧٣]واتە: ئەی خەڵکینە نموونەیەك باسکراوە گوێی بۆ ڕادێرن وبیری لێبکەنەوە : ئەو بت وپەرستراوانەی کە جگە لەخوای پەروەردگار دەیانپەرستن بەهەموویانەوە ناتوانن تەنها مێشێك دروست بکەن، ئاخۆ چۆن لەوە گەورەتر دەتوانن ؟ وە ناشتوانن ئەوەی کە مێشێك لێیان دەبات لێیوەرگرنەوە، ئایا پاش ئەوە بێدەسەڵاتی تر هەیە ؟ هەردووکیان لاواز و بێدەسەڵاتن : داواکار کە بریتیە لە پەرستراوەکان جگە لە خوای پەروەردگار، ناتوانێت ئەوەی مێشێك

دەیبات لێی وەربگرێتەوە، وە داواکراویش کە مێشەکەیە، ئاخۆ چۆن دەگونجێت ئەم بت وپەیکەرانە لەکاتێکدا کە ئەوەندە بێدەسەڵات ودەسەوسانن بکرێن بە پەرسترا ؟! هەندێك دەلێن : قورئان و زانست هاوران یان یەك دەگرنەوە ، بەلام ئەم قسەیە تەنها مایەیی پێکەنینە سەر سورهێنەرە ..؟! چونکە ئێمە دەلێن : قورئان لە سەرووی هەموو زانستەکانە یان لە سەرووی خەیالی مرۆڤ دایە یان لە سەرووی هەموو تصوراتی مرۆڤەکانە ، چونکە قورئان هەر بە خۆی سەرچاوەی هەموو بنچینەی زانستەکانە ..؟!

لە (شداد بن أوس ) – خوا لی رازی بیت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی : ((أيُّها النَّاسُ إنَّ الدُّنيا عرَضٌ حاضِرٌ يأكُلُ منها البَرُّ والفاجِرُ ، وإنَّ الآخِرةَ وعْدٌ صادِقٌ يَحكُمُ فيها مَلِكٌ قادِرٌ يُحِقُّ الحَقَّ ويُبطِلُ فيها الباطِلَ ، أيُّها النَّاسُ فكونوا أبناءَ الآخِرَةِ ولا تَكونوا أبناءَ الدُّنيا فإنَّ كلَّ أمٍّ يَتبَعُها ولَدُها)).[1] واتە :ئەی خەلکینە: دونیا رووداوێکی ئێستایە یان (حاضر) ، کە لە چاکە کاران و خراپە کاران لیّ دەخۆن ، بەلام قیامەتیش بەلێنکی راست و دروستە ، پاشایەکی زۆر بەتوانا قادر واتە: (خوای بەرز بەدەسەلات ) تێدا دادپەروەری دەکات ، کە ئەوەی راست و حەق دامەزراوە ، ئەوەشی باتلە یان درۆیە باتل و پووچەل دەبێتەوە ، ئەی خەلکینە نەوەی قیامەت بن ، نەوەی دونیا نەبن هەرگیز ، چونکە هەموو دایکێك کورەکەی بەدوا دا دێت ..؟!

لە رێ (ابن اسحاق ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – لەسەر ووتەی : قال تعالى: ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٤] واتە: راست و دروست نیشان دەدات ..!!

لە رێ (سعید بن ابی عروبە ) لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – لە سەر ووتەی ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ﴾واتە : تۆ ناتوانیت ئەوە بکەیت ..؟! وە ناشتوانێت ئەوە بکەیت ..؟!

لە (ابی لیلی ) – خوا لی رازی بێت – دەلێت : ((صلَّيتُ إلى جَنبِ النَّبيِّ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ وَهوَ يُصلِّي منَ اللَّيلِ تطوُّعًا ، فمرَّ بآيةِ عَذابٍ فقالَ : أعوذُ باللَّهِ منَ النَّارِ وويلٌ لأَهْلِ النَّارِ)).[2] واتە: لە تەنیشت پێغە مبەری خوا ﷺ نوێژی سوننە تم دە کرد ، گوییی لیّ بوو دە پارایەوە دەی فەرموو : ( خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای سەختی ئاگر ، وەیل بۆ خەلکانی ناو ئاگری دۆزەخ ..!!

لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٤]

لە (ابو هریرە ) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : ((كُنَّا مع رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، إذْ سَمِعَ وَجْبَةً، فَقالَ النَّبيُّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ: تَدْرُونَ ما هذا؟ قالَ: قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قالَ: هذا حَجَرٌ رُمِيَ به فى النَّارِ مُنْذُ سَبْعِينَ خَرِيفًا، فَهو يَهْوِي

[1] -ابن القيسراني في ذخيرة الحافظ (١٠٧٠/٢).
[2] -سنن ابو داود برقم (٨٨١).

فی النَّارِ الآنَ، حتَّى انْتَهَى إلى قَعْرِها)).[١] واتە: لە کاتێك دا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دابووین ،گوێی لە گرمە یەك بوو ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : دە زانن ئەوە چی بوو ..؟! دەلێت : ووتمان : خوا پێغەمبەرە کەی زاناترن ..!!فەرمووی : ئەوە بەردێکە فرێدرایە نێو ئاگری دۆزەخە وە ، حەفتا پایز دە چێتەوە خوارەوە ، ئێستا گەیشتە بنەکەی ..؟!

✍ لە رێ (الشعبی ) لە (عبداللە بن مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ئەگەر یەکێك لە ئێوە بیری لە ئاگری دۆزەخ کردوە با پەنا بگرێت بەخوا ، وە ئەگەر یەکێك لە ئێوە بیری لە بەهەشت کردەوە ئەوا با دوای چوونە بەهەشت لە (خوای گەورە ) بکە ..!!

📖 لە (انس بن مالك ) – خوا لی رازی بیت – دەلێت ((تلا رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ هذه الآيةَ وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ فقال : أُوقِدَ عليها ألفَ عامٍ حتى احمرَّتْ ، وألفَ عامٍ حتى ابيضَّتْ ، وألفَ عامٍ حتى اسودَّت ، فهي سوداءُ مظلمةٌ ، لا يُطفَأُ لهيبُها)) .[٢] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە قال تعالی: ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٤] واتە: فەرمووی : هەزار سال ئاگر گری تێبەردرا تاکو سوور بوویەوە ..؟! هەزار سال ئاگر گری تێبەردرا تاکو سپی بوویەوە ..؟! هەزار سال ئاگر گری تێبەردرا تاکو رەش بوویەوە ..؟! وەك رەشییەکی زۆر تاریك ..؟! هەر گیز بلیسەی ئاگرە کە ناکو ژێتەوە ..؟!

✍ لە رێ (عمرو بن میمون ) لە (عبداللە بن مسعود ) – خوا لی رازی بێت – لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٤] دەلێت : ئە بەردەی کە لە قورئان باسکراوە بەردی کبریتە ، (خوای گەورە ) چۆنی بیوێت دروستی کرووە ..)[٣]

✍ لەرێ (السدی ) لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بیت - لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَٱلۡحِجَارَةُ﴾ دەلێت : ئەو بەردی ئاگری کبریتی رەشە ، لە گەل ئاگر بۆ ئەشکەنجە دانە ..).[٤]

✍ لە (عمر بن میمون ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلێت : ئەو بەردە بەردی کبریتە ، (خوای گەورە ) دورستی کردووە لە رۆژی دورست کردنی ئاسمانە کان و زەوەی دا ، لە ئاسمانی دونیادا ، ئامادەی کردووە بۆ کافران یان بێ باوەران ..).[٥]

---

[١] -صحيح مسلم برقم (٢٨٤٤).
[٢] -شيخ الالباني في الضعيف الترغيب (٢١٢٧).
[٣] -اخرجه عبدالرزاق (٤/١) ، وهناد في كتابه الزهد (٢٦٣) ، وابن ابي الدنيا في صفة النار (٤٥٠/٦).
[٤] -اخرجه ابن جرير (٤٠٤/١).
[٥] -اخرجه ابن جرير(٤٠٣/١).

✍ لە ڕێ ( ابن ابی نجیح ) لە (مجاهد ) – ڕەحمەتی خوای لی بیت – لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ﴾ دەڵێت : بەدرێکە کە بە لاشەیان دەکەوێت بۆگەنی دەکات ، ئەوە کبریتە ، (واتە: کبریت بۆنێکی ناخۆشی هەیە ) .[١]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – ڕەحمەتی خوای لی بیت – لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ﴾ دەڵێت : ئەم بەردە لە ژێر زەوەی دووەم دان ، وەك : کبریت ، لەسەر گەردنیان دایە ، ئەگەر ئاگری گرت و دەسووتێت هەموو ڕۆژە کە ، درەو شانەوەی لەسەر دەم چاویان دا ، ئەوەش (خوای گەورە ) دەفەرموویێت قال تعالی: ﴿أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجۡهِهِۦ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ﴾ [الزُّمَر : ٢٤] واتە: ئازارێکی زۆر توندو بەشدەت لە ڕۆژ قیامەت دا واتە: مانای قال تعالی: ﴿يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ [الزُّمَر : ٢٤] ..)[٢]

✍ لە ( سفیان الثوری ) – ڕەحمەتی خوای لی بیت – لەسەر ووتەی ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ﴾ دەڵێت : واتە : بەردی کبریت ..).[٣]

✍ لە (ابن عطية ) – ڕەحمەتی خوا لی بیت – لە سەر ووتەی (عبدالله بن مسعود ) – خوا لی ڕازی بیت – دەی لێت : ئەو بەردە بەردی کبریتە ، چونکە لە هەموو بەردەکان زیاتر و تایبەت مەندی ترە ، پێنچ جۆرە ئازاری تێدایە ..؟؟!! ١-خێرا دە سووتێت یان گر دە گرێت. ٢-بۆنی زۆر بۆگەن و ناخۆشە. ٣- دووکەڵێکی زۆری هەیە ،٤- وە زوو بە جستەی مرۆڤ دە نووسێت یان دەلكێت.

٥-وە گەرمیەکەی یەکجار بە هێزە ، ئەگەر گەرم دا هات ..).[٤]

📖 لە (ابو هریرە ) – خوا لی ڕازی بیت – دەڵێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((نارُ بَنی آدمَ الَّتی توقِدُون جزءٌ من سَبعينَ جُزءًا مِن نارِ جهنَّمَ فقال رَجلٌ : إن كانَت لكَافيةً ، فقالَ : لقَد فُضِّلَت علَيها بتِسعةٍ وستِّينَ جُزءًا حُرًّا فَحرًّا)).[٥] واتە : ئە ئاگرەی کە ئادەمیزا بە کاری دەهێنی بۆسوتاند ،(واتە: مەبەست پێی ئاگری دونیایە ) بەشێکە لە حەفتا

[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٦٤/١).
[٢] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٤/١).
[٣] -تفسير سفيان الثوري ص ٤٢ .
[٤] - تفسير ابن عطية (١٤٩/١).
[٥] - صحيح مسلم برقم (٢٨٤٣).

بەشی گەرمی ئاگری دۆزەخ دا ، ووتیان : ئەگەر هەر ئەمیش بوایە بەس بوو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، (واتە : مەبەستیان لە ئاگری دونیا بووە ) ، ئەویش فەمووی : دۆزەخ شەست و نۆ پلە گەرمیەکەی زیاتر بە وێنەی گرمی دونیا ..؟!

لە (ابو هریرە ) – خوا لی رازی بیت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((أترونها حمراءَ كنارِكم هذهِ ؟ ! لَهِيَ أشدُّ سَوادًا من القارِ و ( القارُ ) الزِّفتُ)).[1] واتە : ئایا دەروانن کە ئەو ئاگرە سوورەی ئێوە لە دونیادا کە دەتان سووتێنیت ..؟! کە زۆر توندو رەش ترە لە قیر و زفت ترە یان خراپ ترە ..؟!

لەری (ابن اسحاق ) لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ٢٤﴾ دەلێت : بۆ هەر کەسیچك لە سەر هاو وینەی ئێوە بوون واتە : کافرە کان یان بیٚ باوەرکان ..).[2]

لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلێت : ﴿أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ٢٤﴾واتە: یەکخواپەرستی ،وە ترسان لە (خوای گەورە ) کەچی نەدە رتسان ، دەلێت : بە درۆیان دەخستەوە ، ئەو ئاگرەش بۆ سووتاندنی ئەو خەلکە، بە بەردی کبریت ئامادە کراوە ..؟! .[3]

قال تعالى: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنۡهَا مِن ثَمَرَةٖ رِّزۡقٗا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗاۖ وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٥﴾ [البَقَرَةِ : ٢٥]

قال تعالى: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ﴾ واتە: ئەی ﷺ موژدە بدە بە وانەی ،قال تعالى: ﴿ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ واتە: کە باوەریان هێناوە و کردەوەی چاکە یان ئەنجامدا وە ، قال تعالى: ﴿أَنَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ﴾ واتە: بیٚ گومان بۆ ئەوان هەیە بە هەشتانێك،قال تعالى: ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ واتە : کە جۆگەو رووبارو ئاوی زۆر بە ژێر یان دە رواتە ،قال تعالى: ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنۡهَا مِن ثَمَرَةٖ رِّزۡقٗا﴾ واتە: هەر کاتیٚ لەویٚ رۆزی یان بدریٚت لە میوە هات ،قال تعالى: ﴿قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُ﴾ واتە: دەلێن : ئەمە ئەوەیە کە لەمەو پێش پێمان درا ، (جیاوازە لە تام و بۆندا ) ، قال تعالى: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗا﴾

[1] - شيخ الالباني الصحيح الترغيب (٣٦٧٠).
[2] -اخرجه انب اسحاق في تفسير ابن كثير القران العظيم (٩٠/١).
[3] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٤/١).

واتە: ئێستا نموونە یان هێناوە یان وێنە یان هێناوە ، قال تعالى: ﴿وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ واتە: وە لە و بەهەشتانەدا بۆ ئەوان هەیە هاوسەرانی پاکیزە ، قال تعالى: ﴿وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٥﴾ واتە : وە ئەوانە لەو بەهەشتانەدا بۆ هەتا هەتایێ بۆ هەمیشەیی دەمێنەوە ..؟! بەلێ جا هەروەها (خوای گەورە ) لە زۆر شوێندا لە قورئانی پیرۆز دا باسی (بەهەشت و دۆزەخ ) دەکات، جا ئێمەی ئیمانداری موسلمان دەبێت باوەری راستەقینەی تەواومان هەبێت کە (بەهەشت و دۆزخ ) ئامادە کراوە بۆ ئەوانەی لە ژیانی دونیادا بە پێ کاروکردەوەکانیان جا ئەوانەی چاکە کارن لە دونیادا دەخرێنە بەهەشت یان ئەوە تا خراپە کاری و بێ باوەرن لەدونیادا دە خرێنە دۆزەخ ، جا بە دلنیایەوە ئێمەی موسلمانی راستەقینە دەبێت باوەری تەواومان بە (بەهەشت و دۆزەخ ) هەبێت کە ئامادە کراوان بەلام نازانین لە شوێنیان لە کوێن ..؟! وە نازانین چۆنن ..؟! وە ناش زانین خۆشی و ناخۆشیە کانی چۆنن ..؟! بە گوێرەی خەیالی دونیادا سیفە تەکانیان دەنرخێنین ..!! ئەمانە هەر هەمووی (خوای گەورە )ئەیزانی و عالمە پێیان ،یان ئەو خۆشی و شادییە چی یە و چۆنە ..؟! یان ئەو ناخۆشی ئێش و ئازارەی هەیە چی یە چۆنە ..؟! ئەمانە مەگەر هەر خودا خۆی بیزانێت بە ئێمە باس ناکرێت ..؟! بەلێ لە دوو ئایەتی پێش تردا، واتە: لە ئایەتی (٢٣-٢٤) کە باسمان کرد، باسی کافران و بێ باوەران دەکات ، کە تحدایە کی راستەقینە یان دە کاتە کە ئەگەر ئێوە گومان لەم قورئانە دەکەن ،کە ناردوومانە بە سەر بەندەکەمان ﷺ ، ئێوەش وەك ئەم قورئانە سورەتێك بهێنن ، هاوێنەی ئەم قورئانە ، هەروەها پێ شیان دەفەرمووی : ناتوانن هەرگیز هاوێنەی ئەم قورئانە بهێنن..؟! دواتریش باسی ئەو کەسانە دەکات کە بێ باوەر بوون ن هەورەها شوێنیان ناو ئاگری دۆزەخە سوتەمەنی ئاگرە کەش خەلك و بەردی کبریتە ، ئەم دۆزەخەش ئامادە کراوە بۆ کافران یان بێ باوەران ، بەلام ئایەتی دواتر کەواتە: ئایەتی ٢٥ سورتی (البقرە ) موژدەی دەداتە بە ئیمانداران ئەوانەی کردەوەی چاکە ئەنجامدە دەن ، بەهەشت بۆیان ئامادەکراوە ،وە رووبارە جۆکە کان بە ژیر باغەکانی دادەروات چەندە میوە میوە زاتی تێدایە ، هەروەها هاوسەرانی پاکیزە بۆ ئیمانداران ئامادە کراوە ..؟!

بەلێ کاتی باسی سزایی خوانە ناسانی کرد ، ئینجا موژدە دەدات بە ئیمانداران ، کە پاداشتیان بۆ هەیە ، ئەوانەی کە خاوەنی کردەوەی چاکە کانن ، لەسەر نەخشە رێگای (خوای گەورە ) لە قورئاندا هاندان بۆ چاکە کردن و ترساندن لە خراپە کاری پێکەوە کۆ کردوەتەوە ، بۆ ئەوەی بەندە برتسیچ و بە ئومێد بێت ..؟! جا دە فەرموویت : قال تعالى: ﴿وَبَشِّرِ﴾ واتە: ئەی ﷺ ئەو کەسە شی لە جێگای ئەوان بانگەوازی دەکات ،قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتە: لە ناخی دلە کانیانەوە ئیمانیان هێناوە ، قال تعالى: ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ واتە : کارو کردەوەی چاکەیان کردووە ، بە ئەندامەکانی جستەیان ،باوەری خۆیانیان سەلماندووە بە کردەوەی چاکە ، بەلێ وەسفی کارە چاکە کانیانی کردووە بە ﴿ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ، چونکە بە کاری چاکە بارودۆخی بەندە چاك و پاك دەبێت لە کارو بارەکانی دین دونیادا ، هەر بەم هۆیەشەوە خراپەکاریان نامێنی دەروات ، جا مرۆڤ بەمە دەبیچت یەکێك لە چاکە کاران ، ئەوانە کە شایستەن دراوسێیەتی (خوای گەورە ) بن لە بەهەشتە کەیدا ..؟! بەلێ موژدە یان پێ دەدات بە قال تعالى: ﴿أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ﴾ واتە: باغ وباغاتێکی کۆکەرەوە لە دارو دەرختی جوان نایاب و سەر سور هێنەر ! و بەر هەمی جوان سێبەری

دریێژو دلڕفێن ، لق بەروبوومی نایاب ، بەلێ هەر بەمە بۆتە بەهەشتێك مەگەر تەنها خوا بزانێت چەندە خۆش دلرفێنە هەرگیز خۆشی بەهەشت بە خەیالی هیچ مرۆڤێك دانایەت بەلکو لە سەرووی هەموو خەیالەی مرۆڤ دایە ..؟! بەلێ بۆتە بەهەشتێك کە ناوە وەی بە باغ باغات رازێنراوە تەوە ، ئەو کەسەی کە تێدا نیشتە جێ دەبێت ئەوا لە نازو نیعمەتی ئەم بەهەشت پاداشت دە کرێت ، ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ واتە: جۆگە و کانیاو رووباری ئاو وە رووباری هەنگوێن و وە رووباری شەراب ، بە ژێر باغەکان و درەختەکانی دادەروات ، شانازی پێوە دەکەن کە چۆن بیانەوێت ، بۆ هەر جێگایەك بیانەوێت بەکاری دێنن ، ئەو داروو درەختانە ئاوی لێ دەخۆنەوە، جۆرەها بەروبووم بە بەرهەمی رەنگاو رەنگ پێشکەش دەکات ، ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنۡهَا مِن ثَمَرَةٖ رِّزۡقٗا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُ﴾ واتە: هەر کاتی لە بەهەشت دا خواردنەمەنیە کیان پێ دەدرێت لە مێوەکانی بەهەشت دەلێن : ئەمە ئەوەیە کە لەمەو پێش خواردمان یان بینیمان یان هێناتان بۆمان ، واتە: ئەمە لەو رەگەزە یە یان لەم مێوەیە یان لەم سیفەتەیە ، هەموویان وەك یەك وان یان لە یەکتر دەچن شێوە و وێنەیان وەك یەکە لە جوانی وە لە تام لە لەزەتدا ،ئەوانە هیچ کاتێکی بەتالیان نیە جگە لە خۆشی چێژ وەرگرتن لەخۆشیە کانی بەهەشتدا ، ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗا﴾ واتە: دەوترێت : لە ناودا لە یەك دەچن ، چیاوازن لە تام چێژو بۆن ..؟! دە وترێت : لە یەك دەچن لە رەنگدا ، لە ناو جیاوازن ..؟! دەوترێت : هەندێکیان لە هەندێکی دەچن لە جوانی و لە زەت و خۆشیدا ..؟! کەواتە : لە تام بۆن لەزەت و رەنگ جوانی شێوە مێوە کانی جیان ، واتە دەرکرێت دوو لە مێوەکان شێوەیان لێك بچێت بەلام لە بۆن جیاوازبن ، یان دەکرێت دوو مێوە شێوە یان لێك بچێت بەلام لە تام جیاواز بن ، هەرەها دەکرێت لە بۆن جیاواز بن بەلام لە تام لێك بچن ، ئابەم شێوەیە بەهەشتە کان دەلێن : مەگەر تازە ئەو جۆرە مێوەیەتان بۆ نەهێناین.؟! واتە : مێوە کان و بەروبوومەکانی بەهەشت ئەوەندە زۆرن ئەوەندە بەتام چێژن ، بە خەیالی هیچ کەس نایەت ..؟!!

﴿وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ﴾ واتە: لەم بەهەشتە دا بۆ ئەوانەی ئیمانی راستەقینەیان هێناوە کاور کردەوەی چاکەیان ئەنجام داوە ، هاوسەرانیان بۆ ئامادە کراوە کە هاوسەرانێکی پاکیزە هەیە بۆ یان ، دەوترێت : پاکیزە لە عەیب وعار ، چونکە لە بەر ئەوە هەمو جۆە کانی پاگیزە دەگرێتەوە یان دەگرێتە خۆ ..؟! وەکو پاکیزەی لە رەوەشت بەزری دا ، یان پاکیزەی لە دروست کردنیان کە هیچ کەم کوریەکیان نیە لە جوانی ، یان پاکیزەی لە زمانیان چونکە زمانیا پاکە تەنها بەو پەری رەوشت بەرزی دەدوێن لە گەل هاوسەرە کانیان دا بە ووتەی شرین و جوان قسەیان لە گە دەکەن ، پاکیزەی لە چاوەکانیا چونکە چاوەکانیان تەنها هاوسەرانی خۆیان دەبینێ ،هاوسەرەکانی خۆیان یان مێردەکانی خۆیان زۆر خۆش دەوێت ،بۆیە لە لای مێردەکانیان زۆر خۆشە ویستن ، وە بە ئەدەب رەوشت لە قسە کانیان و لە کردارەکانیادا ، بەلێ زۆر پاکیزەن لە بەجوانیەکی زۆر سەرنج راکێش و سەر سورهێنەر ..؟! پیاوەکانیا تەواو شەیدا دەکەن ، بێ گومان هیچ ناتەواویەکیان تێدا نیە ، بەلکو جوان و شۆخ شەنگن ،جگە لە هاوسەرەکانیان چاو بۆکەسی دیکە هەلنابرن ، زمانە کانیشیان پاراوە و پارێزراوە لە هەموو قسەیەکی ناشرین ..؟! ﴿وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٥﴾ واتە: ئینجا ئەوانە لەم شوێنەی کە باسمان کرد واتە : بەهەشت بۆ هەتاهەتایی بۆ هەمیشەیی لەم شوێنە دا دەمێنەوە دوامەنزلیان دەبێت ...؟!!

بەڵێ ئەوانەی کە باسمان کرد کە جۆرەها رووباور جۆگە و جۆرەها درەختی بەرهەمدار جۆرەها میوە و میوەهات بە خەلات و پاداشت دانراوە بۆ موسلمانان ئامادەکراوە ، بەلام پرسیارە کە لێرە دا کام موسلمان ..؟! ئایا ئەو موسلمانانەی کە کاور کردەوەی خراپە یان ئەنجام داوە ..؟! یان خیانەت دووڕووی و مونافق بوونە ..؟! یان جاسوس و نمیم و بوختان چی بوونە..؟! یان دز جەردە مافیان گەندەل کار بوونە ..؟! یان زوڵم ستەم و ئازاری ئەشکەنجەی جستەی دەروونی برایانی موسلمانانی تریان داوە ..؟! یان مافی خەلکیان پێشەلك کردووە ئازادەیەکانیان تەسك کردۆتەوە بۆ بەرژەوەندی خۆیان ..؟! یان ئەمانەتیان نەپاراستووە خیانەتیان لە پێگە کەی خۆیان کردووە بەخراپ بەکاریان هێناوە بۆ بەرژەوەندی خۆیان ، یان ئەوانەی بانگەشەی چاکسازی دەکەن و کەچی خۆیان تۆی خراپە بەلاو دەکەنەوە ..؟! بێگومان بە دلنیایەوە ئەم شوێنە واتە : بەهەشتی نەبراوە فروان شوێنی ئەوانە نیا کە دەربارەیان بسمان کرد ، بەلکو شوێنی چاکە کارانە بە کردەوە چاکە کانیان لە ژیانی دونیادا ، بەلێ شوێنی ئەو موسلمانانەیە کە کاور کردەوەی چاك و رێك پێکیان ئەنجامداوە ، دوور کەوتووەتنەوە لە خراپەکاری فەرمانیان کردووە بە چاکە کردن لە گەل خەلکی دا ، (خوای گەورە) یان بەتەنها پەرستووە (توحید) یەکتاپەرستیان دامەزراو بووە براویان تەنها بەخواو پێغەمبەرکەی ﷺ هێناوە ، براویان بە رۆژی قیامەت هەبووە نوێژو رووژوو هەموو عیبادەتەکانیان بەچاکی ئەنجامداوە ، خێرو چاکەیان کردووە تەنها پشتیان بەخوا بەستووە ، تەنها پارانەوەکانیا بۆ خوای گەورە بووە ، ئەمەشە ئەو بەلگەیە کە تەنها باوەر هێنان بێ کارو کردەوە ئەنجامی نابێت بۆچوونە بەهەشت.

📖 لە (انس بن مالك) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :((ليسَ الإيمانُ بالتَّمنِّي ولكنهُ ما وقرَ فى القلبِ وصدَّقَهُ العملُ)).[1] واتە: بە تەنها ئیمان ئاوات خوز نابی ، بەلکو دەبێت لە دلدا جێگیر بێت بە کرداریش کردەوەی چاکە خێر صەدقە بیسەلمێنی ..؟!



قال تعالى: ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بەلێ کردەوەی چاکە دوو مەرجی سەرەکی هەیە ئەمانەن:

١- دەبێت بە ئەخلاص و نیازی پاکی تەواو و دامەزراوە تەنها بۆ (خوای گەورە ) بێت ..!!

٢-دەبێت رەزامەند بێت، یەك بگرێتەوە لە گەل قورئان و سوننەت شەریعەتی (خوای گەورە) و پێغەمبەرەکەی ﷺ ..!!

بەلێ هەر لە بەر ئەوەیە پێ دەلێن : کردەوەی چاکە ، چونکە دین و دونیا و دوا رۆژییش باش دەبێت واتە رۆژی قیامەتی خێردەبێت.

﴿جَنَّٰتٍ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٥] بە کۆ هاتووە ، بەلام ﴿ٱلۡجَنَّةَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٥] بە تاك هاتووە ، لە زمانەوانیدا واتە : بێستان باخچە و مێرگ و دارو درەختی بەرهەم دار و سەوزایی هەر لەبەر ئەمەش پێ دەلێن : ﴿ٱلۡجَنَّةَ﴾ چونکە ناوەوەی هەر هەمووی داپۆشراوە بە دار درەخت و جۆرە ها مێوە زات بەرووبوومی بە لەزەت ، هەروەها باسی سیفەتی ئەو باخانەی کردووە کە رووبارە کان بە ژێر درەختە کان و باخەکان دا دەروات ، هەروەها بەم رووبارانە لەسەر شویچنی راست دەروات نە دۆل شوینی خوار خێچ دا ، ئەگەر

[1] -محمد جار الله الصعدي في النوافح العطر ص ٢٨٧.

سەرنجی ووتەی ﴿مِن قَبۡلُ﴾ ئەمە ظرفي زمانە ئاوەلناوی کاتیە بۆ کات بە کار دێت ، واتە : لە دونیادا پێ مان دراوە ، ئەم ووتەیەش ﴿مِن قَبۡلُ﴾ دوو مانا لە خۆ دەگرێت : یەکەمیان : ئەوان دەڵێن ئەم بەڵێنە بە ئێمە درا بوو لە ژیانی دونیا ، کە لە بەهەشت ئەم بەرو بوومەو مێوە زاتە پێمان دەدرێت ..!! دووەمیش : ئەم بەرو بووم و مێوە زاتە خۆ لە دونیاش بە ئێمە درا بوو..!!

چونکە ڕەنگی وەك ڕەنگی مێوە و بەرووبوومی دونیایە ، بەلام کاتێك دەی خۆن هەست دەکەن تامەکەی تامێکی ترە ، وەك تامی دونیا نیە ، ئەم رایەش ووتراوە لەسەر ووتەی ﴿مِن قَبۡلُ﴾ واتە: لە بەهەشتە ، چونکە مێوە و بەروو بوومیان بۆ دەهێنن پاشان جاریچکی تر مێوە و بەرووبوومیان بۆ دەهێنەوە ، واتە : لە سەرتایی رۆژی بەهەشت دا خواردنەکە یان بەرو بوومەکە یان بۆ دەهێنن لێ دەخۆن ، لە کۆتایی رۆژی بەهەشت دا دووبارە خواردنەکە یان بەروو بوومەکەیان بۆ دەهێنن دوو بارە لێ دە خۆن ..؟! ئەوان واتە : بەهەشتیە کان دەڵێن : ئەم خواردنە پێشتر بە ئێمە درا بوو ، واتە : لە سەرەتایی رۆژدا ، چونکە رەنگیان وەك یەکە وایە ، کاتێك کە دەی خۆن هەست دەکەن تامەکەیان وە ك یەك نیە یان جیاوازە ..!! ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗا﴾ واتە: هەندێکیان وەك هەندیچکی ترن لێك دەچن لە وێنە دا یان لە دیمەندا ، بەلام تامیان جیاوازە ، قال تعالی: ﴿وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ۝٢٥﴾ واتە: هەروەها لەوێدا هاوسەرانی پاکیزە و بێگەردیان بۆ ئامادەکراوە ، ئەو بەختەوەرانە ژیانی هەمیشەیی نە براوە لە و بەهەشتە دا بۆ هەتا هەتایی دەبەنە سەر ..؟!



بێ گومان ئەگەر سەرنج بدەین سەر ووشەی ﴿أَزۡوَٰجٞ﴾ بە کۆ هاتووە ، بەلام ووشەی قال تعالی: ﴿زَوۡجَهُۥٓ﴾ [الأَنبِيَاء : ٩٠] بە تاك هاتووە ، بەلێ ووشەی (ازواج) کۆیە ، ووشەی (زوج ) تاکە ، لە زمانە وانیدا دژی (وترە ) یان دژی تاکە ، بەلێ واتە : بە جووت هاتووە ، (زوج ) بۆ پیاو ئافرەت بەکاردەهێنرێت ، ووشەی ﴿مُّطَهَّرَةٞ﴾ واتە: پاگیزە ، ئەم ووشە یە تەنها بۆ مێنەیە چونکە لە زمانی عەرەبی دا (التاء تأنیث ) هاتووە ، بەلی ووشەی ﴿مُّطَهَّرَةٞ﴾ وە سفە بۆ مێینە لە زمانی قوریشدا ، هەروەها لە چەند شوێنێکی قورئاندا ووشەی (زوج) بۆ ئافرەت بەکار هاتووە ، قال تعالی: ﴿وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٣٥﴾ [البَقَرَةِ : ٣٥]واتە : وە خوای پەروەردگار فەرموی : ئەی ئادەم خۆت وحەوائی هاوسەرت لە بەهەشتدا نیشتەجێ بن، وخۆش بگوزەرێنن وچێژ وەربگرن بە بەربومەکانی و بە فراوانی لێی بخۆن لە هەر کوێیەك حەزتان لێیەتی، ونزیکی ئەم دارە مەکەونەوە بۆ ئەوەی نەکەونە تاوان و سەرپێچیەوە، و بەو هۆیەشەوە ببن بەزێنەرانی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار ..!! لە زمانی بەنی تمیم بە ئافرەت دەڵێن :(زوجة) ، هەروەها لە

📖 لە (محمد بن سيرين ) – خوا لى رازى بێت –دە لیت : (( إما تفاخروا وأما تذا كروا : الرجال فى الجنة أكثر أم النساء ..؟! فقال (ابو هريرة ) : أولم يقل أبو القاسم ﷺ : إن أول زمرة تدخل الجنة على صورة القمر ليلة البدر، والتى تليها على أضوا كوكب درى فى السماء ، لك امرئ منهم زوجتان اثنتان ، يرى مخ سوقهما من وراء اللحم ، وما في الجنة أعزب ..؟!))[١] محمد دەلێ : خەلكى يا شانازيان كرد يان باسيان كرد : ئايا پياوان لە بەهەشتا زۆرترن يان ئافرەتان..؟!(ابو هريره ) – خوا لى رازى بيت – ووتى : ئەى (ابو القاسم ) ﷺ نەى فەرموو : يەكەمين دەستە كە دەچنە بەهەشتەوە لە سەر شێوەى مانگى چواردە ن ، دەستەى واى ئەوانيش لەسەر شێوەى درەخشاوەترين ئەستێرە ن لە ئاسماندا ، هەر پياوێك لەوانە دوو هاوسەرى هەيە يان ژنى هەيە ..؟! موخى لاقيان لە ديوى گۆشتە كەى ديارە ، لە بەهەشتدا رەبەن نيە واتە : بێ ژنى نيە ..؟!

📖 لە (انس ب مالك ) – خوا لێ رازى بيت – دەلێت : لەپێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( إن فى الجنة لشجرة يسير الراكب فى ظلها مئة عام لايقطعها )) .[٢] واتە: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : لە بە هەشتا درەختێك هەيە ، سەد ساڵ سورا بە سێبەرەكەى دا بروات و نايبرێت ..!!

📖 لە (ابو سعيد الخدرى ) – خوا لى رازى بيت – دەلێت : لە پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : ((إن فى الجن لشجرة ، يسير الر اكب الجواد المضمر السريع مئة هام ما يقطعها )).[٣] واتە: لە بە هەشتا درەختێك هەيە ، سوارى جوست چالاك و خێرا يان سريع ، سەد ساڵ دەروات نايبرێت ..!!

📖 لە (ثوبان مولى رسول الله ﷺ ) – خوا لى رازي بيت – دەليت: لە پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: (( إن الرجل إذا نزع ثمرة من الجنة عادت مكانها أخرى )) .[٤] واتە : كاتيچك پياوێك ميوە يەك لە بەهەشت بۆ بێت ، لە شوێنى دا ميويەكى ترى شوێنى دەگرێتەوە ..!!

📖 لە (ابو هريره ) – خوا لێ رازى بێت – دەلێت : لە پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( سيحان وجيحان ، والفران والنيل كل أنهار الجنة )) .[٥] واتە: (( سيحان وجيحان ، والفران والنيل)) هەمووى لە رووبارە كانى بەهەشتن ..!!

---
[١] -صحيح مسلم برقم (٢٨٣٤).
[٢] - صحيح البخاري برقم (٣٢٥١).
[٣] -صحيح البخاري برقم (٦٥٥٣).
[٤] - شيخ الالباني ضعيف الجامع (١٤٤٦).
[٥] - صحيح مسلم برقم(٢٨٣٩) .

له (ابو هريره ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( فرجت أربعة أنهار من الجنة : الفرات ، والنيل ، وسيحان ، وجيحان )) .[١] واتە : چوار رووبار لە بەهەشتدا دەرژێن : (الفران ، والنيل ، وسيحان ، وجيحان) ..!!

له (ابو هريره ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((يُقالُ لأهْلِ الجَنَّةِ: يا أهْلَ الجَنَّةِ خُلُودٌ لا مَوْتَ، ولِأَهْلِ النَّارِ: يا أهْلَ النَّارِ خُلُودٌ لا مَوْتَ)).[٢]

له(عبدالله بن عمر ) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إذا صار أهل الجنة إلى الجنة ، وصار أهل النار إلى النار ، أتي بالموت حتى يجعل بين الجنة والنار ، ثم يذبح ، ثم ينادي مناد: يا أهل الجنة لا موت ، ويا أهل النار لا موت ، فيزداد أهل الجنة فرحا إلى فرحهم ، ويزداد أهل النار حزنا إلى حزنهم ..؟! )).[٣] واتە: کاتێك بە هەشتیە کان بەرەو بەهەشت یەکلایی کرانەوە ، دۆزەخیە کانیش بەرەو دۆزەخ یەکلایی کرانەوە، مردن دەهێنرێت لە نێوان بە هەشت و دۆزخ دا سەر دەبرێت ، ئینجا بانگ پێژێك جار دەدات ، ئەی بەهەشتیە کان ئیتر مردن نیە ، ئەی دۆزەخیە کان ئیتر مردنیە ..؟! بەهەشتیە کانیش لە سەرووی دڵ خۆشیە کانیانەوە هیندەی تر دڵ خۆش دەبن ، دۆزەخیەکانیش لە سەرووی خەفەت باریانەوە هیندەی تر خەفەتبار تر دەبن ..!!

له (ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت: لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((يجمع الله الناس يومَ القيامة فی صعيد واحد، ثم يطلع عليهم رب العالمين، فيقول : ألا يتبع كل إنسان ما كانوا يعبدون ؟ فيمثل لصاحب الصليب صليبه، ولصاحب التصاوير تصاويره، ولصاحب النار ناره، فيتبعون ما كانوا يعبدون، ويبقى المسلمون، فيطلع عليهم رب العالمين، فيقول : ألا تتبعون الناس ؟ فيقولون : نعوذ بالله منك، نعوذ بالله منك، الله ربنا، وهذا مكاننا، حتى نرى ربنا، وهو يأمرهم ويثبتهم، قالوا : وهل نراه يا رسولَ اللهِ ؟ قال : وهل تضارون فی رؤية القمر ليلة البدر ؟ قالوا : لا يا رسولَ اللهِ، قال : فإنكم لا تضارون فی رؤيته تلك الساعة، ثم يتوارى، ثم يطلع، فيعرفهم نفسه ثم يقول : أنا ربكم فاتبعونی، فيقوم المسلمون، ويوضع الصراط، فيمر عليه مثل جياد الخيل والركاب، وقولهم عليه : سلم سلم، ويبقى أهل النار، فيطرح منهم فيها فوج، فيقال : هل امتلأت ؟ فتقول

---

[١] - السيوطي الجامع الصغير برقم (٥٨٢٣).
[٢] -صحيح البخاري برقم (٦٥٤٥).
[٣]

: هل من مزيد ؟ ثم يطرح فيها فوج فيقال : هل امتلأت ؟ فتقول : هل من مزيد ؟ حتى إذا أوعبوا فيها وضع الرحمن قدمه فيها، وأزوى بعضها إلى بعض، ثم قال : قط ؟ قالتْ : قط قط، فإذا أدخل الله أهل الجنة الجنة، وأهل النار النار، أتى بالموت ملببا، فيوقف على السور الذى بين أهل الجنة وأهل النار ثم يقال : يا أهل الجنة، فيطلعون خائفين، ثم يقال : يا أهل النار ! فيطلعون مستبشرين، يرجون الشفاعة، فيقال لأهل الجنة ولأهل النار : هل تعرفون هذا ؟ فيقول هؤلاء وهؤلاء : قد عرفناه هو الموت الذى وكل بنا، فيضجع فيذبح ذبحا على السور، ثم يقال : يا أهل الجنة ! خلود لا موت، ويا أهل النار ! خلود لا موت)).[1] واتە :پێغەمبەری خوا ﷺ فەر مووی : لە ڕۆژی قیامەت دا (خوای گەورە ) هەموو خەلك لە دەشتایەکی فراواندا کۆدەکاتەوە ، لە پاشاندا پەروەردگاری جیهانیان تەماشایان دەکات و دەفەرموویێت : ئاگادار بن با هەموو کەسێك شوێنی پەرستراوەکەی بکەوێت ، ئیتر گاور خاچ پەرست ویچنەی خاچە کەی بۆ دەکیشرێت و خاوەنی پەیکەر یان بت وێنەی پەیکەرەکانیان بۆ دەکێشرێت ، مەجووس یان ئاگر پەرست وێنەی ئاگرەکەی بۆ دەکێشرێت ، جا شوێنی پەرستراوەکانیان دەکەون ، موسلمانان دەمێننەوە ، پەروەردگاری جیهانیان تەماشایان دەکات و دەفەرموویێت : ئایا شویچنی خەلکی ناکەون ..؟! دەلێن : پە نا دەگرین بە تۆ ، پەنا دەگرین بە تۆ ، (خوای گەورە ) پەروەردگارمانە ، ئەمە شوێنمانە هەتاکو پەروەردگارمان دەبینین ..!! (خوای گەورە)ش فەرمانیان پێ دەکات و جێگیریان دەکات ..!! دەلێن : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا دەی بینین ..؟! فەرمووی : ئایا گومانتان هەیە لە بینینی مانگی چواردە ..؟! ووتیان : نە خێر . ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ گومانمان نیە ..!!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : دەی لە و کات ساتەدا ئاوا خوای خۆتان دەبینن و لە بینیندا تووشی هەیچ زەحمەتێ نابن ، لە پاشاندا دیار نامێنی ، ئینجا دەردەکەوێتەوە ، زانستێکی براوە دەخاتە دلیانەوە بە دلنیاییەوە دەزانن ئەوە پەروەردگاریانە ..!! پاشان دەفەرموویت : من پەروەردگارتانم شوێنی فەرمانەکانم بکەون موسلمانان هەلەسن پردی سیران دادەنرێ و دەپەرنەوە بۆ بەهەشت وەك ئەسپ و ووشتری خێرا ، پێغەمبەران و فرستادەکان قسە یان لەسەر پردەکە ئەمەیە کە دەلێن : (خوایە سەلامەتمان بکە ، خوایە سەلامەتمان بکە ، جا ئەهلی دۆزەخ دەمێننەوە ، سەرەی ئەوانە کۆمەلیکیان فرێ دەدرێنە دۆزەخەوە ، جا دە ووترێت : ئایا پر بووی ..؟! ئەویش دەلێت : ئا خۆ زیاتریش هەیە ..؟! تا ئەو کاتەی هەر هەموویان کۆدەبنەوە لە نێو دۆزەخدا ، (خوای گەورە ) پێ تێ دەخات ، (شێوەی جۆنیەتیە کەی دەگرێتەوە بۆ (خوای گەوە ) چیە و جۆنە تەنها خوا دەزانێت )، ئەو کاتە دۆزەخ لە هیبەتی ئەوە دا دەچێتەوە یەك ، دۆزەخ دەلێ : خوایە بەسمە بەسمە ، پر بووم جێی کەسم نەماوە ، کاتێك (خوای گەورە ) بەهەشتیەکان دەخاتە بەهەشتەوە ، و دۆزەخیەکان دەخاتە دۆزەخەوە ، مردن دەهێنرێت لە سەر دیواری نێوان بەهەشت و دۆزەخدا

[1] سنن الترمذي برقم (٢٥٥٧).

رادەوستێنرێت ، جا دەوترێت : ئەی ئەهلی بەهەشت ئەوانیش بە ترسەوە دەروانن ، پاشان دەوترێت : ئەی ئەهلی دۆزەخ ئەوانیش بە دڵخۆشیەوە بە هیوای شەفاعەتەوە دەوانن کە بێنە دەرەوە لە دۆزەخدا ، جا بە هەر دوو لایان دەوترێت : ئایا دەزانن ئەمە دەناسن ..؟! هەر دوو لایان دەڵێن : بەڵێ دەیناسین ئەوە مردنە پێی سپێردراوین ، جا رادەکێشرێت و لە سەر دیوارەکەی نێوان بەهەشت و دۆزەخدا ، سەر دەبررێت ، جا دەوترێت : ئەی بەهەشتیەکان ئیتر لە بەهەشتدا بە هەمیشەیی دەمێنەوە بۆ هەتا هەتایێ و مردن نیە ..؟! ئەی دۆزەخیەکان ئیتر لە دۆزەخدا بەهەمیشەیی دەمێنەوە بۆ هەتاهەتایێ و مردن نیە ..؟!

✍ لە (معاذ بن جبل ) – خوا لي رازي بيت – دە ليت : العمل الصالح الذي اربعة أشياء: (العلم ،النية ، الصبر ، الإخلاص).[١]

واتە : کارو کردەوەی چاکە چوار شتە : زانستی شەرعی ، نیاز پاکی یان نیەت پاکی ، خۆگری یان ئارام گرت ، دلسۆزی ..!!

✍ لە (عثمان بن عفان ) – خوا لی ازي بيت – لەسەر وتەی قال تعالى: ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ [ٱلبَقَرَةِ : ٢٥] دەڵێت : بە دلسۆزی کار کردەوە ئەنجام بدە ..).[٢]

✍ لەرێ (عطاء ) لە (عبدالله بن عباس ) - خوا لي رازی بيت دە ليت : الاعمال الصالحة ، واتە : کردەوە چاکە بریتیە لە : (سبحان الله ، والحمد لله ، ولا إله إلا الله ، والله أكبر ) .[٣]

✍ لە (عبدالله بن عباس) – خوا لی رازی بيت – دەڵێت : کارو کردەوەی چاکە لە نێوان خۆت و پەروەردگارتا ..).[٤]

📖 لە (انس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت = دە ليت : ((أنَّ الرُّبيِّعَ بنتَ النَّضرِ أتتِ النَّبيَّ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ وَكانَ ابنُها الحارث بنُ سراقةَ أصيبَ يومَ بدرٍ أصابَهُ سَهْمُ غَربٌ فأتت رسولَ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ فقالَت أخبِرني عن حارثةَ لئن كانَ أصابَ خيرًا احتسَبتُ وصبرتُ وإن لم يصِبِ الخيرَ اجتَهَدتُ في الدُّعاءِ فقالَ النَّبيُّ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ يا أمَّ حارثةَ إنَّها جنَّةٌ في جنَّةٍ وإنَّ ابنَكِ أصابَ الفِردوسَ الأعلى والفردوسُ رَبوةُ الجنَّةِ وأوسطُها وأفضلُها)).[٥] واتە: لە ( ئەنسی کوری مالك ) – خوا لێ رازی بێت – دە گێرێتەوە دەڵێت : کە ( روبەیعی کچی نضر) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە کورەکەی (حارثة کوري سوراقة ) لەجەنگی بەدردا تیری وێل بەری کەو تبوو ..!! ووتی : هەوالی (حارثة ) بدەنێ ئەگەر تووشی خێر بووە خۆراگر دەبم ، ئەگینا زۆر بۆی دەپارێمەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی دایکی (حارثة ) !! کورەکەت لە فیردۆس دایە کە کە چلەپۆپە و بەرزترین شوێنی بە هەشتەو خۆشترین جێگەیەتی ..؟!!

---

[١] -اخرجة ابن ابي حاتم (٦٥/١).
[٢] -تفسير الثعلبي (١٧٠/١) تفسير البغوي (٧٣/١).
[٣] - اخرجه ابن ابي حاتم (٦٥/١) .
[٤] - تفسير الثعلبي (١٦٩/١).
[٥] - سنن الترمذي برقم (٣١٧٤).

✍ لەرێ (عطاء بن دینار) لە (سعید بن جبیر ) – رەحمەتی خوای لێبێت- لە سەر ووتەی : قال تعالى: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ دەڵێت : واتە : موژدە بە سەر کەوتن لە دونیا دا ، وە لە دوا رۆژ دا یان لە قیامەت دا بەهەشت بەدەست دەهێنن ..).[1]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) –رەحمەتی خوای لێ بێت- لە سەر ووتەی : قال تعالى: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ واتە: (البساتين ) واتە : بێستانەکان ..).[2]

✍ لەرێ (عطاء بن دینار) لە (سعید بن جبیر ) – رەحمەتی خوای لێبێت- لە سەر ووتەی : قال تعالى: ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ دەڵێت : واتە : لە ژێرەوە جۆگەو رووبار هەیە ، وە لە ژێر دەرختەکان بێستان و باخ و باخات و گول و گولزراوهەموو جۆرە بەهەرهەمێکی مێوە زات هەیە ..).[3]

✍لە ( أبی مالك غزوان الغفاری ) – رەحمەتی خوای لێ بێت- لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ دەڵێت: واتا : شوێن وخانووبەرە و کۆشك و تەلار ، لە ژێرەوە جۆگە و رووبارە ..).[4]



📖 لە (ابی هریرە ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : لە پێغەمبەری ﷺ فەرمووی : (( أنهارُ الجنَّةِ تُفَجَّرُ من تحتِ تلالِ - أو من تحتِ جبالِ –المِسكِ)).[5] واتە: روو بارە کانی بەهەشت لە ژێر گردەکان ، یان لە ژێر چیاو شاخە کانەوە لە مسکە وە هەڵدەقولێن یان دەرژێن ..!!

✍ لەرێ (ابن مسعود ) لە (مسروق ) دەڵێت : رووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقولێن لە ژێر چیاکان یان شاخە کانی مسك ..).[6]

📖 لە (انس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لعلَّكم تظنُّونَ أنَّ أنهارَ الجنَّةِ أُخدودٌ في الأرضِ ؟ لا واللهِ ، إنَّها لسائحةٌ على وجهِ الأرضِ ، إحدَى حافَّتَيْها اللؤلؤُ ، والأخرَى الياقوتُ ، وطينةُ المِسْكِ الأذفَرِ قال : قلتُ : ما الأذْفَرُ ؟ قال : الَّذي لا خلْطَ لهُ )).[7] واتە: رەنگە ئێوە وا بیربکەنەوە کە رووبارەکانی

[1] -اخرجه ابن ابي حاتم (٦٥/١).
[2] - تفسير مقاتل بن سليمان (٩٤/١).
[3] - اخرجه ابن ابي حاتم (٣٠٧٧/٩).
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (٦٦/١).
[5] -اخرجه ابن حبان (٤٣٢/١٦) (٧٤٠٨).
[6] -اخرجه ابن ابي شيبه (٩٦/١٣) .
[7] -شيخ الالباني صحيح الترغيب (٣٧٢٣).

بەهەشت وە کو خەندەق سەر زەوەی وان یان وەکو حفر یان دۆل لە سەر زەوەی وان ..؟! نە خێر بە خوا ، وەك گەشتێکە لە سەر رووی زەوی دا ، لێوارێکی یان کەنارێکی لە مرواریە ، وە دیوارەکەی تری لە یاقووت یان کەنارەکەی تری لە قوتە ، وە قورەکەی لە مسکی ( الأذفر ) ووتیان : ( الأذفر ) چیە ..؟! فەرمووی : ئەوە هیچ تێکەلاوێکی لە گەل دا نیە ..!!

لە (أبی موسی ) – خوا لی رازی بیت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إن أنهار الجنة تخشب ، من جنة عدن فی جوبة ، ثم تصدع بعد أنهار )).[١] واتە : رووبارەکانی بەهەشت هەلدەقولێن یان هەلدەرژێن ، لە بە هەشتی عدن کە لە چیاکانیدا پاك خاوێنە وە پاکە ، پاشان دەبنە درەزاوی یان پەرشووبلاوی رووبارەکان ..!!



لە (ابو هریرە ) – خوا لی رازی بیت دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((قلنا: يا رسولَ اللهِ، ما لنا إذا كُنَّا عندك رَقَّت قُلوبُنا وزهِدْنا في الدُّنيا، وكُنَّا مِن أهْلِ الآخرةِ، فإذا خرَجْنا مِن عندِك، فآنَسْنا أهالِينا وشَمَمْنا أولادَنا، أنكَرْنا أنفُسَنا؟ فقال رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: لو أنَّكم تكونون إذا خرَجْتم مِن عندي كُنْتم على حالِكم ذلك، لَزارَتْكم الملائكةُ في بُيوتِكم، ولو لم تُذْنِبوا لجاء اللهُ بخلْقٍ جديدٍ؛ كي يُذْنِبوا فيغفِرَ لهم. قال: قلْتُ: يا رسولَ اللهِ، مِمَّ خُلِقَ الخلْقُ؟ قال: مِن الماءِ. قلْتُ: الجنَّةُ ما بِناؤُها؟ قال: لَبِنَةٌ مِن فِضَّةٍ، ولَبِنَةٌ مِن ذهَبٍ، ومِلاطُها المِسْكُ الأذْفَرُ، وحصْباؤُها اللُّؤْلُؤُ والياقوتُ، وتُرْبَتُها الزَّعفرانُ، مَن يدخُلُها ينعَمُ لا يبْأَسُ، ويَخْلُدُ لا يموتُ، ولا تُبْلى ثِيابُهم، ولا يَفْنى شَبابُهم. ثمَّ قال: ثلاثٌ لا يُرَدُّ دعوتُهم: الإمامُ العادِلُ، والصَّائمُ حين يُفْطِرُ، ودعوةُ المظلومِ يرفَعُها فوق الغَمامِ، ويُفْتَحُ لها أبوابُ السَّماءِ، ويقولُ الرَّبُّ تبارَكَ وتعالى: وعِزَّتي لأنْصُرَنَّك ولو بعدَ حينٍ)).[٢] واتە: لە (ابو هریرە ) – خوا لی رازی بیت – دە گێرێتەوە دەلێت : ووتمان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بۆچی کاتێ

---

[١] اخرجه ابن ابي الدنيا في صفة الجنة ص٩٨ (٨٤) وابو نعيم في صفة الجنة (٣/١٦٠) .

[٢] - سنن الترمذي برقم (٢٥٢٦).

لە خزمەت تۆداین ، دڵ مان نەرم و دونیاش بە کەم دە گرین و ئە هلی دوا رۆژین ..؟! بەلام کاتێ گەراینەوە بۆ مالەوە سەر قال بووین بە مال و منداڵ و خاو خێزانەوە و کار پیشەکانمانەوە زۆر لە ئامۆژگاریەکانی تۆ مان لە بیر دەچێتەوە حالمان دەگۆرێت و وەك ئەوە نین کە لە خزمەت تۆ دا بین ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەگەر لەسەر ئەو بارو دۆخە یان ئەو حالە بە ردەوام بن کە لای منن بە ئیمانی جێگیرەوە ،لە ناو مالە کانی خۆتان مەلائیکەتەکان سەردانتان دەکەن ..!! ئەگەر ئێوە گوناهو تاوان نەکەن ئەوا (خوای گەورە ) دورست کاری نوێ دێنیتە کایەوە بۆ یەوەی گوناهو تاوان بکەن و داوای لێخۆشبوون بکەن ، وە لێ تات خۆش دەبێ ووتی : ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دورست کراوان لە چی دورست کراون ..؟! فەرمووی : لە (ئاو) ووتم : ئەی بەهەشت لە چی دورستکراوە ..؟! فەرمووی (خشتێ زیو خشتێ زێر نێوان خشتەکان میسکی زۆر بۆن خۆشە ، زیخ و چەوەکەی مرواری و یاقوت، خاکل گل و خۆلەکەشی زعفرانە زەرد و نەرم و بۆنی خۆشە ..؟! هەر کەس بچێتە بەهەشتەوە ، بۆ هەمیشە بەهرەمەند دەبێت و بێ هیوا نابێت و دەکەوێ بەسەر ناز و نیعمەتدا ، هەر گیز ناخۆشی نابینێ ، هەتا هەتایە ب خۆشی و شادی دەژی ، هەر گیز نامرێ ..؟! جەل وبەرگ پۆشاکەکانیان هەر گیز کۆن نابێت نارزێت ..؟! هەر گیز پیر نابن یان تافی گەنجی یان بەسەر ناچێت هەر بەگەنجی دەمێنەوە ..؟! لە پاشاندا فەرمووی : سێ کەس پارانەوە یان گیرا دەبێت یان وەر دەگیرێت و قبول دەبێت ، یەکەمیان : پێشەوایەکی داد پەروەرد داگەری راستە قینە ، دووەم : رۆژوو وان کاتێ کە رۆژووەکەی دەشکێنی بەربانگ دەکاتەوە، سێ یەم : نزاو پارانەوەی ستەم لێ کراوە (خوای گەورە ) بەرزی دەکاتەوە بۆ سەر هەور ، وە دەرگای ئاسمانەکانی بۆ دەکاتەوە ، پەروەردگار دەفەرموویێت : سوێند ب گەورەیی و شکۆمەندی خۆم ئەی ستەم لێ کراو سەرت دەخەم با لە پاش ماوەیە کیش بێت ..!!

✍ لە رێ (السدی ) لە (ابی مالك وابی صالح ) لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُ﴾ دەلێت : بەروو بوومی جۆراو جۆریان پێدەدن لە بەهەشتدا ، ئینجا دەروانن ، دەلێن : پێشتر ئەو بەروو بووومە رزقەمان پێدراو بوو لە ژیانی دونیا ..؟! ).[١]

✍ لە ری (ابی نجیح ) لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُ﴾ دەلێت : زیاتر لە یەك چوونیان هەیە ، لە هەموو جۆرێکیان وەك یەك هەیە ..)[٢]

✍ لە رێ (عمرو بن مره ) لە (ابی عبیده بن عبداللە بن مسعود ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : دار خورمای بەهەشت درەوشاویە ، لە سەرچاوە رەگەکانی خۆیەوە تا لقە کانی ، دارێکە بەرزە بۆتەوە لەسەر زەوەی بەروو بوومی زۆرە هەیە زۆر خۆشەویستی گەورەی هەیە ، هەر جارێك مێوە یەك لێدەکەیتەوە یان لادەچێت ، میوەیەکی تری لە شوێنی جێگای دەگرێتەوە ، کپە کەی یان هیشوو یەکەی دوانزە بالە ..).[٣]

[١] -اخرجه ابن جرير (٤٠٨/١).
[٢] -تفسير مجاهد ص ١٩٨.
[٣] -اخرجه ابن المبارك (١٤٨٩) ، ابن ابي شبيه (٩٧/١٣).

✍ لە ڕێ (سعید) لە (قتادە) ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُ﴾ دەڵێت : واتە : لە دونیا دا ..).[١]

✍ لە (علی بن زید ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنۡهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزۡقًا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُ﴾ دەڵێت : واتە :ئەو رزق رۆزیە و میوە هاتەی لە دونیا هەبووە پێش چوونە بەهەشت ..).[٢]

✍ لەرێ ( الاوزاعی ) لە (یحیی بن ابي كثیر ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت: کەسێك سنیەك دەهێنێت ، هەموویان لێی دەخۆن ، دووبارە دەی هێنەوە ، ئینجا دەڵێن : ئەوە ئەم خواردنەیە کە پێشتر پێمان درا بوو ..).[٣]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنۡهَا مِن ثَمَرَةٍ﴾ واتە: تاكو زیاتر لەزەت لە خواردن و بەروبوومەكانی بەهەشت بكەن ، قال تعالی: ﴿رِّزۡقًا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُ﴾ واتە: ئەمەش لەبەر ئەوەی کە رزق رزیان یان هەیە لە بەروبوومەكانی بەهەشت لە بەیانیان و ئێواران دا ، جۆرەكانی مێوە زاتیان پێ دەدرێت لە سەر سنی درو یاقوت ، بەو برەی کە لە بەیانیان دونیان پێ یان دەدرێت ، وە جۆرەكانی مێوە یان پێ دەدرێت ، جگە لەو برەی کە ئێوارانی دونیا پێ یان دەدرێت ، ئینجا لە مێوە كان دەروانن وەك یەكن یان لێك دەچن لە ڕەنگ ، قال تعالی: ﴿قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُ﴾ واتە: خوادرنی بەلەزەتی بەیانیان ..).[٤]

✍ لەرێ (السدی ) لە (ابی مالك وأبی صالح ) لە ( عبدالله بن عباس )- خوا لێ رازی بێت- لەسە ووتەی قال تعالی: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ دەڵێت : لە دیمەن ڕەنگ دا لێك دەچن ، بەلام لە تام لەزەت دا جیاوازن یان لێك ناچن ..).[٥]

✍ لە ڕێ (ابي ظبیان) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – دەڵێت : هیچ شتێك لە دونیا دانیە کە لە بەهەشت دا بێت ، جگە لە ناوە كانی نەبێت ..).[٦]

✍ لەرێ (الربیع بن أنس ) لە (ابی العالیە ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ دەڵێت : هەندێكیان لەهەندێكیان دەچێت ، بەلام جیاوازن لە تام و لە زەتدا ..).[٧]

---

[١] -علقە ابن ابي حاتم (٦٦/١).
[٢] -تفسیر موسوعة المأثورة (١٧١/٢).
[٣] - اخرجە ابن جریر (٤١٠/١).
[٤] -تفسیر مقاتل بن سلیمان (٩٤/١).
[٥] -اخرجە ابن جریر(٤١٤/١).
[٦] -اخرجە ابن ابي حاتم (٦٦/١).
[٧] -اخرجە ابن ابي حاتم (٦٧/١).

✍ لەرێ (شبل) لە (ابن ابی نجیح ) لە (مجاهد ) –رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ دەڵێت : لە یەکدەچن لە رەنگ دا ، جیاوازن لە تام و لەزەت ، وەك خەیار و تەرۆزی ، لە شێوە لێك دەچن بەلام تامیان جیاوازە ..).[١]

✍ لە رێ (الحكم بن أبان ) لە (عكرمه ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾دەڵێت : لە بەروو بوومی دونیا دەچێت ، بەلام وەك بەرووبوومی بەهەشت نیە چونکە بەروو بوومی بە هەشت جەندەها جار باشترە ..).[٢]

✍ لەرێ (ابی عامر ) لە (الحسن البصری ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ دەڵێت : هەموو هەڵبژاردەکان ، هەندێکیان لە هەندێکیان لەیەك دەچن ، هیچ یەکێك لە بەرووبوومەکانی بەهەشت خراپ نین ، هەر هەموویان باشن لە لەزەت و خۆشی دا ، ئایا بەر هەمەکانی ژیانی دونیا تان نەبینیوە ..؟! چۆن هەندێکیان لە هەدێکی تریان خراپ ترن و بێ سوود بێ لەزەت و بێ تام و ناخۆشن ..!! )).[٣]

✍ لەرێ (عامر بن یساف) لە (یحیی بن کثیر ) – رەحمەتی خوای لێ بێت –دەڵێت : گژوگیای بەهەشت زعفرانە ، تەپۆلکە لمەکانی یان قورەکانی میسکە ، مندالان بە سەریان دەگەرێن ب مێوەوە لێ دەخۆن پاشان هەر بەوێنەی ئەو میوانەیان بۆ دەهێنن ، خەلکی بەهەشت پێیان دەلێن : ئەمەی کە هێناو تانە لە مە پێش هەر لە مەتان هێنا ..؟! مندالەکان پێیان دەلێن : فەرموو : بخۆن رەنگی وەك یەکە بەلام تام لەزەتیان جیاوازە ، ئەمە ئەوەیە کە (خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ واتە: ئێستا وێنەیان هێناوە ..).[٤]

✍ لە(سفیان الثوري) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : لە رەنگیان یەکە ، بەلام تام لە زەتیان جیاوازە ..).[٥]

✍ لە رێ (ابن وهب ) لە (عبدالرحمن بن زید بن أسلم ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ دەڵێت : ناوە کانی بەرووبوومەکان دەناسن ، هەر وەك لە دونیا دەیان ناسی ، هەر وەك : سێو بە سێو ، هەنار بە هەنار ، ئەم لە بەهەشت دا قال تعالى: ﴿هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾ واتە : لە دونیا دا ، قال تعالى: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ واتە: دەیان ناسی ، بەلام جگە لە تام لە زەت دا ، وەك یەك نین ..).[٦]

---

[١] -تفسیر مجاهد ص١٩٨ .
[٢] -اخرجه اب ابي حاتم (٦٧/١).
[٣] -اخرجه ابن جریر (٤١٣/١).
[٤] -اخرجه ابن جریر (٤١٤/١).
[٥] -تفسیر سفیان الثوري ص٤٢.
[٦] -اخرجه ابن جریر (٤١٦/١).

له (ابى سعيد الخدرى ) له پێغەمبەری خوا ﷺ: ﴿وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ﴾((قال : مِنَ الحيضِ والغائِطِ والنُّخامَةِ والبُزَاقِ)) .[١] واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : لە سووری مانگانە، لە پیسایی ، لە بەلغەم و لی کاوی دەم ..!!

لەری (السدی ) له (ابى مالك وأبى صالح ) لە ( عبدالله بن عباس )- خوا لیّ رازی بێت- لەسە ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ﴾ دەلێت : واتە: ئەوانە خوێن دەرنادەن کە پیّ دەلێن : (يحضن) (لە رۆژی سووری مانگانەی ئافرەت ئەو خویچنەی دەێت و وەچاوەرێی وەستانی خوێنەکەی دەکات بۆ نوێژ کردن )، وە نە حدث گەورە واتە جنابە نە حدث بچووك واتە سەر ئاو کردنیان نیە ، هەروەها هیچ بەلغەمێکیان نیە ..).[٢]

لەری له (علی بن ابي طلحة) لە ( عبدالله بن عباس )- خوا لیّ رازی بێت- لەسە ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ﴾ دەلێت : واتە: پاك و بێگەردە ، لە پیسی و قێزەوونی و زیان و ئازار گەیاندن ..).[٣]

له رێ (ابن ابى نجيح ) له (مجاهد )- رەحمەتی خوای لیّ بێت - لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ﴾ دەلێت : پاکن ، لە سووری مانگانەی ئافرەت ، لە پیسایی و ، میزو ، چەرم و ، بەلغەم و ، ئاوی شل یان منی شل ، منداليان نابێت و واتە : سروشتی مندال بوونیان نیە وەك لە دونیا ئافرەتان بە هۆی زگ پڕ بوونیان منداليان دەبێت و تووشی حالەتێکی نا سروشتی دەبن بەهۆی مندال لە دایك بوونیان خوێن بەر بوونیان زۆر دەبێت ، بەلام لە بەهەشت دا هاسەرانی پاکیزە ئەم بارو دۆخەیان لیّ روونادات ..!!).[٤]

لەرێ (الربيع بن أنس ) له (الحسن البصرى ) – رحمەتی خوای لیّ بێت- لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ﴾ دەلێت : پاك و خاوێن و بێگەردن لە سووری مانگەی ئافرەتی دونیا ..).[٥]

له رێ (معمر ) له ( قتاده ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ﴾ دەلێت : (خوای گەورە ) ئەوانی پاك و بێگەر کردووە ، لە هەموو میزێك و ، پیسایی و، قێزە وونی و ناپاکی و نادروستی یەك ..).[٦]

---

[١] -اخرجه ابو نعيم في صفة الجنة (٢/٢٠٠)، ابن حجر العسقلاني في تغليق التعليق (٤٩٩/٣).
[٢] -اخرجه ابن جرير (٤١٩/١).
[٣] -اخرجه ابن ابي حاتم (٩٨٤/٣).
[٤] -تفسير مجاهد ص١٩٨ .
[٥] -اخرجه ابن جرير (٤٢٢/١).
[٦] -اخرجه ابن جرير (٤٢١/١).

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سە ر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ دەلێت : ئەوانە دروست کراوی نێو بەهەشتن لە گەل درەختە کانی شیکراوەکانی ، پاکن لە سووری مانگانە ، لە پیسایی و میزو ، وە لە هەموو قێزە وونەکانی دونیا ..)).[1]

✍ لەرێ (ابن وهب ) لە (عبدالرحمن بن زيد بن أسلم ) لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ دەلێت : پاکیزەن ، ئەوانە سووری مانگانەیان نیە ، بەلام هاوسەرانی ژیانی دونیا پاکیزە نین ..؟! ئایا نایان بینن کە تووشی خوێن بەر بوون دەبن لە سووری مانگانە و لە کاتی لە دایك بوونی مندال ، ئا لەم کاتەدا واز دە هێنن لە نوێژ کردن و لە رۆژوو گرتن ، تاکو ماوە کەیان تەواو دەبێت ، (ابن زيد) دەلێت : (دایکە حەوا ) ئاوا دروست کرا تاکو گوناهو سەرپێچی کرد ،کاتێك سەرپێچی و گوناهی کرد ، (خوای گەورە ) پێ فەرموو : من تۆم بە پاکیزە دورست کرد ، خوێنت لێ بەر بێت ، هەر وەك چۆن ئەو دەرختە خوێنی لی بەردەبێت..).[2]

📖 لە (ابی أمامە ) – خوا لی رازی بێت – دەلێت : ((إنَّ رجلاً سألَ النبيَّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم هل يَتَنَاكَحُ أهلُ الجنَّةِ ، فقالَ رسولُ الله صلَّى اللهُ عليه وسلَّم: دِحَامًا دِحَامًا لا مَنِيَّ ولا مَنِيَّةَ)) .[3] واتە: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ، ئایا هاوسەر گیری لە گەل خەلکی بەهەشت دەکەین ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (دحاما ،دحاما ، واتە: ئاویی سپی نێرینەو مێینە کە لە زکری پیاو دێت ، وە لە رحمی ئافرەت دێت ، کەواتە : ئەم ئاوە یان نیە ، نە لە پیاودا نە لە ئافرەت دا واتە : بە مانایەکی تر جماع کردن نیە لە بەهەشت دا بەم شێوەی کە لە دونیادا هەیە ..).

📖 لە ( زيد بن أرقم ) – خوا لی رازی بێت – دە گێڕێتەوە دەلێت : ((جاءَ رجلٌ مِن أهلِ الكتابِ إلى رسولِ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ علَيهِ وسلَّمَ فقالَ : يا أبا القاسمِ تزعمُ أنَّ أهلَ الجنَّةِ يأكلونَ فيها ويشربونَ ، فقال : والَّذي نفسي بيدِهِ إنَّ الرَّجلَ منهُم ليؤتَى قوَّةَ مائةِ رجلٍ في الأكلِ والشُّربِ والجِماعِ والشَّهوةِ ، قال : فإنَّ الَّذي يأكلُ ويشربُ يكونُ لهُ الحاجةُ ، قال رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ علَيهِ وسلَّمَ : حاجتُهم عَرَقٌ يفيضُ مِن جلودِهم مِثلُ ريحِ المِسكِ فإذا كانَ

[1] تفسير مقاتل بن سليمان (٩٤/١).
[2] اخرجه ابن جرير (٤٢١/١).
[3] -اخرجه الطبراني في الكبير (٩٦/٨) برقم (٧٤٧٩)، و ابو نعيم في صفة الجنة (٢٠٣/٣).

ذلكَ ضَمُرَ لهُ بطنُهُ)) .[١] واتە: پیاوێك لە خاوەنی کتێبە ئاسمانیەکان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی : ئەی باوکی قاسم ، تۆ بانگەشەی ئەوە دەکەیت ، کە خەلکی بەهەشت دەخۆن و دەخۆنەوە ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بەوەی کە نفسی منی بە دەستە ، هەر یەکێك لە پیاوانی بەهەشت ،هێزی سەد پیاوی پێدەرێت ، بۆ خوادرن و خواردنەوە جماع کردن یان سەرچی کردن و شەهوەت ، فەرمووی : ئێمە دە خۆین و دەخۆیەنەوە پێویسمان بە سەر ئاو کردنە لە دونیا دا ، بە لام بەهەشت پاك و بێگەردە ، هیچ قێزە وونی زیان گەیاندنی تێدا نیە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سەر ئاوی کردن لە بەهەشت دا ، دەبێتە عەرق کردن بۆنەکەشی وەك میسك وایە ، ئەگەر ئەوە سگی وورینە بکات ..!!

📖 لە (انس بن مالك ) – خوا لی رازی بێت – دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((يُعطَى المؤمنُ في الجنَّةِ قوَّةَ كذا وَكذا منَ الجماعِ ، قيلَ: يا رسولَ اللَّهِ أوَ يطيقُ ذلِكَ ؟ قالَ : يعطى قوَّةَ مائةٍ)) .[٢] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : پیاو باوەردار هێز وتوانای ئەوەند کەسی پیێ دەدرێت بۆ جوتبوون یان جمعا کردن لە گەل ئافرەت ، ووترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئایا ئەوەندە توانای پیێ دەدرێت ..؟! فەرمووی : بەلیێ هێز و توانای سەد پیاوی دەدرێت ..!!

📖 لە ( زيد بن أرقم ) – خوا لی رازی بێت – دە گێرێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((فإنَّ البولَ والجَنابةَ عِرقٌ يَسيلُ من تَحتِ ذَوَائِبِهِمْ إلى أقْدامِهِمْ مِسكٌ)).[٣] واتە: میزو پیسایەکەی دەبێتە عارەقە دەرژێتە دەروە لە ژێری پێیەکانی بە بۆنی مسك ..!!

📖 لە (ابو هريرە) – خوا لی رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، پرسیاریان کرد لە بەهەشت دا ئافرەتان کچ یان ژن کە لە دونیادا کچە دەبێتە ژن ..؟! ((نعم – والذي نفسي بيدِه – دَحْمًا دَحْمًا ؛ فإذا قام عنها رجعَتْ مُطَهَّرةً بِكرًا)).[٤] واتە: بەلیێ : سوێند بە کەسەی نفسی منی بەدەستە ..؟!واتە : نە ئاوی پیاو هەیە نە ئاوی ئافرەت ، کاتێك لە لایان هەستان دەگەرێنەوە سەر پاکیزەی خۆیان وە هەر بەکچەیەتی دەمێنەوە ..!!

📖 لە (ابو سعيد الخدري ) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( أهل الجنة إذا جامعوا نساءهم عادوا أبكارا )) .[٥] واتە: خەلکی بەهەشت ئەگەر سەرچی یان کرد یان جماعیان کرد لە گەل ئافرەتەکان ئەواو دووبارە دەبنەوە کچیەتی جارانی خۆیان ..!!

---

[١] -اخرجه احمد (٦٥/٣٢) برقم (١٩٣١٤) ، وابن ابي شيبة في المصنف (١٣٦/٩)، والنسائي في السنن الكبرى (٢٥٠/١٠).
[٢] -سنن الترمذي برقم (٢٥٣٦).
[٣] -شيخ الالباني ضعيف الترغيب برقم (٢٢٠٤).
[٤] - شيخ الالباني السلسلة الصحيحة برقم (٣٣٥١) ، ابن حبان برقم (٧٤٠٢).
[٥] - اخرجه الطبراني في الصغير (١٦٠/١) برقم (٢٤٩) .

له(عبدالله بن عمر ) – خوا لی رازی بيت – دەلێت : هەر كاتێك ئیماندار هاوسەرەكەی دەوێت و دەی دۆزێتەوە بەكچەیەتی ، واتە: لە بەهەشتدا ..!!).[١]

له (طاووس ) – ڕەحمەتی خوای لی بيت – دەلێت : خەلكی بەهەشت هاوسەر گیری لە گەل ئافرەتان دەكەن ، بەلام ئافرەتەكان منداليان نابيت ، بەهیچ شێوەیەك نە ئاوی نێرینە هەیە نە ئاوی مێینە ..!! ).[٢]

له رێ (نافع بن الازرق ) له (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بێت- لە سە ر ووتەی قال تعالى: ﴿وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٥﴾ دەلێت : واتە : مانەوە یان بەردەوام بوون ، بەهیچ شێویەك ناچنە دەرەوە هەر گیز لە بەهەشت ، دەلێت : ئایا عربە ئەمەی گوێی لیّ بوو ..؟! ووتی : بەلی . شعری ( عدی بن زيد ) ..!! ).[٣]

له رێ (عطاء بن دينار ) له (سعيد بن جبير ) – ڕە حمە تی خوای لی بیت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٥﴾ دەلێت : مانای : هەر گیز مردن نیە ..!!).[٤]

له (مقاتل بن سليمان ) – ڕەحمەتی خوای لی بێت – لە سەر ووتەی ﴿وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٥﴾ دەلێت : مانای : هەر گیز مردن نیە ..!!هەمان ووتەی (سعيد بن جبير ) ..!![٥]

له (عبدالله بن عمر ) – خوا لی رازی بيت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إذا دخل أهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ وأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، ثُمَّ يَقُومُ مُؤَذِّنٌ بيْنَهُمْ: يا أهْلَ النَّارِ لا مَوْتَ، ويا أهْلَ الجَنَّةِ لا مَوْتَ، خُلُودٌ )).[٦] واتە : كاتێك خەلكی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە ، وە خەلكی دۆزەخ دەچنە دۆزەخەوە ، ئینجا بانگ بێژێك لە نێوانیاندا هەلدەستێت ، ئەی خەلكی دۆزەخ ئێوە نامرن ، ئەی خەلكی بەهەشت ئێوە نامرن ، واتە: نەمری بۆ هەتاهەتایی ..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ أَن يَضۡرِبَ مَثَلٗا مَّا بَعُوضَةٗ فَمَا فَوۡقَهَاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦﴾ [البَقَرَة : ٢٦]

[١] - احمد بن حنبل في زوائد الزهد.
[٢] - اخرجه عبدالرزاق (٢٠٨٨٩).
[٣] عزاه السيوطي الي الطستي وينظر : الإتقان (٧٥/٢).
[٤] - اخرجه ابن ابي حاتم (٦٨/١).
[٥] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٤/١).
[٦] -اخرجه البخاري (١١٣/٨).

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ﴾ واتە: بێ گومان (خوای گەورە ) شەرم ناکات ، قال تعالى: ﴿أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا﴾ واتە: بەوەی کە ( بۆ تێگە یاندنی خەلك هەر نموونە یەك بهێنێتەوە ..!!، قال تعالى: ﴿بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا﴾ واتە: بە مێش لەو بچووکتر یان گەورەترلە ویش ..؟! ، قال تعالى: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتە: ئینجا ئەوانەی کە باوەردارن ، قال تعالى: ﴿فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ واتە: ئەوە چاك دەزانن کە ئەو (نموونە هێنانەوەیە ) راست و دروستە لە پەروەردگاریانەوە ،قال تعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ واتە: ئەوانەش کە بێ باوەرن یان کافرن ..؟!، قال تعالى: ﴿فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا﴾ واتە: دەلێن : خوا چی ویستووە بەم نموونە هێنانەوەیە ..!! ،قال تعالى: ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا﴾ واتە: زۆر کەسی پێ گومرا دەکات ..؟! ، قال تعالى: ﴿وَيَهْدِي بِهِۦ كَثِيرًا﴾ واتە: وە رێنموونی زۆر کەسیشی پێ دەکات ..؟! ، قال تعالى: ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ٢٦﴾ واتە: وە کەس گومرا ناکات بەو نموونە هێنانەوەیە مەگەر بەدکاران نەبێت ..!!

جا بێ گومان (خوای گەورە ) لە هێنانەوەی وێنە و نموونە شەرم ناکات ، جا ئەوە بوو لە چەند ئایەتێکی پێشوودا تەحدای کافرانی کرد و ، وە رووبەروویان وەستایەوە و پێ فەرموون : ئەگەر ئێوە دەلێن : ﷺ بۆ خۆی قورئانی هەلبەستووە دەفەرموون ئێوەش وەك وێنەی ئەم قورئانە قورئانێك یان کتێبێك بهێنن ..؟! ئەوانیش واتە: کافران دەستەو ئەژنۆ وەستان و پە کیان کەوت تەنها نەیان توانی سورەتێکی کورتێش بهێنن ..!! جا سەیر لەمەیە ..؟! کافران رەخنە یە کی تریش دەگرن دەلێن : خوا بەو گەورەیە خۆی ناوی هەندێك شتی بچووك دەهێنێت وەك : مێش ، و جالجالۆکەو مێروستان و مێشەنگین ..؟! وە دەلێن : شتی وا لە م قورئانە هاتووە ، ئەگەر قورئان وەك ﷺ بانگەشەی بۆ دەکات کە فەرموودەی (خوای گەورە ) یە ، حەق نەبوو باسی ئەو شتە بچووکانە بکات ..!!

لە راستی دا ئەو نقد و رەخنانەی کافران و مولیحدە کانی ئەم سەردەمش رەخنەی بێ بنەمام پرو پووچن چونکە هیچ بەهایەکیان نیە لە رووی زانست زانیاری و لۆژیك و مەنتق دا بۆ بەلگە هێنانەوە ..!! ئەگەر (خوای گەورە ) دورست کەری گەردوون زەوەی ئاسمانەکان ئەستێرە کان و شتە گەورە کان بێت ، بێ گومان دروست کەری شتە بچووکە کانیشە کە هەیانە هەر بە چاو نابینرێت وەك میکروب وشتی تریش ، ئایا هەر بەلۆژیك یان مەنتق شتی گەورە بۆ دروست کردن ئاسان ترە یان شتی بچووك ، ئەوە تا لە تەکنەلوجیان ئەم سەردەمەدا شتی بچووك بە ها کەی زیاترە ، بۆیە لەم نموونەیە دا (خوای گەورە ) تەحدای مرۆڤایەتی دەکات بەوەی کە گیان لەبەرێکی بچووك دروست بکەن پێ شیان دروست نابێت بەلکو لە وەش گەورەتر ، (خوای گەورە ) نموونەی هێناوەتەوە ، ئەمە ش تواناو دەسەلات قدرەتی خۆی دەسەلێنی بۆ گرۆی ئادەمیزا..؟!

جا ئەوەی (خوای گەورە ) کە هەندێك نموونەی لە قورئانی پیرۆز هێناوە تەوە ، وەك : (مێش و جالجالۆکە مێشەنگین مێروستان ) بێ گومان لە راستی دا ئەم قسانەی کافران و مولیحدانی ئێستا بەلگەی جەهل نەفامی ونەزانین و گومرایی سەر گەردنی ئەوانە ، چونکە روح مایە ژیانی هەموو مرۆڤێکە یان هەموو زیندەوەر گیاندارێکە لەم گەردوونەدا ، چونکە ئە رووحەی یان ئەم گیانەی کە

بە مرۆڤ دا هەر ئەم جۆە روحە یان گیانەشی بە زیندەوەرو گیان لەبەران داوە ، وەك : مێش،جالجالۆکە ، مێشەنگین ، مێروستان ، باڵندەکان و زیندەوەران و یان گیان لەبەری گەورە وەك : مەر و بزن چێل رەشە ولاغ و ، کەر و ئێسترو ، فیل ، شێر ، پەلنگ و مار و دووپشك ... هتد ، ئەوەی مایەی شانازی مرۆڤی موسلمان و یان ئیمانداره ، ئەوەی کە ئەو رووحەیە کە (خوای گەورە ) بە بەری هەموو مرۆڤێك و زیندە وەرێك گیانداریکی کردووە ، تا ئێستاش نەزانراوە ، وە هەرگیز تاکۆتای ژیانیش واتە: تا رۆژی قیامەت نازانرێت ..؟! ئەمەش یەکێکە لە موعجیزە هەر گەورە کانی (خوای گەورە ) و لە قورئانی پیرۆز دا هاتووە کەمرۆڤ شارەزایی لێ نیە و ناش زانرێت تەنها (خوای گەورە ) دیزانێت علم زاستی پێ هەیە ..؟! قال تعالی: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾﴾ [الإِسۡرَاء : ٨٥]واتە : هەندێك کەس پرسیارت لێ دەکەن دەبارەی (رووح ) چیە و چۆنە ..؟! لە وە لامیاندا تۆ بلێ : (رووح ) نهێنی پەروەردگارمە و بەدەست ئەو زاتەیە ، بە فەرمانی ئەو زاتە دەبەخشرێت بە هەر مرۆڤێك و زیندەوەرێك و گیان لەبەرێك ، هەر بە فەرمانی ئەویش وەردە گیرێتەوە دەردەکێشرێت ، (من هیچی لێ نازانم ) دلنیاش بن کە ئێوە بە شێکی کەمتان لە زانست و زانیاریی پێدراوە ..؟! ( لەم سەر دەمەی عەلەمە زانست پسپۆری و زاناکان دا هەر یەك لە بوارێکی زانستی دا ، زیاتریش بۆ زانایان دەرکەوتووە کە هەتا زانست پێش بکەوێت بازنەی نادیاری شتە نەزانراوەکان زیاتریش دەبێت ، وە بازانەی پسپۆری بوون تەسکتر و بچووك تر دەبێتەوە ..!!) قوریشە کان کاتێ لە گەل جوولە کەکەان کۆدەبوونەوە ، بە جوولە کە کانیان دە ووت چونکە ئەوان خاوەنی کتابی ئاسمانی بوون شتیان دەزانی بۆیە قوریشە کان بە جوولە کە کانیان ووت : شتێکمان پێ بلێن : با ئێمەش پرسیار لە ﷺ بکەین دەبارەی ...!! ئەوانیش واتە : جوولە کە کان ووتیان : بە قوریشە کان پرسیار لە ﷺ دەربارەی (رووح ) لێ بکەن ..!! هەر بۆیە (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە ، کە (رووحی ) پەیوەست کرد بە فەرمانی خۆیەوە ..!! بەلی لە سەردەم رابردوو دا وە لەسەردەمی ئێستادا وە لە ئایندەش کەدێت ، هەر چەندە زانا پسپۆر بن لە بوارە زانستەکانی خۆیان بە سەردەمی رابروو ئێستا و ئایندەش کە دا دێت ، لە هەندێك زانستدا پەی پێ نابەن هەر زانی نیشان لە سەر زانستەکە نیە ، چونکە هەندێك زانست سنووردارە تایبەت بە زاتی (اللە ) تاکۆتایی تەمەنیشی پەی پێ نابات ، بۆیە زانستی خوا فراوانە هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَـٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَـٰتُ رَبِّى وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾﴾ [الكَهۡف : ١٠٩] واتە: ئەی پەیامبەری خوا صلی اللە علیه وسلم بڵێ : ئەگەربێتو ئاوی دەریا حوبر بێت بۆ ئەو پێنووسانەی کە فەرمایشتی خوا لە حیکمەت ودانایی پێدەنووسرێن، ئەوا ئاوی دەریا تەواو دەبێت و کۆتایی پێدێت پێش ئەوەی ووشەکانی خوا تەواوبن، ئەگەریش هاوشێوەی ئەو دەریایە چەند دەریایەکی تریش بهێنین بۆ یارمەتی دانی . لەم ئایەتەدا جێگیرکردنی سیفەتی کەلامی تێدایە بۆ خوای پەروەردگار بەشێوەیەك کە شایستەی گەورەیی و مەزنی خوا بێت ..!!

شی کردنەوەی هەندێك ووشە :

﴿لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ﴾ واتە: بە مانای (حیاء) لە زمانی عەرەبی دا دێت ، یان بە زمانی کوردی بە مانای شەرم یان شورەیی هەژمار دەکرێت ، بەلام ئەگەر بۆ زاتی (خوای گەورە ) بگەڕێتەوە دەبێت ئەم مانایا نەگرێت چونکە نابێت لایەقی زاتی (اللّٰه ) بێت ، (خوای گەورە زاناترە ) ، یان (الحياء : إنقباص النفس عن القبائح و تركه ) واتە : (حیاء) : بریتیە لەوە کە مرۆڤ لە کاتێکدا لە گەل شتێکی ناشرین روو بەروو دەبێتەوە ، باروو دۆخیچکی گرژیی و هاتنەوە یەکی بۆ دروست دەبێت ، وە واز لەو شتە بێنی ، کە لێرە دا (خوای گەورە ) مە بەست پێ وازهێنانی شتە کەیە ، ئەگەر نا ئەو باروو دۆخە مرۆڤ شەرم دەکات بۆی دروست دەبێت ، کە گرژیی هاتنەوە یەکە ، ئەوا بێ گومان بۆ (خوای گەورە ) راست نیە ..!! چونکە بارودۆخی نەفسی جستەیی کە لە ئێمە روو دەدەن ، بەدلنیایەوە لە (خوای گەورە ) روونادادات ، چونکە هەر خۆی دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾ [الشُّورَى : ١١] واتە : چونکە هیچ شتێك وێنەی ئەو نیە ،و لە هیچ شتێك نا چێت هەرچی ئێمەی مرۆڤ خەیال و بیری لێ دە کەینەوە ، هەموو لە چوار چێوەی دروست کراوە کانی (خوای گەورە ) دایە ..؟! بەلام (حیاء ) مەبەست پێی هاتنە دی ئەنجامەکەیەتی و ن کەسێك شرمی لە شتێك کرد ، ئەو شتە ناکات ، تەنها بۆ تۆ گەیشتنە (خوای گەورە زانا ترە )..!!

﴿يُضِلُّ﴾ واتە: گومرا دەکات (أصل الضلال : العدول عن الطريق المستقيم ) واتە : (ضلال ) لە بنەرەتدا لادانە لەرێ راست ..!!

﴿ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦﴾ واتە : کۆیە کەی (فاسق ) واتە : لادەر ، ئەصلی ووشەی (فِسق)یش ، لە (فَسَقَ) یە ، واتە : خرج یانی دە رجوونە ، (فسقت الرطبة إذا خرجت عن قشرها ) واتە : فەریکە خورما دەرجوو ، هەر کات لە تویکلە کەی هاتە دەرێ ، میوە لە تویکلە کەی دێتە دەری ، واتە : (فسق ) دەرچوونە ، لایدا کە ، لێرە دا مەبەست دەرچوون و لادانە لە سنووری شەرعدا..!!

هەرەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت قال تعالی: ﴿إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾ [الحُجُرَات : ٦] واتە : ئەگەر هاوا لێك لە لایەن کەسێکی فاسق و درچوو لە گوێرایەلی خوا باوەری پێ مەکەن ..!! هەروەها دەفەرموویێت قال تعالی: ﴿أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ١٨﴾ [السَّجۡدَة : ١٨] واتە: ئایا رەوایە کە باوەردارو ، دەرچوون لادان لە فەرمانی(خوای گەورە ) وەك یەك بنن ..؟! یان ئایان ئەو کەسەی کە ئیمانی هێناوە ، وەك ئەو کەسە وایە کە لە ئیمان دەرچووە ..؟! بێ گومان هەر گیز ئەم دووانە لە هاوسەنگی دا وەك یەك نین ..!!

﴿مَثَلٗا﴾ واتە : کۆیەکەی (أمثال ) واتە : (مثل ) بریتە لە ووتاری دەلالەت یان بەلگە هێنانەوە یان نموونە هێنانەوە ، یان لە سەر شێوەی بوو بێ بە (مشبە بە ) واتە : وێنەی ، بەلێ (مثل ) یان وێنە هێنانەوە بۆ هەموو سەردەمێك و زەمەنێك دا بە کار هاتووە بۆ پەند وئامۆژگاری کردن یان سوود لێ وەرگرتن بۆ زانینی و مەعریفە ..!!

قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا﴾ [البَقَرَة : ٢٦] . بەڵێ (خوای گەورە) دوای ئەوەی دوو نموونەی هێنایەوە لە سەر دوو رووەکان ، پاشان (خوای گەورە ) نموونەیەکی تریش دە هێنێتەوە وەلامی کافرانی قریش دەداتەوە، بەوەی کە شەرم ناکات بەو نموونەی کە باسی دەکات وەك نموونە هێنانەوە یان وێنە هێنانەوە بە شتی بچووك یان شتی گەورەتر ، شتی بچووك وەکو ﴿بَعُوضَةً﴾ واتە : پێشکە یان مێشوولە یان مێشی بچووك ، هەروەها دەفەرمووێت : ﴿فَمَا فَوْقَهَا﴾ واتە: (فاء) عاطیفة ، (ما ) موصولة ، بە مانای (الذي ) دێت ، یان (الذب فوق بعوضة ) واتە : ئەوەی کە لە پێشکە یان مێشوولە گەورەترە ، وەك : مێشەنگین جالجالۆکە نموونەی تر کە لە قورئانی پیرۆز دا باس کراوە ، لەوانەیە ووتەی ﴿فَمَا فَوْقَهَا﴾ مەبەست پێ کەمتر یان بچووکتر بێت وە ك مێروستان ، کەواتە : ووشەی (فوق ) بۆ (أدنى و أعلى ) بەکاردێت ، هەروەك ووشەی (وراء) بۆ پێش و پاش بە کاردێت ، قال تعالى: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ واتە : جا ئەوانەی ئیمانیان باوەریان هێناوە ، ئەوە چاك دەزانن ئەم نموونەیە راستە و لە لایەن پەروەردگاریانەوەیە ، بیری لێ دەکەنەوە و هیدایەت و ئیمانیان هەر لە زیاد بوون دەبێت ، قال تعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا﴾ واتە: ئەوانەش کافر و بێ باوەریان دەڵێن : خوا مەبەستی چی بوو لەم نموونەیە دا ..؟! سەرنج بدەن ئەو کافرانە کوفرو ئیلحادیان گەیشتۆتە چ ئاستێك ..؟! بسەیری ئەم کافرانە بکەن دەڵێن : (بهذا) بۆ (التحقیر ) بە کاردێت ، واتە: ئەمە بۆ بەکەم دانانە ، سەیری باردۆخیان بکەن کوفرە کەیان یان ئیلحادەکەیان گەیشتۆتە چ ئاستێك ..؟! قال تعالى: ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِي بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾﴾ واتە : رۆزێك پێی گومرا دەکات زۆرێکی تریش پێ هیدایەت و رێنموویی دەکات ، بەلام دیارە جگە لە لار خوارو خێچی لە سنور دەرچووان یان یاخی و تاوانباران کەسی تر گومرا ناکات ..!! بەڵێ جێگیر کردنی سیفەتی شەرم بۆ (خوای گەورە) لەبەر ووتەی ﴿لَا يَسْتَحْيِۦٓ﴾ رووی کردن بەلگە : نەفی کردنی شەرم لە (خوای گەورە ) بەلگەیە بۆ جێگردنی شەرم بەرامبەری، بێ گومان لەم ئایەتەدا شەرم بۆ (خوای گەورە ) جێگیر کراوە ، بەلام وەك شەرم کردنی دورست کراوە کانی نیە ، چونکە شەرمی دورستکراوە کانی لاوازە شکانی تیدایە ..؟! بۆیە کاتێك کەسێك شەرم دەکات دەشکێتەوە و قسە ناکات ، یان ئەو شتە ناکات کە جێگای شەرم بێت ..؟! ئەم سیفەتە لاوازە کەم کوریە ئەگەر لەشوێنی خۆی نەبێت ، بەلام سیفەتی (خوای گەورە ) کمال لە هەموو شتێك دا واتە : سیفتەکە وەك سیفەتی بەندەکانی نیە ، چونکە خۆی دروستکارە ، لە هەموو شتێك کامل و کمالە واتە : هیچ کەم کوریەکی نیە تەواوە ، وە سیفەتەکانی (خوای گەورە ) هەر گیز لە دروست کراوەکانی ناچێت ، چونکە لە هەر سیفەتێك دا بەندە کامل و تەواو نیە ، بەلکو نقص و کەم کوری هەیە ، بەلام سیفە تەکانی (خوای گەورە ) هەر هەموو کامل تەواو کمال هیچ نقص کەم کوری تێدانیە ..!!

هەروەك دەفەرمویت قال تعالى: ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ﴾ [الحَشْر : ٢٤]واتە : هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ ] خوای گەورە دروستکارە، یان تەقدیری شتەکان ئەکات بە گوێرەی ویست و ئیرادەی خۆی [ الْبَارِئُ ] ئەوەی کە خوای گەورە تەقدیری کردووە ئەیهێنێتە بوون و دروستی ئەکات لەبەر ئەوەی هەموو کەسێك ناتوانێ ئەو شتەی کە دایئەنێ و تەقدیری ئەکات دواتر دروستی بکات و بیهێنێتە بوون ئەمە تەنها بۆ خوای گەورەیە [ الْمُصَوِّرُ ] وە خوای گەورە وێنەکێشە وێنە ی دروستکراوەکان ئەکێشێ بە جوانترین شێواز..!!

چونکە قیاس لە شەرعدا حوجەیە ، چونکە هەموو نمونەیەك لە قورئانی پیرۆز دا بە بەلگە یە بۆجێگیر کردنی قیاس ، هەروەها ووتەی : قال تعالى: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡ﴾ ئەمە فەزلی ئیمان هێنانە ، چونکە ئیماندار ناکرێت دژی بوەستێت و گومانی هەبێت کە (خوای گەورە ) نازلی کردووە ، هەروەها ئیماندار رەخنە ناگرن و نالێن : بۆچی ..؟! چۆن ..؟! بەلکو دەلێن : گوێمان لێ بوو ، وە بەرستمان دانا وە گەواهیماندا ، وە گوێرایەلین ، چونکە ئیمانیان بەوە هێناوە (خوای گەورە ) حیکمەتی داناوە لە شەرعدا ، وە هەر شتێکی نازل کردبێت ئەوا بەدلنیاییەوە حیکمەتی خۆی تێدایە (خوای گەورە زانا ترە ) ،

بۆیە (خوای گەورە ) زانستی بە ئیمانداران داوە مەبەست پێ زاستی شەرعیە ئەمە بەهۆی فەزلی ئیمانەکەیانەوە ، هەر بۆیە راستی دەبینیت وە راستەقینە لە ئایەتەکان دەگات یان لە فەرموودە کانی (خوای گەورە ) دەگات تێ گەیشتنی تەواو راستە قینەی بۆی هەیە بۆ سەرگەردان گومرا نابێتە ، ئەمەش بە هۆی فەزلی ئیمانە کەیەتی کە دامەزراوە لە دلەوە ،زۆر بە باشی لەم نمونانە دگات کە (خوای گەورە ) بۆ ئیمانداران و کافران و مونافیقە کان و مولحیدەکان لە قورئانی پیرۆز دەیان هێنێتەوە ، هەروەك دەفەرمووێت:

قال تعالى: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡ﴾ لێرە دا سەرنج بدەینە ووشەی ﴿رَّبِّهِمۡ﴾ ئەوا جێگیر کردنی پەروەردگار وە تایبەتی خوا بۆ ئیمانداران کە باوەریان پێ هێناوە ..!! بەلێ جێگیر کردنی قەدەر یان چارە نووس و هیدایەت یان رێنمووی کردن ، هەروەها جێگیر کردنی گومرایی و سەر گەردانی ، یان تاریکی ، ئەم دوو وانەی بە یەکەوە هێناوە تەوە ، ئەمە دەلالەت یان بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە هیدایەت و گومرایی هەردووکیان لە بەدەستی (خوای گەورە ) ئەگەر ویستی لێ بێت کە سێك هیدایەت بدات ئەوا بەدلنیایەوە هیدایەتی دەدات ، ئەو ئەگەریش ویستی لێ بێت گومرایی بکات ئەوا بەدلنیایەوە گومرای دەکات ، هەروەك دەفەرمووێت قال تعالى: ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ﴾ [الكَهْف : ٢٩]واتە : [ وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - بەو بێ ئاگایانە بلێ: ئەم دینەی کە من هێناومە حەقەو هیچ گومانی تێدا نیەو لە لایەن خوای گەورەوەیەو لە لایەن کەسی ترەوە نیە [ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ ] جا هەر کەسێك ویستی لێیە با ئیمان بێنێ [ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ] وە هەر کەسێکیش ویستی لێیە با کوفر بکات..!!

کەواتە : لێرە دا بۆمان دەر دەکەوێت هیدایەت و گومرایی هەردووکیان بەدەست (خوای گەورە ) یە ، لە بەر ووتەی قال تعالى: ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرًاۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦﴾ [البَقَرَةِ : ٢٦] ئەگەر سەرنج بدەین ووشەی قال ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا﴾ بە پێش ووشەی ﴿وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرًا﴾ کەواتە وا دەر دەکەوێت کە ئەوانەی گومران زیاترن لە وانەی هیدایەت دا چونکە هەمیشە ئەوانەی ئیمان و باوەریان هەیە یان هیدایەت دراون لە لایەن (خوای گەورە ) کەمترە لە وانەی کە گومراو سەر گەردان ، بۆ هەمیشە رێنمووی کاران کەمترن ، بەلام ئایەتەکە لە ظاهری دا وا دەردەکەوێت ، هیدایەت دەران و گومرا کەران یەکسانن لە زۆری دا بەلام وانیە ، ئەوانەی کە گومران زیاترن لەوانەشە یەکەم جار باسی گومرای بوون دەکات ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا﴾ وە دوا تریش دەفەرموویت ﴿وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرًا﴾ چونکە لە زۆر شوێندا (خوای گەورە ) ئیمانداران یان هیدایەت دەرانی بە ژمارە بە کەم داناوە هەروەك دەفەرمووێت قال تعالى: ﴿طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيۡهَا بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ١٥٥﴾ [النِّسَاء : ١٥٥]واتە : بەڵکو خوای گەورە بەهۆی کوفری خۆیانەوە مۆری لەسەر دڵیان داوە [ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا (١٥٥) ] بۆیە ئیمان ناهێنن تەنها کەمێکیان نەبێت..!! قال تعالى: ﴿وَمَنۡ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ ٤٠﴾ [هُود : ٤٠]واتە : [ وَمَنْ آمَنَ ] وە باوەڕدارانیش هەمووی بخەرە ناو کەشتیەکەوە [ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلَّا قَلِيلٌ (٤٠) ] وە تەنها کەسانێکی کەم لەگەڵیدا ئیمانیان هێنا کە وتراوە: لای زۆریەکەی هەشتا کەس بوونە..!!هەروەها (خوای گەورە ) ئەوانەی کە زۆرن لە خەلکی ئەوانەن کە دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ [المَائـِدَة : ٤٩] واتە : وە زۆرێك لە خەڵكی فاسیقن و لە ڕێگاو گوێڕایەڵی خوای گەورە دەرچوونە...؟! قال تعالى: ﴿وَإِنَّ كَثِيرٗا لَّيُضِلُّونَ بِأَهۡوَآئِهِم بِغَيۡرِ عِلۡمٍ﴾ [الأَنۡعَام : ١١٩]واتە: وە بە دڵنیایی زۆرێك لە کافران بەهەواو ئارەزووی خۆیان خەڵکی گومڕا ئەکەن، (کە باسمان کرد هەندێك لەو ئاژەڵانە خۆیان لەسەر خۆیان حەرامی ئەکەن و نایخۆن)..؟! قال تعالى: ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضۡلَلۡنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ [إِبۡرَاهِيم : ٣٦]واتە : ئەی پەروەردگار ئەم بتانە بوونەتە هۆی گومڕا کردنی زۆرێك لە خەڵکی..؟! کەواتە لێرە دا بۆمان دەر کەوت کە زۆرینەی خەلکی گومراو سەرگەردان و لە سنوور دەچوون و فاسق و سەر لێ شێواون ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) خەلکانیچکی زۆر گومرا دەکات ، بە دادپەروەری خۆی ، ئەوانیش کافرو لە سنورر دەچوو مولیحد و گومراکانن ، لەبەر ئەوەی رەخنە دەگرن ئینکاری دەکەن ، ئیتر گومرایی لە دوای گومرایی دێت و زیاد دەبێت لەبەر ووتەی ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا﴾ ، هەروەها خەلکانێکی زۆریش هیدایەت دەددات بە هیدایەت رێنموویی و فەزلی خۆی ، ئەوەش ئیماندرانن ، هەر لەبەر ئەمە زانستی شەرعیان هەیە کە ئەمە حەقە لە لایەن پەروەردگاریانەوەیە ، هیدایەتی ئیماندارانیش زیاترو زیاتر دەبێت ، لەبەر ووتەی ﴿وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرًا﴾ هەروەها (خوای گەورە ) هیچ کەس گومراو سەرگەردنان ناکات مەگەر فاسق و لە سنوور دەرچوون نەبێت ، هەر بە هۆی ئەم فاسقیەکەیان گومراو سەر گەردان دەبن ..؟!

هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەیە (٢٦)سورەتی البقرە

✍ لە ڕێ (السدی ) لە (ابی مالك وابی صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بێت - دەلێت : کاتێك (خوای گەورە ) ئەم دوو نموونەی هێنایەوە : قال تعالی: ﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] واتە : ئەمانە راستێ وێنەیان وەك کەسێك وایە : لە شەوێکی تاریکا ئاگرێك هەلگیرسێنێت . وە (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ [البَقَرَةِ : ١٩] واتە: یان وەك کەسانێ کە بارانێکی بە تەوژم لە ئاسمانەوە ، هەروەها ئەم ئایەتی تریش کە دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ أَن يَضۡرِبَ مَثَلٗا مَّا بَعُوضَةٗ فَمَا فَوۡقَهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٦] واتە: ئەم سێ ئایەتە کە (خوای گەورە ) بە نموونە هێنایەوە ، ئینجا دوو ڕووەکان ووتیان: خودا زۆر بەرزو بلند ترە لەوە کە ئەم نموونانە بێنێتەوە ، (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە تادەگاتە قال تعالی: ﴿... أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٢٧﴾ [البَقَرَةِ : ٢٧]واتە : ئا ئەمانە زەرەرمەندن لە دونیاو لە قیامەتدا..!!).[1]

✍ لە (الحسن ) لە (قتادة ) لە (عطاء ) لە (ابن عباس) خوا لی رازی بیت -دە لیت : کاتێك (خوای گەورە ) باسی مێش جالجالۆکەی کرد لە کتابە کەی خۆی بە نموونە یان بە وێنە هێنایەوە ، بۆ موشریکان ، ئەوکات جوولە کەکان پێکەنین بەم نموونەیە ، ووتیان : ئەمە هاوشێوەی کلامی خودایە ..!! ئینجا (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابە زاند ..).[2]

✍ لە ڕێ ( ابن جريج ) لە (عطاء ) لە ( عبدالله بن عباس ) –خوا لی رازي بيت– دەلێت : (خوای گەورە ) کاتێك باسی خودای موشریکانی کرد فەرمووی : قال تعالی: ﴿وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا﴾ [الحج : ٧٣] واتە : نەك هەر ئەوەش بەڵکو لەمە یش بێدەسەڵاتترن ئەگەر مێشەکە شتێکیان لێ بڕفێنێت و بیبات..!! وە هەروەها باسی فیل و پیلانی خواوەندەکانی کردن ، کە وە مالی جالجالۆکە وایە ، ووتیان : ئایا بینیوتانە خودا لە کوێ باسی مێش و جالجالۆکەی کردووە ..؟! لەو شتانەی کە لە قورئانە وە بۆ محمد ﷺ دابەزیوە.؟! ئەوە چی لێ دورست کراوە ..؟! (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابەزاند، قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ أَن يَضۡرِبَ مَثَلٗا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٦]

✍ لەرێ (سعيد ) لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لێ بيت – دەلێت : خودا شەرم ناکات لە لە باسی شتێ کە حەق بێ ، با ئەو شتە بچووك بێت یان گەورە بێت ، کە (خوای گەورە ) کاتێ لە کتێبەکەیداباسی مێش و جالجالۆکە دەکات ، ئەو کەسانەی کە گومران دەلێن : خودا مەبەستی چیە لە باسی ئەمانە ..؟! (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ أَن يَضۡرِبَ مَثَلٗا مَّا بَعُوضَةٗ فَمَا فَوۡقَهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٦]. ).[3]

---
[1] -الواحدي اسباب النزول ص٢٣ .
[2] - الواحدي في الوسيط (١٠٧/١).
[3] -اخرجه ابن جرير (٤٢٤/١) ، طبراني في التفسير (٣٩٩/١).

✍ لە ( ابي جعفر الرازي) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : ئەم نموونەیە کە (خوای گەورە ) هێناویەتەوە ، بۆ دونیا چونکە مێش تا برسی بێت دەژی و دەمێنی ، کاتێ قەڵە و بوو ترێر بوو دەمرێت ..؟! هەر وەها ئەو کە سانەش کە (خوای گەورە ) ئەم نموونەیان لەسەر هێناوەتەوە لە قورئاندا کاتێ لە دونیا دا تێریان خوارد بێ نیاز بوون ،لە و کاتەدا (خوای گەورە ) دەیان گرێ و لە ناویان دەبات ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : قال تعالى: ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَبۡوَٰبَ كُلِّ شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةً فَإِذَا هُم مُّبۡلِسُونَ ﴿٤٤﴾﴾ [الأنعَام : ٤٤] واته : وه کاتێك كه ئه‌وان وازیان لەکردەوەکردن بەفەرمانەکانی خوای بەرز وبڵند وپایەبەرز هێنا و پشتیان لێکرد، دەرگای هەموو شتێکمان لەسەر کردنەوە، و لەجیاتی ناخۆشی و تەنگانە خۆشگوزەرانی و لەجیاتی نەخۆشی و بەڵا لەش ساغی و تەندروستی، ئەمەش بۆ ئەوەی زیاتر لەتاوان وسەرپێچیدا رۆبچن ونغرۆبن، هەتا وایان لێهات هەقیان ڕەتکردەوە و تووشی لەخۆباییبون بوون بەوەی پێمان بەخشیون لە خێر و نیعمەت، لەناکاو تووشی سزای سەختمان کردن، بۆیە ئەوکاتە بێ ئومێدبوون لەهەموو خێر و چاکەیەك ..!! ).[1]

✍ لە ری (ابن ابي نجيح ) له (مجاهد ) – ره حمه تى خواى لى بيت – له سه ر ووته ى : قال تعالى: ﴿مَثَلٗا مَّا بَعُوضَةٗ فَمَا فَوۡقَهَا ۚ فَأَمَّا﴾ واته: هەموو نموونەيك له بچووك گەورە دا ..).[2]

✍ له رى (سعيد) له (قتاده ) – ره حمه تى خواى لى بيت- له سه ر ووته ى: قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ أَن يَضۡرِبَ مَثَلٗا مَّا بَعُوضَةٗ فَمَا فَوۡقَهَا﴾ واته : (خوای گەورە ) شەرم ناکات لەوەی حەق کە باسی هەر شتێك بکات ،وەك نموونە هێنانەوە لە سەر پێشکە یام مێش یان لەوە زیاتریش ..).[3]

✍ له (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ أَن يَضۡرِبَ مَثَلٗا﴾

دەڵێت :مانای وایە : (خوای گەورە ) هیچ شەرمێك نابێتە رێگری لەوەی کە نموونە بێنێتەوە بە دروست کراوە کانی خۆی وەك : قال تعالى: ﴿مَّا بَعُوضَةٗ فَمَا فَوۡقَهَا﴾ ..).[4]

---

[1] -اخرجه ابن جرير(٤٢٣/١).
[2] - تفسير مجاهد ص ١٩٨ .
[3] -اخرجه ابن جرير(٤٢٤/١).
[4] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٥/١).

📖 لە (ابی هریره ) – خوا لی رازی بیت – دە لێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((يا أيُّها الناسُ لا يَغْتَرَّنَّ أحدُكم باللهِ، فإن اللهَ لو كان غافلاً شيئًا لأَغْفَلَ البَعوضةَ، والخَرْدَلَةَ، والذَّرَّةَ)).[1] واتە : ئەی خەلکینە ، با هیچ کام لە ئێوە لە لایەن خوداوە نەگۆر درێن ، چونکە ئەگەر خوا بیٔ ئاگا بوایە ،ئەوا هەر گیز پێشکە و یان مێش و دەنکە گەنم و گەردیلەی پشت گوێ نەدەخست ..؟!

📖 لە (ابی هریره ) – خوا لی رازی بیت – دە لێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إنَّه لَيَأْتي الرَّجُلُ العَظِيمُ السَّمِينُ يَومَ القِيامَةِ، لا يَزِنُ عِنْدَ اللهِ جَناحَ بَعُوضَةٍ، اقْرَؤُوا {فَلا نُقِيمُ لهمْ يَومَ القِيامَةِ وزْنًا} ).[2] واتە: لە ڕۆژی قیامەت دا پیاوێکی قەلەوەی ئاوا زەبەلاح دێت کە لە لای (خوای گەورە ) نرخی یان بەهای بالە پێشکەیەکی یان مێشکی نیە ، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە قال تعالى: ﴿... فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنٗا ١٠٥﴾ [الكَهۡف : ١٠٥] واتە: وە لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ کێشێکیان بۆ دانانێین و هیچ نرخێکیان نیە، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - فەرمووی: (لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوی گەورەی قەڵەو دەهێنرێت و دەکێشرێت سوك و بێنرخەو کێشی باڵە مێشولەیەکی نیە، پاشان فەرمووی ئەم ئایەتە بخوێننەوە)..!!

✍ لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازي بيت – لە سە ر ووتە ی قال تعالى: ﴿فَمَا فَوۡقَهَا﴾ واتە: مێش و جالجالۆکە ..).[3]

✍لەریٚ ( معمر ) لە (قتادە ) – رە حمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەلیٚت : پێشکە لاواترین شتە کە (خوای گەورە) دورستی کردووە..).[4]

📖 لە (عائشة ام المؤمنين ) – خوا لی رازی بیت – دەگێریتەوە دەلێت: بیستوومە : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((ما مِن مُسْلِمٍ يُشَاكُ شَوْكَةً، فَما فَوْقَهَا إلاَّ كُتِبَتْ له بهَا دَرَجَةٌ، وَمُحِيَتْ عنْه بهَا خَطِيئَةٌ)). [5] واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هیچ موسلمانێك نیە ئەگەر درکیچك بچێت بە جستەیە یان لە درکێك زیاتر ، ئەوە بەم کارە پلە یەکی بۆ دە نووسرێت و تاوانیچکی لە سەر هەلدەگیرێت ..!!

[1] - شيخ الالباني في سلسلة الضعيفة برقم (١٢١٤).
[2] - صحيح مسلم برقم (٢٧٨٥).
[3] -تفسير الثعلبي (١٧٢/١).
[4] -اخرجه ابن جرير (٤٢٦/١).
[5] -صحيح مسلم برقم (٢٥٧٢).

✍ لە ڕێ (ابن ابی نجیح ) لە (مجاهد ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ﴾واتە: ئیمانداران باوەڕیان هێنا ، وە دەزانن و دەرکی پێ دەکەن کە ئەوە حقیقەت ڕاستی یە لە لایەن پەروەردگاری خۆیانەوە ، وە (خوای گەورە ) بەم نموونەیە ڕێنمایان دەکان ..).[1]

✍ لە ڕێ (عبادە بن منصور ) لە (الحسن البصری ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡ﴾ واتە: ئەوان دەزانن و بەم تاقی کردنەوەیە ، بۆ ئەوەی کە (خوای گەورە ) دەزانیت کێ بە فەرمانەکەی دەزانێت ، وە بەڕاست زانینی ئەوشتانەی کە دەفەرمووێت ، وە دلنیاشە لەوەی کە (خوای گەورە ) لە کتێبەکەی دایبەزاندووە و حەق و ڕاستە ، وە ئەوەی کە دەی فەرمووێت ، وەکو خۆیەتی کە دەی فەرمووێت ..).[2]

✍ لەڕێ (سعید ) لە (قتادە ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡ﴾ واتە: ئیمانداران دەزانن ئەوە ووتەی (الرحمن ) ، ئەو ووتانەش حەق و ڕاستن لە لایەن (خوای گەورە ) یە ، قال تعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗا﴾ ..).[3]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتە: بەڕاست دانانی قورئانی پیرۆز ، قال تعالى: ﴿فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ﴾ واتە: ئەم نموونەیە قال تعالى: ﴿ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡ﴾ ..).[4]

✍ لە ڕێ (سعید ) لە (قتادە ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ واتە : دلە کانیان نەخۆشە ، قال تعالى: ﴿فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗا﴾ ..).[5]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – ەرحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ لە قورئاندا : بەواتای : جوولەکەکان دێت ، قال تعالى: ﴿فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗا﴾ ئەو باسەی ﴿مَثَلٗا﴾ واتە : ﷺ هەر لە خۆیەوە هەلی بەستووە دەی لێت : نەك لە لای خواوە هاتبێت ، ئینجا (خوای گەورە ) پی فەرمووی : قال تعالى: ﴿بِهِۦ كَثِيرٗا﴾ لەم ئایەتە دا ..).[6]

---

[1] -تفسير مجاهد ص١٩٨.
[2] -اخرجه ابن ابي حاتم (٦٩/١).
[3] -اخرجه الدرامي (٥٣٢/٢) و ابن جرير (٤٣١/١).
[4] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٥/١).
[5] -اخرجه ابن ابي حاتم (٦٩/١).
[6] -تفسير مقاتل بن سليمان ((٩٥/١).

✍ لە رێ (السدی ) لە (ابی مالك وابی صالح ) لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا﴾ دەڵێت : واتە دوو رووەکان یان مونافیقەکان ، قال تعالی: ﴿وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرًا﴾ واتە : باوەرداران یان ئیمانداران ، واتە : بەمەست پێ دووررووە کان پی گومرادەکات ، وە ئیمانداران پێ شارەزاو رێنموییی دەکات ، ئەو کەسانە واتە: دوو رووەکان گومرایان پێ زیاترو زیاتر دەبێت ، چونکە بە درۆیان دەخستەوە ، کەچی باش دەیانزانی کە کە دلنیابوون کە حەق و راستە ، ئەو نموونە هێنانەوەی (خوای گەورە ) بۆ ئەوان کە هێنایەوە ، بەلام بەم هێنانەوەیە موافق نەبوون ، ئینجا (خوی گەورە ) گومرای کردن ، قال تعالی: ﴿وَيَهۡدِي بِهِۦ﴾ واتە : بەم نموونەیە زۆریچك لە ئەهلی ئیمان بە راستی یان زانی یان بەراستی دانا ، بەمەش (خوای گەورە ) هیدایەت و رێنمووی زیاتر و زیاتر کرد بۆ ئیمانداران ، واتە: ئیمانیان زیاترو زیاتر دامەزراو کرد ، بە هۆی ئەوەی کە بە راست وحەق یان زانی دلنیا ومتمانەی تەواویان هەبوو لە سەر موافق بوون بەم نموونەی کە لە لایەن (خوای گەورە ) هاتووە ، زۆر بە چاکی دانیان پێدانا یان گەواهیان دا لەسەر ئەم نموونانە ، ئینجا لە لایەن (خوای گەورە ) هیدایەت و رێنمووی کران ..).[١]

✍ لەرێ (ابنە مصعب ) لە (سعدبن ابی وقاص ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا﴾ دەڵێت : واتە : خوارج یان خواریجەکان ..).[٢]

✍ لە رێ (ابن ابی نجیح ) لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوا ی لی بێت – لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا﴾ دەڵێت : واتە : ئیمانداران دیان زانی وە باوەریان پێ هە یە، بەلام فاسیقەکان یان لە سنوور دەرچووەکان دەیانزانی بەلام بێ باوەر بوون پێی..).[٣]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رحمەتی خوای لی بیت – دەڵێت : قال تعالی: ﴿يُضِلُّ بِهِۦ﴾ واتە: (خوای گەورە ) گومرای کردن بەم نموونەیە ، قال تعالی: ﴿كَثِيرًا﴾ زۆرێك لە خەلکی ، واتە : جوولە کەکان ، قال تعالی: ﴿وَيَهۡدِي بِهِۦ﴾ واتە: بەم نموونە یە ، قال تعالی: ﴿كَثِيرًا﴾ واتە: زۆرێك لە خەلکی واتە: ئیماندارانی رێنموییی هیدایەت دا ..).[٤]

✍ لە رێ (السدی ) لە (ابی مالك و ابی صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت - لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦﴾ واتە: ئەوانە مونافیقە کان بوون ..).[٥]

---

[١] -اخرجه ابن جرير (٤٣٣/١).
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧٠/١).
[٣] عزاه السيوطي الي عبد بن حميد ، في تفسير المأثور (١٨٧/٢).
[٤] -تفسير مقاتب بن سليمان (٩٥/١).
[٥] -اخرجه ابن جر ير (٤٣٤/١).

✍ لەرێ (ابن جريج ) لە (مجاهد ) لە (عبدالله بن عباس ) – رەحمەتی خوای لی بیت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦﴾ دەڵێت : واتە : بێ باوەرە کان یان کافران ..).[1]

✍ لە رێ (الربيع بن أنس ) لە ( أبى العاليه ) – رەحمەتی خوای لێ بیت – لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦﴾ دەڵێت : واتە : ئەوانە خەلکی دوو رووەکانن ..).[2]

✍ لەرێ (ابن ابی نجیح ) لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوا لی بیت- لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦﴾ دەڵێت: لە سنوور دەرچووان واتە فاسیقەکان دەیانزانی ،بە لام بێ باوەر بوون پێ یان ئینکاریان دەکرد ..).[3]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لی ربیت –لە سەر ووتەی : قال تعالی: ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ﴾ دەڵێت : بەم نموونەیە قال تعالی: ﴿إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦﴾ واتە: جوولەکە کان ، (خوای گەورە ) ئەم هەواڵەی راگەیاند دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ [البَقَرَة : ٢٧] واتە: ئەو کەسانەی کە عەهدو پەیمانی خوای گەورە هەڵئەوەشێننەوە لە دوای ئەوەی کە عەهدو پەیمانیان داوەو خۆیان پێوە پەیوەست کردووە..!!

📖 لە (عائشه ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((خَمْسٌ فَوَاسِقُ، يُقْتَلْنَ فى الحِلِّ وَالْحَرَمِ: الحَيَّةُ، وَالْغُرَابُ الأبْقَعُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْكَلْبُ العَقُورُ، وَالْحُدَيَّا)).[4] واتە: پێنج زیندەوەر زیان بەخش هەیە لە مککە سنووری دەوربەری مەکە دەکوژێن ، ( مار ،قەلە رەشی بازو ، مشك ، سەگی هار ، کۆلارە )

بەلێ عەرەب دەلێن : (خست الرطبة ) واتە: کاتێ لە کونەکەی خۆی هاتە دەرەوە ، هەر بۆیە بە مشك دەلێن : فسق یان لەرێ لادەر یان لە سنوور لادەر ، کاتی لە کۆنەکەی خۆی هاتە دەرەوە بۆ بەدکاری ، واتە (فاسق ) خوانەناس لاساری و دەگرێتەوە ، بەلام لاساری خوانەناسی زۆر خراپترە چەپەل ترە ، مەبەست بە لاساری یان لەرێ لادەر واتە: (الفاسق) خراپە کاری لە سنوور دەچوو، هەر بۆیە بە (فسق ) دەلێن : کەسێك خراپەکاری کردووە ، وە دەر چووە لە سنووری شەرع دا . هەروەها (الفويسقه ) واتە : مشکێك دەرچوو لە کوونە کەی دا لە سەر خەلك . قال تعالی: ﴿وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٞ﴾ [الأَنۡعَام : ١٢١] واتە : ئەم تاوانە حرامە دەرچوونە لە سنووری شەرع دا ..!!

[1] - اخرجه ابن ابي حاتم (٧٠/١).
[2] - اخرجه ابن ابي حاتم (٧٠/١).
[3] -تفسير مجاهد ص١٩٨ .
[4] -صحيح مسلم برقم (١١٩٨).

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٢٧﴾ [البَقَرَةِ : ٢٧]

﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ﴾ واتە : ئەوانەی کە پەیمانی (خوای گەورە ) دەشکێنن و یان هەڵی دەوەشێننەوە ، ﴿بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ واتە: پاش بەستنی ، ﴿وَيَقۡطَعُونَ﴾ واتە : وە دەی پچرێنن ، ﴿مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ واتە: ئەو پەیوەندیانەی کە (خوای گەورە ) فەرمانی داوە بە پەیوەستی کردنی ، ﴿يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: وە لە زەوەی دا تۆی خراپە دەچێنن ، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٢٧﴾ واتە : هەر ئەوانە خەسارت مەندو یان زەرەر مەندو رەنجە رۆن ..!!

بەڵێ (خوای گەورە ) وەسفی فاسق و تاوانبارانی کردووە ، کەواتە : لەم ئایەتەدا باسی فاسقەکان دەکات چونکە لە ئایەتی پێشتر دا باسی فاسقەکانی کرد دیارە تەواو کەری ئایەتی پێشتر ، بەلام (خوای گەورە زاناترە ) ، چونکە فاسقەکان چاویان بە حەق هەڵنایەت ، هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ واتە: ئەمە هەموو ئەو پەیمانانە دەگرێتەوە کە لە نێوان ئەوان و (خوای گەورە ) دایە ، وە ئەوەی کە لە نێوان ئەوان و بەندەکاندایە وە لە ناو یەکتر دا ، ئەوەی کە زۆر جەختی کردۆتەوە لە سەریان ، بە بەڵێنی قورس گرانەکان ، هەر گێز گوێ بەو بەڵێن و پەیمانانە نادەن ، بەڵکو هەڵیان دەوەشێننەوە وە دەیان شکێنن ، وە واز لە فەرمانەکانی خوا دەهێنن ، قەدەغەکراوە کانی خوا ئەنجام دەدەن ،وە ئەو بەڵێن و پەیمانەی لە نێوان خۆیان خەڵکیدایە نایبەنە سەرو هەڵیدەوەشێننەوە ، قال تعالى: ﴿وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: ئا ئەمە زۆر شت لە خۆ دەگرێت ، بێ گومان (خوای گەورە ) فەرمانی پێکردووین کە پەیوەندیە کانی نێوانی خۆمان و ئەو بە هێز بکەین ، بە باوەر هێنان پێی ، وە بە جێ هێنانی فەرمانی بەندایەتی کردنی ، وە لە نێوان ئێمە و پێغەمبەرەکەی ﷺ بە باوەرهێنان پێی ، وە خۆشەویستنی و رێز گرتنی ، وە جێ بەجێ کردنی مافەکانی ، وە لە نێوان ئێمە دایك باوك دا ، هاورێ دۆستە نزیکە ئیماندارەکان ، وە سەرجەم بەدیهێنراوەکانیش ، بە بەجێ هێنانی سەرجەم ئەو مافانەی کە (خوای گەورە ) فەرمانی پێ کردووین کە بە چاکی بیگەیەنین ، وە ئیمانداران ئەوەی کە (خوای گەورە ) فەرمانی پێ کردوون گەیاندوویانە ، وە پێی هەستاون بە چاکترین شێوە ، بەلام فاسق تاوانباران پچراندوویانە و پشت گوێیان خستووە ، بە تاوان و خراپەکاری و سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) وە هەروەها بە پچراندنی خزمایەتی وبلاو کردنەوەی خراپەکاریی لە سەر زەویدا ..!! قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ واتە: کەسانێك یان خەڵکانێك ئەو سیفەتانەیان هەیە ...!! قال تعالى: ﴿هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٢٧﴾ واتە: زەرەمەند لە دونیاو لە دوارۆژ دا ..؟!

لێرە دا زەرەر مەندی کورت کردۆتەوە تێ یاندا ، چونکە زەرەمەندیەکەیان گشتگیرە لە هەموو باروو دۆخێکدا هیچ جۆرە قازانجێکیان بۆ نیە ..؟! چونکە هەموو کردەوەیەکی چاکە مەرجە بۆ ئیمان ، بۆیە ئەوەی کە باوەری نەبێ کردەوەشی قبول نیە ..؟!

بەلێ ئەوە زەرەرمەندەی یان خەسارەت مەندە بریتە لە خەسارەتی کوفر بێ باوەری و شریك هاوەل بریاردان ،بەلام هەندیچك جار خەسارەت مەند یان زەرەرمەند دەبێتە کوفر و هەندێك جاری تریش دەبێتە سەرپێچی و بێ فەرمانی (خوای گەورە ) ، وە هەندێك جاریش دەبێتە کەم تەرخەمی لە فەرمانە کانی (خوای گەورە ) وەك واجباتەکان و فەرزەکان یان فەرمانە کان بۆ رزگار بوون لە دۆزەخ ، وە هەندێك جاری تریش زەرەرمەندی دەبێتە کەمتەرخەمی لە کاری پەسند کراوە ، هەر وەك دەفەرموویێت قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ۝٢﴾ [العَصۡر : ٢]واتە : بەڕاستی سەرجەم مرۆڤایەتی هەر هەموویان بەردەوام لە زەرەرمەندی و بە هیلاك چوون و تیاچووندان..!! ﴿عَهۡدَ ٱللَّهِ﴾ واتە: پەیمانی خوا ، مەبەست پێ ئەو بەلێنەیە لە نێوان ئەوان و (خوای گەورە ) کە واجب کراوە بە ئیمان بە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ و کتێبەکان بهێنن و نوێژ بکەن و زەکات بدەن و حەج بکەن و واجبە کانی تر جێ بەجی بکەن ، هەروەها ئەوەی (خوای گەورە ) واجبی کردووە لە سەریان لە نێوان خۆیان و دروستکراوەکان ، ﴿مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ واتە : لەدوای بە هێزو پتەوبوونی ، واتە: دوای ئەوەی کە (خوای گەورە ) بەلێنیان لێ وەرگرتن ، هەروەك کە بەلێنی لە نەوەی ئیسرائیل وەرگرت ، کە دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَانٗا وَذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنكُمۡ وَأَنتُم مُّعۡرِضُونَ ۝٨٣﴾ [البَقَرَةِ : ٨٣]واتە : وە یادی ئەوە بکەنەوە . ئەی نەوەکانی ئیسرائیل . کاتێك پەیمانێکی بە هێز وپتەومان لێوەرگرتن لەسەر ئەوەی : کە خوای پەروەردگار بە تاك و تەنهایی بپەرستن و بە بێ هیچ هاوەڵبڕیاردانێك بۆی، و چاك بن لەگەڵ دایك وباوکدا، وە لەگەڵ خزمانی نزیك، وە لەگەڵ ئەو منداڵانەی باوکیان مردوە وتەمەنیان نەگەیشتۆتە باڵغ بون، وە لەگەڵ ئەو هەژارانەی کە ئەوەندەیان نیە بەشیان بکات وپێویستیان پڕ بکاتەوە، وە ئەوەش کە بە چاکترین شێوە قسە لەگەڵ خەڵکدا بکەن، و نوێژەکان بەجوانرین شێوە ئەنجام بدەن، و زەکاتیش بدەن، کەچی ئێوە پشتان هەڵکرد و پەیمانەکەتان شکاند. جگە لە هەندێکی کەمتان نەبێت لەسەری مایەوە. بەڵکو بەردەوامیشن لە پشت هەڵکردنتان ..!! هەروەها دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٧] واتە: لە زەویدا تاوان خراپە کانی دەچێنن ، کە تاوان و خراپەی نابەرجستە دەگرێتەوە لە کوفر و تاوان و هەول دان بە دیار خستنی شتی پوچل و بە تال ، وە کوژانەوەی نوری ئیمان و ئیسلام ، ئەمانە هۆکارن بۆ فسادی و گەندەلی و خراپەکاری ، بەرجەستە بۆ لە ناو چوون و بەلاو ناخۆشی خەسارەت مەندی دونیا دوارۆژ بۆ بەندەکان ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت قال تعالى: ﴿ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعۡضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ۝٤١﴾ [الرُّوم : ٤١] واتە : خراپە و فەساد لە وشکانی و دەریاکاندا سەریهەڵداوە وەك : و قاتوقڕی وشکە ساڵی و کەمی باران بارین و زۆری نەخۆشی و پەتا، هەموو ئەوەش بەهۆی ئەو سەرپێچیانەی کە مرۆڤەکان ئەنجامی دەدەن، لەبەر ئەوەی هەر لە دونیادا سزای هەندێك لەو کردەوانەیان توشببێت کە ئەنجامی دەدن، بۆ ئەوەی تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار و دەست لە تاوانکردن هەڵگرن، و بەو هۆیەشەوە حاڵیان باشبێت و کار و کردەوەیان بە رێکوپێکی بەڕێوە بچێت ..!!

شی کردنەوەی هەندێك ووشە :

﴿عَهۡدَ ٱللَّهِ﴾ واتە : پەیمانی خودا لە گەل بەندەکانی دا سێ جۆرە :

یەکەم : ئەو پەیمانەیە کە لەگەل پێغەمبەران کردوویەتی بۆ گەیاندنی پەیامەکەی بە ئیمانداران یان بە گرۆی ئادەمیزاد .

دووەم : پەیمانی لە گەل زانایانی ئۆمەتی ئیسلام بۆ ئەوەی ئاین وون نەکەن لە ئادەمیزاد بەراستی بێ گۆرانکاری پێشانی مرۆڤایەتی بدەن و فەرمانی بدەن بەوەی کە راست و حەق رەوایە ..؟! وە هەرچی نادروست قەدەغەیە یان نا رەوایە ریچگری لێ بکەن بە گرژی دا بچن بەدەست بە زمان و بەدل بەرگری لە حەق بکەن خۆیان لە سەر فەرمانەکانی (خوای گەورە ) بەخت بکەن .

سێ یەم : پەیمانێکە بەهۆی (عەقل ) و هۆشەوە لە گەلیاندا کراوە چونکە مادام (خوای گەورە ) (عەقل و هۆشی ) دا بە مرۆڤ مانای وایە هەتا ئەتوانێت لە زەرەمەندی یان خەسارەت مەندی ئاین و دونیا دا عەقل و هۆشی خۆی بخاتە گەر وە بەکاری بێنن وە راوێژ بە ژیر مەندان و زانایان ئاینی ئیسلام بکەن بۆ ئەوەی سەر فەراز بن لە دونیا دوارۆژدا ، ئەو کارو کردەوە چاکانەی کە (خوای گەورە ) نیشانی داوە فەرمانی کردووە کە جێ بەجی بکەن بۆ ژیان دونیا دوارۆدا سوودی دەبێت بۆ بەندەکانی ، بۆ ئەوەی دوور بکەونەوەی لە خراپە کاری قەدەغە کراوەکانی (خوای گەورە ) رێگای راست وون نەکەن رێگاری راست درەستی خوا پەرستی بە تەنها راستەقینە بدۆزنەوە ، بۆئەوەی خۆیان لە کردەوەی ناپەسەند فاسق دوور بکەنەوە ، واتە : لە فەرمانی (خوای گەورە ) دەر نەچن سنوور نەبەزێنن ، واجبات و فەرمانەکانی (خوای گەورە ) جێ بەجی بکەن وەك : نوێژ و رۆژوو زەکات و حەج و جیهاد و کردەوە چاکەکانی تر ، بێ گومان جێ بەجێ کردنی فەرمانە کانی (خوای گەورە ) ، وە دوور کەوتنەوە لە قەدەغەکراوە کانی (خوای گەورە) ئەوا بەدلنیایەوە پەیمان بەستنە لە گەل زاتی (الله ) ، هەلوشاندنەوەشی ئەوەی کە فسق و فسادی خراپەکاری و گەندەلی ئەنجام بدەی ، بەلام ئەگەر فەرمانە کانی (خوای گەورە ) پێغەمبەرەکەی و شەریعەتی ئاینی ئەنجام بدەی بەدلنیایەوە سەرفەرازی لە دونیاو لە دوارۆژ..!! خەسارەت مەندەی دونیاو دوا رۆژیش ئەو کەسانەن کەفەرمانەکان (خوای گەورە ) جێ بەجی ناکەن لە سنووردەرچوون.

﴿يَنقُضُونَ﴾ واتە : هەلدەوەشێننەوە ، بەمانایەکی تر بەلێن و پەیمانەکە هەلدەوەشێننەوە ، (النقض انتشار العقد من البناء والحبل ، والعقد هو الإبرام ) (النقض ) واتە : بلاو کردنەوەی هەلوەشاندنەوە ، جا چ خانوو بێت ، چ گوریس بێت ، چ گرێدانێك بێت ، چ پەیمان و بەلێنێك بێت ، ئەویش پێچەوانەی (الابرام ) واتە: گرێدان (نقضە ) واتە : هەلیوەشاندەوە ..!!

﴿مِيثَٰقِهِۦ﴾ واتە: ( الميثاق : عقد مؤكد بيمين عهدا ) ووشە ی (الميثاق ) بریتیە لە پەیمانێکی بتەو بەهێز ، بەم هۆیەوە کە سوێندی لە سەر خورابێت ، یاخو بەلێنی لە سەر درابێت ..!!

﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ واتە : جێگیر کردنی خەسارەت مەندی بۆ ئەکەسانەی کە ئەو سیفەتانەیان تێدا بێت یان تێدا بەر جەستە بێت ..!!

﴿هُمُ﴾ واتە: (ضمير فصل ) سێ سوودی هە یە : ١-بۆ تەکید کردنەوە یان دلنیا بوونەوە ،٢- بۆ حصر کردن ، ٣- بۆ لادانی تێکەلی و ئالۆزی لە نێوان سیفەت و خبر یان هە والدا ..!!

ئەگەر سەرنج بدەین ووشەی ﴿ٱلۡخَـٰسِرُونَ ٢٧﴾ کۆیە بۆ ئەو کەسانەیە کە خۆیان تووشی زیان دەکەن ، بە گوناهو تاوان و فسادی گەندەلی و خراپەکاری لەسەر زەوەیدا ، خۆیان لە بەزەیی خودا دوور دەخەنەوە ، وەك : کەسێك کە لە بازرگانیەکەیدا تووشی زیان و خەسارەت مەندی بێت ، سەرمایەکەی دەخاتە سەر زیان لێکەوتووەکەی لە مالە کەیدا ، هەر بەم شێوەیەك کەسانی دوو روو بێ باوەر تووشی زیان بووە ، لە بێبەش بوون بەهرەو بەزەیی خودا کە دایناوە بۆ بەندەکانی خۆی لە رۆژی قیامەت دا ..!!

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَـٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَـٰسِرُونَ ٢٧﴾ [البَقَرَة : ٢٧] واتە: ئەو کەسانە پەیمان لەگەل خودا دەبەستن و دەیشکێنن ، ئەو پەیمانەی یان ئەو شتەی کە خودا ویستویەتی بە ساغ و سەلامەتی بیهێلێتەوە ، وە دەیبرن یان دەپسێنن لە زەویدا بەد فەری دەکەن هەر خۆیان زیان بار و خەسارەت مەند دەبن ..!! ئەم سیفەتانە سیفەتی خوانەناسن و دوورە لە سیفەتی ئیمانداران یان باوەرداران ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ٢٠ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ٢١﴾ [الرَّعۡد : ١٩ - ٢١] واتە : ئایا ئەو کەسەی کە باوەڕی وایە : ئەوەی بۆ تۆ هاتووە .ئەی پەیامبەری خوا صلى الله علیه وسلم .لەلایەن خواوەیە و دەزانێت کە هەر ئەوەیە حەق و ڕاستی و باوەڕی پێهێناوە، وەکو کوێرێك وایە لەبەرامبەر حەق و ڕاستیدا کە باوەڕی پێ نەهێناوە ؟ بەڕاستی کەسانێك پەند و ئامۆژگاری وەردەگرن کە خاوەنی ژیری وعەقڵێکی تەواوبن..!! ئەوانەی کە وەفان دەکەن بەو پەیمان و بەڵێنەی کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردوون، وە ئەو بەڵێنەش ناشکێنن کە پەیمانیان داوە بە خوای پەروەردگار لەسەری ..!! وە ئەوانەی کە باسکران ئەوانەن کە ئەو پەیوەندیە دەگەیەنن خوای پەروەردگار فەرمانی گەیاندنی کردووە وەکو سیلەی ڕەحم وپەیوەندی خزمایەتی و یارمەتی هەژار و نەداران، و هەست دەکەن بە چاودێری خوای پەروەردگاریان دەکەن و دەترسن لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکات لەسەر هەموو ئەو تاوانانەی کە کردوویانە، و لەهیچیان خۆش نەبێت..!! هەروەها ئەو کەسانە پەیمان بە خودا دەدەن پاشان پەیمانەکەیان هەلدەوشێنەوە و پاشگەز دەبنەوە ، پەیوەندی نێوان خۆیان ن خودا دەبرن یان دەپرسێنن ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَـٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ٢٥﴾ [الرَّعۡد : ٢٥] واتە : بەڵام بەدبەخت و چارەڕەشەکان بەپێچەوانەی سیفاتی باوەڕدارانەوە باس دەکرێن، چونکە ئەوان ئەو پەیمانەی کە دابوویان بەخوای پەروەردگار لە بەتاك دانانی لەپەرستن و هاوەڵبڕیارنەدان بۆی شکاندیان لەپاش ئەوەی خۆیان جەختیان لەسەر کردەوە کە پابەند دەبن پێیەوە، وە ئەوانن کە ئەو پەیوەندیەی کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردووە لەگەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی و سەردان کردنیان و جگە لەوەش دەپچڕێنن، وە خراپە لە زەویدا دەنێنەوە بە ئەنجامدانی تاوان و سەرپێچی، ئا ئەوانەی کە بەم سیفاتە خراپ و ناشرینانە وەصف دەکرێن دەرکردنیان بۆ هەیە لە ڕەحم وبەزەیی خوای پەروەردگار، و سزایەکی بەئێش و ئازاریشیان بۆ هەیە کە زۆر ناڕەحەتیان دەکات لە رۆژی دواییدا ..!!

✍ لەرێ (مصعب بن سعيد ) لە (سعد بن ابی وقاص ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ئەو کەسانەی هارانە کە کە پەیوەندیان بری یان پچراند لە پاش ئەوەی کە پەیمانیان بەستبوو بە خودا ، وە ناوی لێ نان فاسقەکان یان لە سنوور دەرچووەکان ..).[١]

✍ لە رێ (الربيع بن أنس ) لە ( أبي العاليه )- رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ هەتاکو ووتەی قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٢٧﴾ دەلێت : ئەوە شەش تایبەتمەندی لە دوو رووەکان دا هەن ، ئەگەر هاتووە خۆیان بە دیارخست لە نێو خەلکی دا ئەوا ئەم تایبەتمەندیانەیان تێدا بەدی دەکرێت : ئەگەر قسەی کرد بەردەوام درۆ دەکات ، ئەگەر بەلێنی دا نایی باتە سەر یان خیلاف دە کە لە وەعدەکەی ، ئەگەر ئەمانەتێکی پێ سپێردرا ئەوا خیانەتی لێدەکات ، هەروەها ئەو پەیمانەی خوا دەشکێنن و هەلی دەوشینەوە ،لە پاش پەیمان بەستن لە گەل خودا دا ، وە ئەو پەیوەندیەش کە لەگەل خودا هەیانە دەی پچرێنن ، وە تۆی خراپە کاری لە زەویدا دەچێنن ، وە ئەگەر ئەم تایبەتمەندیانەیان لەسەر بە دیار کەوت ، وەك : ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات ، ئەگەر پەیمانی دا ناباتەسەر یان پەیمانەکە دەشکێنی ، ئەگەر ئەمانەتێکی گرتە دەست ئەوا خیانەتی لێ دەکات ..).[٢]

✍ لەرێ (سعيد ) لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ دەلێت : واتە : هەرگیز ئەو بەلێن پەیمانە مەشکێنن یان هەلی مەشێنەوە ، چونکە (خوای گەورە ) توورە دەبێت لە شکاندنی یان هەلوەشاندنەوەی ، کەچی ئێوە بەلێن تان داوە ، وە لە ئایەتە کانی قورئاندا پێشکەش کراوە (ئامۆژگاری جوان ، چاکە کردن ، وە بەلگە یان حجە ، ئەوەی ئێمە کە خودا دەناسین بەلێن مان داوە کە گوناهو تاوان نەکەین ، ئەو پەیمان و بەلێنەی پیمان داوە نەی شکێن و هەلینەوەشێنینەوە ، چونکە پەیمان بەستن لە گەل خودا بەروبوومی دلە بۆ جێ بەجی کردنی فەرمانە کانی خودا ..).[٣]

✍ لە ری (اسباط ) لە (اسماعیل السدي ) – رحمە تی خوا ی لی بیت - لە سە ر ووتە ی قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ دەلێت : ئەوە ئەم عەهد و پەیمانیە کە لە سەر قورئان دراوە ، بۆ دان پێدانانە لە سەری ، پاشان بێ باوەر بوون پێی و پەیمانەکەیان هەلوەشاندەوە و شکاندیان ..).[٤]

---

[١] -اخرجه البخاري برقم (٤٧٢٨).
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧١/١).
[٣] - اخرجه ابن جرير (٤٣٩/١).
[٤] - اخرجه ابن ابي حاتم (٧١/١).

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لێ بیت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ دەلێت : هەلوەشاندنەوەی یان بەلێن شکاندنی پەیمانی یەکەم بوو ، کە کتابی (تورات ) یان وەرگرت یان بۆهات ، بۆ ئەوەی کە (خوای گەورە ) بپەرستن و کە هیچ شتێکی بۆ نەکەنە شریك و هاوەل دانان ، وە ئیمان هێنان بە پەیغەمبەری خوا ﷺ ، ئینجا بێ باوەر بوون بە عیسی و ﷺ ، هەروەها باوەریان بە هەندێك لە پێغەمبەران هەبوو ، بێ باوەر بوون بە هەندێکی تر لە پێغەمبە ران (علیهم السلام ) ..).[1]

📖 لە (انس بن مالك )- خوا لێ رازی بێت – دە گێرێتەوە دەلێت : ((خطَبنا رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم فقال في الخُطبةِ: ( لا إيمانَ لِمَن لا أمانةَ له ولا دينَ لِمَن لا عهدَ له )).[2] واتە : لە ووتاری پێغەمبەر ﷺ بووین ووتاری بۆ داین فەرمووی : ئەوە ئیمان و باورە نیە ، کە باوەری تەواو و راستەقینە نەهێنی ، وە ئەوە ئایینداری نیە کە عهد و پەیمانی راستەقینەی نەبێت ..!!

📖 لە (عائشە دایکی ئیمانداران ) – خوا لێ رازی بێت – دە گێریتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إنَّ حُسْنَ العهْدِ من الإيمانِ)) .[3] واتە: پەیمانی چاك وباش بەشێکە لە ئیمان ..!!

✍ لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لەسەر ووتەی : قال تعالى: ﴿وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ دەلێت : مانای وایە : فەرمانی خوایە بە ئیمان هێنان بە هەموو پێغەمبەران (علیهم السلام ) ..).[4]

✍ لە رێ (سعید ) لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سە رووتەی قال تعالى: ﴿وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ دەلێت : واتە : پچراندنی رحم و بەزەیی ، یان پچراندنی خزمایەتی کردن ..).[5]

✍ لە رێ (بکیر بن معرف ) لە ( مقتل بن حیان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە پەیامبەران و پێغەمبەرانی پێش تر ، دەبێت ئیمان بە گشت پێغەمبەران بهێنین بی جیاوازی لە هەریەك لە پێغەمبەران دا ..).[6]

---

[1] -تفسير مقاتل بن سليمان (١/٩٥).
[2] -صحيح ابن حبان برقم (١٩٤).
[3] - اخرجه الطبراني في الكبير (٢٣/١٤) ، والحاكم (١/٦٢).
[4] - تفسير ابن زمنين (١/١٣٠).
[5] -اخرجه ابن جرير (١/٤٤١).
[6] -اخرجه ابن ابي حاتم (١/٧٢).

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لێ بیت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ دەڵیت : واتە : گوناهو تاوانیان تێدا هەڵگرتووە ..).[١]

✍ لە رێ (بكير بن معروف ) لە (مقاتل بن حيان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: کارو کردەوەی خراپە بە پا دەکە لە سەر رووی زەویدا ..).[٢]

✍ لەرێ (ابى روق ) لە (الضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٢٧﴾ دەڵێت : هەموو شتێك کە لە خوا وەیە یان دەگەرێتەوە بۆ (خوای گەورە ) ئەو انەی جگە لە ئیسلام کە نسبەکەی لە خواوە یە یان دەگەرێتەوە بۆ (خوای گەورە ) ئەوەی تر هەمووی خەسارەت مەندیە و لادان و گومراییی و لە سنوور دەرچوون فاسق ، واتە : ئەمانە هەر هەمووی بێ باوەری کوفر کردنە ، بەلام ئەوەی دە گرێتەوە بۆ ئیسلام تەنها گوناهو تاوانە ..).[٣]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی : قال تعالى: ﴿يَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ دەڵێت : واتە : وانە گوناهو تاوانیان کردووە ، قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٢٧﴾ واتە: لە سزادانیان ، واتە : جوولە کە کانە ..).[٤]

✍ لەرێ (بكير بن معروف ) لە مقاتل بن حبان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت - لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٢٧﴾ دەڵێت : واتە : ئەوانە ئەهلی دۆزەخ یان ئەوانە خەڵکی ئاگرن ..).[٥]

[١] -تفسير مقاتل بن سليمان (١/٩٥).
[٢] - اخرجه ابن ابي حاتم (١/٧٢).
[٣] -اخرجه ابن جرير (١/٤٤٢).
[٤] -تفسير مقاتل بن سليمان (١/٩٥).
[٥] -اخرجه بن ابي حاتم (١/٤٤٣).

قال تعالى: ﴿ كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٨ ﴾ [البَقَرَة : ٢٨]

قال تعالى: ﴿ كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ ﴾ واتە: چۆن بێ باوەر دەبن بە خوا ..؟! قال تعالى: ﴿ وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡ ﴾ واتە : لە کاتێکدا ئێوە بیچ گیان بوون ، وە گیانی پێ بەخشین ..!! قال تعالى: ﴿ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ﴾ واتە : لە پاشان دەتان مرێنێ دوای ئەوەش زیندووتان دەکاتەوە ..!! قال تعالى: ﴿ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٨ ﴾واتە: ئینجا بۆ لای خۆی دەگەرێنرێنەوە ..!!

قال تعالى: ﴿ كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ ﴾ واتە : چۆن ئێوە کافر دەبن بە خوا ..؟! ئیمانی بەراستی پێ ناهێنن ..؟! قال تعالى: ﴿ وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا ﴾ واتە: ئێ ئێوە مردوو بوون ..؟! کە کاتێك ( نطفه و علقه و مضغه ) بوون ..!! قال تعالى: ﴿ فَأَحۡيَٰكُمۡ ﴾ واتە : ئێوەی کردە زیندوو ، مانای وایە رووحی دا بەم پێکهاتەیە کە باسمان کرد ( نطفه و علقه و مضغه ) ، ئەم رووح بەبەردانە لە غیر خودا هیچ کەسێك ناتوانێت ئەم کارە بکە ..؟! ئەوەی کە بەخیال دابنێ کە تبیعەت یان سروشتە ..؟! تبیعەت و سروشت دەبێت هەست و هۆشی پێ بکەین ، چونکە هیچ کات خەیال بە تبیعەتی بێ هەست و بێ شعور ناکرێ ، قال تعالى: ﴿ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ﴾ واتە: پاشان ئەتان مرێنێ ..؟! ئادەمیزاد لەبەر بێ ئاگایی غافل بوونی خۆیان پێ نازانێت کە دە مرن ..؟! قال تعالى: ﴿ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ﴾ واتە: لە پاشان زیندووتان دەکاتەوە ، واتە : لە رۆژی قیامەتدا ..!! قال تعالى: ﴿ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٨ ﴾ ئینجا بۆ لای خۆی دەمان گەرێنێتەوە ..!! قال تعالى: ﴿ كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٨ ﴾ [البَقَرَة : ٢٨] واتە: بە حالێك بە چ روویەکەوە بەرانبەر بە پەروەردگاری جیهان نیان ئینکاری و ئلحادی و بێ باوەری ئەکەن ..؟! لە گەل ئەوەش دا خۆتان باش دەزانن کە لەوەو پێش لە ئاوێکی بێ گیان و بێ روح بوون لە لای باوك و دایکەوە ، وە (خوای گەورە ) گیانی خستە بەرتان ، وە لە پاش هاتنی قەدر و چارە نووستان دەتان مرێنی ..؟! بێ گومان لە پاش مردنەکەش لە دوایی دا یان لە رۆژی قیامەت زیندووتان دەکاتەوە ، وەك چۆن لە دونیا زیندوو بوون ، جا دوای ئەوەش دەگەرێنەوە بۆ لای (خوای گەورە ) حیساب تان لە گەل دا دەکات ، بەو بیرو باوەری کە لە دونیا کارو کردەوە تان لە سەر دەکرد حیساب و لێ پرسینە وە تان لە گەلدا دەکات ، هەر بەندەیە کی خۆی بە پێ کردەوە کانی لە ژیانی دونیا رەوانەی شوێنی خۆی دەکات جا بە پێ پاداشت و سزا دەبێت یان ئەوەتە شوێن و مەنزلی لە بەهەشت دەبێت بە پێ پاداشتی خۆی ، یان ئەوەتا شوێن و مەنزلی لە دۆزەخ دەبێت بە پێ سزاکەی خۆی ..!!

مە بەست لەم ئایەتە ئەمەیە : کە ئادەمیزاد چوار شت لە رێگای دایە :

یەکەم : دورست کردنی یەکەم جار کە لە ئاوێکی سپی لە لای باوك و دایکی بێ گیان بووە .

دووەم : لە پاش ماوەیەك کە (خوای گەورە ) رووحی خستە بەری ، لە سگی دایکی دا دەری کردووە بۆ دونیا ،بە گوێرەی قەدەر چارە نووسی خۆی بۆی رێك کەوتووە لە دونیا ژیاوە تا کاتی مردنی .

سێ یەم : رووح کێشان و بۆ ناو گۆر ناردن .

چوارەم زیندو کردنەوە لە رۆژی دوای دا ، واتە : لە ناگۆر دەردەهێنرێت و زیندوو دەبێتەوە وەك ئەوەی لە دونیا ژیاوە بەلکو باشتریش دروست دەکرێتەوە ، ئینجا پاداشتی بیرو باوەرو کردەوە کانی دەست دەکەوێت .

ئیمامی (فخر الرازی ).[1] – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : هەندێك کەس ووتوویانە لە ئایەتەوە قال تعالى: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ۝٢٨﴾ [البَقَرَةِ : ٢٨] واتە : دەر دەکەوێ کە زیندوو بوونەوەی گۆر نیە ، چونکە (خوای گەورە ) دوو زیندوو کردنەوە باس دەکردووە بۆ ئادەمیزاد ، یەکەم : بۆ ژیانی دونیایە ، دووەم بۆ ژیانی دوای دونیایە واتە : ژیانی دوارۆژ یان ژیانی قیامەت ، جا هەر وەها وەلامی ئەم گومانە ئەمە یە : پێویست نیە هەموو مەبەستێك لە هەموو ئایەتێك دا هەبێت ، مادام بەلگەی خاریجی هیە بۆ زیندوو کردنەوە گۆر جا باس نەکردنی لەم شوێنە دا هیچ زیانی نیە ، یانی گەلی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ زیندوو بوونەوەی گۆر ئەگەیەنن وە باسی خۆشی نا خۆشی ناو گۆر دەکات ، لەگەل فەرموودە یا دیارە ئەمیش بۆ ئیسپاتی ئەم مەبەستە بەسە و کافیە . بەلام هەندێك لە زانایانی ئەم ئۆمەت فەرموویانە ، زیندووبوونەوەی پاش گیان دەرچوون وە پێش هاتنی رۆژی قیامەت زیندووبوونەوەی (بەرزەخ ) بیە وە ئەوەیش بریتیە لە پەیوەندی رووح بە مردووە وە وەرگرتنی خۆ شی و ناخۆشی وەکو مرۆڤی نستوو خەو ئەبێ وە لە خەوە کەیا وا ئەزانێ مەسەلا کە لە گەل دۆستانا لە باخێکا یان لە خانووێکا بە خۆشی را ئەبوێری وە یاخوود لە ژێر دەستی دوژمنێکدا داماوە وە ئازار ئەدرێ وە (زەجر ) وداخ ئەکرێ ئینجا لەگەل ئەوەشدا ئەو کە سانە وان لە گەل نووستوەکەدا هیچ جمو جۆل و نیشانەی شین شادی لێوە نابینن ، جا بێ گومان بە کوورتی زیندووبوونەوی (بەرزەخ ) جۆرێکی تایبەتە وەجیایە لە زیندوو بوونەوەی راستەقینەی رۆژی قیامەت ، بەلام بە ظاهري ئایە تە تی قال تعالى: ﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا ۝٢٥﴾ [نُوح : ٢٥] واتە : بۆیە بەهۆی تاوانەکانیان و پێداگریان وە سوور بوونیان لە سەر بێباوەڕی و ستەمکردن بە لافاو غەرق بوون و خنکێنران، وە لەپاش خنکانیان خرانە ناو ئاگرێکی بڵێسەدار و سوتێنەر، وە جگە لە خوا کەسیان نەبوو سەریان بخات یان سزای خوایان لێدوربخاتەوە ..!! بەلێ وا دیارە ئەم ئاگرە کە لە باسی (ال فیرعون ) دایە ، ئەمەیش هە ر لە

[1] -تفسير الكبير الامام فخر الرازي (٣٧٦/٢).

پاش ئەوە لە کە دەریایی نیل دا خنکان خودا ئەوانی خستە نێو ئاگرەوە ، وا دیارە ئەم ئاگرە ئاگری رۆژی قیامەت نیە ، کەوایە ئاگری ئازاردانی کاتی یان ماوەی (بەرزەخ ) هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویّت : قال تعالى: ﴿ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ۝٤٦﴾ [غَافِر : ٤٦] واتە : لەسەرەتادا بەنوقومبوون لەئاودا تووشبوون و تیاچوون، پاشان لەگۆڕەکانیاندا . کە ئاگر هەیە . سزا دەدرێن، بەوەی هەموو بەیانی وئێوارەیەك ئاگریان توشدەکرێت هەتا کاتی لێپرسینەوە، وکاتێکیش کە دوارۆژ بەرپادەبێت، پێیان دەوترێت : بنەماڵەی فیرعەون بخەنە نێو ئاگرەوە، لەپاداشتی ئەو کردەوە خراپانەی کە ئەنجامتاندا . وە ئەم ئایەتەش بنەوا وبەڵگەیەکە لەسەر سەلماندن وجێگیرکردنی سزای ناوگۆڕ ..!! قال تعالى: ﴿كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ﴾ واتە : چۆن لەو خودایە ئینکاری دەکەن و بێ باوەر دەبن و حاشا دەکەن ..؟! لە گەل خودا شتێکی تر دەپەرستن و ئیلحادی خۆتان رادەگەیەنن ..؟! قال تعالى: ﴿وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡ﴾ واتە: کە لە نەبوونەوە ژیانی داوە بە ئێوە ، واتە: ئێوە هەر نەبوون (خوای گەورە ) ئێوەی هێنایە دونیا ، هەروەك دەفەرموویّت قال تعالى: ﴿أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ۝٣٥﴾ [الطُّور : ٣٥] واتە : ئایا ئەو هاوەڵبڕیاردەرانە هەر لە خۆوە و بەبێ بەدیهێنەرێك هاتوونەتە بوون، یان خۆیان بە دیهێنەری خۆیانن ؟! ئاشکراشە کە هەردوو حاڵەتەکە پوچ و مەحاڵن . وە بەمەش ئەوە جێگیر دەبێت کە خوای پەروەردگار بەدیهێناون، وە خوای پەروەردگار هەر خۆی شایستەی پەرەستنە، و شایستەی جگە لەو نیە ..؟! یان ئایا ئەوانە لە نەبوون هاتوونە تە دێ ..؟! هەروەك دەفەرموویّت : قال تعالى: ﴿خَلَقُواْ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ۝٣٦﴾ [الطُّور : ٣٦]واتە : یان ئەوان ئاسمانەکان و زەویان لەسەر ئەم شێوە دروستکردنە جوانە بێ وێنەیە هێناوەتە بوون ؟! نەخێر ئەوان یەکلا و دڵنیا نین لە سزای خوای پەروەردگار، هەربۆیە هاوەڵبڕیاردەرن ..؟! هە روە ها دە فە رموویت: قال تعالى: ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ۝١﴾ [الإِنسَان : ١] واتە : بێگومان ماوەیەکی درێژ لە رۆژگار بەسەر ئادەمیزاددا تێپەڕیوە پێش ئەوەی رۆحی بە بەردا بکرێت، و هیچ شتێك نەبووە باسی لێوە بکرێت، و هیچ ئاسەوارێکیشی نەبووە پێی بناسرێتەوە ..؟! قال تعالى: ﴿وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡ﴾ واتە : ئێوە بێ گیان یان بێ رووح بوون ، گیان یان رووح تان بە بەردا کردن ، واتە : لە پشتی باب باپیرانتاندا بێ گیان بوون و هیچ شتێ نەبوون تا کاتێ کە بەدی هێنران ، پاشان دەتان مریچنی بە مردنێکی حەق و راست ، دوو بارە زیندووتان دەکاتەوە ، لە رۆژی قیامەت دا ، ئەلێن : وەك ئەم ئایەتە وایە دە دەفەرموویّت : قال تعالى: ﴿قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَٱعۡتَرَفۡنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلۡ إِلَىٰ خُرُوجٖ مِّن سَبِيلٖ ۝١١﴾ [غَافِر : ١١]واتە : بێباوەڕان دەڵێن : پەروەردگارا تۆ دووجار ئێمەت مراند : کاتێك لەسکی دایکماندا دڵۆپەیەك بووین پێش رۆح بەبەرداکردن، وە کاتێکیش کە وادەی مردنمان هات لەژیانی دونیادا، وە دووجاریش ئێمەت زیندووکردەوە : لەژیانی دونیادا کاتێك لەدایکبوین، وە ئەو رۆژی کە لەگۆڕەکانمان زیندوکراینەوە، وا ئێستا ئێمە داندەنێین بە تاوانەکانی پێشوومان‌دا، جا ئایا رێگە و دەرچەیەکمان بۆ هەیە کە لەئاگر دەربچین و بمانگەڕێنیتەوە بۆ دونیا بۆ ئەوەی عیبادەتت بکەین ؟ بەڵام ئەستەم ودوورە ئەو دانپێدانانەیان سوودیان پێبگەیەنێت ..؟!

شی کردنەوەی هەندێك ووشە :

﴿كَيْفَ﴾ واتە: جۆن ..؟! (اسم استفهام مبنی علی فتح ) پرسیار کردنە لە حال و بارودۆخێك ، ئەم (استفهام) بۆ ئینکاری و سەر سورمانیە ..؟! واتە : چۆن بێ براو دەبن بە خوا ..؟! لە ئایەتەدا قسە کردن لە غیبە وە نقل بووە بۆ خطاب ، واتە : جۆن کوفر بە خوا دەکەن ، ئینکاری و ئیلحادی یەك خواپەرستی و بەندایەتی (خوای گەورە ) دەکەن ..؟!

﴿تَكْفُرُونَ﴾ واتە : بێ باوەر دەبن کوفر دەکەن ..؟! (الكفر في اللغة : ستر الشيء ، ووصف الليل بالكافر لسترة الاشخاص )واتە: ووشەی کوفر لە رووی زمانەوە بە داپۆشینی شت دە گوترێ ، وە وصفی شەو بە کافر دەکرێ ، چونکە هەمووشت دادەپۆشێ ، وە بابای جونیار دیسان بە کافر ناو براوە ، لە قورئاندا (يعجب الكفار نباته ) کە (کفار ) بەمانای (زراع ) ، چونکە ئەویش ئەو تۆوە کە دە چێنیت یاخود ئەو نامەکە دەی نێژێ ، لە ژێر زەویدا بە شاراوەیی دایدە پۆشێت ..؟!

﴿أَمْوَاتًا﴾ واتە: کۆ یەکەی دەکاتە (میت ) واتە : (الميت عكس الحي )واتە: مردوو پێچەوانەی زیندووە ..؟!

﴿فَأَحْيَاكُمْ﴾ واتە : زیندوو کردنەوە ، وە ژیان چەند قۆناغێکە (حياة النبات ، وحياة الحيوان ، وحياة الإنسان ، وحياة الجن ، و حياة الملائكة ، وحياة الأخرة ) واتە : ژیانی رووەك ، ژیانی ئاژەل و زیندە وەران ، ژیانی مرۆڤ یان ئادەمیزاد ، ژیانی جنۆکە کان ، ژیانی فریشتە کان ، ژیانی دوا رۆژ یان ژیانی قیامەت ).

قال تعالى: ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾﴾ واتە: لە کاتێك دا ئێوە بێ گیان بوون (خوای گەورە ) دروستی کردوون و گیانی بە بەردا کردن ، پاشان دەتان مرێنێت و دوایی زیندووتان دەکاتەوە ، ئەو سا هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە ،﴿وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا﴾ واتە : لە کاتێدا ئێوە مردوو بوون ، لەم ئایەتە نەبوونی بە مردوو وەصف کردووە ، پاشان دەفەرمووێت : ﴿فَأَحْيَاكُمْ﴾ واتە : ئێوەی دروست کرد رووح یان گیانی بە بەر ئێوە دا کرد ، هەر وەك (خوای گەورە ) بە (زكريا) – عليه السلام – دەفەرمووێت قال تعالى: ﴿وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئًا ﴿٩﴾﴾ [مَرْيَم : ٩] واتە : کە من پێشتر تۆم دروست کردووە لە نەبوونەوە تۆم هێناوەتە بوون و هیچ شتێك نەبوویتە ئێستا لە دایك و باوکێك منالێك دروست بکەم زۆر ئاسانترە..!! ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾ واتە : پاشان دەتان مرێنێت لەم دونیایە دا بە رووح کێشان یان بە گیان کێشان ، ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾﴾ واتە : پاشان زیندووتان دەکاتەوە ، ئینجا هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە ..؟!

لەم ئایەتە پیرۆزە دا کە (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٢٨] کەواتە : سێ مەسەلەی گرینگ لە خۆ دەگرێت :

یەکەم : قال تعالى: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٨] ئەوە دەگەیەنێت کە کوفرو بێ باوەری شتێکی نالۆژێك و نامنتقییە و شتێکی بێ بەلگە و پاساوە ..؟! کاتێك هەر مرۆڤێك کافر دەبێت یان بێ باوەر و ئیلحادی خۆی رادەگەیەنی ، هیچ شتێکی نیە ببێتە پال بشت بەلگەی بێ باوەریە کەی ، واتە : هیچ بەلگەیەکی پشت ئەستووری نیە ..؟! کە جگە لە زاتی (الله ) خالقێکی تر شك ببات یان جێگرەوەیەکی نیە ، چونکە بە هێ شێوەیەك نە عەقل هۆش پشتراستی دەکاتەوە ، نە فیترەت و سروشت پشتراستی دەکاتەوە ، چونکە هەموو ئەم دروست کراوە بۆ مان دەسەلمێنی کەوا دروستکراویك بوونی هەیە کە خالقی زەوی ئاسمانەکان ئادەمیزاد جنۆکەیە ، هەر بۆیە نە واقیعی ئەم بوونەوەرەی ژیان پشتراستی دەکاتەوە یان پشت گیری لە بێ باوەریە کەی دەکات ..؟! بۆ زیاتر شارەزا بوون لەم گەردوونە لە بوونی (خوای گەورە ) دەبێت پشت بە دەقە ئاینیەکان ببەستین بە تایبەتی ئاینی ئیسلام ، کە بۆمان روون دەکاتەوە ، کە خالقێك بوونی هەیە بۆئەم هەموو بوونەوەر و ئەم گەردوونە ، ئەویش (خوای گەورە ) یە کە لە هیچ دورست کراوەکانی ناچێت ، قال تعالى: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ واتە : لە هیچ شتێك ناچێ ..؟! وە سەر باری هەموو شتێکیش دەقە ئاینە کان واتە : (وەحی ) خوای کار بەجێ دیسان دژی کوفر بێ باوەریە ، کەواتە : لە راستیدا کوفر شتێکی بێ پاساوە شتێکی بی مانایە تەنها ئیلحاد و ئینکاریە مرۆڤە سەرگەردانەکانە ، ئەوانە نقوومی گومرایی سەر لێ شێوایی و سەرگەردانی بوون ، چارە نووسی خراپ چاوەرێ یانە لە رۆژی دوایی.

دووەم : قال تعالى: ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا﴾ دوو مانا لە خۆ دەگرێت :

١-واتە : ئێوە نە بوو بوون (كنتم معدومين ) واتە : خوا پەیدای کردن .

٢-واتە: ئێوە ئەو کاتە لە شێوەی (نطفة ) بوون ، یاخودلە شێوەی خوێن دابوون ، خوێنی دایك و باوکتان ، چونکە ئاوی پیاو ئاوی ئافرەت لە خوێن دروست دەبێت ..؟! خوێنیش وادیارە لە خواردنی دەرست دەبێت ، واتە : ئەو کاتە ژیان نەبووە ، ﴿فَأَحْيَٰكُمْ﴾ ، بەلام (خوای گەورە ) ژیان و رووحی یان گیانی بە بەردا کردوون .

سێ یەم : ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ واتە : دەتان مرێنی ، لە پاشاندا زیندووتان دەکاتەوە ، لەبەر ئەوەی دوایی دەفەرموویێت :﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾﴾ واتە : ئینجا بۆ لای ئەو زاتی (الله ) دەگەرێنەوە ، وا دەگونجی وەك باسمان کرد ژیانی بەرزەخ بێت واتە : ژیانی دوای مردن لە دونیادا ، کەواتە : ژیانی ناو گۆر یان قبر بە ژیانی بەرزەخ ناو دەبرێ ئەم ژیانە وەك وێسگەیەکە بۆماوەیەکی کاتی دەبێتە مەنزل شوێنگەی مرۆڤ ، مانای وایە ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾ ژیانی بەرزەخە یان ژیانی ناگورە ، کەواتە گەرانەوەکەش بۆ لای زاتی (الله ) ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾﴾ کەواتە : رۆژی زیندوو بوونەوە (يوم البعث ) واتە : گەرانەوەی کەشی لە رۆژی قیامەت دا دێتەدێ ..!!

✍ لەرێ (السدی ) لە ( ابی مالك وابی صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی : قال تعالى: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَـٰكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ دەلێت : تۆ هیچ شتێك نە بوویت ..؟! ئێوە دەرست کران ، پاشان دەتان مرێنێ ، ئینجا دزیندووتان دەکاتەوە لە رۆژی قیامەت دا ..).[1]

✍ لەرێ ابی الاحوص ) لە (عبدالله بن مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَـٰكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ کەواتە وەك ئەم ئایەتە کە دابەزیوە بە سەر ئیماندارانی یەکەم ، (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ﴾ [غَافِر : ١١] واتە : ئەی پەروەردگار تۆ دوو جار ئێمەت مراند: مردنی یەکەم مرۆڤ لە نەبوونەوە لە سکی دایکدا دێتە دەرەوە، وە ئەو مردنەیش کە لە دونیادا بەسەرمان دێت..؟!.[2]

✍ لە رێ (ابن جریج ) لە (عطاء الخراساني ) لە (عبدالله بن عباس ) - خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا﴾ دەلێت : واتە : لە پشت یان لە کەمەرەی باوباپیرانی دا ، تۆ هیچ شتێك نە بوویت ..؟! تا ئەو کاتەی تۆی دروست کرد ..؟! لە پاشان تۆی مرادن بە مردنێکی حەق ، ئینجا تۆی زیندوو دەکاتەوە لە رۆژی قیامەت دا یان (یوم البعث ) ئینجا دەلێت : ئەو ئایەتە وەك ئەم فەرموودەی (خوای گەورە ) یە گە دەفەرموویێت قال تعالى: ﴿رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْـنِ﴾ تَنَا ٱثْنَتَى [غَافِر : ١١] واتە : ئەی پەروەردگار تۆ دوو جار ئێمەت مراند: مردنی یەکەم مرۆڤ لە نەبوونەوە لە سکی دایکدا دێتە دەرەوە، وە ئەو مردنەیش کە لە دونیادا بەسەرمان دێت..؟! ..).[3]

✍ لەرێ (ابی روق ) لە (ضحاك) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ﴾ [غَافِر : ١١] دەلێت : واتە : پێش دروست بوون ، ئێوە خۆل بوون ..؟! ئەوەش مرووە ..؟! پاشان زیندووی کردن یان گیانی بە بەردا خستن دەرستی کردن ..!! ئەمەش ژیانە یان ئەوە حیاتە ، پاشان ئێوە دەمرێنی دەگەرێنەوە نێو گۆر ، ئەوەش مردنی کۆتایی یە ، پاشان زیندوو دەکرینەوە بۆ رۆژی قیامەت ، ئەمەش ژیان دوای زیندوو بوونەوە لە گۆردا ، هەروەها ئەمە کەواتە : دوو مردن و دووژیانە ،( واتە: دوو جار دەمرێن ، مردنی یەکەم کە لە نەبوونەوە تۆ مردوویت زیندوو دەکرێت، مردنەکیش کە لە ژیانی دونیادا دەمریت بۆ ناو گۆر دەچیت ، هەروەها دوو ژیانیش هەیە ، ژیانێك لە دونیا ژیانێك لە ناو گۆر واتە : ژیانی بەرزەخ ) ئینجا دەلێت ئەم ووتەیە کە (خوای گەورە ) دەفەر موویێت : قال تعالى: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَـٰكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ [البَقَرَة : ٢٨].[4]

---

[1] -اخرجه ابن جرير (٤٤٣/١).
[2] -اخرجه سفيان الثوري ص٤٣.
[3] -اخرجه ابن جرير (٤٤٤/١).
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧٣/١).

✍ لە رێ (الربيع بن أنس) لە (ابى العاليه ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ئەم ئایەتەی کە باسمان کرد لە سورە تی قبرە ئایەتی ٢٧ دەڵێت : واتە: لە کاتێك دا هیچ نەبوون یان هیچ وجودتان نەبوو ، پاشان زیندووی کردن کاتێك دورستی کردن ، پاشان ئێوە دەمرێنی ، لە پاشاندا لە رۆژی قیامەت دا زیندووتان دەکاتەوە ، هەر بۆ ئەو دەگەرێنرێنەوە لەدوای ئەو ژیانە دا ..).[١]

✍ لەری (ابن جريج ) لە (مجاهد ) رەحمەتی خوای لێ بێت – دەر بارەی ئەم ئایەتە دەڵێت : لە کاتێك دا ئێوە هیچ شتێك نەبووە لە بربرەی پشت باب و باپیرانتان ، پاشان (خوای گەورە ) ئێوەی دەرهێناو زیندووی کردن ، پاشان دەتان مرێنی کە مردنێك پێویست ببێت ، لە پاشان لە رۆژی قیامەت دا زیندوو دە کرینەوە ، ئەوەش دوو مردنە و دوو ژیانە ..).[٢]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ﴾ دەڵێت : یەك هاوبەشی و شریك نیە ، قال تعالى: ﴿وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا﴾ واتە : (نطفا ) بوون یان ئاوێکی سپی دروست بوون ، هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿مَن يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ﴾ [يُونُس : ٣١] واتە : وە کێیە لە مردووە زیندوو دەردەکات وە لە زیندوو مردوو دەرکات وەك لە دڵۆپە ئاوێك لە مەنی مرۆڤێك دەردەکات، لە هێلکەیەك باڵندە یەك دەردەکات، لە مرۆڤێکی کافر موسڵمانێك دەردەکات، وە بە پێچەوانەوە..!! قال تعالى: ﴿يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ﴾ [الرُّوم : ١٩] واتە: {تواناو دەسەلآتی خوای گەورە} [ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ ] خوای گەورە ئەوەندە باڵادەستە لە مردوو زیندوو دەردێنێ و دروست ئەکات: وەکو لە دڵۆپێك ئاو مرۆڤ دروست دەکات، لە هێلکە باڵندە دروست دەکات، لە کافر موسڵمان دروست دەکات [ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ ] وە بە پێچەوانەیشەوە لە زیندوو مردوو دەردێنێ و دروست دەکات، مرۆڤ کە زیندووە مەنی و دڵۆپە ئاوی لێ دەردێنێ، باڵندە کە زیندووە هێلکەی لێ دەردێنێ، موسڵمان کە زیندووە جاری وا هەیە لە نەوەی ئەو کافر دەبێ..؟! قال تعالى: ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ﴾ واتە: لە کاتێك دا دەژیت ، قال تعالى: ﴿ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ﴾ واتە : لە دوای مردنی رۆژی قیامەت ، قال تعالى: ﴿ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٨﴾ واتە: پاداشتی کارەکانتان دەدەمەوە ، سەبارەت بە جوولە کەکان ئەوان دەیانزانی بەلام بێ دەنگ بوون ، بەلام موشریکە کان ووتیان : ئەگەر ئێمە خۆل بووین ، کێ دەتوانێت زیندوومان بکاتەوە دوای مردن مان ..؟! ئیجا (خوای گەورە ) ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە ، دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٩] واتە: هەر ئەو زاتەیە کە هەموو شتێکی لە زەویدا بۆ ئێوەی دروست کردووە ..).[٣]

---

[١] -اخرجه ابن جرير (٤٤٤/١).
[٢] - اخرجه ابن جرير (٤٤٦/١).
[٣] - تفسير مقاتل بن سليمان (٩٥/١).

قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾﴾ [البَقَرة : ٢٩]

﴿هُوَ ٱلَّذِى﴾ واتە: خوا ئەو خوایە یە ، ﴿خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ واتە: هەر چی لە زەوی دایە دروستی کردووە بۆ ئێوە ، ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە : پاشان ویستی ئاسمان دروست بكات ، ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ واتە: ئینجا ڕێکی خستن بە حەوت ئاسمان ، ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾﴾ واتە : زاتی (الله ) ئاگادارە بە هەموو شتێك ..؟!

بەڵێ (خوای گەورە ) کارزانە لە ئایەتە پیرۆزە دا هەندێك ئایەت و نیشانەی دەسەلات و توانایی خۆی باس دەکات ، هەتا پتر سەرنجی مرۆڤ رابکێشیێ بۆ ئیمان و باوەری بەهێز و تەواو دامەزراوی ئیمانداری راستە قینە ، هەر بۆیە دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ خوا ئەو خوا یەیە کە لە زەویدا لە بەر سوودو قازانجی ئێوە هەموو جۆرە شتیچکی دروستکرد ، قال تعالى: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە : لە پاشان دا ویستی ئاسمان دورست بکا، کردیە حەوت ئاسمان ، قال تعالى: ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ واتە : پاشان بەوێنەی حەوت ئاسمانی رێك پێك و جوان و قەشەنگ ، ئاسمانەکانی رێکخست،قال تعالى: ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾﴾ واتە : هەر ئەو زاتەش بە هەموو شتێچك زانا دانا بە ئاگایە ..!! بەڵێ زانیاری (خوای گەورە ) دەوری هەموشتێکی داوە لە دروستکراوەکانی وەك دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾﴾ [المُلْك : ١٤] واتە : ئایا خوایەك کە خۆی دروستکراوەکانی دروست کردووە ئاگای لە خۆیان و نهێنیەکانیان و دڵیان نیە، بەڵێ بێگومان ئاگای لێیانەو خۆی شارەزاترە بە دروستکراوەکانی کە چ یاساو شەریعەتێك بۆیان گونجاو و شیاوە ئەوەی بۆ تەشریع کردوون، وە هەر خوای گەورە زۆر بەبەزەییە، وە زانیاریەکی زۆر وردی هەیە وە هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە..!!

هەروەها دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۚ وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾﴾ [سَبَإ : ٢] واتە : زانایە بە هەموو دڵۆپێك ئاو کە ڕۆدەچێت بە زەویدا، و ئەوەی لێ دەردەچێت لەڕووەك و لەکانزا و ئاوەکان، وە ئەوەش لەئاسمانەوە دادەبەزێت لەباران وفریشتە وکتێب، وە ئەوەشی بۆ ئاسمان بەرز دەبێتەوە لەفریشتە وکرداری بەندەکانی . وە ئەو بە بەزەییە بەرامبەر بەندەکانی و بەخێرایی تاوانبارەکانیان سزا نادات، وە لێبوردەیە بۆ تاوانی تۆبەکاران ئەوانەی بۆ لای دەگەڕێنەوە و پشتی پێدەبەستن ..!! هەروەها دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤﴾﴾ [التَّغَابُن : ٤] واتە : خوای بێگەرد و بەرز و بڵند زانایە بە هەموو ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدایە، وە زانایە بەوەش کە لە نێوان خۆتان .لە نێوان خۆتاندا .دەیشارنەوە، و ئەوەشی کە ئاشکرای دەکەن . وە خوای پەروەردگار زانا و بەئاگایە بەوەی کە لە سینگ و دڵەکاندا حەشاردراوون ..!!

هەروەها دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ١٩﴾ [النّحل : ١٩]واتە : وە خوای پەروەردگار هەموو کار و کردەوەکانتان دەزانێت و لێیان ئاگادارە، ئەوەی کە دەیشارنەوە و ئەوەشی کە دەریدەخەن، وە سزا و پاداشتان لەسەری دەداتەوە ..!! هە روە ها دە فە رموویت : قال تعالى: ﴿وَإِن تَجۡهَرۡ بِٱلۡقَوۡلِ فَإِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخۡفَى ٧﴾ [طه : ٧] واتە : بۆیە ئەگەر تۆ . ئەی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم . ووتەکانت ئاشکرا بکەیت و ڕاییگەیەنیت یان بیشاریتەوە . ئەوا خوای پەرودگار هیچ شتێکی لاپەنهان وشاراوە نیە، ئەو هەموو نهێنی وئەوەش کە لەنهێنی پەنهانترە . لەوانەی بەدەرونتدا دێن . دەزانێت ..!! بێ گومان (خوای گەورە ) عظمة و دە سەلات هێزو توانای خۆی بۆمان دە سەلمێنی کە بە دروست کردنی حەوت ئاسمان و مانگ رۆژو دا کە دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿أَلَمۡ تَرَوۡاْ كَيۡفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗا ١٥ وَجَعَلَ ٱلۡقَمَرَ فِيهِنَّ نُورٗا وَجَعَلَ ٱلشَّمۡسَ سِرَاجٗا ١٦ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ نَبَاتٗا ١٧ ثُمَّ يُعِيدُكُمۡ فِيهَا وَيُخۡرِجُكُمۡ إِخۡرَاجٗا ١٨ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ بِسَاطٗا ١٩﴾ [نُوح : ١٥ - ١٩] واتە : ئایا نابینن کە خوای گەورە حەوت ئاسمانی دروست کردووە چین لەسەر چین ئاسمان لەسەر ئاسمان وە ڕایگرتووە..!!

[ وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا ] وە لەناو ئاسمانیشدا مانگی داناوە وەکو جوانی وایە بۆ ئاسمان، وە نورو ڕووناکییەو گەرمی تیا نیە [ وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا (١٦) ] وە خۆریشی داناوە وەکو چرایەك کە سەر زەوی ڕووناك ئەکاتەوە وە گەرمی و ڕووناکی تیدایە .؟!! [ وَاللَّهُ أَنْبَتَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا (١٧) ] خوای گەورە ئێوە واتە: ئادەمی لە زەوی دروست کردووە، واتە: لە خۆڵ ئادەمی دروست کردووە..؟! [ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا ] پاشان کە مردن ئەتانگەڕێنێتەوە ناو زەوی لەناو گۆڕەکاندا [ وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا (١٨) ] وە لە ڕۆژی قیامەتیش دووبارە دەرتانئەکاتەوە لەناو زەوی..؟! [ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا (١٩) ] وە خوای گەورە زەوی بۆ ڕاخستوون تا لەسەری بەرژەوەندیەکانتان بەدەست بێنن..؟

شی کردنەوەی هەندێك ووشە :

﴿ٱسۡتَوَىٰٓ﴾ واتە: ڕێك و پێك بوو ، (استوى ) ئەگەر بە (على ) واتە بەرزی تەعەددا بکا ، وە : (إستوى على العرش) واتە: چووە عەرش بەزر بووە بۆ سەر عەرش ، بەلام بە (إلى ) تەعەددا بکات ،وەك (استوى على السماء ) واتە : ( قصدإلى السماء ) رووی کردە ئاسمان ، کەواتە: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە : رووی توانا ئیرادەی خۆی کردە ئاسمان تاکو ئاسمان دروست بکات.

﴿ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە: (أسماء كل شيء اعلاه ) واتە: ئاسمان کە هەموو شتێك لە سەرەوەیە یان لە لای سەرەوەیەتی بۆیە لە قورئاندا بە سەقفی خانوو ووتراوە : ئاسمان وەکو (خوای گەورە ) لە ئایەتەدا دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ فَلۡيَنظُرۡ هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ مَا يَغِيظُ ١٥﴾ [الحج : ١٥] واتە : جا هەرکەس باوەڕی وایە کە خوای پەروەردگار یارمەتی پەیامبەرەکەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم نادات بەسەرخستنی و بڵاوبوونەوەی ئاینەکەی لە دونیادا، و لەدواڕۆژیشدا بەبەرزکردنەوەی پلەوپایەی، و سزادانی ئەوانەی کە باوەڕیان پێنەهێنا و بەدرۆیان داناوە، با بە پەتێك خۆی هەڵواسێت بە بنمیچی خانووەکەیەوە بۆ ئەوەی بخنکێت، و پاشان پەتەکە ببڕێت، و دواتر سەرنج

بدات : ئایا ئەو ڕق وکینەیەی کە لەناخیدایە دەڕوات ؟ بەدڵنیایەوە خوای سەرخەری پەیامبەرەکەیەتی صلی الله علیه وسلم وهیچ گومانێك لەوەدا نیە ..!! و(سماء) واتە: بە هەوریش ووتراوە (نزل السماء) بە حەوت ئاسمانەکانیش وتراوە : (سماء).

﴿ثُمَّ﴾ واتە : لێرەدا بە ڕیزبەندیی هەولدان یان (ترتیب الاخبار ) هاتووە ، واتە: (خوای گەورە ) هەوال مان پێدەدات کە زەوی و دروست کردووە، پاشان هەوال مان پێدەدات کە ویستی ئاسمانیش درەست بکا ..!!

﴿فَسَوَّىٰهُنَّ﴾ واتە: ڕێکخستن ،دروستی کردن بە ڕێکو پێکی ، (تسوية الشيء جعله سواءا ) واتە : (تسوية ) کردنی شتێك یانی ، ڕێك و پێك کردنی ..!! ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ﴾ بێ گومان ئەوەش تەواو کامل یەتی ڕێك پێکی جوانی ئاسمانە کانە بەم شێوەیە ..!!

بەلام ئەوەیە دەبێت بزانین کامیان پێش کامیان دروست بوونە ..؟! ئەگەر بروانینە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بۆمان دەر دەکەوێت بۆ یەکەم جار زەوی دروست بووە بێ یەوەی ڕێکی بخات ، پاشان ئاسمانی د ئاسمان دروست کرد حەوت چین یان حەوت تبەقە لە دوو ڕۆژ دا پاشان زەوی ڕێکخست ؟!! بەلێ بێ گومان بە دلنیایەوە کە زەوی پیش ئاسمان دروست بووە ، ئەمەش قورئانی بۆمان روون دەکاتەوە ، بەلێ ئەصلی دروست بوونی زەوی پێش ئاسمان بووە ، ڕێکخستنی بە چیا و رووبار دۆل و شتی تر دوای دورستکردنی ئاسمان بووە ، بەلگە لەسە ر ئەمە (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ۝٣٠﴾ [النَّازِعَات : ٣٠] واتە : وە لە دوای ئەوەیش زەویشی ڕاخستووە، (ابن کثیر) و (ابن جەریر) ئەفەرموون: یەکەمجار خوای گەورە زەوی دروست کردووە پێش ئاسمان، پاشان ئاسمانی دروست کردووە، پاشان لە دوای دروست کردنی ئاسمان زەوی ڕاخستووە، ئەگەرنا وەکو دروست کردنەکە سەرەتا زەوی دروست کردووە پێش ئاسمان..!! دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ۝٣٠﴾ [الأَنبِيَاء : ٣٠]واتە : ایا ئەو بێباوەڕانە نەیانزانیوە کە ئاسمانەکان وزەوی لەپێشدا یەك پارچەی پێکەوەلکاوی لێك جیانەبوو بوون، بەشێوەیەك کە نەئاسمان بارانی هەبوو نە زەویش ڕووەك وگیای هەبوو، و بەهێز و دەسەڵاتی خۆمان لێکمان جیاکردنەوە، و بارانمان لە ئاسمانەوە باران و ڕووەکیشمان لە زەویەوە دەرهێنا، وە ئاومان گێڕاوە بەهۆی زیندووڕاگرتنی هەموو شتێك، ئیتر ئایا ئەو سەرسەخت ونکۆڵیکارانە باوەڕناهێنن بەوەی کە بەچاوی خۆیان دەیبینن وهەستی پێدەکەن، و بەو هۆیەوە دەست بکەن بە تەنها پەرستنی خودا ؟!

کەواتە : هەردووکیان بە یەکەوە دروست بوونە ،هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٩ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ۝١٠ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ۝١١﴾ [فُصِّلَت : ٩ - ١١]واتە : دەسا .ئەی پەیامبەری خوا صلى الله علیه وسلم .بە سەرزەنشت کردن و سەرسوڕمان دەربڕین لە کردەوەکانیان بەو هاوەڵبڕیاردەرانە بڵێ : ئایا ئێوە باوەڕناهێنن بەو ( اللّه ) یەی کە زەوی بە دوو

ڕۆژ دروستکردووە، و هاوەڵ و هاوشێوەی بۆ دادەنێن و لەگەڵیا دەیانپەرستن ؟! ئەو بەدیهێنەرە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە ..!! وە چەندین شاخ و کێوی جێگیری لەسەر زەوی داناوە، وە خێر و بێری بەردەوام و هەمیشەیی بۆ دانیشتوانەکەی تێدا بەدیهێناوە، و ڕۆزی و بژێوی خەڵکەکەی تێدا دیاری کردووە لە خواردن، و ئەوەی بۆ بژێویان گونجاو بێت لە تەواوی چوار ڕۆژدا : دوو ڕۆژ زەوی تێدا بەدیهێناوە و دوو ڕۆژی تری شاخ و کێوی تێدا داناوە و ڕزق و ڕۆزی و بژێوی دیاری کردووە، بۆ ئەوانەی پرسیاردەکەن. واتە : بۆ ئەوانەی ویستبێتیان پرسیار بکەن بەمەبەستی زانین..!! پاشان ئیرادە و ویستی دروستکردنی ئاسمانی کرد، کە پێشتر و لەو کاتەدا دوکەڵ بوو، جا بە ئاسمان و زەوی فەرموو : بە سەرپشکی یان بە ملکەچی پابەندبن بە فەرمانی منەوە، وتیان : بە ملکەچی دێین، و هیچ ویستێکمان نیە پێچەوانەی ویستی تۆ ببێتەوە .!! کەواتە : بە یەکەوە دروست بوون ..؟!

هە روە ها دە فە رموویت : قال تعالى: ﴿فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ١٢﴾ [فُصِّلَت : ١٢] واتە : جا خوای پەروەردگار بەدیهێنانی هەر حەوت ئاسمانەکە وڕێکخستنی لە دوو ڕۆژدا تەواوکرد، بەمەش بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی بەشەش ڕۆژ تەواوبوون، لەبەر دانایی و حیکمەتێك کە تەنها خوا خۆی دەیزانێت، لەگەڵ ئەوەی کە پەروەردگار دەیتوانی بە تەنها ساتێك بیانهێنێتە بوون، وە لە هەر ئاسمانێك چی ویست بڕیاری بۆ دا، و ئاسمانی دونیامان بە ئەستێرەی ڕوناك و درەوشاوە ڕازاندەوە، و بۆ پاراستن لەو شەیتانانەی کە گوێ دەگرن و قسەی ئاسمان ئەدزن، ئا ئەو دروستکراوە بێ وێنەیە بڕیاری بە توانایەکە لە موڵك و سامانەکەی، و زانایەکە کە زانینەکەی هەموو شتێکی گرتووەتەوە ..!! هە روە ها دە فە رموویت: قال تعالى: ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ١٧﴾ [المُؤۡمِنُون : ١٧] واتە : وە بەدڵنیاییەوە حەوت ئاسمانمان بەسەرتانەوە دروستکردوە هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریانەوەیە، و هەرگیز ئێمە لەبارەی دروست کراوەکان بێئاگا نین، و لە هیچ دروستکراوێك بێئاگانابین و لەبیریان ناکەین ..!! هەروەها دەربارەی حەوت ئاسمانە کانیش ، کە (خوای گەورە ) بە وەحی بۆ قورئان پیێ مان دەفەرمووی : کە ئاسمانە کان حەوتە ، بەلام تا ئێستا هیچ ئادەمیزادێك زانیاری نیە دەربارەی ئەم حەوت ئاسمانە ئەوەی هەیە لە قورئان و سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە بە وەحی و نیگا لە لایەن جبریل (علیە السلام ) ، ئەویش بۆمان باسکراوە لە قورئان و سوونەت کە ئاسمانە کان حەوت تبقە یە یان حەوت چینە ، چین لەسەر چینە ، بەلام تا ئێستا بیردۆزی گەردوون ناسی هیچ لە بارەیەوە زانیاری نیە لەم دونیا پێکەوتنەدا ، ئەوەی هەیە لە قورئان سوونەتە ، ئیمە موسلمانی ئیماندارییش دەبێت باوەری تەوامان پیێ هەبێت ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ ٢٩﴾ [البَقَرَةِ : ٢٩]واتە : وە یەکسەر حەوت ئاسمانی دروست کردو ڕێکیخست..!! قال تعالى: ﴿قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبۡعِ وَرَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ٨٦﴾ [المُؤۡمِنُون : ٨٦]واتە : ئەی محمد - صلى الله علیه وسلم - پێیان بڵێ: کێ پەروەردگاری هەر حەوت ئاسمانەکەو پەروەردگاری عەرشی گەورەیە؟!

هه روه ها ده فه رموويت : قال تعالى: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ٤٤﴾ [الإسرَاء : ٤٤]واته : ئاسمانەکان وزەویش پاکی وبێگەردی خوای پەروەردگار ڕادەگەیەنن، وئەوانەش کەلەنیوانیاندان لەهەموو دروست کراوەکانی، وه هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا پاکی وبێگەردی خوای پەروەردگار ڕادەگەیەنێت لەگەڵ ستایسش وشوکرانەبژێرکردنی، . بەڵام ئەی خەڵکینە . ئێوە لێیان تێناگەن، خوای پاك وبێگەردیش حەلیمە بەرامبەر بەندەکانی، پەلەناکات لەسزادانی ئەوانەی کە سەرپێچی دەکەن، و لێبوردەیشە بەرامبەریان ..!! قال تعالى: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا﴾ [المُلْك : ٣]واته : ئەو خوایەی کە حەوت ئاسمانی دروست کردووە چین لەسەر چین (کە هەموویان پێکەوە نەلکاون بەڵکو لیك جیاوازن و کەلێن لە نێوانیاندا هەیەو نێوانیان بۆشە وەکو لە فەرموودەی ئیسراو میعراجدا هاتووە)..؟!

ئەگەر سەرنج بدەینە ووشەی ﴿لَكُم﴾ دەبینین دوو مانا هەلدەگرێت : ١- بۆ (الاباحه ) ، ٢- بۆ (التعليل ) ؟

بیٚ گومان هەر شتێك (خوای گەورە ) دورستی کردبێت لەسە رزەویدا رێگە پێدراوە پاکە ئەوەی کە حەلالە لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعًا﴾

هەروەها جێگیر کردنی کردارەکانی یان کارە کانی (خوای گەورە ) لە بەر ووتەی قال تعالى: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ هەروەها دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ١٦﴾ [البُرُوج : ١٦] واته : خوای گەورە هەر شتێکی بوێ ئەنجامی ئەدات هیچ کەسێك نیە کە خوای گەورە بگەڕێنێتەوە لە کارێك کە بیەوێ ئەنجامی بدات..؟!

بەلام هەندێك لە زانایانی تەفسیری قورئان رای جیاوازیان هەیە لەسە ر دورست بوونی ئاسمان و زەوەی ، کامیان پێش کامیان درەست بوونە ، وەك باسمان کرد هەندێك دەلێن : هەردووکیان بە یەکەوە دەروست بوونە ..؟!

✍ لەرێ (ابن ابی نجیح ) له (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾دەڵێت : هەموو ئەو شتانەی لەسەر زەوەی دا هەن ملكەچی ئێوە بوونه یان بۆ ئێوەی ئامادە كردووە بۆ سوود لێ وەرگرتن ..).[١]

✍ لەرێ (سعید ) له (قتادە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ دەڵێت : هەموو ئەو شتانەی لەسەر زەوەی دا هەن ملكەچی ئێوە بوونه یان بۆ ئێوەی ئامادە كردووە بۆ سوود لێ وەرگرتن، ئەو شرەف كرامەتیە له خودا وەیە ، وە نیعمەتێك بۆ نەوەی ئادەمیزاد ، بۆ چیژ لێ وەر گرتن وەپێویستی و سوود وەرگرتن له پیناوی دا ..).[٢]

✍ له (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ واته : له شتێك ، قال تعالى: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ دەڵێت : له سەرتا كه دورست بوو زەوەی دورست كرا ..).[٣]

✍ لەرێ له (الكلبی ) له (ابی صالح ) له (عبدالله بن عباس ) – خوای لێ رازی بێت – له سەر ووتەی قال تعالى: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ دەڵێت : مانای : فەرمانە كەی بەرەو ئاسمان بەرز بووە وە ..).[٤]

✍ له رێ (الربیع بن أنس ) له (ابی العالیه ) – رحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ دەڵێت : واته : بەرزی ، یان بلندەی ..).[٥]

✍ لەرێ (ابن ابی نجیح ) له (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ دەڵێت : (خوای گەورە ) زەوەی دروست كرد پێش ئاسمان ، دوای ئەوی كه زەوی دروست كرد، دوو كەڵی لێ دەر چوو ،هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ ..).[٦]

✍ لەرێ (ابی جعفر ) له (الربیع بن أنس ) – رەحمەتی خوای لێ بێت- لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ دەڵێت : بەرز بوونەوە بۆ ئاسمانه یان بەرزی بۆ ئاسمان ..).[٧]

---

[١] -اخرجه ابن ابي حاتم .
[٢] -اخرجه ابن جرير (٤٥٤/١).
[٣] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٦/١).
[٤] -اخرجه البيهقي في الأسماء والصفات (٨٧٢).
[٥] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧٥/١).
[٦] -اخرجه ابن جرير (٤٦٣/١).
[٧] - اخرجه ابن ابي حاتم (٧٥/١).

✍ لەرێ (السدی ) لە (ابی مالك ابی صالح ) لە (عبداللّٰه بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿هُوَ ٱلَّذِی خَلَقَ لَكُم مَّا فِی ٱلۡأَرۡضِ جَمِیعࣰا ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰۤ إِلَى ٱلسَّمَاۤءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَـٰوَ ٰتࣲ﴾ دەلێت : (خوای گەورەی ) عەرشی خۆی دروست کرد لە سەر ئاو دا ، هیچ شتێکی دروست نەکرد پێش ئاو ، ئینجا بەوەیستی خۆی دروستی کرد ، دروست کردنی ئاو دووکەلی لێ دەر چوو ، بەرزە بوویەوە سەرووی ئاو ،ئینجا ناوی لەسەر دانا ، ناوی نا ئاسمان ، پاشان وشك رەق پێچەوانەی تەر بوو ، پاشان زەوەی کردە یەك زەوەی ، پاشان زەویە دابەش بوو یان جیای کردەوە ، دواتر بووە بە حەوت زەوی لە دوو رۆژ دا ، لە رۆژی یەك شمە و دوو شمە ، پاشان زەوەی دروست بوو لە سەر حوت ، ئەوەی کە (خوای گەورە ) دەربارەی دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿نۤۚ وَٱلۡقَلَمِ﴾ [القَلَم : ١] واتە : حوت یان نەهەنگ لە ئاو دا ، ئنجا ئاو لە سەر پشتی پاك بوو ، وە پاك لە سەر پشتی فریشت بوو ، وە فریشتە ش لە سەر بەردێکی بەرقی بە هێز بوو ، وە بەردەکەش لە هەوا دایە ، ئەو بەردەی کە لقمان باسی کردووە ، نە لە ئاسمانە و نە لە زەویدایە ، ئینجا حوت یان نەهەنگ جوولە دەکات ، تێك دەشلەقێت ، ئینجا زەوەی لە رزە دورست دەبێت ، ئینجا کێوە کان یان چیایە کان لەسەری لەنگەر دەگرن ، ئینجا قرار دە گرێ ، ئینجا کێوە کان فخرو شانازی بە زەویەوە دەکەن ، هە روەك (خوای گەورە ) دە فەر موویت : قال تعالی: ﴿وَأَلۡقَىٰ فِی ٱلۡأَرۡضِ رَوَ ٰسِیَ أَن تَمِیدَ بِكُمۡ﴾ [النَّحل : ١٥] .وە چیاو یان کێوە کان تێدا دروست کران و جێگیر کران ، ئینجا رزق و رۆزی تێدا تقدیر کرا ، لە دارو درەخت ، وە ئەمەش دەبێت لە دوو رۆژ دا ، لە رۆژی سێ شەم و رۆژی چوار شەم ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿أَىِٕنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِی خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ﴾ [فُصِّلَت : ٩] تاکو ووتەی قال تعالی: ﴿وَبَـٰرَكَ فِیهَا﴾ [فُصِّلَت : ١٠] دەلێت : دارو درەخت رووا ، قال تعالی: ﴿وَقَدَّرَ فِیهَاۤ أَقۡوَ ٰتَهَا﴾ [فُصِّلَت : ١٠] واتە : رزق رۆزی تێدا تقدریر کرا ، قال تعالی: ﴿فِیۤ أَرۡبَعَةِ أَیَّامࣲ سَوَاۤءࣰ لِّلسَّاۤىِٕلِینَ ۝١٠﴾ [فُصِّلَت : ١٠]دەلێت : ئەم پرسیارە فەرمان کردنە ، قال تعالی: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰۤ إِلَى ٱلسَّمَاۤءِ وَهِیَ دُخَانࣱ﴾ [فُصِّلَت : ١١] دەلێت : واتە : ئەوە ئەو دووکە لە بووە لە هەنانسە ی ئاو دەرچوو ، لە ئاسمانی یەکەم ، پاشان ئاسمانە کانی جیا کردەوە ، کردەیە بە حەوت ئاسمان لە دوو رۆژ دا ، لە رۆژی پێنج شەمە و رۆژی هەینی ، هەر بۆیە ناوی جمعەیە یان هەینی بەکوردی بۆیە ، هەموو رۆژە کان تێدا کۆکردۆتەوە ، لە دورست کردنی ئاسمانەکان و زەویدا ، قال تعالی: ﴿وَأَوۡحَىٰ فِی كُلِّ سَمَاۤءٍ أَمۡرَهَا﴾ [فُصِّلَت : ١٢] واتە : هەموو ئاسمانەکانە کان دروست کران ، لە فەریشتەکان ، ئەنجا دروست کردنی دەریاو زەریا کان ، وە چیا و کێوە ساردە کا، ئەوە ئەوەی کە نایزانین ..؟! ئینجا رازانەوەی ئاسمان بە ئەستێرە و هەسارەکان ، هەر بەم شێوەی رازایتەوە بۆ پارێزگاری لە شەیتانە کان ، ئینجا کاتێ تەواوبوو لە دروست کردنی ئەوشتە یکە خۆشی دەویست دواتر سەر کەوتە سەر تەختەکەی یان عەرشە کەی ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَ ٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِی سِتَّةِ أَیَّامࣲ﴾ [الأَعۡرَاف : ٥٤] وە دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿كَانَتَا رَتۡقࣰا فَفَتَقۡنَـٰهُمَا﴾ [الأَنبِيَاء : ٣٠] ..).[١]

[١] -اخرجە ابن ابي حاتم (٧٤/١).

✍ لە ری (الكلبي) لە (ابي صالح) لە (عبدالله بن عباس) – خوا لی رزای بیت – لە سە ر ووتە ی قال تعالى: ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ﴾ واتە : دروست كردنی حەوت ئاسمان ، ئاگرەكە بە سەر ئاوە كەدا درۆیشت ، بۆ بە هەلم و بوخار بە سەردەریادا ، پاشان بەرز بوویە بۆ هەواو ، هەر بۆیە ئاسمانەكانی لێ دروست بوو ..).[1]

✍ لەرێ (الربيع بن أنس) لە (أبى العاليه) – رحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەیقال تعالى: ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ﴾ دەلێت : واتە: بەرێكی دورست بوو ..).[2]

✍ لە رێ (ابن ابی نجیح) لە (مجاهد) – رەحمەتی خوای لێ بێت- لەسە ر ووتەی قال تعالى: ﴿ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ دە لێت : دورست كردنی ئاسمانەكان هەندێكیان لەسەرووی هەندێكن ، وە حەوت زەویە كەش هەندێكیان لە ژێری هەندێكن ..).[3]

✍ لەرێ (معمر) لە (قتاده) – رحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ دەلێت : هەندێكیان لە سەرووی هەندێكن، نێوان هەر دوو ئاسمان پێنچ سەد سال رێی یە ..).[4]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ﴾ دەلێت : واتە : دروست بوونی قال تعالى: ﴿سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ واتە : زۆر گەورە ترە لە دروست بوونی مرۆڤە كان ، هەروە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾﴾ [غَافِر : ٥٧] ..).[5]

[1] -اخرجه البيهقي في الاسماء والصفات (٨٧٢).
[2] -اخرجه البخارى (٢٦٩٨/٦).
[3] - اخرجه ابن ابي حاتم (٧٥/١).
[4] - اخرجه ابن جرير (٤٦٤/١).
[5] - تفسير مقاتل بن سليمان (٩٦/١).

✍ لە لە ری (ابي طلحة ) له (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازي بيت – لە سە ر ووتە ی قال تعالى: ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ۝٢٩﴾ دەڵێت : واتە : ئەو زاتە زانايە كە كە زانستی تەواو كامل لە هەموو شتێكدا ..).[1]

✍ لە رێ (عطاء بن دينار ) لە (سعيد بن جبير ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی خوا قال تعالى: ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ۝٢٩﴾ دەڵێت : واتە : لە كارەكانی دا كار بەجێ و زانا و دانايە ، باشتر دەزانێت ..).[2]

✍ لە (مقاتل بن سليمان) –رە حمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : قال تعالى: ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ﴾ لە دورست كردن قال تعالى: ﴿عَلِيمٌ ۝٢٩﴾ واتە : زانایە لە دورست كردن و زيندوو كردنەوە جگە لەوانەش هی تریش ..).[3]

✍ لە (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت- دەڵێت : ((أَخَذَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ بيَدِي فَقالَ: خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ التُّرْبَةَ يَومَ السَّبْتِ، وَخَلَقَ فِيهَا الجِبَالَ يَومَ الأحَدِ، وَخَلَقَ الشَّجَرَ يَومَ الاثْنَيْنِ، وَخَلَقَ المَكْرُوهَ يَومَ الثُّلَاثَاءِ، وَخَلَقَ النُّورَ يَومَ الأرْبِعَاءِ، وَبَثَّ فِيهَا الدَّوَابَّ يَومَ الخَمِيسِ، وَخَلَقَ آدَمَ عليه السَّلَامُ بَعْدَ العَصْرِ مِن يَومِ الجُمُعَةِ، في آخِرِ الخَلْقِ، في آخِرِ سَاعَةٍ مِن سَاعَاتِ الجُمُعَةِ، فِيما بيْنَ العَصْرِ إلى اللَّيْلِ)).[4] واتە : (ابو هريره ) -خوای لێ رازی بێت – دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرتم و فەرمووی : (خوای گەورە ) لە رۆژی شەمە زەوی دروست كردووە ، لە رۆژی یەك شەمە چیاو كێوە كانی تێدا دروست كردووە ،لە رۆژی دووشەمە درەخت داری دەرست كردووە ، لە رۆژی شەمە شتە بێزاركەرەوە كانی (المكروه ) دروست كردووە ، لە رۆژی چوارشەمە نووری دروست كردووە ،لە رۆژی پێنج شەمە ئاژە لە كانی تێدا بلاو كردە وە ، لە رۆژی جمعە يان هەينی دوای عەصر ئادەمیزادی دروست كردووە ،لە كۆتایی دروستكراوەكاندا لە دوايين ساتەكانی هەينی و نێوان عەصر و شەو دا ..!!

---

[1]- اخرجه ابن جرير (٤٦٦/١).
[2] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧٥/١).
[3] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٦/١).
[4] - صحيح مسلم برقم (٢٧٨٩) .

# چیرۆکی گێرانەوەکانی پاشایەتی شەیتان، دورست بوونی باوکە ئادەم و دوایی دورست بوونی

(خوای گەورە ) ئادەمیزاد واتە : مرۆڤی دورست کرد لە قورێکی ووشك بوو یان قورێکی سوورکراو وەك چۆن کە قورێك بە ئاگر سوور کرابێتەوە ، یان وە کو ئەوانەی کە گۆزە قاپ قاجاغ بە قور سووردکەنەوە ئابەم شێوەیە ئادەمیزاد دورست کرا ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویێت: قال تعالى: ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ ١٤﴾ [الرَّحۡمَٰن : ١٤] هەر وەها جنۆکە و شەیتانیش دورست کرا لە گر بلیسە ئاگری بێ دوو کەڵ ..!!

✍ لە (عائشە ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((خُلِقَتِ المَلائِكَةُ مِن نُورٍ، وخُلِقَ الجانُّ مِن مارِجٍ مِن نارٍ، وخُلِقَ آدَمُ ممَّا وُصِفَ لَكُمْ)).[1] واتە: فریشتە لە نور یان روونکی دورستکراوە ، جنۆکەش لە بلیسە ئاگری بێ دووکەل دورست کراوە ، ئادەمیزادیش بۆتان باسکراوە ،واتە : (لە قوری سوور کراو دوستکراوە )..!!

✍ لە (ابن کثیر )- رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : زانایانی تەفسیر یەك راو بۆچوونن لە سەر ئەوەی کە ، جۆنکە و شەیتان پێش ئادەمیزاد دورست بوونە ، پێش ئەوان زەوی دورست بووە ، واتە : لە دوای زەوەی (الجن ، والبن ) ئەم دوانەش دورست کراوی (خوای گەورە )یە ، ئینجا جنۆکە دورستکراوە ، پاشان لە سەر زەوەی کوشتاریان کردووە ، یەکتریان لە ناو بردووە ، کە لە زەوی دا جێ یش بوون ..).[2]

✍ لە (عبداللە بن عباس) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : شەیتان یان ئیبلیس لە ئەشرافی فریشتە کان بوو ، چونکە براو پێکراو خەزینە داری بە هەشت و سولتانی ئاسمانە کانی دونیا و سولتانی زەوی بوو ..).[3]

✍ لە (عبداللە بن عباس) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : هۆزیك لە فریشتە کان جن یان جنۆکە بوون ، شەیتان یان ئیبلیس یەکێك بوو لەوان ، وە لە نێوانی ئاسمان و زەوی سنوری فەرمانرەوایەتی ئەو بوو ..).[4]

✍ لە (عبداللە بن مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : شەیتان یان ئیبلیس پاشایەتی ئاسمانی لە دەستدا بوو ، لە هۆزێك بوو لە فریشتە کان بە جن یان جنۆکە ناویان دەبرد ، بۆیە بەم ناوە ناویان دەبرد چونکە خەزێنەداری بە هەشت بوون ، شەیتان یان ئیبلیس هەم پاشا بوو هەم خەزێنە دار بوو چونکە شەیان لە گەل فریشە کان یان ملائکەتەکان خەزێنە داریش بوو..).[5]

[1] - صحيح مسلم برقم (٢٩٩٦).
[2] - البداية والنهاية ابن كثير ص٥٥.
[3] -تاريخ الطبري (٨١/١).
[4] -تاريخ الطبري (٨١/١).
[5] -تاريخ الطبري (٨١/١).

✍ لە ( ابن کثیر )- رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت: (شەیتان یان ئیبلیس لە قبیلەی یان لە هۆزی جنۆکەکان بوو، (خوای گەورە ) فەزلی زیاتری پێ بەخشی بوو لە جنۆکە کانی تردا ، (خوای گەورە ) کردیە پاشای جنۆکەکان لەسەر زەوی گەورەیی فەزلی زیاتر بوو ، هەروەها دەڵێت : هەر بۆیە کردیە پاشایە چونکە لە سەر زەوەی فسادی و خوێن ڕێژی تێدا دەکرا ، هەر بۆیە شەیتان یان ئیبلیس ی راستەخۆ نارد لە گە ل جنۆکە سەربازەکانی خۆی دا ، ئینجا کوشتاریی کردن لە سەر زەوی لە دوورگە یەکی دەریادا ، وە هەروەها دەڵێت : ناوی ئیبلیس پێش ئەوەی تاوانە ئەنجام بدات ناوی (عزازیل ) بووە ، وە لە دانیشتوانی سەر زەوی زۆر فریشتە لێ بوو تێ کۆشانیان دەکرد و علم زانستیان زۆر بوو ئەوەی زیندوو بوو پێیان دەووت : جنۆکە ، هەروەها ئیبلیس رێزدار و شەریف بوو لە نێو هۆزەکەیدا ، خەزێنە داری بەهەشت بوو سولتانی دونیا ئاسمان بوو ، ناویشی (عزازیل) بووە ..).[1]

✍ لە (ابن جریر ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەڵێت : ( کاتێك خوا ویستی ئادەم دورست بکات بۆئەوەی لە سەر زەوی بێت خۆی و نەوەکانی دوای خۆی شێوە و یان وێنەو جستەی دروست کرد ، لەو کاتە ئیبلیس سەرکردە و پێشەوای جنۆکەکان بوو ، وە زۆر پەرستنی یان ئەنجام دەدا ، ئا ئەو کاتە ناوی (عزازیل ) و بەخشندەیی بووە ، کاتێك ئیبلیس بینی کەوا بۆشایی هەیە یان کون و ناوچالە ئەو دورست کراوێکە کۆنترۆل نەکراوە خۆی بۆ ناپارێزی ..؟! وە لە پاشان ووتی: سەبارەت بە ئادەم ئەگەر زال بم بەسەری دا ئەوا لە ناوی دەبەم هیلکی دەکەم ، ئەگەریش دەسەلاتم بەسەری ززال بوو ئەوا تووشی سەرپێچی و تاوانی دەکەم ، پاشان (خوای گەورە ) روحی گرتە بەر ئادەم ، کاتێك فەرمانی (خوای گەورە ) درا بە فریشت کان کەوام سووجدە بن ، وە ئیبلیس یان شەیتان چووە ناویان حسوودی و ئیرەیی زۆر گەورەی برد خۆی لە وان بە دوورگرت لە سووجدە بردن ، هەروەها ووتی : من لە باشتر و خیر ترم ، منت لە ئاگر دورست کردووە ، وە ئەویشت لە قور دورست کردووە ، ئینجا سەر پێچی فەرمانە کانی (خوای گەورە ) کرداعتراض ی گرت یان نارەزایی دەربری لە پەروەردگار ، ئەمەش بووە هۆی هەڵە یەکی زۆر گەورە ، هەروەها دوور کەوتەوە لە رحمەت بەزەیی (خوای گەورە ) وە ئیبلیس پلە و پایە پێگەی دا بەزینرا کە پێشتر بە دەستی هێنا بوو لە پەرستنەکانی دا ، ئیبلیس هاوشێوەی فریشتەکان بوو ، بەلام لە رەگەزی ئەوان نەبوو ، چونکە فریشت کان لە نور دورست بوونە ، بەلام ئیبلیس جنۆکە لە ئاگر دورست بوون ، بۆیە ئیبلیس لە سروشتی خۆی خیانەتی کرد لە کاتێك دا زۆر ترین پێویست پێ بوو گەرایەوە بۆ سەر بنچینەی خۆی کە ئاگرە ، قال تعالی: ﴿فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ٧٣ إِلَّآ إِبۡلِيسَ ٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٧٤﴾ [ص : ٧٣ - ٧٤]واتە: مەلائیکەتەکان هەموویان سوجدەی ڕێزو ئیحترامیان بۆ ئادەم بردو فەرمانی خوایان جێبەجێ کرد..!! [ إِلَّا إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ ] تەنها ئیبلیس نەبێ کە جنی بوو ئەم خۆی بە گەورەزانی [ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ (٧٤) ] وە لە کافران بوو لەبەر ئەوەی فەرمانی خوای گەورەی جێبەجێ نەکرد..!! هەروە ها دەفەرمووێت: قال تعالی: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ٥٠﴾ [الكَهۡف : ٥٠]

[1] -البداية والنهاية ابن كثير (٥٦/١).

واتە : [ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ ] کاتێك ئێمە بە فریشتەکانمان وت کڕنۆشی ڕێزو ئیحترام و بەگەورەزانین بۆ ئادەم بەرن [ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ ] هەموویان کڕنۆشیان برد تەنها ئیبلیس نەبێ کە ڕەتی کردەوە کڕنۆش بۆ ئادەم بەرێت و وتی: من لەو باشترم منت لە ئاگر دروست کردووە ئەوت لە خۆڵ دروست کردووە [ كَانَ مِنَ الْجِنِّ ] وە ئیبلیس مەلائیکەت نەبووە بەڵکو لە جنی بوو [ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ ] وە لە گوێڕایەڵی و فەرمانی خوای گەورە دەرچوو [ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِي ] ئایا ئێوە ئیبلیس و نەوەکانی ئەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆتان جگە لە من لە دوای ئەوەی کە بێ فەرمانی خوای گەورەی کرد [ وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ ] لە کاتێکدا ئەوان دوژمنی ئاشکرای ئێوەن [ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا (٥٠) ] خراپترین شتە کە ستەمکاران خۆشەویستی و پشتیوانی خوای گەورە ئەگۆڕنەوە بە شەیتان ..!! .[١]

بەڵێ سەبارەت بەو ڕووداوانەی لە سەردەمی پاشایەتی ئیبلیس یان شەیتان دا ڕوویاندا ، یەکێك لە ڕوواوەکان کە ملکەچی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) بوو .

✍ لە (عبداللە کوری عباس ) – خوا لیچ رازی بێت – دەڵێت : ئیبلیس لە هۆزێك لە فریشت کان بوو کە پێیان دە ووتن : جنۆکە یان (جن ) ، لە ئاگر دورست بوون ، ئیلبیس ناوی (عزازیل ) یان (حارس) بوو ، یەکێك بوو لە خەزێنە دارە کانی بە هەشت. هەموو فریشتەکان جگە لەم هۆزە لە نوور دورست بوون ، واتە : (تەنها هۆزەکەی شەیتان یان ئیبلیس لە ئاگر دورست بوون ) کەواتە ئەو (جن) یان جنۆکانەی لە قورئان دا ناویان هاتووە لە بلیسە ئاگری بێ دوو کە ل دورست بوون ، ئادەمیزادیش لە قوریچکی خاوێنی سورکراوە دورست بوو، یەکەم دانیشتوانی سەر زەوەی جنۆکەکان بوون ...؟! خراپە کاری فسادی و گەندەلیان کردە پیشەی خۆیان خوێنیان زۆر رشت و کوشتاری یەکتریان کرد ، (خوای گەورە ) ئیبلیس نارد لە گەل هاورێ یە کان و سوپا یەك لە فریشتە کانیان رەوانەکرد ئیبلیس سەر کردەیان بوو ، شەر و کوشتاریان لە گەل کردن و جنۆکە کانیان بۆ دوورگە کانی دەریا دەوربەری چیاو کێوە کان دوور خستەوە ، ئیبیس کاتێك ئەم کارەی ئەنجامدا ، لە خۆ بایی بوو ووتی : کارێکم کرد پێش من کەس نەیکردیە . (خوای گەورە ) ش بە نهێنی دڵ ی ئیبلیس زانی ، بەلام فریشتە کانی هاورێی ئاگاداری ئەو تکبری خۆ بە گەورە زانینەی ئیبلیس نەبوون ..؟![٢]

✍ لە (الربیع کوری أنس ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : (خوای گەورە ) فریشتە کانی لە رۆژی چوارشەم دورست کرد ، وە جنۆکەی لە رۆژی پێنچ شەمە دورست کرد ، وە ئادەمیزادی لە رۆژی هەینی یان جمعە دورست کرد ، وە هۆزیك لە جنۆکەکان کافر بوون و فریشت کان لەسەر زەوی کوشتاریان لە گەل کردن و بەمشێوەیە لەسەر زەوی خوێن رێژی و خراپە کاری بلاوبوویەوە..؟!.[٣]

[١] - البداية والنهاية ابن كثر (١/٥٦-٥٧).
[٢] -تاريخ الطبري (١/٨٢).
[٣] -تاريخ الطبري (١/٨٢).

بەڵێ ئەوەی کە باس کراوە سەبارەت بە لە خۆبایی و تەکبر و خۆ بە گەورە زانینی دوژمنی (خوای گەورە) ئیبلیس یان شەیتان .

✍ لە (عبداللە کوری عباس) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : کاتێك ئیبلیس یان شەیتان شەری جنۆکەکانی کرد کە خراپە کاری و خوێن رێژیان دەکرد سەر زەوی ، ئەویش شەری لە گەل دا کردن و کوشتاری کردن و لە ناوی بردن ، بەم هۆیە بوو ئیبلیس لە خۆ بایی بوو ، وە تکبر بوو یان خۆی بەگەورە زانی ، کە گومانی کرد لە زانست و لە پیشە کەی لە کەسانی تر زیاترە یان لە پێشترە..؟!.[١]

✍ لە (عبداللە کوری مسعود) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : کە کاتێك (خوای گەورە) لە دورست کردن تەواو بوو ، لە سەر عەرش جێگەی گرت و ئیبلیس کردە پاشای ئاسمانە کان ، ئەو لە هۆزی ئەو فریشتانە بوو کە بە (جن) یان جنۆکە ناویان دەبردن چونکە خەزێنەدارانی بە هەشت بوون ، ئیبلیس هەم پاشا بوو هەم خەزێنەدار بوو ، لە خۆبایی بوو وە بە خۆی ووت : بۆیە (خوای گەورە) ئە پاشایە تیە بەمن بە خشیە چونکە لە پێشتر و گەورترم لە کە سانی دیکە ..).[٢]

✍ لە (عمری کوری حیماد) – خوا لێ رازی بێت – دە گێرێتەوە دەلێت : کاتێك گەورەیی لە خۆبایی خۆ بە زل زانی لە دڵ ی ئیبلیس جێگیر بوو یان جێگەی گرت ، گومانی کرد کە لە فریشتەکان زۆر لە پێشترە و گەورە ترە ..؟! (خوای گەورە) بە مەی زانی و بە فریشت کانی فەرموو : قال تعالی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةً﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠] واتە : جێگرەوەیەك یان خەلیفە یەك بۆ خۆم لەسەر زەوی جێ نشین دەکەم یان دەست نیشان دەکەم ..؟! .[٣]

✍ لە رێ ( طاوس ) لە (مجاهد) لە (ابي الحجاج) لە (عبداللە کوری عباس) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ئیبلیس لە فریشتە کان بوو ناوی (عزازیلە) نیشتە جێ سەر زەوی بوو ، فریشتە کانی سەر زەوی بە (جن) یان جنۆکە ناویان دەبران ..).[٤]

✍ لەرێ (عکرمە) لە (عبداللە کوری عباس) – خوا لی رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : (خوای گەورە) دورست کراوێکی دورست کرد ، فەرمووی : سووجدی یان کرنۆشی بۆ ببەن ..؟! ئەوانیش ووتیان : کرنۆش یان سووجدە نابەین ..!! واتە : جنۆکە کانی سەر زەوی ئەوانەی خراپە کاریان دەکردو خوێن رێژیان دەکرد ..!! (خوای گەورە) ئاگرێکی نارد و ئەوانی سوتاند ، دواتر دورستکراوێکی یان بوونەوەرێکی تری دورست کرد ، بە وانی فەرموو : من ئادەمیزادێك یان مرۆڤێك دورست دەکەم لە قور سوور کراو ، دەبێت سووجدە یان کرنۆشی بۆ ئادەم ببەن ، ئەوانیش رازی نەبوون و حاشایان کرد ..؟! (خوای گەورە) ئاگرێکی ڕەوانە کرد و ئەوانیشی سووتاند ..؟! دواتر هۆزێك لە جنۆکەی یان فریشتەی دورست کرد فەرمووی : ئایا سووجدەی یان کرنۆشی بۆ ئادەم دەبەن ..؟! ووتیان بەڵێ کرنۆش دەبەین ..!! بەلام تەنها ئیبلیس نەبێت حاشای کردو سووجدە یان کرنۆشی نە برد ..؟! .[٥]

---

[١] -تاریخ الطبري (٨٣/١).
[٢] - تاریخ الطبري (٨٣/١).
[٣] - تاریخ الطبري (٨٣/١).
[٤] -تاریخ الطبري (٨٣/١).
[٥] تاریخ الطبري (٨٤/١).

✍ لە (شهری کوری حوشب ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – سەبارەت بەم باسە دەگێڕێتەوە دەڵێت : (خوای گەورە ) کە ئیبلیس لە (جن ) یان لە جنۆکە بوو ، دە گێڕنەوە کە ئیبلیس لە هۆزی ئەو جنۆکانە بوو کە فریشت کان لە ناویان بردن ، هەروەها ئیبلیس لە لایان فریشتە کان بە دیل گیرا بۆ ئاسمانیان برد ..؟! .[١]

✍ لە (سعدی کوری مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – دە گێڕیتەوە دەڵێت : فریشتە کان لە گەڵ جنۆکە کان شەریان کرد و ئیبلیس کەم تەمەن بوو بە دیل گیرا ، لە گەڵ فریشتە کان بوو و پەرستنی (خوای گەورە)ی ئەنجام دەدا و کاتێك فەرمانیان پێدرا کە سووجدە یان کرنۆش بۆ ئادەم ببەن فریشتە کان بردیان واتە : رازی بوون ، بەلام تەنها ئیبلیس نەبیت رازی نەبوو ، مانایی فەرموودە کەی (خوای گەورە ) ئەمەیە کە فەرمووی : ئیبلیس لە جنۆکە بوو ..؟![٢]

بەلام ئەمانە هەمووی ووتەی زانایانی پێشینە کانە ئەمە راو بۆچوونی خۆی تیان مەرج نیە راست نەبێت و مەرجیش نیە راست بێت ، تەنها (خوای گەروە زاناترە ) ئەوەی هەیە ئەمە ووتەی زانایانە ، بەلام ئێمە دەبێت لە فەرموودەی (خوای گەورە ) لا نەدین دەبێت شوێنکەوتەی قورئان و سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بین ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾ [البَقَرَةِ : ٣٤]

بەلێ بێگومان دە گێڕنەوە دەلێن: هۆکاری ریسوا بوون و زەلیکردنی ئیبلیس ئەوە بوو کە پێش ئادەم ، جنۆکە کان دانیشتوانی سەر زەوی بوون (خوای گەورە ) ئیبلیسی کرد پاشاو سەر کردە و دادوەری ئەوان بۆ ماوەی هەزار ساڵ دادوەری و پاشایەتی لە نێوان ئەواندا کرد ، وە بە (حکم ) ناوی دەرکرد ، (خوای گەورە ) ئەم ناوەی پێ بەخشی ، وەحی بۆ نارد هەر لە بر ئەمە ئیبلیس لە خۆ بایی بوو ، لە نێوان جنۆکەکان دوژمنایەتی دوبەرەکی دورست کرد بۆماوەی هەزار ساڵ لە سەر زەوی کوشتارو شەری یەکتریان کرد ، بە شێوەیەك ئەسپە کانیان لە خوێندا نوقم ببوون ، هەروە ك (خوای گەورە دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٖ مِّنۡ خَلۡقٖ جَدِيدٖ ١٥﴾ [ق : ١٥] واتە: ئایا لە بەدیهێنانی یەکەمی دروستکراوەکاندا کە هیچ نەبوون و هێنامانە بوون دەستەوەستان و بێتوانابووین، بۆ ئەوەی ئێستا بێتوانا و دەستەوەستان بین لە دووبارە بە دیهێنانەوەیان پاش لەناوچوونیان ؟ بێگومان ئەوە بێتوانا و دەستەوسانمان ناکات، بەڵکو توانامان بەسەریدا هەیە، بەڵام ئەوانە لە گومان و دوودڵیدان دەربارەی زیندوبوونەوەی سەرلەنوێ و گەڕانەوەیان بۆلای خوای پەروەردگار ..!! هەروەها (خوای گەورە ) بە فەریشتەکان دەفەرمووی : قال تعالی: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠] بەلێ (خوای گەورە ) ئاگرێکی رەوانەکرد ئەوانی سووتاند ، کاتێك ئیبلیس ئازاری هۆزەکەی خۆی بینی ، رۆیشتە ئاسمانی سەرەوە لە گەڵ فریشتەکان مایەوە و بۆ پەرستنی (خوای گەورە ) هەولی دەدا ئەوکاتە (خوای گەورە ) ئادەمی دەرست کرد ئیبلیس یاخی گەری خۆی کردە پیشە..؟! .[٣]

[١] -تاریخ الطبري (٨٤/١).
[٢] - تاریخ الطبري (٨٣/١).
[٣] - تاریخ الطبري (٨٥/١).

کاتی دورست بوونی ئادەم و سەردەمی پاشایەتی ئیبلیس یان شەیتان :

بەڵێ کاتێك (خوای گەورە ) ئیرادەی کرد یان ویستی کرد  کە فریشتە کان لە  لەخۆبایی خۆ بەگەورە زانینی ئیبلیس یان شەیتان ئاگادار بکاتەوە  لەبەر ئەوەی ئەوان واتە : فریشتە کان هەستیان بەم خراپە کاریەی ئیبلیس نە کرد بوو یان  نەیانزانیبوو ..؟! (خوای گەورە ) ویستی ئەوەی کرد یان مەبەستی ئەوەی کرد کە نەهێنیەکەی ئیلبس ئاشکرا بکات ، چونکە سەردەمی ریسوابوونی بوو ، وە لە دەستدانی پاشایەتیەکەی  هاتبوو ..!! هەروەك (خوای گەورە ) فەرمووی : قال تعالی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠] واتە : لە سەر زەوەی خەلیفەیەك بۆ خۆم دروست دەکە ..!! ئەوانیش وەلامیان دایەوە قال تعالی: ﴿قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠] واتە : ئایا کەسیچك لە سەر زەوی جێگیر دەکەیت کە خراپە و خوێنرێژی بکاتە پیشە ..؟!

✍ لە (عبداللە کوری عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : کە فریشتە کان بۆیە ئەم قسە یان هێنا سەر زمان چونکە ئاگاداری کاروباری جنۆکەکانی سەر زەوی بوون  ، وە  بە (خوای گەورە ) یان ووت : کەسێك لە سەر زەوی جێگیر دەکەیت تا هاوشێوەی جنۆکەکان بێت کە خوێنیان رشت و خراپە یان کردە پیشە  لە کاتێکدا ئێمە بە پەرستنی تۆوە سەر قالین ..!! پاشان پەروەردگار وەلامی دانەوە فەرمووی : قال تعالی: ﴿قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠] واتە: دەفەرمووی : ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن ..؟! کەواتە : مەبەستی (خوای گەورە ) لێ غروری لە خۆبایی و  خۆ بە گەورە زانینی ئیبلیس بووە ، مەبەست ئەوە بوو کە ئیبلیس نافەرمانی کردن بوو تاکو ئاشکرای بکات و فریشە کان بە چاوی خۆیانەوە ببینن ..!! [١]

بەڵێ کاتێك (خوای گەورە ) ویستی یان مەبەستی دورست بوونی ئادەمی کرد ، فەرمانی دا تا خاك یان خۆل لە سەر زەوی هەلبگرن.

✍ لە (عبداللە کوری عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : کە پەروەردگار فەرمانی دا تاکو خاك یان خۆلی ئادەمیان لە سەر زەوی هەگرت و ئەوی لە قوری لکێنەری بۆن خۆش دورست بوو ، ئەوەی لە قوری بۆگەن وەرگیرابوو وە قوری بۆگەن لە خاك یان خۆل ، (خوای گەورە ) ئادەمی بەدەستی خۆی  قور دروست کرد ..؟!

[١]- تاریخ الطبري (١/٨٧).

✍ لە (عبداللە کوری مسعود ) – خوا لیّ رازی بێت – دەگێڕێتەوە کە دەلێت : دەستە یەك لە هاوە لانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێرنەوە فریشتە کان وویتان : قال تعالى: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠] دەلیّت " (خوای گەورە ) کە (جبرەئیل) ی رەوانە کرد تا قور یان گل لەسەر زەوی بێنێت ، وە زەوی ووتی : پەنا بۆ خوا دەبەم لەوەی من ریسوا یا لەمن کەم بکەیتەوە ، (جبرەئیل ) گەرایەوە و هیچی هەلنەگرت ..!! ووتی : ئەی خوایە زەوی پەنای بۆ تۆ برد من لیّ خۆش بوون ..!!

ئینجا (خوای گەورە ) ئەم جارە (میکائیل )ی رەوانە کرد و زەوی ووتەکەی دووبارە کردەوە و (میکائیل ) گەرایەوە ..!! دیسان دووبارە (خوای گەورە ) فریشتە یکی تری رەوانە کرد ئەوی (ملك الموت ) واتە : فریشتەی مەرگی رەوانە کرد و زەوی پەنای بۆ خوا برد بەلام فریشە ی مەرگ ووتی : منیش پەنا بۆ خوا دەبەم لەوەی بگەرێمەوە و فەرمانەکەی ئەوم ئەنجام نە دابێت ،خاك یان خۆلی لسەر زەوی هەلگرت و تێکە لی کرد، لە یەك شوێن هەلینە گرت و لە خاك یان لە خۆلی سوور و رەش و سپی هەلگرت و لبەر ئەمە رەنگی منالە کانی یان نەوە کانی ئادەم جیاوازە ..؟! خاکە کەی یان خۆلە کەی بردە ئاسمان تەریان کرد و گل یان قوریان لیّ دروست کرد و لێگەران تاکو گۆرا بۆنی گرت مانای فەرمووەدەی (خوای گەورە ) قال تعالى: ﴿مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ٢٦﴾ [الحِجۡر : ٢٦] لە گلی یان قوری بۆ گەن ئەمەیە ..؟! [١]

✍ لە (عبداللە کوری عباس ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : کاتێك (خوای گەورە ) ئیبلیسی رەوانە کرد کە لە خۆلی سوێر و شرینی زەوی هەلگرت و ئادەمی لیّ دروست کرد و بە ئادەم ناوی دەرکرد کە لە (ئەدیەمی زەوی ) سەرچاوەی گرتووە ، هەر لەبەر ئەمە ئیبلیس ووتی : من سووجدە یان کرنۆش بۆ کەسێك ببەم کە لە گل خۆر یان قور دورست کرایە هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ٦١﴾ [الإِسۡرَاء : ٦١] واتە : وتی: ئەی پەروەردگار من کرنوش بەرم بۆ کەسێك کە تۆ لە قورِ دروستت کردووە. ..؟! .[٢]

✍ لە (سعید کوری جبیر )- رەحمەتی خوا لی بیت – دەلێت : کە بۆ یە بە ئادەم ناوی دەرکرا چونکە لە ئەدیمی زەوی دورست کراوە ..؟.[٣]

✍ لە (علی کوری ئەبوو تالیب )- خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : کە ئادەم لە ئەدیەمی زەوی دورست کرا بە چاك و خراپە بوو و لەبەر ئەمە منالە کانی کە ئادەم چاك و خراپن ..؟! .[٤]

[١] -تاريخ الطبري (٨٨/١).
[٢] -تاريخ الطبري (٩١/١).
[٣] -تاريخ الطبري (٩١/١).
[٤]

📖 لە (ابو موسى الاشعرى ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إنَّ اللَّهَ تعالى خلقَ آدمَ من قبضَةٍ قبضَها منَ أديمِ الأرضِ فجاءَ منهمُ الأبيضُ والأحمرُ والأسودُ من ذلِك والسَّهلُ والحَزْنُ والخبيثُ والطِّيبُ ، ثم بلت طينته حتى صارت طينا لازبا ، ثم تركت حتى صارت حمأ مسنوناً ، ثم تركت حتى صارت صلصالا ، كما قال الله تعالى: ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٢٦﴾﴾ [الحِجۡر : ٢٦]

واتە : (خوای گەورە ) ئادەمی لە مستێك قور یان گل دورست کرد ، کە لە سەر هەموو زەوی هەلیگرت و منالە کانی یان نەوە کانی ئادەم هاوشێوەی زەوین ..؟! سوور ، رەش ، سپی ، نەرم و درشت و چاك و خراپ ، خاکیان یان خۆل یان تەر کرد بۆ قور یان گل لێ گەران تا بۆنی گرت و ووشك بوویەوە بەهەمان شێوەی کە (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٢٦﴾﴾ [الحِجۡر : ٢٦] واتە : دڵنیابن لەوەی کە ئێمە ئادەممان لە قوڕێکی وشکهەڵاتوو دروستکردووە کە ئەگەر پێیدا بکێشرایە و لێیبدرایە دەنگی لێوە دەبیسترا، وە ئەم قوڕە وشکهەڵاتووەش لە قوڕێکی ڕەشی گۆڕاو .لە ڕەنگ و بۆندا .وەرگیراوە ..!!.[1]

✍ لە (عبدالله کوری عباس) – خوا لی رازی بیت – دە لیت : (خوای گەورە ) ئادەمی لە سێ شت دروست کرد ، لە قور یان لە گل ی ووشك ، لە قوری یان لە گل ی بۆگەن ، یان لە قوری لکێنەر ..؟! .[2]

بە لێ دە گێرنەوە دەلێن : کاتێك (خوای گەورە) ئادەمی دورست کرد یان لە گل تێکەلی کرد ، چل رۆژ یان ووتەیەکی تر دەلێن : چل ساڵ لاشەی یان جستەی لە سەر زەوی بووە .

✍ لە (عبدالله کوری عباس) – خوا لی رازی بیت – دە لیت : کاتێك (خوای گەورە ) فەرمانی دا قوری یان گلی ئادەمیان هەلگرت و ئادەمی لە قور یان لەگلی لکێنەری بۆگەن دورست کرد ، ئادەمی بەدەستی خۆی و چل رۆژ لاشەی یان جستەکەی لە سەر زەوی بوو ، ئیبلیس دەهات و دەچوو بەلاقی لێیدەدا کە دەنگی دەدایەوە و مانای ووتە ی (خوای گەورە ) قال تعالی: ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ ﴿١٤﴾﴾ [الرَّحۡمَٰن : ١٤] واتە : خوای گەورە مرۆڤی دروست کردووە واتە ئادەم لە قوڕی سوورەوەکراو کە قوڕێك بە ئاگر سوور ئەکرێتەوە وەکو چۆن ئەوانەی کە کوپەڵەو گۆزەو شتیان لێ دروست ئەکرێ..؟! یان لە قوری ووشك دەنگدار ئەمەیە یان شتیچکی ناو بە تال کپر نیە ، ئیبلیس یان شەیتان درۆیشتە ناو دەمی ئادەم و لە کۆتاییەکەیەوە دەهاتە دەر ، لە کۆتاییەکەیەوە دەرۆیشتە ناو لە دەمیەوە دەهاتە دەر و دەی ووت : تۆیان بۆ دەنگدانەوە دەرست نە کردووە ، بۆ مەبەستێك تۆ یان دروست کردووە ، ئەگەر بە سەر تۆ دا زال ببم ، لە ناوت دەبەم و ئەگەر تۆ بەسەر من دا زال بکەن ، فەرمان بەریت ناکەم یان بە قسەو فەرمانت ناکەم ..؟! .[3]

---

[1] - تاريخ الطبري (٩٢/١).
[2] - تاريخ الطبري (٩٢/١).
[3] -تاريخ الطبري (٩٢/١).

✍ لە (عبدالله کوری مسعود ) – خوا لی رازی بێت - دەگیرێتە وە ، وە کۆمەلێك لە هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێرنەوە ، دەلێن : (خوای گەورە ) بە فەریشتە کانی فەرموو : قال تعالى: ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ۝٧١ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ۝٧٢﴾ [ص : ٧١ - ٧٢] واتە : بە فریشتە کانی فەرموو : من مرۆڤێك یان بشرێك لە گل یان لە قور دروست دەکەم واتە : (ئادەم ) ، کاتێك تەواو بووم لە رووحی خۆم پێبەخشی ، سووجدە یان کرنۆشی بۆ ببەن ..؟! جا هەر کە دروستم کردو لەو رووحە تایبەتیەی کە من خاوەنی ئەوم و بە دەست منە فوم پێد کردو گیان و ژیانم پیێ بەخشی وە فەرمانم دا ئێوە فریشتە هەمووتان سووجدە کرنۆشی بۆ ببەن ، واتە : ( ئەم سووجدە یان کرنۆشە بۆ ئادەم ، تەنها ئەوەیە کە فریشتە کان فەرمانی (خوای گەورە ) نەشکێنن سووجدەکەش یان کرنۆشە کەش (تقدیر و رێزە ) وە جیێ بەجیێ کردنی فەرمانی خوایە ). (کوری مسعود ) دەلێت : (خوای گەورە ) ئادەمی بە دەستی خۆی دورست کرد تاکو ئیبلیس لە گەل ئەو رکابەری نەکات و ئەگەر رکابەری کرد..!! بفەرموویێت : لە گەل کەسێك رەکابەری دەکەیت کە بەدەستی خۆم دەرستم کردووە ..؟! ئادەمی لە شێوەی مرۆڤدا دورست کرد و چل سالٚ لاشەی یان جستەکەی گل یان قور بوو ..!! فریشتە کان بە لای دا تێدە پەرین و لە بینینی دەترسان و ئیبلیس زیاتر لە هەموویان ..؟! کاتێك ئیبلیس بەلای ئادەم تێدەپەری لێدەدا و لاشە کەی یان جستەکەی وەك گۆزەیەکی گل یان قور دەنگی دەدایەوە ..!! ئیبلیس دەی ووت : ئەمە بۆ مەبەستێکی تایبەت دورست کراوە ..؟! ئیبلیس لە دەمیەوە دەرۆیشتە دەروە لە پاشەوەی دەهاتە دەرەوە ، ئیبلیس بە فەریشتە کانی ووت : لە مە مەترسن واتە (ئادەم ) چونکە خوای ئێوە نا پرە بەلام ئەمە ناوی بەتالە ..؟! ئەگەر بەسە ئەو دا زال ببەم لە ناوی دەبەم ..؟! .[١]

✍ لە (سلمان فارسی )- خوا لی رازی بێت – دە گێرێتەوە دەلێت : کاتێك (خوای گەورە ) ئادەمی دورست کرد وپێش لە بەخشینی رووحی خۆی ، بۆ ماوەی چل رۆژ سەیری کرد ، گل یان قور وەك : گۆزە یان سوالەت ووشك بوویەوە و بەفریشت کانی فەرمووی : کاتێك رووحی خۆم پیێ بەخشی سووجدە یان کرنۆشی بۆ ببەن ..؟!.[٢]

١ -تاريخ الطبري (٩٣/١).
٢ -تاريخ الطبري (٩٣/١).

لە (عبدالله کوری مسعود ) – خوا لی رازی بێت - دەگێریتەوە ، وە کۆمەلێك لە هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێرنەوە ، دەلێن : کاتێك (خوای گەورە ) مەبەستی کرد رووح بە (ئادەم) ببەخشێ ، بە فریشتەکانی فەرموو: ئەگەر رووحی پێ بەخشرا ئەو سووجدە و کرنۆشی بۆ ببەن ..؟! کاتێك رووحیان بە ئادەم بەخشی و گەیشتە لای سەری ، پژمی و فریشتەکان ووتیا: (الحمد الله ) واتە : سوپاسی خوا یان کرد ، (خوای گەورە ) فەرمووی : (رحمك بك ) واتە : رەحمەتی پێ ببە خشێت ، کاتێك رووح گەیشتە چاوەکانی سەیری مێوە کانی بەهەشتی کرد ، کاتێك رووح گەیشتە نێو سینەی ئارەزووی خواردنی کرد ، و پێش ئەوەی رووح بە لا قە کانی بگات ، بە پەلە بەرەوە مێوە کانی بە هەشت رای کرد ، هەموو فەریشتەکان سووجدە یان کرنۆشیان بۆ برد جگە لە ئیبلیس یان شەیتان نەبیت هاوریەتی ئەوانی نەکرد و حاشای لێ کردو بێ فەرمانی (خوای گەورە )ی کرد کافر بوو ، (خوای گەورە ) پێ فەرموو: بۆ چی سووجدە یان کرنۆشت نەبرد ..؟! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٍ﴾ [الأنبِيَاء : ٣٧] واتە : مرۆڤ دروستکراوەو سروشتی وایە کە پەلەیەتی..؟! قال تعالی: ﴿فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ۝٣٠ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ۝٣١﴾ [الحِجۡر : ٣٠ - ٣١] واتە : فریشتەکان هەر هەموویان کرنوشیان بۆ ئادەم بردو فەرمانی خوای گەورەیان جێبەجێ کرد..!! [ إِلَّا إِبْلِيسَ ] تەنها ئیبلیس نەبێ هەر چەندە ئەم جنی بوو لە مەلائیکەت نەبوو بەلام لەبەر ئەوەی زۆر عیبادەتی خوای ئەکرد خوای گەورە لەگەڵ مەلائیکەتەکان باسی کرد [ أَبَى أَنْ يَكُونَ مَعَ السَّاجِدِينَ ] رەتی کردەوە کە لەگەڵ فریشتەکاندا کرنوش بەرێت..!! قال تعالی: ﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسۡجُدَ إِذۡ أَمَرۡتُكَۖ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ۝١٢﴾ [الأَعۡرَاف : ١٢] واتە : [ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ ] خوای گەورە بۆ سەرزەنشت کردن و جێگیر کردنی بەڵگە بەسەریدا فەرمووی: ئەی ئیبلیس چی رێگری لێ کردیت کە سوجدە بۆ ئادەم بەریت کاتێك کە من فەرمانم پێ کردیت [ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ ] وتی: ئەی خوایە من لەو باشترم منت لە ئاگر دروست کردووە ئەوت لە قور دروست کردووە ئاگریش لە قور باشترە بەگومانی خۆی، (ئیبلیس یەکەم کەس بوو کە قیاسی بەکارهێنا)..!! قال تعالی: ﴿قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ۝١٣ قَالَ أَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ۝١٤ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ۝١٥﴾ [الأَعۡرَاف : ١٣ - ١٥]واتە : [ قَالَ فَاهْبِطْ مِنْهَا ] خوای گەورە فەرمووی: دەی لە ئاسمان یان بەهەشت یان ئەو پلەوپایەی پێتدرابوو دابەزە ئیتر تۆ نابێ لەناو مەلائیکەتاندا بیت [ فَمَا يَكُونُ لَكَ أَنْ تَتَكَبَّرَ فِيهَا ] وە بۆت نیە کە لە ئاسماندا یان لە بەهەشتدا خۆت بەگەورە بزانی و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە بکەی [ فَاخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ الصَّاغِرِينَ (١٣) ] دەرچۆ لە بەهەشت تۆ لەو کەسانەی کە رِسواو زەلیل و سەرشۆڕ ئەبیت. ئیبلیس وتی: ئەی پەروەردگار بمهێڵەرەوە با نەمرم تا رۆژی زیندوو بوونەوە تا رۆژی قیامەت..؟! خوای گەورە فەرمووی: ئەوا مۆڵەتت ئەدەم و تۆ لەو کەسانەی کە ئەمێنیتەوە تا رۆژی قیامەت کە دونیا تێك ئەچێ بۆ ئەوەی کە خوای گەورە خەڵکی پێ تاقیبکاتەوە..!!ئەم گێرانەوەیە دا چەند ئایەتێك زیاترە تەنها بۆ زیاتر تێگەیشتنە ..!! .[1]

---

[1] -تاریخ الطبري (٩٥/١).

📖 لە (ابوهریرە ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ ((خلَقَ اللهُ آدمَ بيدِه، ونفَخَ فيه من رُوحِه، وأمَرَ الملائكةَ فسجدوا له، فجلس فعطَسَ، فقال: الحمدُ للهِ، فقال له ربُّه: يرحمُكَ ربُّكَ، ائْتِ الملائكةَ فقُلْ: السَّلامُ عليكم؛ فأتاهم فقال: السَّلامُ عليكم، فقالوا: وعليكَ السَّلامُ ورحمةُ اللهِ، ثم رجَعَ على ربِّهِ تعالى؛ فقال له: هذه تحيَّتُكَ وتحيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ بينَهم. فلما أظهر إبليس من نفسه ما كان له مخفيا فيها من الكبر المعصية لربه ، وكانت الملائكة قد قالت لربها عز وجل حين قال لهم : غنى جاعل فى الارض خليفة : أتجعل فيها من يفسد فيها ويسفك الدماء ونحن نسبح بحمدك ونقدس لك ، فقال لهم ربهم : إنى أعلم ما لاتعلمون ، تبين لهم ما كان عنهم مسترا ، وعلموا أن فيهم من منه المعصية الله عز وجل والخلاف لأمر )).[1]

واتە: کاتێك رووحیان بە ئادەم بەخشی ، پژمی و ووتی : (الحمد الله ) واتە :سوپاسی (خوای گەورە ) ی کرد، ئینجا پەروەردگار فەرمووی : (یرحمك ربك ) واتە: خوا رەحمەت پێ بکات ، ئینجا (خوای گەورە ) فەرمانی پێدا برۆ بۆ لای فریشتەکان بلێ (السلام علیکم ) واتە : سلاوتان لێ بێت ، ئادەم رۆیشت سلاوی لەو ئەوان کرد ، فریشتە کانیش ووتیان : (وعلیك السلام ورحمە الله ) واتە : سلاو رەحمەتی خوات لێ بێت ، پاشان ئادەم بۆ لای (خوای گەورە ) گەرایەوە (خوای گەورە ) پێی فەرموو : ئەمە سلاوی تۆ و منالە کانی تۆیە یان نەوەکانی تۆیە تا کو بە یەکتری بلێن ، ئا لەم کاتە دا ئیبلیس یان شەیتان ئەمەی لە خۆ ئاشکرا کە شارد بوویەوە لە خۆبایی خۆ بەگەورە زانی و خراپە کاریەکانی لە پەروەردگار ،پاشان (خوای گەورە ) بە قریشتە کانی فەرموو : قال تعالى: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ [البَقَرَة : ٣٠] واتە: (خوای گەورە ) بە فریشتە کانی فەرموو : ئەوەی ئەمن دەیزانم ئێوە نایزانن ..؟! لە زۆر چاك دەزانم کە شەیتان سەرپێچی فەرمانەکانی منی کردووە ..؟!.[2]

[1] - تاريخ الطبري (٩٦/١).
[2] - تاريخ الطبري (٩٦/١).

بەڵێ (خوای گەورە ) هەموو ناوە کانی فێری ئادەم کرد ، واتە : هەموو ئەو ناوانەی کە خەڵکی دەیزانن وە : ناوی مرۆڤ و ناوی ئاژەڵ گیاندارە کان و زیندەوەرەکان ناوی زەوی و دەشت و چیاو کێوەکان ناوی رووبار دەریا و زەریاکان هەموو ناوە کان کە هەن .

✍ لە (عبدالله کوری عباس ) – خوا لی رازی بیت – لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] دەڵێت : واتە : هەموو ناوە کانی فێری ئادەم کرد تەنانەت ئەو ناوانەش کە شیاو نیە بۆ ووتن لە نێوان ژن وپیاو دایە مەبەستی پی شەرمی ژن و پیاو و هتد ..!!.[١]

✍ لە (قتادە ) – رحمەتی خوای لیٚ بیٚت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] دەڵێت : واتە : فەرمووی : ئەمە چیاو کێوە ، ئەمە دەریایە ئەمە فلانە و ئەمە فیسارە ، دواتر شتە کانی پێشانی فریشتەکان دا ، کە (خوای گەورە ) دەفەموویٚت : قال تعالی: ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] واتە : اشان خوای گەورە پرسیاری لە مەلائیکەت کرد دەربارەی ئەو ناوانە و فەرمووی: ئەگەر ڕاست ئەکەن ناوی ئەم شتانەم پێ بڵێن..؟! .[٢]

✍ لە (سعید ی کوري جبیر ) –رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەڵێت : (خوای گەورە ) ناوی هەموو شتەکانی فێری ئادەم کرد ، تەنانەت ناوی ووشتر و چێل و بزنیش ..؟! .[٣]

✍ لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوا لیٚ بیٚت – دەڵێت: (خوای گەورە ) ناوی هەموو دروست کراوەکانی خۆی فێری ئادەم کرد ..؟![٤]

✍ لە (الربیع ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣١]دەڵێت : (خوای گەورە ) هەموو ناوە کانی فیچری ئادەم کرد، بەمەست لیٚ ناوی فریشتەکانە..!! .[٥]

✍ لە (قتادە) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەڵێت : (خوای گەورە ) هەموو ناوی شتەکانی فێری ئادەم کرد ،وەك ئەمانە : ماین و ، ئێستر و، ووشتر و ، جنۆکەو ، ئەژدیهاو ، هەموو شتێکی دورست کرد لە سەر شێوەی خۆی ..؟! .[٦]

---

[١] -تاريخ الطبري (٩٧/١).
[٢] -تاريخ الطبري (٩٧/١).
[٣] -تاريخ الطبري (٩٧/١).
[٤] -تاريخ الطبري (٩٧/١).
[٥] -تاريخ الطبري (٩٨/١).
[٦] -تاريخ الطبري (٩٨/١).

✍ لە (عبدالله كوری عباس ) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : كاتێك (خوای گەورە ) خەریكی دورست كردنی ئادەم بوو ، فریشتە كان ووتیان : بۆ كەسانێكی زاناتر و ئازیزتر لە ئێمە دورست ناكات ، چونكە دورست كردنی ئادەم تاقی كردنەوەی ئەوان بوو ، چونكە هەموو دروست كراوە كان رووبەرووی تاقی كردنەوە دەبنەوە هاوشێوەی ئاسمان و زەوی كە تاقی كردنەوەی ئەوان پەرستن بوو ، (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ١١﴾ [فُصِّلَت : ١١]واتە: [ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا ] خوای گەورە بە ئاسمان و زەوی فەرموو یان بە گوێڕایەڵی خۆتان یان بە پێناخۆش بوونی خۆتان فەرمانی من جێبەجێ بكەن، ئەی ئاسمان خۆرو مانگ و ئەستێرەكان دەربكە، ئەی زەوی رووبارو دەریاو كانیاو و بەرهەم و رووەكت دەربكە [ قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ ] وتیان: ئەی پەروەردگار هەردووكمان ملكەچ و گوێڕایەڵین بۆ فەرمانی تۆ..!![1]

✍ لە (قتادة)– خوا لیٚ رازی بێت – دە گێرێتەوە دەلێت : (خوای گەورە ) فە فریشتە كانی فەرموو : قال تعالى: ﴿إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ﴾ ، واتە : فریشتە كان بۆچوونی خۆیان ووت ، شتێكیان زانی شتێكیان نەزانی ، فریشتە كان ووتیان : قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ چونكە فریشتەكان دەیانزانی هیچ تاوان و گوناهێك گەورە تر نیە لە خوێن رێژی یان خوێن رشتن ، قال تعالى: ﴿نَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ وە كاتێك (خوای گەورە ) دورست كردنی ئادەمی دەستپێكرد ، فریشتە كان بە یەكیان ووت : خوا هەرچی پێخۆشە با دروستی بكات ، چونكە لە ئێمە زانا تر و ئازیزتر نابێت ، كاتێك ئادەمی دەرست كرد لە رووحی خۆی پێبەخشی ، فەرمووی : سووجدە یان كرنۆشی بۆ ببەن ، ئادەمی پێش ئەوان خست لە سزای ئەو قسە یان كردبوویان ، فریشتە كان ووتیان: باشتر لە نەبین ، لە زاناترین چونكە پێش دورستكراوین و نەتەوەكانی یان هۆزەكانی ئێمە پێش ئەو دروست كراون ، كاتێك شانازیان بە زانستەكەی خۆیانەوە كرد ، گیرۆدەی تاقی كردنەوە بوون ، (خوای گەورە ) ناوە كانی فێری ئادەم كرد و شتەكانی نیشانی فریشتەكاندا و فەرمووی : ئەگەر راست دەكەن و دەلێن لە هەر شتێك كە بیان فرێنم ،زانا ترن ، ناوی ئەم شتانەم پیٚ بلێن : فریشتە كان تۆ بەیان كرد و هەر باوەر دارێك تۆیە دەكات ، ووتیان: قال تعالى: ﴿قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٣٢ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٣٣﴾ [البَقَرَةِ : ٣٢ - ٣٣] واتە : فریشتەكانیش وتیان : پاكی و بێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگارمان، ئێمە هیچ زانستێكمان نیە جگە لەوە نەبێت كە خۆت فێرتكردوین، تەنها خۆت زانا و شارەزای بە كاروباری دروستكراوەكانت، و دانایت لە بەڕێوەبردنتدا ..؟! خوای پەروەردگار فەرمووی : ئەی ئادەم ناوی ئەو شتانەیان پێبڵێ كە بێ توانابوون لە زانینیاندا، و كە ئادەم ناوەكانی پێوتن، خوای پەروەردگار بە فریشتەكانی فەرموو : پێم ڕاگەیاندن كە من هەموو ئەو شتانە دەزانم كە لە ئێوە شارەوەیە لە ئاسمانەكان ولەزەویدا، و ئەوەش دەزانم كە ئێوە دەری دەخەن و ئەوەشی كە دەیشارنەوە ..؟!

[1] -تاريخ الطبري (١/١٠٠ ).

بە لێ ئەو ناوانەی کە (خوای گەورە ) فێری ئادەمی کرد ناوی هەموو شتەکان بوو وە ئەسپ و ئێستر و ووشتر و جنۆکە و وەحش و هەرشتێکی بەناوی خۆیەوە ناو نا و دەستە دەستە ناوی بردن ، دواتر بە فریشتە کانی ووت : مەگەر بە ئێوەم نەووت لە نهێنی دەیهێڵنەوە ، لای من شاراوە نییە ، ئەوەی شاکرایان کرد ، ئەو قسە یە بوو کەوتبوویە نەوەکانی ئادەم لە سەر زەوی خراپەکاری و خوێن رشتن دەکەن پیشە ..؟! ئەوەی بە نهێنی هێشتیانەوە ، ئەو قسەیە بوو کە بە یەکیان ووت کە ئێمە لە ئادەم باشترین و زاناترین..! کاتێك لە خۆ بایی بوون و نافەرمانی ئیبلیس بۆ فریشتە کان ئاشکرا بوو ، (خوای گەورە ) ئیبلیس دوور خستەوە ، ئیبلیس لە سەر نافەرمانی خۆی پێ داگیری کرد ، (خوای گەورە ) لە بەهەشت دەری کرد یان وەدەری نا ..؟! پاشایەتی ئاسمانە کان و زەوی و خەزینەداری بەهەشتی لێ ساندەوە ، فەرمووی : قال تعالى: ﴿قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ٣٤﴾ [الحِجۡر : ٣٤] واتە: خوای پەروەردگاریش پێی فەرموو : لە بەهەشت برۆ دەرەوە، چونکە تۆ دەرکراوی لە هەموو چاکەیەك، و نەفرەتت لێبێت و دووربیت لە بەزەیی من ..!! قال تعالى: ﴿عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٣٥﴾ [الحِجۡر : ٣٥] واتە : و نەفرەتت لێبێت و دووربیت لە بەزەیی من تا ئەو ڕۆژەی کە خەڵك زیندوودەکرێنەوە بۆ لێپرسینەوە و پاداشت ..!![1]

✍ لە (عبدالله کوری مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : ئیبلیس هێشتا لەسەر ئاسمان و بۆ زەوی نەهاتبووە خوار ..!! (خوای گەورە ) ئادەمی لە بەهەشت جێگە کردەوە کە بە تەنیا پیاسەی تیا دەکرد و هاوسەری نەبوو تا ئارامی پێ بگریت ..!! چەند ساتێك خەوت و کاتێك هەستا ، ژنێکی بینی کە لە سەر سەری دانیشتووە ، (خوای گەورە ) ئەو ژنەی لە پەراسووی ئادەمەوە دورست کرد ، لێ پرسی : تۆ کێیت ..؟! ووتی : ژنێکم .

ئادەم ووتی : بۆ چ مەبەستێك دروست کراویت ..؟!

ژنکە ووتی : تا بەمن ئارام بگریت ..!!

فریشتە کان کە بەشێك لە زانستی ئادەمیان پی برا بوو ، ووتیان : ئەی ئادەم ناوی چیە ..؟!

ئادەم ووتی : ناوی حەوایا ..!!

فریشتەکان : ووتیان لەبەر ئەوەی لە زیندوویەك دورست کراوە ..؟!

(خوای گەورە ) فەرمووی : قال تعالى: ﴿وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٣٥﴾ [البَقَرَةِ : ٣٥] واتە : وە خوای پەروەردگار فەرموی : ئەی ئادەم خۆت وحەوائی هاوسەرت لە بەهەشتدا نیشتەجێ بن، وخۆش بگوزەرێنن وچێژ وەربگرن بە بەربومەکانی و بە فراوانی لێی بخۆن لە هەر کوێیەك حەزتان لێیەتی، ونزیکی ئەم دارە مەکەونەوە بۆ ئەوەی نەکەونە تاوان و سەرپێچیەوە، و بەو هۆیەشەوە ببن بەزێنەرانی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار ..!!

[1] - تاريخ الطبري (١٠٣) .

دورست بوونی دایکە حەوا :

لەوەو پێش باسی دورست بوونی باوکە ئادەمان کرد زۆر بە درێژی ئیستا باسی چۆنیەتی دورست بوونی دایکە حەوا دە کەین ، بەڵێ دە گێرنەوە ئادەم سەر خەوێکی شکان ، (خوای گەورە ) پەراسویەك لە پەراسووەکانی لای چەپی ئادەمی لێکردەوە بە گۆشت پری کردەوە ..؟! ئادەمیش لە خەدا بوو بە خەبەر نەهاتەوە یان بە ئاگا نەهاتەوە ، پاشان (خوای گەورە ) لە پەراسووەکی ئافرەتێکی یان ژنێکی لێ دروست کرد کە ناوی (حەوا ) بوو ، کاتێك ئادەم لە خەوەکەی هەلسا بینی ژنێك یان ئافرەتێك لە لای سەریەوە وەستاوە لێ پرسی تۆ کێت ..؟! حەوا ووتی : من ژنێکم یان ئافەرتێکم ..!! ئادەم ووتی : بۆ چی دورستکراوی ..؟! حەوا ووتی : بۆ ئەوەی لە لام ئارام بگری ..!! ئادەمیش ئارامی گرت لای ..!! بەلێ ئادەم حەوا خێزانێك بوون ، بۆ ماوەیەك لە بەهەشت دەژیان لە خۆشی و چێژی بەهەشت کەیف و خۆشیان دەبرد هەموو شتێکیان بۆ دەستە بەرو حەلال بۆ کە جگە لە یەك درخت نەبێت ، کە (خوای گەورە ) فەرمانی پێ کردبوون لەم دەرختە نزیك نەبنەوە ، کە دفەرموویت قال تعالی: ﴿وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۝٣٥﴾ [البَقَرَةِ : ٣٥] واتە :

وە خوای پەروەردگار فەرموی : ئەی ئادەم خۆت وحەوائی هاوسەرت لە بەهەشتدا نیشتەجێ بن، وخۆش بگوزەرێنن وچێژ وەربگرن بە بەربومەکانی و بە فراوانی لێی بخۆن لە هەر کوێیەك حەزتان لێیەتی، ونزیکی ئەم دارە مەکەونەوە بۆ ئەوەی نەکەونە تاوان و سەرپێچیەوە، و بەو هۆیەشەوە ببن بەزێنەرانی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار ..!!

ووتراوە : ئەو بەهەشتەی کە ئادەم و حەوای لێ بوون بەهەشتی نەمری و نەبراوەی بووە ..!! یان ووتراویشە : بەهەشتێك بووە (خوای گەورە ) لە ئاسمان دروستی کردووە وە ..!! یان دەوترێت : بە هەشتێك بووە لە بە هەشتەکانی دونیادا ، ئەمانە هەر هەمووی راو بۆچوون (خوای گەورە زانا ترە ) . ئەو دەرختەی کە (خوای گەورە ) حەرامی کرد یان قەدەغەی کرد لە سەر ئادەم و حەوا ، زانایانی تەفسیر زۆر راو بۆچوونی جیاوازیان هەیە لە سەر ئەم جۆرە درەختە ، هەریەکەو تەفسیرێکی بۆ دەکات پشت بە خوا راو بۆ چوونی هەموویان دە خەینە روو لە باسە کانی دواتر بە دوو روو درێژی ، لێرە دا چەند راو بۆ چوونێك هەیە بەکورتی ئەمانەن :

یەکەم : دەلێن : دەرختەی کەرەم واتە : داری ترێ ..!!

دووەم : دەلێن : گژو گیای دانەوێلە یە ..!!

سێ یەم : دەلێن : گژوگیای گولە گەنمە ..!!

چوارەم : دەلێن : داری هەنجیرە یان هەنجیر بووە ..!!

پێنچەم : دەلێن : داری خورما یە یان درەختی خورما بوو ..!!

شەشەم : دەلێن : داری البر : ناوکەکەی وەك گورچیلە ی چێل وایە ، یان نەرمترە لە کەری زبدە شیرین ترە لە هەنگوین ..!!

ئەو فەرموودانەی دەربارەی باسی ئادەم هاتوون :

📖 لە ( أبی بن كعب ) – خوا لی رازی بیت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی : ((إنَّ اللهَ خلَق آدمَ رجلاً طُوالاً كثيرَ شعرِ الرأسِ كأنَّه نَخلةٌ سَحوقٌ ، فلمَّا ذاقَ الشَّجرةَ سقَطَ عنهُ لِباسُه فأوَّلُ ما بَدا عَورتُه ، فلمَّا نظَر إلى عَورتِه جعل يشتدُّ فى الجنَّةِ ، فأخذتْ شعْرَه شَجرةٌ فنازَعَها ، فنادَى الرَّحمنُ : يا آدمُ منِّي تفِرُّ ؟ فلمَّا سمِع كلامَ الرَّحمنِ قال : يا ربِّ لا ولكن استِحياءً ، أرأيتَ إن تُبتُ ورجَعتُ أعائدِي إلى الجنَّةِ ؟ قال : نعَم ، فذلكَ قولُه فَتَلَقَّى آدَمُ مِنْ رَبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ)) . [١]

واتە: (خوای گەورە ) ئادەمی دورست کرد پاوێکی بالا بەزر بوو ، پرچی یان قژی سەری زۆر بوو ، وەك دار خوماریەکی بەرز وا بوو ، کاتێك کە تامی دەرختەکەی یان دارەکەی کرد ، جل و بەرگەکەی لەبەری داکەنرا  بوویەوە ، یەکە شت کە لیٚ دەرکەوت شەرمکە کەی بوو یان حیا کەی بوو یان (عەورەتی ) بوو ، کاتێك کە شەرمکەی خۆی بینی یان حیا کەی خۆی یان (عەروەتەکەی ) خۆی بینی ، بە پەلە لە ناو بەهەشتدا دەر کرا ، درەختێك پرچی یان قژی کرد لیٚ کردەوە ، بانگی کرد (الرحمن ) : ئەی ئادەم لە من رادەکەی ..؟! کاتێك ئادەم فەرموودەکەی (خوای گەورە)ی بیست ووتی : ئەی پەروەردگارم نەخێر . !! لە تۆ راناکەم ، بەلام شەرم دەکەم ..؟! ئەگەر بە شیمان ببمەوەو گەرامەوە ، دەم گێریتەوە بۆ بەهەشت..؟! فەرمووی : بەلیٚ . هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ٣٧﴾ [البَقَرَةِ : ٣٧] واته : ئادەم چەند ووشەیەك .کە خوا بە ئیلهام خستبویە دڵیەوە بۆ تەوبەکردن وداوای لێخۆشبون .وەردەگرێت و پێی قەبوڵ دەبێت .کە ئەوانیش بریتی بون لە : [ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ] .پاشان بەو هۆیەوە خوای پەروەردگار تەوبەی لێوەردەگرێت و لەتاوانی خۆش دەبێت، بێگومان تەنها خوای بەرز و بڵند باڵادەستە کە وەرگری تەوبەیە لەوانەی کە تەوبە دەکەن لە بەندەکانی، و میهرەبان و بەڕەحمە بەرامبەریان ..!!

📖 لە (أبی بن كعب ) – خوا لی رازی بیت – لە پێغەمبەری ﷺ فەرمووی : ((إنَّ أباكم آدمَ كان كالنخلةِ السَّحوقِ ستين ذراعًا كثيرَ الشَّعرِ مُوارَى العورةِ فلما أصاب الخطيئةَ فى الجنةِ بدت له سوأتُه فخرج من الجنةِ فلقِيَته شجرةٌ فأخذتْ بناصيتِه فناداه ربُّه أفرارًا منى يا آدمُ قال بل حياءً منك واللهِ يا ربِّ مما جئتُ به)) . [٢]

---

[١] تفسير ابن كثر (٣٢١/٥) ، والبداية والنهاية ابن كثير (٩٧/١).
[٢] - البداية والنهاية ( ٩٧/١).

له (ابی هریره ) – خوا لی رازی بیت- له پێغەمبەری خوا ﷺ : ((خيرُ يومٍ طلعت فيه الشمسُ يومُ الجمعةِ ، فيه خُلِقَ آدمُ، وفيه اُدخِلَ الجنةَ، وفيه اُخرِجَ منها، ولا تقومُ الساعةُ إلا فى يومِ جمعةِ )).[1]

واتە: باشترین رۆژی حەفتە کە رۆژی یان خۆری لیّ هەل بێت رۆژی جمعەیە یان رۆژی هەینیە ، (خوای گەورە ) لە رۆژی جمعە یان هەینی دا ئادەمی دەرست کرد ، هەر لەو رۆژەدا لە بەهەشت دەرکراو دابەزی بۆ سەر زەوی ، هەر لەو رۆژەدا تەوبەی لیّ کرا ، هە لەو رۆژەدا وەفاتی کرد ، هەر لەو رۆژەشدا قیامەت هەلدەستێت یان رۆژی دوای روو دەدات ..!!

له (أنس بن مالك ) – خوا لیّ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((هبط آدمُ وحواءُ عُريانَين جميعًا عليهما وَرَقُ الجنةِ فأصابه الحرُّ حتى قعد يبكي ويقول لها يا حواءُ قد أذاني الحرُّ قال فجاءه جبريلُ بقطنٍ وأمرها أن تغزلَ وعلَّمها وأمر آدمَ بالحياكةِ وعلَّمه أن ينسج وقال كان آدمُ لم يجامِع امرأتَه فى الجنة حتى هبط منها للخطيئةِ التى أصابتْهما بأكلِهما من الشجرةِ قال وكان كلُّ واحدٍ منهما ينام على حِدَةٍ ينام أحدُهما فى البطحاءِ والآخرُ من ناحية أخرى حتى أتاه جبريلُ فأمره أن يأتىَ أهلَه قال وعلَّمه كيف يأتيها فلما أتاها جاءَه جبريلُ فقال كيف وجدتَ امرأتَك قال صالحةً )).[2]

له (عمر بن الخطاب ) – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لما اقترف آدمُ الخطيئةَ قال يا ربِّ أسألك بحقِّ محمدٍ إلا غفرتَ لى فقال اللهُ يا آدمُ كيف عرفتَ محمدًا ولم أَخلُقْه بعد فقال يا ربِّ لأنك لما خلقْتَنى بيدِك ونفختَ فىَّ من رُوحِك رفعتُ رأسى فرأيتُ على قوائمِ العرشِ مكتوبًا لا إله إلا اللهُ محمدٌ رسولُ اللهِ فعلمتُ أنك لم تُضِفْ إلى اسمِك إلا أحَبَّ الخلقِ إليك فقال اللهُ صدقتَ يا آدمُ إنه لأَحَبُّ الخلقِ إلىَّ وإذ قد سألْتَنى بحقِّه فقد غفرتُ لك ولولا محمدٌ ما خلقتُك)).[3]

---
[1] -سنن الترمذي برقم (٤٨٨).
[2] - البداية والنهاية ابن كثير (٩٩/١).
[3] - البداية والنهاية ابن كثير (١٠١/١)، ابن تيمية التوسل والوسيلة ص ١٦٦،و مجموعة الفتاوى ابن تيمية (٢٥٤/١).

له (ابی هریره ) – خوا لی رازی بێت – له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى عليهما السَّلاَمُ عِنْدَ رَبِّهِمَا، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى، قالَ مُوسَى: أَنْتَ آدَمُ الذى خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ وَنَفَخَ فِيكَ مِن رُوحِهِ، وَأَسْجَدَ لكَ مَلاَئِكَتَهُ، وَأَسْكَنَكَ فى جَنَّتِهِ، ثُمَّ أَهْبَطْتَ النَّاسَ بِخَطِيئَتِكَ إلى الأرْضِ، فَقالَ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى الذى اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلاَمِهِ وَأَعْطَاكَ الألْوَاحَ فِيهَا تِبْيَانُ كُلِّ شىءٍ وَقَرَّبَكَ نَجِيًّا، فَبِكَمْ وَجَدْتَ اللَّهَ كَتَبَ التَّوْرَاةَ قَبْلَ أَنْ اُخْلَقَ، قالَ مُوسَى: بِأَرْبَعِينَ عَامًا، قالَ آدَمُ: فَهلْ وَجَدْتَ فِيهَا وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى، قالَ: نَعَمْ، قالَ: أَفَتَلُومُنِى علَى أَنْ عَمِلْتُ عَملاً كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيَّ أَنْ أَعْمَلَهُ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِى بِأَرْبَعِينَ سَنَةً؟ قالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ: فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى)).[1] واتە : ئادەم و موسى كەوتنە مناقشە يان گفتوگۆ لە بەردەم پەروەردگاریاندا و ، ئادەم زال بوو بە سەر موسى دا ، موسى ووتی : تۆ ئەم ئادەمەیت كە (خوای گەورە ) بەدەست و توانای خۆی تۆی دورست كرد و ، لە رووحی خۆی فووی كرد بە بەرتا ، سووجدە یان كرنۆشی برد بە فریشتە كان بۆ تۆ و ، وە لە بەهەشتدا جێگیری كردی ، پاشان بە هۆی هەلە و تاوانی تۆ وە خەلكی دا بەزیە سەر زەوی ..؟! ئادەم ووتی : تۆ موسى یت كە (خوای گەورە ) بە هۆی پەیام و فەرموودە كانی خۆیەوە هەلیبژاردویت ، (الالواح ) پێ بەخشی كە رۆشن كەورەی هەموو شتێكی تێدایە وە نزیكی كردیتەوە وە رزگاری كردی ، بوونی (تەورات ) چەندە پێش دورست كردنی من بووە ..؟! موسى ووتی : بە چل ساڵ ئادەم ووتی : ئەم ئایەتی تیابووە قال تعالى: ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ١٢١﴾ [طه : ١٢١] موسى ووتی : بەلێ . ئادەم ووتی: باشە ئایا سەرزەنشتی من دەكەی لەسەر كردەوەیەك كە پێش چل ساڵ لەدروست بوونم (خوای گەورە ) نووسیویەتی . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئادەم سەركەوت بەسەر موسى ..!!

له (عمر بن خطاب )- خوا لی رازی بیت – دە لیت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إن موسى قال : يارب أرنا آدم الذى أخرجنا ونفسه من الجنة ، فأراه الله آدم ، فقال : أن أبونا آدم : فقال له آدم : نعم . قال : أنت الذى نفخ الله فيك من روحه ، وعلمك الأسماء كلها ، وأمر الملائكة فسجدوا لك ..؟قال : نعم . قال : فما حملك على أن أخرجتنا ونفسك من الجنة ..؟! فقال له آدم : ومن أنت ..؟! قال : أنا موسى . قال : أنت نبي بني إسرائيل الذى كلمك الله من وراء الحجاب لم يجعل بينك وبينه رسولا من خلقه ؟ قال : نعم . قال : أفما وجدت أن ذلك كان في كتاب الله قبل أن أخلق ؟ قال: نعم . قال : ففيم تلموني في شيء سبق من الله تعالى فيه القضاء قبلى . قال رسول الله ﷺ عند ذلك: فحج أدم موسى ، فحج آدم موسى ).[2]

[1] -صحيح مسلم برقم (٢٦٥٢).
[2]- سنن ابو داود (٤٧٠٣).

واتە : موسى دەڵێت : ئەی پەروەردگارم ، دواتر لێ دەکەم ئادەمم نیشان بدەیت کە خۆی و ئێمەشی لە بەهەشت دەرکرد یان وەدەرنا ، (خوای گەورە ) ئادەمی نیشاندا ، ووتی : تۆ ئادەمی باوکمانی ، ئادەم پی ووت : بەڵێ . ووتی : تۆ ئەو کەسەی کە (خوای گەورە ) لە رووحی خۆی گیان بە بەر کردی و ، وە سەرجەم نەوەکانی فێر کردی و ، فەرمانی کرد بە فریشتەکان کە سووجدە یان کرنۆشی بۆ ببەن ؟ ووتی : بەڵێ . موسى ووتی : کەواتە چی وای لە تۆ کرد کە خۆت و ئێمەش لە بەهەشت وەدەرنێ؟ ئادەم پێ ووت : ئەی تۆ کێت .؟! ووتی : من موسام ، ئادەم ووتی : پێغەمبەری نەوەی ئسرائیلیت ، ئەو کەسەی کە (خوای گەورە ) لە پشت پەردەوە قسەی لەگەل کردیت بەبێ دانانی فەریشتە لە نێوان تۆ خوێدا ؟ ووتی : بەڵێ . ئادەم ووتی : ئایا نازانی ئەوەی من کردوومە لە (اللوح المحفوظ ) دا نووسراوە پێش ئەوەی دورست بکرێم ؟ ووتی : بەڵێ . ئادەم ووتی : دەی کەواتە بۆچی سەر زەنشتم دەکەی لە سەر کردنی کارێ کە بریاری پێشتری (خوای گەورە ) ی لەسەر بووە پێش ئەوەی من دروست بکرێم . پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا فەرمووی : ئادەم موسای بەزاند ، ئادەم موسای بەزاند ..!!

📖 لە (ابو موسى الاشعری ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت: لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إنَّ اللهَ خلَقَ آدَمَ من قَبضةٍ قَبَضَها من جميعِ الأرضِ، فجاءَ بنو آدَمَ على قَدْرِ الأرضِ: جاء منهم الأحمرُ، والأبيضُ، والأسودُ، وبيْنَ ذلك، والسَّهلُ، والحَزْنُ، والخبيثُ، والطَّيِّبُ)) .[1] واتە : بێ گومان (خوای گەورە ) ئادەمی دروست کرد لە چەنگێك یان مشتێك خۆڵ لە هەموو بەش و پارچەکانی سەر زەوی هەڵی گرتووە ، بۆیە نەوەکانی لەسەر شێوازی هەموو زەوین ، لە نێوانیاندا رەنگی سور و سپی و رەش و تێکەل بوون ، ئەو سێ یانە بنچینەی رەنگە کانن ، رەنگی خۆڵە کانی زەوی ، هەروەها کەسانی لە سەر خۆ رووح سووك و توند و رەق و خەمۆکی و دەروون پیس و دەرون پاك و جیاواز لە مانە تێکەل بوون ..!!

📖 لە (أنس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لَمَّا صَوَّرَ اللَّهُ آدَمَ في الجَنَّةِ تَرَكَهُ ما شاءَ اللَّهُ أنْ يَتْرُكَهُ، فَجَعَلَ إبْلِيسُ يُطِيفُ به، يَنْظُرُ ما هُوَ، فَلَمَّا رَآهُ أجْوَفَ عَرَفَ أنَّه خُلِقَ خَلْقًا لا يَتَمالَكُ)).[2]

واتە: کاتێك (خوای گەورە ) دیمەنی یان شێوەی ئادەمی کێشا لە بەهەشت دا ، وازی لێ هێنان ئەوەنەی کە (خوای گەورە ) ویستی وازی لێ بهێنێت ، ئیبلیس بەدەوری دا دەگەراو سەیری دەکرد هەتا بزانێت چیە ئەمە ..؟! کاتێ بینی کە ناو سکی بۆشە ..!!زانی بە شێوەیەك دوروست کراوە کە خۆی ناگرێت ..؟!

[1] - سنن ابي داود برقم (٤٦٩٣).
[2] - صحيح مسلم برقم (٢٦١١).

📖 لە (ابو هريره ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لمَّا خلقَ اللَّهُ آدمَ ونفخَ فيهِ الرُّوحَ عَطسَ فقالَ: الحمدُ للَّهِ، فحمِدَ اللَّهَ بإذنِهِ، فقالَ لَهُ ربُّهُ يرحَمُكَ اللَّهُ يا آدمُ، اذهب إلى أولِئِكَ الملائِكَةِ، إلى ملأٍ منهُم جلوسٍ فقل: السَّلامُ عليكُم قالوا: وعليكَ السَّلامُ ورحمةُ اللَّهِ، ثمَّ رجعَ إلى ربِّهِ، قالَ: إنَّ هذِهِ تحيَّتُكَ وتحيَّةُ بَنيكَ، بينَهُم فقالَ اللَّهُ لَهُ ويداهُ مَقبوضتانِ: اختَر أيَّهما شئتَ، قالَ: اختَرتُ يمينَ ربِّي وَكِلتا يدى ربِّي يمينٌ مباركَةٌ ثمَّ بسطَها فإذا فيها آدمُ وذرِّيَّتُهُ، فقالَ: أي ربِّ، ما هؤلاءِ؟ فقالَ: هؤلاءِ ذرِّيَّتُكَ، فإذا كلُّ إنسانٍ مَكْتوبٌ عُمرُهُ بينَ عينيهِ، فإذا فيهم رجلٌ أضوَؤُهُم أو من أضوئِهِم قالَ: يا ربِّ مَن هذا؟ قالَ: هذا ابنُكَ داودُ قد كتبتُ لَهُ عُمُرَ أربعينَ سنةً. قالَ: يا ربِّ زِدهُ في عمرِهِ. قالَ: ذاكَ الَّذي كتبَ لَهُ. قالَ: أي ربِّ، فإنِّي قد جعَلتُ لَهُ من عُمُري ستِّينَ سنةً. قالَ: أنتَ وذاكَ. قالَ: ثمَّ أُسْكِنَ الجنَّةَ ما شاءَ اللَّهُ، ثمَّ أُهْبِطَ منها، فَكانَ آدمُ يعدُّ لنَفسِهِ، قالَ: فأتاهُ ملَكُ الموتِ، فقالَ لَهُ آدمُ: قد عجَّلتَ، قَد كتبَ لي ألفُ سنةٍ. قالَ: بلَى ولَكِنَّكَ جعَلتَ لابنِكِ داودَ ستِّينَ سَنةً، فجَحدَ فجَحدَتْ ذرِّيَّتُهُ ونسيَ فنَسيَتْ ذرِّيَّتُهُ. قالَ: فمِن يومئذٍ أُمِرَ بالكتابِ والشُّهودِ)).[1]

واتە: کاتێ (خوای گەورە ) ئادەمی دروست کرد ، رووحی کرد بەری و پژمی ، فەرمووی (الحمد لله ) سوپاسی خوای کرد بە رێگە پێدانی خوا خۆی ، پەروەردگاری پێ فەرموو : ( رحمك الله ) رەحمەتی خوات لێ بی ئەی ئادەم ، برۆ بۆ لای ئەو فریشتانە بۆ لای دەستە یەکیان یان کۆمەلێکیان کە دانیشتوون ، بەلێ : (السلام عليكم ) واتە : سلاوی خواتان لێ بێ ، ووتیان (وعليك السلام ورحمه الله ) واتە : سلاو لەتۆ ش رەحمەت خوات لێ بێ ، لە پاشاندا گەرایەوە بۆ خزمەت پەروەردگاری ، فەرمووی : ئەمە سلاو کردنی تۆ و نەوەکانتە لە نێوان خۆیاندا ، (خوای گەورە ) هەر دوو دەستی داخست و فەرمووی : هەلبژێرە کامیانت دەوێت ..؟! دەستی راستی پەروەردگاری هەلبژارد ، هەر دوو دەستی پەروەردگار هەر راست پیرۆزە ، لە پاشاندا دەستی کردەوە ئادەم و نەوەکانی تێدا بوو ، فەرمووی : ئەی پەروەردگارم ئەوانە کێن ..؟! فەرمووی : ئەوانە نەوەی تۆن ..!! هەموو کەسێ لەوانە تەمەنی لە نێو چاوانی نووسراوە ..؟! یەکێکیانی تێدا بوو لە هەر هەموویان نورانی ترو یان جوان ترو دەروشاوەتر بوو ،ئادەم فەرمووی : ئەی پەروەردگارم ئەوە کێیە ..؟! فەرمووی : ئەمە داودی کورتە چل سال تەمەنی بۆ نووسراوە ..!! ئادەم فەرمووی : ئەی پەروەردگارم تەمەنی زیاتر بکە ..؟! فەرمووی : هەر ئەوەندەم بۆ نووسیوە ..!! ئادەم فەرمووی : ئەی پەروەردگارم..؟! من شەست سال لە تەمەنی خۆم دەخەمە سەر تەمەنی ئەو ..!! فەرمووی : باشە . (خوای گەورە ) فەرمووی : لەپاشاندا لە بەهەشت نیشتە جێ بە ئەوەندەی خوا ویستی لە سەر بێ ، ئینجا دوای ئەوە دابەزە بۆ سەر زەوی ، ئادەم خۆی ئامادەکرد ، فریشتەی مەرگ هات بۆ لای رووحی بکێشی ، ئادەم فەرمووی : بەراستی تۆ پەلەت کرد من هەزار سالم بۆ نووسراوە ..؟! فریشتەی مەرگ ووتی : بەلێ . بەلام تۆ شەست سالت داوە یە داود ی کورت ..!! جا نکۆلی کرد و نەوەکانیشی نکۆلیان کرد ، لە بیری چوو ، نەواکانیشی لە بیریان چوو..!! فەرمووی : ئیتر لەو رۆژەوە فەرمانکرا بە نووسین شایەت ..!!

---
[1] -سنن الترمذي برقم (٣٣٦٨).

له (عمري بن خطاب ) – خوا لی رازی بیت – پرسیار کرا دەربارەی ئەم ئایەتەی کە (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾﴾ [الأعْرَاف : ١٧٢] واتە : وە ئەوەش بەیاد بهێنەوە .ئەی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم .کە پەروەردگاری تۆ نەوەکانی ئادەمی لە پشتی باوانیان دەرهێنا، و داوای لێکردن کە دان بنێن بە یەکتاپەرستێتی خۆی، بەوەی لە دەروون وفیترەتیاندا جێگیری کردبوو کە تەنها ئەوە پەروەردگار و بەدیهێنەر و خاوەنیان، ئەوانیش دانیان بەوەدانا بۆی، بۆ ئەوەی نەك لە ڕۆژی دواییدا نكۆڵی لێ بکەن، و دان بە هیچ شتێك لەوانەدا نەنێن، و ئیدیعا و لافی ئەوە لێبدەن بەڵگەی خوای پەروەردگاریان لەسەر جێگیر نەبووە، و نەش هیچ زانیاریەکیان لەو بارەیەوە هەیە، بەڵکو بێ ئاگان لێی .!! ((فَقالَ عمرُ بنُ الخطَّابِ : سَمِعْتُ رسولَ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ علَيهِ وسلَّمَ سُئِلَ عنها ، فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ علَيهِ وسلَّمَ : إنَّ اللَّهَ خلقَ آدمَ ، ثمَّ مَسحَ ظَهْرَهُ بيمينِهِ فاستخرجَ منهُ ذرِّيَّةً ، فقالَ : خلَقتُ هؤلاءِ للجنَّةِ وبعمَلِ أهلِ الجنَّةِ يعمَلونَ ، ثمَّ مسحَ ظَهْرَهُ فاستخرَجَ منهُ ذرِّيَّةً ، فقالَ : خلَقتُ هؤلاءِ للنَّارِ ، وبعَملِ أهلِ النَّارِ يعمَلونَ . فقالَ الرَّجلُ : ففيمَ العملُ يا رسولَ اللَّهِ ؟ قالَ : فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ علَيهِ وسلَّمَ : إنَّ اللَّهَ إذا خلقَ العبدَ للجنَّةِ استَعملَهُ بعملِ أهلِ الجنَّةِ حتَّى يموتَ علَى عملٍ من أعمالِ أهلِ الجنَّةِ فيُدْخِلَهُ اللَّهُ الجنَّةَ ، وإذا خلَقَ العبدَ للنَّارِ استعملَهُ بعملِ أهلِ النَّارِ حتَّى يموتَ علَى عملٍ من أعمالِ أهلِ النَّارِ، فيُدخِلَهُ اللَّهُ النَّارَ)).[١] واتە : پێشەوا (عمری کوری خەتاب ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەرباری ئەم ئایەتە پرسیارم لێ کرد فەرمووی : کاتێ (خوای گەورە ) ئادەمی دوروست کرد ، دەستی هێنا بە پشتی ئادەمدا نەوەیەك دەرچوو ، فەرمووی : ئەمانە بۆ بەهەشت ، بە کردەوەی ئەهلی بەهەشت کار دەکەن ..؟! لە پاشاندا دەستی هێنا بە پشتی ئادەمدا نەوەیەك دەرچوو ، فەرمووی : ئەمانە بۆ دۆزەخ بە کردەوەی ئەهلی دۆزەخ کار دەکەن ..؟! پیاوێ ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کەواتە بۆ کار بکەین لە کاتێکدا کە سەرنجامان یان چارە نووسمان دیار کراوە بۆ بەهەشت یان بۆ دەۆزەخ ..؟! فەرمووی : کاتێ (خوای گەورە ) بەندەیەکی دروست کرد بۆ بەهەشت بەکاری دەهێنی بۆ ئەنجامدانی کردەوەی ئەهلی بەهەشت هەتا سەرنجام لەسەر یەکێ لە کردەوەکانی ئەهلی بەهەشت دەمرێ ، بەوەش دەچێتە بە هەشتەوە ، کاتێ کە بەندەیەکی دروست کرد بۆ دۆزەخ بەکاری دەهێنی بۆ ئەنجامدانی کردەوەی ئەهلی دۆزەخ هەتا سەرنجام لە سەر یەکێ لە کردەوەکانی ئەهلی دۆزەخ دەمرێ و بەوەش دەچێتە دۆزەخەوە ..!!

[١]- سنن الترمذي برقم (٣٠٧٥).

قال تعالى: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ۝٣٠﴾ [البَقَرَة : ٣٠]

قال تعالى: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ واتە: بیریان بێنەوە کاتێك کە پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی ووت ، قال تعالى: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ واتە: بەراستی من جێ نشینێك دورست دەکەم لە سەر زەوی ، قال تعالى: ﴿قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن﴾ واتە: فریشتەکان ووتیان : ئایا کەسێکی وای تیا دروست دەکەیت ، قال تعالى: ﴿يُفْسِدُ فِيهَا﴾ واتە : کە خراپە و گەندەلی تێدا بکات ، قال تعالى: ﴿وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ واتە : وە خوێنی تیا بڕێژێ ، قال تعالى: ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ﴾ واتە: لە کاتێك کە ئێمە یادت دەکەین بە ستایش کردنت ، قال تعالى: ﴿وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ واتە : وە پاك رات دەگرین ، قال تعالى: ﴿قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ۝٣٠﴾ واتە : (خوای گەورە ) فەرمووی : بێ گومان ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن ..!!

بەلێ لەم چەند ئایەتەی داهاتوو دا کە دەکاتە ئایەتی ٣٠ تاکو ئایەتی ٣٩ لە سورەتی البقرە دا ، باسی باوکە ئادم دەکات کە چۆن (خوای گەورە ) جێ نشینی کردووە لە سەر زەوەی وە باسی فریشتەکان دەکات ، ئینجا باسی دروست بوونی باوکە ئادەم دەکات ، وە جێ نیشێنی لە زەویدا بۆ بەرێوە بردنی کاروباری ژیانی خۆی وە حوکم و دادپەروەی بە بەرنامەی (خوای گەورە ) ، هەروەها رێز لێنانی پەروەردگار بۆ باوکە ئادەم ، وەك : جێنشینی لە سەر زەویی و فێر بوونی زمانەکان ، باوکە ئادەم و دایکە حەوا لە بەهەشتدان یان هەلوێستی شەیتان بەرانبەریان ، ئاگادار کردنەوەی فریشتە کان بە دانانی یان جێ نشینی باوکە ئادەم لە سەر زەوی دا ، وە نەوە کانی باوکە ئادەم لە سەر زەوی دا ، ووتەی فریشتە کان ، یان رێزی باوکە ئادەم بە سەر فریشتە کاندا ، یان دەرخستنی رێزی باوکە ئادەم بە زانیارە کەی ، وەك : رێز گرتنی باوکە ئادەم ئەوەی کە فریشتە کان سووجدەیان بۆ برد تەنها شەیتان نەبێت ، بێ گومان ئەوەی رێز و پایەکی یەکجار گەورە یە کە ئەم فەزل گەورەیەی بە باوکە ئادەم بەخشی ، کە فریشتە کان سووجدەیان بۆ برد ، تەنها شەیتان نەبێت ..؟! کەواتە : فریشتە کان هەر هەموویان فەرمانەکانی پەروەردگاری خۆیان جێ بەجێ کرد تەنها شەیتان نەبێت بێ فەرمانی کرد ، ئەوە وەك باسمان کرد فەزلێکی یەکجار گەورە یە بۆ باوەکە ئادەم ، وە رێزێکی تری (باوەکە ئادەم و دایکە حەوا ) ئەوەی کە (خوای گەورە ) پییان دەفەرموویێت : خۆت و هاوسەرەکەت لە بەهەشت جێ نیشین بن ، بێ گومان ئەمەش رێز و فەلێکی گەورەیە ، هەروەها تاقی کردنەوەی باوکە ئادەم لە بەرانبەر پەروەردگای خۆی ، هەروەها دانانی باوکە ئادەم بە هەلەکەی وە پەشیمان بوونەوەی لەم هەلەی ئەنجامی دابوو دەستی کرد بە دوعاو نزاو پارانەوە لە (خوای گەورە ) ، بەلێ ئەم چەند ئایەتەی کە باسایان دەکەین دەربارەی باوکە ئادەم دایکە حەوایە ، لە ئایەتی ٣٠ تاکو ئایەتی ٣٩ سورەتی البقرە دا ..!!

بەڵێ لە دوایی ئەوی کە (خوای گەورە ) دەسەلات هێز و توانای خۆی بۆمان باس دەکات لە دەرست کردنی ئاسمانە کان و زەوەی دا کە دەفەرمووێت قال تعالى: ﴿لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ خَلۡقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ۝٥٧﴾ [غَافِر : ٥٧] واتە: ئەی خەلکینە دلنیابن دورستبوونی ئاسمانەکان و زەوەی زۆر گەورە ترو فراوانتر و گرنگترە لە دروستبوونی سەرجمە ئەو خەلکەی بە درێژایی زەمین و زەمان هێناومانننەتە سەر گۆرەپانی ژیان ، بەلام زۆر بەی ئەو خەلکە دەرکی بە ئەم راستیە ناکەن وهەست بە گەورەیی و فراوانی دەسەلتی ئیمە ناکەن ..؟! هەروەها دەفەرمووێت قال تعالى: ﴿إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ۝١٠٧﴾ [هُود : ١٠٧] واتە : بەراستی پەروەردگار تەواو کاریە بۆ هەر شتێك کەبیەوێت یان ویستی لێ بێت ..؟! بەلێ پاش دورست کردنی ئاسمان و زەوی ،بەلام پێ دورست کردنی ئاسمانەکان و زەوی رووی کردە فریشتە کان پێ فەرموون: جێگیرەوەیەك یان جێ نیشینێك جێگیر دەکەم لە سەر زەوەی ئاگارداری فریشتە کانی کردەوە بەم جێ نشینە کە لە سەر زەوی هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ۝٣٠﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠] بەلێ هەموو زانایانی تەفسیر دەلێن : لە پاش دەرست کردنی ئاسمانەکان و زەوی (خوای گەورە ) ئینجا باسی چۆنیەتی دروست بوونی ئادەمیزاد و هەروەها جێ نشینی لە سەر زەوی دەکات ، هەروەك (خوای گەورە ) بە فریشتەکانی فەرموو : من جێ نشینێك لەسەر زەوی جێگیر دەکەم یان دەکەمە بە خلیفە لەسەر زەوی دا ، جا بۆ ئەم مەبەست جێ نشینەکەش یان خلیفە کەش (ئادەم ) بێت یان ئادەم و نەوەکانی ئادەم ، ئینجا فریشتە کانیش وا یان بە بیر هات کە ئەو دەرستکراوە نوێیە ، دەبێت خاوەن هێزو توانا بێت وشتی خراپەی لێ بوەشێتەوە لەبەر ئەوە بۆ زانین پرسیاریان لە خودا کردو ووتیان : ئایا کەسێك دەکەیتە جێنشینی خۆت لە زەویدا کە خراپە دەکات و خوێن دەرێژیت ..؟! کەسێك کە وەکو ئێمە نیەو کە هەمیشە بەندایەتیت بۆ دەکەین و هەمیشە باسی پاکی و دووریت لە گشت جۆرە کەم و کورتییەك لە سەر زارمانە ..؟! ئینجا خودا پێی فەرموون ، ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن ..؟! ئینجا هەر رووی لە خراپە نابیچت و هەموویان خراپەکار نابن بەلکو کەسی چاك و خودا پەرستیان تیا هەلدەکەوێت، وە زەوی ئاوەدان دەکەنەوە و دەیرازینەوە ، ئینجا فریشتەکان ، لەو بریارو فەرمانە سەرسام بوون هەر چەندە هەموو فەرمانێکی خوایان بە خۆشی ومل کەچی وەرئەگرت بەلام هەروەك هەست بە گەورەیی وترسناکی کردەوەی ئەو مرۆڤە بکەن وە چەند کردەوەیەکی تریان لە پێش ئەو خراپە و خوێن رشتن دیبووبێ ، یان پێیان ووترابێ یان بۆیان دیار کرابێ هەندێ لە زانایانی تەفسیر ووتیانە : (خوای گەورە ) خستیە ناو دلیانەوە و کە جۆری ئادەمی بە سروشت بەدکارو خوێن رێژیان تێدایە ، بۆیە ئەو پرسیارە کرد و ، وە (ابن کثیر ) یش – رەحمەتی خوای لێ بێت – ئە لێ کە فریشتەکان دەلێن : قال تعالى: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا﴾ مەبەستیان رەخنە گرتن و سووکایەتی و حە سوودی بردن بە (ئادەم )نە بوو ، بەلکو پرسیارە لە حیکمەتی خودا بۆ دروست کردنی ئادەم و جێنشین کردنی لە زەویدا وەك بلێن : ئاخۆ (حیکمەت ) چی بێ لە دروست کردنی ئادەمدا لە کاتێکدا فسادی بەدکاری و گەندەلی دەکەن ..؟!

هەندێکی تر لە زانایانی تەفسیر دەڵێن : دلیان بەبەر نەوەستاوە خۆیان پیێ رانە گیراو پرسیاریان کرد گوتیان ئەی خودایە یەکێکی تێدا دروست دەکەی خویچنی تیچدا برێژی وخراپەی تیچدا بکات ..؟! ئیچمەش هەر خەریکی (تەسبیح وتە حمیدی ) تۆین وەستایش و پەرستنی تۆ بین ، ئینجا (خوای گەورە ) وەلامی دانەوە هەروەك لە پێشەوە فەرمووی : قال تعالى: ﴿قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ واتە : ئەوەی دەیزانم کەبەرژەن وەندی تێدایە ، من بەس ئامانج درەستی دەکەم وتوانای پیێ ئەدەم کە هەمووکارو پێویستیەك جیێ بەجیێ بکات ئێوە تواناتان نیە بە جیێ بێنن و تێبکەن و نایزانن کە هەر توانایە ك هەیە ، هەمووی خودا داویەتی ، واتە : ئەوەی ئێوە نایزانن من ئەیزانم زانایی خوا بەسەر هەمووشتێك دایە چونکە خۆی دروستکەرو دانەری مرۆڤە لە یەکەم رۆژی تا دوایی تەمەنی دەزانی چ دەکات و چی بەسەر دێت ،جا بیێ گومان فریشتە لە و پرسیارە مەبەستیان رەخنە گرتن نەبوو لە فەرمانی خودا هەروەها (حەسوودیشیان ) بە ئادەم هەلنە برد هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد بەلکو مەبە ستیان زانین بوو ، چونکە ئەوان بە گوێرەی سروشتە پاکەکەی خۆیان وایان مەندە ئەکرد کە ر هەر ستایشی خوا مەبەستە ئش و کاری ئەوانیش هەر ستایشی خوایە ، ئەوان خەو خواردنیان بۆ دانە ندراوە ، هەر فەرمانێکی خوا پێیان بدات بیێ بیر کردنەوە و لێکدانەوە بە جیێ ئەهێنن لە خوا یاخی نابن هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦﴾ [التَّحۡرِيم : ٦]واتە : بیێ فەرمانی (خوای گەورە ) ناکەن لەو کارانەی کە فەرمانیان پیێ دەدات ، وە هەرچی یەکیان پیێ بووتریێ ئەنجامی دەدن یان جیێ بەجیێ دەکەن ..!! بەلیێ لە ئایەتە دا (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ﴾ [البَقَرَة : ٣٠] .

✍ لە (ابن تیمیە ) – رەحمەتی خوای لیێ بێت – دەلێت : ئەمە بەلگەیە (خوای گەورە ) زانیویەتی ئادەم لە بەهەشت دەردەچێت ، ئەگەر دەرنەچووبا لە بەهەشت نە دەکرایە خلیفە یان جێگیرەوە لە زەویدا ..؟! فەرمانی بە ئادەم کرد کە لە بەهەشت نیشتەجیێ بێت و هێچ نەخوات لە دەرختەکە ، نەهی کرد لە گوێرایەلی کردنی ئیبلیس یان شەیتان ، وە بە خواردنی دەرختەکە ، بۆیە هەندێك لە پێشینە چاکە کانی ئەم ئۆمەتە دەلێن : دەرچوونی ئادەم لە بەهەشت تەقدیر کردپێش ئەوەی فەرمانی پیێ بکات بە چوونە بەهەشت بە ووتەی قال تعالى: ﴿إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ﴾ .[1]

---

[1] - مجموعة الفتاوى ابن تيمية (٤٩٢/٨).

بەڵێ بێ گومان جیاوازی هەیە لە نێوان زانایانی تەفسیر سەبارەت ووتەی ﴿خَلِيفَةً﴾ واتە : جێ نشینە یان ئەم جێگیرەوەیە :

یەکەم : لەوانەیە مەبەستی (خوای گەورە ) بەم ﴿خَلِيفَةً﴾ یان جێگیرەویە ، ئادەم و نەوەکانی ئادەم بێت ، کە دەبنە جێ نشینی (خوای گەورە ) لە گەیاند و بلاو بوونەوەی پەیامی خوا و شەریعەتەکەی و حوکم و دادەگەری کردن لە نێوان خەلکی دا ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةً فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ ٢٦﴾ [ص : ٢٦]واتە : ئەی داوود ئێمە تۆمان کردووە بە جێنشین لەزەویدا و موڵکمان پێ بەخشیوی تێیدا، جا تۆش بەدادپەروەری حوکم لەنێوان خەڵکیدا بکە، و شوێنی هەوا و ئارەزوو مەکەوە لە حوکمدا، چونکە ئەوە گومڕات دەکات لە ئاین و شەرعی خوا، بێگومان ئەوانەی لەڕێگەی خوا لادەدەن سزایەکی سەختی ئاگریان بۆ هەیە، بەهۆی ئەو بێئاگاییەیان لەڕۆژی پاداشت ولێپرسینەوە . ئەمەش وەصێتی تێدایە بۆ کاربەدەستان بەوەی کە حوکم بەو ڕەوایی و پەیامە بکەن کە خوای پەروەردگار دایبەزاندووە و لێی لانەدەن، چونکە لەڕێگەی خوا لادەدەن و گومڕا دەبن ..!!

دووەم : لەوانەیە ئەم ووتەیەش بێت کە دەلێن : هەندێکیان دەبن بە جێنشینی هەندێکی تر ، چونکە زەوی ئاوەدان بوو پێش ئادەم ، لەسەر ئەمە ووشەیە ﴿خَلِيفَةً﴾ بەمانای (فاعل ) کردار دێت ، بەلام سەر ووتەی یەکەم بە مانای (مفعول ) بەرکار دێت ، هەر دوو کیان ئەم ووتانە هەلدەگرێت ، هەر دووکیان روویانداوە ، بەلام ووتەی قال تعالی: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ بەم ووتەیە بەلگەیە لە سەر رووداني یان جێنشینی پێش ئادەم یان پێش خۆی روویانداوە چونکە پێش ئادەم جنۆکە دورستکرا بوون لە سەر زەوی خوێنیان دەرشت و فسادی و خراپە کاریان بلاو دەکردەوە ..!! هەر بۆیە فریشتە کان پرساریان لە (خوای گەورە ) کرد ،قال تعالی: ﴿قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ بێ گومان ئەم پرسیار کردنەی فریشتەکان ب ئەوە بووە هەتا بزانن حیکمەتی ئەم ﴿خَلِيفَةً﴾ یان جێگیرەوەیە جیە ..؟! نەك مەبەستیان رەخنە و نقد گرتن بێت لە (خوای گەورە ) یان حەسوودی بردن بێت بە ئادەم و نەکانی ئادەم ، چونکە فریشتەکان زانسیان هەیە دەزانن کە (خوای گەورە ) هیچ شتێك ناکات بی حیکمەت ، وە مەبەستیش لە جێ نیشین دا نان ئەوەی کە زەوی ئاوەدان بکرێتەوە بە چاکە کردن یان بە کاری چاکەکاری و باشە کردن دوور کەوتنەوە لە خراپەکاری و فسادای خوێن رشتن ..؟! ئەم ووتەیەش لە باتی تەزکیە نەفس نیە بەلکو تەنها مەبەستیان هەوالە یان خەبرە ، کە دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ .

لەسەر ئەم ووتەیەش کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت قال تعالى: ﴿قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ واتە : ئەوەی ئێوە نایزانن ، من دەیزانم ..!! (ابن قیم ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : (خوای گەورە ) وەلامی پرسیاریانی داوە بەوە زانستی هەیە بە ناخی هەموو شتەکان کە ئێوە نایزانن ..؟! (خوای گەورە ) (علیم ) و (حکیم ) لەم جێنشینە باشترینی دورستکراوەکانی هەلبژاردووە ..!! لە پێغەمبەران و پیاو چاکان و شەهیدەکان و راست گۆیەکان زانایانی ئەهلی علیم زانستی شەریعی ئەوانەی باشتر فە فریشتە کان ، ئیبلیسی لعنەتی لێ کراوی بەدیارکەوت کە خراپترینی جیهانیانە ، ئەمەی دەرکرد ، وە ئەمەشی دەرکرد ، فریشتەکان زانستیان بەمە و بەوی تر نەبوو ..!! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقٗا ٦٩﴾ [النِّسَاء : ٦٩] واتە : وە هەرکەسێك گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای بەرز و بڵند و پایەبەرز و ڕێبازی پەیامبەروکەی موحەممەد بکات ئا ئەوانەن کە پلە و پایەیان بەرزبووەتەوە، و دەبنە هاوەڵ و هاودەمی ئەوانەی کە خوای پەروەردگار لە بەهەشتدا نیعمەتی خۆی بەسەردا ڕشتوون لە نێردراوان و ئەو ڕاستگۆیانەی کە ڕاستگۆیی تەواویان هەبوو بەوەی کە پەیامبەران پێیهاتوون، بەباوەڕ وکردەوە وگوفتاریان، وە شەهیدانی ڕێبازی خوای پەروەردگار و باوەڕدارانی بۆ خوا صوڵحاو، وە ئەوانە چاکترین هاوەڵ و هاودەمن لە بەهەشتدا ..!!

وەکو لە پێشدا باسمان کرد چۆنیەتی دورست بوونی ئادەم هەروەها لە خۆبایی بوونی ئیبلیس و پاشایەتی سەر زەوی لێردا ئاماژە بە گێرانەوەکان دەکەین کە لە ( عبد الله کوری عباس ) بۆمان ئەم چیرۆکە دە گێرێتەوە ، کە لە (ابن جریر) و (ابن عساکر ) ئەم گێرانەوە (کوری عباس) یان باس کردووە ، ئێمەش ئاماژە بەم گێرانەوەیە دەکەی بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم ئایەتانەی سورەتی القبرە ، کە لە ئایەتی ٣٠ دەست پێ دەکات تاکو ئایەتی ٣٩ کە دەربارەی چیرۆکی دورست بوونی ئادەم و پاشایەتی ئیبلیس و ، وە لە خۆ بایی بوونی ئیبلیس کە خۆی بە گەورە دەزانی و حەسوودی برد بە ئادەم ، بەلام ئەو لە خۆ بایی بوونە و حەسوودیە بۆ هۆکاری ئەوەی کە لعنەتی یان نەفرینی خوای لێ بوو ، هەر ئەمەش بۆ هۆی دەست بەردار بوونی پاشایەتیەکەی دەرکردنی لە خەزینەداری بە هەشت وە دەر کردنی ئیبلیس لە بە هەشت دا ، ئەمەش سەرئەنجامی خۆ بەگەورە زانینە بۆ ئەو کەسانەی کە هاوشێوەی ئیبلیس دەکەن ، چونکە دەبێتە دوور حەوتنەوەی لە رەحمەتی خوا ، هەروەها سزایەکەشی نەفرین یان لعنەتی خوایە ، بۆیە بە پێویستم زانی دەربارەی ئەم چیرۆکە کە بەدرێژی باسی بکەم چونکە ئەمە سەرەتای دورست بوونی بشریە ت و ئادەمیزادە ، بۆیە دەبێت روون بکرێتەوە چونکە زۆر کەس لەم بەسەر هات و چیرۆکە لە هەلە دا چوون ، بێ گومان ئەمانە کە لە قورئان دا هاتوون هەر هەمووی تەنها پیتێکیش ئێمەی موسلمانی باوەرداری راستەقینە گومامان لێ نیە ، ئەگەر غیب شتە پەناهاکانیش بێت دەبێت سە تان سەد باوەری پێ بکەین ، بەلیچ ئەمەی خوارەوە گێرانەوە کەی (کوری عباس ) بۆمان دە گێرێتەوە ..!!

✍ لە ڕێ (السدی ) لە (أبی مالك وأبی صالح ) لە (عبدالله بن عباس) – خوا لێ ڕازی بێت – دەڵێت : کاتێك (خوای گەورە ) لە دورست کردن تەواو بوون پاشان لە دا لەسەر عەرش جێگەی گرت ، ئیبلیس لە فریشتەکانی ئاسمانی دونیا بوو ، ئەو لە هۆزی یان لە قبیلە فریشت کان بوو ، بە وان دە ووترا (جن ) یان جنۆکە ، ناویان بە (جن ) یان جنۆکە دەبرا ، چونکە خەزێنە داری بەهەشت بوون ، وە ئیبلیس یان شەیتان لە گەل فریشتە کان خەزێنە دار بوون ، چونکە ئیبلیس هەم پاشا بوو هەم خەزێنەداری بەهەشت بوو ، خۆی لە هەمووان بەگەورە تر دەزانی ، بۆیە دەی ووت : (خوای گەورە ) بۆیە ئەم پاشایەتیەو دەسە لاتەی بە من بە خشیوە ، چونکە لە پێشرو زیاترو گەورە ترم لە کەسانی دیکە ..؟! هەروەها لە خۆ بایی بووون خۆ بەگەورە زانینی ئیبلیس لە نەفسی خۆیدا جێگەی گرت ، چونکە ئیبلیس گومانی کرد کە لە فریشتەکانی تردا لە پێشترە ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) بە ناو دل دەروونی ئیبلیس زانی و بە فریشتە کانی فەرموو : قال تعالى: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠] واتە: من جێگیرەوەیەك یان جێ نشینێك جێگیر دەکە م لەسەر زەوی دا ..؟! فەریشە کان ووتیان : ئەی پەروەردگار ئەو جێ نیشینە یان جێگیرەوەیە کێ یە ..؟! فەرمووی : ئەم جێ نیشینە نەوەشی دەبێت ، خراپەکاری ئەنجام دەدان لەسەر زەوی و بەخیلی حەسوودی ، وە کوشتار یەکتری دەکەن ، فریشتە کان ووتیان : ئەی پەروەردگارا ، ئایا تۆ کەسانێك دادەنێ لەسەر زەوی خوێن بڕێژن و وە تاوان خراپەکاری بکەن ..؟! واتە : (پێشتر جنۆکە هەبوون لەسەر زەوی خوێن ڕشتنیان کردووە بۆیە فریشتەکان وایان ووت ، ئەمەپرسیاری حیکمەت نەك ڕەخنە گرتنە )، هەروەها ووتیان : ئەی پەروەگار لە کاتێك دا ئێمە تۆ بە گەورە وپاك ڕادەگرین ، لە هەموو کەم کوریەك لە هەموو شتێك کە شایەنی تۆ نەبێت ،لەوەی کە خەلکی دەیداتە پال تۆ لە شەریك بڕیاردانان ، (خوای گەورە ) فەرمووی : ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن ..؟! مانای دەربارەی ئیبلیس ، ئینجا جبریل (علیه السلام ) ڕەوانە کرد بۆ سەر زەوەی ، یان بۆ لای زەوی ، تاکو خال یان گڵ لەسەر زەوی بێنی ، زەوی ووتی : پەنا بۆ خوا دەبەم لەوەی لەم کەم بکەیتەوە ، جبریل (علیه السلام ) گەرایەوە هیچی هەلنەگرت ، ووتی : ئەی پەروەردگار زەوی پەنای بۆ تۆ برد ، منیش لێ خۆش بووم ، (خوای گەورە ) بەم جارە دووبارە میکائیل (علیه السلام ) ڕەوانە کرد ، زەوی قسە کەی دووبارە کردتەوە پەنای بۆ خوا برد ، میکائیلیش (علیه السلام ) گەرایەوە.

ئینجا (خوای گەورە ) فریشتەی مەرگی ڕەوانە کرد ، دیسان زەوی پەنای بۆ خوا برد ، بەلام فریشتەی مەرگ ووتی: منیش پەنا بە خوا دەبەم لەوەی بگەڕێمەوە و فەرمانەکەی ئەو بشکێنم یان فەرمانەکەی ئەوم ئەنجام نەدابێت ؟! گل یان خاکی لە سەر زەوی هەلگرت ، تێکەلی کرد ، لە یەك شوێن هەلی نەگرت و لە گل یان خاك یان خۆلی سوور و ڕەش و سپی هەلگرت و لەبەر ئەمە ڕەنگی نەوەکانی یان منالە کانی ئادەم جیاوازە ؟! خۆلە کەی یان خاکە کەی بردە ئاسمان ، وە تەریان کرد قوریان لێ دورست کرد و لیێی گەران تا گۆرا و بۆنی گرت ومانای ووتەی کەی (خوای گەورە ) کە دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ٢٦﴾ [الحِجۡر : ٢٦]واتە : ((حَمَإٍ) واتە: قوڕێکی ڕەش (مَسْنُون) واتە: گۆڕاو، یەکەمجار قوڕە دواتر کە بۆگەن ئەکات و ڕەنگ و بۆنی ئەگۆڕێت پێی ئەووترێ: (حَمَإٍ مَسْنُونٍ) وە کاتێك کە وشك ئەبێتەوەو لووس دەبێت ئەو کاتە پێی ئەووترێ: (صَلْصَالٍ) ...) ئینجا فریشتە کان ووتیان : کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ

سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ [ص : ٧٢]واتە : کاتێك کە پەروەردگار بە فریشتەکانی فەرمووی من مرۆڤێك دروست ئەکەم لە قورٍ کە ئادەم بوو..!! {فَإِذَا سَوَّيْتُهُ ] کاتێك کە ڕێکم خست و شێوەیم بۆ کرد [ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي ] وە لە روحی خۆم خستە بەری، ئەمە بۆ (ئیزافەی تەشریف و تەعزیم)ە بۆ ڕێزو بەگەورەزانینە نەك خوای گەورە ئەو روحەی خۆی بخاتە بەری ئەگەر نا ئەبوایە ئادەمیش هەمیشەیی بوایەو مردنی بەسەردا نەهاتایە [ فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ] کە ڕوحم کردە بەری ئێوە هەمووتان کڕنوشی ڕێزی بۆ بەرن نەك کڕنوشی عیبادەت..!! هەر بۆیە (خوای گەورە ) ئادەمی بەدەستی خۆی دورست کرد بۆ ئەوەی لە فێلی تەلکەی شەیتان یان ئیبلیس بیپارێزی کە خۆی بە گەورە دەزانی لەسەری ، بۆیە (خوای گەورە ) بەدەستی خۆی دروستی کردووە و پێوانەی کردووە ، هەر بۆیە ئیبلیس خۆی بەگەورە تر دەزانی لەسەری ، دەی ووت : شانازی بەو کارە دەکەم کە بە دەستی خۆت کردووتە ، لە بەرانبەر تۆ دا خۆم بە گەورە نازانم ، (ئیبلیس مەبەستی ئەوە بوو بەرانبەر شانازی بەو کارەی (خوای گەورە ) دەکات کە کار بەجێ یە حکیم و دانایە ، هەروەها خۆش بە گەورە نازانی بە رانبەر پەروەدگاری ، بەلام خۆی بە گەورە دەزانێت بەرانبەر دورست کراوەکانی (خوای گەورە ) مەبەستی ئادەم بوو ..؟! هەر بۆیە وەك مرۆڤێك دورستی کرد ، کە چل ساڵ لاشەی یان جستەی لە قور بوو یان لە گل بوو ، لەو چەند ماوەی رۆژی جمعە یان هەینی ، فریشتەکان بەلای ئادەم دا تێدە پەرین لە بینینی دەترسان ، وە ئیبلیس لە هەموویان زیاتر لە فریشتە کان لە ئادەم دەترسا ..؟! کاتێك بە لای ئادەم دا تێدەپەری لێدەدا ، لاشەکەی یان جستەکەی وەك گۆزە دەنگی دەدایەوە واتە صوتی لێوە دەهات وەکو گۆزە دەنگی دەدایەوە ..؟! دەبێتە هی ئەم قورە یان ئەم گلە واتە: (صلصلة) ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ ﴿١٤﴾ [الرَّحْمَٰن : ١٤]واتە : خوای گەورە مرۆڤی دروست کردووە واتە ئادەم لە قوڕی سوورەوەکراو کە قوڕێك بە ئاگر سوور ئەکرێتەوە وەکو چۆن ئەوانەی کە کوپەڵەو گۆزەو شتیان لێ دروست ئەکرێ..!! ئیبلیس دەی ووت : ئەمە یان واتە: ئادەم بۆ مەبەستێکی تایبەت دورست کردووە؟! ئینجا لە دەمیەوە درۆیشتە دەر و لە کۆتایی یان لە پاشەوەی دەهاتە دەرەوە ..؟! بە فریشتە کانی ووت : لە مە شتە مە ترسن ، چونکە پەروەردگارتان ناو پرە ..؟! وە ئەمە واتە : ئادەم ناو بە تالە یان ناو بۆشە ..؟! ئەگەر بە سەر ئەو دا زال بم و یان دەسەلاتم بەسەری دا بشکێت ئەوا دەی رووخێنم و لە ناوی دەبەم ..؟! کاتێك گەیشتە ئەو کاتە کە (خوای گەورە ) ویستی لێ بوو ، کە رووح بە ئادەم ببە خشێ ، (خوای گەورە) بە فریشتە کانی فەرموو : سووجدەی یان کرنۆشی بۆ ئادەم ببەن ..؟! کاتێك رووح گەیشتە لاشەی ، روو چوو ناو سەری ئادەم پژمی ..؟! فریشتە کان ووتیان : (الحمد لله ) ، ئادەمیش ووتی : (الحمد لله ) ، ئیجا (خوای گەورە ) فەرمووی : (رحمك ربك ) واتە : خوا رەحمەت پێ ببەخشێت ، کاتێك رووح گەیشتە چاوە کانی سەری میوەهاتەکانی بەهەشتی کرد ، کاتێك رووح گەیشتە سینەی ، ئارەزووی خواردنی کرد ، پێش ئەوەی رووح بە قاچە کانی بگات بە پەلە بەرەو میوەهاتەکانی بە هەشت غاریدا یان رای کرد ،هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿خُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ مِنْ عَجَلٍ﴾ [الأَنبِيَاء : ٣٧]واتە : مرۆڤ دروستکراوەو سروشتی وایە کە پەلەیەتی..؟!

ئینجا ئەو کاسانە خۆ بەگەورە زانن ، کە بێ باوەرن یان لە کافران و بێ باوەرە کانن ..!! هەروەها (خوای گەورە ) پێ فەرمووی : چ شتێك رێگر بوو لەوەی لە فەرمانی من یاخی بیت وسووجدە یان کرنۆش بۆ ئادەم نە بەیت .؟! کەچی بە دەستی خۆم دورستم کردوو ..؟! ئیبلیس ووتی : من باشتر خێر ترم لە ئەو ..!! من بۆ مرۆڤی دورستکراو لە قور یان لە گل سووجدە یان کرنۆش نابەم.! (خوای گەورە ) فەرمووی : دەر کەوە لە بەر چاوم یان لە بەر چاوم وونبە ، چونکە بەهەشت جێگای خۆ پەسەندی نیە ، هەر وەك دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ١٣﴾ [الأَعۡرَاف : ١٣] واتە : [ قَالَ فَاهْبِطْ مِنْهَا ] خوای گەورە فەرمووی: دەی لە ئاسمان یان بەهەشت یان ئەو پلەوپایەی پێتدرابوو دابەزە ئیتر تۆ نابێ لەناو مەلائیکەتاندا بیت [ فَمَا يَكُونُ لَكَ أَنْ تَتَكَبَّرَ فِيهَا ] وە بۆت نیە کە لە ئاسماندا یان لە بەهەشتدا خۆت بەگەورە بزانی و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە بکەی [ فَاخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ الصَّاغِرِينَ (١٣) ] دەرچۆ لە بەهەشت تۆ لەو کەسانەی کە ڕیسواو زەلیل و سەرشۆڕ ئەبیت..!! (الصغار) واتە : ریسواو زە لیل و سەر شۆری ..!! ئینجا فەرمووی : قال تعالی: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] واتە: خوای گەورە ئادەمی دروست کرد وە ناوی هەموو شتەکانی فێرکرد..!! پاشان خوای گەورە پرسیاری لە مەلائیکەت کرد دەربارەی ئەو ناوانە و فەرمووی: قال تعالی: ﴿أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣١﴾ [البَقَرَةِ : ٣١]واتە : ئەگەر ڕاست ئەکەن ناوی ئەم شتانەم پێ بڵێن..؟! ووتیان : نەوەکانی ئادەم یان منالە کانی ئادەم خراپە کاری و تاوانکاری لە سەر زەویدا بەرپادەکەن ، وە خوێن رێژی دەکەن ..!! ئیجا فریشتەکان ووتیان : قال تعالی: ﴿سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٣٢﴾ [البَقَرَةِ : ٣٢] واتە : وتیان: ئەی پەروەردگار پاك و مونەززەهی بۆ تۆ ئێمە هیچ زانست و زانیاریەکمان نیە تەنها ئەوە نەبێ کە خۆت فێرمانت کردووە ئێمە غەیب نازانین [ إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ] هەر تۆ زۆر زاناو کاربەجێی..!! (خوای گەورە ) فەرمووی : قال تعالی: ﴿قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٣٣﴾ [البَقَرَةِ : ٣٣]واتە : خوای پەروەردگار فەرمووی : ئەی ئادەم ناوی ئەو شتانەیان پێبڵێ کە بێ توانابوون لە زانینیاندا، و کە ئادەم ناوەکانی پێوتن، خوای پەروەردگار بە فریشتەکانی فەرموو : پێم ڕاگەیاندن کە من هەموو ئەو شتانە دەزانم کە لە ئێوە شارەوەیە لە ئاسمانەکان ولەزەویدا، و ئەوەش دەزانم کە ئێوە دەری دەخەن و ئەوەشی کە دەیشارنەوە ..؟! فریشتە کان ووتیان : قال تعالی: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠]واتە : فریشتەکان وتیان: ئەی پەروەردگار ئایا تۆ کەسانێکی تیا دائەنێی کە ئاشووب بگێڕن لەسەر زەوی وە خوێن بڕێژن وە تاوان بکەن..!! واتە : ئەم نهێنیە بوو کە ئیبلیس لە نێو نەفسی خۆی شاردبوویەوە ئەویش لە خۆبایی و خۆ بە گەورە زانینی بوو ..؟! ).[1]

[1] -اخرجە ابن جریر (٤٨٧/١-٤٨٨) وابن عساکر (٣٧٧/٧).

✍ لە ریّ (السدی ) لە (ابی غزوان الغفاری ) – رەحمەتی خوای لیّ بیّت – دەلیّت : ئەوەی لە قورئاندا یە ئامرازی: ﴿إِذۡ﴾ واتە : (فقد كان) واتە : وابوو ..).[١]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لیّ بیّت – دەلیّت : ئامرازی ﴿إِذۡ﴾ واتە : ( وقد ) واتە: رنگە یان ئەگەر یان بۆیە ..).[٢]

✍ لە ریّ (سعيد ) لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لیّ بیّت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ﴾ واتە : پەروەردگار راوێژی بە فریشتە كان كرد بۆ دورست كردنی ئادەم ..).[٣] (مەبەست لەم راوێژ كردنە بۆ پرسیار كردن و تاقی كردنەوەی (خوای گەورە ) لە فریشتەكان بووە ، چونكە وەك پرسیار راوێژی پیّ كردن یان سروشتی ئاگادار كردنەوەیە بۆ فریشتە كان ، نەك وەك هاوبەش و شریك لە دورست كردنی (حاشا والعياذ بالله ) چونكە (خوای گەورە ) لە دورست كردن دا هیچ هاوبەش شریكی نیە ..؟!

✍ لە (الحسن البصری ) – رەحمەتی خوا لیّ بیّت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿إِنِّي جَاعِلٞ﴾ دەلیّت : واتە : (فاعل ) واتە: ئەو كەسەیە كە بە كارە كە هەلساوە ، واتە : بكەر ..).[٤]

✍ لە ریّ (ابی بكر الهذلي ) لە (قتادة ) –رەحمەتی خوای لیّ بیّت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ﴾ دەلیّت : (خوای گەورە ) بە فریشتە كان دەفەرمووی : (إني فاعل) واتە : من بكەرە كەی مە ، واتە : بكەری دورست كردنی ئادەمم ..).[٥]

✍ لە ریّ (بشر بن عمارە ) لە (ابی روق عطبة بن الحارث الهمداني )- رەحمەتی خوای لیّ بیّت – دەلیّت : هەموو شتێك لە قورئاندا بە مانای (جعل ) هاتبیّت واتە : (خلق ) واتە : دورست دەبیّت ..).[٦]

---

[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧٥/١).
[٢] - تفسير مقاتل بن سليمان (٩٦/١).
[٣] -اخرجه ابن جرير (٤٩١/١).
[٤] -اخرجه ابن جرير (٤٧٥/١).
[٥] - اخرجه ابن جرير (٤٧٥/١).
[٦] اخرجه ابن جرير (٤٧٥/١).

📖 لە (عبدالرحمن بن سابط ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((دُحيتِ الأرضُ من مكةَ وأولُ من طافَ بالبيتِ الملائكةُ فقال اللهُ إني جاعلٌ فِى الأرضِ خليفةٌ)) .[1]

واتە : خاك لە زەوی دا پێشوازی لێ کرا یەکەم کە تەواف کرا لە زەوی فریشتە کان بوون لە مککە ،هەرە وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووی : خلیفە یەك یان جێ نشینێك جێگیر دەکەم لەسەر زەوی ..!!

✍ لە رێ (سالم بن ابی حفصە ) لە (پیاوێك ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : (خوای گەورە ) ئادەمی لە بەهەشت وەدەرنا یان دەرکرد ، پێش ئەوەی دورستی کا ، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە : قال تعالی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةً﴾ ..).[2]

✍ لە (خالد الحذاء ) – رە حمە تی خوای لی بیت – دەڵێت : پرسیارم کرد لە (الحسن ) ، ووتم : ئەی باوکی سعید : ئادەم لە ئاسمان دورست کرا یان لە زەوی ..؟! ووتی: ئایا قورئان ناخوێنیتەوە کە دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةً﴾ ووتی : نەخێر بەلکو ئادەم لە زەوی دورست کرا ..).[3]

✍ لە رێ ( ابي روق ) لە (ضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : یەکە م کەس کە لە سەر زەوی نیشتە جێ بوو (جن ) خراپە کاری و تاوانیان ئەنجامدا ، خوێن رشتنیان ئەنجامدا ، کوشتاری یەکتریان کرد ، (خوای گەورە ) ئیبلیس بۆ رەوانە کردن لە گەل سوپایەك لە فریشتەکان ، بۆیە ئیبلیس کوشتاریانی کرد ئەوانەی لە گەلی دا بوون ، هەتاکو جنۆکە کانی بۆ دوورگە کانی دەریا دەوروبەری کێوە کان دورخستەوە ، ئینجا ئادەم دروست کرا و نیشتە جێ بوو ، ئەمەش ئەوەیە کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةً﴾ ..).[4]

---
[1] - تفسير القران العظيم ابن كثير (١/١٠٠).
[2] - اخرجه سفيان الثوري ص ٤٣ ، وابن ابي حاتم (١/٧٦)، وابن عساكر (٧/٤٥٢).
[3] - اخرجه ابن ابي حاتم (١/٧٦).
[4] - اخرجه ابن جرير (١/٤٧٧).

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ﴾ دەڵێت : ئەوەیە کە (خوای گەورە ) دوورست کردنی فریشتەکان و جنۆکەی پێش شەیتانەکان و ئادەمیزاد یان مرۆڤ بوو ، ئە ویش ئادەم (عليه السلام ) دروست بوو لە گەڵ شەیتانەکان ، وە دوورست کرا لە زەوی نیشتە جێ بوو ، وە فریشتە کانیش لە دوورست کران لە ئاسمانیش نیشتەجێن ، ئینجا جنۆکەکان خراپە کاری و فتنە و ئاشووب ئیرەیی یان حسوودیان برد کوشتار یان شەر یان ئەنجامدا ، پاشان (خوای گەور ) سەربازانی خۆی رەوانە کرد لە ئاسمانی دونیا دا ، پێیانی فەرموو : جنۆکە و ئیبلیس دوژمنی خوا و ئێوەن ، هەموویان لە ئاگر دروست بوون ، وە ئەوان خەزینەداری بەهەشت بوون ، سەرووی هەموویان ئیبلیس ، ئینجا رەوانەی سەر زەوی کردن ، تکلیف نەکرا بوون بۆ پەرستن یان مەرجی پەرستن لە سەر زەوی پێ نەسپێنرا بوو ، هەروەها لە ئاسمانیش تکلیفی نەکرا بوون بۆ پەرستن یان عیبادەت کردن ، بۆیە زۆریان حەدزدە کرد لەسەر زەوی بمێنەوە ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) وەحی بۆیان رەوانەکرد ،قال تعالى: ﴿إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ﴾ . جگە لە ئێوە ، بەرز دەکرێتەوە ، هەر بۆیە رقیان لە مە بوو ، چونکە ئەوان ئاسانرین کاریان لە نێوان فریشتەکان دا بوو ..).[1]

📖 لە (أنس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : یەکەم تەلبییە کردن فریشتە کان کردنیا ، (خوای گەورە ) فەرمووی : قال تعالى: ﴿إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ ، دەڵێت : ئینجا وەلامیان دایەوە دەربارەی ئەوە نارەزایان دەربری ئێمە شەست ساڵ بە دەوری عەرش دەسوراینەوە یان تەوافمان کرد ، پاشان ووتیان : (لبيك لبيك أعتذارا إليك ، لبيك لبيك نستغفرك ونتوب إليك ) واتە: تلبییە یان کرد و دوای لێ بووردن دوای لێ خۆش بوون و تۆبەیان لە (خوای گەورە ) کرد ..!! .[2]

[1] تفسير مقاتل بن سليمان (٩٦/١).
[2] - اخرجه الأصبهاني في الترغيب والترهيب (٤٤٠/١ ).

📖 لە (عبدالله بن عمر ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : گویم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی : ((إنَّ آدَمَ لمَّا أهبَطه اللهُ إلى الأرضِ قالت الملائِكةُ: أى ربِّ: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ قال : ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ ، قالوا: ربَّنا، نحن أطوَعُ لك مِن بنى آدَمَ، قال اللهُ للملائِكةِ: هلمُّوا مَلَكَينِ...، فذكَر قصَّةَ هاروتَ وماروتَ)).[١] واتە : ئادەم (علیە السلام ) (خوای گەورە ) رەوانەی خوارەوەی کرد بۆ سەر زەوی ، فریشتە کان ووتیان : {أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ} ، (خوای گەورە ) فەرمووی ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ واتە : ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن ..!!هەروەها فریشتە کان ووتیان : ئەی پەروەردگارا ..؟! ئێمە خۆمان بەخش دەکەین بۆ تۆ بۆ نەوەی ئادەم ، (خوای گەورە ) بە فریشتە کانی فەرموو : دوو فریشتە وەرن لە فریشتە کان بچنە خوارەوە بۆ سەر زەوەی ، کەواتە تەماشاکەن یان سەیر کەن چوەن کردار دەکەن ..؟! ووتیان : پەروەردگار (هاروت و ماروت ..؟! ) .[٢]

✍ لەرێ (السدی ) لە (ابی مالك وأبی صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : کاتێك (خوای گەورە ) لە دورست کردن تەواو بوو ویستی کرد ، لە سەر عەرش جێگەی گرت ، ئیبلیسی کردە پێشەوا یان پاشایی ئاسمانە کان ، ئەو لە کۆمەلی یان لە قبیلە ئەو فریشتانە بوو کە (جنۆکە ) بوون ، یان بە (جن ) ناویان دەبرد ، چونکە خەزێنە دارانی بەهەشت بوون ، وە ئیبلیس هەم پاشاو پێشەوا بوو هەم خەزێنە داری بەهەشت بوو ، ئیبلیس خۆی بەزل زانی و لە خۆبایی بوو ، بە خۆی ووت (خوای گەورە ) بۆیە ئەم پاشایەتیە ی یان ئەم پێشەوایەتیەی بە من بەخشی چونکە لە پێشتر و گەورەتر و زیاترم لە کەسانی دیکەم یان لە سەر فریشتە کانی دیکە دا ..؟! ئینجا ئیبلیس کە گومانی کرد کە لە فریشتەکانی تر لە پێشترە ، لە پاشاندا (خوای گەورە ) ئەم خۆبەگەورە زانییەی یان ئەم لە خۆباویەی ئیبلیس بینی ، بە فریشتە کانی فەرموو: قال تعالى: ﴿إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ﴾ ئینجا فریشتە کان پرسیاریان کرد بە پرسیارێکی حکیمانە ووتیان : ئەی پەروەردگار ئەم خلیفەیە یان جێ گرەوەیە کێ یە ..؟! ئایا لەم نەوەیە کە تاوان و خراپە کاری لە سەر زەوی ئەنجامدەدن ، وە ئیرەیی و حەسوودی بەیەکتر دەبن ،وە وە هەندێکیان هەندێکیان دە کوژن یان کوشتاری یەکتری دەکەن ، فریشتە کان ووتیان : پەر وەردگار ؟! قال تعالى: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ ..).[٣]

---

[١] - الدار قطني برقم (٢٧٩٢).
[٢] -اخرجه ابن حبان (١٤/٦٣- ٦٤).
[٣] -اخرجه ابن جرير (٤٨٧/١) ، و ابن عساكر (٣٧٧/٧).

✍ لە ریّ (أبی روق ) لە (ضحاك ) لە (عبد الله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – دەلێت : ئیبلیس دورست کراوێك بوو ، وەك دورست کراوە فریشتە کان ، پێیان دلێن : (جن ) یان جنۆکە ، لە ئاگری بلیسە دار دورست کرا بوون ، ئیبلیس ناوی (حارس) بوو ، یەکێك بوو لە خەزێنە دارەکانی بەهەشت . هەموو فریشتە کان جگە لە هۆزی یان قبیلە ی ئیبلیس لە نوور دورست کرا بوون ، وە ئەو جنۆکانەی لە قورئان لە بلێسەی ئاگر دروست کرانە ، وە مرۆڤ لە خۆل یان گل دورست کراوە ، یەکەم دانیشتووی سەر زەوی جنۆکە بوون ، تاوان و خراپە کاریان کردە پیشەی خۆیان ، وە خوێنیان رشت و یەکتریان کوشت ، (خوای گەورە ) ئیبلیس و لە گەل سەربازەکان لە فریشتە کان سوپایەك بوون رەوانەی کردن کوشتاریان لە گەل دا کردن و جنۆکەکانی بۆ دوورگەی دەریا و دەروبەری کێو چیاکان دوورخستەوە ، ئیبلیس کاتێك ئەم کارەی ئەنجامدا لە نەفسی خۆی لە خۆبایی بوو ، ووتی : کارێکم کرد پیش من هیچ کەس ئەم کارەی ئەنجام نەداوە یان هیچ کەسێك ئەم کارەی نەکردیە ..؟! (خوای گەورە ) هەستی بە نهێنیەکەی دلی ئیبلیسی کرد ، بەلام فریشتەکانی لە گەل ئیبلیس بوون ئاگادار نەبوون ،لە پاشان (خوای گەورە ) فەرمووی : قال تعالی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةً﴾ ئینجا فەریشتە کان بەم ووتەیەی (خوای گەورە ) سەر سام بوون ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ هەروەکو جنۆکەکان تاوان خراپەکاری و خوێن رشتنیان کرد کوشتاری یەکتریان کرد ، ئەوەش ئەوە بوو کە (خوای گەورە ) ئیبلیس و سوپایەك لە فریشتە کانی بۆ رەوانە کردن ..؟! ).[١]

✍ لە ریّ (مجاهد ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : لە وکاتەی کە (خوای گەورە ) ئادەمی لە بەهەشت وەدەرنا پێش چوونە ناوەوە بوو ،(خوای گەورە ) فەرمووی : قال تعالی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ وە ئەوەش لە کاتێك دا پێش دورست کردنی ئادەم ، جنۆکەکان لەسەر زەوی بوون بۆ ماوەی هەزار سالّ ،نەوەکانی جنۆکەکان لەسەر زەوی تاوان خراپەکاری ئەنجا دەدا و خوێنیان دەرشت کوشتاری یەکتریان دەکرد ، ئینجا (خوای گەورە ) سوپایەك لە فریشتەکانی بۆ رەوانە کردن شەریان لە گەل کردن و کوشتاریان کردن ، هەتاکو دووریان خستنەوە بۆ دوورگەی دەریا ، ئینجا (خوای گەورە ) فەرمووی : قال تعالی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ بەلیّ جنۆکەکان ئەم کارانەیان ئەنجام دەدا ، هەرەوەك (خوای گەورە ) فەرمووی : قال تعالی: ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ ..).[٢]

[١] -اخرجه ابن جرير (٤٨٢/١).
[٢] -اخرجه الحاكم (٢٦١/٢).

✍ لەڕێ (السدی ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت – لەسەر ووتەیقال تعالى: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ دەڵێت : (خوای گەورە ) بە فریشتە کانی فەرموو : من مرۆڤ دورست دەکەم ، ئیرەیی و حسوودی بە یەکتر دەبن ، وە کوشتاری یەکتر دەکەن ، تاوان و خراپە کاری ئەنجامدەدا لەسەر زەوی دا ،هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا﴾ ..).[١]

✍ لەڕێ (سعید ) لە (قتادە ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – سەر ووتەی قال تعالى: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ لە کاتێك دا فریشتە کان زۆر جاك دەیانزانی کە هیچ شتێك نیە زیاتر (خوای گەورە ) ڕەقی لێ بێت یان زۆر بێ ناخۆش بێت ، لەخوێن ڕشتن و کوشتار کردنی یەکتر بەناحەقی ، وە بلاو بوونەوەی خراپەکاری لە سەر زەوی دا ، فەریشتەکان ووتیان : قال تعالى: ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ بەلێ لە کاتێك (خوای گەورە ) دەزانی ئەو جێ نشینەی کە جێگیر دەکات لە داهاتوودا ، لە پێغەمبەران و ، لە پەیام بەران و ، ە گەلی چاکە کارن ، ئەوانەش نیشتە جێ بەهەشتن ..).[٢]

✍ لە (قتادە ) دە گێریتەوە لە (عبدالله بن عباس )- خوا لێ ڕازی بێت – دەڵێت : لە کاتێك دا کە (خوای گەورە ) دەستی کرد بە دورست کردنی ئادەم ، فریشتەکان ووتیان : ئەی خوای بە دێهینەر دورست کراوێکت دەرست کردووە لە ئێمە بەشەرف و یان بەرێز ترە ، ئێمە دەربارەی هیچ نازانین ، ئەمە دورست کردنە بۆ تاقی کردنەوەی ئادەمە ، وە هەموو دەرست کراوێك بە تاقی کردنەوە دا دەڕوات ، هەروەکو تاقی کردنەوەی ئاسمانەکان و زەوی بۆ پەرستن ، (خوای گەورە ) فەرمووی : قال تعالى: ﴿ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾﴾ [فُصِّلَت : ١١] ..).[٣]

✍ لە ڕێ (الربیع بن أنس ) لە ( أبی العالیە ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : (خوای گەورە ) فریشتە کانی لە ڕۆژی چوارشەمە دورست کرد ، جنۆکە یان (جن ) لە ڕۆژی پێنچ شەمە دورست کرد ، وە مرۆڤی یان ئادەمیزادی لە ڕۆژی جمعە یان هەینی دورست کرد ، قومێك یان نەوەیەك لە جنۆکەکان کافر بون ، (خوای گەورە ) سوپایەك لە فریشتەکانی خۆی ڕەوانەی سەر زەوی کرد شەڕیان و یان کوشتاریان کردن ، ئا بەم شێوەیە لە سەر زەوی خوێن ڕشتن و خراپە کاری و فسادیان بلاو کردەوە ..).[٤]

---

[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧٧/١).
[٢]- تفسير الماثور (٢٢٠/١).
[٣] -ابن عساكر في تاريخ دمشق (٣٩٩/٧).
[٤] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧٧/١).

✍ لە ڕێ (ابنە عبدالوهاب ) لە (مجاهد ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : ئیبلیس پاشا و دەسەلاتداری ئاسمان و زەوی بوو ، وە بە بەرز ترین پێگە لە لایەن (خوای گەورە ) نووسرا ، کە خەلیفە یەك یان جێ نشینێك دروست دەکات ، وە ڕووداوە کان خوێنای دەبێت ، وە ئیبلیس ئەمەی دۆزیەوە ، ئەویش خوێندیەوە یان بینیوە بێ فریشتە کان ، کاتێك فەرمان بە فریشتە کان کرا بۆ سوجدە برند یان کرنۆش بردن بۆ ئادەم ، ئیبلیس یان شەیتان هەوالی بە فریشتە کان دا ،ئایا ئەم جێ نیشینە دەبێت فریشتە کان سوجدەی یان کرنۆشی بۆ ببەن ..؟! بەلان ئیبلیس لە نەفسی خۆی بریاری دابوو بەنهێنی کە سوجدە یان کرنۆش بۆ ئادەم نەبات ..!!بەلام فرشتە کان هەوالیان بە ئیبلیس دا ، کەوا (خوای گەورە ) بەدیهێنەرێکی خۆی دورست دەکات ، وە ئەوان خوێن رشتن ئەنجام دەدن ،ئینجا فریشتە کان فەرمانەکەی (خوای گەورە ) یان جێ بەجێکرد و سوجدە یان کرنۆشیان بۆ جێ نشینەکە برد ، ئەو کاتە یە کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةً﴾ ئەو قسانەیان یان ئەو شتانەیان لە بیر چوو کە پێشتر ئیبلیس بە فریشتەکانی ووتبوو ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠]..).[١]

✍ لەڕێ (معمر ) لە (قتادە ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا﴾

دەڵێت : (خوای گەورە ) زۆر چاك دەیزانی لەسەر زەوی دوست کراوێك دورست دەکات ، کە خراپە کاری تاوانە دەکەن ، وە خوێن رشتن بەر پادەکەن ، هەروەك دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا﴾ واتە : مەبەست لێ خەلکەکە ..).[٢]

✍ لە ڕێ (ابی بکر ) لە (قتادە ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : کە کاتێك (خوای گەورە ) بە فریشتە کانی فەرموو : قال تعالی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةً﴾ ، فریشتەکانیش بۆچوونی خۆیان ووت ، شتێکیان زانی و شتێکیشیان نەزانی ؟! ووتیان : قال تعالی: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ ، چونکە فریشتە کان زۆر چاك دەیانزانی لە لای (خوی گەورە ) هیچ تاوانێك یان خراپە کاریەك گەورەتر نیە لە خۆێن رشتنی ، هەروەك فریشتە کان ووتیان : قال تعالی: ﴿نَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ ..).[٣]

---

[١] -اخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٣٩٨/٧).
[٢] -اخرجه عبدالرزاق (٤٢/١) ، وابن ابي حاتم (٧٨/١).
[٣] -اخرجه ابن جرير (٤٩٢/١).

✍ لە (إسماعیل السدی ) – رەحمەتی خوا لیّ بێت – دەلێت : کاتێك کە فریشتەکان ووتیان : ئەو خلیفە یە یان جیّ نشینە کیّ یە ..؟! ووتیان : ئەو نەوەیە ، کە لە سەر زەوی تاوان خراپەکاری ئەنجام دەدن ، وە یان ئیرەیی و حسوودی دەکە ن ، وەیان کوشتاری یەکتری دەکەن ، ئینجا ووتیان ئەوەیە : قال تعالی: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ ..).[١]

✍ لە ریّ (ابنە عبد الله ) لە (یحیی بن أبی کثیر ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – دەلێت : کاتێك فریشتە کان ووتیان : قال تعالی: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ لە و کاتە دە هەزار جنۆکە بوون ، کە ئاگرێك لە لای (خوای گەورە ) بۆ یان هات هەموویانی سوتاند ..).[٢]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – لەسەر ووتەی : قال تعالی: ﴿قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا﴾ دەلێت : دورست کران لەسەر زەوی دا ، قال تعالی: ﴿مَن يُفۡسِدُ فِيهَا﴾ خراپە کاری و گوناهو تاوانیان کردە پیشە ، قال تعالی: ﴿وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ خوێن رشتنیان ئەنجام دەدا بە بیّ حەق ، ئەم کارەش هەمیشە کاری جنۆکە کارفرە کانە یان شەیتانەکانە ..).[٣]

✍ لەریّ (ابن وهب ) لە (عبد الرحمن بن زید بن أسلم ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – دەلێت : کە کاتێك (خوای گەورە ) ئاگری بە دی هێنا یان ئاگری دورست کرد ، فریشتە کان تووشی شۆك بوون یان راجەلکان بەراجەلکانیەکی یەکجار زۆر؟؟!! ووتیان : ئەی پەروەردگا بۆچی ئەم ئاگرت بەدی هێناوە ، هیچ شتێك وەکو ئەم بەدی نەهێناوە ..؟! (خوای گەورە ) فەرمووی : بۆ ئەو دروستکرا وانیە کە گوناهو تاوانی خراپەکاری ئەنجام دەدن ..!! ئا لەم کاتە هیچ دورستکراوێکی بە دی نەهێنا بوو جگە لە فریشتەکان ، زەویش دورست نەببو یان بەدی نەهاتبوو ؟! بەلام ئادەم دوای بەدی هێنانی یان دروست کردنی زەوی دورست ببوو ، ئەو ئەم فەرموودەی (خوای گەورە)ی خوێندەوە کە فەرمووێت قال تعالی: ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ١﴾ [الإنسَان : ١]واتە : بێگومان ماوەیەکی درێژ لە رۆژگار بەسەر ئادەمیزاددا تێپەڕیوە پێش ئەوەی روحی بە بەردا بکرێت، و هیچ شتێك نەبووە باسی لێوە بکرێت، و هیچ ئاسەوارێکیشی نەبووە پێی بناسرێتەوە..!! دەلێت : (عمری کوری خطاب ) دەلێت ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزەگە مرۆڤایەتیم بەشتێکی نادیار بمایەتەوە ، ئینجا پێغەمبەری خوا فەرمووی : لە سزادانی یان عەزابی (خوای گەورە ) بترسە ..؟! فریشتەکان ووتیان : ئەی پەروەردگار ، یان نەمری بەسەر مان دا دێت ئێمە تێدا خراپەکاری یان سەرپێچی دەکەین ..؟! وە هیچ دروستکراوێك یان هیچ بەدیهێنکی تر تێدا نا بینین ..؟! (خوای گەورە ) فەرمووی : نە خێر . من دەمەوێت لەسەر زەوی دروست کراوێك بەدی بەهێنم ، درست کردنی جیّ نیشێك یان خلیفە ، خۆێن رشتن دەکەن ، وە خراپەکاری و تاوان ئەنجام دەدن ، ئینجا فریشتەکان ووتیان : لە کاتێکدا ئێمە تۆ بە گەورەو پاك رادەگرین ، لە هەموو کەم و

[١] -تفسیر الثعلبي (١٧٥/١).
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧٨/١).
[٣] -تفسیر مقاتل بن سليمان (٩٦/١-٩٧).

کوریەك لە هەموو شتێك کە شایەنی تۆ نەبێ ..؟! لەوەی کە کەسانێك دەی داتە پال تۆ لە شریك هاوبەشی دانان و کوفر و بێ باوەری ، وە ئێمە تۆ پیرۆز دەکەین ، وە خواپەرستی تۆ دەکەین بە گورایەلی فەرمانە کانت ، وە فریشتەکان ترسیان لەوە هەموو کە ئەوانەی خراپەکاری و سەرپێچی (خوای گەورە ) دەکەن ، ئەمان لەو کەسانە بن لەسەر زەوی دابرنێن ..؟! فریشتەکان ئەو زانستەیان بینی کە (خوای گەورە پیێ بەخشیبوون ، وە دان یان نا بەوەی کە فضل ی یان گەورە ی ئادەم بەسەریانەوەیە ، بەلام ئیبلیس نەفرتی و پیس دانی نەنا بە ئادەم ، هەروە ك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ۝١٢ قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا﴾ [الأَعۡرَاف : ١٢ - ١٣]واتە : هی خوایە من لەو باشترم منت لە ئاگر دروست کردووە ئەوت لە قوڕ دروست کردووە ئاگریش لە قوڕ باشترە بەگومانی خۆی، (ئیبلیس یەکەم کەس بوو کە قیاسی بەکارهێنا)..!! خوای گەورە فەرمووی: دەی لە ئاسمان یان بەهەشت یان ئەو پلەوپایەی پێتدرابوو دابەزە ئیتر تۆ نابێ لەناو مەلائیکەتاندا بیت [ فَمَا يَكُونُ لَكَ أَنْ تَتَكَبَّرَ فِيهَا ] وە بۆت نیە کە لە ئاسماندا یان لە بەهەشتدا خۆت بەگەورە بزانی و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە بکەی..؟!..).[1]

✍ لە ڕێ (السدی ) لە (أبی مالك وأبی صالح ) لە (عبدالله نب عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لەسەر ووتەی : قال تعالى: ﴿وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ [البَقَرَة : ٣٠] دەلێت : واتە : فریشتەکان دەلێن : ئێمە تەنها تۆ دەپەرستین و نوێژ بۆ تۆ دەکەین ..).[2]

✍ لە ڕێ (أبی روق) لە (ضحاك ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ دەلێت : (التقديس ) واتە: پاك و بێگەردی یان پیرۆزی ..).[3]

✍ لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : هەموو ووشە یەکی (التسبيح) لە قورئاندا مەبەست لێ نوێژ و دوعا نزاکردنە ..).[4]

✍ لە ڕێ (ابن أبی نجیح ) لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – لە سە ووتەی قال تعالى: ﴿وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ دەلێت : واتە: ئێمە تۆ شکۆمەند دەکەین ، بەگەورە و مەزن و پایە دارت دەکەین ..).[5]

---

[1] - اخرجه ابن جرير (٤٩٥/١).
[2] - اخرجه ابن جرير (٥٠٤/١).
[3] - اخرجه ابن جرير (٥٠٦/١).
[4] -تفسير البغوي (٧٩/١).
[5] -تفسير مجاهد ص ١٩٩ .

✍ لە (الحسن البصری ) – رحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : (سبحان الله وبحمده ) واتە: نوێژ هەمووو ( الخلق ) وتسبیح یان زیکر و نزا پارانەوە یان تسبیحات بۆ رزق رۆزی ..).[1]

✍ لە رێ (معمر ) لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ دەلێت : (التسبیح ) واتە : نزاو پارانەوە زیکر کردن و پیاهەلدان بە ( خوای بەرز بەلند ) یان پیرۆز کردنی دوعا و نزاو پارانەوە نوێژ کردن ..).[2]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ دەلێت : زیکر و یادی فەرمانە کانی تۆ دەکەینەوە ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ﴾ [الرَّعْد : ١٣] واتە: وە هەورە بروسکەش تەسبیحاتی خوای گەورە ئەکات وە خوای گەورە بە پاك و مە زن ڕائەگرێت و حەمدو سەناو ستایشی خوای گەورە ئەکات..!! واتە : یادی فەرمانە کانی (خوای گەروە ) دەکاتەوە ، قال تعالی: ﴿وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ واتە : نوێژ بۆ تۆ دەکەین ، وە فەرمانە کانت بە گەورە بەرز دەنرخێنین یان شکۆمەندیان دەکەین ..).[3]

✍ لەرێ (سلمة بن الفضل ) لە (محمد بن إسحاق ) – رە حمە تی خوای لی بیت – لە سە ر ووتە ی قال تعالی: ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ دەلێت : واتە : فریشتە کان بەهیچ شێوەیەك سەرپێچی ناکەن ، هیچ شتێك ناکەن کە (خوای گەورە ) پێ ناخۆش بێت یان رقی لێ بێت ..).[4]

✍ لە (سفیان الثوري ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ دەلێت : ئێمە شکۆمەندو بەرزی رادەگرین ، بەگەورە و بەلندو مەزنت دادەنێن ..).[5]

---

[1] - تفسير الثعلبي (١٧٦/١) ، وتفسير البغوي (٧٩/١).
[2] -اخرجه عبدالرزاق (٤٢/١).
[3] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٦/١-٩٧).
[4] -اخرجه ابن جرير (٤٩٦/١- ٥٠٦).
[5] -تفسير سفيان الثوري ص٤٤ .

له (عبدالله بن الصامت ) له (أبي ذر الغفاري ) – خوا لی یان رازی بیت - ده گێڕیتەوه دەڵێت : ((أَنَّ رسولَ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ عادَهُ، - أو أنَّ أبا ذرٍّ عادَ رَسولَ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ - فقالَ: بأبى أنتَ وأمِّى يا رسولَ اللَّهِ، أىُّ الكَلامِ أحبُّ إلى اللَّهِ قالَ ما اصطَفاهُ اللَّهُ لملائِكتِهِ: سُبحانَ ربِّى وبحمدِهِ، سُبحانَ ربِّى وبحمدِهِ)).[١] واته : (ابو ذر ) نه خۆش بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەر دانی کرد ، یان پێغەمبەری خوا ﷺ نه خۆش بوو (ابو ذر ) سەردانی کرد ، (ابو ذر ) ووتی : باوك و دایکم به قوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا چ ووشه یەك له لای (خوای گەورە ) زۆر خۆشه ویسته ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەمه یه که (خوای گەورە ) بۆ فریشته کانی هەڵی بژاردووە : (سبحان ربى وبحمده ، سبحان ربى وبحمده )

له (أبو ذر الغفارى ) – خوا لی رازی بیت – ده لیت : له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إنِّي أرَى ما لا ترَونَ وأسمعُ ما لا تسمَعون ، أَطَّتْ السماءُ وحق لها أن تَئِطَّ ؛ ما فيها موضِعُ أربعِ أصابِعَ إلا ومَلَكٌ واضِعٌ جبهَتَهُ لله ساجدًا . واللهِ لو تَعلمونَ ما أعْلَمُ لضَحِكْتُمْ قليلاً ولبَكَيتُمْ كثيرًا ، وما تَلَذَّذْتُمْ بالنساءِ على الفُرُشِ ، ولخَرَجْتُمْ إلى الصُّعُدَاتِ تجْأَرونَ إلى اللهِ . لَوَدِدْتُ أنِّي كنتُ شجرةً تُعْضَدُ)) .[٢] واته : فەرمووی : من شتانێك دەبینم ئێوه نایبینن ، من شتانێك دەبیستم ئێوه نابیستنن ، ئاسمان دەنگی لێوه دەێت و چەرکه چرکی یان چیره چیری دێت ، دەی هەشەقێنی چەرکه چرکه که یان چیره چیره که بکات ، له هەموو شیوێنێك چوار پەنچەیەك فریشته یەك له سووجده یان له کرنۆش دایه بۆ (خوای گەورە ) سوێند به خوا ئەگەر ئەوەی من دیزانمئێوه بیزانن کەم پێدەکەنن و زۆر دەگریان ..؟! له گەل خێزانی خۆتان له سەر جیچگا له زەت و خۆشیتان وەرنەدەگرت ، به لکو دەر دەچوون بۆ سەر ێگاو بانەکان په ناتان به (خوای گەورە ) دەگرت و هاناتان بۆ خوا دەبرد ..؟! خۆزگه من دەرختی بۆ مایه دەیانبریم و له ریشکه وه هەڵیان دەکێشام ..!!

له (سعيد بن جبير ) – خوا لیّ رازی بێت – ده گیریتەوه دەڵێت : ((أن عمر بن الخطاب سأل النبى ﷺ عن الصلاة الملائكة ..؟! فلم يرد ﷺ شيئا ، فأتاه جبريل ، فقال : إن أهل السماء الدنيا سجود إلى يوم القيامة ، يقولون : سبحان ذى الملك والملكوت . وأهل السماء الثانية ركوع إلى يوم القيامة ، يقولون : سبحان ذى العزة والجبروت . وأهل السماء الثالثة قيام إلى يوم القيامة ، يقولون : سبحان الحى الذى لايموت )).[٣] واته : (عمری کوری خەتاب ) – خوا لیّ رازی بێت – پرسیاری له پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ، دەربارەی نوێژی فریشته کانی (خوای گەورە ) پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ وەلامی نەدایەوە ، تاکو جبريل (عليه السلام ) وه حی بۆ دابەزاند ، فەرمووی : خەلکی ئاسمانی دونیا سووجده دەبەن له رۆژی قیامەت دا . دەڵێن : (سبحان ذي الملك والملكوت ) .و خەلکی ئاسمانی دووەم رکوع ده بەن واته کرنۆش دەبه له رۆژی قیامەت دا . دەڵێن : (سبحان ذي العزة والجبروت ) .و خەلکی ئاسمانی سێ یەم هەڵدەستەوه له رۆژی قیامەت دا . دەڵێن : ( سبحان الحي الذي لا يموت ) ..!!

---

[١]- سنن الترمذي برقم (٣٥٩٣).
[٢] -سنن الترمذي برقم (٢٣١٢).
[٣] - اخرجه محمد بن نصر المروزي في تعظيم قدر الصلاة (٢٦٤/١) ، تفسير ابن كثير القران العظيم (٢٩٦/٨).

✍ لەرێ (السدی ) لە (أبی مالك وأبی صالح ) لە ( عبد الله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى:
﴿قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ دەڵێت : مە بەست لە کاروباری ئیبلیس یان شەتانە ، واتە : (خوای گەورە ) زۆر چاك لە کاورباری شەیتان دەزانی بەلام فریشتە کان پێ نازانن ..).[١]

✍ لە رێ (أبی روق ) لە(ضحاك ) لە (عبد الله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ دەڵێت : ئەوەی من لە دلی ئیبلیس دەرچوومە یان بینیومە ، ئێوە نە دەرچوونە یان نە بینیوتانە ،کە چەندە خۆ بەزلزان و گەورەو غرورو لە خۆبایی یە ..).[٢]

✍ لە رێ (السدی ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : ئیبلیس پاشایی فریشتە کان بوو لە ئاسمانی دونیا ، بە هۆی ئەو خۆ بەگەورە زانینەی یا بەهۆی ئەم لە خۆبایی یە هەیبوو ، کەوتە سەرپێچی و لە سنوور دەرچوونەوە ، (خوای گەورە ) بە مەبەستی ئیبلیسی زانی ، هەر وەك دەفەرمووێت :قال تعالى: ﴿ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ بە راستی لە ناخی یان لە نەفسی ئیبلیس دا سەرپێچی لە سنوور دەر چوون هەیە ..).[٣]

✍ لە رێ (ابن ابی نجیح ) لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت - لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ دەڵێت : (خوای گەورە ) دەی زانی کە ئیبلیس نا فەرمانی و سەرپێچی دەکات ، چونکە خۆی دورست کرد بوو..).[٤]

✍ لە رێ (سعید ) لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت - لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ دەڵێت : (خوای گەورە ) پێ دەزانی زۆر چاك لە داهاتوو دا خلیفە کە ئەوانە لە پێغەمبەران و پەیامبەران ،وە لە خەلکانی چاکەکار یان قەومانی چاکە کار ،کە لە بەهەشت دا نیشتە جێ دە بن ..).[٥]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت - لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ دەڵێت: واتە : بە زانیست و زانیاری من ئێوە دەبنە دانیشتووی ئاسمان ، وە ئادەم نەوەکانی دەبنە دانیشتووی زەوی ، وە لە نێوان ئەوانیشدا ستبیحات شکۆمەند و سوپاس ستایشم دەکەن و دەم پەرستن ..).[٦]

---

[١] -اخرجه ابن جریر (٥٨٧/١).
[٢] - اخرجه ابن جریر (٥٠٧/١) ، ٥٨٢ .
[٣] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧٩/١).
[٤] -تفسیر مجاهد ص١٩٩ .
[٥] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧٩/١).
[٦] -تفسیر مقاتل بن سلیمان (٩٦/١-٩٧).

قال تعالى: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣١﴾ [البَقَرَةِ : ٣١]

قال تعالى: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا﴾ واتە: (خوای گەورە ) ناوی هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد ، قال تعالى: ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ واتە: لە پاشان ئەو شتانەی پێشانی نیشانی فریشتەکان دا ،قال تعالى: ﴿فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ واتە: وە (خوای گەورە ) پیێ فەرموون : ناوی ئەمانەم پیێ بلێن : قال تعالى: ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣١﴾ واتە: ئەگەر راست دەکەن ( کە ئێوە لە ئادەم باشترن ) ..؟! بەلێ لە پاشان کاتێ کە قسەی فریشتە کان ئاماژەیە بۆ فەزل و چاکەیان ، لە سەر ئەو خەلیفەی (خوای گەورە ) کە دایناوە بۆ سەر زەوی ، بێ گومان (خوای گەورە ) دەیەوێت فەزلی ئادەم یان بۆ روون بکاتەوە ، وە تەواو حیکمەتی خوا زانستی ، جا دەفەرموویێت قال تعالى: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا﴾ واتە: هەموو ناوە کانی فێری ئادەم کرد یان ناوی هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد ، بەلێ بێ گومان ناوی هەموو شتێك واتە : ناوی گەورە و بچووکی فێری ئادەم کرد ، قال تعالى: ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمۡ﴾ واتە : ناوەرۆکی هەموو شتەکانی خستە روو ، بە واتایەکی تر شتە کان بۆ بە دیار خست بۆ فریشتەکان ، قال تعالى: ﴿عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ واتە : وەك تاقی کردنەوە یەك بۆ یان ئایا دەیانزانن ؟! یان نایزانن ؟! قال تعالى: ﴿فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣١﴾ واتە : (خوای گەورە ) پێی فەرمون : ناوی ئەمانەم پیێ بلێن : ئەگەر ئێوە راست دەکەن ..؟! هەروەها قال تعالى: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا﴾ واتە : (خوای گەورە ) ناوی هەموو شتێکی پێویست خستە نێو مێشکی ئادەم و نەوە کانی بۆ کاروباری ژیانی خۆیانەوە ، هە تاکو ناوی مانگ ئەستێرە رۆژ ، هەروەها ناوی سالیشی فێری ئادەم کرد و خستیە نێو مێشکیەوە ، وە ئادەمی ئامادەکرد بۆ ژیانی دونیا کە ببێتە خلیفە یان جێ نشین لە سەر زەوی دا ، چونکە بەراستی پەروەردگار ناوی هەموو شتێکی بوونەوەری فێری ئادەم کرد ، وە جۆری ئەو شتانەش کە دروستی کرد بوو وەك ئاسمان و هەور و مانگ و رۆژو ئەستێرە زەوی ، هەروەها ناوی گیاندارانیش وە ك ئەسپ و ووشتر بزن ...هتد قال تعالى: ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ واتە: پاشان ئەو شتانەی هەموو نیشانی فریشتە کان دا ، ئیجا فەرمووی : قال تعالى: ﴿فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣١﴾ واتە: فەرمووی : دەسا ئەگەر ئێوە راست ئەکەن لە ئادەم بە تواناترو باشترن بۆ خلیفە یان جێ نشینیەتی فەرموو ناوی ئەو شتانەم پیێ لێن : ئەگەر ئێوە راست دەکەن ..؟!

بەڵێ ئەمە ئەو شوێنەیە کە (خوای گەورە ) باسی ڕێزی ئادەمی تیا کردووە بە سەر فریشتە کاندا ، ئادەمی (علیه السلام ) تایبەتمەند کردووە بە شارەزا بوون بەهەموو ناوەکان ، وە فریشتە کانی لێ شارەزا نەکردووە ، ئەمەش دوای سووجدە برندنیا بۆی وە نە زانینیا لە حیکمەتی وە دی هێنانی یان دروست کردنی خلیفە یەك یان جێ نشینێك بۆ سەر زەوی کە ئادەم بوو ، کاتێ فریشتە کان پرسیاریان کرد دەربارەی ئەم خلیفە یە یان جێ نشینە یان دەربارەی ئادەم ، کە (خوای گەورە ) هەوالی پێدان فەرمووی قال تعالی: ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠] واتە: ئەوەی من دیزانم ئێوە نایزانن ..؟! هەر بۆیە دوای ئەمەی بۆ باس کردن تاکو ڕێزو پایە ئادەمیان بۆ دەرخات ، کە لە زانست و شارەزایی ڕێزی ناوە بە سەر ئەواندا ، کە دەفەرمووێت قال تعالی: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا﴾ واتە : خودا هەموو ناوێکی فێری ئادەم کرد . جا لێرە دا بۆمان دەر دەکەوێت کە (خوای گەورە ) مەبەستی لە م ئایەتە دا کە (ئادەم و نەوە کانیە تی ) جیابکاتەوە لە بوونەوەرەکانی تری ، وەك بونەوەرێکی یان وە دوورست کراوێکی تایبەت شارەزای بکات لە شتەکان ، بەڵێ (خوای گەورە ) مەبەستی بوو پێش رازی بوونی بەم ئە مانەتەی کە پێسپراد لە ژیانی دونیادا ، (خوای گەورە ) دەرگاکانی زانستی لێ کردەوە ، وە کاتێك مرۆڤ دوورست دەبێت شتەکان دەناسێت و فێری زانستی شتەکان دەبێت ، بێ گومان ئەم خەیال کردنی زۆر قورسە زال بێت بەسەر ئەم هەموو زانستە ، بێگومان ئەم هێز و ئیرادەیە توانایە دەبێت بە پیشتیوانی (خوای گەورە ) بێت و دابەزاندنی بە فریشتە یەکی بە هێز توانا خاوەن زانستی زۆر کە (جبریل) (علیه السلام ) ، هەر وەك (خوای گەورە ) بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرمووێت قال تعالی: ﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ٥﴾ [النَّجم : ٥] واتە: لە ڕێگەی فریشتە خوا (جبریل) (علیه السلام ) ئەو وەحیەی لەلایەنی خوداوە هێناوە بە پێغەمبەرەکەی گەیاندوە وە شارە زاو علیم و زانستی فێر کردووە ..!! بەڵێ فەزل گەورەیی زانستی پێغەمبەری خوا ﷺ بە سەر گەورەترین یان زاناترین زانایانی سەر زەویە ، چونکە ئەو زانستە فەزلی خوا یە بە سەر دروستکراوە کەی خۆی کەپێغەمبەری ئاخر زمانە ﷺ ..؟! چونکە ئەگەر بروانینە ژیانی دونیا هەر کەسێك کە هۆشمەند بێت و بیربکاتەوە دەبێت بە دوای زانست زانیاری دە بگەرێت ، هەروەك قوتابی بەدوای زانست دا دە گەرێت ، یان فلان کەس دەڵێت فلان فێری زانستی کردم ، یان دەڵێن لە لای ئەم زانایە فێری زانست بووم ، یان دەڵێن لە لای ئەم شێخە فێری زانستی شەرعی بوومە ، ئەمانە هەر هەمووی شانازی و فخر کردنە بە زاناکە یان شێخە کەی یان ئەو کەسەی فێری زانستی دەکات ، بۆیە قوتابی فخر و شانازی دەکات بەو زانستە زۆرە کە لەلای زاناکەی یان شێخەکەی خۆی فێر بووە ، بەردەوام شانازی بە مامۆستاکەی خۆی دەکات کەفێری علم زانستی کردووە ، جا سەیری لەوە دایە مامۆستاکە (خوای بەرزو بەڵند ) بێت یان خوای بالادەست زاناو دانابێت و کار بەجی بە هێز تواناو حکیم بێت ، بە گومان ئەمە زانستێکە هەر گیز لە بن نایەت و کۆتایی نایەت ئەگەر زاناکە (خوای گەورە ) بێت ، ئەمەش بێ گومان شتێکە سەر سورهێنە ..!!کە مامۆستاکەت ئەوەی فێری زانست علم شارەزایت دەکات کە (خوای گەورە ) بێت ، کە بەتوانایە بەسەر هەموو زانستێك زانایە بە هەمووشتێکدا ، چونکە (خوای گەورە ) بە جۆرێك مرۆڤ فێر دەکات هەمووشتێك پێ دەبەخشی لە کاتێکی کەم دا ...!!

نموویەك : ئەگەر سەیری قوتابیەکی کۆلێژی شریعە بکەین ، دەبینین لە ماوەی ئەم چەند سالە دا لە کۆتاییەکەی توێژینەوەیەکپێشکەش بە مامۆستاکەی دەکات ، لە سەر چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ ئینجا شرحیان دەکات لە ناو توێژینەوەکەی خۆی دەیکاتە بەلگەی چەند ئەحکامێکی شەرعی ، ئینجا توێژینەوەکەی پێشکەش دەکات بە نامەی ماستە یان دکتۆرا ، دواتر مناقەشە و گفتوو گۆیان لەسە ردەکات ئینجا دواتر لەم توێژینەوەیە بروانامەیەك وەردەگرێت جا بە ماستەر بێت یان بە دکتۆرا بێت ، لەدوایی دا نازناوی یان لقبی دەبێت بە مامۆستای وانەبێژی ماستەر یان نازناو یان لقبی دەبێت بە دکتۆر فلان ، ئەم ماستەر یان دکتۆرایە بۆ چی وەرگرت ..؟! چونکە شیکردنەوە شرح کردن و تێ گەیشتنی لە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ، جا لێرە دا پرسیارە کە ئەوەیە شوێن پێگەی پیغەمبەری خوا ﷺ لەرووی فەزلی گەورە یی علم زانست و زانیاری لە کوێی دایە ..؟! بەلێ هەروە ك (خوای گەورە ) هەموو ناوەکان شتەکانی فێری ئادەم (علیە السلام ) کرد ، هەروەها (خوای گەورە ) پێغەمبەرەکەی ﷺ فێری هەموو شتێك کرد .

پرسیار ئایا (خوای گەورە ) پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆ چی کردیە نە خوێندەوار لە سەردەمی نەفامی دا ..؟!

ولام : چونکە ئەگەر علم و زنستەکەی لە ثقافە و کلتوری سەردەمی نەفامی وەرگرتبایە ، ئەو بە دلنیاییەوە دەیان ووت ئەوا ئێمە فێری ئەم علم و زانستە کردیە ، هەر بیە لە سەرتا دا ئومی بوو واتە : نەخوێندەوار بوو ، سەرتایی دەپێکردنی علم زانستەکەی لە خوا وە بۆی دابەزێنرا ، لە ئاسمان وەحی بۆهات و لە گەل زانستی سەر زەویدا تێکەل بوو ، واتە : زانستی زەوی و زانستی ئاسمان تێکە بە یەکتر بوون ، هەر بۆیە دوژمانی ئیسلام ئەم پرسیارە دەکەن ئایا ئەم کلتورەی نەفامی یە یان وەحی ئاسمانە ئەم ووتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ..؟! هەر بۆیە (خوای گەورە ) وەلامیان دەداتەوە کە ئەم وەحیە یان ئەم نیگایە کە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ رەوانە کراوە یان ئەم کردار و ووتانەی بە فەرموودە بۆ مان گێراوەتەوە لە سەر کردار ووتەی پێغەمبەری خوا ﷺ خالیە یان دوورە لە هەموو کلتور یان ثقافە یە کی سەر زەوی ، ئەم ئایەتە وەلامدانەوەی دوژمنانی ئیسلام یان ئەوانەی کە براوایان بە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ نیە ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿مَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝٤﴾ [النَّجم : ٣ - ٤] واتە : وە لە هەواو ئارەزووی خۆیەوە قسە ناکات بەڵکو ئەوەی کە دەیلێ قورئانەو..!! تەنها وەحیەو لەلایەن خوای گەورەوە بە وەحی بۆی هاتووە..!! بەلێ هەر وە ك جۆن (خوای گەورە ) پێغەمبەرەکە ﷺ فێری خوێندەواری کرد کەچی نە خوێندەوار بوو ، ئاواش ئادەم (علیە سلام ) فێری هەموو ناوی شتەکانی کرد ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] هەروەها خستنە رووی ئەو ناوانە بۆ فریشتە کان ئەوانەی (خوای گەورە ) پێشانی ئادەمی دا (علیە السلام ) بۆ تەحەدای کردنی فریشتە کان بووە بۆ ئەوەی کەمی زانستیان بە دیار بکەوێت ، بۆ ئەوەی بەدیار بکەوێت کە گومانە کەیان راست نیە ئەم جێ نشینە واتە: ئادەم و نەوەکانی ئادەم فسادی و خراپەکاری لە زەوی دا بلاو دەکەنەوە ، و خوێن رشتن دەکەن ، هەرە وەك دەفەرمووێت قال تعالی: ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ۝٣١﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] ..؟!

بەلێ راو بۆ چوونی جیاواز هەیە دەربارەی ناوی ئادەم ، بۆچی ناوی ئادەم یان (آدم ) لێنراوە..؟! دەلێن : چونکە لە (أديم ) واتە : لە قولایی زەوی یان لە خاك و خۆلی زەویەوە هاتووە ، (خوای گەورە ) بەدەستی خۆی دورستی کردووە ، ئینجا روحی بە بەرناوە ، ئادەمیش یەکەم بوونەوەر بووە یان مخلوق بووە ..!! هەر بۆیە (خوای گەورە ) رێزو شەرفی لێ ناوە ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ۝٧٠﴾ [الإِسْرَاء : ٧٠] واتە: بێگومان ڕێزمان لەنەوەکانی ئادەم ناوە بەوەی بەخشینی عەقڵ و ناردنی پەیامبەران، وهەموو ئەوەش کە لەبوونەوەردایە بۆمان تەسخیر کردوون، لەوانەش ئاژەڵەکان لەوشکانی و کەشتیش لەدەریاکاندا بۆهەڵگرتنیان، ورزق و ڕۆزی چاکمان داون لەخواردن و خواردنەوەکان، وزۆر بەرێزترشیمان کردوون بەسەر زۆرێك لەدروستکراوەکانی تردا ..!! بەلێ هەر وەك دەزانرێت مرۆڤ ژیری و یان عەقل و شەهوەتی هەیە ، لە مشتێك لە خاك خۆلی زەوی دورست کراوە ، وە رووحی بە بەرکراوە لە رووحی (خوای گەورە ) ئەمە واتە : بۆ تێگەیشتنە مرۆڤ نەوەك (خوای گەورە ) لە هیچ شتێك ناچێت واتە : لەهیچ دورستکراوەکانی ناچێت هەروەکو دەفەرمووێت قال تعالى: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ﴾ [الشُّورَى : ١١] واتە : لە هیچ شتێك ناچی ..؟! چاکترین و خێر ترین دورستکراوە کانی (خوای گەورە ) ئەو کەسانەن ، هەرە وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ۝٧﴾ [البَيِّنَة : ٧] واتە : ئەوانەش کە ڕاستیان لە گەڵ پەرستراوی خۆیاندا کردووە کە ( الله ) یە، و شوێنی پەیامبەرەکەیان صلى الله عليه وسلم کەوتوون، ئەوانە چاکترینی دروستکراوەکانن ..!! هەروەها خراپ ترین دورستکراوەکانی (خوای گەورە )ش ئەمانەن ، کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ۝٦﴾ [البَيِّنَة : ٦] واتە : بێگومان ئاگری دۆزەخە سزای ئەوانەی کە کوفریان کردوە.لە جولەکە و خاچ پەرست و هاوەڵبڕیاردەران.و بەهەتا هەتایی تێیدا دەمێننەوە، چونکە ئەوانە خراپترینی دروستکراوەکانن لە خراپیدا ..!! هەر بۆیە مرۆڤ ئەمانەتێکی پێ راسپێدراوە لەم جیهانە دا، کە فەرمانە کانی (خوای گەورە ) بە خێرو کارو کرداری چاکە بەرێ بکات ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ۝٧١ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ۝٧٢﴾ [الأَحْزَاب : ٧١ - ٧٢] واتە : ا ئەگەر لە تەقواکاری خوا بن و وتەی ڕاست و دروستان ووت ئەوا خوای پەروەردگار کردەوەکانتان بۆ چاك دەکاتەوە، و لە تاوانەکانتان خۆش دەبێت . وە ئەو کەسەش کە گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی صلى الله عليه وسلم بێت لەوەی کە فەرمانی پێکردووە و یاساغی کردووە ئەوا پلەوپایە ورێزی گەورە بەدەست دەهێنێت لە دونیا و دواڕۆژ ..!! ئێمە ئەمانەتەکەمان . کە خوا بەندە موکەللەفەکانی پێڕاسپاردووە لەگوێڕایەڵی فەرمانەکانی ودورکەوتنەوە لەیاساغیکراوەکانی . دابەسەر ئاسمانەکان وزەوی وشاخەکاندا، ئامادەنەبوون کە هەڵیبگرن، وترسان نەتوانن پێداویستیەکانی بەجێبهێنن، وە مرۆڤ هەڵیگرت و چووە ژێرباری لەگەڵ لاوازی، بەڕاستی مرۆڤ زۆر ستەمکار و نەفامە لە نەفسی خۆی ..!!

یەکەم بوونەوەر لە لە سەر زەوی نیشتەجێ بوو ، ئادەمیزاد بوو ، لە پاشان ئەم ئەمانەتەی پێ سپێدرا کە چاکە کار بێت لە سەر زەوی ، چونکە یەکەم دروستکراو وە ، کە ئاسمانە کان و زەوی بۆی فەراهەم هێناوە یان بۆ مسخر کردووە ، وە ئەم بەلگە و نیشانانە ئاماژەیە بۆ لطف و فە زلی پێگەی ئادەم (علیە السلام ) ئەوش یەکەمین پێگەی ئادەمیزادە ، لە لە قولایی یان لە (ادیم ) زەویە (خوای گەورە ) دروستی کردووە ..!!

ئەگەر سەنجێك بدەین دەبینین کە وا فێر کردنی رێ نیشاندانی (خوای گەورە ) جیاوازە لە فێر کردن رێ نیشاندانی مرۆڤ ، ئەوەی (خوای گەورە ) فێری پەیامبەران یان پێغەمبەران دەکات (علیهم السلام ) جیاوازە لە ئەوەی کە مرۆڤێك فێری مرۆڤێکی تر دەدەکات ، ئەوەی (خوای گەورە ) فێری پێغەمبەران دەکات لە رێگای وەحی نیگایە یان لە فەرموودە کانی خۆیەتی بە ووشە ، یان نزیك بوونەوەیە بە کلام و ووشە ی گوفتار وەك دەفەرموویت قال تعالی: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ١٦٤﴾ [النِّسَاء : ١٦٤]واتە : وە خوای پەروەردگاریش قسەی لەگەڵ موسادا کردووە وەك ڕێزلێنانێك بۆی بەو سیفەتە . لەم ئایەتە پیرۆزەدا : جێگیرکردنی سیفەتی کەلامی تێدایە بۆ خوای بەرز وبڵند وپایەبەرز بەو شێوەیەی کە شایستەی خۆیەتی، وە ئەوەش کە : خوای پەروەردگار ڕاستەوخۆ و بەهەقیقەت قسەی لەگەڵ موسادا کردووە بەبێ نێوەند ..!! بەلام مرۆڤ ئەو زانستەی کەفێر بووە لە زانستی پێغەمبەرانە (علیهم السلام ) یان لە زانایانە شەرعیە یان لە زانایانی ترە کە فێری علم و زانست دەبێت ، بێ گومان ئەو زانست و فێر کردنەی مرۆڤ یان ئادەمیزاد ،سیفەتێکی نقصە یان کەم کوری تێدایە لە بەرانبەر علم زانست و فێر کردنی (خوای گەورە ) کە علم و زانست فێرکردنی سیفەتی کامل تەواو هیچ کەم کوری تێدا بە دی ناکرێت ، ئەگەر ئایەتەکانی قورئان بەراوورد بکەین بە فەرموودەکان دەبینین جیاوازیان زۆرە ..؟! قال تعالی: ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ واتە: لە پاشان (خوای گەورە ) بۆی خستنە روو فەرمووی : ئەوە دورست کراوە کانی منە یان ئەوە جێ نشینی من لەسەر زەوی ئایا هیچی دەربارەی دەزانن ..؟! قال تعالی: ﴿فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ واتە: ئێوە چی دەزانن دەربارەی ئەم ناوانە یان چی دەربارەی دەزانن هەولم پێ بدەن..؟!

دەچینە بابەتێکی زۆر وورد ، رەنگە (خوای گەورە ) ئەوەی نزمترینە زیاتری پێ ببەخشێت لەوەی بەرزترین لە لای ، (مەبەست لە ووتەیە ئەوەیە پێغەمبەرێك پێگەو مقامی بەرزە بەلام زانستی کەمترە لە کەسێکی تر کە (خوای گەورە ) زانستی زیاتری پێ بەخشیووە ، یان رزقی زیاتری پێ بەخشیووە یان نەوەو منالی زیاتری پێ بەخشیووە یان مال سامانی زیاتری پێ بە خشیووە ..؟! ) هەروەك ئەم نموونەیە : کە موسی (علیە السلام ) پێغەمبەرێك بوو فەزل رێزی و پێگەی هەبوو لەلای (خوای گەورە )، ئەوە بوو (موسی ) پرسیاری کرد : دەربارەی زانینی سەر زەوی ..؟! هەروەها ووتی : ئاورەم دایەوە پەروەردگار سەیری شتێکی کرد ، ئەوە پێشبینی و چاوەروان کراوە نەبوو، (خوای گەورە ) سر یان نهێنی بەخشی بوو بە (خضر ) (علیە السلام ) تکلیف کرا بوو بەم فەرمانە ، کاتێك (موسی ) و (خضر ) هاورێ یەتی یەکتریان کرد ، نارەزا بیان بە رانبەر یەکتری دەربری ..؟!

بەڵێ (خضر) (علیە السلام ) راست و دورستی بابەتەكانی بە (موسی ) دەبەخشی ، وە حكم دادوەری كردارەكانی (خوای گەورە ) بە (موسی ) دە بەخشی ، هەروەها (موسی ) تەنا تایبەت كرا بوو ، بە تكلیف بەلام (خضر ) تكلیف كرا و هەروەها سر یان نهێنی فەرمانەكانیشی دەزانی ، واتە : (خضر ) تەواو كەری هەردوو پێك هاتە كە بوو، بۆمان روون بۆیەوە ئەوەی كە بە (خضر ) (علیە السلام ) بەخشرا بە (موسی ) (علیە السلام ) نە بەخشرا بوو ..؟! هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی:

﴿فَوَجَدَا عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا ٦٥﴾ [الکَهۡف : ٦٥]واتە : وە كە گەشتنە ئەو شوێنە بەندەیەكی چاكیان لەبەندەچاكەكانمان لەوێ بینی كە ئەویش ( خَضِر ) بوو . سەلامی خوای لەسەر بێت . یەكێكە بووە لە پەیامبەرانی خوای پەروەردگار و وەفاتیشی كردووە . كە لە لایەن خۆمانەوە ڕەحمەت و زانستێكی زۆرمان پێی بەخشیبوو ..!! بەڵێ (خوای گەورە ) دەبە خشێت بە نزمترینی ، وە نابەخشێت بە بەرزترین پێگەی كە پێغەمبەرانن یان پیاو چاكانن ، هەروەك بە خشی بە بوونەوەرێكی گیان لەبەری خۆی ئەویش یەكێك لە بالندەكان (هد هد ) یان بە كوردی پێ ناسراوە (پەپوولە سلیمانە ) كە ئەم زانستەی نەبەخشی بە پێغەمبەر(سلیمان ) (علیە السلام ) كە زانیاری و هەوالی بۆ سلیمان كۆدە كردەوە هەوالی پێدەدا بەلام سلیمان ئەم توانایەی (هد هد) ی نەبوو ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ﴾ [النَّمۡل : ٢٢] واتە: وتی: ئەی سولەیمان - صلی الله علیه وسلم - زانیاریەكم دەست كەوتووە كە تۆ پێت نیەو نایزانیت..!!

هەروەها ئەو بەخشینەی یان ئەو دەسەلات پاشایەتی و علم زانستەی بە (سلیمان ) بەخشی بوو ، بەهێچ پێغەمبەرێك یان هیچ كەسێك لە سەر زەوی نەبەخشی بوو ، لە رابردوو دا بەهیچ كەسێكی نەبەشی بوو ، لە داهاتووشدا نا بەخشی بەهیچ كەسێك ، هەروە ك فەراهەم كردنی جنۆكە كان یان زانینی زمانی بالندە و زیندەوەر گیانداران ، هەروەها فەراهەم كردنی باو چەندینزانست علم زانیاری تر كە بەهیچ كەسێكی تری نەبەخشی بوو ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ عِلۡمٗاۖ وَقَالَا ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّنۡ عِبَادِهِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٥﴾ [النَّمۡل : ١٥] واتە : بێگومان ئێمە زانستمان بەداود و سولەیمان بەخشی و ئەوانیش كردەوەیان پێكرد و وتیان : سوپاس وستایش بۆ ئەو خوایەی كە بەم زانستە ئێمەی ڕێزداركردووە بەسەر زۆرێك لەبەندە باوەڕدارەكانیدا . لەم ئایەتەدا ئاماژەی تێدایە بۆ پلە و پایە و ڕێزی زانستی شەرعی و پلەبەرزی هەڵگرانی ..!! قال تعالی: ﴿وَوَرِثَ سُلَيۡمَٰنُ دَاوُۥدَۖ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمۡنَا مَنطِقَ ٱلطَّيۡرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيۡءٍۖ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡمُبِينُ ١٦﴾ [النَّمۡل : ١٦]واتە : سولەیمان میراتگری داودی باوكی بوو لەپەیامبەرێتی وزانست و موڵك وپاشایەتیشدا، سولەیمان بەگەلەكەی ووت : ئەی خەڵكینە ئێمە قسە و تێگەیشتنمان پێ بەخشراوە لەزمانی باڵندە، و هەموو شتێك كە پێویست بێت پێمان بەخشراوە، وە ئەم بەخششانەی كە خوا بە ئێمەی بەخشیوە لەڕاستیدا فەزڵ وچاكەیەكی ڕوون وئاشكرایە كە ئێمەی پێ تایبەتمەندكردووە بەسەر خەڵكی تردا ..!!

قال تعالى: ﴿وَحُشِرَ لِسُلَيْمَانَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ١٧﴾ [النَّمل : ١٧]واتە : سەربازەکانی سولەیمان زوستانێکدا کۆکرانەوە لە مرۆڤ وجنۆکە وباڵندەکان، بەڵام لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرەشیاندا پشتگوێ نەدەخران، بەڵکو لەسەر هەموو جۆر و ڕەگەزێك پێویستبوو ئامادەبوونی هەموو تاکەکانی . سەرەتا تا کۆتایی . بەسەربکاتەوە بۆ ئەوەی بەڕیز و ڕێك ونیزامی بوەستایە ...!! قال تعالى: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَـٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ١٨﴾ [النَّمل : ١٨]واتە : کەوتنەڕێ تاکو گەشتنە دۆڵێك شارە مێرووڵەیەکی تێدابوو، مێرووڵەیەك پێ ووتی : ئەی کۆمەڵی مێرووڵە بڕۆنە ماڵەکانتانەوە بۆ ئەوەی سولەیمان و سوپاکەی تێکتان نەشکێنیت و لەناوتان نەبەن بەبێ ئەوەی بزانن و هەستتان پێبکەن ..!! قال تعالى: ﴿فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَـٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ﴾ [النَّمل : ١٩]واتە : سولەیمانیش بەزەردەخەنەیەکەوە پێکەنی لەووتەی ئەم مێرووڵەیە لەبەر تێگەیشتن وئاگادارکردنی مێرووڵەکانی تر، جا لەوکاتەدا هەستی بەنیعمەت وبەخششی خوای پەروەردگار کرد بەسەریەوە، و ڕووی لەپەروەردگاری کرد فەرمووی : ئەی پەروەردگارم سەرکەوتوم بکە بۆ ئەوەی شوکرانەبژێری تۆبم لەسەر ئەو نیعمەتانەی کە بەمن وباوانمت بەخشیون، وئەوەی کە کردەوەیەکی چاکی وا ئەنجامبدەم کە تۆ پێیڕازیبیت ولێم وەرگریت، وە بەڕەحمی خۆت بمخەرە ناو خۆشیەکانی بەهەشتەکەتەوە لەگەڵ بەندە چاکەکانتدا کە تۆ لەکردەوەکانیان ڕازیت ..!! قال تعالى: ﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَالِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ٢٠﴾ [النَّمل : ٢٠]واتە : وە سولەیمان حاڵ و باری ئەو باڵندانەی بەسەر کردەوە .لەڕووی ئامادەبوون و ئامادەنەبوونیانەوە . کە ژێربارکرابوون بۆی، و هودهودێکی جیاکار وناسراوی هەبوو بینی دیارنیە، بۆیە ووتی : ئەوە چیە هودهود نابینم کە هەموو جارێك ئامادەی و دەیبینم ؟ ئایا بەربەست و ڕێگرێك هەیە لە پێشی ناتوانم ببینم، یاخود لێرەنیە و لە نادیارانە، بۆیە بەدی ناکەم ؟ کاتێك دەرکەوت کە لەوێ نیە و ئامادەنیە ..!! قال تعالى: ﴿لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَا۟ذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ٢١﴾ [النَّمل : ٢١]واتە : ووتی : دەبێت سزایەکی سەختی ئەو باڵندەیە بدەم . وەك تەمێکردنێك بۆی .لەبەر ئامادەنەبوونی، یان سەریدەبڕم وەکو سزا و تۆڵەیەك بۆ ئەو کارەی . کە سەرپێچی ئەوەی کردووە کە ژێربارکراوە بۆی.، یاخود دەبێت بیانوویەکی ڕوون و ئاشکرا بهێنێتەوە کە بەهانە بێت لەسەر ئەو دیارنەبوونەی ..!! قال تعالى: ﴿فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ٢٢﴾ [النَّمل : ٢٢]واتە : ئەوەبوو هودهودەکە زۆری پێ نەچوو گەڕایەوە و ئامادەبوو، وسولەیمانیش سەرزەنشتی کرد بۆ ئامادە نەبوون و دواکەوتنی، و هودهودەکەش پێی ووت : زانیاریم لەسەر شتێك بۆ هێناوی کە تۆ ئاگات لێ نیە و زانینت لەبارەیەوە نیە، ئەوەیش ئەوەیە کە هەواڵێکی ترسناکم بۆ هێناوی لە شاری سەبەئی یەمەنەوە کە زۆر گرنگ و جێی بایەخە، و منیش دڵنیا و بێگومانم لێی ..!!

قال تعالى: ﴿قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾﴾ [النَّمل : ٣٨] واتە: سولەیمان بەو جن ومرۆڤانەی کە خوا ژێرباری کردبوون بۆی فەرمووی: کێ لەئێوە دەتوانێت عەرشی پاشایەتی شاژنەکەیانم بۆ بهێنێت پێش ئەوەی ئەوان بە ملکەچی و گوێرایەڵیەوە بێن بۆ لام ..؟ قال تعالى: ﴿قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ ۖ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾﴾ [النَّمل : ٣٩]واتە: جنێکی یاخیبووی زەبەلاحی بەهێز و توانا ووتی: من بۆتی دەهێنم پێش ئەوەی لەم کۆڕ و دانیشتنەت هەستی کە بۆ دادوەری و حوکمدان لەنێوان خەڵکی دانیشتووی، وە بێگومان من بەهێز وبەتوانام بۆ هەڵگرتنی، و دەستپاکیشم بەوەی کە تێیدایە، بۆتی دەهێنم وەکو خۆی بێ ئەوەی شتێکی لێ دەربهێنم ناتەواوی بکەم یاخود بیگۆڕم مەوە ...؟! قال تعالى: ﴿قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾ [النَّمل : ٤٠]واتە: ئەوەیان کە زانستی لە کتێب هەبوو وتی: من بۆتی دەهێنم پێش ئەوەی پێڵوی چاوەکانت بگەڕێتەوە شوێنی خۆی پاش جوڵاندنەوەی بۆ تەماشاکردنی شتێك. سولەیمانیش ڕێگەی پێدا ئەو کارە بکات و ئەویش لەخوای پەروەردگار پاڕایەوە و عەرشەکەی بۆ هێنا. جا کاتێك سولەیمان عەرشەکەی بینی لەبەردەستیدا دانرا وتی: ئەمە لە فەزڵ وچاکەی پەروەردگارمە کە من وەهەموو گەردوونی بەدیهێناوە، بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە، کە ئایا سوپاسگوزاری دەبم بەدانپێدانان بەو نیعمەت وبەخشانەی کە پێمی بەخشیون، یاخود سپڵە و ناسوپاسگوزار دەبم ؟ وە ئەوەش کە شوکر و سوپاسی خوا بکات لەسەر نیعمەتەکانی ئەوا سوودی دەگەڕێتەوە بۆ خۆی، و ئەوەشی سوپاسگوزار نەبێت ئەوا بەڕاستی پەروەردگارم دەوڵەمەندە و پێویستی بە سوپاسی ئەو نیە و بەخشندەیە بەجۆرێك کە خێر و بەخشینی لەدونیادا باوەڕدار و بێباوەڕیشی گرتۆتەوە، پاشان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات و لەسەری پاداشت وەردەگرن لەدواڕۆژدا ..!!

قال تعالى: ﴿قَالَ نَكِّرُوا۟ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾﴾ [النَّمل : ٤١]واتە: سولەیمان بە ئامادەبووانی لای خۆی ووت: تەختی پاشاشایەتیەکەی. کە لەسەری دادەنیشێت. بگۆڕن بۆ شێوەیەك کە چاوی پێکەوت نەیناسێتەوە، بۆ ئەوەی بزانین ئایا پەیدەبات بە ناسینەوەی یاخود پەیێ نابات و نایناسێتەوە ؟!قال تعالى: ﴿فَلَمَّا جَآءَتْ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِ ۖ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَ ۚ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴿٤٢﴾﴾ [النَّمل : ٤٢]واتە: جا کاتێك کە شاژنی ( سبأ ) گەیشتە لای سولەیمان لە کۆڕ و دانیشتنەکەیدا پێی ووترا: ئایا تەختی پاشایەتیەکەت بەم شێوەیە ؟ ئەویش ووتی: بەڕاستی زۆر لێیدەچێت. جا بۆ سولەیمان دەرکەوت کە شاژن ڕاستی ووت لەوەڵامەکەیدا، و هێز و دەسەڵاتی خوای پەروەردگار و ڕاستی پەیامبەرێتی سولەیمانی زانی، بۆیە وتی: ئێمە لە پێش ئەمە زانست وزانینمان پێدراوە لەبارەی خوا و توانا و دەسەڵاتی خواوە، وملکەچی فرمانەکانی خواین و شوێنکەوتەی ئاینی ئیسلامین ..؟!

✍ لە ڕێ (السدی) لە (أبی مالك وأبی صالح ) لە (عبد الله بن عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەڵێت : کاتێك (خوای گەورە ) فریشتەی مەرگی ڕەوانە کرد تاکو مشتێك لە خۆڵ وخاکی زەوی بۆ (ئادەم ) – علیە السلام – هێنای لە سەر ڕووی زەوی ، وە لە تێکەلە یەك لە خۆڵ وخاکی هێنا ، بەلام لە یەك شوێن نەی هێنا ، بەلکو لە شوێنی جیاجیا خۆڵ خاکە کەی هێنا ، خۆڵ خاکە کەش لە پێکهاتەی خۆڵ خاکی سوور و سپی و ڕەش ، هەر بۆیە نەوەکانی ئادەم جیاواز دەرچوونە ، چونکە لە قولایی یان لە (أدیم) زەوی یە ..؟! ).[١]

✍ لە ڕێ (سعید بن جبیر ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت - دەڵێت : (خوای شکۆمەند) ئیبلیسی ڕەوانە کرد ، بۆ قولایی زەوی یان (أدیم ) زەوی ، لە سوێرو شرینی زەوی ، ئینجا ئادەمی لێ دروست کرد ، هەمووشتێکی دورست کرد لە شیرین و بۆئەوانەی بەرەو خۆشی شادی دەڕۆن ، ئەگەر نەوەی بێ باوەران بن ، ئەوا هەموو شتێکی دورست کرد لە سوێری ئەوانەی بەرەو هیلاکەت نەهامەتی دەڕۆن ، وە ئەکەر نەوەی پێغەمبەران بن ، دەلێت : ئەم خۆلە یان خاکە کێ یە ، ئیبلیس دەلێت : قال تعالى: ﴿ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ٦١﴾ [الإِسۡرَاء : ٦١]واتە : ئەی پەروەردگار من کڕنوش بەرم بۆ کەسێك کە تۆ لە قوڕ دروستت کردووە..!! ئەم ئەم گل و خۆلە یە کە من هێناومە ، ئەم گلە یان خۆلە یان خاکە ناوی (ئادەمە ) چونکە لە قولایی زەوی یان (أدیم ) زەوی هاتووە ..).[٢]

✍ لەڕێ (الحسن بن مسلم ) لە ( سعید بن جبیر ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت- دەڵێت : ناوی (ئادەم ) بوو ، چونکە دروست بوو لە قولایی زەوی یان (ادیم ) زەوی ، مشتێك لە مشتی گل یان خۆلی سەر زەوی دورستکرا ، لە زەوی سپی و سوور و ڕەش ، هەر بۆیە ڕەنگی خەلکی جیاوازە لە یەکتری ، وە ك سپی و سوور ڕەش ، وە باش و خراپ یان پیس ..).[٣]

✍ لەڕێ (أبی حصین ) لە (سعید بن جبیر ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەڵێت : دەزانن بۆچی ناوی لێنرا : (آدم ) ..؟! چونکە دروست بوو لە قولایی زەوی یان لە (أدیم ) زەوی ..).[٤]

---

[١] -اخرجه ابن جرير (٥١٢/١ ).
[٢] -ابن عساكر في تاريخ دمشق (٣٨٠/٧).
[٣] -اخرجه ابن ابي حاتم (١٤٤٣/٥).
[٤] -اخرجه عبدالرزاق في تفسير (٢٠/٢) .

له (ابی هریره ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((خَلَقَ اللَّهُ عزَّ وجلَّ آدَمَ علَى صُورَتِهِ، طُولُهُ سِتُّونَ ذِراعًا، فَلَمَّا خَلَقَهُ قالَ: اذْهَبْ فَسَلِّمْ علَى أُولَئِكَ النَّفَرِ، وهُمْ نَفَرٌ مِنَ المَلائِكَةِ جُلُوسٌ، فاسْتَمِعْ ما يُجِيبُونَكَ، فإنَّها تَحِيَّتُكَ وتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ، قالَ: فَذَهَبَ فقالَ: السَّلامُ علَيْكُم، فقالوا: السَّلامُ عَلَيْكَ ورَحْمَةُ اللهِ، قالَ فَزادُوهُ: ورَحْمَةُ اللهِ، قالَ: فَكُلُّ مَن يَدْخُلُ الجَنَّةَ علَى صُورَةِ آدَمَ وطُولُهُ سِتُّونَ ذِراعًا، فَلَمْ يَزَلِ الخَلْقُ يَنْقُصُ بَعْدَهُ حتَّى الآنَ)). [1] واته : ( خوای بالادەست ) ئادەمی له سەر شێوەی خۆی دورست کردووە، درێژیه کەی شەست باڵ بوو کاتێك دروستی کرد ، فەرمووی : برۆ سەلام بکە لەو چەند کەسە ، کە چەند کەسێك بوون له فریشتە کان دانیشتبوون ، گوێی بگرە کە چۆن وەلامی سەلام دەدەنەوە ، چونکە ئەو سەلامە دەبێت بە سەلامی خۆت نەوە کانت ، ئینجا رۆیشت ووتی: سەلامتان لەسەر بێت ، ئەوانیش ووتیان : سەلام و رەحمەتی خوا له سەر تۆیش ، دەفەرمووێت (رحمه الله ) لێ زیاکرا ،فەرمووی : هەر کەسێك دەچێتە بەهەشتەوە له سەر وێنەی یان شێوەی ئادەم ، کە شەست باڵ بەرزی بوو ، ئیتر دوای ئەو خەلك بەروە کورت بوونەوە هاتوو هەتاکو ئێستا ..؟!

له ( ابو موسى الاشعرى ) – خوا لێ رازی بێت – دە گێرێتەوە له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إن اللهَ - تعالى - خلقَ آدمَ من قبضةٍ قبضها من جميعِ الأرضِ ، فجاءَ بنو آدمَ على قدرِ الأرضِ ، فجاءَ منهم الأحمرُ ، والأبيضُ ، والأسودُ ، وبين ذلكَ ، والسهلُ ، والحَزنُ ، والخبيثُ ، والطيّبُ)) . [2] واته : بێ گومان (خوای گەورە ) ئادەمی دروستکردووە له مشتێ خۆل و خاك له هەموو بەش پارچە کانی زەوی یان له هەموو شوێنەکانی زەوی دا ، هەر بۆیە نەوەکانی ئادەم لەسەر شێوازی هەموو زەوین ..؟! هەیانە رەنگی سوورە ، هەیانە رەنگی سپی یە ، هەیانە رەنگی رەشە ، له نێوان ئەو رەنگانە هەیانە کەسانی له سەر خۆ رووح سووك توند رەق خەمۆکی هەیە ،وە دەروون پیس و دەروون پاکیش هەیە ..؟!

له (أنس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت – دە گێریتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لمَّا صوَّر اللهُ تبارك وتعالَى آدمَ عليه السَّلامُ تركه ، فجعل إبليسُ يطوفُ به ينظُرُ إليه ، فلمَّا رآه أجوفَ ، قال : ظفرتُ به خلقٌ لا يتمالكُ)). [3] واته: ئەوەی (خوای گەورە ) ئادەمی له بەهەشتدا وێنە کرد ، وازی لێ هێنا تا ویستی لێ بوو وازی لێ هێنا ، ئینجا ئیبلیس بە دەوری دا دەسورایەوە ، دە ماشای دەکرد دەی ووت ئەمە چیە ..؟! کاتێك بینی یان روانی کە ناوی بۆشە یان ناوی بەتالە ، زانی ناتواتنێت بە سەر خۆی دا زال بێت ، واته : ئەم دورست کراوە هیچ ناتوانێت زال بێت بە سەر خۆی دا ، کەواتە دەتوانێت ئیبلیس بە سەر دا سەر کەوتووبێت له ناو ببات یان زەفری پی ببات ..؟!

---

[1] - صحیح مسلم برقم (٢٨٤١).
[2] - سنن الترمذي برقم (٢٩٥٥).
[3] -صحيح مسلم برقم (٢٦١١).

📖 لە (أنس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت - دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لمَّا نُفِخ في آدَمَ فبلَغ الرُّوحُ رأسَه عطَس فقال : الحمدُ للهِ ربِّ العالَمينَ فقال له تبارَك وتعالى : يرحَمُك اللهُ)).[1] واتە : رووحی بەبەر ئادەم خست ، رووح گەیشتە سەری ئادەم ووتی : (الحمد لله رب العالمين ) (خوای گەورە ) فەرمووی : (يرحمك الله ) ..!!

📖 لە (ابو هرير ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إنَّ اللهَ خلَقَ آدَمَ مِن تُرابٍ، ثمَّ جعَلَه طِينًا، ثمَّ ترَكَهُ حتَّى إذا كان حمَأً مَسنونًا خلَقَه وصَوَّره، ثمَّ ترَكَه حتَّى إذا كان صَلصالاً كالفخَّارِ، قال: فكان إبليسُ يمُرُّ به يقولُ: لقد خُلِقْتَ لأمْرٍ عظيمٍ، ثمَّ نفَخَ اللهُ فيه مِن رُوحِه، فكان أوَّلَ شَيءٍ جَرى فيه الرُّوحُ بصَرَهُ وخَياشِيمَه، فعَطَسَ، فلقَّاهُ اللهُ حمْدَ رَبِّه، فقال الرَّبُّ: يَرحَمُك ربُّك، ثمَّ قال: يا آدَمُ، اذهَبْ إلى أولئك النَّفرِ، فقُلْ لهم، وانظُرْ ما يقولونَ، فجاء فسلَّمَ عليهم، فقالوا: وعليك السَّلامُ ورحمةُ اللهِ، فجاء إلى رَبِّه، فقال: ماذا قالوا لك؟ وهو أعلَمُ بما قالوا له، قال: يا رَبِّ، لمَّا سلَّمْتُ عليهم قالوا: وعليك السَّلامُ ورحمةُ اللهِ، قال: يا آدَمُ، هذا تَحيَّتُك وتحيَّةُ ذُرِّيَّتِك، قال: يا رَبِّ وما ذُرِّيَّتي؟ قال: اختَرْ إحدى يَدَيَّ يا آدَمُ، قال: أختارُ يَمينَ ربِّي، وكِلْتا يَدَيْ رَبِّي يَمينٌ، فبسَطَ اللهُ كَفَّه، فإذا هو كما هو كائنٌ من ذُرِّيَّتِه في كَفِّ الرَّحمنِ عَزَّ وجَلَّ)).[2]

واتە : (خوای گەورە ) ئادەمی دروست کرد لە خۆڵ ، لە پاشان لە قور یان گڵ دروستی کرد ، پاشان وازی لێ هێنا ، تاکو قورەکە گۆرا رەنگی رەش بوو ، واتە : بۆگەن بوو ،شێوەی دورست کرا یان ویچنەی دروست کرا ، هە تاکو قورەکە وشك دبێتەوە لووس دەبێت ، ئینجا لە پاشاندا ئیبلیس بە لای دا تێدەپەرێت ، دەلێت : ئەمە بۆ فەرمانێکی زۆر گەورە و مەزن دورست کراوە ، پاشان (خوای گەورە ) لە رووحی خۆی رووحی پێ بەخشی ، یەکەم شت کە رووحی بە بەر کرا، هەناسی بە ناو داهات و چاوەکانی کونەکانی لووتی بوونەوە، ئینجا بژمەیەکی کرد ، پاشان (خوای گەورە ) کەبینی ستایشی پەروەردگاری دەکرد ، پاشان پەروەردگار فەرمووی : پەروەردگارت رەحمەت پێ بکات ، پاشان فەرمووی : ئەی ئادەم ، برۆ بۆ لای ئەو کەسانە واتە : فریشتە کان ، ئینجا پێ فەرموو : بزانە چی دەلێن : چووە لایان سەلامی لێکردن ، ئەوانیش ووتیان : (وعليكم السلام ورحمه الله ) فەرمووی : ئەی ئادە ئەم سەلاوی تۆیە و نەوەکانی تۆیە ، ووتی : ئەی پەروەردگار نەوە کانم کێن ..؟! فەرمووی : یەکێك لە دەستە کانم هەلبژێرە ئەی ئادەم ، ووتی : من دەستی راستی پەروەردگار هەلدەبژێرەم ..!! وە هەر دووستی پەروەردگار هەر راستە ، بۆیە خودا دەستی درێژ کرد ،ئەوەش هەر ئەو بوونەوەرانەبوو کە نەوەکانی ئادەم لە ناو دەستی الرحمن عز وجل ..!!

[1] -اخرجه ابن حبان (٣٧/١٤) برقم (١٦٣٠).
[2] - البوصيري إتحاف الخيرة المهرة (١٣٦/٧).

له (ابن زید ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إن الله لما أراد أن يخلق آدم بعث ملكا ، والأرض بومئذ وافرة ، فقال : اقب لى منها قبضة ، ائتنى بها أخلق منها خلقا . قالت : فإنى أعوذ بأسماء الله أن تقبض اليوم منى قبضة ، يخلق خلقا يكون لجهنم منه نصيب . فعرج الملك ولم يقبض شيئا ، فقال له : ما لك ..؟! قال : عاذت بأسمائك أن أقبض منها خلقا يكون لجهنم منه نصيب ، فلم أجد عليها مجازا .فبعث ملكا آخر ، فلما أتاها ، قالت لة مثل ما قالت اللأول ، فعرج ولم يقبض منها شيئا ، فقال له الرب مثل ما قال للأول ، ثم بعث الثالث ، فقالت له مثل ما قالت لهما ، فعرج ولم يقبض منها شيئا ، فقال له الرب تعالى مثل ما قال للذين قبله ، ثم دعا إبليس ، واسمه يومئذ فى الملائكة : حباب ، فقال له : اذهب ، فاقبض لى من الأرض قبضة . فذهب حتى أتاها ، فقالت له مثل ما قالت للذين من قبله من الملائكة ، فقبض منها قبضة ،ولم يسمع تحرجها ، فلما أتاه قال الله تعالى : ما أذتك بأسمائى منك ..؟! قال : بلى . قال : فما كان من أسمائى ما يعيذها منك ..؟! قال : بلى ، ولكن امرتنى فأطعتك . فقال الله : لأخلقن منها خلقا يسوء وجهك . فألقى الله تلك القبضة فى نهر من أنهر الجنة ، حتى صارت طينا ، فكان أول طين ، ثم تركها حتى صارت حما مسنونا منتن الريح ، ثم خلق منها ىدم ، ثم تركه فى الجنة أربعين سنة ، حتى صارت صلصالا كالفخار ، يبس حتى كان كالفخار ، ثم نفخ فيه الروح بعد ذلك ، وأوحى الله إلى ملائكته :إذا نفخت فيه من الروح فقعوا له ساجدين ، وكان آدم مستلقيا فى الجنة ، فجلس حين وجد مس الروح ،فعطس ، فقال الله له : أحمد ربك . فقال : يرحمك ربك . فمن هنالك يقال : سبقت رحمته غضبه . وسجدت الملائكة إلا هو قام ، فقال : قال تعالى: ﴿مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسۡجُدَ إِذۡ أَمَرۡتُكَ﴾ [الأَعۡرَاف : ١٢] قال تعالى: ﴿أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ ٧٥﴾ [ص : ٧٥] ، فأخبر الله أنه لا يستطيع أن يعلو على الله ، ما له يتكبر على صاحبه ، فقال: قال تعالى: ﴿أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ٧٦﴾ [ص : ٧٦] .قال : قال تعالى: ﴿فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا﴾ [الأَعۡرَاف : ١٣] إلى قوله : قال تعالى: ﴿وَلَا تَجِدُ أَكۡثَرَهُمۡ شَٰكِرِينَ ١٧﴾ [الأَعۡرَاف : ١٧] وقال الله : إن إبليس قد صدق عليهم ظنه ، وإنما كان ظنه أن لايجد أكثرهم شاكرين )).[1]

[1] - اخرجه أبو الشيخ في العظمة (١٥٦٣/٥) برقم (١٠٤٤) ، و هو حديث معضل .

📖 لە (ابی هریرە ) – خوا لێ رازی بێت – دە گێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((خلق اللهُ آدمَ بيدِه ، ونفخ فيه من روحِه ، وأمر الملائكةَ فسجدوا له فجلس فعطَس فقال : الحمدُ للهِ . فقال له ربُّه : يرحمُك ربُّك ، ائْتِ أولئك الملَأَ من الملائكةِ فقُلْ لهم : السَّلامُ عليكم ، فأتاهم ، فقال : السَّلامُ عليكم . قالوا له : وعليك ورحمةُ اللهِ ثمَّ رجع إلى ربِّه فقال له : هذه تحيَّتُك وتحيَّةُ ذُرِّيَّتِك بينهم ، ثمَّ قبض له يدَيْه فقال : خُذْ واخترْ . قال : اخترتُ يمينَ ربِّي ، وكلتا يدَيْه يمينٌ ، ففتحها له فإذا فيها صورةُ آدمِ وذرِّيَّتِه كلِّهم ، فإذا كلُّ رجلٍ مكتوبٌ عنده أجلُه ، وإذا آدمُ قد كُتِب له عمرُ ألفِ سنةٍ ، وإذا قومٌ عليهم النُّورُ فقال : يا ربِّ من هؤلاء الَّذين عليهم النُّورُ ؟ فقال : هؤلاء الأنبياءُ والرُّسلُ الَّذين أُرسِلُ إلى عبادي ، وإذا فيهم رجلٌ هو أضوءُهم نورًا ، ولم يُكتَبْ له من العمرِ إلاَّ أربعون سنةً فقال : ذاك ما كُتِب له فقال يا ربِّ انقُصْ له من عمري ستِّين سنةً ، فقال رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وعلى آلِه وسلَّم : فلمَّا أسكنه اللهُ الجنَّةَ ثمَّ أُهبِط إلى الأرضِ كان يعُدُّ أيَّامَه ، فلمَّا أتاه ملَكُ الموتِ ليقبِضَه قال له آدمُ : عجِلتَ عليَّ يا ملَكَ الموتِ . فقال : ما فعلتُ فقال : قد بَقِي من عمري ستُّون سنةً . فقال له ملَكُ الموتِ : ما بَقِي من عمرِك شيءٌ ، قد سألتَ ربَّك أن يكتُبَه لابنِك داودَ . فقال : ما فعلتُ ، فقال رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وعلى آلِه وسلَّم : فنسِي آدمُ فنسيت ذرِّيَّتُه ، وجحَد آدمُ فجحدت ذرِّيَّتُه ، فيومئذ وضع اللهُ الكتابَ وأمر بالشُّهودِ)).[١] واتە : کاتێ (خوای گەورە ) ئادەمی دروستکرد ، رووحی کرد بە بەریا پژمی ، ووتی : (الحمدالله ) واتە: سوپاسی خوای کرد بەرێگە پێدانی خوا خۆی ، پەروەردگاری پێ فەرموو : (رحمك الله ) واتە: رەحمەتی خوات لێ بێ ئەی ئادەم ، برۆ بۆ لای ئەو فریشتانە ،بۆ لای ئەوانەی کە دانیشتوون ، بلێ : (السلام علیکم ) واتە: سەلاوی خواتان لەسەر بێ ، ئەوانیش ووتیان: (وعلیکم السلام ورحمە الله ) واتە : سەلاو رحمەت و میهرەبانی خواتان لە سەر بێ ، لە پاشاندا گەرایەوە بۆ خزمەت پەروەردگاری ، فەرمووی : ئەمە سەلاو کردنی تۆ نەوەکانتە لە نێوان خۆیاندا ، (خوای گەورە ) هەر دوو دەستی داخست و فەرمووی : هەلبژێرە کامیان دەوێ ، دەستی راستی پەروەردگارم هەلبژارد هەر دوو دەستی پەروەردگار هەر راست و پیرۆزە لە پاشان دەستی کردەوە ئادەم و نەوەکانی تێدا بوون ، فەرمووی : ئەی پەروەردگارم ئەوانە کێن ..؟! فەرمووی : ئەوانە نەوەی تۆن ، هەموو کەسێ لەوانە تەمەنی لە نێوچاوانی نووسراوە ، یەکێکیان تێدا بوو لە هەر هەموویان جوانترو نوورانی تر بوو ، ئادەم فەرمووی : ئەی پەروەردگارم ئەوە کێیە ..؟ فەرمووی : ئیتر لە رۆژەوە فەرمانکرا بە نووسین شایەت ..!!

[١] - سنن الترمذي برقم (٣٣٦٨).

📖 لە (ابی هریرە ) – خوا لێ رازی بێت – دە گێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لَمَّا خلق اللهُ آدمَ مسح على ظهرِه فسقط من ظهرِه كلُّ نسَمةٍ هو خالقُها من ذرِّيَّتِه إلى يومِ القيامةِ وجعل بين عينَيْ كلِّ إنسانٍ منهم وبيصًا من نورٍ ثمَّ عرضهم على آدمَ فقال أي ربِّ من هؤلاء قال هؤلاء ذرِّيَّتُك فرأى رجلاً منهم فأعجبه وبيصُ ما بين عينَيْه فقال أي ربِّ من هذا فقال رجلٌ آخرُ الأممِ من ذرِّيَّتِك يُقالُ له داودُ قال أي ربِّ كم جعلتَ عمرَه قال ستِّين سنةً قال أي ربِّ زِدْه من عمري أربعين سنةً فلمَّا انقضَى عمرُ آدمَ جاء ملَكُ الموتِ فقال آدمُ أوَلم يبقَ من عمري أربعون سنةً قال أوَلم تُعطِها ابنَك داودَ قال فجحَد وجحَدت ذرِّيَّتُه ونسِي فنسِيَت ذرِّيَّتُه وخطِئ فخطِئت ذرِّيَّتُه))[1]

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : کاتێ (خوای گەورە ) ئادەمی دروست کرد ، دەستی هێنا بە پشتی ئادەمەوە هەرچی رووح لەبەرە لە پشتی دەرچوو ، هەتا رۆژی قیامەت ئەویش بەدیهێنانیانە ، بۆ هەر یەکێکیان لە نێوچاوانیدا بریقەیەکی لە نووردانا، لە پاشاندا پێشانی ئادەمی دان ، ئادەم ووتی : ئەی پەروەردگارم ..!! ئەمانە کێن ..؟! فەرمووی : ئەمانە نەوەی تۆن ..!! جا ئادەم لە ناو هەموو نەوەکانی دا پیاوێکی بینی بریقە کەی ناوچوانی زۆر جوان و دەرەوشاوە بوو ، فەرمووی : ئەی پەروەردگارم ..!! ئەمە کێیە ..؟! فەرمووی : ئەمە پیاوێکە لە نەوەی تۆ لە دواترین نەوەکان دەبێ ، ناوی (داودە ) (علیه السلام ) فەرمووی : ئەی پەروەردگارم ..!! چەندە تەمەنت بۆ داناوە ..؟! فەرمووی : شەست ساڵ ..!! فەرمووی : ئەی پەروەردگارم ..!! لە تەمەنی من چڵ ساڵ ی بۆ زیاد بکە یان بۆ بخەرە سەری ، کاتێ تەمەنی ئادەم تەواو بوو فریشتەی مەرگ یان فریشتەی مردن هات بۆ رووح کێشانی فەرمووی : مەگەر من چڵ ساڵ تەمەن نەماوە ..؟! فەرمووی : ئەی ئەم چڵ ساڵەت نەدا بە (داود)ی کورت ..؟! فەرمووی : ئادەم حاشای کرد ، هەر بۆیە نەوەکانیشی حاشا لە گوفتاری خۆیان دەکەن ..!! ئادەم لە بیری چوو بۆیە نەوەکانیشی زۆر شتیان لە یاد دەچێ ئادەم هەڵەی کرد بۆیە نەوەکانیشی هەڵە دەکەن ..!!

[1] - سنن الترمذي برقم (٣٠٧٦) حسن صحيح .

📖 لە (عمران بن الحصين ) – خوا لێ رازی بێت –دە گێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((أَنَّ النَّبيَّ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ لمَّا قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ١﴾ [الحج : ١] ، إلى قولِهِ : قال تعالى: ﴿يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ٢﴾ [الحج : ٢] قالَ : أُنْزِلَت عليهِ الآيةُ وَهوَ فى سفرٍ ، قالَ : أتدرونَ أيَّ يومٍ ذلِكَ ؟ قالوا : اللَّهُ ورسولُهُ أعلمُ ، قالَ : ذلِكَ يومَ يقولُ اللَّهُ لآدمَ : ابعَث بَعثَ النَّارِ ، قالَ : يا ربِّ وما بعثُ النَّارِ ؟ قالَ : تِسعُمائةٍ وتِسعةٌ وَتِسْعونَ فى النَّارِ وواحدٌ إلى الجنَّةِ ، فأنشأَ المسلِمونَ يبكونَ ، فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ : قارِبوا وسدِّدوا ، فإنَّها لم تَكُن نبوَّةٌ قطُّ إلَّا كانَ بينَ يديها جاهليَّةٌ ، قالَ : فيؤخَذُ العددُ منَ الجاهليَّةِ فإن تمَّت وإلَّا كَمُلَتْ منَ المُنافقينَ وما مثلُكُم والأممِ إلَّا كمثلِ الرَّقمةِ فى ذِراعِ الدَّابَّةِ أو كالشَّامةِ فى جَنبِ البعيرِ ، ثمَّ قالَ : إنِّى لأرجو أن تَكونوا ربُعَ أَهْلِ الجنَّةِ فَكَبَّروا ، ثمَّ قالَ : إنِّى لأرجو أن تَكونوا ثلُثَ أَهْلِ الجنَّةِ فَكَبَّروا ، ثمَّ قالَ : إنِّى لَأرجو أن تَكونوا نِصفَ أَهْلِ الجنَّةِ فَكَبَّروا قالَ : ولا أدرى ؟ قالَ : الثُّلُثَيْنِ أم لا ؟)).[١]

واتە : پێغەمبەر ﷺ لە سەفەردا بوو ئەم ئایەتە دابەزی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ١﴾ تا کو ووتەی ﴿يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ٢﴾ واتە: وریای سزای خوای پەروەردگاربن . ئەی خەڵکینە . بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی، چونکە بێگومان ئەوەی کە ڕوودەدات لەکاتی هاتنی دواڕۆژدا لە ناڕەحەتی و ناهەمواری و لەرینەوە و جوولەی بەهێزی زەوی کە هەموو لایەکانی پارچە پارچە دەبێت زۆر سەخت و سامناك و زۆر گەورەیە، بەشێوەیەك کە ئەندازە و شێواز و چۆنێتیەکەی جگە لەخوای پەروەردگار کەسی تر نایانزانێت ..!! ئەو ڕۆژەی کە دەبینن هاتنی دواڕۆژ وا دەکات دایك منداڵە شیرەخۆرەکەی پێش مەمکی کە شیری دەداتێ لەبیردەکا، بەهۆی ئەو ناخۆشی وناڕەحەتیەی ئەو ڕۆژە کە بەسەریدا هاتووە، وە ئەوەشی کە دووگیان و سك پڕە سکەکەی لەترساندا فڕێدەدات، و ژیری وهۆشیاری خەڵك نامێنێت، و وەکو سەرخۆشیان لێدێت لەسەختی ترس و دژواری بارودۆخەکە، ئەگەرچی لەڕاسیدا سەرخۆش نین بەهۆی مەیەوە، بەڵکو توندی سزا و حاڵەتەکەیە کە فام و هەست وهۆشیانی لا نەهێشتووە ..!!

[١] - سنن الترمذي برقم (٣١٦٨).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئایا دەزانن ئەو رۆژە چ رۆژێکە ..؟! ووتیان : خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن ، فەرمووی : ئەو رۆژەیە کە (خوای گەورە ) بە ئادەم دەفەرموویێت : بەشی دۆزەخ لە نەوەی خۆت جیاکەرەوە با برۆن بۆ ناوی ، ئادەم دەڵێ : ئەی پەروەردگار ! بەشی دۆزەخ لە نەوەی من چەند لە چەندە ..؟! دەفەرموویێت : لە نێو یەك هەزار کەسدا نۆ سەد و نەوەد و نۆ کەسیان بە شی ئاگرە ،لە هەزار کەس تەنیا یەك کەس بەشی بەهەشتە ، موسلمانان دەستیان کرد بە گریان ،پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (میانرەوبن کارو دروست بن ، هیچ پەیامێکی پێغەمبەرایەتی نەبووە ئیلا خەلکانێکی نەفام باوەریان پیێ نەهێناوە ئە لە سەدا نەوەدو نۆیە لە وانە خۆ ئەگەر تەواوی نەکرد ئەوا لە دوو روو ەکان تەواو دەکرێت ، رێژەی ئێوە لە چاو ئەمەتانی تردا وەك خالێك یان نۆکتەیەك یان هەرشتێك وەك نیشانە وایە بەدەستی وەلاخێکەوە یان وەك خالێکە بە تەنیشتی ووشترێکەوە ، لە پاشان فەرمووی : (هیوام وایە ئێوە چواریەکی خەلکی بەهەشت بن ) هاوەلان لە خۆشیاندا دەستیان کرد بە (الله أکبر ) ئینجا فەرمووی : (هیوام وایە ئێوە سێیەکی خەلکی بەهەشت بن ) هاوەلان لە خۆشیاندا دەستیان کردبە (اللّٰه أكبر ) پاشان فەرمووی : (هیوام وایە ئێوە نیوەی خەلکی بەهەشت بن ) هاوەلان لە خۆشیان دەستیان کرد بە (اللّٰه أكبر ) ، راوی فەرمووی : نازانم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (دوو بەش لە سێ بەش یان نا ..؟!

✍ لە (مجاهد) – رەحمەتی خوای لیێ بێت – دەلێت : (خوای گەورە ) ئادەمی دروست لە کۆتا سەعاتی رۆژدا لە رۆژی هەینی ، ئیجا دوای هەموو شتیچکی دروست کرد ..).[1]

✍ لە ریێ (عطاء بن السائب ) لە (سعید بن جبیر ) – رەحمەتی خوای لیێ بێت – دەلێت : (خوای گەورە ) ئادەمی دروست کر لە سەر زەویەك دا پیێ دەلێن : (دحناء ) واتە : لە زەویەکی بەرز ..).[2]

✍لە ریێ (حجاج ) لە (ابن جریج ) – رەحمەتی خوای لیێ بێت – دەلێت : (خوای گەورە ) ئادەمی دروست کرد لە ئاسمانی دونیا ، هەر وەکو فریشتە کان کرنۆشیان بۆ برد لە ئاسمانی دونیا ، بەلام کرنۆشیان نە برد فریشتە لە ئاسمانە کان دا ..).[3]

✍ لە ریێ (ابی روق ) لە (ضحاك ) لە (عبداللّٰه بن عباس – خوا لیێ رازی بێت – لە سەر ووتەی ، قال تعالی: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] دەلێت : (خوای گەورە ) هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد ، واتە: هەموو ئەو ناوانەی کە خەلکی دەیزانن ، وەك مرۆڤ و ئاژەل و زەوی دەشت و دەریاو کێو و کەر و ، وەك ئەو ناوانەی کە ئۆمەتان دەیزانن جگە لە مانەش ..).[4]

---

[1] -اخرجه ابن عساكر (٣٨٠/٧).
[2] -تفسير ابن زمنين (١٢٩/١).
[3] -اخرجه ابو الشيخ (١٠٤٣).
[4] -اخرجه ابن جرير (٥١٤/١).

✍ لەرێ (جویبر ) لە (ضحاك) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] دەڵێت : (خوای گەورە ) ناوی دورست کراوە کانی خۆی فێری ئادەم کرد ، وە گوند و شارو ، چیاو ، شێرو ، ناوی بالندەکان ، وە درختە و دارەکان ، وە ناوی ئەو شتانەی هەبووە وە ئەوەی دەبێت ، هەموو دە گەرێتەوە بۆ زاتی (الله ) تاکو رۆژی قیامەت ، ئەو ناوانەشی ئامادەکرد یان پێشانی فریشتە کانی دا ..).[١]

✍ لە رێ (سعید بن معبد ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت- لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] دەڵێت : (خوای گەورە ) ناوی کتێب یان مصحف فێر کرد ، وە چارە نووسی هەموو شتێکیش نووسی ، تە نانەت ناوی (الفسوە والفسیە ) واتە : ناوی هەموو شتێك وە هەموو کرداری گەورە و یان بچووك ..).[٢]

📖 لە (أنس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری ﷺ فەرمووی : ((يَجْتَمِعُ المُؤْمِنُونَ يَومَ القِيامَةِ، فيَقولونَ: لَوِ اسْتَشْفَعْنا إلى رَبِّنا، فَيَأْتُونَ آدَمَ فيَقولونَ: أنْتَ أبو النَّاسِ، خَلَقَكَ اللَّهُ بيَدِهِ، وأَسْجَدَ لكَ مَلائِكَتَهُ، وعَلَّمَكَ أسْماءَ كُلِّ شيءٍ، فاشْفَعْ لنا عِنْدَ رَبِّكَ حتَّى يُرِيحَنا مِن مَكانِنا هذا، فيَقولُ: لَسْتُ هُناكُمْ، ويَذْكُرُ ذَنْبَهُ فَيَسْتَحِي، ائْتُوا نُوحًا، فإنَّه أوَّلُ رَسولٍ بَعَثَهُ اللَّهُ إلى أهْلِ الأرْضِ، فَيَأْتُونَهُ فيَقولُ: لَسْتُ هُناكُمْ، ويَذْكُرُ سُؤالَهُ رَبَّهُ ما ليسَ له به عِلْمٌ فَيَسْتَحِي، فيَقولُ: ائْتُوا خَلِيلَ الرَّحْمَنِ، فَيَأْتُونَهُ فيَقولُ: لَسْتُ هُناكُمْ، ائْتُوا مُوسَى، عَبْدًا كَلَّمَهُ اللَّهُ وأَعْطاهُ التَّوْراةَ، فَيَأْتُونَهُ فيَقولُ: لَسْتُ هُناكُمْ، ويَذْكُرُ قَتْلَ النَّفْسِ بغيرِ نَفْسٍ، فَيَسْتَحِي مِن رَبِّهِ، فيَقولُ: ائْتُوا عِيسَى عَبْدَ اللَّهِ ورَسولَهُ، وكَلِمَةَ اللَّهِ ورُوحَهُ، فيَقولُ: لَسْتُ هُناكُمْ، ائْتُوا مُحَمَّدًا صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، عَبْدًا غَفَرَ اللَّهُ له ما تَقَدَّمَ مِن ذَنْبِهِ وما تَأَخَّرَ، فَيَأْتُونِي، فأنْطَلِقُ حتَّى أسْتَأْذِنَ علَى رَبِّي، فيُؤْذَنَ لِي، فإذا رَأَيْتُ رَبِّي وقَعْتُ ساجِدًا، فَيَدَعُنِي ما شاءَ اللَّهُ، ثُمَّ يُقالُ: ارْفَعْ رَأْسَكَ وسَلْ تُعْطَهْ، وقُلْ يُسْمَعْ واشْفَعْ تُشَفَّعْ، فأرْفَعُ رَأْسِي، فأحْمَدُهُ بتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِيهِ، ثُمَّ أشْفَعُ فَيَحُدُّ لي حَدًّا، فأُدْخِلُهُمُ الجَنَّةَ، ثُمَّ أعُودُ إلَيْهِ فإذا رَأَيْتُ رَبِّي مِثْلَهُ، ثُمَّ أشْفَعُ فَيَحُدُّ لي حَدًّا، فأُدْخِلُهُمُ الجَنَّةَ، ثُمَّ أعُودُ الرَّابِعَةَ، فأقُولُ ما بَقِيَ في النَّارِ إلَّا مَن حَبَسَهُ القُرْآنُ، ووَجَبَ عليه الخُلُودُ قالَ أبو عبدِ اللَّهِ: إلَّا مَن حَبَسَهُ القُرْآنُ، يَعْنِي قَوْلَ اللَّهِ تَعالَى: {خالِدِينَ فيها} )).[٣] واتە : لە رۆژی قیامەت دا ئیمانداران یان خاوەن باوەران کۆدەبنەوە ، وە دەڵێن : ئەگەر بە کەسێکمان بووتایە کە شەفاعەتمان بۆ بکات لە لای پەروەردگارمان ، دچنە خزمەت ئادەم (علیە السلام ) پێی دەڵێن : تۆ باوکی هەموو خەلکی ، (خوای گەورە ) بە دەستی خۆی تۆی دەرست کرد ، فریشتە کانی کرنۆشیان بۆ بردی یان سووجدەیان بۆ بردی ، ناوی هەمووشتێکی فێر کردی ، شەفاعەتمان بۆ بکە لە لای پەروەردگارت..

[١] - تفسير الثعلبي (١/١٧٨).
[٢] -اخرجه ابن جرير (١/٥١٥).
[٣] -صحيح البخاري برقم (٤٤٧٦).

تا لە م جێگەیەدا دل خۆشمان بکە بمان حەسێنەوە ، ئە فەرمووێت : من لە پپلە یەدام نیم کە ئێوە لێی تێدەکەن . گوناهە کەی خۆیان باس دەکا و شەرم دەکا لە خوای خۆی دەفەرمووێت : بچنە لای (نووح ) (علیه السلام ) کە یەکەم پێغەمبەرێکە خودا رەوانەی کردووە بۆ خەلکی سەر رووی زەمین ، ئەونیش دەچنە لای (نووح ) (علیه السلام ) ئەفەرمووێت : من لە پلەیە دا نیم وەك ئێوە لێی تێدەگەن . دوا کەی خۆی کردوویەتی باسی دەکا کە لە پەروەردگاری کردووە ، کە هیچ شارەزایەکی نەبوو لە بارەیەوە ، شەرم دەکا . ئەفەرمووێت : بچنە لای (خلیل رەحمان ) (علیه السلام ) دەچن بۆ لای ،دەلێت : من لەو پلە یە دا نیم وەك ئێوە لێی تێدەگەن ، ئەفەرمووێت : بچنە لای (موسی ) (علیه السلام) کە بەندەیەك خودا قسەی لەگەل کردووە ، وە تەوراتی پیۆ بەخشیوە ،ئەویش ئەفەرمووێت : من لە پلە یەدا نیم وە ك ئێوە لی تێدەگەن . باسی کوشتنی گیانێکی کرد ، کە فەرمانی پێنەکرابوو بیکوژێ . شەرمی کرد لە پەروەردگار ووتی : بچنە لای (عیسی ) (علیه السلام ) کە بەندەی خودا و پێغەمبەری خودا و کلمەی خوداو رووحی خودا یە ، دە چنە لای ئەو ئەفەرمووێت : من لەو پلەیە دانیم وەك ئێوە لێی تێدەگەن . بچنە لای (ﷴ ) ﷺ کە بندەیەکە خودا لە گوناهی یە کەم و کۆتایی خۆش بووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : دێنە لای من دەچم تا ئیزن یان مۆلەت لە پەروەردگارم وەرگرم ، ئیزن یان مۆلەت ئەدرێم ، کاتێ کە پەروەردگارم بینی کە بە سووجدە دا دەچم یان دەکەوم ، (خوای گەورە ) لە سووجدەدا وازم لێدێنی ئەوەندەی خۆی مەیلی لێبێ ، پاشان فەرمانم پێدەکرێ : ئەی ﷴ ..!! سەرت هەلبرە دوای بکە پێت بدرێ ، قسە بکە گوێت لێ بگیرێ ، شەفاعەت بکە قبول بکرێ ، ئەو کاتە سەر هەلدە برم و ستایشی دەکەم بە ستایشێ کە خودا خۆی فێرم دەکا ، لە دوایدا شەفاعەت دەکەم ، سوورێکم بۆ دیاری دەکرێ ، ئەوانە دەخەمە بەهەشت، پاشان سێهەم جار دەگەرێمەوە ، چوارم جاریش دەچمەوە دەلێم : ئەی خودایە ..!! لە ناو ئاگرا ئەوانە نەبێ کە قورئان بە ندەی کردوون لە ئاگرا تا هەتایی دەمێنەوە هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ [البَقَرَةِ : ١٦٢]..!!

✍ لە رێ (سالم الأفطس) لە (سعید بن جبیر) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] دەلێت : (خوای گەورە ) ئادەمی فێری ناوی هەموو شتێك کرد ، تە نانەت ناوی ووشتر چێل و مەریش ).[1]

✍ لە رێ(أبی بکر ) لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : (خوای گەورە ) ناوی هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد ، وەك : ئەسپ و ئیستر ، ووشتر ، جنۆکە ، ئەژدیها یان درندە ، وە هەمووی دروست کرد بە ناوی خۆی ، ئامادەکی کرد دەستە دەستە یان ئومەت ئومەت ..).[2]

[1] -تفسير الثعلبي (١٧٧/١).
[2] اخرجه ابن جرير (٥١٦/١).

✍ لە (قتادە) – رحمەتی خوا لێ بێت – دەلێت : (خوای گەورە ) ناوە كانی فێری ئادەم كرد ، ناوی ئەو دورست كرا وانەی خۆی كە فریشتە كان نەیان دەزانی ، ناوی هەمووشتێك بە ناوی خۆی ، وە هەموو شتێك بۆ رە گەزەكەی خۆی دەگەراندەوە واتە : هەموو شتێك بۆ جنسی خۆی ..).[١]

✍ لە رێ (الحسن بن صالح ) لە (باوكی ) لە (حمید الشامی ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەلێت : (خوای گەورە ) ناوی ئەستێرەكانی فێری ئادەم كرد ..).[٢]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەلێت : (خوای بەرز بلند ) بالندە كانی كۆ كردەوە ، وە ئاژەلە كان ، وە هەموو مێروولە كانی زەوی ، ئەو ناوانەی فێری ئادەمی كرد ،فەرمووی : ئەی ئادەم ، ئەوە مارە ، ئەوە كەرە ، تەنانەت ناوی هەموو ئاژەلێكی رۆیشتن ،وە هەموو بالندەیە بەناوە كەیەوە ..).[٣]

✍ لە رێ (ابن وهب ) لە (عبدالرحمن بن زید أسلم ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] دەلێت : واتە ناوەی هەموو نەوەكانی فێری ئادەم كرد ..).[٤]

✍ لەرێ (أبی جعفر ) لە (الربیع بن أنس ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] دەلێت : ناوەكانی فریشتە كانە فێری ئادەم كرد ..).[٥]

---

[١] - اخرجه ابن جرير (٤٩٢/١)
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٠/١).
[٣] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٨/١).
[٤] -اخرجه ابن جرير (٥١٨/١).
[٥] -اخرجه ابن جرير (٥١٧/١).

له (ابو هريره ) – خوا لیّ رازی بیّت – دەلیّت : له پیّغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لمَّا خلقَ اللَّهُ آدمَ ونفخَ فيهِ الرُّوحَ عَطسَ فقالَ: الحمدُ للَّهِ، فحمِدَ اللَّهَ بإذنِهِ، فقالَ لَهُ ربُّهُ يرحَمُكَ اللَّهُ يا آدمُ، اذهب إلى أولئِكَ الملائِكَةِ، إلى ملَأ منهُم جلوسٍ فقل: السَّلامُ عليكُم قالوا: وعليكَ السَّلامُ ورحمةُ اللَّهِ، ثمَّ رجعَ إلى ربِّهِ، قالَ: إنَّ هذِهِ تحيَّتُكَ وتحيَّةُ بَنيكَ، بينَهُم فقالَ اللَّهُ لَهُ ويداهُ مَقبوضتانِ: اختَر أيَّهما شئتَ، قالَ: اختَرتُ يمينَ ربِّي وَكِلتا يدَي ربِّي يمينٌ مبارَكَةٌ ثمَّ بسطَها فإذا فيها آدمُ وذرِّيَّتُهُ، فقالَ: أي ربِّ، ما هؤلاءِ؟ فقالَ: هؤلاءِ ذرِّيَّتُكَ، فإذا كلُّ إنسانٍ مَكْتوبٌ عُمرُهُ بينَ عينيهِ، فإذا فيهم رجلٌ أضوَؤُهُم أو من أضوئِهِم قالَ: يا ربِّ مَن هذا؟ قالَ: هذا ابنُكَ داودُ قد كتبتُ لَهُ عُمُرَ أربعينَ سنةً. قالَ: يا ربِّ زِدهُ في عمرِهِ. قالَ: ذاكَ الَّذي كتبَ لَهُ. قالَ: أي ربِّ، فإنِّي قَد جعَلتُ لَهُ من عُمُري ستِّينَ سنةً. قالَ: أنتَ وذاكَ. قالَ: ثمَّ أُسْكِنَ الجنَّةَ ما شاءَ اللَّهُ، ثمَّ أُهْبِطَ منها، فَكانَ آدمُ يعدُّ لنَفسِهِ، قالَ: فأتاهُ ملَكُ الموتِ، فقالَ لَهُ آدمُ: قد عجَّلتَ، قَد كتبَ لي ألفُ سنةٍ. قالَ: بلَى ولَكِنَّكَ جعَلتَ لابنِكِ داودَ ستِّينَ سَنةً، فجَحدَ فجَحدَتْ ذرِّيَّتُهُ ونسيَ فنَسيَتْ ذرِّيَّتُهُ. قالَ: فمِن يومئذٍ أُمِرَ بالكتابِ والشُّهودِ)).[1]

واتە: کاتیّ (خوای گەورە ) ئادەمی دروست کرد ، رووحی کرد بەری و پژمی ، فەرمووی (الحمد لله ) سوپاسی خوای کرد بە ریّگە پیّدانی خوا خۆی ، پەروەردگاری پیّ فەرموو : ( رحمك الله ) رەحمەتی خوات لیّ بی ئەی ئادەم ، برۆ بۆ لای ئەو فریشتانە بۆ لای دەستە یەکیان یان کۆمەلیّکیان کە دانیشتوون ، بەلیّ : (السلام عليكم ) واتە : سلاوی خواتان لیّ بیّ ، ووتیان (وعليك السلام ورحمه الله ) واتە : سلاو لەتۆ ش رەحمەت خوات لیّ بیّ ، لە پاشاندا گەرایەوە بۆ خزمەت پەروەردگاری ، فەرمووی : ئەمە سلاو کردنی تۆ و نەوەکانتە لە نیّوان خۆیاندا ، (خوای گەورە ) هەر دوو دەستی داخست و فەرمووی : هەلبژیّرە کامیانت دەویّت ..؟! دەستی راستی پەروەردگاری هەلبژارد ، هەر دوو دەستی پەروەردگار هەر راست پیرۆزە ، لە پاشاندا دەستی کردەوە ئادەم و نەوەکانی تیّدا بوو ، فەرمووی : ئەی پەروەردگارم ئەوانە کیّن ..؟! فەرمووی : ئەوانە نەوەی تۆن ..!! هەمموو کەسیّ لەوانە تەمەنی لە نیّو چاوانی نووسراوە ..؟! یەکیّکیانی تیّدا بوو لە هەر هەموویان نورانی ترو یان جوان ترو دەروشاوەتر بوو ،ئادەم فەرمووی : ئەی پەروەردگارم ئەوە کیّیە ..؟! فەرمووی : ئەمە داودی کورتە چل سال تەمەنی بۆ نووسراوە ..!! ئادەم فەرمووی : ئەی پەروەردگارم تەمەنی زیاتر بکە ..؟! فەرمووی : هەر ئەوەندەم بۆ نووسیوە ..!! ئادەم فەرمووی : ئەی پەروەردگارم..؟! من شەست سال لە تەمەنی خۆم دەخەمە سەر تەمەنی ئەو ..!! فەرمووی : باشە . (خوای گەورە ) فەرمووی : لەپاشاندا لە بەهەشت نیشتە جیّ بە ئەوەندەی خوا ویستی لە سەر بیّ ، ئینجا دوای ئەوە دابەزە بۆ سەر زەوی ، ئادەم خۆی ئامادەکرد ، فریشتەی مەرگ هات بۆ لای رووحی بکیّشی ، ئادەم فەرمووی : بەراستی تۆ پەلەت کرد من هەزار سالم بۆ نووسراوە ..؟! فریشتەی مەرگ ووتی : بەلیّ . بەلام تۆ شەست سالت داوە یە داود ی کورت ..!! جا نکۆلی کرد و نەوەکانیشی نکۆلیان کرد ، لە بیری چوو ، نەواکانیشی لە بیریان چوو..!! فەرمووی : ئیتر لەو رۆژەوە فەرمانکرا بە نووسین شایەت ..!!

---

[1] -سنن الترمذي برقم (٣٣٦٨).

✍ لە ڕێ (السدی ) لە (ابی مالك وابی صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت – لە سەر ووتە ی قال تعالی: ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ﴾ دەلێت : ئینجا (خوای گەورە )دورست کراوەکانی پێشانی فریشتەکانی دا ..).[١]

✍ لە ڕێ (ابی روق ) لە (ضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ﴾ دەلێت : واتە : ناوی هەموو شتەکانی پێشاندا ،وە ئادەمی فێری جۆرە جیاوازەکانی دورست کراوە کانی کرد ..).[٢]

✍ لە ڕێ (ابن جریج ) لە (مجاهد ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ﴾ دەلێت : خاوەنی ناوەکانی پێشانی فریشتە کاندا ..).[٣]

✍ لە ڕێ (أبی بکر ) لە (قتادە ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت: (خوای گەورە ) ناوی هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد ، وەك : ئەسپ و ئێستر و ، ووشتر و جنۆکە و وەحش و هەر شتێکی بەناوی خۆیەوە ناونا وپێشانی دان ، دەستە دەستە ناوی بردن ..).[٤]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت - لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ﴾ دەلێت : پاشان ناوی ئەم خەلکانەی پێشاندان یان ناوەکانی ئەم خەلکەی خستە ڕوو بۆ فەریشتە ئەوانەی لە سەر زەوی نیشتەجێ دەبن ..).[٥]

✍ لەڕێ (ابن وهب ) لە ( عبدالرحمن بن زید بن أسلم ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : ناوەی هەموو نەوەکانی لە پشتی ئادەم وەرگرت ، ئینجا خستیە ڕوو یان پێشانی فریشتەکانی دا ..).[٦]

✍ لە ( ابن عطیة ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : جیاوازی لە ناوە کانی گەردوونە کەپێشانی دان ، چونکە ناوەکان گشتگیرە بۆ هەموو شتێك لە گەردوونەدا ، خستیە ڕوو دەستە دەستە جۆر بەجۆر ...).[٧]

✍ لە ( ابن عطیة ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : بۆ دەرکەوتنە ، کە (خوای گەورە ) ناوەکانی فێری ئادەم کرد ، وە لە گەل ئەوەی کە جۆری ڕەگەزە کانی خەلکی خستە ڕوو ، ئینجا پێشانی یان خستیە ڕوو بۆ فریشتەکان ، وە پرسیاریان کرد دەربارەی ئەو ناوانەی کە ئادەم فێر بوو ، ئینجا ئادەم ووتن : ئەمە ناوی فلانە و ئەمەش ناوی فلانە ..).[٨]

---

[١] -اخرجە ابن جریر (٥٢٠/١).
[٢] -اخرجە ابن جریر(٥١٢-٥٢٢).
[٣] -اخرجە ابن جریر (٥٢١/١ ).
[٤] -اخرجە ابن جریر (٥٢١).
[٥] -تفسیر مقاتل بن سلیمان (٩٨/١) و تفسیر بغوي (٨٠/١) .
[٦] - اخرجە ابن جریر (٥٢٠/١ ).
[٧] - تفسیر ابن عطیة (١٧١/١).
[٨] -تفسیر ابن عطیة (١٧٢/١).

✍ له رێ ( ابی روق ) له ( ضحاك ) له (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت - له سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى﴾ دەڵێت : ناوی ئەم شتانە پێ راگەیەنە یان بە من بلێن ..).[1]

✍ له (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – له سەر ووتەی ﴿فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى﴾ دەڵێت : واتە : (أخبرونی ) واتە : بە من بلێن ..).[2]

✍ لەرێ (ابی نجيح ) له (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – له سەر ووتەی قال تعالى: ﴿بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ دەڵێت : بە و ناوانەی کە بە ئادەم ووت ..).[3]

✍ له (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – له سەر ووتەی قال تعالى: ﴿بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ دەڵێت : واتە : بوونەوەرەکانی هەموو زەوی یان ئاژەلە کانی هەموو زەوی ..).[4]

✍ لەرێ (السدی ) له (أبى مالك وأبى صالح ) له ( عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – له سەر ووتەی قال تعالى: ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ٣١﴾ دەڵێت : نەوەکانی ئادەم خراپە کاری دەکەنە پیشە لە سەر زەوی ، وە خوێن رێژی دەکەن ..).[5]

✍ لەرێ ( أبى روق ) له ( ضحاك ) له (عبد الله بن عباس ) – خوا لی رازی بیت – له سەر ووتەی قال تعالى: ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ٣١﴾ دەڵێت : ئەگەر راست دەکەن و بۆ لە سەر زەوی جێگرم بۆ خۆم داناوە ، ناوی ئەم شتانە بە من بلێن ..).[6]

✍ له رێ (قتادە ) له (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : کاتێك (خوای گەورە ) ئادەمی دورست کرد ، فریشتە کان ووتیان : خوا هەرچی پێ خۆشە ،با دورستی بکات ، بۆ کەسانێکی زاناترو ئازیزتر لە ئێمە دروست ناکات ، دورست کردنی ئادەم تاقی کردنەوەی ئەوا بوو ..).[7]

---

[1] -اخرجه ابن جرير (٥٢١/١).
[2] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٨/١).
[3] - تفسير مجاهد (١٩٩/١).
[4] تفسير مقاتل بن سليمان (٩٨/١).
[5] -اخرجه ابن جرير (٥٢٣/١).
[6] - اخرجه ابن جرير(٥٢٢/١).
[7] - اخرجه ابن جرير(٥٢٢/١).

قال تعالى: ﴿قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٣٢﴾ [البَقَرَةِ : ٣٢]

قال تعالى: ﴿قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ﴾ واتە: هەموو ووتیان : خوایە تۆ پاکیت لە هەل کەم کوری، قال تعالى: ﴿لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآ﴾ واتە : ئێمە هیچ هیچ نازانین ، مەگەر ئەوەی کە خۆت فێرت کردبین ،قال تعالى: ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٣٢﴾ واتە : بەراستی هەر تۆیت زاناو دانا ..!! بەلێ کاتێك فریشتە کان فەرموویان : پەروەردگار ! تۆ دووریت لە کاری بێ حیکمەت ، وە ئێمە ئاگامان لە هیچ نییە مەگەر ئەوەی تۆ نیشانت داوین ، هەر تۆ خۆت زانای بە هەموو شتێك ، وە هەر تۆ خاوەن حیکمەتی لە هەر کاریچکا ئەیکەی وە کەس رایەی ناکەوێ قسەی تێدا بکات ، یان تۆ خاوەنی حیکمەت و زاناو دانای کەس بۆیەنیە قسەی تێدا بکات لە حیکمەت کار بەجێ و زاناو دانایی تۆ ..؟! یان فریشتە کان ووتیان: ئەی پەروەردگار ! تۆ پاك و بێگەردی و بێ عەیبی بۆ تۆیە ، خۆ ئێمە هیچ زانیاریەکمان نیە تەنها ئەو زانیاریە نەبێت کە خۆت فێرت کردوین ، بەراستی تۆ زۆر زانایی لە کار بەجێ و دانایی حیکمەت دا ..؟! قال تعالى: ﴿قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآ﴾ واتە : ئەوانیش ووتیان : یان فریشتە کان ووتیان : تۆ پاك وبێگەر و یان پیێخەوشی ئێمە هیچ زانیاریەکمان نیە ، مەگەر ئەوەی خۆت فێرت کردبین ، قال تعالى: ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٣٢﴾ واتە : بێ گومان تەنها هەر تۆی پەروەردگاری زاناو کارجوان و کار بەجێ ،هەموو کارە کانیشت پرە لەحیکمەت لەجێ خۆیدان ؟؟!! بێ گومان لە ئایەتی پێشتر (خوای گەورە ) بە فریشتەکان دەفەرموویێت قال تعالى: ﴿فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣١﴾ [البَقَرَةِ : ٣١] واتە : فەرمووی : ناوی ئەو شتانەم پێ بلێن : ئەگەر ئێوە راست دەکەن یان ئەگەر ئێوە شایستە ترن ، مانای وایە شتەکانی پێشان داون ، چونکە ئەگەر ناوەکانی پێشانداوبان ، مانای وایە ناوەکانی فێر کردن ، ئەوانیش واتە فریشتە کان وەلام دەدەنەوە دەلێن : قال تعالى: ﴿قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٣٢﴾ [البَقَرَةِ : ٣٢] واتە : ووتیان : ئەی پەروەردگار ! پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە ، بێجگە لە وەی کە تۆ فێرت کردووین ، ئێمە هیچ زانیارییەکی بەخشراو (وهب ) یە ، زانیارییەکی وەدەستهێنراو (کسبی ) نیە ، واتە : وەك فریشتە و مرۆڤ نیە ، مرۆڤ خوا توانایەکی داوەتێ بۆ خۆی زانیاری بەدەست بێنێ ، بەلام فریشتە کان زانیارییە کەیان لە کەم دەکات و نە زیاد دەکات و زانیارییەك لە لایەن (خوای گەورە ) پێیان بەخشراوە ، (خوای گەورە ) چەدی دابنی هەر ئەوەندەیە ..؟! وە ئەوەی خوا زانیاری ئەوەی نەداوتە فریشتەکان کە ناوی شتەکانی سەر زەوی بزانن ، چونکە فریشتەکان لە سەر زەوی ناژین پێویستیان بەم زانیاریە نیە ،چونکە خوای کار بەجی جۆرە زانیاریەکی فێری فریشتەکان کردوو کە پێویستیان پێ هەیە ، بەلام مرۆڤ بەردەوام زانیاری کەم دەکات و زیاد دەکات چونکە لە سەر زەوی دەژیت پێویستی بە زانیاری هەیە لەسەر زەوی بۆیە دەبێت بەردە وام بە

دوای زانیاری دا بگەرێت لە هەر شوێنی زەوی دە هەبێت بۆ سوود وەرگرتنی خۆی بۆ دونیا بۆ دوارۆژی بێگومان سوودی زانیاری تەنها زانیاری دوار رۆژە چونکە ئەم ژیانە وەك خەوێکە کۆتایی دێت پر لە هیلاکی زەحمەت نەهامەتی تاقی کردنەوەی مرۆڤەکان ،هەر بۆیە فەزل پلەی زانست زانیاری وەدەست هێنان لە لای (خوای گەورە ) پلەیەکی زۆر گەورەی هەیە ، خاوەنی زانستی راست و دروست سەرفراز دەبێت لە دونیا لە دوارۆژ دا ، هەر بۆیە لە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا فەزل پایە زانست دەردەخات ،

📖 لە (أنس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((اطْلُبوا العِلمَ ولو بالصِّينِ؛ فإنَّه فَريضةٌ على كلِّ مُسلمٍ)).[1] واتە : فەرمووی : داوای زانست زانیاری بکە ئەگەر لە وەلاتی صین بێت ، چونکە واجبە یان فەرزە لە سەر هەموو موسلمامانێك دوای زانست بکات ..!!

جا بێگومان (خوای گەورە ) فەزل گەورەیی زانست زانیاری بە گەورە دادەنێن بۆ ئەوەی کە داوای زانستی شەرعی دەکات ، ئەوەی کەفریشتەکان دان بە و زانستە زۆرە دانایی کار جوان پر لەحیکەت پەروەدگار دادەنێن ، شەرف فەزلی زانست و زانایان لە بەرانبەر نەزانانەوە پلە و پایەی زاناو فێر خواز روون دەکاتەوە ،وەك لە ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

📖 لە (أبو الدرداء ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((من سلَكَ طريقًا يَبتَغي فيهِ عِلمًا ، سلَكَ اللَّهُ بِهِ طريقًا إلى الجنَّةِ ، وإنَّ الملائِكَةَ لتَضعُ أجنحتَها لطالبِ العلمِ وإنَّ العالِمَ ليستغفرُ لَهُ مَن في السَّمواتِ ومَن في الأرضِ حتَّى الحيتانُ في الماءِ وفضلُ العالِمِ على العابدِ كفَضلِ القمرِ على سائرِ الكَواكبِ إنَّ العُلماءَ ورثةُ الأنبياءِ إنَّ الأنبياءَ لم يورِّثوا دينارًا ولا دِرهمًا إنَّما ورَّثوا العِلمَ فمن أخذَ بِهِ فقد أخذَ بحظٍّ وافرٍ)).[2] واتە : هەر کە سێك ریگایەك بگرێتە بەر بۆ بەدەست خستنی زانستی شەعی ئەوا (خوای گەورە ) رێگە یەك لە رێگاکانی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات ، فریشتە کانیش بالیان رادەخەن بۆ ئەو کەسەی دەگەرێت بەدوای زانستی شەرعی دا لەبەر ئەوەی رازین بەوەی بۆی دەگەرێن ، هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمانە کان و زەویدا دوای لێ خۆشبوون دەکەن بۆ شەرع زانەکان تەنانەت ماسیش لە دەریادا ، گەورەی چاکێتی شەرع زان بە سەر بەندەی خوا پەرستدا وەك چاکێتی و جوانی مانگ وایە بە سەر هەموو ئەستێرە کانەوە ،زانایان میراتگری پێغەمبەرانن ، پێغەمبەران دینار و دەرهەمیان بە میرات بە جێ هێشتووە ، بەلکو تەنها زانستی شەرعیان بە جێ هێشتووە ، جا هەر کەسێ بە دەستی خات ئەوا بە شێکی زۆری بەدەست خستووە ..!!

[1] -الامام أحمد في (المنتخب من العلل للخلال ) ص ١٠٩ .
[2] - سنن الترمذي برقم (٢٦٨٢).

ووتەی قال تعالى: ﴿لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ﴾ ئەم ووتەیە بە نەناسرا هاتووە سیاقە کەشی نەرێ یە یان نەفی تێدایە ، چونکە سیاقی رستە کە هەموو زانستێك دەگرێتەوە ..؟! بێ گومان ئەم ئایەتە بەلگەیە لە سەر ئەوەی ئە گەر بەندەی خوا حیکمەتی هەندیچك شتی لیچ دیار نەبوو لە دورستکراوەکانی (خوای گەورە ) و شەرعی خوا ، ئەوا واجبە فەرزە دەبێت تەسلیم ببێت ، دەبێت عەقل و بیرو هۆشی خۆی بە کار بەهێنی ..؟! هەروەها جێگیر کردنی ناوی (العلیم ) بۆ (خوای گەورە ) هەروەها بەلگەیە بۆ جێگیر کردنی سیفەتی زانست بۆ (خوای گەورە ) ، وە بێ گومان دەبێت مرۆڤ قەدری نەفسی خۆی بزانێت ، بانگەشەی زانستێك نەکات زانستی پێ نەبێت ، چونکە ووشەی من نازانم باشترە لەوە قسە بکەیت بێ زانست ، وە جێگیر کردنی ناوی (الحکیم ) بۆ (خوای گەورە ) هەروەها بەلگەشە بۆ جێگیر کردنی حیکمەتێکی تەواو بۆ (خوای گەورە ) چونکە (خوای گەورە ) کردەوەکانی بنیات نراون لەسەر حیکمەتێکی تەواو بۆ (خوای گەورە ) ، کە (خوای گەورە ) کردەوەکانی بنیات نراون لەسەر حیکمەت ،هیچ کردەوەیەکی بێ حیکمەت نیە ، پێچەوانەی ئەوانەی دەلێن دەکرێت (خوای گەورە ) کردەوەیەکی بکات بێ حیکمەت ، ئەمەش وتەیەکی ترسناکە ، چونکە بێ حیکمەتی دەدرێتە پال منالّ و شێت و کەسی ساویلکە و کەم عەقل ، چۆن دەبێت بێ حیکمەتی بدەیتە پال (خوای گەورە) ، بەلێ فریشتە کان (خوای گەورە ) یان بە پاك دانا ...!! هەر بۆیە فریشتەکان (خوای گەورە) یان زۆر بە گەورە دانا چونکە یەکسەر دانیا پێدانا بە تەواو یان (کامل ) ی (خوای گەورە ) ، بە پاك و بێ گەردیان دانا لە نەزانیدا ، هەر وەك ووتەی قال تعالى: ﴿سُبْحَٰنَكَ﴾ بەلێ دانیان پێدانا بە نەفسی خۆیان کە هیچ زانستیان لا نیە ، وە دانیان نا بە فەزل و گەورەیی (خوای گەورە ) بەوەی کە ئەوەی هەرچی علم و زانست زانایی هەبێت هەر (خوای گەورە ) زانا و دانایە و کار جوان و کار بەجێ یە لە بەر ووتەی قال تعالى: ﴿لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾﴾ واتە : ئێمە هیچ زانستێکمان نیە جگە لەوە نەبێت کە خۆت فێرتکردوین، تەنها خۆت زانا و شارەزای بە کاروباری دروستکراوەکانت، و دانایت لە بەڕێوەبردنتدا ..؟!

📖 لە (عیاض بن حمار المجاشعي )- خوا لێ رازی بێت – دە گێڕێتەوە دەلێت : ((أَنَّ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ قالَ ذَاتَ يَومٍ في خُطْبَتِهِ: أَلاَ إنَّ رَبِّي أَمَرَنِي أَنْ أُعَلِّمَكُمْ ما جَهِلْتُمْ، ممَّا عَلَّمَنِي يَومِي هذا...)).[1] واتە : کە پێغەمبەری خوا ﷺ رۆژێکیان لە ووتارێکیدا فەرمووی : بزانن کە پەروەردگار فەرمانی پێ کردوومە ، ئەوەی کە نازانن فێرتان بکەم لەوەی کە لەم رۆژەدا فێری کردوومە ...!!

[1] -صحيح مسلم برقم (٢٨٦٥).

بەڵێ بێ گومان هەموو علم و زانسێك بە ستراوە بە راست گۆیی ، بۆ ئەوەی زیاتر راست گۆبیت بۆ گەران بە دوای حقیقەت و راستیە کاندا ، یان بۆ ئەوەی زیاتر و زیاتر راست گۆ بیت بۆ گەران بەدوای ناسینی (خوای گەورە ) زانست زانیاری زیاتر بەدەست بهێنی ، هەر وەك ئادەم (علیە السلام ) دوای زانیاری زۆر بەرزی کرد لە (خوای گەورە ) ئینجا (خوای گەورە ) زانست زانیاری فێرکرد پی بەخشی کەچی ئەو زانست زانیاریە بە فریشتە کان نەدا ..؟! بێگومان هەموو مرۆڤێك بەردەوام دەبێت فێری زانست بێت ، جا زانستی دونیایی یان زانستی شەرعی ، قوتابی زانستی شەرعی نابێت خۆ بەگەورە بزانێت بەلکو دەبێت سادە و ساکار خۆ نیشان بدات ، هەر ووشەیەك هاتە سەر زمانی دەبێت بلێ نازانم چونکە وەلام دانەوەی نازام نیوەی زانست و زانیارەیە کەیەتی ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ١٦٩﴾ [البَقَرَةِ : ١٦٩] واتە: وە هەر شەیتانە فەرمانتان پێ ئەکات کە قسەیەك بدەنە پاڵ خوای گەورە کە زانیاریشتان پێ نیەو خۆیشتان نازانن، کە هەموو کافرو بیدعەچییەك دەگرێتەوە کە بەبآ زانیاری و بەڵگە کوفرو بیدعە دەکەن..!! کە (ئیمامی غەزالی ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت :( خەلکی بەگشتی بۆ ئاسایی یە  کە تاوانی گەورە ئەنجام بدەن ، بۆی ئاسایی نیە ئەوەی دەربارەی (خوای گەورە ) بلێن : بلێ .  نایزانم ) بەدلنیاییەوە ئەوەی کەپرسیار دەربارەی ئایەتێك دەکات بەلێن : نایزانین پشت بە خوا دەرباریە ئەم ئایەتە زانیاری کۆ دەکەینەوە یان بلێن دەربارەی ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکان بلێن ، نایزانین چونکە زانیارم نیە پشت بەخوا زانیاری بەدەست دەهێنم ، چونکە زانستی شەرعی بونیادی هەموو کۆمەلگایە کە ئەگەر بە دورستی و ئەجتهادەوە کاری پێ بکەین ، لە ژیانی رۆژانەماندا بێ کەم کوری بە تەواو زانست و زانیاری  و تێ گەیشتن لە  ئایەتە کانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ...!!

📖 لە (جبير بن مطعم ) – خوا لێ رازی بێت – دە گێرێتەوە دەلێت : ((أنَّ رجلًا أتى النبيَّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم ، فقال : أيُّ البلادِ شرٌّ ؟ قال : لا أدري فلما أتى جبريلُ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم ، قال : يا جبريلُ ، أيُّ البلادِ شرٌّ ؟ قال : لا أدري حتى أسألَ ربي ، فانطلَق جبريلُ ، فمكَث ما شاء اللهُ ، ثم جاء ، فقال : يا محمدُ ، إنَّكَ سألْتَني أيُّ البلادِ شرٌّ ؟ قلتُ : لا أدري ، وإني سألتُ ربي ، تبارَك وتعالى ، فقلتُ : أيُّ البلادِ شرٌّ ؟ قال : أسواقُها)) .[١] واتە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی : چ ولاتێك بێ خیرە و شەری تێدایە ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : نایزانم ..!! ئینجا (جبریل ) (علیە السلام ) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی  جبریل  چ ولاتێك بێ خیرە و شەری تێدایە ..؟! ئەویش ووتی : نازانم هەتاکو پرسیار لە پەروەردگار نەکەم ، جبریل بەرێکەوت ، هەر بۆیە تا ئەو کاتە خودا ویستی مایەوە ، پاشان هاتەوە  فەرمووی : ئەی ﷴ تۆ پرسیارت کرد چ وەلاتێك بێ خیرە و شەری تێدایە ..؟! ووتم : نایزانم ..!! بەلام من پرسیارم لە پەروەردگارم ، (تبارك وتعالى ) کرد ، ووتم : چ وەلاتێك بێ خیرە شەری تێدایە ..؟!  فەرمووی : بازارە کان  یان (أسواقها ) ..؟! بەلێ لەم فەرموودەیە بۆمان دەردەکەوێ خیر تەنها لە مەزگەوت وشوینە کانی زانست و زانیاری تێدایە شەر و خراپەکاری نەفامی جهل تەنها لە بازارەکان دایە ..؟!

[١] - أخرجه ابو يعلي في (المسند ) (٤٠٠/١٣) ، والطبراني في الكبير (١٢٨/٢).

✍ لە ڕێ (أبی روق ) لە (ضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) - خوا لێ ڕازی بێت - لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ﴾ دەڵێت : ڕاست گۆیی یان پاك وبێ گەردی بۆ خوا ، كێ هەیە شتە پەناهیەكان بزانێت یان (غیب ) بزانێت جگە لە (خوای گەورە ) ، واتە : فریشتە كان دەڵێن : ئێمەش تۆ بە دەگەین بۆ تۆ ئەی پەروەردگار ..!! ).[١]

✍ لە (عبد الله بن عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەڵێت : (عمر) و (علی ) و هاوەڵان لە لایان بوون _ خوا لێ یان ڕازی بێت – ووتیان : ( لا إله إلا الله ، والحمد الله ، والله أكبر ) ئێمە دەی زانین ، بەڵام (سبحان الله)..؟! (علی ) – خوا لێ ڕازی بێت – ووتی : ئەمە ووشە یەكە (خوای گەورە ) بۆ خۆی زۆری پێ خۆشە یان زۆر خۆشەویستە لە لای ، وە لێ ڕازیە ، ئەو كەسە شی خۆشدەوێت كە دەی لێت ..!! ).[٢]

✍ لە ڕێ (أبی شهب ) لە ( الحسن البصری )- ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت: (سبحان الله ) ناوێكە خەلكی ناتوانن لاسایی بكەنەوە ، یان هاوشێوەی ئەم ناوە بێنەوە ..!! ).[٣]

✍ لە ڕێ (النضر بن عربي ) لە (میمون بن مهران ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : پرسیار كرا دەربارەی (سبحان الله ) ووتی : ناوێكە شكۆمەندی و گەورەیی (الله) دەكات ، وە لە خراپەكای ڕزگاری دەبێت ئەوەی بەردەوام بی لێ ..!!).[٤]

✍ لە ڕێ (أبی روق ) لە (ضحاك ) لە (عبدالله بن عباس ) - خوا لێ ڕازی بێت - لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿لَا عِلۡمَ لَنَآ﴾ دەڵێت : فریشتە خۆیان تبریا كرد یان خۆیان یەك لای كردەوە لەوەی كە بە هیچ شتە پەنهاناكان یان (غیب) نازانن ..!! قال تعالى: ﴿إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآ﴾ تەنها ئەوانەی كە خۆت فێرت كردووین ، یان ئەوەی كەفێری ئادەم كردووە ..!!).[٥]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿قَالُواْ﴾ واتە : فریشتەكان ووتیان : قال تعالى: ﴿سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٣٢﴾ (خوای گەورە ) پێیان دەفەرمووی : چۆن بانگەشەی شتێك دەكەن كە نایزانن و هێشتا دروست نەبووە ، وە نەتان بینیوە ..؟! ئێوە نازانن كێ دەبینن ..!!).[٦]

---

١ -اخرجه ابن جرير (٥٢٨/١).
٢ -اخرجه ابن ابي حاتم (٢٧/١، ٨١).
٣ -اخرجه ابن ابي حاتم (٨١/١) (٣٤٥).
٤ -اخرجه ابن ابي حاتم (٨١/١) (٣٤٤).
٥ -اخرجه ابن جرير (٥٢٨/١).
٦ -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٨/١).

✍ لەرێ (علی ) لە (عبد الله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ﴾ دەڵێت : زانایە ، واتە ئەو علم و زانستی تەواو کامل و بێ هیچ نقص و کەم کوریەکە ..!! ).[1]

✍ لەرێ (علی ) لە (عبد الله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿ٱلۡحَكِيمُ ۝٣٢﴾ دەڵێت : ئەو لە ژێری دانایی دا تەواو کامل و بێ هیچ نقص و کەم و کوریە ..).[2]

✍ لە رێ (الربیع بن أنس ) لە ( أبی العالیه ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿ٱلۡحَكِيمُ ۝٣٢﴾ دلێت : واتە :حکیمە لە فەرمانەکانی یان دانایە لە فەرمانەکانی دا ..).[3]

تێبینی / ووشەی ﴿عَلِيمٌ﴾ ووشەیەك صیغەی مبالغەیە واتە : خاوەن زانست و زانیاری زانایی زۆر تەواوە کە هیچ کەم و کوری لە زانست و زانیاری و علیمی دا نیە ، ئەم ناوە وەسفی عیلمی زانست و زانیاری پەروەردگار دەگەیەنێ ، لە قورئانی پیرۆز دا ووشەی ﴿عَلِيمٌ﴾ سەدو شەش جار (١٠٦) هاتووە .

ووشەی ﴿حَكِيمٌ﴾ واتە : خاوەن دانایەکی تەواوە هیچ بەدیهێنراویچك لێ دەرناچێ ، وە فەرمان ناکات بەهیچ شتێك ئیلا حیکمەتێکی تێدایە ، چونکە حیکمەت بریتیە لە دانانی شتێك لە شوێنی شایستەی خۆی دا ، وە دانایە بەچاکە و بەخششی خوا بەسەریانەوە ، وە کار جوان و کار بەجێ ، چونکە ئەو زاتە : هەموو بریار و فەرمانە کانی لە سەر (حیکمەتە ) ، ئەم ناوە وەسفی حیکمەتی پەروەردگار دەگەیەنێ ، لە قورئاندا سی و نۆ جار (٣٩) هاتووە .

[1] -اخرجه ابن جرير (٥٢٩/١).
[2] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨١/١) (٣٤٥).
[3] - اخرجه ابن ابي حاتم (٨١/١) (٣٤٨).

قال تعالى: ﴿قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٣٣﴾ [البَقَرَةِ : ٣٣]

قال تعالى: ﴿قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ﴾ واتە : (خوای گەورە ) فەرمووی : ئەی ئادەم ، قال تعالى: ﴿أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ﴾ واتە: ناوی ئەو شتانە یان پێ بلێ ، قال تعالى: ﴿فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ﴾ واتە : جا کاتێك کە ناوەکانی پێ ووتن ، قال تعالى: ﴿قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ﴾ واتە : (خوای گەورە ) فەرمووی ئەی پێم نە ووتن ..؟! قال تعالى: ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: بێ گومان من ئاگادارم بە نهێنی ئاسمانە کان و زەوی ،قال تعالى: ﴿وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ﴾ واتە: وە ئاگادارم بەوەی کە ئاشکرای دەکەن ، قال تعالى: ﴿وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٣٣﴾ واتە : وە بەوەش کە دیشارنەوە ..!! بلێ (خوای گەورە ) فەرمووی : ئەی ئادەم ناوی ئەو شتانەیان پێ بلێ . ئینجا کاتێك هەوالی ناوەکانیانی پێدا ، واتە : ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین ئادەم لێرە دا دەبێتە مامۆستا و فێرکەر بۆ فریشتە کان ، کەچی پێشتر باسمان کرد کە ( خوای گەورە ) ناوی هەموو شتە کانی فێری ئادەم کرد ، ئەلێرەدا ئادەم وەك مامۆستایەك یان وەك کەسێکی فێر ناوەکان فێری فریشتەکان دەکە ، بە وە ی کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت: ﴿قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ﴾ واتە : کاتێك (خوای گەورە ) فەرمووی : ئەی ئادەم هەموو ئەو ناوانیان پێ بلێ ، ﴿فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ﴾ واتە : کاتێك ئادەم ناوی هەموو شتە کانی پێ ووتن ،ئینجا (خوای گەورە ) وەلامی فریشتە کان دەداتەوە دەفەرمووی: قال تعالى: ﴿قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٣٣﴾ واتە : (خوای گەورە ) فەرمووی : من پێم نە گوتن کە نهێنی شتە غیب و پەنهانیەکان ئاسمانەکان و زەوی دەزانم ..؟! وە دە زانم ئەوەی بە دیاری دەخەن ئەوەشی دەیشارانەوە ..؟! کە بریتیە لەوە کە باسی خۆتان دەکەن ، کە ئێوە هەمیشە سەر گەرمی بەدوور گرتنی (خوای گەورە) ن لە کەم و کوریی و ستایشکردن و بە پاکگرتنی لە عەیب و کەم کوریی بۆیە شایستەیی جێنشینیێتی خوا تان هەیە ..؟! وە ئەوەی ك ئاشکرایا کردووە ، ئەوە بووە کە باسی ئادەمیان کردووە کە خراپە دەکات لە زەویدا خوێن دەرێژێ ، لێرە دا وا دیارە کە (خوای گەورە ) نەی فەرمووی : ئادەم خوێن رێژی ناکات ، بەلام (خوای گەورە ) دادگەر و حیکم و کار جوان و کار بەجێ یە لە فەرمانەکانی دا ، بەلام (خوای گەورە ) سەرنجی فریشتەکانیشی راکێشاوە ، کە ئەگەر ئادەم و نەوەکانی خراپە کاری بکەن بەلام چاکە کاریش دەبن ، وە ئەگەر کەم کوریان هەیە ، لە هاندەر و خراپە و شەر ، ئەوا فەزل رێز ئیمتیازیشیان هەیە کە لە ئێوە دانیە ، بەلام هەلبەتە کە فریشتە کان زانیویانە کە حیکمەتێکی گەورەی تێدایە لە دەرست کردنی ئادەم ، بەلام فریشتە کانیش لەگەل ئەوەشدا هەمیشە سەرگەرمی خوا پەرستی و بەندایەتی تسبیح و تقدیسی (خوای گەورە ) بوون ، لە کۆتایدا (خوای گەورە ) فریشتەکانی نەکردە جێنشین ، سەر ئەنجام (خوای گەورە ) حیکمەتەکەی بۆ دەرخستن بە باشی ..؟!

ئەوەی پێویستە ئەم ڕووداوەی ئادەم فریشتە کان لە چەند خاڵێك دا ڕوون دەکەینەوە لەم ئایەتەدا :

یەکەم : وەك ئەوەی کە (خوای گەورە ) ئادەمی دروست کردووە لە خاك و گل دا ، هەروەها فریشتە دروست کردووە لە نوور یان ڕووناکی ، فریشتە : بدەنی نەرم و ناسکە ، وە بە چاو نابیرێن ، مەگەر بە شێوەی خرق عادە نەبێت ، واتە : لە توانای بەدەری ئادەمیزاد دا بە فەرمانی (خوای گەورە ) دە بینرێت ، وەك ئەوەی کە فریشتەی نیگا یان وەحی لە لایەن (خوای گەورە ) وەحی بۆ پێغەمبەر مان هێنا جبریل (علیە السلام ) ، ئەم دروست کراوەی خوا واتە : فریشتە نێر مێ یان نیە ، وە بە نا تەواوی دورست نەکراون ، بەڵکو تەواون هیچ کەم کوریان نیە لە عیب پاك و بێگەردن ، واتە : بە ناتەواوی پەیدا نابن ، بەڵکو تەنها بەفەرمانی (خوای گەورە ) پەیدا دەبن ، وەك دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ١١٧﴾ [البَقَرَةِ : ١١٧] واتە : وە خوای بەرز و بڵند و پایەبەرزە کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەوی بێ ئەوەی لەسەر نمونەیەکی پێش وەخت دروستی کردبێن . خۆ قەدەری شتێکی هەبێت، ئەوا تەنها پێی دەڵێت ( کن = ببە )، ئەویش دەستبەجێ دەبێت ..!! هەموو فریشتە کان بێ تاوان و بێ گوناهن بە هیچ شێوەیە لە فەرمانی (خوای گەورە ) دەرناچن ، بۆ هەمیشە چاوەرێ فەرمانە کانی (خوای گەورە ) دەکەن ، کە جێ بەجێی بکەن ، هەر گیز سەرپێچی ناکەن.

هەروەها (خوای گەورە) جنۆکە یان (جن ) دروست کردووە لە ئاگر ، کە ئیبلیس یان شەیتان یەکێك لە نەوەی جنۆك یان (جن ) ئەویش لە قبیلەی جنۆکەکانە سەرۆکی هەموو جنۆکەکان بووە خەزێنەداری بەهەشت بوو ، جنۆکە بدەنی نەرم لە تیفە ، ئەوان لە ئاگر دروست بوونە ، بەلام ئەوان نێرو مێیان هەیە ، بە ناتەواوەتی پەیدا دەبن ، واتە : نقصیان هەیە کەم و کوریان هەیە ، کەواتە جنۆکە تاوان باور بێ تاوانی هەیە ، وە دەلیچن جنۆکەی کافرو جنۆکەی موسلمان ، ئەوانیش بە شێوەی خرق عادە نەبێت دەر ناکەون ، ئەوان گوناهو تاوان دەکەن ، بەلام چاکە کاریشیان هەیە ، ئەوان بە دوو شێوە دەرکەون بە چاك و بە خراپ یان بە پاك بە پیس دەردەکەون ..؟!

دووەم : ئەم باسە دەربارەی باسی نیعمەتێکی (خوای گەورە ) یە بۆ باوکە ئادەم ، کە هەڵبژارد بۆ جێنشینی خۆی لە سەر زەوی ، وە ئادەمی کرد بە مامۆستا بۆ فریشتە کان فێری ناوەکانیان بکات ، وە فەرمانی بە فریشتە کان کرد بە شایستەی بزانن ڕێزی لێ بگرن ، دان بنێن بە پایە بەرزی ئادەم ..!!

سێ یەم : بێ گومان ئەم باسە باسی شتە پەنهانیەکان و شتە شاراوە کان و شتە غیبە کانە ، ئاماژەیەکە بۆ بناغەی یان بنچینەی دروست کردنی ئادەمیزاد ، وە باسی ئەوەشی نە کردووە ئەو فریشتانەی کە (خوای گەورە ) قسە ی لە گەل کردوون هەموو فریشتە کان بوونە ..؟! یان فریشتە نزیکە کانی عەرشی خۆی یان بارەگای خۆی ..؟! هەروەها ناوی ئەوەی نەبردووە ئەم باسە بە شێوەی وەحی و ئیلهام بووە بۆ فریشتە کان ، یاخود فەرمانی کردبێت لە شوێنك دا ئامادەبن بە وێنەی ووتاری لە گەل (موسی ) (کلیم اللە ) دا قسەی لە گەل کردوون ، بێ گومان ئەو شتانە هەر هەمووی زانیاری علیم ی (خوای گەورە ) ئێمە زانیاری مان نیە ..!!

چوارەم : ئەو باسە گفتوگۆیەی (خوای گەورە ) لە گەڵ فریشتە کان ، هەر بۆ ئەوە بووە کە (خوای گەورە ) رێزو پایەی ئادەم یان بۆ دەربخات بۆ فریشتە کان ، وە فەرمان بدە کە بە گەورەیی و رێز پلە پایە وە تەماشای ئادەم بکەن ، ئیتر بێ گومان بۆ ئەوە نەبووە کە (خوای گەورە ) راوێژ بکان بە فریشتە ، چونکە خۆی حکیم و علیم ، واتە زانا و دانایە لە کار بەجێی یان کار جوانی .؟!

پێنچەم : ئەم پسیارەی کە فریشتە کان کردیان ، لە رووی رەخنە گرتنەوە نەبوو لە (خوای گەورە ) ، یان لە سەر بنچینەی خراپی ئادەم نەبوو ، چونکە ناو بردنی ئادەم بە خراپە لە پێش دورستکاری خۆیان کە دروست کەری ئادەمیشە (الله ) تبارك و تعالی ، هیچ مەنق و لۆژیك نیە ناوی بە خراپە بهێنن فریشتە کان ، بەلکو پرسیار کردن بوو لە ژیانی ئادەم حیکمەتی (خوای گەورە ) لە دروست کردنی دا چونکە حیکمەتەکانی (خوای گەورە ) فریشتە کانیش نازانن ..؟!

بەلێ ئەم ئایەتەی (٣٣) سورەتی البقرە دەرخستنی رێزو پایەی ئادەم لە لای فریشتە کان ، کە دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٣٣﴾ [البَقَرَةِ : ٣٣] واتە : فەرمووی : ئەی ئادەم ، دەسا تۆ ناوی هەموو ئەوانەیان پێ بلێ بۆیان هەلدە.! کاتێ ئادەم هەموو ناوێکی بۆ هەلدان یان پێ ووتن ..!! ئینجا (خوای گەورە ) پێ فەرموون : من بە ئێوە نە ووت ، کە هەر خۆم بە نهێنیەکانی یان غیبیە کانی ئاسمان و زەوی دەزانم ، هەر چی ئێوە بیشارنەوە و یان بیدەرکێنن دەیان زانم ..؟!

فێر کردنی ئادەم و پێشاندانی ناوەکان بەلگەیەکی روون و ئاشکرایە بۆ شەرەفی مرۆڤ بەسەر دروستکراوەکان ، بەلگەیە بۆ فەزلی زانست بەسەر عیبادەت ، چونکە فریشتە کان زیاتر عیبادەتیان هەبوو لە ئادەم ، لەگەل ئەمەش شایستە ی جێنشین نەبوون ، لەسەر ئەمە مەرجی خیلافەت زانستە..؟! پرسیار لێرە دایە ئایا ئەم ئایەتەی (٣٣) سورتی البقرە ئەصلە بۆ دانانی ئیمام و حاکم ..؟! جێنشین یان خلیفە گوێرایەلی دەکرێت بۆ ئەوەی لە سەر یەك ووشە کۆببنەوە ، بۆ ئەوەی بریارە کانی ئەحکامەکانی جێ بەجێ بکرێن ، و جیازانی نیە لە نێوان زانایان بۆ واجب دانانی جێنشین یان خلیفە ، بێ گومان هەموو زانایان لە سەر ئەوە یەك دەنگن بە جواب دانانی جێنشین یان خلیفە بۆ حوکمرانی بریار دانی ئۆمەت یان وەلات ، جا پێشەوایەکە شیاو شایستەی جێنشین بێت ، ئەویش مەرجی جێنشینی تێدا هەبێت ، هەربۆیە مەبەست لە دروست کردنی ئادەم و جێنشین بۆ سەر زەوی ئەوە بوو بۆئەوەی کە زەوی تێدا ئاوەدان بکاتەوە ئەم خوێن رشتنە تێدا نەمێنی ئەوەی کە جنۆکەکان پێش ئادەم ئەنجامیان دا لەسەر زەوی ، بۆیە (خوای گەورە ) رێز و پلە و پایەی بە ئادەم بەخشی زیاتر لە فریشتە و پەری یان جنۆکەکان ، ئەوە بۆ کردیە جێنشین لە سەر زەوی بۆ ئەوەی بمێنیتەوە بژیت ، زەوی بۆ بووە بە شوێنی تاقی کردنەوەی ئادەمیزاد چاکە و خراپەی ئەنجام دەدا ، هەر بۆیە کەس بە تاوانی باوکە ئادەم سزا نادرێت یان بێ بەش نابێت لە بە هەشت دا ، چونکە ژیانی دونیا تاقی کردنەوەی مرۆڤە ویستی هەبێت بۆ ئیمان ئەو رزگاری دەبێت لە سزایی دوا رۆژ ، ئەویش ویستی هەبێت بۆ کافر بوون ئەوا دەچێتە دۆزەخەوە و رزگاری نابێت لە سزای دوا رۆژدا ..؟! بە هەمان شێوە کردەوەی چاکە پاداشتی دەست دەکەوێت کردەوەی خراپە سزادەدرێت لە سەری ..؟!

بێ گومان ئەوەی کە رەهایە  یان مطلق ، ئەوەی کە زانینی خودا رەهایە ، دانایی یان  کار جوانی کار بەجێی رەهایە ، داد پەروەری یان داگەری خودا رەهایە ، ویستی یان ئیرادەی رەهایە ، ئینجا نارەزایی دەر برین یان پرسیار کردن لە کار بەجێ یان لە کار جوانی علم و زانستی یان زانیاری خودا پێویستی بە چارەسەر کردنی ئیمان ویان باوەر هەیە چونکە ئەوانەی کە باسمان کرد هەمووی مطلق بە رەهایی بۆ زاتی خودا دە گەرێتەوە ، چونکە بەدلنیایەوە هیچ پرسیارێك یان نارەزایەك یان هیچ شتێك لە خۆ ناگرێت کە جێگای گومان بێت ،  وە لێرە دا فریشتە کان بە نەزانی بە خواری مامەلەیان لە گەل ئەم روو داوە دا کرد ، کەچی رێزی ئادەم زیاتر بۆ لە فریشتە کان چونکە ئادەمی کردە فێر کەری فریشتە کان ، هەر بۆیە فریشت کان  بە علم زانین و حیکمەت و دانای (خوای گەورە ) یان نەزانی بۆ یە بەم شێوەی نارەزایان دەربری ..؟!

لە (ابو هریرە ) – خوا لێ رازی بێت – دە گێریتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((كان رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ يقولُ: اللَّهمَّ إنِّي أعوذُ بك مِن الأربعِ: مِن عِلمٍ لا يَنفَعُ، ومِن قلبٍ لا يَخشَعُ، ومِن نفسٍ لا تَشبَعُ، ومِن دعاءٍ لا يُسمَعُ)).[1]  واتە: خوایە ! پەنا دەگرم بە تۆ لە چوار شت : لە زانست و زانیاری بێ سوود ، لە دلێ ملکەچ نەبێت و یان بێ ئاگابێت ، لە نەفسێ کە تێر نە خوات ،  لە پارانەوە یەکە گیرا نەبێت ..؟!

بەلێ وا دیارە زانست و زانیاریەك کە سوودی نەبێت بۆ دوار رۆژ ئەو زانست و زانیاریە هیچ نرخ بە بەهایەکی نیە ، ئەو زانستەی یان زانیاریە دەبیچت مرۆڤ هەولی بۆ بدات کە ویست و ئیرادەی (خوای گەورە )ی لە سەر بیت بۆ بەدەست هێنانی رەزامەندی (خوای گەورە ) هەول تێ کۆشان و ئەجتهادی بۆ بکەی ، چونکە بە نرخ ترین و بە بەها ترین گەورە ترین زانین و زانست ناسینی (خوای گەورە ) یە بەتەنها هەروەها وورد بوونەوە و تێرامانی لە بە دێهینانی ئاسمانە کان و زەوی و مرۆڤ هەموو دروست کراوە کانی ..؟!

بێ سوود ترین زانستیش ئەو زانست و زانیاریە کە هیچ سوودێکی بۆ رۆژی دوای نیە یان هیچ سوودێکی بۆ خۆی  و بۆ دونیاشی نیە ، بەلێ بێگومان هەر زانیاریەك دەبیچت سوودی بۆ قیامەتی هەبێت کەسی موسلمانی ئیمانداری راستە قینە ، بەلام ئەوانەی کە بێ باوەرن زانست زانیاریان هەر بۆ دونیایە هیچ سوودێکی نابێت بۆ دوا رۆژ یان رۆژی قیامەتی خۆی ، مایە پووچ دەبێت ..؟!

لە (ابو هریرە ) – خوا لێ رازی بێت –  دەگێریتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((علمُ النسبِ علمٌ لا ينفعُ ، وجهالةٌ لا تضرُّ)) .[2] واتە: زانستی رەچەلەك زانستێکە هیچ سوودی نیە ..!! وە نە زانی هیچ زیانێکی نیە ..!! مە بەست لێ هیچ زیان بەکەس ناگەیەنێ ئەگەر زانستی رەچەلەك نەزانێ ..؟!

[1]- سنن ابي داود برقم (١٥٤٨).
[2] -محمد جار الله الصعدي في (النوفخ العطرة ) ص ٢٠١.

لێرە دا گرینگی بەهاو نرخ و سوودی زانست و زانیاریمان بۆ دەر دەکەوێت ، کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ [الزُّمَر : ٩] واتە : ئایا ئەوانەی دەزانن وەکو ئەوانە وان کە نایزانن لە ئایندا..؟! نە خێر هەر گیز یەکسان نین ..؟!

✍ لە (ئیمامی علی ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : زانست زۆر باشتر لە مال و سامان ، چونکە زانست یان علم پاسەوانیت دەکات و دەپارێزی ، بەلام تۆ پاسەوانی لە مال سامانەکەت دەی پارێزی ، مال و سامان کەم دەبێت بە نفقە یان خەرجی کردن ، بەلام زانست یان علم زۆر باشتر لە الانفاق یان خەرجکردن ..!!

بەلێ سە بارەت بە علم و زانست ، ئەلێن : پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە پەلە لەگەل جبریل (علیە السلام ) قورئانەکەی دەخوێندەوە نەوەك لە بیری بچێتەوە ، جا (خوای گەورە ) فەرمووی: قال تعالى: ﴿فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ ۗ وَلَا تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰ إِلَيْكَ وَحْيُهُ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴿١١٤﴾﴾ [طه : ١١٤] واتە : دەسا پاكی و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگاری پاك وبێگەرد و بەرز و بلند بێت، و دوور بێت لە هەموو کەم وکوریەك، ئەو پادشایەی کە دەسەلاتی هەموو پادشا و دەسەلاتدارێکی ژێربار کردووە، دەسەلاتدار و بەڕێوەبەری هەموو شتێکە، ئەوەی کە هەق و ڕەواییە، وپەیمانی هەر هەقە، و هەڕەشەشی هەر هەقە، وهەموو شتێك لەوەوە هەر هەقە. بۆیە. ئەی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم. پەلەمەکە بە پێشکەوتنت لە جبریل. سەلامی خوای لێبێت. لە وەرگرتنت بۆ قورئان تاکو لێی دەبێتەوە، وبلێ: پەروەردگار زانستم زیاد بکە بۆ ئەو زانستەی کە فێرت کردووم ..؟! هەروەك (خوای گەورە ) ئەم دوعاو پارانەوەی فێری پێغەمبەرەکەی ﷺ کرد پێ فەرموو : قال تعالى: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴿١١٤﴾﴾ [طه : ١١٤] واتە: ئە تۆ بلێ : ئەی پەروەردگار زانست زانیارم زیاد بکە ..؟! لێرە دا شتێکمان بۆ روون دەبێتەوە ئەوەی (خوای گەورە ) پێ نە فەرموو : دعاو پارانەوە بکە بە زیاد کردنی مال سامانی یان زیاد کردنی ژیانی دونیا ، بەلکو فەرمانی پێ کرد بەوەی دوعاو پارانەوە بکە بە زیاد کردنی علیم زانست و زانیاری قورئان ، ناسنی (خوای گەورە ) ناوە جوانەکای (خواگەورە ) هەروەها شەرع و ئاینی ئیسلام ، کەواتە زانستی قورئان واتە زانستی ئاینی ئیسلامە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ تاکو کات ساتی وەفاتیش هەر علم و زانستی ئاینی ئیسلامی ل زیاد بوون بوو، چونکە چاکترین و باشترین موفەسری قورئان بوو ، هەر بۆیە تەفسیری قورئانی پیرۆز بە بێ فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ تەفسیرێکی نا کاملە لە رووی تێ گەیشتنی روون کردنەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ، بە شێوە یەکی پوخت دروست رەوان لە ئایەتە کان دەگەین ..؟!

📖 لە (أبو هریرە ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((... وَمَن سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فيه عِلْمًا، سَهَّلَ اللَّهُ له به طَرِيقًا إلى الجَنَّةِ...)) .[١] واتە : هەر کەسێك رێگایەك بگرێتە بەر بۆ ئەوەی علم زانستێك بە دەست بهێنێت ، ئەوا (خوای گەورە ) بەهۆی ئەوە وە رێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات..!!

[١] -صحيح مسلم برقم (٢٦٩٩)، و صحيح الترمذي برقم (٢٦٤٦).

بەڵێ هەر وەك ئەوە وایە ئەگەر كەسێك لە ماڵە كەی خۆیدا خۆی فێری قورئانی پیرۆز بكات ؟!، لێ تێ بكات و تەفسیری ئایەتەكان بزانێ و لێ تێ بگات ، هەر بۆ ئەم مەبەستە رێگای مەزگەوت یان شوێنێكی وەك ئاكادیمیە بگریتە بەر بۆ فێری بوونی زانستی قورئان ؟!، ئەوا بێ گومان رێگای چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەبێت ..؟!!، چونكە هەر قوتابیەك علم زانستە كەی بۆ رۆژی دوایی بێت یان بۆ رۆژی قیامەتی بێت ئەوا بێ گومان كاریگەری دەبێت بۆ قیامەتەكەی وە براوەی دونیاو دوا رۆژ دەبێت ، بەلام كەسی نەفام زانستی دونیایی پێ باشترە ..!! لە زانستێك كە سوودی هەبێت بۆ دوا رۆژی خۆی یان قیامەتی خۆی ، ئەوا بێ گومان ئەو كەسە زەرەر مەندی هەردوو دونیا دەبێت ؟!، واتە خسارەت مەندی دونیا و قیامەتە ..؟! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەر موویێت :

قال تعالى: ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ وَفَوۡقَ كُلِّ ذِي عِلۡمٍ عَلِيمٞ ٧٦﴾ [يُوسُف : ٧٦]واتە: [ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ ] ئیلا ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بێت [ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَنْ نَشَاءُ ] پلەی هەر كەسێك بەرز ئەكەینەوە كە ویستمان لێ بێت وەكو پلەو پایەی یوسفمان - صلی الله علیه وسلم - بەرز كردەوە [ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ] لەسەرووی هەموو خاوەن زانیاریەكەوە زانایەكی تر هەیە تا دەگاتە خوای گەورە..!! هەروەها ئەگەر سەیر بكەن برانینە دونیا ئەم رۆ دەبینین خەلكی زۆر هەولی علم و زانست دەدات ، لە تەمەنی شەش سالیەوە مندالە كانیان دەبنە بەر خوێند بۆ ئەوەی زانستێك فێر بن ئیجا گەورە دەبن بە گەنج و لاو خەریچكی بەدەست هێنانی علم و زانست و شهادەی بەرزن بۆ ئەوەی لە دونیادا سوودیان پێ بگەیەنێ هەندێك لە خەلكی تەنا بۆ بەدەست هێنانی شهادەكەی تیان یان براوانامەكەی تیان هیچ سوودێكی لێ نابینی لەو زانست علیمە كە فێری بوو لە خوێندگاكان ، ئەو كاتە لێ دەپرسن ئایا چی لەم زانستە فێر بووی كە بۆ ماوەی ئەم چەند سالە كاتت بۆ تەرخان كردبوو ..؟! ئەویش لە وەلامدا دەلێت : هەندێك لەو زانستە فێر بووم ، ئەویش بەمە زیاد كردنی علم و زانست بە پیشتوانی (خوای گەورە ) فەزل و ویستی خوا دەبێت ، دەبێت مرۆڤ صبرو ئارامی هەبێت بۆ بەدەست هێنانی علم زانست ، وە ئەخلاصی تەواویشی هەبیت بۆ زانستەكەی كە بۆماوەی چەند سال هەول و تێ كۆشانی بۆ كردووە ، زیاد كردنی علم زانست بێ گومان بە دوعا پرانەوەو زكرو یادی (خوای گەورە) دەبێت ، هەر بۆیە ئەوانەی كە لە ژیانی خۆیان دا علم زاست تیان كەم بووە ، هەندێك فێری بوون ، تەنها بۆ بەدەست هێنانی برانامە رێگای خوێندیان گرتۆتە بەر ، ئەوا بەدلنیایەوە نە رێگای خوێندە ئاسان دەكات و نە رێگای بەهەشت ئاسان دەكات ، بەلام لێرە دا علم زانست وەك رزق رۆزی وایە (خوای گەورە ) ویستی لێ بیت بە هەر كەسێكی دەدات ، جا هەیە علم زانستەكەی یەكجار زۆر داهێنان دەكات ، هە شە علم و زانستە كەی كە م پیێدەدات ، هەروەك (خوای گەورە ) دەربارەی روح ئەو علم و زانستەی نەدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ كە جوولە كەكان لە مەدینە دا پرساریان لێ كرد ووتیان : باسی رووح مان بۆ بكا ...!!!

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەر موویێت : قال تعالى: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥﴾ [الإِسۡرَاء : ٨٥] واتە : کەس نازانێت حەقیقەتی روح چییەو چۆنە} [ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي ] (عبداللە¬ی کوڕی مەسعود) دەفەرمێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - لەناو کێڵگەیەك دە رۆیشتین لە مەدینە، کە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - خۆی دابووە سەر لقە دارێکدا، بە لای کۆمەڵێك جولەکە تێپە ڕی، هەندێکیان وتیان پرسیاری لێ بکەن سەبارەت بە روح، وە هەندێکیان وتیان پرسیاری لێ مەکەن نەوەکو شتێك بڵێت پێتان ناخۆش بێت، پرسیاریان لێ کرد دەربارەی روح و وتیان ئەی محمد - صلی الله علیه وسلم - روح چیە؟ دەفەرمێت بەردەوام خۆی دابوو بەسەر دارەکە گومانم دەبرد وەحی بۆ دابەزێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو خوێندیەوە، هەندێکیان وتیان: وتمان پرسیاری لێ مەکەن، واتە: ئەی محمد - صلی الله علیه وسلم - پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی روح و حەقیقەتی روح چیە؟ بڵێ: روح کاری خوای گەورەیەو خوای گەورە خۆی نەبێ کەس نازانێ حەقیقەتی روح چیەو چۆنە، ئەم ئایەتە لە مەککەیش دابەزیوە کە قورەیش بە جولەکەیان وت شتێکمان پێ بڵێن تا پرسیاری لە محمد پێ بکەین، ئەوانیش وتیان پرسیاری لێ بکەن سەبارەت بە روح، ئەوانیش پرسیاریان لێ کردو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو دواتریش لە مەدینە دووبارە دایبەزاندەوە [ وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ] وە ئێوە لە زانیاری شتێکی کەم نەبێ هیچتان پێ نەدراوەو نایزانن..!!

✍ لە (ابی روق ) لە (ضحاك ) لە ( عبد الله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٣] دەلێت : واتە : ناوە کانیان بلێ ) .[١]

✍ لە (محمد بن أبان ) - رەحمەتی خوای لێ بێت - دەلێت : پرسیارم کرد لە (زید بن أسلم ) دەربارەی ووتەی : ﴿أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ﴾ ووتی : ناوە کانی فریشتە کانی ووت : (تۆ جبریل ) ، (تۆ میکائیل ) ، (تۆ إسرافیل ) هە تاکو ناوی هەموو ژمارە کان ، تاکو گەیشتە قەلە رەش یان غراب ..).[٢]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان )- رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : (خوای گەورە ) بە ئادەمی فەرموو : ﴿يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ﴾ واتە : ناوی ئاژەل و بالندەکانی سەر زەوی هەر هەمووی بە فریشتە کان بلێ . هەر بۆیە ئەویشی کرد یان ئەو کارەشی کرد ..).[٣]

✍ لە رێ (ابن جریج ) لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ﴾ دەلێت : ئادەم ناوە کانی بە فریشتە کان ووت ، ناوی ئەو خاوەن ناوانە یان ناوی هاو ناوەکان..).[٤]

✍ لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : هەموو جۆرێك بە ناوە کەی خۆی ناونا یان هەر جۆرێکی بە ناوەکەی خۆی ناونا ..!!) .[٥]

✍ لە (ابی روق ) لە (ضحاك ) لە ( عبد الله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ﴾ دەلێت : ناوە کانیان بلێ . قال تعالى: ﴿فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ﴾ دەلێت : بە تایبەتی فریشتە کان ، قال تعالى: ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ دەلێت : واتە : هیچ کەسی تری نایزانێت ..).[٦]

---

[١] -اخرجه ابن جرير (٥٣٠/١).
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٢/١).
[٣] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٨/١).
[٤] - اخرجه ابن ابي حاتم (٨٢/١) (٣٥٢).
[٥] -تفسير ابن ابي زمنين (١٢٩/١).
[٦] -اخرجه ابن جرير (٥٣٠/١).

✍ لە ریٚ (عباد بن منصور ) لە (الحسن الصبری) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەلیٚت : هەر بۆیە ئادەم ناوە ئەوانەی پیٚ ووتن : ووتی : ئەمە ناوی ئەم و ئەوە کە (خوای گەورە ) دروستی کردووە ، وە ئەوە ناوی ئەم و ئەوە ، (خوای گەورە ) ناوە کانی فیٚری ئادەم کرد کە پیٚشتر ئەو ناوانەی نە دەزانی یان فیٚر نە ببوو ، هە تاکو فیٚر بوو ناوەکانی فیٚری فریشتە کانیش کرد ، قال تعالى: ﴿فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ..!!) .[1]

✍ لە ریٚ (ابن وهب ) لە (عبدالرحمن بن زید بن أسلم ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەلیٚت : چیرۆکی ئادەم فریشتە کان ، ئەوە بوو کە (خوای گەورە ) بەفریشتە کانی ووت : هە ر وەکو ئیٚوە فیٚری ئەو ناوانە نەبوون ، ئیٚوە هیچ زانیاریەکتان نیە لە سەر ئەوەی ئەوانە ئیرادەی یان ویستی خراپە کاریان هەبیٚ ، (مەبەست لیٚ خراپە کاری نەوەکانی ئادەم ، فریشتە کان هیچی لیٚ نازانن ) ، هەروەها (خوای گەورە ) فەرمووی : ئەوم واتە : ئادەم فیٚر کردووە ، هەر بۆیە لیٚم شاردنەوە ، وە ئەوانەشی کە سە رپیٚچی دەکەن و ئەوانەشی کە گویٚرایم دەکەن ، دەلیٚت : پیشتر (خوای گەورە ) فەرمووی : قال تعالى: ﴿لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ١١٩﴾ [هُود : ١١٩] واتە : کە ئەبیٚ دۆزەخ پڕ بکەم لە جنی و لە مرۆڤ بە تیٚکرا ئەوەی کە شایەنی دۆزەخ بیٚ ئەبیٚ دۆزەخیان لیٚ پڕ کەم..!! دەلیٚت : فریشتە کان فیٚری ئەوە نەبوون ، وە هیچیان نەدەزانی ، دەلیٚت : کاتیٚ (خوای گەورە ) زانست و زانیاری بەخشی بە ئادەم ، دانیان نا بە ریٚز گرتنی ئادەم ..).[2]

✍ لە (ابی روق ) لە (ضحاك ) لە ( عبد الله بن عباس ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ﴾ دەلیٚت : واتە : ئەوەی کە نیشانی نادەن ، قال تعالى: ﴿كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٣٣﴾ دەلیٚت : ئەوەشی دەزانم کە شار دووتانەوە ، لەوەی کە ئیبلیس لە نەفسی خۆی دا تکبر و لە خۆبایی و لووت بەرزی شارد بۆوە ..!! ) .[3]

✍ لە (الربیع بن أنس ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿أَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٣٣﴾ دەلیٚت : واتە : ئەوەی کە ئاشکرایان کرد ، ئەوە بوو کە ووتیان : ئەی خودایە تۆ کەسیٚ وا دەکەیتە خلیفە یان جیٚنشین کە خراپە کاری بکا و خویٚن بریٚژی ، ئەویشی لە نیٚوان خۆیان دا دەیان شاردەوە ، ئەوە بوو دەیان ووت : پەر وەردگار مان هیچ دروستکراویٚ دروست ناکات مەگەر ئیٚمە لەوان شارەزاتر و بەریٚز ترین نە بین ، بۆ یان دەرکەوت کە خودا ریٚزی ئادەمی داوە بەسەر ئەواندا لە زانست زانیاری و شارەزایی چاکی دا ..).[4]

---

[1] - اخرجه ابن ابي حاتم (٨٢/١).
[2] -اخرجه ابن جرير (٥٣٠/١).
[3] -اخرجه ابن جرير(٥٣١/١).
[4] - تفسير ابن كثير به كوردى ص ١٣٢.

قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾
[البَقَرَةِ : ٣٤]

قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ واته : (بیێنەوە بیرت ) کاتێك ووتمان بە فریشتە کان ،قال تعالى: ﴿ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ﴾ واتە: سوژدە ببەن بۆ ئادەم ، قال تعالى: ﴿فَسَجَدُوٓاْ﴾ واتە : جا (هەموو ) سوژدە یان برد ، قال تعالى: ﴿إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ﴾ واتە : شەیتان نەبێت گوێی نە دایەو خۆی بە گەورە زانی ،قال تعالى: ﴿وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾ واتە : لە بێ بروایان بوو یان لە کافران بوو ..!!

ڕێزگرتنی ئادەم بە سوژدەبرنی فریشتەکان بۆی ، بێ گومان ئەوە ڕێزێکی زۆر گەورە بوو بۆ ئادەم ، هەر وەکو لە ئایە تەدا (خوای گەورە ) فەرمووی : بیر کەرەوە لەو کاتەی کە فەرمانمان بە فرشتە کان کرد کە سوژدە ببەن بۆ ئادە ، جا ئەوانیش هەموویان سوژدە یان برد ، جگە لە ئیبلیس یان شەیتان کە خۆی بە گەورە زانی خۆی بە گەورە دانا سوژدەی نە برد و ئەو لە دەستەی فریشتە کان نەبوو هەر لە پێش دا یان هەر لە زووەوە ئەو کافر یان بێ باوەر بوو ..!! بەلام ئەو خۆی لە شێوەی فەرمانبەرداری و گوێرایەلی دا نیشان دەدا ..؟! لە پێش دا باسی ئەوە مان کرد کە (خوای گەورە ) بەدلنیایەوە بە نیازی ناو دلی شەیتانی دەزانی بەلام فریشتەکان درکیان پێ نەدەکرد پێیان نەدەزانی ، چونکە فریشتە کان لە پێش دا پێیان وا بوو کە ئیبلیس یان شەیتان کەسێکی چاکە ، بەلام (خوای گەورە ) دەیزانی چی لە دلی ئیبلیس دایە ، دەیزانی ئەوەی ئیبلیس ئەنجامی دەدا وانیە و کەسێکی لە خۆبایی و خراپە کارە ، ئەوتا لە چیرۆکی ئادەم دەرکەوت بۆ فریشتە کان کە ئیبلیس کەسێکی خراپە فسادو گەندەل و لووت بەرزە ، ئەوان پێیان نەدەزانی و لەگەل ئەوانیش دا هەل سوکەوتی دەکرد بەلام خراپەکاری لە خۆ بایی ئیلبیس دەر نەکەوت تاکو کاتی دروست بوونی ئادەم ، ئەوە بوو کە ئادەم دروست بوو لە بەر حەسوودی و ئیرەیی و لە خۆبایی و خۆ بە گەورە زانین ، بەلێ ئیبلیس خۆی بە خۆ نەگیراو ئەو تاوانە گەورەی ئەنجامدا ئەویش کوفری رەها بێ باوەری رەها بوو ، نەچووە ژێر فەرمانی (خوای گەورە ) گوێرایەلی فەرمانە کەی (خوای گەورە ) نەرکرد ، ئەوە بوو کوفری دل و دەروونی خۆی دەرخست ، بۆ هەموو فریشتە کان روون بوویەوە کە ئیبلیس کوفری گەورەی ئەنجامدا ، بۆیە ئیبلیس بەر نەفەر تی (خوای گەورە ) کەوت لە بەر ئەو سەر پێچیەی کە ئەنجامی دا، وە نافەرمانی کرد ،گوێرایەلی فەرمانەکانی (خوای گەورە)ی نە کرد ، بۆیە (خوای گەورە ) لە بەهەشت دەری پەراند یان دەری کرد ، وە مۆلە تیشی پێدا تاکو رۆژی قیامەت بمێنێتەوە ، لە گومرا کردنی بەندە کانی (خوای گەورە ) یان لە نەوەکانی ئادەم کە گومرایان بکان ..؟!

بەلێ (خوای گەورە) فەرمووی : قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ﴾ واتە : بۆ فریشتەکانی روون کردەوە ، کە فەزل و رێزی ئادەم بە علم زانستە ، پاشان فەرمانی پێ کردن بە سوژدە بردن بۆ ئادەم وەك رێز لێنان ، نەك وەك پەرستن ، وەك ئەو سوژدەیەی کە بۆ براکانی بۆ یوسف پێغەمبەرایان برد لە کاتێك دا کە دایك وباوکی لە تەنیشتە خۆی دانا لە سەر عەرشەکەی خۆی یان لە تەنیشت کورسیە کەی خۆی ،ئینجا براکانی سوژدەی رێز لێنانیان بۆ یوسف و دایك و باوکیان برد ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗا﴾ [يُوسُف : ١٠٠] واتە : [ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ ] وە دایك و باوکی بردە سەر کورسیەکەی خۆی [ وَخَرُّوا لَهُ سُجَّدًا ] وە هەموویان کوڕنوشیان بۆی برد هەر یانزە براکەو دایك و باوکیشی (ئەوە کوڕنوشی ڕێزو ئیحتیرام بوو لە شەریعەتی ئەواندا دروست بووە لە شەریعەتی ئێمەدا دروست نیە) هەر بۆیە سوژدە بردن بۆ هیچ دروست کراوێکی (خوای گەورە) نابێت بکرێت ئەنجام بدرێت جگە لە (الله ) نابێت سوژدە بۆ هیچ کەسێك یان دورست کراوێك ببردرێت ، چونکە شرك وکوفر بوونە یان بێ باوەریە ، هەر بۆیە دورست نیە سوژدە بردن بۆ هیچ کەسێك لە ئاینی ئیسلام یان ئاینی توحید و یەك خوا پەرستی ، بەلام ئەوەی کە فریشتە کان سوژدەیان برد بۆ ئادەم تەنها سوژدەی فەزل ریزلێنان بوو ، چونکە فەرل ئادەم زیاتر لەسەر هەموو دورست کراوەکانی تری خۆی ، هەر وەك ئەو سوژدە بردنەی فریشتە کان بەلگەی ریز و فەلی ئادەمە بەسەریانەوە ، هەر وەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾ واتە : سوژدەیان برد ، جگە لە ئیبلیس یان شەیتان نەبێت کە سەر پێچی فەرمانی خوای کرد و خۆی بە گەورە زانی و خۆی خستە ریزی کافرەکانەوە یان بێ باوەرەکانەوە ، سەرنج لێرە دا پیتی(فاء ) بۆ ( للترتيب والتعقيب ) واتە : فریشتە کان دەست پێش خەریان کرد لە سوژدە بردن بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکەی (خوای گەورە ) ، بەلام تەنها ئیبلیس نەبیت قال تعالى: ﴿إِلَّآ إِبۡلِيسَ﴾ واتە : تەنها ئیبلیس سوژدەی نەبرد ، ئیبلیس سەرۆکی (جن) یان جنۆکەکان بوو ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ٥٠﴾ [الكَهۡف : ٥٠]واتە : وە باسی ئەو کاتە بکە کە فەرمانمانکرد بە فریشتەکان کە سوجدە بۆ ئادەم ببەن، وەکو ڕێزێك نەوەك پەرستن، بەهەمان شێوەش فەرمانەکە ئیبلیسیشی گرتەوە، ئەوەبوو هەموو فریشتەکان سوجدەیان برد، بەڵام ئیبلیس کە لە تیرەی جنۆکەکان بوو لەفەرمانی خوای پەروەردگار دەرچوو و سوجدەی نەبرد لەبەر حەسوودی و بەگەورەزانی خۆی . ئایا .ئەی خەڵکی.ئێوە شەیتان ونەوەکانی دەکەن بە یارمەتیدەر و پشتیوانی خۆتان و واز لە گوێڕایەڵی من دەهێنن، لە کاتێکدا ئەوان سەرسەختترین دوژمنانی ئێوەن ؟ ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپ و نابەجێیە گوێڕایەڵی ستەمکاران بۆ شەیتان لەجیاتی گوێڕایەڵی خوای میهرەبان و بەبەزەیی !!..

هەروەها فریشتەکان سەرپێچی فەرمانە کانی (خوای گەورە ) ناکەن هەر وەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ۝٦﴾ [التَّحْرِيم : ٦] واتە : [ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ ] ئەو ئاگری دۆزەخە هەندێك مەلائیکەتی لەسەرە کە (زەبانیە)ن خوای گەورە تایبەت بۆ ئەوە دروستی کردوون کەسانێکی زۆر دڵ ڕەقن وە زۆر سەخت و توندو ترسناکن هیچ ڕەحم و بەزەییەك لە دڵیان دا نیە بەرامبەر بە دۆزەخییەکان [ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ ] وە هەر فەرمانێك کە خوای گەورە پێیان بکات ئەوان سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە ناکەن [ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ] وە هەر فەرمانێکیان پێ بکرێ لەلایەن خوای گەورە ئەوان لە کاتی خۆیدا ڕاستەوخۆ جێبەجێی ئەکەن. کەواتە لێرە دا لەم دوو ئایەتەی کە باسمان کرد بۆ مان روون دەبێتەوە کە ئیبلیس لە (جن) یان جنۆکە کان بووە ، وە سەر پێچی فەرمانە کانی (خواگەورە ) کرد ، بەلام فریشتە کان هەر فەرمانێك (خوای گەورە ) پێیان بکان یەکسە ر جێ بەجێ دەکەن و سەر پێچی لە فەرمانەکانی ناکەن ،راستە و خۆ جێ بە جی دەکەن ..؟! قال تعالى: ﴿أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ﴾ واتە : سەرپێچی کرد و خۆی بە گەورە زانی ، بێ گومان ووشەی (استكبر ) بە هێزترە لە ووشەی (تكبر ) چونكە زیادەی ووشە بەلگەیە لەسەر زیادەی ماناکەی ، (استكبار ) واتە : لە و پەری خۆ بەگەورە دانان و لە خۆ بایی بوونە، واتە : ووشەکانی ( الكبر ، الاستكبار ، والتكبر ) هەر هەموو یان لێك نزیکن لە مانادا ، وە ك ووشەی (الكبر ) بەم شێوەیە پێناسە کراوە (فالكبر الحالة التي يتخصص بها الإنسان من إعجابه بنفسه ، وذلك أن يرى نفسه أكبر من غيره ) واتە : بارودۆخێکە تایبەتە بە مرۆڤە کانەوە ، کە سەر سام دەبێت بە خۆیەوە ، ئەویش ئەوەیە کە خۆی پێ لە غیری خۆی گەورەترە ..!! بەلێ ئیبلیس خۆی بە گەورە دانا بە سەر ئادەم ، قال تعالى: ﴿وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ۝٣٤﴾ واتە : ئیبلیس خۆی خستە ریزی کافرانەوە یان بێ باوەرانەوە ، بە لێ سوژدە نەبدنی ئیبلیس بە هۆی خۆ بەگەورە زانیەوە بوو ، یان بە هۆی حەسوودی ئیرەیەوە بوو ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿إِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ۝٦١﴾ [الإِسۡرَاء : ٦١] واتە : {کفتوگۆی نێوان خوای گەورەو ئیبلیس} [ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ ] وە کاتێك بە فریشتەکانمان وت کڕنوشی ڕێزو ئیحتیرام بۆ ئادەم بەرن [ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ ] هەموویان کڕنوشیان برد تەنها ئیبلیس نەبێ [ قَالَ أَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ] ئیبلیس ووتی: ئەی پەروەردگار من کڕنوش بەرم بۆ کەسێك کە تۆ لە قوڕ دروستت کردووە.!! هە روە ها کفتو کوي نيوان (خوای کە ورە) و ئیبلیس .﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسۡجُدَ إِذۡ أَمَرۡتُكَۖ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ۝١٢﴾ [الأَعۡرَاف : ١٢] واتە : گفتوگۆی نێوان خوای گەورەو ئیبلیس} [ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ ] خوای گەورە بۆ سەرزەنشت کردن و جێگیر کردنی بەڵگە بەسەریدا فەرمووی: ئەی ئیبلیس چی ڕێگری لێ کردیت کە سوجدە بۆ ئادەم بەریت کاتێك کە من فەرمانم پێ کردیت [ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ (١٢) ] وتی: ئەی خوایە من لەو باشترم منت لە ئاگر دروست کردووە ئەوت لە قوڕ دروست کردووە ئاگریش لە قوڕ باشترە بەگومانی خۆی، (ئیبلیس یەکەم کەس بوو کە قیاسی بەکارهێنا)..!!

ئینجا (خوای کە ورە ) فە رمووی : قال تعالی: ﴿قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ١٣﴾ [الأَعۡرَاف : ١٣] واتە : [ قَالَ فَاهْبِطْ مِنْهَا ] خوای گەورە فەرمووی: دەی لە ئاسمان یان بەهەشت یان ئەو پلەوپایەی پێتدرابوو دابەزە ئیتر تۆ نابێ لەناو مەلائیکەتاندا بیت [ فَمَا يَكُونُ لَكَ أَنْ تَتَكَبَّرَ فِيهَا ] وە بۆت نیە کە لە ئاسماندا یان لە بەهەشتدا خۆت بەگەورە بزانی و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە بکەی [ فَاخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ الصَّاغِرِينَ] دەرچۆ لە بەهەشت تۆ لەو کەسانەی کە ڕسواو زەلیل و سەرشۆڕ ئەبیت.!! ئینجا ئیبلیس ووتی : قال تعالی: ﴿قَالَ أَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ١٤﴾ [الأَعۡرَاف : ١٤]واتە : ئیبلیس وتی: ئەی پەروەردگار بمهێڵەرەوە با نەمرم تا ڕۆژی زیندوو بوونەوە تا ڕۆژی قیامەت. ئینجا (خوای کە ورە ) فە رمووی : قال تعالی: ﴿قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ١٥﴾ [الأَعۡرَاف : ١٥]واتە : خوای گەورە فەرمووی: ئەوا مۆڵەتت ئەدەم و تۆ لەو کەسانەی کە ئەمێنیتەوە تا ڕۆژی قیامەت کە دونیا تێك ئەچێ بۆ ئەوەی کە خوای گەورە خەڵکی پێ تاقیبکاتەوە .

هە روە ها ئیبلیس بە م شیوە یە ووتی : قال تعالی: ﴿قَالَ أَرَءَيۡتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي كَرَّمۡتَ عَلَيَّ لَئِنۡ أَخَّرۡتَنِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَأَحۡتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا ٦٢﴾ [الإِسۡرَاء : ٦٢]واتە[ قَالَ أَرَأَيْتَكَ هَذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ ] وتی: ئەی پەروەردگار هەواڵم پێ بدە سەبارەت بەو کەسەی کە ڕێزت لێناوە کە ئادەمە کە منت لە ئاگر دروست کردووە ئەوت لە قوڕ دروست کردووە بۆچی فەزڵی ئەوتدا بەسەر مندا [ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ] ئەگەر دوام بخەی تا ڕۆژی قیامەت [ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلَّا قَلِيلًا ] ئەوە زاڵ ئەبم بەسەر نەوەکانیداو هەموویان گومڕا ئەکەم تەنها کەمێکیان نەبێ کە بەندە دڵسۆزو باوەڕدارەکانن ..!!

(خوای کە ورە ) بە ئیبلیسي فە رموو : قال تعالی: ﴿قَالَ ٱذۡهَبۡ فَمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمۡ جَزَآءٗ مَّوۡفُورٗا ٦٣﴾ [الإِسۡرَاء : ٦٣]واتە : خوای گەورەش فەرمووی: ئەوە ئەمێنیتەوە بڕۆ هەر کەسێکیش گوێڕایەڵی تۆ بکات و شوێنت بکەوێ ئەوە بەدڵنیایی جەهەننەم سزای ئێوەیە سزایەکی تەواو..؟!

بەلێ سوژدە برن بۆ جگە لە (خوای گەورە ) ئەگەر لە سەر فەرمانی (خوای گەورە) بێت بۆ بەندەی خوا ، ئەوا بە پەرستن و عیبادەت حیساب دەکرێت ، بەلام ئەگەر فەرمانی (خوای گەورە )ی لە سەر نەبێت جگە لە (خوای گەورە ) ئەو بێ گومان سەرپیێچی و حرام و کوفر و شرکە سوژدە بردن بۆ غیری (خوای گەورە ) ، هەر وەك فریشتە کان سوژدەی ڕێز لێنان بۆ ئادەم (علیە السلام ) برد ، یان وەك براکانی یوسف (علیە السلام ) سوژدەی تحیە سلاو کردن ڕێز لینان بۆ یوسف و دایك و باوکیان برد ، بەلێ فریشتە کان سوژدە یان بۆ ئادەم برد هەروەك دەفەرمووی : قال تعالی: ﴿ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ﴾ واتە: (خوای گەورە ) فەرمان دەکات کە فریشتەکان سوژدە ببەن ، وە حوکم دەکات بەوەی کە بییەوێت ، هەر لە بەر ئەم هۆکارە ئیبلیس سوژەی نەبرد کە خۆی بەگەروە زانی ، ئەویش حساب کرا کە کافرانە یان لە بێ باوەرەکان یان لەوانەیە کە سەرپیێچی (خوای گەورە ) دەکەن ، هەروەها ئەو سوژدە بردنە بۆ ئادەم

سوژدە بردنی ڕێز بوو نەك سوژدە بردنی پەرستن و عیبادەت بۆ ئادەم (علیه السلام ) ، سوژدە بردنی عیبادەت و پەرستن تەنا بۆ (خوای گەورە) یە ، چونکە زانایان لەسەر ئەم یەك دەنگن کۆدەنگن سوژدەی ڕێز بووە ..!!

سوژدە بردن بۆ بێجگە لە (خوای گەورە ) بە مطلقی دروست نیە حرام ، چونکە زانایان دەڵێن : سوژدە یان ركوع كرنۆش بردن ئەم دووبارەیە یان ئەم دووحالەتەیە :

یەکەم: ئەگەر بەندە سوژدە یان کرنۆش و رکوع ببات وەك عیبادەت و پەرستن جگە لە (خوای گەورە ) خۆی بۆ زەلیل و سەر شۆر بکات بۆ دروست کراوەکانی (خوای گەورە ) ئەوا بەدلنیایەوە شیرکی گەورەیە واتە : (شرك أكبر ) بێ گومان شرکی گەورە ئەوا بەدلنیایەوە لە ئاین و دەردەچێت .

دووەم : ئەگەر سوژدە یان کرنۆش و رکوع ببات وەك ڕێز گرتن و سلاو کردن نەك عبیادەت و پەرستن ، ئەمەیان نابێتە شیرك ، چونکە بۆ ئۆممەتەکانی پێش ئێمە دروست بووە ، بەلام بۆ ئۆمەتی ئیسلام حرامە بە هیچ شێوەیەك نابێت سوژدە و کرنۆش و رکوع ببەین وەك ڕێز گرتن ، چونکە ئەوا دەبێتە شیرکی بچووك ، شیرکی بچووك خاوەنەکەی لە ئاین دەرناچێت بەلام ئیمانی کەم دەبێت.

✍ لە (ابن تیمیه ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : سوژدەی عیبادەت یان پەرستن تەنها بۆ خوایە ، هەموو یەك دەنگن کە سوژدە بۆ بێجگە لە (خوای گەورە ) حرامە بە مطلقی ، هەروەها دەفەرمووی : سوژدە دووجۆرە سوژدەی عیبادەت و سوژدەدەی ڕێزگرتن ، واتە : سوژدەی عیبادەت نابێت تەنها بۆ خوا نەبێت ، واتە : تایبەت کراوە تەنها بۆ خوا ..!!

✍ لە (محمد ابراهیم ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : خۆ چەماندنەوە یان خۆ نزم کردنەوە کاتی سەلام کردن حەرامە ، ئەگەر مەبەست پێی سەلام کردن بێت ، ئەگەر مەبەست پێ عیبادەت بێ ئەوا بە مطلقی کوفرە ..؟!

✍ لە (عبدالعزیز عبداللطیف ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : ئەگەر کەسێك سوژدە ببات بۆ باوکی یان بۆ زانایەکی ئاینی ئیسلام ، ئەگەر مەبەستی پێی سەلام و ڕێز بێت ، ئەوا لە حرام کراوەکان و شیرك نیە ، بەلام ئەگەر سوژدەی زەلیلی و نزیك بوون و عیبادەت بێت ئەوا بە مطلقی شیرکە ..؟!

بۆیە ئیبلیس سیفەتە ، خراپەکانی تێدا کۆ بوویتەوە :

١-سەرپێچی فەرمانەکەی (خوای گەورە )ی کرد و فەرمانەکەی جێ بەجێ نەکرد.

٢-خۆ بەگەروە دانا لووت بەرز بوو لە خۆ بایی بوو .

٣-حسوودی ئیرەیی برد بە ئادەم .

٤- بێ باوەر بوو ، یان لە کافرەکان بوو .

قال تعالى: ﴿وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَـٰفِرِينَ﴾ مەبەست لە ووتەیە زانایان دەڵێن : ئەو کەسەی نوێژ تەرك دەكات كافرە ، چونكە سەرپێچی فەرمانی و فەرز و واجب (خوای گەورە )ی كردووە ، هەر وەك ئیبلیس سەر پێچی كرد كە یەك فەرمانی جیٚ بەجیٚ نە كرد یان یەك سوژدەی نەبرد بۆ (خوای گەورە ) ، بەڵیٚ ئیبلیس لە سەر یەك سوژدە كافر بوو ، ئەی ئەگەر كەسێك نوێژ نەكات كە فەرمانی پیٚ كراوە رۆژانە حەڤدە سوژدە ببات ، كەچی سەر پێچی بكات فەرمانەكەی یان واجبە كەی (خوای گەورە ) جیٚ بەجیٚ نەكات نوێژ بە تەواوە تی ترك بكات ..؟!

زانایان دەڵێن : تەرك كردنی نوێژ لەم سیٚ حالەتانەن :

یەكەم : نوێژ تەرك بكات یان نوێژ نەكات باوەری بە نوێژ نەبێت ، یان دەڵێت : نوێژ فەرز واجبە نیە ، یان دەڵێت : نوێژ نەكردن باشترە لە نوێژ كردن ، ئەمەیان كافرە بە یەك دەنگی هەموو زانایان ئۆممەت ..؟!

دووەم : ئەگەر كەسێك هەندێك جار نوێژ بكات و ، هەندێك جار نوێژ نەكات واتە : بیٚ خیرەتی یان لە لە زەخەلی و تەمبەلی نوێژ نەكات ئەو كەسە یان ووتەی راست ئەوەیە موسلمانە ، بەلام بە فاسق ناو دەبرێت ناچێتە دەر لە ئیسلام بەلام تاوان بارە و گوناهكارە لەسەری سزای دەدرێت ..؟!

✍ لە (ابن تیمیە ) – رەحمەتی خوای لیٚ بێت – دەڵێت: زۆر لە خەلكی بەلكو زۆر بە یان لە شارەكان بەردەوام نابن لە سەر نوێژ كردن لە سەر ئەنجامدانی نوێژە فەرزو واجبەكان واتە: پێنچ نوێژە فەرزەكە ، لە و كەسانە نیٚن كە بە یەكجاری واز لە نوێژ بهێنن ، هەندێك جار نوێژ دەكەن ، هەندێك جار نوێژ ناكەن، هەندێك جاریش وازی لیٚ دەهێنن ، ئەوانە : دوو روویی و نیفاق یان تێدایە ، ئەحكامە شرعیەكانی ئسلامیان لە سەر جیٚ بەجیٚ دەكرێت ، بۆ میرات و ئەحكامە كانی تر ...؟!

✍ لە (ابن عیثمین ) رەحمەتی خوا لیٚ بێت – دەڵێت : ئەوەی لای من دیار بێت (خواش زاناترە ) نوێژ تەرك كردن بە یەكجاری پێی كافر دەبێت ، ئەگەر یەكێك هەندێك جار بكات و هەندێك جار نەكات ئەمە كافر دەبێت ، چونكە ئەصل وایە ئیسلام ماوە تا بەلگەی روون هەبێت بۆ نەمانی ئیسلام بوونی ، ئەگەر ئینكاری واجب بكات ، ئەوا كافرە لە بەر ئینكاری نەك لە بەر تەرك كردنی..؟!

سێ یەم : نوێژ ناکات به یەکجاری ، بەلام باوەری بە نوێژ هەیە و دەزانێت تاوانبارە و نوێژ کردن باشترە و دەزانێت واجبە و فەرزە ، بەلام ئەو کەس نایکات لە تەمبەلی و زەخەلیە کە نوێژ ناکات ، ئەم جۆرە یان جیاوازی هە یە لە نێوان زانایان ئایا کافرە یان موسلمانە ، زۆر بەی زانایان دەلێن موسلمانە ، هەندێك زانای تر بۆ ئەوە چوون کە کافرە ..؟!

✍ لە (ئیمام مالك ) و (ئیمام شافعی ) – رەحمەتی خوا یان لیٚ بێت – هەر دووکیان بۆ ئەوە چوونە نوێژ نەکەری عمدا ، وە بە بیرو باوەر بە عقیدە نوێژ نەکات و باوەری وا بێت واجبە نیە نەی کات ، ئەوا دەبێت بە کوژرێت وەك حەدی شەرعی نەك وەك کوفر.؟!

✍ لە (ابو حنیفە ) – رەحمەتی خوای لیٚ بێت – رای بۆ ئەوە چووە دەلێت : نوێژ نەکەر بەند بکرێت لە بەندیخانە یان سجن بکرێت تاکو نوێژ دەکات ..؟!

هەندێك لە زانایانی تر بۆ ئەوە چوونە نوێژ نەکەر ، دوای تۆبەی لێدە کرێت ، ئەگەر تۆ بە بکات ، ئەوا تۆبەکەی لیٚ وەردەگیرێت ئەگەر تۆبەی کرد و نوێژی کرد ئەوا موسلمانە ، بەلام ئەگەر نوێژی نەکرد ، ئەوا دە کوژرێت وەك ردە یان هەلگەراوە لە دین..؟!

هەندێکی تری زانایان بۆ ئەوە چوونە ئەوا نوێژ نە کەر دەبێتە کافر دەبێت بکوژرێت ، بیٚ گومان کێشەکە تەنها نوێژ نەکردن نیە ، یان ترك کردنی نوێژ بەلکو ئەوانەی کە نوێژ ناکەن روکنەکانی تری ئیسلام بەجی ناهێنن ، وەك رۆژوو ، زەکات ، حەج ، هەر کەسێك هە چوار روکنی ئیسلام تەرك بکات ئەوا کافر دەبێت بە یەك دەنگی زانایان ئەم ئوممەتە ، چونکە کردەوە مەرجی دەرستی ئیمانە نەك مەرجی تەواوی ئیمان بێت ..؟!

بیٚ گومان ئەوەی گرینگە ئەوەی موسلمان بۆ برا موسلمانەکە ببێتە کەسێکی ئامۆژگاری کار بەوەی کە نوێژ نەکردن سزایی زۆر گەورەی بۆ دانراوە لە لایەن (خوای گەورە ) ئاگاداری بکاتەوە کە تاونەکەی یەکجار گەورەیە ئەگەر تەرك بکات و یان نوێژ نەکات ، هەر وەك (خوای گەورە ) سزاکەی بۆ داناوە دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ۝٤٢ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ۝٤٣﴾ [المُدَّثِّر : ٤٢ - ٤٣]واته : {هۆکاری چونه دۆزەخ} [ مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ (٤٢) ] ئەوە چی ئێوەی خستۆتە ناو (سەقەرە)وە؟ کە ناوێکی ترە لە ناوەکانی دۆزەخ..!! [ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ (٤٣) ] وتیان: ئێمە لە دونیادا نوێژمان نەئەکردو لە نوێژخوێنان نەبووین..!! هەروەها موسلمان بۆ برا موسلمانەکەی دلسۆز بێت بۆی بگەرێنتەوە سەر رێگای راستی خوا پەرستی ، هەول بدا هیدایەتی بدات بۆ ئەوەی لە سزای ئاگر دوور بکەوێتەوە ، نەك یەکسەر پی بلیٚ تۆ کافری یان مولحیدی ئامۆژگاری بکات تائەوە کاتەی پێویست دەکات و شەرعی رێگای پێداوە ، یان بم شێوەش وەسفی نەکات وەکو مورجیئەکان نوێژ نەکەر پیٚ

موسلمان بێت ، بەلکو دەبێت بە ئایەت و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاری بکات بۆ هیدایەت دانی ، نابێت بە نوێژ نەکەر بلێ ، (اللە ) (غفور – رحیم )ە ، بەلکو دەبێت بلێ (اللە ) (شدید العذاب ) بە یان (اللّه ) (شدید العقاب )ە ..؟!

📖 لە ( جابر بن عبداللە ) – خوا لێ رازی بێت – دە گرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إنَّ بيْنَ الرَّجُلِ وبيْنَ الشِّرْكِ والْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاةِ)).[١] واتە : لە نێوان پیاو هاوەل بۆ خوا بریاردان وە کوفردا نوێژ نەکردنە ..!!

📖 لە ( جابر بن عبداللە ) – خوا لێ رازی بێت – دە گرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((بين الكفرِ والإيمانِ تركُ الصَّلاةِ)) .[٢] واتە : نێوانی کوفر ئیمان وازهێنانە لە نوێژ کردن ..!!

📖 لە (أنس بن مالك) – خوا لێ رازی بێت – دە گرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((من ترك الصلاة مُتعمّدًا ، فقد كفر جهارًا)). [٣] واتە : هەر کەسێك نوێژ واز لێ بهێنێ یان ترکی بکات بە عمدا ئەوا کفری ئاشکرای کردووە ..!!

📖 لە ( جابر بن عبداللە ) – خوا لێ رازی بێت – دە گرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((بَينَ العَبدِ وبَينَ الكُفرِ تَركُ الصلاةِ)).[٤]واتە: نێوانی بەندە و نێوانی کوفر وازهێنانە لە نوێژ کردن ..!!

📖 لە (عبداللە بن شقيق العقلی ) – خوا لێ رازی بێت – دە گرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( كان أصحابُ محمَّدٍ صلَّى اللهُ علَيهِ وسلَّمَ لا يرونَ شيئًا من الأعمالِ تركُه كفرٌ ، غيرَ الصَّلاةِ. سمعت أبا مصعب المدنی يقول : من قال : الإيمان قول يستتاب ، فإن تاب وإلا ضربت عنقه )).[٥] واتە : هاوەلانی پێغەمبەری خوا ﷺ وازهێنانیان لە هیچ کارێك بە کوفر دانە ناوە جگە لە نوێژ ..؟! بۆ خۆم گوێم لە (ابو مصعب ی مەدنی ) بوو دەی ووت: هەر کەس ووتی : ئیمان بەس ووتەیە دەبێ تەوبە بکات ، جا ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە باشە ، ئەگەر نا دەبێت بدرێت لە گەردنی ..؟!

📖 لە (عبداللە بن بريدە ) لە باوکی – خوا لێ رازی بێت – دە گرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((العَهدُ الَّذي بيننا وبينهم الصَّلاةُ ، فمَن ترَكَها فقد كفَرَ)).[٦] واتە : بەلێن و پەیمانی نێوان ئێمە ئەوان واتە : کافران یان بێ باوەران ، نوێژ نەکردنە ئەوەی وازی لێ بهێنێ یان ترکی بکات ، ئەوا بێ باوەر بووە یان کافر بووە ..؟!

📖 لە (بريدة بن الحصيب الأسلمي)– خوا لێ رازی بێت – دە گرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((كُنَّا مع بُرَيْدَةَ في غَزْوَةٍ في يَومٍ ذِي غَيْمٍ، فَقالَ: بَكِّرُوا بصَلَاةِ العَصْرِ؛ فإنَّ النبيَّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ قالَ: مَن تَرَكَ صَلَاةَ العَصْرِ فقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ)).[٧] واتە: دەفەرمووی : ئێمە لە گەل بوریدە لە رۆژی غەزای (ذي غيم ) دابووین ، ووتی : نوێژی عصر زوو بکەن ،

---

[١] -صحيح مسلم برقم (٨٢).
[٢] - سنن الترمذي (٢٦١٨).
[٣] -شيخ الالباني في ضعيف الجامع برقم (٥٥٢١).
[٤] -سنن الترمذي برقم (٢٦٢٠).
[٥] -سنن الترمذي برقم (٢٦٢٢).
[٦] سنن الترمذي برقم (٢٦٢١).
[٧] -صحيح البخاري برقم (٥٥٣).

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوکەسەی نوێژی عصر نەکات ، کردەوەکانی گیرا نابێ ، یان کردەوەکانی قبول نابێت ، یان کردەوەکانی پووچەل دەبێتەوە ..!!

بەڵێ لە راستی دا سوژدە دەبێت تەنها بۆ (خوای گەورە ) بێت ، جگە لە خوا نابێت سوژدە بۆ هیچ کەسێك ببردرێت ، ئەو سوژدەی کە بۆ ئادەم و یوسف لە قورئاندا باسکراوە تەنها سوژدەی سەلاو رێزگرتنە ، نەك سوژدەی پەرستن و عیبادەت کردن ، ئەو فەرمانەی کە (خوای گەورە ) بە فریشتە کان دا ، ئەویش سوژدەی رێزگرتن بۆ ئادەم بوو ، فریشتە کانیش سوژدەیان برد ، فەرمانەکانی (خوای گەورە ) جێ گەیاند ، هەروەك (خوای گەورە ) فەرمان بە موسلمانان دەکات بۆ نوێژ کردن روو لە بەردە رەشەکەی کەعبە بکەن واتە : قبیلە ی موسلمانان بەردە رەشە کەیە ، یان فەرمان دەکات بە حەج و عمرە کردن بۆ مالە کەی خۆی کەعبەی پرۆز ، هەروەها فەرمان کردن بە رجم کردنی ابلیس بە بەرد ، هەر بۆ یە موسلمانان فەریزەی حەج بە جێ دە هێنن فەرمانەکانی (خوای گەورە ) جێ بەجێ دەکەن ، ئەوەش بە گەورە دان و رێز گرتنی فەرمانەکانی (خوای گەورە )یە ، بێ گومان ئەمەش حیکمەتی (خوای گەورە ) بۆ موسلمانان ، هەر (خوای گەورە ) بەخۆی زانایە حیکمە تە کەی ، هەروەك فریشتەکان دەفەرموون : قال تعالی: ﴿قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٣٢﴾ [البَقَرَةِ : ٣٢] بەڵێ موسلمان دەبێت بزانێت هەر فەرمانێك (خوای گەورە ) بریاری لەسەر دەدات فەرمانەکە دەردەکات راست و دروستە ، حیکمەت لە دوای حیکمەتی تێدایە ، دادگەری لەدوای دادگەری تێدایە ، بەزەیی لە دوای بەزەیی ، ئەی برای موسلمان کە تۆ ئیمانداری باوەرت هەیە بە حیکەتی (خوای گەورە ) ، دەبێت باوەرت هەبێت بە حیکەتی (الله ) بە مطلقی ، دەبێت باوەرت هەبێت بە علمی (الله ) بە مطلقی ، دەبێت باوەرت هەبێت بە رەحمەت یان بەزەیی (الله ) بە مطلقی ، ئەگەر سوژدەش ببیت دەبێت تەنها بۆ (الله ) بێت.
بەلام سوژدەی فریشتەکان تەنها سوژدەی رێز و پایە بوو ، بۆ ئادەم (علیه السلام ) هەر وەك سوژدە بردنی ئەستێرە ز مانگ و رۆژ سوژدەی رێزیان گرت بۆ یوسف (علیه السلام ) کە لە خەونەکەیدا بۆ باوکی دەگێرێتەوە، (خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالی: ﴿إِذۡ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ ٤﴾ [يُوسُف : ٤]واتە : کاتێك یوسف - صلی الله علیه وسلم - بە باوکی فەرموو کە یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم بوو (صەڵات و سەلامی خوای گەورەیان لەسەر بێت): ئەی باوکە من یانزە ئەستێرەم بینی لە خەودا (کە لێکدانەوەکەی یانزە براکەی بوو)، وە خۆرو مانگیشم بینی (کە لێکدانەوەکەی دایك و باوکی بوو) هەموویان کڕنوشی رێزو ئیحتیرامیان بۆ ئەبردم، کە پاش چل ساڵ یاخود هەشتا ساڵ روویداوە..!!

📖 لە (ابو هریرە) – خوای لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لو كنتُ آمرًا أحدًا أن يسجُدَ لأحدٍ ، لأمرتُ المرأةَ أن تسجُدَ لزوجِها)).[1] واتە: ئەگەر فەرمانم بکردایە بە کەسێ سوژدە بەرێ بۆ کەیسێکی تر ، ئەوا فەرمانم دەکرد بە ئافرەت سوژدە بەرێ بۆ هاوسەرەکەی یان پیاوەکەی ، ئەوەندەی مافی هەیە بە سەر یەوە ..!! مەبەست لەم فەرموودەیە

[1] - سنن الترمذي برقم (١١٥٩).

ئەوەیە کە دەبێت ئافرەت ڕێزی پیاوەکەی بگرێت ، دیارە مەبەستی سوژدە بردن ڕێزو پایەی پیاوە لە لای ئافرەت یان لە لای مێردەکەی .!

لە ( ابو هريره ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەڵێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إذا صلَّتِ المرأةُ خَمْسَها وصامتْ شهرَها وحصَّنتْ فرْجَها وأطاعت بعلَها دخَلتْ مِن أيِّ أبوابِ الجنَّةِ شاءتْ)).[1] واتە: ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژە بکات ، واتە : پێنج فەرزەکەی ئەنجام بدات ، مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بێت ، وە داوێنی خۆی بپارێزی لە حرام کراوەکان ، وە گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی بێت یان مێردەکەی بێت ، ئەوا دەچێتە بە هەشتەوە بە هەر دەرگایەك لە دەرگاکانی بە هەشت بیەوێت..؟!

بەڵێ فەرمانی کردنی (خوای گەورە ) حیکەتی تێدایە بۆ بەندەکەی ، وە گوێڕایەڵی کردنی واجب و فەرزە ، هەر وەکو فەرمان دەکات ڕوو بکەن قیبلە ئەویش بەردە ڕەشەکەیە واتەحجر الاسود ، بەڵی ئەم بەردە نەسوودی هەیە و ن زیانی هە یە ، بەلام فەرمانی (خوای گەورە ) یە حیکمەتی خۆی تێدایە ، حیکەت لە بەردەکە دانیە بەڵکو حیکەت لە فەرمانە کەی (خوای گەورە )یە چونکە سوود لە فەرمانەکەی نەوە بەردە کە سوود بگەیەنێ یان زیان بەگەیەنێ ..؟! هەر وەك دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾ [النِّسَاء : ٥٩]واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمانتان هێناوە گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا بکەن- صلى الله عليه وسلم - وە ئەوانەی کە فەرمانڕەواو کاربەدەستی ئێوەن چ فەرمانڕەوایان وە چ زانایان هەردووکی ئەگرێتەوە لە چاکەدا بەڵام لە خراپەو تاواندا گوێڕایەڵی بۆ کەس نیە، ئەم ئایەتە لەسەر (عبدالله بن حذافة بن قيس بن عدي) دابەزی کە پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - کردی بە ئەمیری سریەیەك و فەرمانی پێ کردن کە گوێڕایەڵی بکەن، ئەویش توڕە بوو وتی ئایا پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - فەرمانی پێ نەکردون گوێڕایەڵیم بکەن؟ وتیان بەڵێ، وتی دارم بۆ کۆ بکەنەوە، کۆیان کردەوە، وتی: ئاگری تێبەر بدەن، ئاگریان تێبەردا، وتی: بچنە ناوی، ویستیان بچنە ناوی، بەڵام هەندێکیان هەندێکیان دەگرت و وتیان: ئێمە لەترسی ئاگر ڕامان کرد بۆ لای پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - بە قسەیان نەکرد تا ئاگرەکە دامرکایەوەو ئەویش توڕەبوونەکەی ئارام بووەوە کە ئەم هەواڵە بە پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم - گەیشت فەرمووی: ئەگەر بچونایەتە ناو ئاگرەکە لێی دەرناچوون تا ڕۆژی قیامەت، چونکە گوێڕایەڵی تەنها لە چاکەدایە . {گەڕاندنەوەی کێشە بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا- صلى الله عليه وسلم -}..!!هەروەها (خوای گەورە ) فەرمان دەکات بە موسلمانان کە ئەوەی لە پەیامبەرەکەی ﷺ هاتووە وەری بگرن ، ئەویشی کە قەدەغەی کردووە لێ دوور بکەنەوە ، هەر وەك دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ﴾ [الحَشۡر : ٧] واتە : وە ئەوەی کە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بۆی هێناون ئێوە وەری بگرن، وە ئەوەیشی کە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - نەهی لێکردووە دەستی لێ هەڵبگرن، واتە: گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا بکەن - صلى الله عليه وسلم - چونکە ئەو تەنها فەرمانتان پێ دەکات بە چاکەو ڕێگریتان لێدەکات لە خراپە..!!

[1] صحيح ابن حبان برقم (٤١٦٣).

قال تعالی: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾ [النِّسَاء : ٥٩] واتە : گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار بن وسەرپێچیان مەکەن، وە وەڵامی پەیامبەرەکەی صلى الله عليه وسلم بدەنەوە لەو هەق وڕاستیانەی کە پێی هاتووە، وگوێڕایەڵی کاربەدەستانتان بکەن لەو شتانەی کە سەرپێچیکردنی خوای بەرز وبڵند وپایەبەرزی تێدا نیە ..!! بەڵێ گوێرایە لی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) واجبە لە هەر فەرمانێك کە بریاری لە سەردەدات ، هەروەها گوێرایەلی کردنی پێغەمبەرکەی لە فەرمان کردن بە چاکە دوور کردنەوە لە خراپە ، هەروەها گوێرایەلی کردنی فەرمانرەوا یان کاربەدەست یان زانایانی شەرعی ئاینی ئیسلام ، بەلام لێرە دا ولی ئەمر دەبێت پویست بێت بە گوێرایەلی پێغەمبەری خوا ﷺ واتە لە شەرعی ئیسلام دەر نەچێت ئەگەر فەرمانی کرد بە چاکە گوێرایەلی بکرێت ئەگەریش فەرمانی کرد بە خراپە ئەو واجبە کە گوێرایەلی نەکەی و ئامۆژگاری ولی ئەمر بکرێت ، هەروەك ئەم نموونەیە : ئەگەر ولی ئەمر فەرمانی کرد بە موسلمانان بە خواردنی شەراب و گۆشتی بەراز ئەوا نابێت گوێرایەلی بکریت لە خراپە چونکە ئەم خواردن خواردنەویە ، حرام کراوە بە فەرمانی (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ﷺ ، هەر وەك دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَـٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَـٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾﴾ [المَائـِدَة : ٩٠]واتە : ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان بەخوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی صلى الله عليه وسلم هێناوە و بەڕاستان زانیون، وکردەوە بە شەرعەکەی دەکەن، بێگومان مەی : کەبریتیە لە هەموو ماددەیەکی سەرخۆشکار کە ڕێگر دەبێت لەکارکردنی، و مەیسریش : کە قومارە، کە هەموو کردار و کێبرکێیەك دەگرێتەوە لەسەر بەرامبەرێك، و هاوشێوەکانی، وە ئەنصابیش : کە بەردێك بوو هاوەڵبڕیاردەران سەربڕینیان لەلادا ئەنجامدەدا وەکو بەگەورە ڕاگرتنێك بۆی، یان هەر شتێك کە ئەنجام دەدرا بەمەبەستی پەرستن بۆ لێنزیکبوونەوەی، وە ئەزلامیش : ئەو سێ پەرداخە بوون کە هاوەڵبڕیاردەران بۆ بەخت گرتنەوە پێش ئەوەی کە کارێك یان سەفەرێك ئەنجام بدەن یان وازی لێبهێنن بەکاریان دەهێنان، هەموو ئەوانەی کە باسکران تاوانن و لە ڕازاندنەوە و جوانکاریەکانی شەیتانە بۆ خەڵك، سا لێیان دووربکەونەوە، بەڵکو بەهەشت بەدەست بهێنن ..!! هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحۡمَ ٱلۡخِنزِيرِ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٣]واتە : ئەو شتانەی کە خوای گەورە لێتانی حەرام کردووە بزانن [ٱلۡمَيۡتَةَ ] مردارەوە بووی وشکانی نەك دەریا هی دەریا حەلالە [ وَالدَّمَ ] وە خوێنیش جگە لە جەرگ و سپڵ کە حەلالە [ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ ] واتە : وە گۆشتی بەراز کە حەرامە بەهەموو شێوازێك..!!چونکە هەر قە دەغەکراوێك فەرمانی (خوای گەورە ) لە سەر بێت دەبێت جێ بەجی بکەین و گوێرایەلی بین ، چونکە گوێرایەلی کردنی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) عیبادەتە یان پەرستنە ، هەروەها ئەجامدانیشی سەرپێچی کردنە لە فەرمانەکان ، چونکە ئەگەر گوێرایەلی دورست کراوەکانی (خوای گەورە ) بکەین لە خراپە ئەوا بە دلنیایەوە سەرپیێچی فەرمانی (خوای گەورە ) دەکەین ..؟! دەبێت وورد بین بین لە گوڕایەلەی کردنی ولی ئەمردا ..؟!

هەر وەك ئەم چیرۆکەی شەو ڕۆیی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ قدس لە وەلاتی شام لەوێشەوە بۆ ئاسمانەکان بەهەشت و دۆزەخ دا ، ئە چیرۆکە ، لە سەرووی هەموو خیالە وەیە یان لە سەرووی هەموو یاساکانی ژیانی دونیایەوەیە ، (فوق تصور او خرق عادە) هێچ کەسێك لە کافرانی قوریش لە شاری مککە دا باوەری بەم بە سەر هاتەی نەکرد کە شەو ڕۆیی کرد ، بەلێ ڕووداوە کە زۆر سەیر بوو بەلای خەلکی شاری مککە وە بە تایبەتی بێ باوەرانی قورەیش ، چونکە هەر گیز لە و کاتەدا باوەریان نەدە کرد ، هەروەها بێ باوەرە کانی شاری مککە چوونە لای (ابو بکر صدیق ) وتیان : وە بزانە هاوەلەکەت واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستیان بوو ، وەتیان ئەوا دەلێ چی ..؟! دەلێت : ئەم شەو چوومە تە (بیت المقدس ) واتە : وەلاتی شام و شاری قدس ..؟! بێ گومان ئەم ڕووداوە لەم کاتە دا ، شتێکی سەر سوور هێنە رە ..؟! هەروەها بۆ ئیستاش کەسێك بلێ : من چومەتە ئاسمانە کان لە شەوێك دا ، چونکە نابیتە جێگای بڕواکردن هەرچەندەش تەکنەلۆجیا پێشکەو تووە ..؟! بەلام ئەگەر سەرنجی (ابو بکر ) بدەین زۆر بەندەیەکی دامەزاو باوەر دارێکی زۆر بەهێز بووە – خوای گەورە لێ ڕازی بێت – چونکە یەکسەر باوەری پێ کرد و پێغەمبەرەکەی بەراست زانی ، هەروەها ئەمە پێ دەلێن : گوڕایەلی کردن ، چونکە یەکسەر باوەری کرد بێ دوو دلی ..؟! هەروەها (ابو بکر) – خوا لێ ڕازی بێت – ووتی: ڕاست دەکات ، هەر وەك ڕاست گۆ ترین بەندەی خوایە خاوان ڕاستی و ئەمانەتە ، بەلێ (ابو بکر ) متمانەی یان ثقەی زۆری بە پێغەمبەرەکەی هەبوو ، هەر بۆیە یەکسە گوێڕایەلی فەرموودە ی ڕووداوە کەی کرد، بەراستی زانی، بەلێ (ابو بکر) – خوا لێ ڕازی بێت – متمانەی بە (خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی زۆر هەبوو، لە فەرمانە کانی خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ دەرنەدەچوو هەر گیز ، وە یگوێڕایەلی خوا پێغەمبەرکەی ﷺ دەکرد ، دەبێت موسلمان لە گوێڕایەل و فەرمان کردن نمونەی (ابو بکر ) بێت – خوای لێ ڕازی بێت – بەلێ کاتێك (خوای گەورە ) فەرمانی کرد بە (ابرهیم ) – علیە السلام – کەوا جگەرگۆشەکەی خۆی سەر برێت یان کورەکەی خۆ سەر برێت یەکسەر فەرمانەکەی جێ بەجێ کرد ، هەروەك کورە کەشی فەرمانەکەی باوکی بەجێ هێنا ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعۡيَ قَالَ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٠٢﴾ [الصَّافَّات : ١٠٢] واتە : جا کاتێك کە ئیسماعیل گەورە بوو، و لەگەڵ باوکیدا ڕێی دەکرد باوکی پێی وت : من لە خەودا بینیم کە تۆ سەر دەبڕم، جا تۆ ڕات چیە ؟ ( خەوی پەیامبەرانیش هەقە ) جا ئیسماعیلیش بۆ ڕازیبوونی پەروەردگاری و گوێڕایەڵی باوکی و یارمەتیدەری لەسەر گوێڕایەڵیخوی پەروەردگار وتی : ئەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوی لە سەربڕینی من ئەنجام بدە، بە ویستی خوای پەروەردگار دەبینی ئارامگر و گوێڕایەڵ و چاوەڕوانکاری پاداشتبم ..!!

قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾

بەڵێ کاتێ (خوای گەورە ) فەرمانی بە فریشتە کان کرد سوژدە ببەن بۆ ئادەم تەنها ئیبلیس سوژدەی نەبرد خۆی بەگەورەزانی ئەو چووە ریزی کافرانەوە یان ریزی بێ باوەرانەوە ، لێرە دا سەرنجێك بدەین لە جێ بەجێ نە کردنی فەرمانی (خوای گەورە ) لە لایەن ئیبلیس یان شەیتانەوە ، هەروەك زانراوە فریشتە هیچ تکلیفی لێ نەکراوە ، واتە : تکلیفی لە سەر نیە ، کە شتێك ئەنجامی نەدا بەلکو لە ژێر فەرمانەکانی (خوای گەورە)ن هەر فەرمانیچك دەر بکات یەکسەر ئەوان جێ بەجێ کارن ، فەرمانە کە جێ بەجێ دەکەن ، چونکە فریشتەکان هیچ سەر پێچی یەك ئەنجام نادەن ، وە فریشتە کان تۆمەتبار ناکرێن تکلیفی یان لەسەر نیە ، چونکە فریشتە کان ویستی خۆیان لە دەست دانیە واتە : مسیرن ، نەك مخیر ، بەلکو بە ویستی خۆ نەدەتوانان چاکە کار بن نە دەتوانن خراپە کار بن ، واتە : تەنها فریشتە مسیرە نەك مخیر ، چونکە ئەوان بۆ هەمیشە گوێرایە لی دەکەن بەوەی کە (خوای گەورە ) هەر فەرمانێك در بکات یەکسەر جێ بەجێ دەکەن و ئەنجامی دەدەن ، بۆیە (خوای گەورە ) هەر فەرمانێك یان بریارێك بدات ، بێ پرسیار کردن بیرکردنەوە یەکسەر ئەنجامی دەدن ، سەرپێچی ناکەن لە هیچ فەرمانێك ،چونکە فریشتە ویستی لە دەستە خۆ دانیە واتە : بەویستی خۆی هیچ فەرمانێك ئەنجام نادات یان سەرپێچی ناکات ، بەلام بە پێچەوانەی فریشتە کان ، (الانسان و جن ) یان مرۆڤ و جنۆکە ، ئەوان مخیر واتە : هەلبژاردنی هەر فەرمانیچك (خوای گەورە ) بیکات یان هەر واجبێك و فەرزێك یان هەر پەرستنێك و عیبادەتێك بریاری لەسەر دەبێت ، ئەوا مرۆڤ و جنۆکە سەر پشکە تێدا فەرمانەکە جێ بەجێ بکات و یان نەی کات ، هەروەك ووتمان فریشتەکان سەرپێچی ناکەن ، بەلام بە پێچەوانەوە مرۆڤ جنۆکە چاکە دەکەن و سەرپێچیش ئەنجام دەدن ، لە ژێر فەرمانی خوا دەردەچن لە سنوور دەدەچن ئینکاری دەکەن و پرسیاری زۆر دەکەن لە فەرمانەکانی (خوای گەورە ) چونکە ئەم دوو دروستکراوە مخیر کراوە واتە : هەلبژاردەنی چاکە و خراپە لە دەستە خۆیەتی ، چونکە مرۆڤ جنۆکە ، ئەگەر فەرمانێك لە لایان (خوی گەورە ) دەربچێت ئەوا هەلژاردن لە دەستە خۆیان دایە ئەگەر گوێرایەلی فەرمانەکەی بکەن یان گوێرایەلی فەرمانەکەی نەکەن ..؟! ئەوەی لە مرۆڤ و جنۆکە گوێرایەلی فەرمانە کانی (خوای گەورە ) بکە ئەوا لە ریزی ئیمانداران و چاکە کاران دایە ، ئەوەشی سەرپێچی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) بکە ئەوا لە ریزی کافران یان بێ باوەران و سەرپێچی کاران و لە سنوور دەر چووان دایە ..؟!

هەروەك ئەم نموونەیە دەلێن : بەکەسێك نوێژ بکا گوێرایەلی فەرمانەکەی (خوای گەورە ) بکە ..؟! بەلام ئەگەر نوێژی نەکرد گوێرایەل نەبوو ئەوا بە دلنیایی لە کەسانە دایە کە سەرپێچی کارە و گوێرا یەلی نەکردووە کەمتەرخەمی و تەمبەلی ئەنجام داوە ، بۆیە ئەوکەسە دەچێتە ریزی بێ باوەرانەوە ، چونکە سەرپێچی ئەنجامداوە ..؟! لێرە دا جیاوازی نێوان ئەو کەسەی کە نوێژ دەکات و ئەو کەسەی کە نوێژ ناکات بۆ مان دەر دەکەوێت ، ئەوەی ئەنجامی دەدا چاکە کارە ، ئەوەی ئەنجامی نادات خراپە کارە لە رووی پەرستن عیبادەتەوە ، بەلێ مرۆڤ جنۆکە متاح وەردەگرن بەلام فریشتە متاح وەرناگرن ، بۆیە فریشتە مسرە ، بەلام مرۆڤ و چنۆکە مخیرەن لە عیبادەت و پەرستن ، ئەوەی جێ بەجێ بکات لە چاکە کارانە ، ئەوەشی سەرپێچی بکات لە خراپە کارانە ..؟!

کەواتە هەموو دورست کراوە کانی (خوای گەورە ) مسیرن ، واتە : ویستیان لەدەستە خۆ دانیە ، تەنها مرۆڤ و جنۆکە مخیرن ،واتە ئەوان هەلبژاردن لە دەستە خۆیان دایەو ، وە متاح یان هەیە ، بەلام فریشتە و دورست کراوە کانی تر متاح یان نیە ..؟! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ١١﴾ [فُصِّلَت : ١١] واتە : جا بە ئاسمان و زەوی فەرمووی : بە سەرپشکی یان بە ملکەچی پابەندبن بە فەرمانی منەوە، وتیان : بە ملکەچی دێین، و هیچ ویستێکمان نیە پێچەوانەی ویستی تۆ بیێتەوە ..؟! واتە: ئەوەی دورستکراوە هەیە جگەلە مرۆڤ و جنۆکە ، هەر هەمووی مسیرە ، گوێرایەلی لە دەستە خۆی دانیە هەردەبێت گوێرایەل بێت..؟! هەروەك (خوای گەورە ) دەربارەی سوژدە بردنی فریشتە کان بۆ ئادەم تەنها ئیبلیس نەبێت سوژدەی نەبرد ،ئەوەش ئەوە دەگەینی کە ئیبلیس لە هۆزی جنۆکە یان لە قبیلە ی (جن ) بووە ، چونکە لە دەستەی فریشتە کان نەبووە ، چونکە فریشتەکان مسیرن ویستیان لە دەستەخۆ دانیە ، بەلام ئیبلیس مخیرە ویستی گوێرایەلی و سەرپێچی هەیە لە دەستی خۆی دایە فەرمانەکان جێ بەجێ بکان یان سەرپێچی بکات لە خراپە کاران و لە کافران بێ، قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٤]بەلێ ئیبلیس سوژدەی نەبرد چونکە مخیر بوو سوژدەکە لە دەستی خۆی دا بوو سوژد ببات یان سەر پێچی بکات سوژدەکە نەبات ..؟! چونکە ئەو لە هۆزی جنۆکەکان بوو، قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ﴾ [الكَهۡف : ٥٠] واتە : ئیبلیس گوێرایەلی فەرمانەکەی نە کرد سوژدەی نەبرد ، چونکە لە قبیلە ی جنۆکە بوو ، ئیبلیس تەنها سەرپێچی نەرکرد لە فەرمانەکە ، بەلکو خۆی بەگەورە و لە خۆبایی زانی ، هەموو خراپە کاریەك و ئینکاری بێ باوەری تیدا کۆبوویەوە ، چونکە گەورە ترین تاوان لە لای (خوای گەورە ) لە خۆبایی خۆ بەگەورە زانین و ئینکاری گوێرایەلی نەکردنە لە فەرمانەکانی ، هەروەك دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓ﴾ [الكَهۡف : ٥٠] واتە : شەیتان یان ئیبلیس یاخی بوو لە فەرمانی پەروەردگار سوژدەی نەبرد..؟!

ئیبلیس ووتی : قال تعالى: ﴿قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ٦١﴾ [الإِسۡرَاء : ٦١] واتە : ووتی : من سوژدە ببەم بۆ کەسێك کە لە قور یان گل دورست کردووە ..؟! هەروەها ئیبلیس ووتی : قال تعالى: ﴿قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ٧٦﴾ [ص : ٧٦] واتە : ییلیسیش وەکو بەرهەڵستیەك بۆ پەروەردگاری ووتی : من سوجدەم بۆ نەبرد، لەبەر ئەوەی من لەو چاکترم، لەو ڕووەی کە منت لەئاگر دروستکردووە و ئەویشت لەقوڕ. وە ئاگریش چاکترە لەقوڕ ..؟! قال تعالى: ﴿أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾ [البَقَرَةِ : ٣٤] واتە : ئیبلیس خۆیی بە گەورەزانی چووە ریزی بێ باوەرانەوە ..!!

له (عبدالله بن مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – ده گێریتەوه له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لا يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ فى قَلْبِهِ مِثْقالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِن إيمانٍ، ولا يَدْخُلُ الجَنَّةَ أَحَدٌ فى قَلْبِهِ مِثْقالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِن كِبْرِياءَ)).[١]

واته: ناچێته ناو ئاگری دۆزەخەوه ئەگەر كەسێك بە قەد گەردیلەیەك یان مثقال له دەنكە خردل ئیمانی له دلی دابێت ..؟! وه ئەو كەسەش ناچێته بەهەشتەوه ئەگەر بە قەدر گەردیله یەك یان مثقال له دەنكە خردل گەورەیی و خۆ بە زل زانی له دلی دابێت ..؟!

له (ابو هريره) – خوا لێ رازی بێت – دەگیریتەوه له (هناد) دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوای گەوره ) فەرموویەتی : ((قال اللهُ تبارَكَ وتعالى: الكِبْرِياءُ رِدائى، والعَظمةُ إزارى، فمَن نازَعَنى واحدًا منهما قذَفتُه فى النارِ)).[٢] واته : گەورەیی و مەزنایەتی پۆشاك و كالای منن مافی كەسی تریان پێوە نیه ، ئەو كەسه ی یەكێ لەم دووانه بەربەرەكانێ و دژایەتیم بكات ئەوە فرێی دەدەمە نا ئاگری دۆزەخەوە ..؟!

له (عبدالله بن مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – ده گێریتەوه له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( لا يدخل الجنة من كان فى قلبه مثقال حبة من خردل من كبر ، ولا يدخل النار من كان فى قلبه مثقال خردلة من إيمان )).[٣]واته : (خوای گەوره ) دەفەرمووی : هەر كەسێ سەنگی دەنكە خردل خۆ بەگەوره یان بەزل بزانێ ، وه له دلی دابێ ناچێته بەهەشتەوه ، هەر كەسێ سەنگی دەنكە خردل ئیمانی له دلدا بێ ناچێته ئاگری دۆزەخەوه ..؟!

له (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – ده گێریتەوه ، پیاوێك هاته خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ : ((أنَّ رجلاً أتى النبيَّ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ وكان رجلاً جميلاً ، فقال : يا رسولَ اللهِ إنى رجلٌ حُبِّب إليَّ الجمالُ ، وأُعطيتُ منه ما ترى حتى ما أُحبُّ أن يفوقنى أحدٌ ، إما قال : بشِراك نعْلى ، وإما قال : بشِسْع نَعلى ، أفمنَ الكِبرِ ذلك ؟ قال : لا ، ولكنَّ الكبرَ من بطَر الحقَّ ، وغمطَ الناسَ)) .[٤] واته : پیاوێك هاته خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ، پیاوێكی زۆر جوان بوو ، ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پیاوێكم زۆر حەزم له جوانی یه ، ئەوەندەیشم پێ بەخشراوه كه دیبینی ، هەتا حەزم ناكەم كەس له خۆم جوانتر دەركەوێ یان جوان تربێ ..!! تەنانەت نعله كانیشم چاكتر دەكەم ، ئایا ئەوه له خۆ بایی یه

[١] - صحيح مسلم برقم (٩١).
[٢] - سنن ابي داود برقم (٤٠٩٠).
[٣] -سنن ابي داود برقم (٤٠٩١).
[٤] -سنن ابي داود برقم (٤٠٩٢).

یان خۆ بە گەورە زانی یە ..؟! پێغەمبەی خوا ﷺ فەرموی : نا خۆ بە گەورە زاینن حەق پێشەل کردنە، وە خەلك بەکەم سووك دانانە لە چاوە خۆتەوە ..؟!

📖 لە (عبدالله بن مسعود ) – خوا لێ رازی بێت – دە گێریتەوە ، لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لا يدخلُ الجنَّةَ من كانَ في قلبِه مثقالُ ذرَّةٍ من كبرٍ ولا يدخلُ النَّارَ يعني من كانَ في قلبِه مثقالُ ذرَّةٍ من إيمانٍ قالَ فقالَ لَه رجلٌ إنَّهُ يعجبني أن يَكونَ ثوبي حسنًا ونعلي حسنةً قالَ إنَّ اللَّهَ يحبُّ الجمالَ ولَكنَّ الكبرَ من بطرَ الحقَّ وغمصَ النَّاسَ)). [1]واتە:هەر کەسێ سەنگی دەنکە خردل خۆبە گەورە زانینی لە دل دا بێ نا چێتە بەهەشتەوە ..!! هەر کەسێ سەنگی دەنکە خردل ئیمانی لە دل دا بێ ناچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ..!! پیاوێك پێ ووت : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من حەز دەکەم جل بەرکو تەنانەت نەعلە کانیشم جوان و کەشخە بێت ، ئایا لە خۆباییەوەیە یان لە خۆ بەگەورە زانینەوە یە ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : نا نەخێر . (خوای گەورە ) خۆی جوانە و شتی جوانی خۆشدەوێ ، بەلکو خۆ بەگەورە زانین و لە خۆبایی بوون ناحەقی یە یان حەق پێشەل کردنە بە چاوی سووك و کەم تەماشای خوارە خۆ دەکەیت ، واتە: خەلکی بە نزم دەبینی لە ئاست خۆتدا..؟!

✍ لە رێ (الربيع بن أنس ) لە ( ابی العالیە )- رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی: قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ دەلێت : واتە: فریشتە کان لە سەر زەوی بوون کاتێ سوژدە یان برد بۆ ئادەم ..!!). [2]

✍ لە (عمر بن عبدالعزيز ) – رەحمەتی خوای لێ بێت –دەلێت : کاتێ (خوای گەورە ) فەرمانی کرد بە فریشتەکان ، کە سوژدە بەرن بۆ ئادەم ، ئەوە بوو یەکەم فریشتە سوژدەی برد (إسرافیل ) بوو ، بۆیە پاداشتی دایە وە بە نووسینی قورئان لەم بارەیەوە ..!!). [3]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَإِذۡ﴾ دەلێت: واتە :مانای (وقد ) واتە : وابوو . قال تعالى: ﴿قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ واتە: جنۆکە کان دروست کردووە لە گرو بلیسەی ئاگر تێکەل ..). [4]

---
[1] - سنن الترمذي برقم (١٩٩٩).
[2] اخرجه ابن ابي حاتم (٨٣/١)(٣٥٨).
[3] - ابن عساكر (٣٩٨/٧).
[4] - تفسير مقاتل بن سليمان (٩٨/١)

✍ لە ڕیێ (سعید ) لە (قتادە ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت- لە سە ر ووتەی قال تعالى: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ﴾ دەڵێت : واتە : فریشتە کان سوژە یان برد بۆ ئادەم ، گوێرایەڵی فەرمانی خوا بوون ، (خوای گەورە) شکۆ و ڕێزی لە ئادەم نا بە سوژدە بردنی فریشتە کان بۆی ..!! ).[1]

📖 لە (أنس بن مالك ) – خوا لێ ڕازی بێت – دە گێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( إن الله أمر آدم بالسجود ، فسجد ، فقال : لك الجنة ، ولمن سجد من ولدك . وأمر إبليس بالسجود ، فأبى أن يسجد ، فقال : لك النار ، ولمن أبى من ولدك أن يسجد )).[2] واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (خوای گەورە ) فەرمانی کرد بە ئادەم سوژدە ببات ، ئادەم سوژدەی برد ، فەرمووی : بە هەشت هی تۆیە ، هی نەوەکانی تۆیە ئەوەی سوژدە دەبات ، وە فەرمانی کرد بە شەیتان یان ئیبلیس سوژدە بەرێ ، بەلام خۆیی بە گەورە زانی سوژدەی نە برد ، فەرمووی : دۆزەخ یان ئاگر هی تۆیە ، هی نەوەکانی شەیتانە ئەوانەی سوژدە نابەن و خۆ بەگەورە دەزانن ..!!

✍ لە ڕێ (قتادە ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت – لە سەر ووتەی : قال تعالى: ﴿ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ﴾ دەڵێت : سوژدە بردن بۆ ئادەم ، واتە : (طاعة الله ) واتە: فریشتە کان گوێرایەڵی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) یان کرد ..!!).[3]

✍ لەڕێ (عباد بن منصور ) لە (الحسن البصري ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : دەربارەی ئەو ئایەتەی کە (خوای گەورە ) فەرمان بە فریشتە کان دەکات سوژدە بن ، ئەوانیش سوژدە یان برد بۆ ئادەم ، ئەوا شکۆ و ڕێزە بووە لە لایەن (خوای گەورە ) بۆ ئادەم ..).[4]

✍ لە (محمد بن عباد بن جعفر المخزومي ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : کاتی کە فریشتە کان سوژدە یان برد بۆ ئادەم ، ئاماژە یەك بوو ، یان (إشارە) ..!!).[5]

✍ لە (ابی إبراهیم المزني ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – پرسیاریان کرد دەربارەی سوژدە بردنی فریشتە کان بۆ ئادەم ، ووتی : (خوای گەورە ) ئادەمی دورست کرد ، وەك هاوشێوەی کعبە کە بۆتە ڕووگەی موسلمانان لە سەر زەوی ،ئاواش فریشە کان سوژدەیان بۆ برد ..!!) .[6]

---

[1] تفسير ابن ابي زمنين (١٣٣/١).
[2] - اخرجه محمد بن نصر ، في تعظيم قدر الصلاة (٣٢٨/١-٣٢٩).
[3] - اخرجه ابن ابي حاتم (٨٤/١).
[4] - اخرجه ابن ابي حاتم (٨٣/١).
[5] - اخرجه ابو الشيخ في العظمة (١٠٤١).
[6] -اخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٣٩٨/٧).

✍ لە ریْ (یعلی بن مسلم ) لە(سعید بن جبیر ) لە (عبدالله بن عباس ) – رەحمەتی خوای لیْ بێت – دەلێت : ئیبلیس : ناوی (عزازیل ) بوو ، ئەو بەرێز ترینی فریشتەکان بوو ، خاوەنی چوار بال بوو ، پاشان بووە سەرۆکی شەیتانەکان رووحی بەر جەستە کراوی خراپەکاریەکان و شتە قێزە وونەکان ..!!).[١]

✍ لەریْ (ابی روق ) لە (ضحاك) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیْ رازی بێت – دەلێت : بۆیە ناوی (ئیبلیس ) بوو، چونکە (خوای گەورە ) لە هەموو خێرێك دای مالی و بیْ هوودەی کرد ..).[٢]

✍ لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لیْ بێت – دەلێت : (ئیبلیس) زۆر گەمژە بوو لە گوێرایەلی کردن ..).[٣]

✍ لە ریْ (أسباط ) لە (اسماعیل السدي ) – رە حمە تی خوای لی بیت – دەلێت : ناوی (حارث) بوو ، بوویە ناوی براوە بە ئیبلیس چونکە گەمژە خراپە کار بوو ، خۆی وەك رێوی رەفتاری دەکرد خۆی فەقیر دەکرد..؟! ).[٤]

✍ لەریْ پیاوێك لە (عکرمە ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیْ رازی بێت- لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿أَبَىٰ﴾ دەلێت : کە (خوای گەورە ) دروست کراوێکی دروست کرد ، فەرمووی : سوژدە ببن بۆ ئادەم ، ووتیان : نای بەین یان ئەو کارە ناکەین ..؟! (خوای گەورە ) ئاگرێچکی نارد ئەوانی سوتاند، دواتر بوونەوەرێکی دیکەی دروست کرد ، ووتی : من مرۆڤێك لە قور یان گل دروست دەکەم ، وە دەبیچت سوژدە بۆ ئادەم ببەن . دەلێت : رازی نەبوو حاشایان کرد ، (خوای گەورە ) ئاگرێکی رەوانە کرد و ئەوانیشی سووتاند . دواتر ئەم دەستەی دورست کرد ، فەرمووی : ئایا سوژدە ش بۆ ئادەم نابەن ..؟! ووتیان : دیبەین بەلام ئیبلیس حاشای کرد و سوژدەی نە برد ..!!).[٥]

[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٤/١)، و ابن الانباري في لاضداد ص ٣٣٦.
[٢] -اخرجه ابن جرير (٥٤٣/١).
[٣] -اخرجه ابن جرير (٥٤٣/١).
[٤] -اخرجه ابن جرير (٥٤٣/١).
[٥] -اخرجه ابن جرير (٥٤١/١).

✍ لەریٚ (عمر بن الغفار ) لە ( سفيان بن عيينه ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەلیٚت : پرسیار کرا دەربارەی ئەم ووتەیە ( ليدخلن الجنه إلا من أبى ) واتە : دچنە بەهەشتە وە ، تەنها ئەوانە نەبیٚ کە حاشایان کرد خۆیان بە گەورە زانی سوژدەیان نەبرد، وەتەنها سەرپیٚچی کاران کە نافەرمانی دەکەن و خراپە کاران وەك ئەم ووتەیە قال تعالى: ﴿فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ﴾ ..!!).[١]

تێبینی / لە سەر ئەم ووتەی (سفيان بن عيينه ) ، مەبەست لیٚ ئەوەی سوژدە نەبات بۆ پەروەردگای خۆی وەك ئیبلیس یان شەیتان وایە ، مەبەست لیٚ ئەوانەی نویٚژ ناکەن و سوژدە نابەن بۆ یەکجاریش باوەریان بە نویٚژ کردن و سوژدە بردن بۆ (خوای گەورە ) نیە بیٚ گومان ئەوانە لە کافرانن یان لە بیٚ باوەرانن ..؟! کەواتە بە بەلگەی شەرعی نویٚژ نەکەری عیقدەی کافرە بە کۆدەنگی زانایان.

✍ لەریٚ (طاووس) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – دەلیٚت : ئیبلیس پیٚش ئەوەی خراپە کاری و سەرپیٚچی بکات لە فریشتە کان بوو ، ناوی (عزازيل ) بوو ، ئەو لە سەر زەوی نیشتەجیٚ بوو ، وە یەکیٚك بوو لە فریشتە زۆر ئجتهادە کان واتە : تیٚ کۆشەرە کان ، وە زۆر زانیاری لە وانی تر زیاتر بوو ، بەلام بانگەشەی خۆ بەگەورە زانینی کرد و لە خۆ بایی بوو ، ئەو لە قبیلە ی جنۆکەکان دروست کراو بوو لە ئاگری بلیسە دار ..!!).[٢]

تێبینی / (جن) یان (جنًا ) واتە : دروست کراوەیٚکی نادیار و مخفی ، هەر بۆیە جنۆکە نادیارە نابینریٚت ، چونکە لە ئاگر دورست کراون ، ئەگەر سەرنج بدەینە ئەوەی زانایان بە تایبەتی (طبري ) کە لە باسی دورست کردنی ئادەم ، پاشایەتی ئیبلیس یان شەیتان وەدەر کردنی ئادەم لە بەهەشت دا ، باسی مار دەکات دەلیٚت : ئیبلیس لە شیٚوەی مار چووە نیٚو بەهەشتەوە بۆ ئەنجامدانی وەسوەسەی ئادەم و هەلە کردنی ئادەم ، منیش لیٚرە دا بۆیە باسم کرد لە زمانی عەربی دا بە سیٚ ووشە ناوی مار هاتووە ، وەك لە قورئان دا باسی مار دەکات ، قال تعالى: ﴿وَٱلۡجَآنَّ خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ٢٧﴾ [الحِجر : ٢٧] واتە: وە جنیشمان دروست کردووە لە پێش ئادەمدا لە ئاگرێك کە گڕو بڵێسەی هەیە، مەبەست پێی ئیبلیسە، بۆیە پێی ئەووترێ: (الْجَانَّ) یان جنی لەبەر ئەوەی لەبەر چاو دیار نیە..!! بەلیٚ ووشەی ﴿ثُعۡبَانٌ﴾ واتە: ماریٚکی زۆر گەورە و زخم و مەزن بەلام نیٚر ، ووشەی ﴿حَيَّةٌ﴾ واتە: ماری ئاسایی نیٚرو میٚ ،ووشەی ﴿جَآنٌّ﴾ واتە: تیرە ماریٚکی باریٚك جوولە و خیٚرایی زۆر ، یان (أشد حركه وسرعه ) واتە : زۆر بەدەگمەن بە چاو دەبیریٚت ..؟! ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم سیٚ ووشەیە یان ئەم سیٚ ئایەتەدا ، کە لە نیٚوان موسى (عليه السلام ) فیرعەون و ئۆمەتەکەی روویدا ، موعجیزەی مارەکەی موسى ، بەلام قورئانی پیرۆز هەر ناویٚکی ماری لە شویٚنی خۆی داناوە لە شویٚنی گونجاوی دانەوە ..؟!

یەکەم : ووشەی (ثعبان ) واتە: ماریٚکی زۆر گەورە و زەخم مەزن و نیٚر ، بۆ ئەوەی فیرعەون لیٚ بترسیٚ چونکە فیرعەون خۆی بەگەورە دادەنا ، بۆیە لەم شویٚنە ناوی مارەکە بە گەورە و زەخم مەزن نیٚر هاتووە بۆ ئەوەی فیرعەون بترسیٚ ، هەر وەك (خوای گەور )

---
[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٤/١).
[٢] -اخرجه ابن جرير (٥٣٦/١).

دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ۝١٠٧﴾ [الأَعْرَاف : ١٠٧]واتە: {دوو لە موعجیزەکانی موسا پێغەمبەر [ فَأَلْقَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُبِينٌ ] موسا گۆچانەکەی هەڵدا بوو بە مارێکی زۆر گەورە بە ئاشکرا بە چاوی خۆیان بینیان کە دەمی کردبووەوەو بەرەو فیرعەون رۆیشت..!!

دووەم : ووشەی (حیة ) واتە : مارێکی ئاسایی نێرو مێ یە، بۆ ئۆمەتەکەی فیرعون واتە بۆ خەلکی بە گشتی ، نەوە ك بۆ فیرعەون چونکەو شوێنی کەی گونجاوە وە مارێکی ئاسایی بچووك نەك گەورەو زەخم هەر وەکو ماری ئاسایی کە خەلك دیبینێ ..؟! (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿قَالَ أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ۝١٩ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ۝٢٠﴾ [طه : ١٩ - ٢٠] واتە : خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسی گۆچانەکەت فرێ بدە سەر زەوی...!! ئەویش فرێیدا کاتێك بینی گۆچانەکەی بوو بە مارێکی گەورە کە بەخێرایی ئەڕۆی، وە موساش - صلی الله علیه وسلم - کە ئەوەی بینی ترسا..!!

سێ یەم : ووشەی (جان ) واتە: تیرە مارێکی بچووکی زۆر بە جوولە و خێرایی زۆر ، زۆر بە خێرای لە چاو وون دەبێ چونکە خێرایی جوولە کەی زۆرە ، مەبەستمان لە ووشەی (جان ) واتە : نادیار و مخفی ، (جن) یان جنۆکە هەر بەم شێوەن بەدەگمەن دەبیرێن ، خیرایی زۆر جوولەی زۆریان هەیە ، ئیبلیس یان شەیتان لە قبیلەی (جن ) بۆیە لە شێوەی مار چۆتەوە نێو بەهەشتەوە بۆ وسوسە کردنی ئادەم ..؟! بۆیە ووشەی (جان ) هاتووە لە دوو شوێندا لە قورئاندا بۆ خەلکە ئەوانەی کە ئیماندار و موسلمانان نابێ لە (جان ) برتسن ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿وَأَلْقِ عَصَاكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ۚ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ۝١٠﴾ [النَّمل : ١٠] واتە : داردەستەکەت فرێدە وموساش فرێیدا و بوو بەمارێك، جا کاتێك کە بینی بە سوکی وەکو مارێکی خێرا دەجوڵێتەوە موسا ڕایکرد و لێی هەڵات و نەگەڕایەوە لای، خوای گەورەش دڵنیایی کردەوە بەوەی پێی فەرموو : ئەی موسا مەترسە، چونکە لەلای مندا ئەوانە ترسیان نیە کە پەیامی خۆمیان پێدا دەنێرم، بەڵام ئەوەی سنوور ببەزێنێت بەتاوانکردن ..!! هە روە ها دە فە رموویت: قال تعالی: ﴿وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ۚ يَٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ ۖ إِنَّكَ مِنَ ٱلْءَامِنِينَ ۝٣١﴾ [القَصَص : ٣١]واتە : جا کاتێك کە موسا گەیشتە لای ئاگرەکە لەلای ڕاستی شیوەکەوە لەو پارچە زەویەی بە بەرەکەت و پیرۆزەی نزیك درەختەکەوە خوای پەروەردگار بانگی لێکرد : ئەی موسا بێگومان منم ( اللّە ) کە پەروەردگاری جیهانیانم، و گۆچانەکەشت فرێ بدە و موساش فڕێیدا، و بوو بە مارێك و دەجووڵایەوە و دەڕۆیشت، جا کە موسا بینی وەك جنۆکە دەجوڵێتەوە و دەڕوات

لەسەر شێوەی مار، پشتی لێکرد و لێی هەڵهات، و لە ترسا ئاوڕی نەدایەوە، و پەروەردگاری بانگی لێکرد : ئەی موسا بەرەو لای من وەرە و مەترسە، وگومانت لەوەدا نەبێت کە تۆ لەو کەسانەیت لە ئەماندان لە هەموو خراپەیەك ..!!

✍ لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیّ رازی بێت – دەڵێت : ئیبلیس لە بەرێز ترین و لە ئەشرف ترین فەریشتە کان بوو ، لە ناو قبیلە کەی خۆی دا ، ئەو خەزێنە داری بەهەشت بوو ، ئەو بەرێوەبەری ئاسمانە و زەوی بوو ، واتە : چارەسەری ئاسمان و زەوی لە دەستی دا بوو ،گەورە ترین سەرۆك و سلطانی ئاسمانەکان بوو ، لە دەستەی ئەو فریشتانە بوون کە (جن ) بوون یان جنۆکە بوون ، چونکە خەزێنەدارانی بەهەشت بوون ، بۆیە تووشی گومان هاتووە خۆی بە گەورە دانا ، ئەو خۆ بە گەورە بوونەی ئیبلیس تەنها (خوای گەورە ) علم و زانستی و زانیاری پیّ هەبوو ، کاتێك (خوای گەورە ) فەرمانی کرد بە فریشتەکان سوژدە بن بۆ ئادەم ، ئیبلیس لە سنوور دەرچوو یاخی بوو سەرپیّچی فەرمانەکەی خوای کرد ..؟! ).[1]

✍ لە ریّ (السدی) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیّ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَٱسۡتَكۡبَرَ﴾ دەلێت: واتە : ئیبلیس راستگۆی فریشتەکان بوو لە ئاسمانی دونیا دا ، دەلێت : بەلام سەرپیّچی کردو لە سنوور دەرچوو خۆی بە گەورە زانی ..!!).[2]

✍ لەریّ (سعید ) لە (قتادە ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَٱسۡتَكۡبَرَ﴾دەلێت : ئیبلیسی دووژمنی خوا ، ئیرەیی و حسوودی بۆ بە ئادەم لە سەر ئەوی (خوای گەورە ) کرامەتی پیّ بەخشی بوو ، ئیبلیس ووتی: من لە ئاگرم ، ئەو لە قور یان لە گلە ، ئەوە یەکەم گوناهو تاوان و یان سەرپیّچی گەورەی ئیبلیس بوو ، خۆ بەگەورە و لە خۆ بایی زانی دوژمنی خوا ، بۆ سوژدە بردن بۆ ئادەم ..).[3]

[1] -عزاه السيوطي إلي ابن المنذر ، تفسير المأثور (٢٥٧/١).
[2] اخرجه ابن ابي حاتم (٨٤/١).
[3] - اخرجه ابن ابي حاتم (٨٤/١).

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَٱسۡتَكۡبَرَ﴾دەلێت : مانای : خۆ بەگەورە زانین بۆ سوژدەبردن بۆ ئادەم ، لە کاتێك دا فەرمانی (خوای گەورە ) بوو ، بۆ سوژدە برن بۆ ئادەم ، بەلام (خوای گەورە ) زانیاری و علمی هەبوو بەوەی کە چی لە ناو دلی ئیبلیس دایە ، فریشتە کان خۆشیان دەویست بە کارە ئاشکراکانی ئیبلیس ، بەلام ئەو لە نفسی خۆیدا بە نهێنی هێشت بوویەوە بە دیاری نەدەخست کردەوە خراپە کانی ، هەروەك (خوای گەورە ) زانایە بە ناو دل نەفسی ئیبلیس ، کە دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسۡجُدَ إِذۡ أَمَرۡتُكَۖ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ١٢﴾ [الأَعۡرَاف : ١٢]واتە : خوای پەروەردگار وەکو سەرزنشتێك بۆ سووژدە نەبردنی بە ئیبلیسی فەرموو : چی رێگرت بوو لەوەی سووژدە نەبەی کە فەرمانم پێکردی ؟ ئیبلیسیش لەوەڵامدا وتی : من باشترم لەو لە دروستکردنماندا، چونکە من لە ئاگر دروستکراوم بەڵام ئەو لە قوڕ دروستکراوە، چونکە ئەو وای دەبینی کە ئاگر لە قوڕ بەرێزترە ..).[1]

✍ لە (عبدالله بن عباس ) – خوای لێ رازی بیت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾ دەلێت : (خوای گەورە ) دورستی بە بێ باوەری یان کافری ، نا توانێت ئیماندار بێت ..!!).[2]

✍ لە رێ (الربیع بن أنس ) لە (أبی العالیە )- رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾دەلێت : مانای سەرپێچی کاران ، یان تاوانباران ..).[3]

✍ لەرێ (موسی بن عبیدة الربذي ) لە (محمد بن کعب القرظي ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : لە سەرتادا (خوای گەورە) ئیبلیسی دروست کرد بە کافری یان بێ باوەری و گومرایی ، بەلام کارو کردەوەی فریشتەکانی ئەنجام دەدا لە سەرەتا ..؟! هەر لە سەرتادا ئیبلیس خۆی لە خۆی دا لە کافران بوو، قال تعالى: ﴿وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾ ..؟! ) .[4]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت: ئیبلیس لە دەستەی کافرانە ، لەوانەی کە (خوای گەورە ) لە حیکمەت و زانستی خۆیدا نەهامەتی بۆ سەپاندووە لە کردەوەکانی دا ، چونکە سوژدەی نە برد ..).[5]

[1] - تفسير مقاتل بن سليمان (٩٩/١).
[2] - عزاه السيوطي إلي ابن المنذر ، تفسير المأثور (٢٥٧/١).
[3] -اخرجه ابن جرير (٥٤٦/١)، وابن ابي حاتم (٨٥/١).
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٥/١).
[5] -تفسير مقاتل بن سليمان (٨٧/١).

✍ لەرێ (مجاهد) لە (جناد بن أبي أمیە) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت: یەکەم هەڵەی کە کرا، هەڵەی ئیرەیی و حسوودی بوو، ئەوە بوو ئیبلیس ئیرەیی حسوودی برد بە ئادەم، فەرمان کردن بە سوژدە بردن بۆی، ئەو کارەی حسوودی ئیبلی بووە هۆی سەرپێچیە کەی ..).[1]

📖 لە (ابو هريره)- خوا لێ رازی بێت - دەگێڕیتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إذا قَرَأَ ابنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ اعْتَزَلَ الشَّيْطانُ يَبْكِي، يقولُ: يا وَيْلَهُ، وفي رِوايَةِ أبِي كُرَيْبٍ: يا وَيْلِي، أُمِرَ ابنُ آدَمَ بالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الجَنَّةُ، وأُمِرْتُ بالسُّجُودِ فأبَيْتُ فَلِيَ النّارُ. وفي رواية: فَعَصَيْتُ فَلِيَ النّارُ)).[2] واتە: ئادەمیزاد ئەگەر ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە سووژدەی تێدایە و سووژدەی برد، ئەوا شەیتان دوور دەکەوێتەوە و دەگری..؟! دەڵێت: ئای قورت بەسەر، لە ریوایەتی (ابی کریب) دا، دەڵێت: ئای قور بەسەر فەرمان کرا بە ئادەمیزاد سوژدە ببات ..؟! سووژدەی برد و بەهەشت بۆ ئەوەو ..؟! منیش فەرمانم پێ کرا سوژدە ببەم، رازی نەبووم ئاگر بۆ منە ..؟!

قال تعالى: ﴿وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٣٥﴾ [البَقَرَة : ٣٥]

قال تعالى: ﴿وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ﴾ واتە: ووتمان: ئەی ئادەم، قال تعالى: ﴿ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ﴾ واتە: خۆت و هاوسەرەکەت نیشتەجێ بن لەم بەهەشتە دا، قال تعالى: ﴿وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا﴾ واتە: وە لە هەموو خواردەمەنی یەکی بخۆن بە تە تێرو تەسەلی ،قال تعالى: ﴿حَيْثُ شِئْتُمَا﴾ واتە: لە هەر شوێنیك کە حەز دەکەن، قال تعالى: ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ واتە: وە نزیکی ئەم درەختە مەکەون ،قال تعالى: ﴿فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٣٥﴾ واتە: تاکو لە ستەم کاران هەژمار نەکرێن ..؟! بەڵێ (خوای گەورە) لە قورئانەکەی دا باس دەکە دەفەرموویێت: ووتمان: ئەی ئادەم خۆت هاوسەرەکەت لە ناو ئەم بەهەشتە دا ئارام بگرن و بحەسێنەو، لە هەر شوێنێك یان جێگایەکی ئەم بەهەشتە دا، کە هەر چی ئارەزوتان یان هەر چی خواستان لێ هەیە بگەرێن و بی خۆن لە خوادرمەنی و خواردنەوەکانی بەهەشت، بخۆن بە لێشاوی چۆن ئارەزو دەکەن و لە کام دەتانەوەی

[1] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٥/١).
[2] - صحيح مسلم برقم (٨١).

بی خۆن ..؟! بەلام نەکەن نزیکی ئەو درەختە بکەون ، یان نزیکی ئەو درەختە نەکەون ..؟! کە درختێکی ناسراو دیاری بوو لە لایان ، جا ئەگەر لەو دەرختە نزیك کەوتنەوە و سووتان لێ وەرگرت ئەو کاتە خۆت و هاوسەرەکەت لە ستەمکارانن..؟!

هەلبەتە ئەگەر تەماشاکەی لەم ئایە تە دا دەبینین ناوی (حەوا) واتە : هاسەری ئادەم ، نەهاتووە بەلکو لە هیچ شوێنێکی قورئانیش ناوی (حەوا ) نە هاتووە ، بەلکو لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە (حەوا ) ناوی هاتووە ، بە لام لە قورئاندا هەر دە فەرمووی هاوسەری ئادەم ..!!

📖 لە (سلمانی فارسی ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إنَّ آدمَ اُهبِطَ إلى الأرض ومعَهُ السِّندانِ والْكلبتانِ والمطرقةُ واُهبِطت حوَّاءُ بجدَّةَ)) .[١] واتە : ئادەم (علیه السلام ) دا بەزێنرایە خوارە وە بۆ سەر زەوەی لە گەل چەند ئامرازێکی ئاسنی وەك چەقۆ چەکش و تۆ بەزی ئاسنی ، حواش دابەزێنرایە خوارەوە لە بیابان ..!!

جا جێی سەرنج ئەوەیە (خوای گەورە ) باسی دروست بوونی ئادەمی کردووە ، بەلام باسی دورست بوونی (حەوا)ی نە کردووە ، تەنها دەفەرمووی : هاوسەری ئادەم ، لە بەهەشت دا نیشتەجێ بوون یان لە گەلی دا بوو لە بەهەشت دا ، هەر چەندە هەندێك زانایان دەلێن لە پەراسووی ئادەم دروست بووە ..؟! چونکە زانایان ئەم ئایەتە دەکەنە بەلگە کە لە پەراسووی ئادەم دروست بووە..!!

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ①﴾ [النِّسَاء : ١]واتە : ئەی خەڵكی تەقوای ئەو خوایە بکەن کە ئێوەی دروست کردووە لە یەك کەس کە ئادەم بوو- صلى الله عليه وسلم - [ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا ] وە لە پەراسوی ئادەمیش خێزانەکەی دروست کرد کە حەوا بوو [ وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ] وە لە ئادەم و حەواش پیاوان و ئافرەتانێکی یەکجار زۆری لەسەر ڕووی زەویدا بڵاو کردۆتەوە [ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ] وە تەقوای ئەو خوایە بکەن کە هەندێکتان داوا لە هەندێکتان ئەکەن بەخوای گەورە واتە دەڵێن: لەبەر خوای گەورە ئەو شتەمان پێ بدەن، وە سیلەی ڕەحم و پەیوەندی خزمایەتیتان بگەیەنن و مەیپچڕێنن [ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ] بەڕاستی خوای گەورە چاودێرە بەسەرتانەوەو ئاگای لێتانە..؟! دیارە ووتەی [ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا ] ووشەی ﴿مِنْهَا﴾ واتە : لەو نەفسە ، نەفس لە زمانی عەرەبی دا (مؤنث ) دێت ، مەبەستی پێ رووحی ئادەمە ، دیارە و ئاشکرایە کە (حوا) لە رووحی ئادەم جیانەبۆتەوە ، چونکە بە پێ مەنتق رووح دووبەش نابێت ، کەواتە : لە جینسی ئەو نەفسەو لە جینسی ئەو رووحەوە ، واتە : لە جینسی رووح نەفسی ئادەم (خوای گەورە ) (حوای ) دروست کردووە ، کەواتە ئەم ئایەتە ئەوە ناگەیەنێ کە (حوا ) لە ئادەم جیابۆتەوە ، ئینجا ئەو فەرموودەی پێغمەبەری خوا ﷺ کەباسی ئەوە دەکن ، ئەوە مەبەست پێی لێکچوونی یان (تشبیە ) کردنی ئافرەت بە پەراسووی ئادەمەوە ..؟!!

[١] -اخرجه ابن عدي في كامل في الضعفاء (٤٢٣/١)، الذهبي في الميزان الاعتدال (٣٣/١).

له (ابو هريره ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – دەگیٚریتەوه له پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((مَن كانَ يُؤْمِنُ باللَّهِ وَالْيَومِ الآخِرِ، فَإِذَا شَهِدَ أَمْرًا فَلْيَتَكَلَّمْ بخَيْرٍ، أَوْ لِيَسْكُتْ، وَاسْتَوْصُوا بالنِّسَاءِ، فإنَّ المَرْأَةَ خُلِقَتْ مِن ضِلَعٍ، وإنَّ أَعْوَجَ شيءٍ في الضِّلَعِ أَعْلاهُ، إنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وإنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ، اسْتَوْصُوا بالنِّسَاءِ خَيْرًا)) .[1] واتە: هەر کەسیٚ ئیمانی یان باوەری بە خواو بە رۆژی دوایی هە بیٚت ، هەر شتیٚکی بینی چاك بلیٚت یان بیٚ دەنگ بیٚت ، ئامۆژگاری وەرگرن چاك رفتار بکەن لە گەل ئافرەتان ، چونکە لە پەراسوو دروست کراون ، خوارترین یان لار ترین بەشی پەراسوو لای سەرەوەیە تی ، ئەگەر هەولی راست کردنەوەی بدیت ئەوا دەی شکیٚنی ، ئەگەر وازیشی لی بهیٚنیت ئەوا بەخواری یان لاری دەمیٚنیٚتەوە ، ئامۆژگاری چاکم وەرگرن دەربارەی ئافرەتان ..!!

تیٚبینی / دەربارەی ئەم فەرموودەی پیٚغەمبەری خوا ﷺ کە باسی پەراسووی ئافرەت دەکات، واتە : ئافرەت لە پەراسوودا دروست کراوە ، لە چ روویٚکەوە ..؟! بەلیٚ لەم رووەوە کە پەراسووەکان خوارن یان لارن بەهۆی خواری و لاریە کەشیانەوە توانیویانە قەفەزی سینگ دورست بکەن ، بەهەمان شیٚوە ئافرەتیش خوارە یان لارە ..؟! لە روویەکی تریشەوە ئافرەت لە رووی دەروونیەوە ئافرەت سۆزە عاتیفەی زیاترە لە پیاو ، هەر ئەم سۆزو عاتیفەیە زالە بە سەر عەقل بیرو هۆشیەوە ، یان رەحم بەزەیی زیاترە لە عەقل و بیرو هۆشی ، چونکە کاریٚك یان فەرمانیٚك بە ئافرەت سپیٚراوە زیاتر سۆزو عاتیفەو بەزەیی رەحمە ، هەر ئەوەشە ئەرکی بە خیٚوکردنی مندالی پیٚ سپیٚراوە ، کەواتە : لە فەرموودەکەدا ئافرەت لیٚکچوو یان (تشبیه ) کراوە بە پەراسوو ..؟! نەك وەکو دەلیٚن : ئافرەت لە پەراسوو دروست بووە ( خوای گەورە زانا ترە بەم باسە ) ، هەر لە فەرموودەکەدا باسی (حوا ) ناکات بەلکو باسی ئافرەت دەکات بەگشتی وەك دەفەرمووی :(خلقت المراة ) نەوە ك (خلقت حواء ) واتە: دەفەرمووی : ئافرەت دورستکرا ، نەك (حوا) دروستکرا ، کەواتە : ناوی (حوا) نەهاتووە بەلکو ناوی ئافرەت بەگشتی هاتووە ، هەر بۆیە هیچ بەلگەیەك یان دەقیٚکی نیە لە قورئان و فەرموودەکانی پیٚغەمبەری خوا باسی ئەوە بکات کە حوا لە پەراسووی ئادەم دروست بووە ، ئەو دەنگ و باسە ووتانەی کە دەلیٚن : ئافرەت لە پەراسووی ئادەم دروست کراوە ، راست نین ، بەلکو لە ئەهلی کتاب وەرگیراون بەتایبەتی لە تەوراتی جوولەکە، وەك لە العهد القديم لە سفر تكوين الإصحاص (٢١/٢) ص١١، دا هاتووە ، لە ژیٚر ناو نیشانی (خلق المرأة) یان بروانە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس ) ..؟!

[1] صحيح مسلم برقم (١٤٦٨).

بەڵێ (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ﴾ واتە: ووتمان : ئەی ئادەم خۆت و هاوسەرەکەت لەم بەهەشتە دا ژیان ببەنەسەر و نیشتە جێ بن یان ئارام بگرن بحەسینەوە ، ووشەی ﴿ٱسْكُنْ﴾ یان (سکن ) واتە : بە و جێگایە دەڵێن کە تێدا دادەنیشن یان نیشتە جێ دەبن تێدا وەك ئەوەی لە کوردە وای پێی دەڵێن سکونە ،کەواتە : ووشەی (سکن ) ووشەی (سکون ) وە هاتووە واتە ئارام گرتن و تێدا حەسانەوە ..؟! ئینجا ئادەم و هاوسەرەکەی لەم بە هەشتە دا نیشتە جێ بوون لەم شوێنەدا تێدا بە ئارامی تێدا دەحەسێنەوە ، قال تعالى: ﴿وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۝٣٥﴾ واتە: لە هەرشتێك لە هەر کوێیەك دا دەتانەوێ لە بەهەشت دا رابوێرن و بەهرەمەندبن لە نازو نیعمەتەکان بە فراوانی ، بەلام یەك دانە درەختی لێ قەدەغەکردوون فەرموویی : لەم درەختە مەخۆن ..؟! جائێمە بینە سەر وەسفی ئەم دەرختە بزانین ئەم درەختە چی یە کە (خوای گەورە ) لە ئادەم هاوسەرەکەی قەدەغەی کرد لە بەهەشت دا ، بەلێ زایانی تەفسیر لەم بارەیە زۆ شتیان گوتووە دەربارەی ئەم درەختە ، هەندێك دەڵێن : درەختی دار سێوە ..؟! هەندێکی تر دەڵێن : داری مێوە واتە: داری ترێیە ..؟! هەندێکی تریش دەڵێن : ئەم درەختە گەنمە ...هتد ، بەلام لەراستی دا ئەم رای ووتانەی هەمووی زیادەن مادەم جۆری درختەکە نەهاتووە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەلگەی دورست لە بەردەست دانیە ئەوەی کە زانیان گوتیانە هەر هەموو راو بۆچوونە (خوای گەورە زاناترە ) ، ئیجا بابەتەکە ئەوەنیە کە جۆری درەختە چی یە جۆنە ، بەلکو فەرمانی (خوای گەورە ) بوو کە نزیکی ئەم درەختە نەکەون ، ئادەم و حوا سەرپێچی لە فەرمانەکەی (خوای گەورە یان ) کرد ..؟!

قال تعالى: ﴿وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ﴾ واتە: ووتمان : ئەی ئادەم خۆت و هاوسەرەکەت لەم بەهەشتەدا ژیان بەرنەسەر ، ووشەی ﴿ٱسْكُنْ﴾ کە پێشتر ووتمان بۆ ئارام گرتن و حەسانەوە نیشتەجێ بوون دێت ، بەلام ئەگەر سەیری ووشەکە بکەین دەبینین ، ئەمە ئاگادار کردنەوەیە واتە : (اسکن ) فەرمانێك بۆ ئاگادار کردنەوە بۆ دەچوون لە بەهەشت دا ، چونکە (سکن ) یان ئارام و حەسانەوە نابێتە مولکی هەتا هەتایی یان خاون مولکی خۆی ، بەلکو هەندێك دەڵێن : ووشەی (سکن ) بۆ ماوەیەکە پاشان تەواو دەبێت ، واتە : ماوەییە بۆ هەمیشەیی نیە ، لە راستیدا چوونی هەردووکیان واتە: ئادەم و حوا بۆ بەهەشت بوونی (سکن) بووە نەوەك (إقامە ) نیشتەجێ بوونی هەتاهەتایی ..؟! هەروەها لەم ئایەتەدا (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَزَوْجُكَ﴾ واتە : (خوای گەورە ) نەی فەرمووە (وزوجتك ) واتە: ئەمە بەلگەیە (زوج) بۆ ئافرەت و پیاو بە کاردێت . هەروەها دەفەرمووی : قال تعالى: ﴿وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۝٣٥﴾ واتە: لە هەر کوێ حەز دەکەن بخۆن و بخۆنەوە بە تێرو تە سەلی ، بەلام نزیکی ئەم درەختە نەکەون ..؟! ئەم درەختە درەختێکی دیار کراوە بووە بۆ تاقی کردنەوە لێیان قەدەغە کرا..؟! کەواتە : (خوای گەورە ) فەرمانی پێیان کرد ئەگەر نزیکی ئەو درەختە بکەونەوە لێ بخۆن ئەوا دەچنە ریزی ستەمکارانەوە ..؟! ووشەی قال تعالى: ﴿حَيْثُ شِئْتُمَا﴾ واتە : لە هەر شوێنێکی بە هەشت دا ، هەروەها دەڵێن : لە هەر کاتێك چونکە ووشەی قال تعالى: ﴿وَكُلَا﴾ مطلقە مقید نەکراوە بە کات ..؟! دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ

ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ واتە: ئەم درەختە درەختێکە لە درەختەکانی بەهەشت (خوای گەورە ) زاناترە ) هەر خۆی دەزانی جۆرەکەی چییە چۆنە شێوە و جۆری درەختە کە چۆنە و چییە ..؟! ووشەی قال تعالى: ﴿وَلَا تَقْرَبَا﴾ واتە: بەڵگە یە لە سەر حەرامیەتی خواردنی ئەم درەختە ، چونکە نەریٚ کردن یان نهی لە هەر شتێك دا بکریٚ ئەو بەڵگەی حەرام یەتی ئەم شتەیەیان ئەم کرداره ئەم کارە ، بۆ یە نەریٚ یان نهی بۆ هەر فەرمانێك هاتبێت ئەوا سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی (خوای گەورە) یە ئەو کەسەی ئەنجامی دەدات ، وە دەچێتە دەستەی ستەم کارانەوە ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾﴾ واتە : لەبەر ئەوەی ئەگەر لەو دارە نزیك ببنەوەو لەو دارە بخۆن ئەوە زوڵم و ستەم لە نەفسی خۆتان ئەکەن..!!



ماناییی هەندێك ووشەی ئایەتی ٣٥-٣٦ سورەتی البقرە :

قال تعالى: ﴿ٱسْكُنْ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٥]: واتە : ئارامگە یان شوێنی حەسانەوە کاتی نە بۆ هەمیشەیی ،واتە: نیشتە جیٚ بوونێکی کاتی نە وەکو هەمیشەیی،هەروەها ﴿ٱسْكُنْ﴾ واتە : (لسكون : ثبوت الشيء بعد تحرك ) واتە (سکون ) بریتیە لە : ئارامگە و حەسانەوە سەقامگیر بوونی شتێك و ئارام گرتنی دوای جوولانەوە متحرك ..!!

قال تعالى: ﴿رَغَدًا﴾ [البَقَرَةِ : ٣٥] دە لی : ( عيش رغد ورغد، طيب واسع ) دە وتری : (عيش رغد ) یان ﴿رَغَدًا﴾واتە : ژیانێکی خۆش و فروان ، واتە : فروان لە رووی نازونیعمەتەکان ..؟! بە پێچەوانەی ژیانی ناخۆش و تەنگ و تەسك ، کە مرۆڤ نەزانی جی بخوات پەنا بۆجی ببات.؟!

قال تعالى: ﴿فَأَزَلَّهُمَا﴾ [البَقَرَةِ : ٣٦] ، بەلیٚ بەم شێوە خوێندراوەتەوە (أزلهما) یان (أزاحهما) واتە : لایدان یان (أزلهما ) واتە : خلیسکاندن یان (أزلهما ) (الزلة في الأصل : إسترسال الرجل من غير قصد ، يقال زلت رجله تزل والمزلة المكان الزلق ) (إلزلة ) لە ئەسلدا ئەوەیە کە مرۆڤ پیٚ یان قاچی بخلیسکی بیٚ ئەوەی مەبەستی بیٚ و بیەوێت ..؟! وە دە ووتریٚ : (زلت رجل تزلت ) واتە : پیٚ خلیسکا ، وە (المزلة) شوێنی خلیسکە ، کە مرۆڤ لیٚ بخلیسکی یان بەواتایی فریودانیش دێت ..!!

قال تعالى: ﴿ٱهۡبِطُواْ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٦] (الهبوط الإنحدار على سبيل القهر كهبوط الحجر ) واتە : مانای (هبوط) بریتە لە شۆڕبوونەوە یان هاتنەخوارەوە و دابەزین لە شوێنێکی بەرزەو بۆ شوێنێکی نزم ترە ، بەشێوەیەك کە مرۆڤ بەدەست خۆی نەبێت ، یاخود وەکو بلێی کە بەزۆر شۆر بکەرێتەوە لە شوێنێکی بەرزەوە بۆ شوێنێکی نزمەوە ، یان خلۆری بکەنەوە وەکو چۆن بەردێك لە شوێنێکی بەرز خلۆردەکەیتەوە بۆ خوارەوە بەدەست خۆی نیە ..؟!!

قال تعالى: ﴿مُسۡتَقَرٌّ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٦] (قر في مكانه يقر قرارا : إذا ثبت ثبوتا جامدا ، وأصله من القر وهو البر وهو يقتضي السكون ، كما ان الحر يقتضي الحركة ) واتە : لە جێ خۆیی نیشتەجێ بوو، یان نیشتەجێ دەبێ ، نیشتەجێ بوون ، کاتێك شتێك دەچەسپێ و ناجوولێ ن وە لە بنەرەتدا لە (قر) وە هاتووە کە بەمانای (سەرما ) یە ، چونکە سەرما وەستان دەخوازێ : وە ك چۆن (گەرما) جوولان دەخوازێ ..!! هەروەها ﴿مُسۡتَقَرٌّ﴾ بەمانای جێگیر بوونیش دێت ..!!

قال تعالى: ﴿وَمَتَٰعٌ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٦](متاع: انتفاع ممتد الوقت ) (المتاع ) واتە: ئەوەیە کە مرۆڤ بە شتێك رابوێرێ خۆشی لێوە وەرگرێ و گوزەرانی پێ بکات و لەزەتی لێ وەرگرێ یان بەهەرمەندبێ ، وە دەووترێت : ( متعة الله بكذا وأمتعه )واتە : خوا بەوشتە گوزەرانی بسوورێنی لێی بەهەرەمەند بێ ..!!

تێبینی / بدەینە سەر ووشەی قال تعالى: ﴿ٱلۡجَنَّةَ﴾ واتە : ووشەی (جنة) ووشەیەکە کە پێ دەلێن : باغ و بێستان ، وە بە کوردەواری خۆمان پێ دەلێن : بەهەشت بۆ باغ و بێستان بە کار دێت ..؟! بەلێ ئەو باغ وبێسانەی کە (ئادەم حوا ) تێدا ئارامیان گرت حەسانەوە و ، وەکو (سکنە ) تێدا ژیان ، ئایا مەبەست پێی چیە و لە کوێیە ..؟! کەواتە : بەهەشت ناوێکە بۆ ئەم شوێنە خۆشە واتە : باغ و بێستانە ، کە (خوای گەورە ) بۆ ئیمانداران یان باوەڕدارانە ئەوانەی راستگۆ کاری چاکە کاریان کردووە لە ژیانی دونیادا ، بۆیە (خوای گەورە ) ئەم شوێنەی بۆ ئیماندران داناوە ..؟! بەلام ئەصلی ووشەی (جنە ) لە قورئاندا بە مانای باغ وبێسان گل و گول زار دێت ، هەروەها هەر لە زمانی عربیدا بەم مانایە دێت ، ئینجا لێرە دا هەندێك لە زانایان ئەم ئۆمەت دەلێن : ئەم (جنە) شوێنێك بووە لە سەر زەوەی کە لە شوێنێکی بەرز دا بووە ..؟! نە ك ئەو بەهەشتەی کە ئیمانداران دەچنە ناوی لە رۆژی دوایی دا، بەلام ئەمە راو بۆچوونە (خوای گەورە زاناترە )..!!بەلکو لە چەند شوێنێکی قورئانی پیرۆز وەسفی بەهەشت دەکات کە هەر گیز بەهەشت لەوە ناچێت لە سەر زەوی بێت ، چونکە تەواو پێچەوانەی خۆشی باغ وباغات وبێستانی ژیانی دونیایە یان ژیانی سەر زەویە ، بۆیە خۆشیە کانی بەهەشت بە خەیالی هیچ کەسێك دا نایەت ئەوەی لە قورئان باس کراوە تەنها بۆ تێ گەیشتنی بەندە کانە ، بەلکو فوق تصور واتە : لە سەرووی هەموو بیر کردنەوەیەکی مرۆڤ دایە بە خەیال دانایە خۆشی ، لەم چەند ئایەتە دا (خوای گەورە وەسفی بەهەشمان بۆ دەکات ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ ١١٧ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ ١١٨ وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضۡحَىٰ ١١٩﴾ [طه : ١١٧ - ١١٩] واتە : ئێمەش وتمان : ئەی ئادەم بزانە کە ئا ئەم ئبلیسە دوژمنی تۆ و هاوسەرەکەتە، سا لێی

بەئاگابن، وگوێڕایەڵی مەکەن بەسەرپێچی من، وببێتە هۆی دەرکردنتان لە بەهەشت، وتوشی سەرگەردانی بیت بە دەرچوونت لێی ..؟! ئەی ئادەم دڵنیابە لەوەی کە لەم بەهەشتەدا بۆت هەیە خواردن بخۆیت و برسیت نەبێت، و لێی بپۆشیت ورووت نەبیت تێیدا ..؟! و لەوەش دڵنیابە کە بۆت هەیە لەم بەهەشتەدا تینو نەبیت، وتین وگری خۆرت بەرنەکەویت ..؟!کەواتە : ئەم بەهەشتەی کە (خوای گەورە ) وەسفی دەکات لە سەر زەوی دانیە بەهیچ شێویەك ، چونکە هەر خۆشی یەك لە سەر زەوی ناگات بەخۆشی بەهەشت بۆ یەك چرکە ساتیش دا ، هە ر وەك دە فە ر موویێت : قال تعالی: ﴿مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنۡهَٰرٞ مِّن مَّآءٍ غَيۡرِ ءَاسِنٖ وَأَنۡهَٰرٞ مِّن لَّبَنٖ لَّمۡ يَتَغَيَّرۡ طَعۡمُهُۥ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ خَمۡرٖ لَّذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ عَسَلٖ مُّصَفّٗىۖ وَلَهُمۡ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡۖ كَمَنۡ هُوَ خَٰلِدٞ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمٗا فَقَطَّعَ أَمۡعَآءَهُمۡ ١٥﴾ [مُحَمَّد : ١٥]واتە : سیفەت و شێوەی ئەو بەهەشتەی کە خوای پەروەردگار پەیمانی بە بڕواداران داوە : چەندین ڕووباری گەورەی تێدایە لە ئاوی سازگاری نەگۆڕ، و چەندین ڕووباری لە شیری تام نەگۆڕاو، و چەندین ڕووباری شەراب کە بنۆشانی لەزەتی لێ وەردەگرن، و چەندەها ڕووباری هەنگوینی پاڵاوتەش کە پاڵاوتەکراوە لەوە خڵتە و شتانەی کە تێکەڵی دەبن، وە هەر بۆ ئەو تەقواکار و خۆپارێزانە لە بەهەشتدا هەموو جۆرە میوەیەك و جگە لەوەش هەیە، وە لە هەموو ئەوانەش گەورەتر پۆشین و لێخۆشبون و لێبوردەیی پەروەردگار بۆ تاوانەکانیان، ئایا ئەو کەسەی کە لەم بەهەشتدایە وەکو ئەو کەسە وایە کە لە ئاگردایە و بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە و لێی دەرناچێت، وە کاتێك کە تینویان دەبێت ئاوی کوڵاوکوڵ کە لەوپەڕی گەرمیدایە دەرخوارد دەدەن وگەدە وریخۆڵەکەیان پارچەپارچە دەکات ؟ هەروەها دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ رِزۡقٞ مَّعۡلُومٞ ٤١ فَوَٰكِهُۖ وَهُم مُّكۡرَمُونَ ٤٢ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ٤٣ عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ٤٤ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِكَأۡسٖ مِّن مَّعِينِۭ ٤٥ بَيۡضَآءَ لَذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ ٤٦ لَا فِيهَا غَوۡلٞ وَلَا هُمۡ عَنۡهَا يُنزَفُونَ ٤٧ وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ عِينٞ ٤٨ كَأَنَّهُنَّ بَيۡضٞ مَّكۡنُونٞ ٤٩ فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ٥٠﴾ [الصَّافَّات : ٤١ - ٥١]واتە : {پاداشتی باوەڕدارە دڵسۆزو نیازپاکەکان} [ أُولَئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَعْلُومٌ] وە ئەمانە لەناو بەهەشتدا ڕزق و ڕۆزیەکی بەردەوام و زانراویان بۆ هەیە کە نابڕێتەوە..؟! [فَوَاكِهُ وَهُمْ مُكْرَمُونَ ]وە جۆرەها میوەیان بۆ هەیە وە خوای گەورە ڕێزیان لێ ئەگرێ بە جۆرەها ڕێز..؟!

[ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ (٤٣) ] لە بەهەشت و باخ و باخاتێکدا کە پڕە لە نازو نیعمەت..؟! [ عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ (٤٤) ] لەسەر جێگای بەرز دانیشتوونە وە بەرامبەر یەکن و ڕوویان لە یەکە..؟! [ يُطَافُ عَلَيْهِمْ بِكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ ] وە خزمەتکاران بەسەریاندا ئەسوورێنەوە بە گڵاسێك لە مەی بەهەشت کە سەرچاوەی هەیەو هەڵئەقوڵێت و کۆتایی نایات..؟! [ بَيْضَاءَ لَذَّةٍ لِلشَّارِبِينَ ] وە زۆر سپیە وە زۆر بەتام و چێژو بەلەزەتە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەیخۆنەوە..؟! [لَا فِيهَا غَوْلٌ ] بەڵام عەقڵیان لە دەست نادەن و بێ عەقڵ و سەرخۆش و بێ هۆش نابن [وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنْزَفُونَ ] وە تووشی سەر ئێشەو سك ئێشەو ئازاریان ناکات و وەکو عەرەق و مەی دونیا نیە..؟! [ وَعِنْدَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ] وە حۆریان بۆ هەیە کە چاویان کورت ئەکەنەوە لەسەر مێردەکانیان و تەنها تەماشای ئەوان دەکەن و بۆ لای جگە لەوان ناچن، (عین) یش واتە: چاویان یەکجار گەورەو جوانە..؟! [ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَكْنُونٌ ] سپین وەکو دوڕڕو مراوری، یان سپین وەکو سپێنەی هێلکە، یاخود لە زەردیدا سپی بوونە کە جوانترین ڕەنگە، وە پارێزراون و کەس دەستی بۆ نەبردوون..؟! خۆپاراستن لە هاوڕێی خراپ} [ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ] ئینجا

بەهەشتیانیش روو لە یەکتری دەکەن و هەندێکیان پرسیار لە هەندێکی تریان ئەکەن: ئەوە ئێوە لە دونیا چۆن بوونە؟! هەروەها دەفەرموویێت :قال تعالى: ﴿عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعْدُهُۥ مَأْتِيًّا ﴿٦١﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا إِلَّا سَلَٰمًا ۖ وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿٦٢﴾ تِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِى نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيًّا ﴿٦٣﴾﴾ [مَرْيَم : ٦١ - ٦٣]واتە : بەهەشتگەلێکی هەتاهەتایی و بەبەردەوام مانەوە، هەر ئەوەشە ئەو بەهەشتە پەنهانەی کە خوای بەڕەحم و بەبەزەیی پەیمانی بە بەندەکانی داوە، ئەوانیش باوەڕیان پێهێناوە بێ ئەوەی ببینن، بێگومان پەیمانی خوای پەروەردگار بۆ بەندەکانی بەم بەهەشتە دێت و هیچ ڕێگریەك لەهاتنیدا نیە ..؟! بەهەشتیان هیچ ووتەیەکی پڕوپوچی تێدا نابیستن، بەڵکو تەنها گوێبیستی سەلام دەبن و وەکو سەڵاو لێکردنێك لێیان، وە ڕزق و ڕۆزیەکی بەردەوام و هەتاهەتاییان لە خواردن و خواردنەوە بۆ هەیە تێیدا، و هەر کاتێك کە بیانەوێت .بەرەبەیان بێت یان شێواراندا .تایبەت و دیاریکراو نیە ..؟! ئەو بەهەشتەی کە بەو سیفەتانە وەسفکرا، ئەوەیە کە بەندە لەخواترس و خۆپارێزەکانمان دەکەین بە میراتگری و پێیانی دەبەخشین، ئەو بەندانەی کە جێبەجێکاری فەرمانەکانمان بوون و دووریش دەکەوتنەوە لە یاساغی لێکراوەکانمان ..؟!

هە روە ها دە فە رموویت:قال تعالى: ﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ ۖ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ ۚ كُلُّ ٱمْرِئٍۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ ﴿٢١﴾ وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾ يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ * وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾﴾ [الطُّور : ٢٠ - ٢٤] واتە: وە لەسەر سیستەمەکان ڕوو لەیەك پاڵیان داوەتەوە، و لە جوانترین ئافرەتانی سپی پێست و چاو گەورەمان کردووە بە هاوسەریان..؟! وە ئەو کەسانەش کە باوەڕیانهێناوە و نەوەکانیشیان بە باوەڕەوە شوێنیان کەوتوون، ئەوا نەوەکانیان پێدەگەیەنین لەو پلە و پایەیەی کە تێیدان لە بەهەشتدا، ئەگەرچی کردەوەکانیشیان نەگاتە ئاستی کردەوەی باوکانیان، ئەوەش بۆ ئەوەی چاوی باوانیان بە ڕۆڵەکانیان گەش بێتەوە لەو پلە و پایەیەی کە تێیدان، و لەسەر چاکترین حاڵ پێکەوە کۆدەکرێنەوە، بەشێوەیەك کە هیچ لەپاداشتی کردەوەی باوانیان کەم ناکەینەوە . هەموو کەسێك پەیوەستی کردەوەکانی خۆیەتی، گوناهی هیچ کەسی تر لە خەڵکی هەڵناگرێت ..؟! وە زیاد لە سەر ئەوەی کە باسکرا لە ناز و نیعمەت جۆرەها میوە و گۆشتمان پێ بەخشین لەوەی کە بەباش دادەنرێت و ئیشتیهای دەکرێت ..؟! هو ناز و نیعمەتانەش ئەوەیە کە بەهەشتیان پەرداخی پڕ لە مەی لەیەك وەردەگرن، و پێشکەش بە یەکتری دەکەن، بۆ ئەوەی خۆشیەکانیان بگاتە لوتکە، بێگومان ئەو مەی و شەرابەش پێچەوانەی مەی و شەرابی دونیایە، چونکە بنۆشەکەی عەقلی لە دەست نادات، و بەهۆیەوە قسەی پڕ و پوچ روونادات، و نەش قسیەك دەکرێت کە گوناە و تاوانی تێدا بێت ..؟! وە چەندەها لاو بەسەریاندا دەگەڕێن کە بۆ خزمەتکردنیان ئامادەکراون، لە جوانی و سپێتی و هاوگونجاوێتیان وەکو مرواری پارێزراوی ناو سەدەفەکانیان ..؟! هە روە ها دە فە ر موویت : قال تعالى: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾

لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ۝٣٥﴾ [النَّبَإِ : ٣١ - ٣٥] واتە : بێگومان بردنەوە بۆ ئەوانەیە کە لە پەروەردگاریان دەترسن و کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن، ئەوەش بەچوونیانە بۆ بەهەشت ..؟!! کە تێیدا باخچە و ڕەز و باخی گەورەیان بۆ هەیە ..؟! و هاوسەرگەلێکی تەمەن نوێیان بۆ هەیە، کە مەمکیان بەسەر سنگیانەوە خڕ و بەرز بووەتەوە، و لە یەك تەمەندان ..؟!! و پەرداخی پڕ لە مەیان بۆ هەیە ..؟! و ووتەی پڕوپوچ لەو بەهەشتەدا نابیستن، و کەسیشیان کەسی تریان بەدرۆ ناخاتەوە ..؟!

قال تعالى: ﴿وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُواْ جَنَّةً وَحَرِيرًا ۝١٢ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۖ لَا يَرَوۡنَ فِيهَا شَمۡسًا وَلَا زَمۡهَرِيرًا ۝١٣ وَدَانِيَةً عَلَيۡهِمۡ ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتۡ قُطُوفُهَا تَذۡلِيلًا ۝١٤ وَيُطَافُ عَلَيۡهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكۡوَابٍ كَانَتۡ قَوَارِيرَا۠ ۝١٥ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقۡدِيرًا ۝١٦ وَيُسۡقَوۡنَ فِيهَا كَأۡسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ۝١٧ عَيۡنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلۡسَبِيلًا ۝١٨ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيۡتَهُمۡ حَسِبۡتَهُمۡ لُؤۡلُؤًا مَّنثُورًا ۝١٩ وَإِذَا رَأَيۡتَ ثَمَّ رَأَيۡتَ نَعِيمًا وَمُلۡكًا كَبِيرًا ۝٢٠ عَٰلِيَهُمۡ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضۡرٌ وَإِسۡتَبۡرَقٌۖ وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ شَرَابًا طَهُورًا ۝٢١ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمۡ جَزَآءً وَكَانَ سَعۡيُكُم مَّشۡكُورًا ۝٢٢﴾ [الإِنسَان : ١٢ - ٢٢]

واتە : وە لە پاداشتی ئارام گرتنیان لە دونیا لەسەر گوێڕایەڵی خوای پەروەرگار لە بەهەشتدا باخێکی گەورە و فراوانی پێ بەخشین، چیان دەوێت تێیدا دەیخۆن، وە پۆشاکی ئاورێشمی نەرمی تێیدا دەپۆشن ..؟! و لەسەر قەنەفەی ڕازاوە بە بەرگ و پەردەی نایاب پاڵکەوتوون و شانیان داهێڵاوە، وە لە بەهەشتدا نە گەری خۆر و نەش سەختی ساردی..؟! و دارەکانی بەهەشت لێیانەوە نزیکن سێبەریان بەسەریانەوەیە، وە لێکردنەوەی میوەی دارەکانیشیان بۆ ئاسانکراوە ..؟! وە خزمتکارەکان قاپ و قاچاغی زیوینی خواردن ..؟! و پەرداخە شەرابی شوشەیی شوشەیەکی زیوینیان بەسەردا دەگێڕن، بە ئەندازەی ئەوەی بنۆشانی حەزیان لێیەتی . نەزیاد و نەکەم ..؟! ساقیەکان شەرابیان ئامادەکردووە، وە ئەو چاکەکارانە لە بەهەشتدا پەرداخی پڕ مەیان پێدەدرێت کە تێکەڵ بە زەنجەبیل کراوە ..؟!وە لە بەهەشتدا لە کانییەك دەخۆنەوە بە سەلسەبیل ناوزەدکراوە، لەبەر سەلامەتی خواردنەوەی، وئاسانی چوونەخوارەوەی لە گەروو، و خۆشی خواردنەوەکەی ..؟! بەسەر ئەو چاکەکارانەدا . بۆ خزمەتکردنیان . کۆمەڵە لاوێکی هەمیشە لاو دەگەڕێن و خزمەتیان دەکەن، کە ئەگەر تەماشایان بکەی .لەبەر جوانی و ڕوونی ڕەنگ و درەوشاوەیی ڕوخساریان . گومانی ئەوە دەبەیت مرواری درەوشاوە بن و بڵاوکرابێتنەوە ..؟! وە ئەگەر بڕوانیتە هەر جێگایەکی بەهەشت ناز و نیعمەتێك دەبینی هیچ وەسفێك نایگاتێ، وە موڵکێکی گەورە و فراوان و بێ سنوور دەبینیت ..؟!

ئەم ئایە تانەی کە باسمان کرد ئەوا وەسفکردنی بەهەشت کە (خوای گەورە ) بۆ بەندەکانی باس دەکات ، بێ گومان بەهەشت شایستەی چاکە کاران و ڕاست گۆیانە لە ژیانی دونیادا ، کارو کردەوەی چاکەیان ئەنجامداوە وە ڕاست گۆ بوونە لەو بیرو باوەڕەی کە (خوای گەورە ) فەرمانی پێ کردون ئەنجامی بدەن ، هەروەها دامەزراو و خۆراگر بووینە لە سەر ئیمانەکەیان ، چونکە مرۆڤی باوەرداری ڕاستە قینە دەبێت پاداشتەکەی بدرێتەوە لە ڕۆژی دوایی دا ئەو پاداشتەش ئەوەیە کە (الجنه ) یان بەهەشتە کە لە پێشدا لە چەند ئایەتێك دا (خوای گەورە ) بۆ ئیماندارانی باس کردووە ، هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ

ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَخۡبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٣﴾ [هُود : ٢٣]واتە : بەڕاستی ئەوانەی کە خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەیان بەڕاست زانیوە، و کردەوەی چاکیان ئەنجام دەدەن، و ملکەچی خوای پەروەردگار بوون لە سەرجەم ئەوانەی کە فەرمانیان پێکراوە و ئەوانەی کە یاساغیان لێکراوە، ئەوانە بەهەشتیانن و تێیدا نامرن و هەرگیز لێی دەرناچن و بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ..؟!

قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفًا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾﴾ [العَنكبُوت : ٥٨]واتە: ە ئەوانەی کە باوەڕیان بە خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی هێناوە و ئەو کردەوە چاکانە ئەنجامداوە کە فەرمانیان پێکراوە، ئەوا بێگومان لە کۆشك و تەلار و جێگایەکی بەرزی بەهەشتدا نیشتەجێیان دەکەین کە ڕووبارەکان بە ژێریاندا دەڕۆن، و بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، بەڕاستی ئەو کۆشکانەی بەهەشت چاکترین پاداشتە بۆ ئەوانەی کە گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار دەکەن ..؟!

بێ گومان ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم بەهەشتەی کە ئادەم هاوسەرەکەی تێدا نیشتەجێ بوون یان تێدا ئارامیان گرتوو حەسانەوە وەکو (سکونە ) تێدا ژیان هەرشتێك ویستان لە خواردن و خواردنەوە بە دەستیان هێنا ، واتە : بە ئارزووی خۆیان هەرچیان پیویستایە بۆیان دەستە بەر دەبوو ، تەنها پێیان ووترا: لە و درەختە نزیك نەبنەوە ، ئەگەر نزیك ببنەوە لێ بخۆن ئەوا لە ریزی ستەم کارانن .؟! بەلام لێرەدا ئەم (جنە) یان ئەم بەهەشتە نیە بۆ هەتاهەتایی تێدا بمێنەوە چونکە لە شوێنێکی تردا (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴿٤٨﴾﴾ [الحِجۡر : ٤٨]واتە : وە ئەوەی بچێتە بەهەشتەوە جارێکی تر لە بەهەشت دەرناکرێن..؟! ئەم وەسفەی (خوای گەورە ) دەی کات کە ئەو کەسەی دەچێتە نێو بەهەشتەوە بە هیچ شێوەیەك دەرناچێت لە بەهەشت دا کەواتە : ئەم بەهەشتە نیە بۆ ئیمانداران بەلکو بەهەشتێك بووە بۆ ئادەم و هاوسەرەکەی ئادەی کردووە جا هەر (خوای گەورە ) زاناو دانایە کار بەجێیە بە حیکمەتە کانی ، ئەم بە هەشتەی بۆ ئادەم و هاوسەرەکەی نازانرێت لە سەر زەوی بووە یان لە ئاسمان بووە ، (خوای گەورە ) زاناترە ..؟! چونکە بە پێ سیاقی ئەم سورەتەی حجر کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴿٤٨﴾﴾ [الحِجۡر : ٤٥ - ٤٨]واتە : ئەو کەسانەی تەقوای خوای گەورەیان کردووە بەدڵنیایی لەناو باخ و سەرچاوەکانی ئاوی بەهەشتدان..؟! پێیان ئەووترێ: بچنە ناو بەهەشتەوە ئێوە سەلامەت و پارێزراون لە هەموو دەردو بەڵایەك وە ئەمینن لە هەموو ترسێك..؟! بەهەشتیەکان هەر ڕق و کینەیەك لە دڵیاندا بوو بێت پێش ئەوەی بچنە بەهەشت خوای گەورە هەمووی دەرئەکات و ئەیانکات بە برای یەکتری [ عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ] لەسەر جێگای بەرز دایان ئەنێن کە بۆیان ئامادە کراوە بەرامبەر یەکتر دائەنیشن و تەماشای یەکتری ئەکەن..؟! [ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ ] لە بەهەشتدا تووشی ماندوو بوون نابن [ وَمَا هُمْ مِنْهَا بِمُخْرَجِينَ ] وە ئەوەی بچێتە بەهەشتەوە جارێکی تر لە بەهەشت دەرناکرێن، وە نەخۆش ناکەون و پیر

نابن..؟! بێ گومان ئەم ئایەتانەی سورەتی حجر باس لەم بەهەشتە دەکات کە (خوای گەورە ) بۆ ئیمانداران و تقوا داران وەسفی کردووە ئەم بەهەشتە بۆ هەتاهەتایی تێدا دەمێنیتەوە ، بەلام ئەم بەهەشتەی کە ئادەم و هاوسەرەکەی تێدا ئارامیان گرتووە حەسانەوە کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٥] ئەم بەهەشتە لە سەر زەویە بە پێ وەسف کردنی (خوای گەورە ) چونکە بەهەشتی هەمیشەیی هەر کەسێ بچێتە ناوێ دەمێنێتەوە هەتاهەتایی و دەرناچێت ..؟! هەر وەکو(خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿إِنَّا بَلَوْنَـٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَـٰبَ ٱلْجَنَّةِ﴾ [القَلَم : ١٧]واتە : بەسەرهاتی هاوەڵانی باخەکە} [ إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ كَمَا بَلَوْنَا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ ] ئێمە کافرانی مەککەمان تاقیکردەوە بە برسێتی و نەبوونی کە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - دوعای لێ کردن، هەروەکو چۆن هاوەڵانی باخەکەمان تاقیکردەوە، هاوەڵانی باخەکە سێ برا بوونە لە دێیەك بوونە ناوی (ضەروان) بووە دوو (فەرسەخ) واتە: شەش میل لە (صەنعا)ی پایتەختی (یەمەن)هوە دوور بووە، یاخود وتراوە: لە (حەبەشە) بووە، ئەمانە باوکێکی چاکیان هەبووە کە باخ و بێستانی هەبووە کە جۆرەها میوەو بەروبوومی هەبووەو ساڵانە کردوویەتی بە سێ بەشەوە: بەشێکی لە رێی خوا کردووە بە خێرو زەکاتی لێداوە، بەشێکیشی بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی داناوە، بەشێکیشی بۆ بنەتۆو و مەسرەفەکەی بۆ ساڵی داهاتوو هەڵگرتووە...

کە باوکیان مرد ئەمان وتیان: باوکمان لە هەڵەدا بووەو نەزان بووە کە ئەم ماڵەی ئاوا لێ کردووە ئێستا بەرهەمەکە کەمە وە ماڵ و منداڵمان زۆرەو بەشمان ناکات، ویستوویانە فەقیرو هەژاری لێ بێبەش بکەن، کە ئێستا خوای گەورە باسی بەسەرهاتەکەیان ئەکات..؟! کەواتە : بە پێ سیاقی ئەم ئایەتە بێت بەهەشتێك بووە لە سەر زەوی هەر وەکو هاوەلانی بەهەشتی سەر زەوی یان باغ و بێستانەکانی سەر زەوی دەلێن : لە وەلاتی یەمن بووە ..؟! هە روە ها لە سورە تی الكهف دا کە بە سە ر هاتی خاوە نی دوو باغە کە دە کات ، (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَـٰبٍ وَحَفَفْنَـٰهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا ﴿٣٢﴾ كِلْتَا ٱلْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْـًٔا ۚ وَفَجَّرْنَا خِلَـٰلَهُمَا نَهَرًا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَـٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا ﴿٣٤﴾﴾ [الكَهْف : ٣٢ - ٣٤]واتە : وە بۆ بێباوەڕانی گەلەکەت.ئەی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم.نموونە بێنەوە کە ئەویش بەسەرهاتی ئەو دوو پیاوەی ئوممەتانی پێشووە : کە یەکێکیان باوەڕدار و ئەوی دیکەیان بێباوەڕبوو، دوو باخمان بە بێباوەڕەکەیان دابوو کە پێکهاتبوو لە ڕەزی ترێ، و ئەو دوو باغەشمان دەورەدابوو بە دارەخورمای زۆر، و لەنێوانیشیاندا بەروبومی کشتوکاڵی سودبەخشی جۆراوجۆرمان پێدابوو ..؟! هە ر وە ها دە فە ر موویت : قال تعالى: ﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَـٰذِهِۦٓ أَبَدًا ﴿٣٥﴾﴾ [الكَهْف : ٣٥]واتە: وە چووە ناو باخەکەی خۆی و موسڵمانەکەیشی بردە ناوی و نیشانیدا کە ئەو زوڵمی لە خۆی ئەکرد بە کوفر کردن و لووتبەرزی [ قَالَ مَا أَظُنُّ أَنْ تَبِيدَ هَذِهِ أَبَدًا] وتی: گومان نابەم ئەم باخ و باخاتە لەناو بچێت و بۆ هەمیشەیی ئەمێنێتەوە ..؟! بەلێ بە پێ سیاق و بەلگەی ئەم ئایە تانەی کە باسمان کرد لە پێشدا (خوای گەورە ) بەهەشتی دروست کردووە لە سەر زەوی هەروەکو هاوەلانی باغە کە یان بێستانە کەی کە باسمان کرد ، یان وەکو خاوەنی دوو باغە کە لە وەلاتی یەمن دا ، بەلێ بێ گومان

بەهەشت هەبووە لە سەر زەوی کە (خوای گەورە) بۆ بەندەکانی دروست کردووە ، هەر وەکو بۆ ئادەم و هاوسەرەکەی دروست کرد کە تێدا ئارامیان گرتوو تێدا حەسانەوە هەرشێتك ئارەزوویان لیٚ بوو لەم بەهەشتە دا بۆیان دەستە بەر بووو ، بەلام دەرختێك لەم بەهەشتەدا لێیان قەدەغە کرا ، (خوای گەورە ) پیٚ فەرموون : لەم درەختە دا نزیك نەبنەوە ، ئەگەر نزیك ببنەوە لیٚ بخۆن ئەوا لە ستەم کاران حیساب دەکرێن ..؟! بۆیە بە بروای من تەنها وەك ئیجتهادێك دەلێم : ئەم بەهەشتە ی ئادەم هاوسەرەکەی وەکو بەهەشتی ، هاوەلانی بەهەشتە یان دوو خاون باغە کەیە ، بەلیٚ ئەو بەهەشتەی کە (خوای گەورە ) وەسفی دەکات بۆ تەقوا داران و ئیمانداران راستگۆیان و پیاو چاکان ، جیاوازە لەم بەهەشتەی ئادەم هاوسەرەکەی ، بەلام (خوای گەورە زاناترە ) ..!!

چونکە ئەگەر بە پیٚ ئەم ئایەتە بێت کە (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ [البَقَرَةِ : ٣٠] واتە : (خوای گەورە ) بە فریشتەکانی فەرموو کە سانێك دادەنێم لە سەر زەوی ببنە جێنشینی یەکتری ..؟! کەواتە : ئەم بەهەشتە بە پیٚ ئەو ئایەتە بێت لەسەر زەوی دورست کرا بۆ ئادەم هاوسەرەکەی ..؟!

📖 لە (ابي ذر الغفاري )- خوا لیٚ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلیٚ: ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ((أرأيتَ آدمُ أنبيًا كانَ ؟ قال : نعم ، كان نبيا ورسولا كلّمهُ اللهُ قبلا فقال : { يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الجَنَّةَ } ).[1] واتە:

ئایا ئادەمت وەك پێغەمبەرێك بینی ..؟! فەرمووی : بەلیٚ . پێغەمبەر و پەیامبەر بوو ، کە (خوای گەورە ) پێشتر قسەی لەگەل کرد بوو ..!! ئینجا ئەم ئایەتەی فەرموو : { يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الجَنَّةَ } ..).

📖 لە (ابی ذر الغفاری ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلیٚ : ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ((أيُّ الأنبياءِ كان أولُ ؟ ! قال : آدمُ، قلتُ : يا رسولَ اللهِ ! ونبيٌّ كان ؟ ! قال : نعم نبيٌّ مُكلَّمٌ، قلتُ : يا رسولَ اللهِ : كم المرسلونَ ؟ ! قال : ثلاثُ مئةٍ وبضعةَ عشرَ ؛ جمًّا غفيرًا )). [2] واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئایا کامە پێغەمبەر یەکەم بووە ..؟! فەرمووی (ئادەم ) . دەلیٚ ووتم : ئایا پێغەمبەر بووە ..؟! فەرمووی : بەلیٚ . پێغەمبەرێکی قسە کەر بوو ، دەلیٚ ووتم : ئایا چەندیان پەیامبەر بوونەیان نێردراو بوونە ، ئەی پێغەمبەری خوا ..؟! فەرمووی : (سیٚ سەدو پانزە) ، زۆرێکە یان خەلکانێکی زۆر ..!!

[1] -اخرجه الطبراني في المعجم الأوسط (٤٢٥٩)، و ابن عدي في الكامل في الضعفاء (٣٤١/٣).
[2] -اخرجه الامام احمد (٤٣١/٣٥-٤٣٢).

📖 له ( ابی أمامه الباهلی ) – خوا لیّ رازی بیّت – دەلیّت : ( أبا ذر ) ووتی : ((یا نَبیَّ اللهِ، فأیُّ الأنبیاءِ كان أوَّلَ؟ قال: آدَمُ، قال: قُلتُ: یا نَبیَّ اللهِ، أوَنَبیٌّ كان آدَمُ؟ قال: نَعَمْ، نَبیٌّ مُكلَّمٌ، خَلَقَه اللهُ بیَدِه، ثُمَّ نَفَخَ فیه رُوحَه، ثُمَّ قال له: یا آدَمُ، قُبْلاً، قال: قُلتُ: یا رسولَ اللهِ، كم وَفَّى عِدَّةُ الأنبیاءِ؟ قال: مِئةُ ألْفٍ وأربعةٌ وعشرونَ ألْفًا، الرُّسُلُ مِن ذلك ثلاثُ مِئةٍ وخَمسةَ عَشَرَ جَمًّا غَفیرًا)).[1] واتە : (ابی ذر الغفاري ) دەلیّ ووتم : ئەی پیّغەمبەری خوا كامە پیّغەمبەر یەكەم بووە ..؟! فەرمووی : (ئادەم ) دەلیّ ووتم : ئایا ئادەم پیّغەمبەر بووە ..؟! فەرمووی : بەلیّ . پیّغەمبەری قسە كەر بووە ، (خوای گەورە ) دروستی كردووە بەدەستی خۆی ،پاشان رووحی بە بەردا ، ئینجا فەرمووی :ئەی ئادەم (قبلا) واتە: ناسكی فریشتە ، دەلیّ ووتم : وەفا و ژمارەی پیّغەمبەران چەندە ..؟! یان ژمارەی پیّغەمبەران چەندە ..؟! فەرمووی : سەدو بیست و چوار هەزارە ..!! لە پەیامبەران یان نیّردراوانیش (سیّ سەدو پانزە ) زۆریّكە یان خەلكانیّكی زۆر ..!!

📖 له ( ابی أمامه الباهلی ) – خوا لیّ رازی بیّت – دەلیّت : (پیاویّك ) ووتی : ئەی پیّغەمبەری خوا ﷺ ((أنَّ رَجُلاً قالَ: یا رَسولَ اللهِ، أنَبِیًّا كانَ آدَمُ؟ قالَ: «نَعمْ»، قالَ: كم كانَ بَیْنَه وبَیْنَ نوحٍ؟ قالَ: «عَشَرةُ قُرونٍ»، قالَ: كم كانَ بَیْنَ نوحٍ وإبْراهیمَ؟ قالَ: «عَشَرةُ قُرونٍ»، قالَ: یا رَسولَ اللهِ، كم كانَتِ الرُّسُلُ؟ قالَ: «ثَلاثَمِئةٍ وثَلاثةَ عَشْرَ». )) .[2]واتە: پیاویّك ووتی : ئەی پیّغەمبەری خوا ﷺ : ئایا ئادەم پیّغەمبەر بووە ..؟! فەرمووی : بەلیّ . دەلیّ ووتی : ئایا نیّوانی ئادەم نیّوانی نوح پیّغەمبەر چەندبووە ..؟! فەرمووی : (دە قرونە ) دەلیّ ووتی : ئایا نیّوانی نوح و نیّوانی پیّغەمبەر ئیبراهیم چەندبووە ..؟! فەرمووی : (دە قرونە ) دلیّ ووتی : ئەی پیّغەمبەری خوا چەندیان پەیامبەر یان نیّردراوە بوونە ..؟! فەرمووی : (سیّ سەدو سیانزە بوونە ..!!

✍ لە ریّ (سعید بن جبیر ) لە (عبداللە بن عباس )- خوا لیّ رازی بیّت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ دەلیّت : ئارام گرتن وحەسانەوەی ئادەم و هاوسەرەكەی لە بەهەشت دا ، تەنها لە نیّوانی نویّژی عەصرو تا وەكو رۆژئاوا بووە ..؟! ( واتە : مەبەست لیّ كاتی مانەوەیان لە بەهەشت دا) .[3]

[1] - اخرجه الامام احمد(٦١٨/٣٦-٦١٩).
[2] -اخرجه الوادعي في الصحیح المسند برقم (٤٨٠).
[3] - اخرجه الحاكم (٥٤٢/٢).

✍ لە ریّ (معمر ) لە (شیخ ) لە (عبداللە بن عباس )- خوا لیّ رازی بێت – دەڵێت : (خوای گەورە ) ئادەمی دورست لە (أدیم) زەوی واتە : لەناخی زەوی ، لە رۆژی هەینی یان جمعە ، دوای عەصر ، ناوی نا ( ئادەم ) ، لە پاشان سپاردی ئەویش لەبیری چوو ، ناوی نا (الانسان ) واتە : مرۆڤ ، (کوری عباس ) دەڵێت : لە لایەن (خوای گەورە )وە لەم رۆژە وە رۆژئاوا نەبوو ، هەتاکو دابەزی لە بەهەشت دا ).[١]

✍ لە ریّ (الربیع بن أنس ) لە (أبی العالیە ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت- دەڵێت : (خوای گەورە ) ئادەمی دروست کرد لە رۆژی هەینی یان جمعە ،وە هە ر لە رۆژی هەینی یان جمع چووە ناو بەهەشتەوە ، لە بەهەشتە کانی فیردوس ..).[٢]

✍ لە ریّ (معاویە بن إسحاق ) لە (سعید بن جبیر ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – دەڵێت : ئادەم لە بەهەشت دا بوو ، لە نێوان کاتە کانی نیوەرۆ و عەصردا ..).[٣]

✍ لە ریّ (هشام ) لە (الحسن البصری ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – دەڵێت : راستە و خۆ ئادەم لە کات ژمێرە کانی رۆژدا لە بەهەشت دا بوو ، ئەو کات ژمێرە کە دەکاتە سەدو سی سالی دونیا یە ..؟! ).[٤]

✍ لە (موسی بن عقبە ) – رحمەتی خوای لیّ بێت – دەڵێت : ئادەم تا کۆتای چواریەکی رۆژ لە بەهەشت مایەوە ،وە دەکاتە دوو کات ژمێرو نیو ، وە دەکاتە دووسەد وپەنچا سالی دونیا ، بەهەشت سەد سال لە سەری گریا ..).[٥]

✍ لە ریّ ( السدی ) لە (أبی مالك وأبی صالح ) لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لیّ رازی بێت – دەڵێت : کاتێك ئادەم لە بەهەشت دا بوو ، بە تەنها پیاسە دەکرد و دەسوورایەوە ، هاوسەرێکی نە بوو لە بەهەشت دا تێدا بحەسێتەوە بۆ ئارامی دلی خۆی ، ئادەم خەوت ، کاتێك بەخە بەر بوویەوە ، لە لای سەری دا ئافرەتێك دانیشت بوو ، (خوای گەورە ) لە پەراسووی ئادەم دورستی کرد بوو ، پرسیاری لیّ کرد تۆ کێت ..؟! ووتی : من ئافرە تێکم ..!! ئادەم ووتی : بۆ چی مەبەستێك دورست کرایت ..؟! حەوا ووتی : تاکو بە من ئارام بگریت و بحەسێتەوە ..!! فریشتە کان بەشێك لە علم و زانستی ئادەمیان پێدرا بوو ، ووتیان : ئەی ئادەم

---

[١] -اخرجه عبدالرزاق ٤٣/١) ، والبیهقي في الاسما والصفات (٨١٦-٨١٧) ، وابن عساكر (٢٤٠/١).
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٥/١) (٣٧١).
[٣] -اخرجه احمد في الزهد ص٤٧.
[٤] -اخرجه احمد في الزهد ص ٤٧ ، و تفسیر ابن كثیر (٢٤٠/١).
[٥] -عزاه السیوطي إلى عبدالله في زاوائده على المسند تفسیر المأثور (٢٦١/١).

ناوی چیە ..؟! ئادەم ووتی : (حەوا ) ، ئەوانیش ووتیان : بۆچی (حەوا ) ..؟! ئادەم ووتی : چونکە لە زیندوویەك دورست کراوە یان بەدیهێنراوە ..!! هەروە ك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : ﴿يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ ..).[1]

✍ لە (مجاهد ) – رحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەلیٚت : ئادەم خەوت ، حەوا دروست بوو لە پەراسووی یان خوارەوی یان سەرەوەی ئادەم ، کاتێك لە خەو هەستایەوە بینی ، ووتی : تۆ کێت ..؟! (حوا) ووتی : من ئافرەتێکم ، واتە : ئافرەتی السريانيه ..).[2]

✍ لەریٚ (سلمە ) لە (ابن إسحاق ) – خوای لیٚ رازی بیٚت – دەلیٚت : کاتێك (خوای گەورە ) سزای ئیبلیس بەخشی و ناوەکانی فێری ئادەم کرد ، بەوتەی شوێنکەوتەکانی ئەهلی کتاب واتە : تەورات و زاناکانی دیکە ، ئادەم (خوای گەورە) پەرسووێکی لای چەپی هەلگرت و شوێنەکەی بە گۆشت پر کردەوە ، ئادەم بەهەمان شێوە لە خەودا بوو کە (خوای گەورە ) حەوای لە پەراسووی ئەو دورست بوو بە ئافرەت تاکو ئادەم ئارام بگرێت ز بحەسێتەوە ، کاتێك ئادەم لە خەو هەستا ، ئەوی لەتەنیشت خۆی بینی و هەمان شێوە کە تووپانە (خوای گەورە زاناترە ) ، ( گوشت و خوێنی هاوسەرم ، بەو ئارامی گرت حەسایەوە ، کاتێك (خوای گەورە ) هاوسەرێکی پیٚ بەخشی و ئارامی پێگرت ، هەرە وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ٣٥﴾ ..).[3]

✍ لە ریٚ ( السدى ) لە (أبى مالك وأبى صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – لەسەر ووتەی: ﴿رَغَدًا﴾ دەلیٚت: بەمانای : (الْهَنِيء ) واتە : بەدەستی دەهێنی بە ئارەزووی خۆت بیٚ ئەوەی ماندوو بیٚت خۆتی بۆ هیلاك بکەیت ..؟! ).[4]

✍ لە ریٚ ( ابى روق ) لە (ضحاك) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – لەسەر ووتەی: ﴿رَغَدًا﴾ دەلیٚت: واتە : لە ژیانێکی زۆر خۆش دا دەژیت ، پیٚ رازی هیچ کەم کوریەك بەدی ناکات ..).[5]

✍ لە ریٚ (ابى نجيح ) لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوا لیٚ بیٚت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ شِئۡتُمَا﴾ دەلیٚت : واتە : هەرچی دەخۆن و دەخۆنەوە هیچیان لە سەر هەژمار ناکریٚ یان هیچی لەسەر حیساب ناکریٚ ، بەئارە زووی خۆیان هەرچی بانەوێت بە دەستی دەهێنن لە هە جۆرێك لە خواردن و خواردنەوە ..).[6]

---

[1] - اخرجه ابن جرير (٥٤٨/١).
[2] -عزاه السيوطي إلى سفيان بن عيينة ، تفسير المأثور(٢٦٢/١).
[3] -اخرجه ابن جرير (٥٤٩/١).
[4] -اخرجه ابن جرير (٥٥٠/١) ، وابن عساكر (٤٠٢/٧).
[5] -اخرجه ابن جرير (٥٥١/١).
[6] - اخرجه ابن ابي حاتم (٨٦/١) (٣٧٤).

✍ لە (علی بن أبي طالب ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ دەڵێت: ئەم درەختە دەرختی کافورە ..).[١]

✍ لە ریٚ ( السدی ) لە (أبی مالك وأبی صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – لەسەر ووتەی: قال تعالى: ﴿وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ دەلیٚت : ئەو دەرختە یە دەرختیٚکی تریٚ بوو، بەلام یهودیە کان یان جوولە کەکان دەلیٚن : گەنم بووە..؟! ).[٢]

✍ لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیٚ رازی بیٚت- دلیٚت : ئەو دەرختە بووە کە (خوای گەورە ) لە ئادەمی قەدەغە کرد ، درەختی (السنبلە ) واتە : دانەویٚلە وەکو دەنکی گەنم و جۆ و گەنمەشامی یان بە زاراویەکی (البر ) واتە : دنکە گەنم ..).[٣]

✍ لە ریٚ (السدی ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – دەلیٚت : ئەو دەرختە بووە کە (خوای گەورە ) لە ئادەمی قەدەغە کرد ، دەرختی تریٚ بوو یان دارمیٚوو بووە ) .[٤]

✍ لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیٚ رازی بیٚت- دلیٚت : ئەو دەرختە درەختی (اللوز ) واتە : درەختی بادەم بووە ..؟!).[٥]

✍ لە ریٚ (ابن جریج ) لە هەندیٚك لە هاوەلان دەلیٚن : ئەو درەختە دەرختی زیتون بووە ..؟! ).[٦]

✍ لە (أبو الجلد {جیلان بن فروە} ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیت – دەلیٚت : پرسیاری لیٚکردم دەربارەی ئەو درەختەی کە لە ئادەم قەدەغەکرا ، ئەو دەرختە دەرختی (السنبلە ) بووە ، وە پرسیاری لیٚکردم دەربارەی ئەو درەختەی کە ئادەم تۆبەی لە سەر کرد ، ئەو درەخت دەرختی زیتون بووە ..؟! ) .[٧]

✍ لە ریٚ (یعلی بن مسلم ) لە (سعید بن جبیر ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ دەلیٚت : ئەو درەختە دەرختی تریٚ بووە ..).[٨]

---

[١] - تفسير البغوی (٨٣/١).
[٢] -اخرجه ابن جرير (٥٥٤/١).
[٣] - اخرجه ابن ابي حاتم (٨٦/١).
[٤] -اخرجه ابن جرير (٥٥٤/١).
[٥] -عزاه السيوطي ابي الشيخ في تفسير المأثور (٢٦٥/١).
[٦] - اخرجه ابن جرير (٥٥٦/١).
[٧] -اخرجه ابن جرير(٥٥٣/١).
[٨] - اخرجه ابن ابي حاتم (٨٦/١).

✍ له ڕێ (سفیان ) له (حصین ) له (ابى مالك غزوان الغفارى ) – ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت – له سه‌ر ووته‌ی قال تعالی: ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ ده‌ڵێت : ئه‌و دره‌خته دره‌ختی (النخله ) واته : دره‌ختی خورما بووه یان دار خورما بووه ..؟! ).[١]

✍ له ڕێ (ابن جریج ) له (مجاهد ) ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت – له سه‌ر ووته‌ی قال تعالی: ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ده‌ڵێت: که پێم گه‌یشت که ده‌رختی هه‌نجیره یان داری هه‌نجیره ..؟! ).[٢]

✍ له (قتاده ) – ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت – ده‌ڵێت : ئه‌و دره‌خته دره‌ختی هه‌نجیره یان داری هه‌نجیره ..؟! ).[٣]

✍ له‌ڕێ (ابى روق ) له (ضحاك) – ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت – ده‌ڵێت : ئه‌و دره‌خته دره‌ختی هه‌نجیره یان داری هه‌نجیره ..؟!).[٤]

✍ له‌ڕێ ( ابن إسحاق ) له (پیاوێك ) له (وهب بن منبه ) – ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت – ده‌ڵێت : ئه‌و دره‌خته بوو که (خوای گه‌وره ) له ئاده‌م قه‌ده‌غه‌ی کرد ، دره‌ختی (البر) واته : ده‌نکه گه‌نم یان دانه‌وێله ، به‌ڵام ئه‌م دانه‌وێله‌یه له به‌هه‌شت دایه ، وه‌کو دوو کلیه یان گورچیله ی چێل وایه ، زۆر له که‌ره و په‌نیرو زبده نه‌رم تره ، وه شیرین تره له هه‌نگوێن ، وه ئه‌هلی (ته‌ورات ) واته جووله‌که پێ ده‌ڵێن : (البر ) ..).[٥]

✍ له‌ڕێ ( عبدالرزاق ) له (عمر بن عبدالرحمن ) له (وهب بن منبه ) – ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت – ده‌ڵێت :کاتێك ئاده‌م و هاوسه‌ره‌که‌ی له به‌هه‌شت دا ئارامیان گرتوو حه‌سانه‌وه ، (خوای گه‌وره ) ئه‌و دره‌خته‌ی لێ قه‌ده‌غه کردن ، ئه‌و دره‌خته‌ش دره‌ختێك بوو که لقه کانی هه‌ندێکیان به سه‌ر هه‌ندێکیان که‌وتوون واته: پر و چڕن لقه‌کانی وه‌کو قولاب وایه ، له به‌رووبوومه‌که‌ی ئه‌م دره‌خته فریشته‌کان لێ ده‌خۆن بۆ ئه‌وه‌ی به‌نه‌مری بمێننه‌وه یان بۆ هه‌میشه‌یی بمێنه‌وه ، ئه‌وا ئه‌م دره‌خته یه که (خوای گه‌وره ) له ئاده‌م و هاوسه‌ره‌که‌ی قه‌ده‌غه کرد ..؟! ).[٦]

به‌ڵام زۆرینه‌ی زانایانی ئه‌م ئۆمه‌ت ده‌ڵێن : ئه‌م ده‌رخته گوله گه‌نمه واته : (السنبله ) هه‌روه‌ها ڕاوبۆچوونی زۆر هه‌یه له سه‌ر ئه‌م دره‌خته‌ی که (خوای گه‌وره ) له ئاده‌م هاوسه‌ره‌که‌ی قه‌ده‌غه‌کرد له به‌هه‌شت ، هه‌ریه‌کیان ڕاو بۆچوونی خۆی ده‌ربریوه له‌سه‌ر ئه‌م دره‌خته‌ی به‌هه‌شت که ئاده‌م و هاوسه‌ره‌که‌ی یان (حوا ) خواردیان ئه‌مانه هه‌ر هه‌موو ڕاو بۆچوونه هیچ کامیان به‌ڵگه‌ی ته‌واو نیه که‌وا جۆری دره‌خته که چیه و چۆنه بووه ..؟! به‌ڵام زانایان هه‌وڵ تێ کۆشانیان بۆ کردووه به ئیجتهادی خۆیان به شێوه‌یه ڕاو

[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٦/١).
[٢] - اخرجه ابن ابي حاتم (٨٦/١).
[٣] - تفسير ابن زمنين (١٣٣/١).
[٤] - تفسير الثعلبي (١٨٢/١).
[٥] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٦/١) .
[٦] -اخرجه عبدالرزاق (٢٢٦/٢)، وابن جرير (٥٦١/١).

بۆچوونی خۆیان لە سەر دەربریوە ، هەر چەندە درەختە کە نازانین چۆنە و جۆرەکەی چی بووە ، بەلام بە دلنیایی ئەوا فەرمانی (خوای گەورە ) یە بۆ بەندەکانی هەرشتێك فەرمانی پێ بکات ئەنجامی بدەن دەبێت دەست بەجێ گوێرایەلی بکەین سەرپێچی نەکەی لە فەرمانەکە ، ئەوە شی کە لێ مان قەدەغەدەکات دەست بەچێ دەبێت لێ دوور بکەینەوە لە خۆمانی حرام بکەین قەدەغەی بکەین ، لێرە دا دەتوانین بلێن: تەنها (خوای گەورە زاناترە ) ئەوەی هەیە تەنها کەمێکی علم زانستی بەندەکانیەتی بێ گومان بەندەش هەر هەلە دەکات و زۆر جار تێ کۆشانەکەی ناپێکێت ، ئەوەی راست ئەوەیە ( خوای گەورە زاناترە ) بەم دەرختە کە جۆرەکەی چیە جۆن بووە ..؟! هەروەك دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ۝٢٨﴾ [التَّوۡبَة : ٢٨]واتە : بەڕاستی خوای گەورە زۆر زاناو کاربەجێیە..؟! قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ۝٧٠﴾ [النَّحۡل : ٧٠]واتە : بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر زاناو بەتواناو بەدەسەڵاتە..؟! قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ ۝٣٤﴾ [لُقۡمَان : ٣٤]واتە : بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر زانایە وە زانیاریەکی زۆر وردی هەیە وە هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە، والله أعلم..؟! قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ۝٢٣﴾ [لُقۡمَان : ٢٣]واتە: بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر زانایە بەو دڵەی کە لەناو سینگدایە..؟!



قال تعالى: ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ۝٣٦﴾ [البَقَرَة : ٣٦]

قال تعالى: ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا﴾ واتە: ئینجا ئیبلیس یان شەیتان هەلی خەلەتاندن لە بەهەشتدا ،قال تعالى: ﴿فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ﴾واتە : وە لە و خۆش گوزەرانیەی کەتێدا بوون دەرکردن یان دەری بەراندن ، قال تعالى: ﴿وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ﴾واتە: وە ووتمان : بە ئادەم و حەواو ئیبلیس یان شەیتان ..!! دابەزنە خوارەوە یان بچنە خوارە وە ، قال تعالى: ﴿بَعۡضُكُمۡ

﴿لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ﴾واتە : هەندێکتان دوژمن ئەبن لە گەل هەندێکتاندا ،قال تعالى: ﴿وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ﴾واتە: وە بۆتان هەیە جێگیربن لە سەر زەوی ،قال تعالى: ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ٣٦﴾ واتە : بەهەرەمەندی و ئارەزووی دونیا ، تا ماوەیەك ..!!

کەواتە : ئیبلیس یان شەیتان ئادەم حەوای هەل خەلەتاند و فریویدان لە سەرێگای راستی لادان ..؟! چونکە ئادەم حەوا بەخۆیان لە ناو ئەم نازو نیعمەتە گەورەی خوا بوون کە بەهشتێکە (خوای گەورە) بۆ بەندەکانی ئامادەکردیە بۆ ئەوانەی کە رێگای راستی خواپەرستی دەگرنە بەر لە فەرمانە کانی (خوای گەورە ) دا بەخیچ شێوەیەك سەرپێچی ناکەن هەلە ناکەن و لە فەرمان دەرناچن .؟!

بەلێ (خوای گەور) دەری بەراندن دەریکردن لە بەهەشتە کەی خۆی دا ، هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : ئینجا ووتمان : دابەزنە خوارەوە بۆ سەر زەوی ، هەندێکتان دوژمنی هەندێکتان دەبن ..؟! ئینجا جێگەو شوێنی وەقرەگرتن و خۆشی رابواردنی ئێوە لەسەر زەوی دایە جێگیرە یان مستقر بۆ ئەو کەسەی کە عەقل و هۆشی خۆی تێدا بەکار دەهێنێ بە چاکە دوور لە هەل وخراپە کاری ئەوکاتە لە سەر زەوی جێگیر و مستقر دەبێت ..؟! یان مستقر شوێنی مانەوە کەسێك کە تێدا جێگیر بێت بی کیشە دەردەسەری ..؟! ئینجا ووشەی مستقر (مفعول للمتعدی ) یە واتە: بۆ هەمیشەیی جێگیر نابێت بەلکو بۆ ماوەیەکە ، دەگەرێتەوە کەسی چاکە کار بۆ ئەو شوێنەی لیێ هاتووە دوای ئەوەی حیساب و میزان لە گە ل دەکرێ ، کەواتە : (مستقر) جێگیر کردنی ماوە یەکە کە تێدا بە سەر دەبات بە تاقی کردنەوەو چاکە کردن دوور لە خراپە کاری ، دەگەرێتەوە ئەو شوێنە کە لیێی هاتووە هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ ٨﴾ [العَلَق : ٨]واتە : بەدڵنیایی گەڕانەوەو سەرەنجامتان هەر بۆ لای خوای گەورەیەو خوای گەورە لێپرسینەوەتان لەگەڵدا ئەکات لەسەر ئەو ماڵە چۆن دەستت ختووەو بەچی دەستت ختووە؟ وەچۆن کۆت کردۆتەوە؟ وە لە چیدا سەرفت کردووە؟ وە ئایا لە گوێڕایەڵی و عیبادەتی خوای گەورە بەکارت هێناوە؟ یاخود لە خراپەکاریداو بەهۆیەوە لە خۆبایی بوویتەو لە خوای گەورە دوورکەوتوویتەوە..؟!

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویێت قال تعالى: ﴿ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ٢٨﴾ [الفَجۡر : ٢٨]واتە : بگەڕێرەوە بۆ لای خوای گەورە، تۆ لە نەفسی خۆتدا ڕازیت و لە خواش ڕازی بوویتە، وە خوای گەورە لە تۆ ڕازیەو تۆش لە خوا ڕازی بوویتە وە خوای گەورە ئەوەندەی پێ ئەبەخشێ تا ڕازی ئەکات..؟!هەروەها دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ١٦ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ١٧﴾ [الأَعۡلَى : ١٦ - ١٧] واتە : بەڵکو ئێوە ژیانی دونیا پێش ئەخەن و گرنگی و بایەخ بە ژیانی دونیا ئەدەن لەگەڵ ئەوەی کە دونیا بێ نرخ و فانییەو لەناو ئەچێ و کۆتایی پێ دێت ئێوە گرنگی بە ژیانی دونیا ئەدەن ، [وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ] ..؟! واتە : {قیامەت باشترە لە دونیا} لە کاتێکدا کە ڕۆژی قیامەت باشترەو ئەمێنێتەوەو هەمیشەییە چۆن ئەبێ ئێوە گرنگی و بایەخ بە دونیایەکی فانی بدەن وە قیامەتێك کە باشترەو ئەجرو پاداشتی یەکجار زۆری تیادایە پشت گوێی بخەن و لەبیری بکەن، واتە: نابێ وابێ..؟! قال تعالى: ﴿إِنَّ إِلَيۡنَآ إِيَابَهُمۡ ٢٥ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا حِسَابَهُم ٢٦﴾ [الغَاشِيَة : ٢٥ - ٢٦] واتە : بە دڵنیایی شوێنی گەڕاندنەوەی ئەمان لە دوای مردن هەر بۆ لای خۆمانەو بۆ لای ئێمە ئەگەڕێنەوەو بۆ لای کەسی تر ناگەڕێنەوە

. [ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم]واتە : پاشان بە دڵنیایی لێپرسینەوەیشیان لەسەر ئێمەیە خۆمان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ئەکەین لەسەر کردەوەکانیان کە لە دونیادا وەڵامی پێغەمبەرانیان نەداوەتەوەو ئیمانیان نەهێناوەو کردەوەی چاکیان نەکردووە، والله أعلم...

کەواتە بۆمان روون بۆیەوە کەوا لە ژیانی دونیادا یان لە ژیانی سەر زەوی دا ئێمە (مستقر) جێگیرین بۆماوەیەك ب،ەلام لە ژیانی دوار رۆژدا ئێمە (أبقى ) ین واتە : بۆ هەمیشەیی دەمێنینەوە ..؟! بەلێ ئەم ماوەیەی کە تەمەنێکی چەند سالە یەو یان بۆماوە یە لە پاش ئەم چەند سالە مانەوە و نەمانەوە مان پێویستە لە سەر مان دەبێ بارگەمان بپێچینەوە وەکو گەشتیارێك جانتاکەمان هەلبگرین ئەوەی کۆمان کردۆتەوە لە کاری چاك و لە کاری خراپە دە لە ژیانی دونیادا ، ئینجا ئەم بارگە بنە و جانتایەمان دەپێچینەوە ئەم سەر زەویە کە تێدا مستقر بووین یان جێگیر بووین بۆ ماوەیەك دەبێت بە جێ بهێلین ، جا سەیرەکە لەوە دا هیچ کە سێك نامێنیتەوە لە سەر رووی زەوی دەبێت هەر ئەم زەویە بەجێ بهێلێت و مالئاوای لێ بکات ، لە گەورە بچووك گەنج و پیرو ژن وپیاو ، لاوازو دەسەهەلات دار چاکە کار و ستەم کار ، کافرو ئیماندار هەر هەمووی بێ جیاوازی دەبێت ئەم زەویە بەجێج بهێلێت و بگەرێتەوە بۆ لای (خوای گەورە ) چونکە یەکسانی دادپەروەی و دادگەری ئەوەیە بێ جیاوازی دەگەرێنەوە بۆ لای (خوای گەورە ) هەر وەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ۝٨﴾ [التين : ٨] واتە : ایا خوای گەورە دادوەرترین دادوەر نیە؟ بەڵێ، واتە: هیچ دادوەرێك وەکو خوای گەورە دادوەرو دادپەروەر نیە کە مسقالە زەرەیەك زوڵم و ستەم لە هیچ کەسێك ناکات، بەڵکو خوای گەورە بە دادپەروەری بڕیار لە نێوان هەموو کەسێکدا ئەدات..!!

بەلێ هیچ شتێك لە سەر زەوی نامێنی لە مرۆڤ و گیانداراندا هەموو شتێك نامێنی لە کۆتاییدا ئەم زەویە ئاسمانیش تێك دەچێت وبێ گومان ئەوەی نەوەی ئادمیزادە دەبێت هەر هەموو کۆچ بکات و بگەرێتەوە ئەو ژیانەی کە بۆی ئامادەکراوە ئەویش یان بەهەشتە یان دۆزەخە شوێنی دەبێت دە بێتە دوا مەنزلی خۆی بۆ هەمیشەیی ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرمووێت قال تعالى: ﴿يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ ۝٦ فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ۝٧ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ۝٨ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۝٩ يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ۝١٠ كَلَّا لَا وَزَرَ ۝١١ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ۝١٢﴾ [القِيَامَة : ٦ - ١٢]واتە : پرسیار ئەکات کەی ڕۆژی قیامەت دێت؟ پرسیارەکە بۆ گاڵتە پێکردن و بەدوور زانینە کە ڕۆژی قیامەت نیەو ئەو قیامەتە کەی دێت..؟! خوای گەورە ئەفەرمووێ: کاتێك کە چاو سەرسام ئەبێ و ئەترسێ و شۆڕو ئەبڵەق ئەبێ لە کاتی بینینی مردندا، یان لەبەر سەختی دیمەنەکانی ڕۆژی قیامەت..؟! وە کاتێك کە مانگ ڕووناکییەکەی نامێنێ..؟! وە لە ڕۆژی قیامەتدا خۆرو مانگ هەردووکیان ڕووناکییان نامێنێ، وە

شەو و ڕۆژ نامێنێ، نە خۆر ئەمێنێ نە مانگ..؟! لەو ڕۆژەدا مرۆڤ ئەڵێ: ئایا شوێنی ڕاکردن و پەناگەیەك هەیە تا بۆی ڕابكەین و ڕزگارمان بێ لە سزای خوای گەورە..؟! لە ڕۆژی قیامەتدا شوێنی جێگیر بوون و گەڕانەوەو سەرەنجامتان تەنها لای خوای گەورەیەو بۆ لای خوای گەورە ئەگەڕێنەوە..؟! قال تعالى: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ۝٢ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ۝٣ وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ۝٤ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ۝٥﴾ [الانشِقَاق : ١ - ٥]واتە : سوورەتی (ئینشیقاق) (واتە: لەت بوون) سوورەتێكی مەككی یەو (٢٥) ئایەتە (ئەبو رافع) ئەفەرمووێ: لە دوای (ئەبو هورەیرەوە) نوێژی عیشامان كرد سوورەتی (ئینشیقاق)ی خوێند (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ) ئایەتی سەجدەی تیایە گەیشتە ئەو ئایەتە سەجدەی برد، پێم وت: بۆچی سەجدەت برد؟ فەرمووی: لە پشت پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - نوێژم كردووە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - سەجدەی بردووە، بۆیە منیش بەردەوام بگەمە ئەم ئایەتە سەجدە ئەبەم تا لە ڕۆژی قیامەت ئەگەم بە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - . بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ [ إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ ] كاتێك ئاسمان لەت ئەبێ بۆ دابەزینی مەلائیكەتەكان، كە یەكێكە لە نیشانەكانی ڕۆژی قیامەت..؟! وە گوێڕایەڵی فەرمانی خوای گەورە ئەكات لەو لەت بوونەداو لە خۆیەوە لەت نەبووە [ وَحُقَّتْ ] وە حەقی خۆیەتی و شایەنی ئەوەیە كە گوێڕایەڵی خوای گەورە بكات لەبەر ئەوەی هەموو شت و هەموو كەسێك ملكەچ و گوێڕایەڵن بۆ خوای گەورە بەتایبەتی لە ڕۆژی قیامەتدا..؟! وە كاتێك كە زەوی ڕائەخرێ و تەخت ئەكرێ و فراوان ئەكرێ لەبەر ئەوەی شاخەكان تیایدا هەڵكەندراون و هیچ بەرزی و نزمییەك لە زەویدا نامێنێ و هەمووی یەك پارچەیەو تەخت و ڕێكە..؟! وە زەوی هەموو مردووەكانی ناوی فڕێ ئەداتە دەرەوەو بەڕائەتیان لێ ئەكات و خۆی لێیان خاڵی ئەكات بۆ ئەوەی خوای گەورە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەست پێ بكات..؟! وە زەویش كاتێك ئەم كارە دەكات لە خۆیەوە ئەو شتەی نەكردووە بەڵكو ئەمیش گوێڕایەڵی خوای گەورەی كردووەو ملكەچ بووە بۆ فەرمانی خوا، وە مافی خۆیەتی و شایەنی ئەوەیە كە گوێ بگرێ و گوێڕایەڵ و ملكەچ بێت و فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ بكات..؟!

قال تعالى: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ۝١ وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ ۝٢ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ فُجِّرَتۡ ۝٣ وَإِذَا ٱلۡقُبُورُ بُعۡثِرَتۡ ۝٤﴾ [الانفِطَار : ١ - ٤]واتە : سوورەتی (ئینفیطار) (واتە: لەت بوون) سوورەتێكی مەككی یەو (١٩) ئایەتە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ئەفەرمووێ: [ هەر كەسێك پێی خۆشە تەماشای ڕۆژی قیامەت بكات وەك ئەوەی بەچاوی خۆی ببینێ با (إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ) و (إِذَا السَّمَاءُ انْفَطَرَتْ) و (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ) بخوێنێ ] چونكە دیمەنەكانی ڕۆژی قیامەت لەو سوورەتانەدا زۆر بە ئاشكرا و ڕوونی و جوانی باسكراوە، كاتێك كە ئەیخوێنی وەك ئەوە وایە بە چاوی خۆت قیامەت ببینیت. بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ [ إِذَا السَّمَاءُ انْفَطَرَتْ ] كاتێك كە ئاسمان شەق و لەت ئەبێت بۆ دابەزینی فریشتەكان..؟! [وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انْتَثَرَتْ] وە كاتێك كە ئەستێرەكان بەر ئەبنەوە..؟! [ وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ ] وە كاتێك كە دەریاكان هەندێكیان ئەتەقێنەوە ناو هەندێكیان و تێكەڵ ئەكرێن و ئەبنە یەك دەریایەك، وە وتراوە: دەریای شۆڕ (سوێر) و دەریای ئاوی شیرین و سازگار تێكەڵ ئەكرێن بەیەكدا،

خوای گەورە هەندێکی تێکەڵ بە هەندێکی ئەکات، یاخود وتراوە: ئەتەقێنرێنەوە ناو یەکتری، واتە: ئاویان تیادا نامێنێ و بەتاڵ ئەبنەوە، یاخود تێکەڵ بەیەك ئەکرێن و ئەبن بە یەك دەریاو پڕ ئەبن..؟! [ وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ] وە کاتێك کە مردووی ناو گۆڕەکان دەرئەکرێن بۆ ئەوەی لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێ..؟!!

بەلێ کاتێ ئادەم و هاوسەرەکەی ، بە قسەی ئیبلیس یان شەیتان فەرمانی (خوای گەورە)یان شکان و سەرپێچی کردو بەرووبوومی ئەو درەختە یان خوارد ، پۆشاکیان لە بەردا نەماو شەرمگە یان دەرکەوت ، جا پەلاماریان دایە لق و گەلای درەختەکانی ئەو بەهەشتە و خۆیان پێدادەپۆشی ،واتە : جل و بە رگیان نەما ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە تاوان سەرەرای ئەوەش کە مایە شەرمەزاری دونیاو سزای قیامەتە کاردەکاتە سەر پۆشاك و زۆریش هەر وەك (خوای گەورە ) لە قورئاندا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووی: ( ئارام بگرە لە سەر ئەو نوێژەی کە دەیکەی و بەردەوام بە لە سەری ئێمە داوای زۆری لە تۆ ناکەین بەلکو ئێمە رۆزی بە تۆ دەدەین ، قال تعالى: ﴿أْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ۝١٣٢﴾ [طه : ١٣٢]

کەواتە بەردەوام بوون لەسەر پەرستن عیبادەتی (خوای گەورە) ئەوا بە دلنیایی رزق رۆزی زیاد دەبێت ، نەك رزق رۆزی دونیا بەلکو رزق رۆزی قیامەتیش زیاد دەبێت ، ئەوە شی عیبادەت و پەرستن وازلێ دەهێنی یان ترکی دەکات بە پێچەوانەوە ئەو رزق رۆزی کەم دەکات ، ئەوەی کە ئادەم ئەنجامی دا لە گەل هاوسەرەکەی لە نازو نیعمەتەکانی بەهەشت بێ بەش بوون دەرپەرێندران بۆ سەر زەوی ، ئەوەش ئەوە بوو کە فەرمانەکەی (خوای گەورە ) شکاند و سەرپێچی کرد لە فەرمانەکە ، بەلام کاتێ کە تاوانەکەی ئەنجام دا ئەوا (خوی گەورە ) دەری کرد لە بەهەشت دابەزاندە سەرزەوی جێگیر و مستقری کرد لە سەر زەوی بۆ ماوەیەك ..!!

سەرنجێك کاتێ(خوای گەورە ) باسی چیرۆکێك یان داستانێك یان گێرانەوەیەك دەکات لە رابردوو دا روویداوە ، بۆ ئەوە نیە کە ئێمە غافل بین و بێ ئاگابین و بخەوین ، بە پێچەوانە وە بۆ ئەوەیە کە سوودی لێ وەرگرین و غافل و بێ ئاگا نەبین نە خەوین ، بەلکو بۆ سوود وەرگرتمانە لە ژیانی رۆژانە ماندا لە دونیادا کە پەندو ئامۆژگاری لێ وەردەگرین ، ئەمە پەندو ئامۆژگاریە دەبێتە حیکمەتێکی تری (خوای گەورە ) کە لە گەل بەندە کانی دا دیکات ، بۆ ئەوەی بیربکەینەوە تێ بفکرین و تێرامێنین و بیرو هۆشمان بۆ چاکە کردن لە گەل یەکتری دا بخەینە گەر ، ئەگینا نیعمەتەکانی (خوای گەورە ) فراوانە زۆرن بێ ژمار نایەت تەنانەت بۆ کافر و بێ باوەران و موشریکە کانیشە ..؟! ئادەم (علیە السلام ) کە (خوای گەورە ) بەدەستی قودرەتی خۆی دروستی کردوەو بە فریشتە کان یان ملائیکەتەکان فەرمانی دا کە سوژدەی بۆ ببەن ، ئەوەش رێز شکۆ پایە یەکی زۆر گەورە بوو ئەو رێز لێنانەی ئادەم ، بەلام هەموو فریشتەکان سوژدەیان بۆ برد جگە لە ئیبلیس یان شەیتان نەبێت ، غروری گەورەیی لە خۆ بایی گرتی سوژدەی نەبرد ، چووە دەستەی

یان ڕێزی بێ باوەڕانەوە ..؟! ئینجا (خوای گەورە ) دەری پەڕاند و نەفرەتی لێ کرد تا ڕۆژی دوایی ، چونکە فەرمانی (خوای گەورە)ی بەجێ نەهێنا ، بەلام کاتێك ئادەمیش نافەرمانی و سەرپێچی (خوای گەورە) کرد ئەم درەختەی خوارد کە لێ قەدەغەکرا بوو ، ئەویش دوور خرایەوە لە بەهەشت دا بەو هەموو نیعمەتە زۆرەی کە (خوای گەورە ) پێی بەخشی بوو ..؟! بەلام ئادەم جیاواز بوو لە گەل دەرکردنی ئیبلیس ، چونکە ئادەم یەکسەر دوای ئەوەی کە هەلەکەی ئەنجامدا یەکسە تۆبەی کردو پەشیمان بوویەوە ، (خوای گەورە) ش تۆبە و پەشیمان بوونەوەی لێ قبول کرد ، کردیە بە پێغەمبەر ..؟! جا ئێمەش کە نەوەی ئادەمین (علیه السلام ) حەق و دروست وایە کە پەند لەو گێرانەوەیە وەربگرین کە (خوای گەورە ) لە قورئانە کەی دا بۆمان باس دەکات ، بزانین کە گوناهو سەرپێچی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) چۆن دوورمان دەخاتەوە لە ڕەحمەتی سۆزو بەزەیی (خوای گەورە ) ، بەلام بە پێچەوانەوە چاکە کردن گوێڕایەلی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) ئەوا بەدلنیایەوە خێر ڕەحمەت و سۆز و بەزەیی (خوای گەورە ) زیاد دەکات ، هەروەها(خوای گەورە ) ئادەم و هاوسەرەکەی دابەزاند بۆ خوارەوە دەری کرد لەو نازو نیعمەتەی بەهەشت کە تێدا بوون ، جا پێیان ووتن : دابەزن بۆن بۆ خوارەوە هەندێکیان دوژمنی هەندێکتان دەبن ، کەواتە : (خوای گەورە ) ئادەم حەواو ئیبلیسی دابەزاند هیچیان لە بەهەشت نەمایەوە ، بەلام ئیبلیس یان شەیتان دوژمنی نەوەی ئادەمە تا ڕۆژی قیامەت هەر شەرو وسوسە دژایەتی نەوەکانی ئادەم دەکات هەتاکو ڕژی قیامەت دێت ..؟! هەر بە بۆنەی خراپەکاریەکانی ئیبلیسەوە یان شەیتانەوە هەندێکیان دەبنە دوژمنی هەندێکی تریان ..؟! واتە بەهەولە فێزەونەکانی ئیبلیس یان شەیتان نەوەی ئادەم خۆێن ڕشتن ئەجامدەدەن و خراپەکاری و فسادو گەندەلی ئەنجامد دەدەن ، بێ گومان ئەو کەسانەی کە هاوسۆزی شەیتانن یان وەك شەیتان ڕەفتاو ڕوەشتیان وایە ، بەلام هەر لە نەوەی ئادەم کەسانێکی باش چاکە کار دەردەکەون کە ئیمان و باوەری تەواویان بە (خوای گەورە ) پێغەمبەرەکەی هێناوە لە کەسانێکن چاکە کارن هەر گیز سەرپێچی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) ناکەن گوێڕایەل لە عیبادەت وپەرستنی (خوای گەورە ) ئەوانەش لە دەستەی پێغەمبەران و ڕاست گویان پیاوچاکانن ، بە پێچەوانەوە ئەوەی لە دەستە شەیتانە لە کارفر بێ باوەران موشریکان دوو ڕووەکان ستەمکاران گەندەل کارانە ئەمانە سەر زەوی دەکەن بەخوێن ڕشت فسادی خراپەکاری و گەندەلی و زولم و ستەم کردن لە خەلکی هەژارو نەدار لاواز بێ دەسەهەلات ، وا دیارە دەستە یخراپەکاری زۆر ترن لە ئیستا دا، چونکە ستەم و گەندەلی دزی جەردەی خراپەکاری چۆتە قیمە ، هیچ شوێنیك نەماوە لەسەر ئەم زەویە خراپەکاری تێدا ئەنجام نەدرێت ، هاوەلانی ئیبلیس یان شەیتان ڕوو لە زیاد بوونە ، ئەوەی ئێستا کە لەسەر زەوی دەگۆزەرێت هیچ کات خراپەکاری وا ڕووی نەداوە ، تەنانەت سەردەمی فیرەعەونیش ستەم وا لە خەلکی هەژار و لاواز موسلمانی بێ دەسەهەلان نەکراوە ، ئێستای دونیا فەرمان ڕەوایەتی کە تۆتە تاقمی یان دەستە شەیتان بەجارێك موسلمانان وئیمانداران وا لاواز بوونە کە توانای بەرگریان نەماوە هەر هەموویان پەرتەوازە بوونە ، چونکە بەری شەیتان و زولم ستەم فەرمان ڕەوای دەکات ، ئەواتا بە چاوی خۆمان دەروانین لە بەرچاوی هەموو دونیا خوێن ڕشتنی ئەوا ئەنجام دەدن کە هەرگیزاو هەرگیز بە سەر ئیماندار ان موسلمانان دا نەهاتووە ، ئەوەی ئێستا لە (غەزە) لە وەلاتی فەلەستین ڕوودەدات ، ڕۆژانە بە سەدان ژن ومندال پیرۆ نەخۆش کە سانی موسلمانی بێ تاوان خوێنی دەرژێت ، بە ئاگرو ئاسن و فرۆکەو دەبابە شەهید دەکرێت ، ئەوەی کەئێستا دەنووسم لە ڕێکەوتی ٢٠٢٣/١١/١ جوولەکەی صهیونی یان یهودیەکان بە ئاگرو ئاسن لە کەرتی غەزەدەن موسلمانان لە سەرانسەری دونیا تەماشایان دەکەن هیچیان بۆ ناکری جگە لە دوعا کردن پارانەوە بۆیان ، ئەوەی کە

بەناو سەکردەی یان پێشەوای ولاتانی موسلمانە فەزەیان لێ وە نایەت موسلمانا لە سەرتاپەی جیهان بە ژمارە زۆرن بەلام خۆیان لەم جیهادە نادەن کە من بەجیهاد ناوی دەبن چونکە پارێزگاری کردن لە ژن منداڵان بەناحەق ئەوەی شەر بکات بیچیتە ئەم جەنگە بێ گومان جیهادە لە پێناوی (خوای گەورە ) ، بەلام سەر کردە کانی موسلمانان بە گشتی بە تایبەتی سەر کردە عەربەکان رووی خۆیان رەش کرد ،ئەم بێ دەنگیە دەبێت ، باچی بدەن وا بۆیان ناچێتە سەر ، (خوی گەورە ) حەقی ئەم بێ خیرەتیەیان لێ دەسێنێتەوە بەدلنیایەوە ، بەتایبەت یوەلاتی سعودیا کە خۆی بە مەرجەی سوونە پێشەوایانی موسلمانان دەزانێت لە بەردەم مێژوودا دەبێت بەر پرسیاریەتەکەی بخرێتە ئەستۆی وەلاتی سعودیا ، ناکرێ موسلمان ئەوانە بێ خیرەت بێ چونکە موسلمان حەز بە مردن دەکات رەقی لە دونیایە ، ئەوەی ئێستا پێچەوانەبۆتەوەبەرانبەر جوولە کەی خیانەتکار دوژمنی راستەقینەی هەموو مرۆڤێك لە سەر ئەم زەویە دا ، وەلاتانی موسلمانان ئەو هەموو چەك صلاح کەرتەی چەنگی تۆپ دەبابە فرۆکە سارخەی هەیانە بۆ چ رۆژێك هەلیان گرتووە ئەی نالێن موسلمان برای موسلمانە لە هەر کارەساتێك بەسەری بێت دەبێت یارمەتی بدات و پال پشتی بێت ..؟! ئەی وا خوێنی ئەو هەموو منداڵە دەرێژن بۆچی دەنگ ناکەن ، خۆ من بەهیچ شێوەیە باوەرم بەحزبایەتی نیە..؟! هەر کاریچك بکرێت ئەگەر بۆ (خوای گەورە ) نە بێت یەك عانەش ناهێنی ، بەلام حەماس ئاگرەکەی خۆش کردن لە پێناوی وەرگرتنی دەسەلات ، بەلام ژن ومنداڵ گوناهی چیە بۆچی وەلاتێك لەسەر بەجواب نایەت ئیسرائیل نغرۆی ئاگرو ئاسن بکات تەختی بکات لەسەر زەوی خۆ پیان دەکرێن بەلام نایکەن ، چونکە خیرەتیان نەماوە ، ئەو موسلمانە فەقیرو هەژارەی کە توانای نیە بچێت بۆ جیهاد کردن ، ئەوا نابێتە حجە لەسەر بەلام ئەوەی تواناداره چ مال چ بەتوانا چ بە هێز ، ئەوا بەدلنیایەوە دەبێتە حجە لەسەر کە وەلامەکەی چ دەبێت لە لای (خوای گەورە ) ..؟! بەدلنیایەوە ناخ هەژینە ئەو هەموو ژن منداڵ پیرو پەکەت رۆژانە شەهید دەبن لە غەزە ، خودایە لێت دەپارینەوە صبرئارمی ببەخشە بە کەس وکاری شەیدان لە غەزە خودایە نصرت و سەرکەوتن یان پی ببەخشە چونکە زولم ستەمیان لێ دەکرێ خودایە صبر ئارامی ببەخشە بەسەر ئەوانەی توانیان نیە پال پشتی خەلکی بێ تاوانی غەزە بکەن ، وا جوولەکەی نامرۆڤ وەکو ئاژەل بە بۆتە گیانی ئەم خەلکە ، خودایە جوولە کە لە ناو ببەیت هەر وەکو بەلێنتداوە بە پێغەمبەرکەت ﷺ ..؟!

بەلێ ئەگەر تەماشای جیهانی ئێستا بکەین کە وەلاتانی رۆژئاوا بانگەشی مافی مرۆڤ مافی ژن مافی منداڵ و مافی ئاینەکان مافی جەنگ و شەرکردن و هەموو مافێك کە ئەوان بەناو دایان رشتووە لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی وەلاتانی یەکگرتوو دا هەموو ئەم فافانە هەلوەشاوەتەوە کەو تۆتە ژێر پرسیا کردن ..؟! کەچی خۆی لە بنەرەت هە بۆ هەلخەلەتاندن روو پۆش کردنی خیان دایان نابوو هەر ماف نەبوون ، ئەوەی ماف هەیە تەنها لەئیسلام دا هە یە ، چونکە بە بەرچاوی ئەنجوومەنی نوێنەرانی وەلاتانی یەکگرتوودا یان وەلاتانی رۆژئاوا داوا جوولەکە زولم وستەم ئاگرو ئاسن دەبارێنێ بەسەر ژن ومنداڵی غەزە دا ..؟! ئەمانەی کەباسمان کرد خۆ موسلمانانیش کەم نیچن بەژمارە بە بەچاویانەوە زولم و ستەم دەکرێت خۆیان بێ دەنگ کردیە ، (ابو عبیدە ) ووتە بێژی توفان ئەقصی یان حماس ، ووتەیەکی زۆر جوان و مانداری ووت : بۆ وەلاتانی ئیسلامی عەرەبی دا ، ووتی: (مێن بۆ جیهاد کردن یان یارمەتی جەنگیمان مەدەن ، بەلکو تەنها ئازووقە ئاو دەرمان و خواردنمان بۆ بهێنن ..؟! ). ئەمەیان بەسە بۆ وەلاتانی موسلمانان وەلاتانی عەربی ..؟! ئەوەش ئەو مانایە دەگەیەنێ کە لە غەزاکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەت بەژداری جیهادی نەدەکرد بەلکو

تەنها ئاو هێنان خواردن تیمار کردنی مجاهیدان لە ئەستۆی ئافرەتان بوو، ئەوەکە وەلاتانی ئیسلامی و عەربی بە ئافرەت ناو زەندکرد..؟! هەر وەکو ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموویێت : ((يوشِكُ الأُمَمُ أنْ تَداعَى عليكم؛ كما تَداعَى الأَكَلَةُ إلى قَصْعتِها. فقال قائلٌ: ومِن قِلَّةٍ نحنُ يومئذٍ؟ قال: بل أنتم يومئذٍ كثيرٌ، ولكنَّكم غُثاءٌ كغُثاءِ السَّيْلِ، ولَيَنْزِعَنَّ اللهُ من صدورِ عدُوِّكم المهابةَ منكم، ولَيَقذِفَنَّ اللهُ في قلوبِكم الوَهَنَ. فقال قائلٌ: يا رسولَ اللهِ، وما الوَهَنُ؟ قال: حُبُّ الدُّنيا، وكراهيةُ الموت)).[١] واتە : هاکا گەلان یان وەلاتانی رۆژئاوا یان وەلاتانی بێ باوەران ، دابارین بە سەرتاندا چواردەوریان لێ گرتن وە چۆن کۆمەلە بخۆری یان کۆمەلێکی زۆر خۆر دادەبارن بە سەر سفرەی نان خواردنێك، قەسەکەرێك ووتی : ئایا لە بەر ئەوەی ژمارەمان کەمە ..!! پەلامارمان دەدەن لە و کاتە دا ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : نەخێر . بەلکو لەم رۆژەدا ئێوە ژمارەتان زۆرە ، بەلام وە کەفی سەر لافاو یان پوش بەلاشی سەر لافا و وانە ..!! ئاماژەی بە ترسنۆکی بێ خیرەتی بێ توانایيان کرد ، (خوای گەورە ) لە بەر بێ ئیمانی بێ تەواقیتان بێ بایەختان دەکات لەبەر چاوی دوژمن و ترسی ئێوەیان لە دلدا نامێنی ..!! ورەشتان دەبا ..!! قسەکەرێك ووتی : ئەی پێغەمبەریخوا ﷺ ،هۆی ئەو بێ وورە بەردانە چی یە ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : خۆشەویستی دونیاو رقبوون و ترسان لەمردنە ..؟! ماشا الله هەر دەلێ ئەم فەرموودە ئەمرۆیە کەتێداینە هەر دەلێ پێغەمبەری خوا ﷺزیندووە وا لەگەل ماندایە ، چۆن وەسفی ئەو رۆژەمان بۆ دەکات ، بێ خیرەت ترسنۆکی وەلاتانی ئیسلامی ترسنۆکی وەلاتانی عەرەبی بەتایبەتی ، هەروەها دوو رووی نفاقی موسلمانان لەم رۆژە دا ، ئەوەی کە ئێستا بەسەر موسلمانانی غەزە دا هاتووە لە مێژوو ئەم زولم ستەمە نەکراوە لە موسلمانان ، خۆ (عمری کور خەتاب ) فتحی قدسی کرد وا زولم ستەمیان نەکرد جوولە خۆ صەلاحەدین ئەیووبیکە کورد شانازی پێوە دەکات فتحی قدسی کرد جوولەکەئەم زولم ستەکیان ئەنجام نەدا ، ئەی کوا خیرەت شەرفی عەرەبەکان کە بە بیست دوو وەلات ناتوانن بەرگری لە خاك هاو نەتەوەی خۆیان بکەن ، لە لایەکی تریشەوە وەلاتانی موسلمان ئەو رۆژە تان لە بیر بێت ٢٠٢٣/١٠/٧ رۆژ شمە تاکو ئێستا ٢٠٢٣/١١/١رۆژی چوارشمە..؟!

بەلێ بگەرێنەوە سەر بابەتی سەرکی خۆمان دەربارەی ئادەم (علیه السلام ) ئەم چەند ئایەتەی پێشتر کە باسمان کرد هەندێك سەرنج:

هەندێك لە ئەهلی سوننە و جماعە پێیان وایە رێزو پایە و شکۆی ئادەم زیاتر بووە لە فریشتە کان لە بەر هۆی ئەوەی کە سوژدەی رێزیان برد بۆ ئادەم (علیه السلام ) ، هەر بۆیە لە چەند خالێك دا روونی دەکەینەوە :

١-ئادەم (علیه السلام ) زاناترە بوو ، لەفریشتە کان چونکە ئەوەی (خوای گەورە ) فێری ئادەم کرد فێری فریشتەکانی نەکرد بۆیە ئادەم بووە بە فێرکاری فریشتە کان ناوی شتە کانی پێ ووتن ، هەر بۆیە زانا لە نەزان رێزدار و پایە دار ترە لە لای (خوای گەورە)..؟!

[١] سنن ابي داود برقم (٤٢٩٧).

٢-(خوای گەورە ) فەرمانی بە فریشتەکان کرد سوژدە ببەن بۆ ئادەم ، دیارە ئەمەش ئاشکرایە ئەوانەی سوژدەی ڕێز و ئیحترام دەبەن بۆ کەسێك دیارە بەرێز ترو بەئیحترام ترە لە لایەن ئەوانە سوژدەیان بۆ بردوە یان لە لایەن (خوای گەورە ) کە فەرمانی سوژدە بردنی بۆ بڕیاردا ..؟!!

٣-هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرمووێت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەنەوەی ئادەم ، ڕێزی ڕەحمەتی لێناوە دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ [الأَنبِيَاء : ١٠٧]واتە : ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - تۆمان نەناردووە ئیلا وەکو ڕەحمەت نەبێ بۆ هەموو جیهان، ئەوەی ئیمانی پێ بێنێت و شوێنی بکەوێت ڕەحمەتە بۆ دونیاو قیامەتی، ئەوەیشی ئیمانی پێ نەهێنێت و شوێنی نەکەوێت تەنها ڕەحمەتە بۆ دونیای کە خوای گەورە وەکو ئوممەتانی تر لە دونیا بە کۆمەڵ سزایان نادات و لەناویان نابات..؟!

٤-(خوای گەورە ) ئادەمی کردە بە مامۆستای فریشتە کان چونکە بێ گومان مامۆستا لە قوتابی ڕێز دار ترە ..؟!

٥-(خوای گەورە ) ئادەمی کرد بە خلیفە یان جێ نشین لە سەر زەوی ، هەر وەك پایە خلیفە یان جێ نشین پایە کی بەرزە ..؟!

٦-عیبادەت یان پەرستنی ئادەم قورسترە گرانترە لە عیبادەت پەرستنی فریشتە کان ، چونکە ئادم گیرۆدەی یان خواست و ، ویستی لە سەر ئارەزوویی نەفسی خۆیەتی ، ئەوانەش ڕێگری دەکات لە عیبادەتی تەواو دورست ، وە ڕێگەی وسوەسەی شەیتان یان ئیبلیس زۆر ترە لە فریشتەکان ، وە فریشتەکانیش نە ئارەزووی نەفس و نە ڕێگری شەیتان یان ئیبلیسی هەیە ..؟!

٧-(خوای گەورە ) ئادەمی هەڵبژاردوە لە گەل نەوەکانی ، هەروەها ئادەم لە جیهانیان یان (العالمین ) گەورە ترو پایەدار ترە هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿۞إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ٣٣﴾ [آل عِمۡرَان : ٣٣]واتە : بە دڵنیایی خوای گەورە ئادەم و نوح و ئالی ئیبراهیم خۆی و نەوەکانی کە پێغەمبەر بوونە وە ئالی عیمران کە عیسی لەوان بووە ئەمانەی هەڵبژاردووە بەسەر هەموو جیهاندا ..؟!

قال تعالى: ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٦]واتە : شەیتان تووشی زەلەو تاوانی کردن [ فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ] وە دەری کردن لە ژیانی خۆشی بەهەشت بەوەی کە لە دەرەوەی دەرگای بەهەشت پێیانی وت لەم دارە بخۆن وە ئەگەر لێی بخۆن ئێوە ئیتر بۆ هەمیشەیی ئەژین، فێڵی لێ کردن و وەسوەسەی بۆ دروست کردن..؟!

ئەگەر سەرنجێك بدەین بە ووشەی ﴿ٱهۡبِطُواْ﴾ واتە: مانای ئەوە دەگەیەنێ ( دابە زینە لە سەرەوە بۆ خوارەوە ) ، ووشەکە بە (صیغەی الامر ) واتە: بە صیغەی فەرمان کردن هاتووە ..؟! سەبارەت بەم (خطابە ) یان ئەم ووتەیە سێ ڕەهەند لە خۆ دەگرێت:

١- ئەم (خطابە ) بۆ ئادەم و حەواو ئیبلیس هاتووە ، چونکە بە صیغەی جمع هاتووە واتە : بە کۆ هاتووە ..؟!!

٢- ئەم (خطابە ) بۆ ئادەم و حەواو نەوەکانی هاتووە ..؟!!

٣- ئەم (خطابە ) بۆ ئادەم و حەواو هاتووە ، چونکە کەمترین جمع یان کۆ بۆ دوو کەسە ، هەر وەك (خوای گەورە) دەربارەی دادگەری یان حوکمی (داود) و(سلیمان ) بە جمع یان کۆ هاتوو ، دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ۝٧٨﴾ [الأَنبِيَاء : ٧٨] واتە: وە ئێمەش ئاگاداری بڕیاردانی ئەوان بووین..!! هەروەها لە سورەتی تردا بە (مثنى) واتە: بە جووت هاتووە ، هەر وەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا﴾ [طه : ١٢٣]واتە : هەردووکتان ئادەم و حەووا لە بەهەشت دەرچن و دابەزن بۆ سەر ڕووی زەوی..؟!

✍ لە ( ابن قیم ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : سەبارەت بەم ووتەیەی (خوای گەورە ) کە لە سوورەتی طه دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ٱهْبِطَا مِنْهَا﴾ [طه : ١٢٣] دەلێت : یان بۆ ئادەم و حەوا واتە: هاوسەرەکەی دە گەرێتەوە ، هەندێکیان دەبن بە دوژمنی هەندێکیان (ضمیر ) لە ووتەی ﴿ٱهْبِطَا مِنْهَا﴾ یان بۆ ئادەم و خێزانەکەی دەگەرێتەوە یان بۆ ئادەم ئیبلیس دەگەرێتەوە باسی هاوسەرەکەی یان خێزانی نەکراوە ، چونکە تابعە بۆ ئادەم ، لەسەر ئەمە ئەو دوژمنایەتی باسکراوە بۆ ئادەم ئیبلیس ..؟! .[1]

لێرە دا باسکردنی بە (مثنى ) واتە : دوو ئەگەری هەیە ،١- یان بۆ ئادەم حەوایە ، چونکە هەردووکیان لە درەختە کەیان خوارد ، ٢-یان بۆ ئادەم ئیبلیسە چونکە هەردووکیان پێشەوایی مرۆڤ جنۆکەکانن واتە : ئەصلی نەوەکانیانن واتە: ئادەم باوکی مرۆڤ ئیبلیسیش باوکی جنۆکەیە ..؟! تێبینی : هیچ بەلگەیە نیە کە ئیبلیس باوکی جنۆکە بێت بەلام لە قبیلە ی جنۆکەکان بووە هەروەها پێشەواو سەرۆکیان بووە ( (خوای گەورە زاناترە )..!!

کەواتە : قال تعالى: ﴿ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا﴾ [طه : ١٢٣] واتە: ئە(خطابە ) بۆ ئادەم و ئیبلیسە ، چونکە کاتێك باسی تاونەکەی کرد ، تەنها باسی ئادەمی کرد باسی حەوا نە کراوە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ۝١٢١ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ۝١٢٢ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ [طه : ١٢١ - ١٢٣]واتە : وە ئادەم - صلى الله علیه وسلم - سەرپێچی خوای گەورەی کردو ژیانی لێتێکچوو بەوەی هاتە سەر ڕووی زەوی..!![ ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ ] پاشان دووبارە خوای گەورە هەڵیبژاردەوە [ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى] وە کە داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە کرد

[1] - بدائع التفسير (١/٣١١-٣١٢) او (١/٣١٠).

لێیخۆشبوو وە هیدایەتی دا بۆ ئەوەی کە تەوبە بکات..؟! هەردووکتان ئادەم و حەووا لە بەهەشت دەرچن و دابەزن بۆ سەر ڕووی زەوی [ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ] ئێوەی گرۆی مرۆڤ هەندێکتان ئەبن بە دوژمنی هەندێکی ترتان..؟!

بەڵێ شەیتان یان ئیبلیس ، ئادەم حەواوی تووشی هەڵخەڵەتاندیانی کرد، سەرپێچی پی کردن ، بەو خواردنی ئەم درەختەی کە (خوای گەورە ) لێی قەدەغەکردن ، ئەوە تووشی وەسوەسەی شەیتان بوون ، هەر دووکیانی دەرکرد لە بەهەشت دا ، هەر لە بەر ئەم تاوانە بوو ، قال تعالی: ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ﴾ بەڵێ لێرە دا واجبە بۆ نەوەی ئادەم کە خۆی لە وەسوەسەی شەیتان بپارێزێت ، چونکە بەردەوام هەڵمان دەخلیسکێنی بۆ هەردیلە کان ، قال تعالی: ﴿فَأَزَلَّهُمَا﴾ واتە : هەڵخەڵەتاند یان هەڵخلیسکاندن، چونکە بەردەوام ئادەمیزاد بۆ گومرایی جاهیلی نەزانی لە خۆبایی غروری دەبات ..؟! هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ﴾ [الأَعۡرَاف : ٢٧]واتە : ئەی نەوەکانی ئادەم شەیتان فێڵتان لێ نەکات و نەتانخەڵەتێنێ [ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ ] هەروەکو فێڵی لە دایك و باوکتان کردو لە بەهەشت دەری کردن بەوەی کە تووشی ئەو سەرپێچی و تاوانەی کردن..؟!هەروەها دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ١٦٨﴾ [البَقَرَةِ : ١٦٨]واتە: ئەی خەڵکینە بخۆن لەو ڕزق ورۆزیەی کە خوای پەروەردگار بۆی حەڵاڵکردون لەزەویدا، کە پاکە و پیس نیە، بە سود و زیان بەخش نیە، و شوێنی ڕێگەکانی شەیتان مەکەون لە حەڵاڵکردن و حەرامکردندا، و لە بیدعە و سەرپێچیەکان. چونکە بێگومان ئەو .واتە : شەیتان. دوژمنی ئێوەیە و دژایەتیکردنی بۆتان ئاشکرایە ..؟!هەروەکو شەیتان دوژمنی ئادەم حەواو نەوەکانیەتی لەبەر ووتەی قال تعالی: ﴿بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ﴾ ..!!

زانایانی ئەم ئۆمەتە سەبارەت بە جیاوازی نیچوان ئادەم و ئیبلیس یان شەیتان دەڵێن :

١-شەیتان یان ئیبلیس فەرمانی (خوای گەورە )ی شکاندو وازی لێ هێنا ، واتە : فەرمانی (خوای گەورە) جێ بەجێ نە کرد ..؟! بەلام ئادەم جیاواز بوو ئەو تووشی حرام کراوێك بوو یان قە دەغەکراوێك بوو ، ئەوەی ئادەم هەلە بوو بیرو باوەر نەبوو ، بەلکو ئیبلیس یان شەیتان بە بیروباوەری یان ئیعتقادی خۆی فەرمانەکەی جێ بەجێ نەکرد ..؟!

٢-هۆی تاوانی ئادەم شەهوت و ئارەزوو بوو، بەلام هۆی تاوانی ئیبلیس غروری لە خۆبایی و خۆ بەگەورە زانین بوو..؟!

٣-ئادەم (علیه السلام ) بە شیمان بوویەوە یەکسەر توبە و استغفاری کرد ، بەلام شەیتان یان ئیبلیس پەشیمان نەبوویەوە غروری خۆ بە گەورە زانین و لە خۆبایی بوو توبەی نەکرد ، وە بەلێنیشی دا ئەگەر بمێنێت تا رۆژی دوایی هەموو بەندەکانی (خوای گەورە) گومراو سەرگەردان بکات ..!

(ابن قیم) – رەحمەتی خوای لێ بێت – سەبارەت بەتاوانی ئادەم و ئیبلیس یان شەیتان دەلێت: (وازهێنان یان نەکردنی فەرمانەکانی (خوای گەورە ) تاوانەکەی گەورە ترە ، لە قەدغەکراوەکانی (خوای گەورە ) ..).[١]

کەواتە : ئەگەر ئیبلیس پەشیمان بووبایەوە توبەی بکردایە ، ئەوا دەرگای توبەی لێ دانەدەخرا ، دەرگای توبەی بۆ دەکراوە بوو ، بەلام توبەی نەکرد و بەردەوام بوو لە سەر خۆ بەگەورە دانان وە لە خۆبایی بوون و بەلێنی دا زۆربەی نەوەی ئادەم گومرا بکات ..؟!

بەلێ گومان شەیتان یان ئیبلیس دۆری لە گەل ئادەم کرد و هەلی خەلە تاند لە خشتەی برد هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا﴾ ، بێ گومان ئەو درۆ و هەلخەتاندنەی کە شەیتان کرد لە گە ل ئادەم ، بە وەسوەسە کردنی ئادەم لە دلی دا ئەوەیە کە (خوای گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ١٢٠﴾ [طه : ١٢٠] واتە : {ئیبلیس فێڵی لە ئادەم دەکات} [ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ ] شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست کرد بە دەنگێکی نهێنی [ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ ] وتی: ئەی ئادەم ئایا ڕێنماییت بکەم بۆ دارێك کە ئەگەر لێی بخۆیت بۆ هەمیشە زیندوو ئەبیت و مردنت بەسەردا نایەت [ وَمُلْكٍ لَا يَبْلَى ] وە موڵکێکیش کە هەرگیز لەناو ناچێت و کەم ناکات..؟!

بەدلنیایەوە شەیان بۆ هەمیشە هەر درۆ دەکات بەندەکانی (خوای گەورە ) هەلدەخەلەتێ نێت لە خشتەیان دەبات ، بەلام ئەم شەیتانە زۆر ترسنۆکە بە رانبەر بە پیاوچاکان ، هەروەها ترسی هەیە لەوانەی ئیمانیان دامەزراوە لە سەر ئەم ئاینە پاك و بێگەردە ، چونکە بەردەوام هەولی جیاکردنەوەی موسلمانان و ئیمانداران دەدات بە تەفرقە کردنی نێوانیان ، دەچێتە نێو خیزانە ئیماندارەکان بە تەفەرقە دووبەرەکی نێوانیان ، هەولدەدات بە شرین کردنی مال وسان نی موسلمانان بۆ ئەوەی نە نفەقەی خاو خێزان و کەس کاریان بدەن نەزەکاتی مالی خوا بدەن ، رێگری دەکات لە نەفقە و صدقە زەکات بە موسلمانان ، هەروەها رێگری دەکات لەوەی کە دانیشتن یان مجلسی علم و زانستی شەرعی هەبێت ، بۆئەوەی کە خەلکی زانستیان نەبێت بە کردەوە چاکەکان ، بەردەوام شەرو

---

[١] - الفوائد ص (١٢٥-١٣٥).

ئاشوب بلاودەکاتەوە چونکە سوود لە خراپەکاری شەرو ئاشووبی نێوان ئیمانداران دەبینێ، هەروەها رێگری دەکات لەوەی کە ئەم ئاینە جوانەی خوا بلاو بێتەوە ،ئەوە کارو پیشەی شەیتان سەربازانی شەتانە ، چونکە کەندێك کەس هەن هاوشێوەی شەیتان دەکەن ئەوانە سەر بازی شەیتانن ، هەروەکو دەڵێن : شەیتانی ئەنس و شەیتانی جن ، بەلام شەیتانی ئەنس واتە: مرۆڤ ئەو شەیتانانە کە بەردەوام روویان لە خراپەکاریە دارو دەستەی شەیتانن ، وەکو دەڵێن : شەیتان بەچاو نابینرێت ، بەلام ئەو کەسە شەیتانە، کە کارێکی قێزەون خراپەکاری و ستەم زوڵم بێ باوەری بلاودەکاتەوە لە نێو خەلکی دا ، جا دۆستانی یان سەربازانی شەیتانی ئەنس زۆرن بە ژمارە نایەت بە تایبەتی لەم سەردەمەی ئێستا دا ، کە زوڵم ستەم خراپەکاری و نیفاق دووڕوویی کوفرو موشریکی چۆتە قیمە و ، وە بەهیچ شێوەیەك بە هایی مرۆڤایەتی نەماوە بەتایبەتی لە نێو وەلاتانی رۆژئاوا ، وا خەریکە پروشك وئاگرەکەش بکەویتە نێو وەلاتانی موسلمانانیش ..؟! جا ئەوەیە کە (خوای گەورە ) بۆمان روون دەکاتەوە کە شەیتان دوژمنی راستەقینەی ئیماندارانە ، وە بەقسەی مەکەن و گوێڕایەلی مەکەن ، چونکە شەیتان بانگەشەی یان بانگی دۆست و لایەنگیرانی و کروپ و حیزبەکانی خۆی دەکات ، بۆئەوەی کەئەوانیش بچنە نێو ئاگری دۆزەخەوە ، بێ گومان ئەوەی کە خراپەکار و ستەم کارو دوو روو فسادو گەندەلکارو خوێن مژو دزو جەردە و ئەوانە لە دەستە و گروپ و دۆست لایەنگیران و حیزب و پێرەیی شەیتانن ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ٦﴾ [فَاطِر : ٦]واتە : بەڕاستی شەیتان دوژمنی نەوەکانی ئادەمە، دەسا ئێوەش بیکەن بەدوژمنی خۆتان وگوێڕایەڵی مەکەن، ئەو تەنها شوێنکەوتوەکانی بانگ دەکات بۆ گومڕایی، بۆ ئەوەی ببن بە نیشتەجێی دۆزەخ کە ئاگرەکەی ئاگرێکی بڵێسەدارە ..؟!

✍ لە (الاعمش ) – خوا لی رازی بێت – دەڵێت: لە سورەتی البقردا ، لە شوێنی ﴿فَأَزَلَّهُمَا﴾ دەمان خوێند ﴿فَوَسۡوَسَ﴾ [الأَعۡرَاف : ٢٠] ..).[١]

[١] -اخرجه ابن ابي داود في المصاحف (٣٠٢/١).

✍ لەرێ (ابن جريج ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَأَزَلَّهُمَا﴾دەڵێت: مانای (فریودانە )..!! ).[١]

✍ لەرێ (إسماعيل ) لە (الحسن البصرى ) – رەحمەتی خوای لێ بێت - لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَأَزَلَّهُمَا﴾ دەڵێت : واتە : بەروە هەنگاو نانی هەڵە فێڵ کردن ..).[٢]

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت- لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا﴾ دەڵێت : بۆیە شەیتان وای لێ کردن لە رێ لایان بدات ، واتە : دوو ری خستنەوە لە گوێرایەڵی کردنی (خوای گەورە ) ..).[٣]

✍ لە رێ ( أبان العطار ) لە (عاصم بن بهدلة ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَأَزَلَّهُمَا﴾ واتە: لە سەر ێگای راستی بردن ..؟! ).[٤]



✍ لە رێ (الزبير بن خريت ) لە (عكرمه) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ دەڵێت : ناوی : شەیتانە ، چونکە (تشیطن) واتە : تەنها کردەوەی خراپەی لێ چاوەرێ دە کرێت یان دوور لە هەموو خێرێك تەنها شەری لێ چاوەرێ دەکرێت ..!! ).[٥]

✍ لە رێ (السدى ) لە ( ابى مالك لە ابى صالح ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : کاتێك (خوای گەورە) فەرمووی : بە ئادەم هاوسەرەکەی لە بەهەشت دا ئارام بگرن بحەسێنەوە ،قال تعالى: ﴿ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ دەڵێت : ئیبلیس ویستی بچێتە ناو بەهەشتەوە ، بەڵام خەزێنەدارەکانی بەهەشت رێگریان لێ کرد کە بچێتە ناو بەهەشت ..!!

---

[١] -اخرجه ابن جرير(٥٦٠/١).
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم ((٧٨/١) (٣٨٣).
[٣] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٩/١)، و التفسير البغوي (٨٣/١).
[٤] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧٨/١) .
[٥] -اخرجه ابن ابي حاتم (٧٨/١).

شەیتان رۆیشتە لای مار ، لەو کاتە دا مار لە دەستەی یان لە تاقمی چوار پێ یەکان بوو ،واتە : ئاژەڵێك بوو لە چوار پێ یەکان ..!! وەکو ئاژەلی ووشتر رادە لە بەر جوان بوو ، شەیتان دوای لە مار کرد تاکو بڕواتە نێو دەمی و هەر بەم شێوەیە بڕواتە نێو بەهەشت دا، مار لە لای خەزینە دارە کانی بەهەشت تێ پەری ..!! ئەوان نەیانزانی واتە : پێ یان نەزانی ..!! چونکە (خوای گەورە ) هەر بەم شێوەیە فەرمانی یان بڕیاری لە سەر دا بوو ویستی (خوای گەورە ) بوو ..!! شەیتان یان ئیبلیس لە ناو دەمی مارە کە قسەی کرد، بەلام ئادەم گرینگی بەم قسە کانی نەدا ..؟! هاتە دەروە ووتی : قال تعالی: ﴿قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ١٢٠﴾ [طه : ١٢٠] واتە : [ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ ] وتی: ئەی ئادەم ئایا ڕێنماییت بکەم بۆ دارێك کە ئەگەر لێی بخۆیت بۆ هەمیشە زیندوو ئەبیت و مردنت بەسەردا نایەت [ وَمُلْكٍ لَا يَبْلَى ] وە موڵکێکیش کە هەرگیز لەناو ناچێت و کەم ناکات..!! بەلێ ئیبلیس ووتی : ئەی ئادەم ئایا تۆ دەخوازیت درەختی نەمری و هەرگیز هەرگیز نامری و پاشایەتی بێ کۆتا نامریت بۆ هەمیشەیت پێ نیشان بدەم ..؟! واتە: درەختێکت پێ نیشان بدەم ئەگەر لە بەرووبوومەکەی بخۆیت دەبیتە فریشتەیەك هاوشێوەی فریشتەکان هەر دووکتان نەمر دەبن ، واتە : هەر گیز نامرن ..؟! ئینجا شەیتان سوێندی خوارد بە (الله ) ، ووتی : قال تعالی: ﴿وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ٢١﴾ [الأَعۡرَاف : ٢١] واتە: شەیتان سوێندی بۆ خواردن کە من دڵسۆزو ئامۆژگاریکاری ئێوەم..!! هەروەها شەیتان دەیویست هەر بەم شێوەیە شەرم و حیایی ئەوان ئاشکرا بکات و جلەکانیا لە بەردا فڕێ بدات ، چونکە بە خوێندەوە ی کتابی فریشتەکانی دەزانی ، کە شەرم و حیایان هەیە ، بەلام ئادەم نەیدەزانی و جلەکانیان لە نینۆك بوو ، ئادەم نەی دەویست لەم درەختە بخوات ، بەلام حەوا رۆیشت پێش دانیشت لەم دەرختەی خوارد ، بە ئادەمی ووت : بخۆ لەم درەختە ..!! من خواردم هیچ زیانیچکم بەر نەکەت ..!! کاتێك ئادەم خواردی ..؟! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالی: ﴿فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِ﴾ [الأَعۡرَاف : ٢٢]واتە : کاتێك کە ئادەم و حەوا لە دارەکەیان خوارد عەورەتیان کە دایان پۆشی بوو دەرکەوت [ وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ ] وە بەگەڵای دارەکانی بەهەشت عەورەتی خۆیان داپۆشی، کە ئەووترێ: گەڵای دارهەنجیر بووە..!! ).[1]

✍ لە ( يحيى بن سلام ) دەڵێت : (ابو هريرە ) – خوا لێ رازی بێت- پێ راگەیاندم ووتی : حەوا ئەو کەسە بوو کە شەیتان ئەو شوێنە قەدەغەکراوەی پێی نیشاندا ..؟! ).[2]

---

[1] - اخرجه ابن جرير (٥٦٣/١).
[2] -تفسير ابن زمنين (١٣٤/١).

✍ لەرێ (ابن إسحاق ) لە (لیث) لە ( طاووس الیماني ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : دوژمنی خوا ئیبلیس یان شەیتان داوای لە هەموو خشۆکەکانی یان دابەی سەر زەوی کرد تاکو یەکێکیان ببات بۆ ناو بەهەشت ، بۆ ئەوەی لە گەل ئادەم هاوسەرکەی دا قسە بکات ، هیچ لە خشۆکەکان یان دابەکان رازی نەبوون ..!! ئەم داوایەی لە مار کرد پێ ووت : ئەی مار ئەگەر تۆ من ببەیتە ناو بەهەشت لە بەرانبەر ئادەمیەکان پارێزگاریت لێ دەکەم لە پەنای مندا دەبیت ..؟! مار شەیتانی لە نێوان دوو ددانی خۆی دا هەلگرت رۆیشتە ناو بەهەشتەوە ، شەیتان لە ناو دەمی مار قەسەی لە گەر ئەوان دەکرد، مار داپۆشرا بوو لە سەر چوار دەست پێ دا رادەوستاو دەرۆیشت وەك ئاژەلی (ووشتر) ، بەلام (خوای گەورە ) ئەوی واتە: ماری رووتکردەوە بەشێوەیەك لە سەر سگ بخزیێ واتە: دوو دەست دووقاچی لێ کردوە ، کردیە بە خشۆك بێ پێ ..؟! هەروەها (ابن عباس ) دەلێت : لە هەر شوێنێك مار تان بینی ، بی کوژن و پشتیوانی دوژمنی تێکیشکێنن ..).[١]

✍ لەرێ ( عبدالرزاق ) لە (عمر بن عبدالرحمن بن مهرب ) لە (وهب بن منبە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : کاتێك (خوای گەورە ) ئادەم و هاوسەرەکەی لە بەهەشت دا جێگەی کردەوە ، پێ فەرموون : لەم درەختە مەخۆن ، لقەکانی درەختە تێکەل لە یەك ئالابوون ،فریشتەکانیش لەو درەختەیان یان لەو میوەیان دەخوارد ، هەر ئەو درختە ش بوو یان ئەو میوەیە بوو کە (خوای گەورە ) لە ئادەم و هاوسەرەکەی قەدەغەی کردبوو..!! کاتێك ئیبلیس یان شەیتان مەبەستی ئەوەی کرد ، بۆ هەلخەتاند یان هەلخلیسکاندیان تووشی گوناهو تاوانیان بکات ، چووە ناو دەمی مار ئەو کاتە مار خاوەنی چوار پێ بوو ،هاوشێوەی قۆچێکی بەهێز بوو ، کاتێك مار چووە ناو بەهەشت ، ئیبلیس یان شەیتان لە دەمی هاتە دەرەوە ، لە درەختە قەدەغەکراوەکەی هەلگرت بردی بۆ حەوا و ووتی : بروانە یان تەماشا بکە میوەی ئەم دارە یان ئەم درەختە چەندە بۆنخۆشە و بەتامە و رەنگ جوانە ، ئینجا حەوا لێ خوارد ئادەمیش بە هەمان شێوەی لە دوای حەوا خواردی ..؟! هەر بەم شێوەیە شەرم و حیایا ئابروویان دەرکەوت ، واتە : پۆشاکیان لەبەردا نەمان ، ئادەم پەنای بۆ لق و پۆپی درەختەکە برد ، (خوای گەورە ) بانگی کرد فەرمووی : ئای ئادەم تۆ لە کوێیت ..؟! ئادەم ووتی : ئەی (خوایە ) لێرەم ..!! (خوای گەورە ) فەرمووی : بۆ نایێیتە دەر ..؟! ئادەم ووتی : ئەی (خوایە ) لە تۆ شەرم دەکەم ..!! (خوای گەورە ) فەرمووی : نەفرەت بێت یان نعلەت بێت لەو زەویەی لێ دورست کرایت ، نەفەرت بێت لە دەرختەکە میوەکەش بوو بە چقل یان بوو بە درکاوی یان درەختی شوکا ...

دەلێت: پێش ئەوە لە بەهەشت و زەوی درەختێکی چاکتر باشتر لە درەختی (الطلح والسدر ) بوونی نەبوو ، (خوای گەورە ) فەرمووی : ئەی حەوا تۆ لەبەر ئەوەی بەندەکەی منت فریودا ، بە بێزاریەوە یان بە رق لێ بوونەوە تۆ دووگیان دە بیت یان حامیلە دار دەبیت، وە لە کاتی مندال بوونت دا بۆ هەمیشە هەرەشەی مەرگت لە سەر دەبێت ، واتە : لە کاتی مندال بوونت لە مەرگ یان مردن نزیك دەبیتەوە ..؟! ئینجا (خوای گەورە ) بە ماری فەرموو: تۆ ئیبلیس یان شەیتانی مەلعون یان نەفرت لێ کراو، هاتە ناو سکت و

---
[١] -اخرجه ابن جریر(١/٥٦٦).

بەندەی منت فریودا ..؟! تۆش مەلعون یان نەفرەت لێ کراو دەبیت ، واتە : ماریش نەفرتی لێ دەکرێ ، هەروەها فەرمووی : ئەی مار دەست قاجەکانت دەبیێت بەسکی تۆ ، واتە بێ دەست قاج دەبێت ، رزق رۆزیت دەبیتە بەخاك خۆل ، وە دوژمنی نەوەکانی ئادەم دەبیت ، وە ئەوانیش دوژمنی تۆ دەبن ، لە هەر شوێنیك لە نەوەکانی ئادەم ببینی ، ئەوا پاژنەی پیان دەگەزی ، وە ئەوانیش تۆ لە هەر شوێنك ببینن سەرت پان دەکەنەوە لە ناوت دەبەن ..!!).[1]

✍ (عمر) لە (وهبی ) پرسی : فریشتە كان خۆ هیچ ناخۆن ..؟! (وهب ) ووتی : (خوای گەورە ) هەرچی بخوازێت ئەنجامی دەدات..).[2]

✍ لە رێ (الربيع بن أنس ) لە (ابى العاليه )- رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : لە ووشترەکان یەکەمیان جنۆکە بوو ، دەلێت : هیچ درەختێکیان لی قە دەغە نەکرا بوو ، تەنها ئەو درەختە نەبێ کە (خوای گەورە ) لێ قە دەغەی کردبوون ،هەر وەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٣٥﴾ [البَقَرَةِ : ٣٥] ..!! کە شەیتان پێش حەوا رۆیشت و ووتی : رێگری هیچ شتێکیان لێکردون ..؟! ووتی: بەلی. لەم درەختە قال تعالى: ﴿مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ٢٠﴾ [الأَعۡرَاف : ٢٠]..!! ووتی: بۆیە رێگەی خواردنی میوەی ئەم دارەیان لیگرتن لە ترسی ئەوەی نەبنە فریشتە ..!! حەوا سەرەتا خواردی و بە ئادەم ووت : تائەویش بخوات ..!! ئەو درەختە بوو هەر کەسێك لە میوەکەی دەخوارد ، با لە سکیدا لوولی دەخوارد و ئەمە لە بەهەشتا رەوا نەبوو . ئادەم لە بەهەشت دەرکرل ..).[3]

✍ لە رێ ( ابى معشر ) لە ( محمد بن قيس ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : (خوای گەورە ) قەدەغەی کرد لە ئادەم و حەوا ، لە میوەی یەك درەختە مە خۆن ، جگە لە میوەی درەختەکانی دیکە ، بەلام ئەوانەی تر هەرچەندتان دەوێت بە ئارەزووی خۆتان بەخۆشی بیخۆن و خۆشی و تام چێژی لێ وەر گرن ، شەیتان یان ئیبلیس هات چووە ناو سگی مار لە گەل حەوا قسەی کرد و ئادەمی فەریودا یان هەلخەلاند وسوەسەی دورست کرد بۆ ئادەم ..!! شەیتان بۆ ئادەم ووتی : قال تعالى: ﴿وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا

[1] -اخرجه عبدالرزاق (٢٢٦/٢) ، و ابن جرير (٥٦١/١).
[2] - اخرجه عبدالرزاق (٢٢٦/٢) ، و ابن جرير (٥٦١/١).
[3] -اخرجه ابن جرير (٥٦٤/١).

رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾﴾ [الأَعْرَاف : ٢٠ - ٢١]واتە : وە پێی وتن کە خوای گەورە قەدەغەی ئێوەی نەکردووە لەم دارە بخۆن تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە ئەگەر لەو دارە بخۆن ئێوە ئەبن بە دوو مەلائیکەت یان لە بەهەشتدا بەهەمیشەیی ئەمێننەوەو تیایدا نامرن.. شەیتان سوێندی بۆ خواردن کە من دڵسۆزو ئامۆژگاریکاری ئێوەم..؟! هەروەها حەوا لە میوەی درەختەکەی لێکردەوە و دارەی خوێناوی بوو ، پۆشاکەکەی ئجستەی ئەوان لە بەر بوویەوە و مەبەستی ئەوەیان کرد لە لق و گەلاکانی بەهەشت جل و بەرگ بۆ خۆیان ئامادە بکەن ..؟! قال تعالى: ﴿وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾﴾ [الأَعْرَاف : ٢٢]واتە: [ وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ ] وە بەگەڵای دارەکانی بەهەشت عەورەتی خۆیان داپۆشی، کە ئەووترێ: گەڵای دارهەنجیر بووە [ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَنْ تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ ] وە پەروەردگار بانگی لێ کردن ئەی ئادەم و حەوا ئایا من قەدەغەی ئێوەم نەکرد لەو دارە نەخۆن؟ خوای گەورە سەرزەنشت و لۆمەی کردن بۆ کەوتنە ناو فێڵی شەیتانەوە، (بانگ کردنی خوای گەورە مانای ئەوەی تێدایە کە خوای گەورە قسە دەکات و سیفەتی قسە کردنی هەیە) [ وَأَقُلْ لَكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُبِينٌ ] ئەی من پێم نەووتن: کە بە دڵنیایی شە یتان دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە..!! (خوای گەورە ) بە ئادەمی فەرموو: ئەی ئەم درەختەم لیّ قەدەغە نەکردن ..؟! ئادەم ووتی : ئەی پەروەردگار حەوا ئەم کارەی پیّ کردم یان حەوا دەرخوادری دام ..!! (خوای گەورە ) بە حەوای فەرموو : بۆ چی دەرخواردتدا یان بۆچی ئەم کارەت پیّ کرد ..؟! حەوا ووتی: مار فەرمانی ئەو کارەی پیّ کردم ..!! (خوای گەورە ) بە ماری فەرمووو: بۆچی فەرمانی ئەو کارەت پێدا ..؟! مار ووتی : ئیبلیس یان شەیتان فەرمانی پێدام ..!! (خوای گەورە) فەرمووی : ئیبلیس ملعون و نەخلەت نەفرەت کراوبیت ..!! تۆش ئەی حەوا کە درەختەکەت خوێناوی کرد ، هەموو مانگێك خوێناوی دەبیت ..!! تۆش ئەی مار ، دەست پیّ یان قاچت لیّ دەسێنمەوە و لەسەر سگی خۆت دەرۆیت یان دەخزیی یان دەخشی ، هەر کەسێك تۆ ببینی بە بەرد سەرت پان دەکاتەوە ، دەبەزنە خوارەوە هەندێکتان دوژمنی هەندێکتان بن ..!!).[1] (مەبەست لەم گێرانەوە ئەمە گێرانەوەیە تەنها بەلام لەسەرووی هەموو تەنها (خوای گەورە زاناترە ) ..؟!

✍ لە (الربيع بن أنس ) — ڕەحمەتی خوای لیّ بێت — دەڵێت : کاتێك شەیتان چووە ناو بەهەشت لە شێوەی ئاژەڵێکی چوار پیّ وەستاو بوو ، دەڵێت : وە کو ووشتر وابوو ..!! قاچ و پیّ و دەستە کانی لیّ بوونەوە هەلوەری ، بوو بەمار ..).[2]

✍ لە لەرێ (ابن إسحاق ) — ڕەحمەتی خوا لیّ بێت — لە (کۆمەڵێك یان دەستەیەك لە زانایان شەرعی ) دەڵێن: کاتێك ئادەم چووە ناو بەهەشتەوە نیعمەت خۆشی شادی بەهەشتی بینی ڕێزو شکۆیی بەهەشتی بینی کە (خوای گەورە ) پیّ بەخشی بوو ، ئادەم

[1] -اخرجه ابن جرير (٥٦٤/١).
[2] -اخرجه ابن جرير(٥٦٧/١).

ووتی : چ دەبوو بۆ هەمیشە زیندوو باین یان نەدەمردین بە نەمری بمانایە ..!! شەیتان یان ئیبلیس کاتێك ئەم قسەی ئادەمی بیست و هەر لەرێگەی ئەم قسەوە واتە : نەمریەوە ، شەیتان ئادەمی فریودا هەلی خەلەتاند و لە خشتەی برد ..!!).[١]

✍ لە ریٚ ( سلمه ) لە (محمد بن إسحاق ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – دەلیٚت : بیستم کە سەرەتای فریوەکەی شەیتان ئەوە بوو ، کە بەردەوام دەینالاند و کاتێك کە نالاندی ئەوە یان بیست ، خۆیان داشارد و ئادەم ووتی : هۆکاری نالاندنی تۆ چی یە ..؟! شەیتان ووتی: بۆ ئێوە دەگریم چونکە دەمرن و ئەم خۆشی و نیعمەتانە لێت جیادەبنەوە بەجێت دەهێلن . ئەم ووتەیە کاری گەری لە سەر دلی ئەوان دانا واتە : ئادەم حەوا دانا ، دواتر شەیتان هات و هانیدان و وەسوەسەی خستە نێو دلیان ..!! شەیتان ووتی : قال تعالى: ﴿فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ۝١٢٠﴾ [طه : ١٢٠]واتە : {ئیبلیس فێڵ لە ئادەم دەکات} [ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ ] شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست کرد بە دەنگێکی نهێنی [ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ ] وتی: ئەی ئادەم ئایا ڕێنماییت بکەم بۆ دارێك کە ئەگەر لێی بخۆیت بۆ هەمیشە زیندوو ئەبیت و مردنت بەسەردا نایەت [ وَمُلْكٍ لَا يَبْلَى ] وە موڵکێکیش کە هەرگیز لەناو ناچێت و کەم ناکات..؟! دە فە ر مووی : قال تعالى: ﴿وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنۡ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيۡنِ أَوۡ تَكُونَا مِنَ ٱلۡخَٰلِدِينَ ۝٢٠ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ۝٢١﴾ [الأَعۡرَاف : ٢٠ - ٢١]واتە : پێی وتن کە خوای گەورە قەدەغەی ئێوەی نەکردووە لەم دارە بخۆن تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە ئەگەر لەو دارە بخۆن ئێوە ئەبن بە دوو مەلائیکەت یان لە بەهەشتدا بەهەمیشەیی ئەمێننەوەو تیایدا نامرن.وە شەیتان سوێندی بۆ خواردن کە من دڵسۆزو ئامۆژگاریکاری ئێوەم..!! شەیتان هات ووتی : ئەی ئادە دەتەوێت درەختی نەمری و پاشایەتیت نیشان بدەم کە هیچ کات لە ناو ناچیت ..؟! خوا رێگەی خواردنی میوەی ئەم درەختەی لیٚ گرتن نەوەکا هیچ کات نەمرن ..!! یانی ئەگەر لە نیعمەتەکانی بەهەشت نەبنە فریشتە ، هیچ کات نامرن ، هەروەك(خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٖ﴾ [الأَعۡرَاف : ٢٢] واتە : (دَلَّاهُمَا) واتە: لە بانەوە کەسێك بۆ خوارەوە شۆڕ بکەیتەوە، واتە: لەو پلە بەرزەوە دای گرتنە خوارەوەو فێڵی لیٚ کردن..!! ) .[٢]

✍ لە ری (الربيع بن أنس ) لە (ابي العاليه )- رە حمە تی خوای لی بیت – لە سە ر ووتە ی قال تعالى: ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ﴾ دەلیٚت : واتە : ئادەم درکرا لە بەهەشت ..).[٣]

[١] -اخرجه ابن جرير (٥٦٤/١).
[٢] اخرجه ابن جرير (٥٦٥/١).
[٣] -اخرجه ابن جرير (٥٦٤/١).

✍ لە (مقاتل بن سليمان ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ﴾ واتە: ئادەم دەرکرا لە خێرو بێرەی بەهەشت دا ..).[١]

📖 لە (ابى بن كعب ) – خوا لی رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إنَّ اللهَ خلَق آدمَ رجلاً طُوالاً كثيرَ شعرِ الرأسِ كأنَّه نَخلةٌ سَحوقٌ ، فلمَّا ذاقَ الشَّجرةَ سقَط عنهُ لِباسُه فأوَّلُ ما بَدا عَورتُه ، فلمَّا نظَر إلى عَورتِه جعل يشتدُّ فى الجنَّةِ ، فأخذتْ شعْرَه شَجرةٌ فنازَعها ، فنادَى الرَّحمنُ : يا آدمُ منِّي تفِرُّ ؟ فلمَّا سمِع كلامَ الرَّحمنِ قال : يا ربِّ لا ولكن استِحياءً ، أرأيتَ إن تُبتُ ورجَعتُ أعائدِي إلى الجنَّةِ ؟ قال : نعَم ، فذلكَ قولُه فَتَلَقَّى آدَمُ مِنْ رَبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ)).[٢] واتە: (خوای گەورە ) ئادەمی دروست کرد پیاوێکی بالابەرز بوو ، پرچی یان قژی سەری زۆر بوو ، وەك دار خورماریەکی بەرز وابوو ، کاتێك کە تامی درەختەکەی کرد ، جل وبەرگە کەی لە بەر داکەنێرا ، بووەوە یەکەم شت کە لێیەوە دەرکەوت شەرمەکەی بوو یان (عەورەتی ) بوو یان حیاکەی بوو ، کاتێك کە شەرمەکەی یان حیایی یان (عورەتەکەی ) خۆی بینی ،بە پەلە لە ناو بەهەشت دەگەرا ، درەختێك لقی یان گەلای گرت و لیّ کردەوە ، (خوای رەحمان ) بانگی کرد ئەی ئادەم لە من رادەکەی ..؟! کاتێك ئادەم فەرموودەکەی (خوای گەورە)ی بیست ووتی : ئەی پەروەردگار نەخێر .!! لە تۆ راناکەم ، بەلام شەرم دەکەم ..!! ئەگەر پەشیمان بوومەوە گەرامەوە دەمگێریتەوە بۆ بەهەشت ..؟! (خوای گەورە ) فەرمووی : بەلیّ .

📖 لە (ابى هريره ) – خوا لیّ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((وَلَوْلاَ بَنُو إِسْرَائِيلَ، لَمْ يَخْبُثِ الطَّعَامُ، وَلَمْ يَخْنَزِ اللَّحْمُ، وَلَوْلاَ حَوَّاءُ لَمْ تَخُنْ أُنْثَى زَوْجَهَا الدَّهْرَ)).[٣] واتە : ئەگەر نەوەی جوولەکە نەبایە گۆشت بۆنێکی ناخۆشی لیّ دەهات یان نەدەکولا ..!! ئەگەر حەوا نەبوایە ، ئەوا هیچ مێینەیەك یان ژنێك خیانەتی لە هاوسەرەکەی نەدەکرد ..!!

✍ لەریّ (السدى) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لیّ رازی بێت - لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ﴾ دەلێت : واتە : (ئادەم ، حەواو ، ئیبلیس ، مار ) ..).[٤]

---

[١] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٩/١).
[٢] -تفسير ابن كثر القران العظيم (٣١٤/٥).
[٣] -صحيح مسلم برقم (١٤٧٠).
[٤] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٩/١) (٣٩٨).

✍ لەرێ (الربیع بن أنس ) لە (أبی العالیە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ﴾ دەڵێت : واتە : (ئیبلیس و ئادەم ) دەبنە دوژمنی یەك ..!! )[1]

✍ لە رێ (عیسی بن میمون وشبل ) لە (ابن ابی نجیح ) لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ﴾ دەڵێت : واتە : (ئادەم ، ئیبلیس ، مار ، لە گەل نەوە كانی ئادەم ) دەبنە دوژمنی یەكتری..!!).[2]

📖 لە (علي بن ابي طالب ) – خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إنَّ اللَّهَ أهبطَ آدمَ بالهندِ وحوَّاءَ بجُدَّةَ وإبليسَ ببيسانَ والحيَّةَ بأصبَهانَ)).[3] واتە: (خوای گەورە ) ئادەمی لە خای هند دابەزاند ، وە حەوای لە جەدە دابەزاند ن وە ئیبلیسی لە میسان دابەزاند ، وە ماری لە ئەصبهان دابەزاند ..!!

✍ لە رێ (قسامە بن زهیر ) لە ( ابی موسی الاشعری ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : كاتێك (خوای گەورە ) ئادەمی دابەزاند سەر زەوەی وە لە بەهەشت دەری كرد ، پیشە كانی فێركردو لە میوەكانی بەهەشتی پێ بەخشی ، ئەم مێوانەی ئێوە لە میوەكانی یان بەروبوومەكانی بەهەشت جیاوازە ، چونكە میوەكانی ئەم دونیایە گۆرانیان بەسەردا دێت ..!! بەلام میوەكانی بەهەشت نا ..!!).[4]

✍ لە رێ (الزبیر بن عدی ) لە (عبداللە بن عمر ) –خوای لێ رازی بێت – دەڵێت : ئادەم دابەزی لە ( صفاء )، حەواش دابەزی لە (المروء ) ..).[5]

✍ لە رێ (سعید بن جبیر ) لە (عبداللە بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : یەكەم جار كە (خوای گەورە ) ئادەمی دەركرد و دابەزاندو هێنایە خاوەرە بۆ زەوی هند ..).[6]

---

[1] -اخرجه ابن جرير (٥٧٣/١).
[2] -اخرجه ابن جرير (٥٧٣/١).
[3] - أورده الديلمي في الفردوس (١٥١/٣) رقم (٤٤٠٩).
[4] اخرجه عبدالرزاق (٤٤/١).
[5] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٨/١).
[6] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٨/١).

✍ لە ڕێ (سعید بن جبیر ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەلێت: دابەزاندی ئادەم بۆ سەر زەوی شوێنێك بوو پێ دەلێن : (دحنا) لە نێوان مككە و طائیف بووە ..!!).[١]

✍ ڕێ (عباد بن مسیره ) لە (الحسن البصری ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : ئادەم لە هند دابەزی ،حەوا لە جدە ، ئیبلیس لە زەویە كژوگیایەكان واتە : زەوی قاروشەكانی میسان لە بصرە لە ناچە فراوانەكان ، وە ماریش لە ئەصبهان ..!!).[٢]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : ئادەم دابەزی لە  هند ، حەوا لە جدە ، ئیبلیس لە شوێنێك دابەزی پێ دەلێن :( الأبلة) كە لە نزیك شاری بصرە ، یان وەكو شاری بصرە ، وە ئادەمیش دابەزی لە دۆلێك ناوی (نوذ) بوو ، خلكی پێ دەلێن : (سرندیب ) ئەویش جزیرەیەك بووە  لە باشووری هند ، واتە : ( ئێستا وەلاتی  سریلانكای پێ دەوترێت كە چیای بەرزی تێدایە بە ناوبانگە بە گەوهەر یاقوت )هەروەها بەیەك گەشتنی ئادەم حەوا یان كۆبوونەوەیان لە یەك شوێندا لە (مزدلفە ) نزیك لە شاری مككە یە لە وەلاتی سعودیا ، لەوێد ئادەم حەوا كۆبوونەوە یان بەیەك گەیشتن ، وە ئیبلیس پێش ئادەم دابەزێنرا بۆ خوارەوە ..).[٣]

✍ لە (عبدالله بن مسعود ) – خوا لێ ڕازی بێت –  لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ﴾ دەلێت: واتە : گۆڕەكان یان (القبور ) ..!!).[٤]

✍ لەرێ (السدی) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ﴾ دەلێت : واتە : مستقر یان جێگیر : سەرووی زەوی یان ژێر زەوی ..).[٥]

✍ لەرێ (الربیع بن أنس ) لە (ابی العالیە ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت -  لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ﴾ دەلێت : ئەمە ئەو ووتەیە كە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢]واتە: ئەو خوایەی كە ئەو زەویەی بۆ ئێوە كردووە بە ڕاخەرو لەسەری جێگیر بوونە..!! ).[٦]

---

[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٩/١).
[٢] اخرجه ابن ابي حاتم (٨٩/١).
[٣] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٩/١).
[٤] -اخرجه ابن ابي حاتم (٨٩/١) (٤٠١).
[٥] - اخرجه ابن جرير (٥٧٦/١).
[٦] - اخرجه ابن ابي حاتم (٩٠/١).

✍لە ریّ (ابی جعفر ) لە (الربیع بن انس ) – رحمەتی خوای لیّ بیّت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ﴾ دەڵیّت : ئەمە ئەم ووتەی کە (خوای گەورە ) دەفەرموویّت : قال تعالی: ﴿جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا﴾ [غَافِر : ٦٤]واتە: خوای گەورە ئەو خوایەیە کە زەوی بۆ ئێوە جێگیر کردووەو راخستووە کە لەسەری جێگیرو نیشتەجێن..!! ).[1]

✍ لە (عبدالله بن مسعود )- خوا لیّ رازی بیّت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ٣٦﴾ دەڵیّت : واتە : بۆ رۆژی قیامەت ..).[2]

✍ لە ریّ (السدی ) لە (کریب ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوای لیّ رازی بیّت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ٣٦﴾ دەڵیّت : هەتاکو دەچیّت بۆ بە هەشت یان هەتاکو دەچیّت بۆ دۆزەخ ..).[3]

✍ لە ریّ (السدی ) لە (عکرمە ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوای لیّ رازی بیّت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ٣٦﴾ دەڵیّت : واتە : (ژیان ) ..).[4]

✍ لەریّ (ابن ابی نجیح ) لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لیّ بیّت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ٣٦﴾ دەڵیّت : هەتا رۆژی قیامەت تاکو پچراندنی ژیانی دونیا ..).[5]

✍ لەریّ (أسباط ) لە (إسماعیل السدي ) – رەحمەتی خوای لیّ بیّت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ٣٦﴾ دەڵیّت : بەبانێکە بۆ مردن یان بلاغیّکە بۆ مردن ..).[6]

✍ لە ریّ (ابی جعفر ) لە (الربیع بن أنس ) – رەحمەتی خوای لیّ بیّت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ٣٦﴾ دەڵیّت : واتە : بۆ سەر ئەنجامە یان بۆ چارەنووسە ..).[7]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لیّ بیّت – لەسەر ووتەی قال تعالی: ﴿وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ٣٦﴾ دەڵیّت : واتە بلاغیّکە یان هەوالیّکە بۆ کۆتایی هاتنی چارەنووسی مردن ..!! ).[8]

---
[1] -اخرجه ابن جریر (٥٧٥/١).
[2] -عزاه السیوطي الى ابي شيخ تفسير مأثور (٢٨٣/١).
[3] اخرجه اب ابي حاتم (٩٠/١).
[4] اخرجه اب ابي حاتم (٩٠/١).
[5] -اخرجه ابن جرير (٥٧٨/١).
[6] -اخرجه ابن جرير (٥٧٧/١).
[7] -اخرجه ابن جرير (٥٧٨/١).
[8] -تفسير مقاتل بن سليمان (٩٩/١).

قال تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٣٧]

قال تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ واته: ئینجا ئادەم جەند ووتەیەکی (پارانەوەی ) لە پەروەردگارییەوە وەرگرت..!!

قال تعالى: ﴿فَتَابَ عَلَيْهِ﴾واته: (خوای گەورە ) لێ قبول کرد یان گیرا کرد..!!قال تعالى: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾﴾

واتە : بەراستی هەر ئەو زاتە تۆ بە وەرگرو گیراکەری میهربانە یان تۆبە قبول کەری (الرحيم ) یان میهربانە ..!!

قال تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٧] واتە: ئادەم چەند ووشەیەك.کە خوا بە ئیلهام خستبویە دڵیەوە بۆ تەوبەکردن وداوای لێخۆشبون.وەردەگرێت و پێی قەبوڵ دەبێت.کە ئەوانیش بریتی بوون لە م ئایە تە کە (خوای کە ورە ) دفە رموویت: قال تعالى: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾ [الأَعْرَاف : ٢٣]واتە: {ئادەمو حەوا تەوبە دەکەنو بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە} [ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا ] هەردووکیان یەکسەر تەوبەیان کرد وەکو ئیبلیس نەبوون کە تاوانی کردو تەوبەی نەکرد، بەڵکو ئەمان یەکسەر دانیان بە تاوانی خۆیاندا نا ئەی پەروەردگار زوڵممان لە نەفسی خۆمان کردو تاوانمان کرد، (پێویستە هەر کەسێك تاوانی کرد وەکو ئادەم و حەوا خێرا تەوبە بکات و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوە تا خوای گەورە لێی خۆش بێت) [ وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ] وە ئەگەر تۆ لێمان خۆش نەبی وە ڕەحممان پێ نەکەی ئەوا ئێمە لە زەرەرمەندان ئەبین لە دونیاو قیامەتدا، خوای گەورە لێیان خۆشبوو..؟!!

قال تعالى: ﴿فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٣٧]واتە :کاتیك ئادە م وای ووت: خوای گەورەش تەوبەی لێ قبووڵ کرد، بە دڵنیایی هەر خوای گەورەیە زۆر تەوبەی بەندەکان قبووڵ ئەکات وە زۆر بە ڕەحم و بەزەییە..؟! بەڵێ ئادەم جەند ووشەیەکی لە پەروەردگاری خۆی وەرگرتن و ئەویش تۆبەی لێوەرگرت و قبول کرد،بێ گومان ئەو زۆر تۆبە وەرگری (الرحيم ) یان میهرەبانە ..!! مەبەست لە (کلمات ) چەند ووشەیەکە کە بەکاریان بێهێنی تاکو بگەرێتەوە و بە شیمان ببێتەوە بۆ لای (خوای گەورە ) ، جا تەماشابکەن ..!! (خوای گەورە ) چەندە میهرەبان و بەرەحم بەزەییە لە گەڵ بەندەکانی خۆیدا ، لە کاتێك دا قەدەغەی کردبوو کە لەم درەختە نەخوات لێ دوور بکەوێتەوە ..؟! بەلام کەچی ئادەم حەوا فەرمانەکەی پەروەردگاری خۆیان شکاند و لە درەختە کەیان خوارد ، کەچی هەستان بە قسەی دوژمنی (خوای گەورە ) یان کرد ..!! ئەویش ئیبلیسی نەفەرتی بوو یان نەعلەتی کراو بوو ،بەلام لە گەر ئەوەشدا (خوای گەورە ) لە گەلیان میهرەبان بوو ، ئەو بوو چەند ووشەیەکی فێرکرد کە چۆن خۆیان لە تاوان گوناه رزگاربکەن ..؟! وە چۆن بگەرێنەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆیان ، بۆ ئەوەی کە لێ یان خۆشێ عفویان بکەت پارانەوە کانیا گیرا بکات یان قبول بکات ..؟! هەربۆیە (خوای گەورە ) میهرەبانی خۆی پێشان دەدات بۆ بەندەکانی تاکو بگەرێنەوە و تۆبە بکەن ئەویش لە گوناهو تاوانەکانی بەندە کانی خۆش بێ بە میهرەبانی یان بە (الرحيم ) خۆیی بەزەیی و رەحمی بە بەندەکانی دادێت.!

قال تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ٣٧﴾ [البَقَرَة : ٣٧] واتە: ئینجا لە لایەن (خوای گەورە) وە چەند ووشەیەکی پێگەیشت و تێیگەیاند کە بەو چەند ووشانە بپارێتەو، بەراستی ئەو زاتە هەر خۆیەتی زۆر تۆبە وەرگرو زۆریش بە رەحم میهرەبانە ..!! جا ئادەمیش جارێکی تر هاتەوە سەر راستە رێگاو بە دلێکی پاکەوە رێنماییەکان رێ نیشاندەرکانی پەروەردگاری خۆی ئەنجامداو ، تۆبەی کرد جا (خوای گەورە)ش تۆبەکەی لێ گیرا کرد یان لێی قبول کرد ، هەروەها ئادەمیشی کرد بە پێغەمبەریش ..!!

لە (ابی ذر الغفاری ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێ : ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ((أيُّ الأنبياءِ كان أولُ ؟ ! قال : آدمُ، قلتُ : يا رسولَ اللهِ ! ونبيٌّ كان ؟ ! قال : نعم نبيٌّ مُكلَّمٌ، قلتُ : يا رسولَ اللهِ : كم المرسلونَ ؟ ! قال : ثلاثُ مئةٍ وبضعةَ عشرَ ؛ جمًّا غفيرًا )).[1] واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئایا کامە پێغەمبەر یەکەم بووە ..؟! فەرمووی (ئادەم ) . دەلێ ووتم : ئایا پێغەمبەر بووە ..؟! فەرمووی : بەلێ . پێغەمبەرێکی قسە کەر بوو ، دەلێ ووتم : ئایا چەندیان پەیامبەر بوونەیان نێردراو بوونە ، ئەی پێغەمبەری خوا ..؟! فەرمووی : (سێ سەدو پانزە) ، زۆرێکە یان خەلکانێکی زۆر ..!!

بەلێ ئەم بە سەرهاتە وای کرد کە ئادەم (علیه السلام ) بزانێت دوژمنی راستە قینەی خۆی هەیە ، ئەویش ئیبلیسە یان شەیتانە ، کە هەموو فریودان فەرت و فێلێکی لە بەن سەردایە بۆ ئادەم نەوەکان بۆیە دوژمنی سەرەکی ئادەم لە دونیا ئیبلیسی نەفەرەتی لێ کراوە کە نەفەرتی لێکراوە لە لایەن (خوای گەورە ) تاکو رۆژی دوایی حیسابی لە گەل دەکرێت ..؟! چونکە ئیبلیس زۆر فەرت وفێل دەکات لە گەل نەوەکانی ئادەم ، هەمیشە لە سەر رێگای راست لایاندەدات دەیان خەلیسکێنی بەرەو هەلدێریان دەبات ، هەمووکات درۆ بەکاردەهێنی بۆ ئەوەی نەوەکانی ئادەم لە خشتە ببات ..؟! ﴿ٱلتَّوَّابُ﴾ واتە : ناوێکە ،بەمانای : تۆبە وەرگرە، چونکە ئەو زاتە کە بەندەکانی هەر چەندە تاوان گوناه بکەن ، بەلام بۆ یەکجار بە دلسۆزی ئیخلاصەوە ، بگەرێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان تۆبە یان لێ گیرا دەکات یان قبول دەکات ، ئەم ناوەی پەروەردگار ﴿ٱلتَّوَّابُ﴾ بەهەموو شێوەکانیەوە دووانزە جار هاتووە لە قورئاندا ،هەروەها ئەم ناوەش واتە :﴿ٱلرَّحِيمُ﴾ سەدو پانزە جار هاتووە بە شێوەکانیەوە ،وە دوانزەجار هاتووە لە سورەتی القبرە دا..!! ﴿ٱلرَّحِيمُ ٣٧﴾ واتە: زۆر بەرەحم میهرەبانە ئەوزاتە سۆزو بەزەیی دەنوێنی بۆ بەندەکانی خۆی ، بەتایبەتی بۆ ئیمانداران ..؟!

[1] -اخرجه الامام احمد (٤٣١/٣٥-٤٣٢).

مانای دوو ووشەی ئایەتی ئەم ئایەتە :

قال تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٧] واتە : پێی گەیشت یان (تلقاە ) واتە: (لقیە ) واتە : وەریگرت یان پێی گەیشت .

قال تعالى: ﴿ٱلتَّوَّابُ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٧] واتە : ( التوب : ترك الذنب على اجمل الوجود ) واتە : وازهێنان لە گوناهو تاوان بە شێوەیەکی هەرە جوان ، (تواب ) صیغە مبالغەیە ، جا دەکرێت بەندەش (تواب) بێت ، زۆر بگەرێتەوە بۆ لای (خوای گەورە) چونکە هەتاکو زیاتر بەندە بگەرێتەوە بۆ لای (خوای گەورە) بە گوێرایەلی کردن و ، وازهێنان لە گوناهو تاوان ، (خوای گەورە ) رەش زیاتر (تواب) دەبێت ، بولای بەندەکە ی ، واتە : زیاتر تۆبە وەرگر دەبێت ، ئەو بەندەیەی کە مەبەست و نیازی تۆبەی تەواوی هەیە ، هەر بۆیە (خوای گەورە ) (تواب) بۆ بەندەکانی واتە : وەرگری تۆبەیە ..؟! هەر بۆیە تۆبە ناوە بۆ زاتی (خوای گەورە ) یاخود صیغە مبالغەیە ، هەروەك دەفەرموویێت :: ﴿هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ واتە: بە دڵنیایی هەر خوای گەورەیە زۆر تەوبەی بەندەکان قبووڵ ئەکات وە زۆر بە ڕەحم و بەزەییە..؟! نیعمەتی (خوای گەورە ) بەسەر ئادەم بۆ قبول کردنی تۆبەی ئادەم دوای ئەوە توفیقی ئادەم درا بۆ تۆبە ،لە بەر ئەم ووتەیە: ﴿فَتَابَ عَلَيۡهِۚ﴾ ،چونکە جێگیر کردنی ناوی (التواب ) بۆ (خوای گەورە) وە سیفەتی توفیقی بۆ بەندەکانی دان بۆ تۆبە کردن و قبول کردنی تۆبە یان ، لەبەر ووتەی قال تعالى: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ﴾ ..!!

قال تعالى: ﴿ٱلرَّحِيمُ ٣٧﴾ [البَقَرَةِ : ٣٧] واتە: رەحم و بەزەیی و میهرەبانی بۆ بەندەکانی ..!! چونکە جێگیر کردنی ناوی ﴿ٱلرَّحِيمُ﴾ بۆ (خوای گەورە ) هەروەها سیفەتی رەحمەت بۆ زاتی (خوای گەورە ) ..!!

زانایانی تەفسیر سەبارەت بە تاوانی ئادەم و ئیبلیس جیاوازە دەلێن :

١-ئیبلیس فەرمانێکی واز لێ هێنا ، واتە : فەرمانی (خوای گەورە)ی جێ بەجێ نەکرد..؟!

٢-بەلام ئادەم قەدەغەکراوێکی ئەنجام دا تووشی سەرپێچی کردن بوو ..؟!

٣-تاوانی ئیبلیس لە خۆبایی بوو ، وە خۆی بەگەررەدانا ..؟!

٤-بەلام ئادەم تەنها شەهوەت ئارەزوو متاح بوو ..؟!

٥-ئیبلیس پەشیمان نەبوویەوە (تۆبەی ) نەکرد بۆ پەشیمان بوونەوەی خۆی بەگەروە دانا غروری گرتی لەخۆبایی بوو، بەلێنی دا ئەگەر بهێنێتەوە بەندەکانی خوا گومراو سەرگەردن بکات ، هەروەها ئیبلیس دەرگای (تۆبەی ) کراوە بوو ، بەلام لە سەر خۆ دەرگای (تۆبەی ) داخست چونکە غروری گرتی خۆی بەگەورە دانا ..؟!

٦-ئادەم دەرگای (تۆبەی ) لەسەر خۆ دانەخست ، یەکسەر پەشیمان بوویەوە تۆبە کەی گیرا بوو یان قبول کرا ..؟!

گومانێك و وەلام دانەوەی ئەم گومانەە لە لای زۆربە خەلك كە بەهەلە لەم بابەتە تێگەیشتوون ..؟!

وەكو لە پێش دا باسمان كرد ووتمان لەوانەیە ئەم بەهەشتەی (خوای گەورە ) بۆ ئادەمی ئامادە كرد بوو كە لە سەرتای دورست بوونی دا خستیە نێو ئەم بەهەشتەوە ، هەروەك دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿وَقُلۡنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٥]واتە : ئەی ئادەم خۆت و حەوای خێزانت نیشتەجێ بن لە بەهەشتدا..؟! ووتمان وای بۆ دەچین بە پێ زانایانی تەفسیر كە ئەم بەهەشتە لە شوێنێكی بەرزدا بووە لەسەر زەوی ، وەكو ئەوەی كە (خوای گەورە) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿إِنَّا بَلَوۡنَـٰهُمۡ كَمَا بَلَوۡنَآ أَصۡحَـٰبَ ٱلۡجَنَّةِ﴾ [القَلَم : ١٧]واتە : بەسەرهاتی هاوەلانی باخەكە} [ إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ كَمَا بَلَوْنَا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ ] ئێمە كافرانی مەككەمان تاقیكردەوە بە برسێتی و نەبوونی كە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - دوعای لێ كردن، هەروەكو چۆن هاوەڵانی باخەكەمان تاقیكردەوە، هاوەڵانی باخەكە سێ برا بوونە لە دێیەك بوونە ناوی (ضهروان) بووە دوو (فەرسەخ) واتە: شەش میل لە (صەنعا)ی پایتەختی (یەمەن)هوە دوور بووە، یاخود وتراوە: لە (حەبەشە) بووە، ئەمانە باوكێكی چاكیان هەبووە كە باخ و بێستانی هەبووە كە جۆرەها میوەو بەروبوومی هەبووەو ساڵانە كردوویەتی بە سێ بەشەوە: بەشێكی لە ڕێی خوا كردووە بە خێرو زەكاتی لێداوە، بەشێكیشی بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی داناوە، بەشێكیشی بۆ بنەتۆو و مەسرەفەكەی بۆ ساڵی داهاتوو هەڵگرتووە ..؟! كەواتە: ئەگەر ئەم بەهەشتە لە سەر زەوی بوو بێت ، ئەوا شەیتان لە سەر زەوی وەسوەسەی بۆ ئادەم دروست كردو ئەم تاوانەی پێ ئەنجامدا ، بە لام هەندێكی تر لە زانایان دەلێن : ئەگەر ئەم بەهەشتەی ئادەمی لێ دەركرا لە ئاسمان بووە كەواتە : ئیبلیس چۆن توانی بچێتە نێو ئەم بەهەشتەوە ..؟! كە خۆی لە خۆیدا ئیبلیس لە بەهەشت دا دەركرا بەدەركردنێكی قەدەری وچارەنووس سازی خۆی سەر ئەنجامەكەی بۆ خۆی دیار كرد ..؟! وەلامەكەی ئەمەیە بۆی دەچێت كە ئەم بەهەشتە ی ئادەمی تێدا بووە لە زەوی دا بووە لە شوێنێكری بەرز دا ، (خوای گەورە زاناترە ) ، بەلام هەندێكی تریش لە زانایان دەلێن : ئەم دەقەیان لە تەوراتی جوولە كە وەرگرتووە ئیبلیس لە ڕێگای مارە وە چوۆتە نێو بەهەشتەوە ، بەلام هەندێكی تریش لە زانایان دەلێن : هەلدەگرێ وەسوەسە دورست كردنی ئیبلیس بۆ ئادەم هە لە سەر رووی زەویە وە بێت ئەوانیش واتە : ئادەم حەوا لە ئاسمان بووبن ، بەلام ئەم ووتەیە لاوازترە لەوانی تر ئەم قسەیە هی (زەمەخشەری ) و كەسانی تریش ..؟! بەلام من وای بۆ دەچم كە ئەم بەهەشتەی ئادەم و حەوا تێدا بوونە هە لە سەر زەوی بووە لە شوێنێكی زۆر بەزر ، هەر بویە لە پێشدا باسمان كرد كە ئەوەی بچێتە نێ بەهەشت ناچێتە دەروە هەرگیز بە پێ بەلگەی قورئانی پیرۆز ، هەروەك دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَأَخۡبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ أُوْلَـٰٓئِكَ أَصۡحَـٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ٢٣﴾ [هُود : ٢٣]واتە : بەڕاستی ئەوانەی كە خوای پەروەردگار و پەیامبەرەكەیان بەڕاست زانیوە، و كردەوەی چاكیان ئەنجام دەدەن، و ملكەچی خوای پەروەردگار بوون لە سەرجەم ئەوانەی كە فەرمانیان پێكراوە و ئەوانەی كە یاساغیان لێكراوە، ئەوانە بەهەشتیانن و تێیدا نامرن و هەرگیز لێی دەرناچن و بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ..؟!

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴿٤٨﴾﴾ [الحِجْر : ٤٨]واته : وه ئەوەی بچێته بەهەشتەوه جارێکی تر له بەهەشت دەرناکرێن..؟!بەلێ ئەمانه بەلگەن که ئەو کەسەی که دەچێته بەهەشتەوه بۆ هەمیشەیی و هەتاهەتایی تێدا دەمێنێتەوه ، دەرناچێت لەبەهەشتدا ، وەکو ووتمان له پێشدا باسمان کرد له لاپەرەی ٤٠٣بۆ ٤٠٨ بەدرێژی باسمان کردووه ، گومانی چوونه نێو بەهەشتی شەیتان که وەسوەسەی بۆ ئادەم وحەواو دروست کرد هەر بەم هۆکارەش بوو ئەوان لەبەهەشتدا دەرکران ، بەلام ئادەم پەشیمان بوویەوه تۆبەی کردو تۆبەکەشی گیرا بوو یان قبول کرا له لایەن (خوای گەورە ) وه ..؟!

بەلێ که (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَـٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٣٧]واته : ئادەم له لایەن پەروەدگاریەوه چەند ووشەیەکی پێ گەیشت ، ئەوسا تۆبەکەی قبول کرد ، بەلکو (خوای گەورە ) هەر خۆی له پەشیمان بوونەوان به تاوان دەبوورێ ، چونکه دلۆڤان و بەرەحم و میهرەبانه ..؟!هەروەك دەفەرموویت:

قال تعالى: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾ [الأَعْرَاف : ٢٣]واته : {ئادەمو حەوا تەوبه دەکەنو بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە} [ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا ] هەردووکیان یەکسەر تەوبەیان کرد وەکو ئیبلیس نەبوون که تاوانی کردو تەوبەی نەکرد، بەڵکو ئەمان یەکسەر دانیان به تاوانی خۆیاندا نا ئەی پەروەردگار زوڵممان له نەفسی خۆمان کردو تاوانمان کرد، (پێویسته هەر کەسێك تاوانی کرد وەکو ئادەم و حەوا خێرا تەوبه بکات و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوە تا خوای گەورە لێی خۆش بێت) [ وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ] وە ئەگەر تۆ لێمان خۆش نەبی وە ڕەحممان پێ نەکەی ئەوا ئێمه له زەرەرمەندان ئەبین له دونیاو قیامەتدا، خوای گەورە لێیان خۆشبوو..!!

بەلێ خوێنەری بەرێز ئێمه دەبێت جیاوازی بکەین له نێوان تاوانی ئادەم ئیبلیس دا، چونکه جیاوازیەکە زۆر گەورەیە ..؟!

وەك باسمان کرد تاوانی سیبیس زۆر گەورە ترە له تاوانی ئادەم ، چونکه ئیبلیس فەرمانێکی جێ بەجێ نەرکرد و پەشیمان نەبوویەوە تۆبه شی له سەر نەکرد بەلکو زیاتر له خۆبایی بوو خۆی بەگەرە دانا ..؟! بەلێ ئیبلیس گوێرایەلی فەرمانی (خوای گەورە ) نەبوو ، کەچی تکبر یان خۆی بەگەورە دانا غرور لەخۆبایی گرتی ..؟! ئەمەش سەرپێچی یەکی یەکجار گەورەیە ، چونکه توندترین گوناهو سزایی لەسەرە ..!! هەرکاتێك مرۆڤ تووشی سەرپێچیەکی ئەوا گەورە بێت دەبێت دەست بەجێ پەشیمان بێتەوە دوای تۆبه بکات ، چونکه تاوانەکەی وەکو ئیبلیس هەژماردەکرێت ، بەندەیەکی (خوای گەورە) فەرمانێکی خوا ئەنجام نەدات و ، خۆی بەگەورە بزانێت و غروری و لەخۆبایی بی گرێت ، ئەوا دەبێت دەست بەجێ زۆر به پەلە تۆبە بکات و پەشیمان بێتەوە ، دوای لێ خۆشبوون له (خوای گەورە ) بکات ..؟!!

بەلێ زۆربەی زانایان دەڵێن : پێغەمبەران هەر هەموویان بێ تاوانن یان بێ هەڵەن تاوان و گوناه ناکەن ، بەلام گوناهوتاوان وسەرپێچی ئادەم (علیه السلام ) بەمانای دقیقی یان توندەکەی سەرپێچی نیە ، چونکە (خوای گەورە ) ویستی وانەیەك فێری ئادەم بکات ، بۆ ئەوەی ئەم تاقی کردنەوەی وانەی لێ وە وەرگرێت بۆ خۆی و نەوەکانی کە لە دوای خۆیدا پەیدا دەبن ، لەلایەکی تریشەوە قەدەغەکراوێك بوو ، نەوەك فەرمانێك بێت و ئادەم بەرهەڵستی لێ بکات فەرمانەکە جێ بەجی نەکات..؟! هەروەك (خوی گەورە) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾﴾ [طه : ١٢٠]واتە: {ئیبلیس فێڵ لە ئادەم دەکات} [ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ ] شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست کرد بە دەنگێکی نهێنی [ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ ] وتی: ئەی ئادەم ئایا ڕێنماییت بکەم بۆ دارێك کە ئەگەر لێی بخۆیت بۆ هەمیشە زیندوو ئەبیت و مردنت بەسەردا نایەت [ وَمُلْكٍ لَا يَبْلَى ] وە موڵکێکیش کە هەرگیز لەناو ناچێت و کەم ناکات..؟! بەلێ ئادەم ویستی بۆ ئەبد و هەتاهەتایی لە نێو بەهەشت دا بمێنیتەوە ..؟! بەلام ئادەم (علیه السلام ) درۆی نەدەزانی چونکە یەکەم مرۆڤ بووە ، کە (خوای گەورە ) دروستی کرد ..؟! ئەوە بوو کە ئیبلیس یان شەیتان درۆی لە گەل کردو هەلیخسکاند و فریویدا ، وەسوەسەی بۆ دروست کرد ..؟! چونکە ئادەم هەرچی ویستووە هەر هەمووی ڕاستبووە ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾﴾ [طه : ١١٥]واتە : {ئامۆژگاری خوای گەورە بۆ ئادەم} [ وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِنْ قَبْلُ فَنَسِيَ ] وە بە دڵنیایی ئامۆژگاری و وەسیەتمان بۆ ئادەم کردبوو لە پێشتردا کە لەو دارە نەخوات، بەڵام ئەو لەبیری کردو شەیتان خەڵەتاندی (بۆیە بە مرۆڤ وتراوە انسان چونکە لە بیری کرد) [ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا (١١٥) ] وە نەمان بینی کە عەزیمەتی هەبێ لەسەر ئەو شتە [ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ ] وە ئێمە بە فریشتەکانمان وت: کڕنوشی ڕێزو ئیحتیرام بۆ ئادەم بەرن...؟! کەواتە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئادەم (علیه السلام ) هەلەیەکی کرد قەدەغەکراوەکەی (خوای گەورە ) ی لە بیرکرد ، بە بیری نەهات کە (خوای گەورە ) پێ فەرموو : قال تعالی: ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٥] واتە : لە دەرختە نزیك نەبنەوە ..!! بەلام ئادەم لە بیری چوو بە وەسوەسەیو فریودانی شەیتان لە دەرختەکەی خوارد ..؟!!

بەلێ پێغەمبەران بێ هەل و سەرپێچین ، چونکە ئەگەر لە بەهەشتدا ئادەم هەلەیەکی کرد خۆ لە بەهشت تکلیف ناکرێ ، چونکە ئەوە بەهەشتە ، تەنها فەرمانی ڕێ نیشاندان دەدرێن ، قەدەغەی ڕێ نیشاندان دەدرێن ..؟!

📖 لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((رُفِعَ عن أمّتِي الخطأ والنسيانَ وما استكرهوا عليهِ)). [١] واتە: هەلەو لە بیر چوونەوەم لە سەر ئۆمەتەکەم دوور خستەوە یان هەلگرتووە ،ئەوەی کە ناچار بوون ئەو کراە بکەن ، یان ئەوانەی کە رقیان لەسەرە ..!!

---

[١] - الامام التلخيص الحبير (٤٦٤/٤).

بەڵێ گەورەترینی ئەو کێشانە ی هەن لە سەر رووی زەوی هەر هەموو شەیتانە دوژمنی مرۆڤەکان بەردەوام لە هەولدایە سەربازی خۆی زیاد بکات وەکو ئەو نەفرەت لێ کراو بن ، ناکۆکی و دوو بەرەکی درووست دەکات لە ناو مرۆڤە کان دا هەروەها شتە حرام کراوەکان دەرازێنەوە ، هەروەها فەرمانی عیبادەت پەرستن نی (خوای گەورە ) لەلای خەلکی قورس و گران دەکات بۆئەوەی جێ بەجێ نەکەن وەکو خۆی ، بۆیە هەیشە دەیەویت هاوشانی خۆی پەیدا بکات لە شەرو خراپەکاری زوڵم و ستەم کردن لە سەر رووی زەوی ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ٦﴾ [فَاطِر : ٦]واتە : بەڕاستی شەیتان دوژمنی نەوەکانی ئادەمە، دەسا ئێوەش بیکەن بەدوژمنی خۆتان وگوێڕایەڵی مەکەن، ئەو تەنها شوێنکەوتوەکانی بانگ دەکات بۆ گومڕایی، بۆ ئەوەی ببن بە نیشتەجێی دۆزەخ کە ئاگرەکەی ئاگرێکی بڵێسەدارە ..؟! هە روە ها قال تعالی: ﴿ أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٦٠﴾ [يس : ٦٠]واتە : ئەی ئادەمیزاد ئایا عەهدو بەڵێنم لێ وەرنەگرتن کە ئێوە عیبادەتی شەیتان نەکەن [ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ ] لەبەر ئەوەی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە..؟!! هە روە ها دە فە رموویت : قال تعالی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٢٠٨﴾ [البَقَرَةِ : ٢٠٨] واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بەوەی کە ( الله ) پەروەردگارتانە و موحەممەدیش پەیامبەرتانە صلى الله عليه وسلم و ئیسلامیش ئاینتانە، سەرجەم شەریعەتەکانی ئیسلام وەربگرن، وبەسەرجەم ئەحکامەکانی کاربکەن، و واز لەهیچی مەهێنن، وشوێنی ڕێگەکانی شەیتان مەکەون کە بانگتان دەکات بۆی لەتاوانکردن . چونکە بێگومان ئەو دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە بۆیە لێی بەئاگابن ..!!

بێ گومان تاوان کردن چەند جۆرێکە :

أ- ئەو تاوانە یان سەرپێچیەی کە لە نێوان خۆت و (خوای گەورە ) دایە ئەنجامی دەدەیت ئەویش دوو جۆرە:

١- ئەو تاوانەی کە گەورەن ئەگەر تۆبە نەکەیت و پەشیمان نەبیتەوە ، ئەو (خوای گەورە ) هەر گیز لێت خۆش نابیت ..؟!

٢- تاوانە بچووکە کان ئەویش بێ گومان بە تۆبە کردن پەشیمان بوونەوە و کاری چاکە (خوای گەورە ) لێت خۆش دەبێت ..؟!

ب- ئەو تاوانە ی کە بەندەکان لە نێوان خۆیان ئەنجامی دەدەن ، ئەویش دەبێت بە لیچ خۆش بوونی یەکتر بێت گەردەن ئازایی یەکترە بکەن ئینجا (خوای گەورە ) بە گەورەیی خۆیی لێیان خۆش دەبێت ، چونکە بە رەحم و بەزەیی و میهرەبان و دلۆڤانە ..!!

قال تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ٣٧﴾ [البَقَرَةِ : ٣٧] بەڵێ (خوای گەورە) تۆبە وەرگرە ، چونکە ووشەی ﴿ٱلتَّوَّابُ﴾ ووشەیەکی صیغە مبالغەیە لە گەڵ ناوە جوانە کانی (خوای گەورە)یە دایە ، بە مانایی ئەوەیە ئەگەر مرۆڤ تۆبە بکات و پەشیمان بێتەوە بە یەقینەوە ، ئەوا گەورە ترین تاوان ئەنجام بدات ، ئەوا بەدلنیایی (خوای گەورە) (تواب) یان تۆبەی گیرا دەکات لێ قبول دەکات ، ئەگەر هەزار گوناهو تاوانیشی کردبێت بەندەکە هەر تۆبەلی قبول دەکات،هەر چەندە گوناهو تاوانەکەشی گەورە بێت تۆ بەکەی گیرا دەبێت ، هەروەك لە فەرموودە یەکی القدسی پێغەمبەری خوادەفەرموویت:

لە (أنس بن مالك ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێریتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((قال الله تبارك وتعالى يا ابن آدمَ إنّكَ ما دعوتَني ورجَوْتَني غفرتُ لكَ على ما كانَ فيكَ ولا أُبَالِي يا ابن آدمَ لو بلغَتْ ذنوبكَ عَنَانَ السماءِ ثم استغفرتَنِي غفرتُ لكَ ولا أبالي يا ابن آدمَ إنك لو أتَيتَنِي بقُرَابِ الْأرضِ خطايا ثم لقِيتَنِي لا تُشْرِكُ بي شيئا لَأتَيتُكَ بقُرَابِها مغفرةً)).[1] واتە: (خوای گەورە) دەفەرموویت : ئەی نەوەی ئادەم هەتا تۆ هاوارم بۆ بێنی و ئۆمێدت بە من بێت ..!!منیش لێت خۆش دەبم کارو کردەوەت هەر چیەك بێت دەربەست نیم ..!! ئەی نەوەی ئادەم ئە گەرگوناهو تاوانەکانت بکەنە کەناری ئاسمان لە پاشاندا داوای لێ خۆشبوونم لێ بکەی لێت خۆش دەبم ، ئیتر کارو کردەوەت هەرچیەك بێت دەربەست نیم..!!ئەی نەوەی ئادەم کاتێ دێی بۆ دیوانی من نزیکەی پر بەزەوی گوناهو تاوان لە گەڵ خۆت بهێنی بەمەرجێ بە هیچ شێوەیەك هاوبەشت بۆ دانەنابم منیش لە سەرجەم گوناهو تاوانەکانت خۆش دەبم ..؟!

لە (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێریتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((خلقَ اللَّهُ مائةَ رحمةٍ فَوضعَ رحمةً واحدةً بينَ خلقِهِ يتَراحمونَ بِها وعندَ اللَّهِ تسعٌ وَتِسْعونَ رحمةً)).[2] واتە: (خوای گەورە) سەد بەزەیی دروست کردووە ، یەکێکیانی لە ناو دروستکراو داناوە ، وە بەو بەزەییان بە یەکتردا دێتەوە ، نەوەد و نۆی هەڵگرتووە بۆ قیامەت ..؟!

لە (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێریتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :(( لو يَعلَمُ المُؤمِنُ ما عِندَ اللهِ مِنَ العُقوبةِ؛ ما طَمِعَ بالجنَّةِ أحدٌ، ولو يَعلَمُ الكافِرُ ما عِندَ اللهِ مِنَ الرَّحمةِ؛ ما قنَطَ مِنَ الجنَّةِ أحدٌ...)).[3]

واتە: ئەگەر ئیمانداران بیانزانی بایە ئەو سزایەی لە لای (خوای گەورە) یە چۆن و چەندە سەختە هیچ کەس بە تەمای بەهەشت نەدەبوو ، ئەگەر بێ باوەر بیزانیایە سۆز بەزەیی لای (خوای گەورە) چۆنە چەندە بە سۆزە بەزەییە هیچ کەس لە بەهەشت نائۆمید نەدەبوو ..!!

[1] - سنن الترمذي برقم (٣٥٤٠).
[2] - سنن الترمذي برقم (٣٥٤١).
[3] - سنن الترمذي برقم (٣٥٤٢).

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿نَبِّئْ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ۝٤٩ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ۝٥٠﴾ [الحِجْر : ٤٩ - ٥٠]واتە: ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - هەواڵ بە بەندەکانم بدە کە بە دڵنیایی منم زۆر لێخۆشبوو بە بەزەییم..!! وە بە دڵنیایی سزای من یەکجار سزایەکی بە ئێش و ئازارە..!! هه روه ها ده فه رموويت : قال تعالى: ﴿۞ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥٣﴾ [الزُّمَر : ٥٣]واتە : ێئومێد نەبوون لە رەحمەتی خوا [ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ ] (ئیبنو عەبباس) دەفەرمێت: کەسانێك لە هاوبەشبڕیاردەران خەڵکیان کوشتبوو بە زۆری، وە زینایان کردبوو بە زۆری، هاتنە لای پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم - وتیان ئەی محمد -صلى الله عليه وسلم - ئەوەی تۆ دەیڵێیت و بانگەوازی بۆ دەکەیت شتێکی چاکە بەڵام پێمان بڵێ: ئایا ئەو تاوانانەی کە پێشتر کردوومانە دەسڕێتەوەو خوا لێمان خۆش دەبێت؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی: ئەی محمد -صلى الله عليه وسلم - بەو بەندانەم بڵێ کە ئیسراف و زیادڕەویان کردووە لە تاوان و سەرپێچیدا: بێئومێد نەبن لە ڕەحمەتی خوا [ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا ] بەدڵنیایی خوای گەورە لە هەموو تاوانێك خۆش ئەبێ تەنها شەریك دانان نەبێت بۆی ئیتر لە هەموو تاوانێکی تر خۆش ئەبێت، (ئەمە ئومێدبەخشترین ئایەتە لە کتابی خوای گەورە، وە صەحابە زۆر دڵیان پێی خۆش بووە)، وە (ئەم ئایەتە بانگکردنی سەرجەم کافران و تاوانبارانە بۆ تەوبە کردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، وە ئەوەی تەوبە بکات چەندێك تاوانی زۆر بێت خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، وەکو ئەو کەسەی کە سەد کەسی کوشت و تەوبەی کردو خوای گەورە لێی خۆش بوو)، (ابن عباس) دەفەرمێت: (هەرکەسێك لە پاش ئەم ئایەتە خەڵکی بێئومێد بکات لە تەوبە ئەوا باوەڕی بە قورئانی پیرۆز نیە) [ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ (٥٣) ] وە بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو بەڕەحم و بەزەییە..؟!

هەروەها بێ گومان (خوای گەورە ) دوای تۆبە و پەشیمان بوونەوە لە بەندەکانی خۆی دەکات ، بۆئەوەی لە بەندەکانی خۆش بێت ، ئەوبەهەشتەی کە ئامادەی کردووە بیان خاتەناو بەهەشتەکی خۆی ، هەروەکو دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيْلًا عَظِيمًا ۝٢٧﴾ [النِّسَاء : ٢٧] واتە : وە خوای پەروەردگار ئەیەوێت لە تاوانەکانتان خۆش بێت، و چاوپۆشی بکات لە هەڵەکانتان، بەڵام ئەو کەسانەی کە شوێن هەوا و ئارەزوویان کەوتوون ئەیانەوێت لە ڕاستە ڕێگەی ئاین لابدەن بەلادانێکی گەورە ..!! بەدلنیایەوە (خوای گەورە ) هەموو کات ویستی هەیە بۆ ئەوەی کە بەندەکانی تۆبە بکەن ، هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ۝١١٨﴾ [التَّوْبَة : ١١٨]واتە: وە داوای لێخۆشبوونیان لە خوا کرد وە ڕاستگۆ بوون لەگەڵ پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - خوای گەورە لە دوای پەنجا ڕۆژ لێیان خۆشبوو [ لِيَتُوبُوا ] بەوەی کە تەوبەکەیان قبووڵ بکات وە بۆ ئەوەی دواتر دامەزراو بن لەسەر تەوبەکەیان [ إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ] بەراستی خوای گەورە زۆر تەوبە قبووڵ ئەکات لەو کەسانەی کە بۆ لای خوا ئەگەڕێنەوە، وە زۆر بەڕەحم و بەزەییە..!!

بەلێ هەر بەندەیەك تاوان بكات پاشان بگەڕێتەوە پەشیمان ببێتەوە لە كار كردەوە خراپەكەی كە ئەنجامی داوە تۆبەی لە سەر بكات ، نەگەڕێتەوە سەری لە پیناوی (خوای گەورە ) كارو كردەوە خراپەكاری و یان گوناهو تاوانەكە وازلێ بهێنێت و ترك بكات ، ئەوا (خوای گەورە ) بەهەشتی بۆ ئامادەكردووە ، پاداشتی بە چوونە نێو بەهەشت دەداتەوە ، بەو مەرجەی تۆبەكەی راست و دروست بێت واتە ئەخلاصی لە تۆبەكەی دا هەبێت ، وە گوێڕایەلی فەرمانەكانی (خوای گەورە ) بێت لە ژیانی دونیادا ، بەهەمان ئەم كارو كردەوە چاكانەی كە ئەنجامی دەدات لە دوای تۆبە كردنەكەی لە دونیادا ئەوا (خوای گەورە ) یارمەتی دەری دەبێت بۆ ژیانی دونیا ژیانی قیامەت دا ، لە قیامەت دا بەهەشت بۆی ئامادەیە ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَيُدۡخِلُهُمُ ٱلۡجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمۡ ٦﴾ [مُحَمَّد : ٦]واتە : وە دەیانخاتە بەهەشتێكەوە كە پێشتر پێی ناساندوون و بۆی وەسفكردوون، و سەركەوتووی كردوون بۆ بەجێگەیاندنی ئەوەی كە فەرمانی پێكردبوون .لەوانەش شەهیدبوونە لە پێناوی.، پاشان جێگاو مەنزڵگایی خۆیانی پێناساندن كاتێك كە چوونە بەهەشتەوە ..؟! هەروەك ئەم فەرموودەیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی بەهەشت بۆمان دەفەرمووی،

لە (ابو هریرە ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((يقول اللهُ: أَعْدَدْتُ لعبادِىَ الصالحين ما لا عينٌ رأَتْ، ولا أُذُنٌ سَمِعَتْ، ولا خَطَرَ على قلبِ بشرٍ. فاقرَأُوا إن شِئْتُم فلا تعلم نفس ما أخفى لهم من قرة أعين جزاء بما كانوا يعملون وفى الجنةِ شجرةٌ يَسِيرُ الراكبُ فى ظلِّها مائةَ عامٍ، لا يَقْطَعُها. واقرَأُوا إن شِئْتُم وظل ممدود وموضعُ سوطٍ فى الجنةِ خيرٌ من الدنيا وما فيها. واقرَأُوا إن شِئْتُم فمن زحزح عن النار وأدخل الجنة فقد فاز وما الحياة الدنيا إلا متاع الغرور)).[1] واتە: (خوای گەورە ) دەفەرموێت : ئەو بەهرە و ناز نیعمەتەی خۆم ئامادەم كردووە بۆ بەندە چاكەكان یان صالح وچاكەكانم ئەوەندە باش و نایەبن نە بە چاو بینراون ..؟! نە بە گوێ بیستراون ..؟! نە بە دل وخەیالی كەس دا هاتوون ..؟! ئەگەر حەزیش دە كەن ئەم ئایەتە بخوێنەوە ، كە (خوای گەورە ) دەفەرموێت : قال تعالى: ﴿فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٧﴾ [السَّجۡدَة : ١٧] واتە: پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - دەفەرمێت: (خوای گەورە ئەوەندە نازو نیعمەتی بۆ بەهەشتیان ئامادە كردووە كە هیچ چاوێك نەیبینیوەو هیچ گوێیەك نەیبیستووەو بە دڵی هیچ كەسێكیشدا نەهاتووە)، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: هیچ كەسێك نازانێ خوای گەورە چی بۆ ئامادە كردوون و بۆی شاردونەتەوە لە پاداشت و نازو نیعمەتی بەهەشت كە چاویان پێی ڕۆشنا ئەبێت و پێی ئەگەشێتەوە [ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ] بەهۆی ئەو كردەوە چاكانەی كە لە دونیادا ئەنجامیان ئەدا لەوانە شەونوێژ كە بە نهێنی ئەنجامیان دەدا خوای گەورەش پاداشتی بۆیان شاردەوە..!! هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : لە بەهەشت دا درەخت هەیە سوار چاك سەد ساڵ بەسێبەرەكەی دا دەروات ، هێشتا ناگات بەو پەری ..!! ئەگەر حەزیش دەكەن ئەم ئایەتە بخوێنەوە ، كە (خوای گەوە) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ٣٠﴾ [الوَاقِعَة : ٣٠]واتە : وە لە سێبەرێكی بەردەوامی لەناو نەچوو ..!!

---

[1] - سنن الترمذي برقم (٣٢٩٢).

بێ گومان جێگەیەکی زۆر کەمی ئێوە لە بەهەشت دا چاکترە لە دونیاو لەوەش لە ناو دونیادا هەیە ..!! ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێنەوە، کە (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ١٨٥﴾ [آل عِمۡرَان : ١٨٥] واتە : جا هەر کەسێك خۆی دووربخاتەوە لە ئاگری دۆزەخ بە ئیمان هێنان و کردەوەی چاك [ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ] وە بخرێتە بەهەشتەوە بە دڵنیایی ئەوە براوەی حەقیقی و ڕزگار بووی تەواوە [ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ ] وە ژیانی دونیا هیچ شتێك نیە تەنها ڕابواردن و هیواو ئومێدو ئاواتێکی کەمی لەناوچووە کە مرۆڤ پێ لە خشتە ئەبرێ ..!!

✍ لەرێ (ابن وهب ) لە (عبدالرحمن بن زيد بن أسلم ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ﴾ دەلێت : ئەمە ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٢٣﴾ [الأَعۡرَاف : ٢٣] واتە : ئادەم وحەواش وتیان : پەروەردگارا ئێمە بەخواردنی بەرووبوومی ئەو دارە ستەممان لەخۆمان کرد، وبێگومانین کە ئەگەر تۆ لێمان نەبووری ورەحمان لێنەکەی ئەوا سەرەنجام لەو کەسانە دەبین کە بەخت وبەشی خۆیان دۆڕاندووە لەدونیا ودواڕۆژیاندا . ئەم ووشانە ئەو کۆمەڵە ووشەیە بوون کەئادەم لەپەروەردگاریەوە وەریگرتن وفێریبوون، وپێیان داوای لێخۆشبوونی کرد لەپەروەردگاری وئەویش لێیخۆشبوو ..!! ).[1]

📖 لە (الحسن ) لە (أبي بن كعب ) – دەلیت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((قال آدمُ عليه السلامُ أرأيتَ يا ربِّ إن تبتُ ورجعتُ أَعائِدي إلى الجنَّةِ قال نعم فذلك قولُه { فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ } )).[2] واتە: ئادەم (عليه السلام ) فەرمووی :ئەی پەروەردگار توبەم کرد، دووبارە بگەرێمەوە بۆ بەهەشت ..!! فەرمووی ئەمە ئەو ووتەیە { فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ } ..!!

لە رێ (السدی ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لێ رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ﴾ دلێت : ئادەم ووتی : ئەی پەروەردگار ئایا تۆ بە دەستی خۆ دروستت نە کردم ..؟! پەروەردگار فەرمووی : بەلێ . پێ فەرموو : لە رووحی خۆت نەتکرد بە بەرمدا ..؟! پەروەردگار فەرمووی : بەلێ . وە پژمیم فەرمووت بەر بەزەیی خودا کەوی و بەزەیت پێش تورەیت کەوتووە ..؟! پەروەردگار فەرمووی : بەلێ . وە لە سەرت نووسیم کە ئەو کارە بکەم ..؟! پەروەردگار فەرمووی : بەلێ . ئایا دیت توبەم کرد دەم گێریتەوە بۆ بەهەشت ..؟! پەروەردگار فەرمووی : بەلێ ..!! .[3]

---

[1] - اخرجه ابن جرير (٥٧٧/١)، وابن ابي حاتم (٩٠/١) (٤٠٢).
[2] -تفسير ابن كثير القران العظيم (١٢٠/١).
[3] تفسير ابن كثير القران العظيم (١٢٠/١).

📖 لە (علی ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت : پرسیام لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئەم ئایەتە قال تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَـٰتٍ﴾ [البَقَرَة : ٣٧] پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((إنَّ اللَّهَ أهبطَ آدمَ بالهندِ وحوَّاءَ بجُدَّةَ وإبليسَ ببيسانَ والحيَّةَ بأصبَهانَ وكان للحيَّةِ قوائمُ كقوائمِ البعيرِ ومكَثَ آدمُ بالهندِ مائةَ سنةٍ باكيًا على خطيئتِهِ حتَّى بعثَ اللَّهُ إليهِ جبريلَ وقال يا آدمُ ألَم أخلقْكَ بيدَيَّ ألَم أنفخْ فيكَ من روحى ألم أُسجِدْ لكَ ملائكَتى ألَم أزَوِّجْكَ حوَّاءَ أَمَتى قال بلَى ، قال فما هذا البكاءُ قال وما يمنعُنى من البكاءِ وقد أُخرِجتُ من جِوارِ الرَّحمنِ قال فعليك بهؤلاءِ الكلِماتِ فإنَّ اللَّهَ قابلٌ توبتَكَ وغافِرٌ ذنبَكَ قُلْ اللَّهُمَّ إنِّى أسأَلُكَ بحقِّ محمَّدٍ وآلِ محمَّدٍ سبحانَكَ لا إلَهَ إلاَّ أنتَ عمِلتُ سوءًا وظلمتُ نفسى فاغفِر لى إنَّكَ أنتَ الغفورُ الرَّحيمُ اللَّهمَّ إنى أسأَلُكَ بحقِّ محمَّدٍ وآلِ محمد سبحانَكَ لا إلَهَ إلاَّ أنتَ عمِلتُ سوءًا وظلمتُ نفسى فتُبْ عليَّ إنَّكَ أنت التَّوَّابُ الرَّحيمُ فهؤلاءِ الكلِماتُ الَّتى تلقَّى آدَمُ)).[1]

📖 لە (عائشة ) – خوا لی رازی بیت- دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((لمَّا أَهبطَ اللَّهُ آدمَ إلى الأرضِ قامَ وجاء الْكعبةَ فصلَّى رَكعتينِ فألْهمَهُ اللَّهُ هذا الدُّعاءِ اللَّهمَّ إنَّكَ تعلمُ سرِّي وعلانيَتى فاقبل معذِرَتى وتعلَمُ حاجتى فأعطِنى سؤلى وتعلَمُ ما فى نفسى فاغفِر لى ذَنبى اللَّهمَّ إنِّى أسأَلُكَ إيمانًا يباشِرُ قلبى ويقينًا صادقًا حتَّى أعلمُ أنَّهُ لا يصيبُنى إلاَّ ما كتبتَ لى وأرضِنى بما قسمتَ لى فأوحى اللَّهُ إليْهِ يا آدمُ قد قبلتُ توبتَكَ وغفرتُ ذنبَكَ ولن يدعوَنى أحدٌ بِهذا الدُّعاءِ إلاَّ غفرتُ لَهُ ذنبَهُ وَكفيتُه المُهمَّ من أمرِهِ وزجرتُ عنْهُ الشَّيطانَ واتَّجرتُ لَهُ من وراءِ كلِّ تاجرٍ وأقبلَت إليْهِ الدُّنيا راغمةً وإن لم يرِدْها)).[2]

✍ لە ڕێ ( ابن جريج ) لە (عبدالله بن عباس ) – خوا لی رازی بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَـٰتٍ﴾ دەڵێت: ئەمە ئەو وتەیە کە دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا﴾ [الأعراف : ٢٣] ..).[3]

---

[1] - اورده الديلمي في الفردوس (١٥١/٣).
[2] -اخرجه الطبراني في الاوسط (١١٧/٦-١١٨) وا بن عساكر (٤٢٨/٧).
[3] -عزاه السيوطي غلى ابن منذر في تفسير المأثور (٢٨٧/١).

✍ لە ریّ (ثابت ) لە (انس بن مالك )- خوا لیّ رازی بیّت – لەسە ر ووتەی قال تعالی: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ دەلیّت : ئەم نزایەی کرد فەرمووی : (( سبحانك اللهم وبحمدك ، عملت سوءا ، وظلمت نفسی ، فاغفر لی ، إنك خیر الغافرین ، لا إله إلا أنت سبحانك وبحمدك ، علمت سوءا ، وظلمت نفسی ، فارحمنی ، إنك أنت أرحم الرلحمین، لا إله إلا أنت سبحانك وبحمدك ، علمت سواءا ، وظلمت نفسی ، فتب علی ، إنك أنت التواب الرحیم . وذكر أنه عن النبی ﷺ ولكن شك فیه ..).[١]

✍ لە ری (أبان بن ابی عیاش) لە (سعد بن جبیر ) – رە حمە تی خوای لی بیت –دەلیّت : کاتێك ئادەم تووشی هەلە بوو ، ئەم چەند ووشەیە بە نیاز پاكی و دلسۆزیەوە ووت : (( لا إله إلا أنت ، سبحانك وبحمدك ، رب علمت سوءا ، وظلمت نفسی ، فارحمنی ، إنك أنت أرحم الراحمین ، لا إله إلا أنت سبحانك وبحمدك ، رب علمت سوءا ، وظلمت نفسی ، فتب علی ، إنك أنت التواب الرحیم ..).[٢]

✍ لە ری (خصیف ) لە (سعد بن جبیر ) – رە حمە تی خوای لی بیت –لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ دەلیّت : ئەمە ئەو ووتەیە دەفەرموویّت : قال تعالی: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ۝٢٣﴾ [الأَعْرَاف : ٢٣] ..)).[٣]

✍ لە ری (عطاء بن دینار) لە (سعد بن جبیر ) – رە حمە تی خوای لی بیت –لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿ٱلرَّحِيمُ ۝٣٧﴾ [البَقَرَة : ٣٧] دەلیّت : (خوای گەورە ) بەزەیی یان رەحمی پیّ کرد دوای ئەوەی توبەی کرد ..).[٤]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لیّ بیّت – دەلیّت : (خوای گەورە ) توبە ی لە سەر ئادەم قبول کرد لە رۆژی جمعە یان هەینی دا ، قال تعالی: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ۝٣٧﴾ [البَقَرَة : ٣٧] دروستی کرد..).[٥]

✍ لە ری (سلمە) لە (محمد بن إسحاق ) – رە حمەتی خوای لی بیت – لە سە ر ووتەی قال تعالی: ﴿ٱلرَّحِيمُ ۝٣٧﴾ [البَقَرَة : ٣٧] دەلیّت : رەحم و بەزەیی بە بەندەکانی دەکات بەوەی کە توبەی دەکەن ..).[٦]

---

[١] -اخرجه ابن عساكر (٤٣٦/٧).
[٢] -اخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق (٤٣٤/٧).
[٣] -اخرجه ابن ابي حاتم (٩١/١).
[٤] -اخرجه ابن ابي حاتم (٩٢/١).
[٥] تفسير مقاتل بن سليمان (١٠٠/١) .
[٦] -اخرجه ابن ابي حاتم (٩٢/١).

قال تعالى: ﴿قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗاۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٣٨﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨]

قال تعالى: ﴿قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗا﴾ واتە : ووتمان هەموو بچنە خوارەوە لە بەهەشت ،قال تعالى: ﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى﴾ واتە: ئینجا ئەگەر لە منەوە ڕێنمایی و ڕێ نیشانی یەکتان بۆ هات ،قال تعالى: ﴿فَمَن تَبِعَ هُدَايَ﴾ واتە : ئەو کەسەی دوای ڕێنموونیی و ڕێ نیشادەری کەوت ،قال تعالى: ﴿فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٣٨﴾ واتە: نە ترسیان لە سەرەو نە خەم دەخۆن ..!! هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗاۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] واتە: پیمان ووتن : هەمووتان بە هەشت دابزنە خوارەوە بۆ سەر زەوی یان خرۆر ببنەوە یا شۆر ببنەوە بۆ خوارەوە بۆ سەر زەوی ، (واتە : مە بەست لێ ئادەم ، حەوا ، یان نەوەکانی ئادەم ، وە ئیبلیس و مار ) واتە : کۆیی ئەوانەی کە هەلە و گوناهو تاوانیان ئەنجامدا ، بەلام هەر یەکە و هەلەکەی جیاوازە لەوەی تر ، ئینجا بەم فەرمانەی (خوای گەورە ) جێگیریەتی ئادەم لە سەر زەوی دەستی پێکرد کە دەبێ بەگوێرەی فەرمانی ئەو ڕێ نموویی ڕێ نیشاندان وەردەگرن ،قال تعالى: ﴿فَمَن تَبِعَ هُدَايَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] هەر کەسێك بەدوای ئەو ڕێ نموویی و ڕێ نیشاندەرانە کەوت و بەگوێرەی فەرمانی (خوای گەورە ) کاری کرد ،قال تعالى: ﴿فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٣٨﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] واتە: تووشی هیچ مەترسیەك و دەلگیریەك نابن یان هیچ تووشی ترس خەمگینی نابن ، وە تووشی کاری وانابن زیانتان پێ بگەیەنی ئەگەر بەسەریشتان بێت و پێی خەفەتباور دەگیرنابن .....!!!!!

قال تعالى: ﴿قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗاۖ ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] واتە: پێمان گوتن : هەمووتان لە بەهەشت دابەزنە خوارەوە یان لێی بچنە دەرەوە ، یان شۆر ببنەوە بۆ سەر زەوی ، ووشەی ﴿ٱهۡبِطُواْ﴾ واتە : ئەوەی کە شتێك یان مرۆڤێك کە لە سەرەوە بێتە خوارەوە یان لە سەرەوە غەلۆبێتەوە خوارەوە یان شۆرببێتەوە خوارەوە ..!! وە کە لە پێشدا باسمان کرد لە بەهەشت دا دەرکران یان چوونە دەرەوە ، ڕەوانەی خواری کران بۆ سەر زەوی ، واتە : لە ژیانی نێو بەهەشت هەر چی نازونیعمەتە تێدایە ، یان هەر چی خۆشیەکە تێدایە ، بە بەراورد بە ژیانی سەر زەوی یان ژیانی دونیا زۆر جیاوازە ، چونکە ژیانی دونیا ، هەول و کۆششی زۆرە و ماندو هیلاك شقیق دەبێت ، دەبێت بە ماندوو بوونی ئارەقەری ناوجەوانی خۆت بژیت خۆشی ڕابواردن خواردن خۆراك و خواردنەوە پەیدا بکەیت ، بەلام لە بەهەشت دا بە پێ کارو کردەوەی دونیا یە ، یان ئەوەتا کاروکردەوەکانت بۆ بەهەشت دەدبات بۆ هەتاهەتایێ یان ئەوەتا بۆ دۆزەخ ڕاپێچت دەکات.!!

قال تعالى: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] واتە: جا هەر کاتێ لە منەوە ڕێنمایتان بۆ هات ، واتە : بە پێغەمبەرانی خۆمدا پەیام و کتێبم بۆ ناردن ،ئەوا هەر کەسێ بەدوای ڕێنموویی من بکەوێ نە ترسی دەبێت و نەغەم و پەژارەی دەبێت ، واتە : ئەو کەسە بێ ترس دەبێت لە دوا ڕۆژی خۆی کە (خوای گەورە ) سزایی بدات ، وە غەم و پەژارەشی نابێت بلێ بەخوا ژیانەکەشم لە دەست چوو ..؟! چونکە ژیانی دونیاکەی لە دەست ناچێت بەلکو بە ژیانی دونیا بەهەرەمەند و شکۆمەند دەبێت ، چونکە ئەو شکۆمەندیە شکۆمەندیە کە لە (خوای گەورە) وە بۆ بێت نەوەك لە لای خەلك بێت ، بۆ هەمیشە بەهرەمەندیی و شکۆمەندی هەر لە ئیمان و باوەر بەخوای تاك تەنهاوەیە ، ئەوەی دەیەوێت بەدەستی بهێنی هەروەك دەفەرموویت : قال تعالى: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُ ۖ بِيَدِكَ الْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾﴾ [آل عِمۡرَان : ٢٦]واتە : ئەی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەکاتێکدا کە ڕوو دەکەیتە پەروەردگارت بە پاڕانەوە بڵێ : ئەی ئەو زاتەی کە موڵك هەمووی هی تۆیە، تۆ موڵك و ماڵ و پایەداری لە زەویدا دەبەخشیت بە هەرکەسێك لە دروستکراوەکانت کە خۆت بتەوێت، وە موڵکیش دەسێنیتەوە لە هەرکەسێك کە خۆت بتەوێت، و عیزەت و دەسەڵات لە دونیا و دوارۆژدا دەبەخشیت بە کەسێك کە خۆت بتەوێت، وە زەلیلی و ژێردەستەیی و سەرشۆڕیش دەدەیت بەسەر کەسێکدا کە خۆت بتەوێت، هەموو خێر و چاکەیەك بەدەست تۆیە، تەنها تۆ بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایت . ئەم ئایەتە ئەو سودەی تێدایە کە سیفەتی دەست بۆ خوای پەروەردگار جێگیردەکات و دەسەڵمێنێت بەشێوەیەك کە شایستە بێت بۆی . پاکی و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگار . .!! بێ گومان ئەوەی شکۆمەندی بەهەرەمەندی دەبەخشیت تەنها (خوای گەورە) یە ، ئەویش بە گرتنە بەری ڕێبازی ڕاست و دروست (خوای گەورە ) یان باوەر هێنانی تەواو بێ کەم و کوری ، گوێرایەلی فەرمانە کانی (خوای گەورە) بین و فەرمانەکانی جێ بەجێ کەین و دوور بکەینەوە لەوەی قەدەغەکراوی (خوای گەورە ) یە ، هەروەها تاکە ڕێ نموویی و هیدایەت و ڕێ نیشاندەر تەنها لەلای زاتی (الله ) یە ، چونکە بەهەرمەندو شکۆمەند دەبین لە دونیا لە دوا رۆژدا یان لە قیامەت دا ، چونکە ژیانی دونیامان لە دەست ناچێ و بەلکو بە ژیانەکەی بەهەرەمەند دەبین ،ترسی شیمان نیە لە سزای ئازارو جەزرەبەی (خوای گەورە ) لە رۆژی لێ پرسینەو حیساب کتێب دا ، چونکە ئەو کەسەی فەرمانەکانی پەروەردگاری جێ بەجێ بکات ، (خوای گەورە ) لە دونیا و لە قیامەت ڕێزی دەگرێت هەر گیز سزایی نادات ، بەلکو ڕێزی دەگرێ ژیانی هەمیشەیی پی دەبەخشێ لە بەهەشت دا ، بەلام ئەو کەسانەی کە بێ باوەڕن کافرو موشریکن بەردەوام ئایەتەکانی (خوای گەورە ) بەدرۆ دەزانن ، ئەوانە دەبنە هاوەل و خاوەنی دۆزەخ بەهەمیشەیی تێدا دەمینێنەوە ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٣٩﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٣٩]واتە : بەڵام ئەوانەی کە کوفریان کردووە وە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیووە [ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ] ئەوانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن و بە نەمری و هەمیشەیی تیایدا ئەمێننەوە..!!

تێبینی / ئەگەر سەرنجێك بدەین دەبینین ووشەی ﴿ٱهۡبِطُواْ﴾ دوو جار دووبارە تۆتەوە لە چیرۆکی دەرکردنی ئادەم لە بەهەشت دا ..؟! وەلامە کەی ئەوەیە جاری یەکەم ئەم ووشەیە ﴿ٱهۡبِطُواْ﴾ پێش تویەکردنی ئادەمە ، هێشتا تویەی نە کردووە ، بەلام لە جاری دووەم ئەم ووشەیە ﴿ٱهۡبِطُواْ﴾ دوایی توبە کردنی ئادەم ، هەروەها توبەکەی گیرا دەبێت یان قبول دەبێت لە لای (خوای گەورە )، واتە : هەر لە سەرەتاوە کە لە درەختە قەدەغەکراوە کەیان خوارد ، (خوای گەورە ) پێ فەرموون شۆببنەوە خوارەوە یان غەلۆر ببنەوە ، بەلام دوای ئەوەی کە ئادەم توبەی کرد و (خوای گەورە ) لێ خۆشبوو ، واتە : جاری دووەم دووبارە پێ فەرموون : برۆنە خوارەوە یان شۆببنەوە یان دابەزنە خوارێ ..؟! تاکو ئادەم وا نەزانێ بەهۆی توبەکردنە کەیەوە سزایی تاوان و هەلە و گوناهی لە سەر لاچووە و بۆی هەیە لە بەهەشت دا بمێنێتەوە ..؟! هەروەها فەرمووی : قال تعالى: ﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٣٨﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] واتە: (خوای گەورە ) بە ئادەمیزادی راگەیاندوە ئەگەر بەدوایی هیدایەت و رێنموونی و رێ نیشاندەری خوا بکەون ، ئەوا بە دلنیایی نە ترسیان دەبێت و وە نەغەم وپەژارەشیان دەبێت ، واتە : لە کاتێکدا پابەند دەبن بە شەریعەتی خواوە ، وە ترسیشیان نابێت لە نسیبەتی رۆژی قیامەت دا ، چونکە نە ترسیان لە سزایی دوا رۆژ دەبێت ، نەغەم وپەرژارەیان هەیە لە ژرۆژی قیامەت ، هەروەها لە دونیا بەهەرەمەندو شکۆمەندە بن ، وە ئەوانەی بە دوای هیدایەت و رێ نموویی خوا دەکەون ، نە ترسیان دەبێت لە هەژاری ژیانی دنیا ، چونکە دەزانن رزق رۆزی تەنها بەدەستی خوایە ، نەغەم پەژارەشیان دەبیت بۆ رزق رۆزی ، چونکە هەموو رزق و رۆزی لە دەستی خوایە ، هەروەها نەغەم پەژاریە یان دەبێت کە نسیبەتێك بۆیان پەیدا دەبێت ، جا دوا لە (خوای گەورە ) دەکەین لەو کەسانەمان حیساب بکات ، کە بەختەوەری ژیانی دونیا و ژیانی دوا رۆژ بین ، نەك لە کەسانە بین ، کە خەسارەت مەند یان زیامەندی دونیا و دوا رۆژ بین ، هەر بۆ بەردەوام دوا لە (خوای گەورە ) بکەین کە بمانخاتە سەر رێگای راست دورست ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ [الفَاتِحَةِ : ٦] واتە : ڕێنماییمان بکە ورێمان نیشانبدە، و سەرکەوتومان بکە بۆ ڕێگەی ڕاست، و دامەزراومان بکە لەسەری هەتا پێت دەگەینەوە، ئەویش ئەو ئیسلامەیە کە ڕێگەیەکی ئاشکرای گەیەنەرە بە ڕەزامەندی خوای پەروەردگار و بە بەهەشتەکەی، کە دواهەمین پەیامبەرەکەی صلى الله عليه وسلم نیشانی داوین، بۆیە هیچ ڕێگەیەك نیە بۆ خۆشگوزەرانی مرۆڤ تەنها بە دامەزراوی و بەردەوام بوون نەبێت لەسەر ئەم ڕێگەیە ..!!

قال تعالى: ﴿قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعًا﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] واتە: ووتمان : هەموو تان بچنە خوارەوە یان شۆببنەوە خوارێ ، (مەبەست لێ ئادەم ، حەوا ، ئیبلیس و مار ) کە لە پێشد باسمان کرد ئەم چوارە گوناهو تاوانیان ئەنجامدا هەریەکەیان گوناهەکەی جیاواز بوو ، بەلام (ئادەم حەوا) گوناهو تاوانیان جیاوازتر بوو ، چونکە ئەوان قە دەغەکراوێکیان خوارد ئەویش ئەم درەختە بوو ، کە زانایان پێیا وایە درەختی تریێ یان گەنم بووە یان شتێك لە هاوشێوەی دانەوێلە ، ئەوە بوو (خوای گەورە ) ئادەم حەوای ، دەرکرد لەو بەهەشتەدا کە (خوای گەورە ) بۆ دەست نیشان کردەبووە، هەر بۆیە ئەوانی رەوانەی خوارەوە کرد یان شۆری کردنەوە بۆ خوارەوە ، لە نازو نیعەتەکانی ئەم بەهەشت دەری کردن ، پاشان ئادەم پەشیمان بوویەوە تۆبەی کرد ..!!

✍ لە (ابن قیم )- رەحمەتی خوای لێ بیت –دەلێت : ئەم دابەزینە وەکو دابەزینی ئایەتی پێشتر نیە واتە : وەك دابەزینی ئایەتی یەکەم نیە ، چونکە ئەم دابەزینە لە ئاسمانەوە بۆ زەویە ، بەلام دابەزینەکەی تر لە بەهەشتەوە بۆ ئاسمان بوو ، لە سەر ئەمە ئەو بەهەشتەی تێدا دابەزین لە سەرووی ئاسمانەکانە ئەم بەهەشتە خلد واتە: نەمریە یان بۆ هەمیشەیی تێدا دەمێنیتەوە نا مری بۆ هەتاهەتایێ ..!! [1]

✍لەرێ (الربیع بن أنس ) لە (ابو العالیە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لەسەر ووتەی قال تعالى: ﴿قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعًاۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى﴾ دەلێت : واتە : رێنموویی ، پێغەمبەران و پەیامبەرەکان و راسپاردەکان ..!! .[2]

قال تعالى: ﴿فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٣٨﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] واتە : [ فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ ] ئەوەی شوێن ئەو کتابە بکەوێ و کاری پێ بکات [ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ ] ئەوانە ترسیان لەسەر نیە لە داهاتوو لە قیامەت [ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ] وە خەفەتیش ناخۆن لە رابردوو لەوەی لە دونیا بەجێیان هێشتووە چونکە خوای گەورە باشتریان پێ دەبەخشێت..!! هەر وەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ١٢٣﴾ [طه : ١٢٣]واتە : ئەوا هەر کەسێك شوێن ئەو هیدایەتەی من بکەوێ لە دونیادا گومڕا نابێت و لە قیامەتیش بەدبەخت نابێت، بەڵکو بەختەوەر ئەبێت..!!

✍ لە (عبدالله بن عباس) – خوا لی رازی بیت – لە سەر ئەم ووتەیە قال تعالى: ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ١٢٣﴾ [طه : ١٢٣] دەلێت : واتە : لە دونیا رێی وون ناکات و ، لە قیامەتیشدا بەد بەخت نابێت ..؟! .[3]

[1] - بدائع التفسير ابن قيم (١/٣١٠-٣١٢).
[2] -اخرجه ابن جرير (١/٥٨٩).
[3] -تفسير الطبري (١٨/٣٨٩) .

قال تعالى: ﴿وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي﴾ [طه : ١٢٤] واتە: وە هەر کەسێکیش پشت لە دین و قورئانەکەی من بکات ،یان هە ر کەسیش پشت لە ئامۆژگاری من هەلکات و گوێرایەلی فەرمانەکانی من نەکات ، ئەوەی کە ناردوومەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەران یان پەیامبەرەکانم ، ئەویش بچێت رێنموویی لە رێگای تروە وەر بگرێت ، واتە: رێنموویی لە کەسانێك وەرگرێ کە خۆیان لارو خوار خێچن لە سەر هیدایەت نین رێگای راستیان وون کردوە، ئەو دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا﴾ [طه : ١٢٤] واتە : ئەوە بە دڵنیایی ژیانێکی تەنگ و تەسك لە دونیادا ئەیژێنین لە دوودڵی و گومان و دڵەڕاوکێ و شڵەژاویدا دەژێت، وە لەناو گۆریشدا سزا دەدرێت و گۆڕەکەی لێ تەسك دەکرێتەوە تا پەراسوەکانی هەموو دەشکێت، کەواتە : ژیانی ئەو کەسە لە تەنگانە دایە لە دونیادا ، دلی ئارام ناگرێت و بەردەوام لە دلە راوکێ دایە ، بەلکو دل تەنگ و نارەحەت و دلە کوتەیەتی بەردەوام ، بەهۆی ئەو رێگا لار خوارو خێچ و چەوتەی گرتوویەتی یان لە سەری دەروات لە ژیانی دونیادا ، با بە روالەت خۆشی رابوێرێت بەجل و بەرگ خۆشی ئارەزووەکانی و مال و سامان دەسەهەلات سلتە و پلە پێگەی شی هە بێت ، ئیتر با بەروالەت هەموو خۆشیەکانی دونیا هەیە هەبێت ببینی ، بێ گومان چونکە دل و دەروونی لە گەل نیە بەردەوام ژیانێکی ناخۆشی هەیە لە دلەوە یان لە ناوەوەدا چونکە ئەوەی بەختەوەری و خۆشی شادی دورست دەکات ئەوە بە دلنیایەوە تەنها و تەنها دلە محکم هەموو خۆشیەك ،بەلێ چونکە دلی لە جێی خۆی نیە و خاوە باوەری راستەقینە نیە ، لە سەر رێ راست ناروات ، هەمیشە لە گومان و سەرگەردانی و سەر لێشێوایی و دلە راوکێدا دەژی ، بەردەوام ئەم باروو دۆخەی بە سەر دادێت ، کە لە ژیانێکی ناخۆش تەسك و تەنگانەدایە ، هەرەکو (خوای گەورە ) دفەرموویێت : قال تعالى: ﴿نَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ١٢٤﴾ [طه : ١٢٤]واتە : وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشری ئەکەین،

✍ لە (مجاهد ) – رەحمەتی خوای لێ بێت - لەسەر ئەم ووتەیە ﴿نَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ﴾ دەلێت : واتە : هیچ بیانوو بەلگەیەکی بەدەستەوە نیە بۆیە بە کوێری حشر دەکرێت ..!!) .[١]

✍ لە (عیکرمە ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : هەموو شتیچکی لێ وون دەکرێت و نایبینی کوێرە لە ئاستی هەموو شتکەکان جگە لە دۆزەخ نەبێت ..!! ).[٢]

[١] -تفسير الطبري (١٨/٣٩٤-٣٩٥).
[٢] - تفسير الطبري (١٨/٣٩٤-٣٩٥).

هەروەك (خوای گەورە) لەئایەتێکی تردا ، دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾﴾ [الإسْرَاء : ٩٧]واتە : وە لە ڕۆژی قیامەتیش حەشریان ئەکەین لەسەر دەم و چاویان، وە پێیەکانیان بە ئاسمانەوەیە [ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ] ئەمانە کوێرو لاڵ و کەڕن [ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ] وە شوێنی مانەوەشیان دۆزەخە [ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا ] هەر کاتێك ئاگرەکەی کپ بێتەوەو دامرکێتەوە زیاتر گڕو بڵێسەی ئەدەین..!!

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾﴾ [طه : ١٢٥]واتە : ئەویش ئەڵێ: ئەی پەروەردگار بۆ بە کوێری حەشرم ئەکەی لە کاتێکدا کە من لە دونیا هەردوو چاوم بینا بووەو کوێر نەبووم..!!هەروە ها (خوای کە ورە ) دە فە رمویت : قال تعالى: ﴿قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ الْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾﴾ [طه : ١٢٦]واتە: خوای گەورە ئەفەرمووێ: بەم شێوازە ئایەتەکانی ئێمەت پێگەیشت تۆ پشتت تێ کردو پشتگوێت خست و وازت لێ هێناو تەماشات نەکرد [ وَكَذَٰلِكَ الْيَوْمَ تُنْسَى] ئێستاش ئاوا بە کوێری بەجێ ئەهێڵدرێی لەناو ئاگری دۆزەخداو وەکو لەبیرکراو مامەڵەت لەگەڵدا دەکرێت..!! بەڵێ (خوای گەورە ) دەفەرمووی: کاتێك کە تۆ شتت هەلکر لە نیشانە و ئایەتەکانی ئێمە دا ، وەکو کەسێك هەر لە بیرت نەبوو و هەر گوێت پێ نەدا ، گرینگی بە نیشانەکانی ئێمە نەدا ..؟!، دوای ئەوەی ئاگادار کرایەوە کردیەوە ..؟! ئێمەش هەر بەم شێوەیە مامەلەت لە گەل دا دەکەین ، تۆ لە بیر دەکەین کە تۆش ئایەتەکانی ئێمەت لە بیرکرد ..؟! هەر وەها (خوای گەورە ) لە ئایەتێکی تر دا دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ۚ فَالْيَوْمَ نَنسَاهُمْ كَمَا نَسُوا لِقَاءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا وَمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٥١﴾﴾ [الأَعْرَاف : ٥١]واتە : [ الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا ] ئەو کافرانەی کە لە دونیادا دینەکەی خوای گەورەیان کردبوو بە گاڵتە کردن و سووکایەتی پێ کردن و یاری کردن [ وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ] وە بە ژیانی دونیا هەڵخەڵتان و ژیانی دونیا فریوی دان [ فَالْيَوْمَ نَنْسَاهُمْ ] ئەمڕۆ ئیهمال ئەکرێن و وازیان لێ ئەهێندرێ لەناو ئاگری دۆزەخداو وەکو لەبیرچو مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت چونکە خوای گەورە هیچ شتێك لە بیر ناکات [ كَمَا نَسُوا لِقَاءَ يَوْمِهِمْ هَذَا ] چۆن ئەوان ئەم ڕۆژەیان لەبیر کردبوو [ وَمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ] وە لەبەر ئەوەی کە ئینکاری ئایەتەکانی خوای گەورەیان ئەکرد..؟! بەلێ دەفەرمووی : بۆیە ئەمرۆ ئەوان لە بیر خۆمان دەبەینەوە هەرچۆنێك ئەوان دیداری ئەم رۆژە یان لە بیر خۆیان بردبوویەوە ..؟! چونکە ئەو پاداشتە لە شێوەی ئە ئاکارەیە ، وەك دەلێن : پادشتە و سزا بە شێوەی جنسی کردەوە و ئاکارەکەیە ..؟!!

بەڵێ (خوای گەورە ) سزای زۆر سەختی داناوە بۆ ئەو کە سانەی کە لە ئەندازە دەرچوونە یان لە سنووری پەیامی (خوای گەورە ) دەرچوونە ، هەروەکو (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿لَّهُمْ عَذَابٌ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَقُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٣٤﴾﴾ [الرَّعْد : ٣٤]واتە : [ لَهُمْ عَذَابٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ] لە ژیانی دونیادا خوای گەورە کافران سزا ئەدات بەدەست باوەڕداران بە کوشتن و گرتن [ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَشَقُّ ] بەڵام سزای قیامەت زۆر سەختترە لە سزای دونیا چونکە سزای دونیا کۆتایی دێت و سزای قیامەت کۆتایی نایات، وە ئاگری دونیا بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ [ وَمَا لَهُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ وَاقٍ ] وە لە غەیری خوای گەورە کەس نیە لە سزای خوای گەورە بیانپارێزێ..!!هەروەها دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾﴾ [طه : ١٢٧]واتە : وە بەهەمان شێوە سزای ئەو کەسە دەدەین کە زیادڕەوی لەسەر خۆی کردووە و سەرپێچی پەروەردگاری کردووە، و باوەڕی بە ئایەتەکانمان نەهێناوە، بەچەندها سزا لەدونیادا، بێگومان سزای دوارۆژیش کە بۆی ئامادەکراوە توندترە لەئازار و بەردەوام وجێگیرترە، چونکە نەدەبڕێتەوە ونەش تەواو دەبێت ..!! بێ گومان ژیانی دونیا زۆر قورس و گرانە لە سەر هەر بەندەیەکی (خوای گەورە ) ئەوەی ئادەم (علیە السلام ) لەم بەهەشت دا دابەزی و شۆڕبی خوارەوەی کرد (خوای گەورە ) لە بەهەشت بوو ، هیچ کەم کوریەکی نەبوو لەم ژیانەی بەهەشت دا ، پر بوو لەو نازونیعمەتە زۆرەی (خوای گەورە ) کە بۆ فەراهەم ببوو ..؟! کەواتە : ئادەم کە دابەزی بۆ ژیانی راستەقینە ی دونیا ، بێ گومان ژیانێکی نوێ و ژیانێك پرە لە کێشمە کێش و دەردەسەری کێبرکی زۆر سەخت جا ئەوەی بۆ ژیانی دونیا ئەوەشی کە بۆ ژیانی دوارۆژ هەولی بۆ دەدات ، چونکە ژیانێکی زۆر قورس و گرانە لە سەر هەر بەندەیەك ، هەر قوناغێك لە قوناغەکانی مرۆڤ پێویستی بە جهد و هەول تێ کوشان هەیە ، جا چ بۆ بژێوی و مەعیشەتی دونیا بێت ، چ بۆ پەرستن و عیبادەت و پەروەردگار بێت بۆ ئەوەی بە بەندەیەکی چاك و چاکەکار بگەرێنەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆمان ، ئەویش بە کۆکردنەوەی کارو ئاکاری چەکە لە ژیانی دونیادا ، بێ گومان ئەمانە پێویستی زۆری بە هەولدان و ماندوو بوون و جهد و تێ کۆشان هەیە لە تەمەنی هەر مرۆڤێك دا ، هەلبەتە ئادەم لە بەهەشت دا بوو ، ئەم هەموو ماندوو بوون قورسی ژیان لەسەری نەبوو ئەوە بوو بە هەلەیەك لە بەهەشت دەرکرا هاتە خوارەوە بۆ ژیانی دونیا ، ژیانی دونیا ئەو هەموو قورسی گرانی ماندوو بوونەی تێدا بەدی دەکرێت ، بۆ ئەوەی بگەرێتەوە بۆ هەمان شوێن ئەویش بەهەشتی نەبراوەیە ، کەواتە ژیانی هەر ئادەمیزادێك لە دونیایە دا ، بەچەند قۆناغێك دەست پێ دەکات ، لە تەمەنی هەر کەسێك دا ، ئەوەی لۆژیك و منتقە ،ئەم قۆناغانەش هەر زۆر سەخت قورس گرانە کە پێدا تێ دەپەرێن ، جا ئەوەی کە لە هەر دوو دونیا دا سەر فرازە ئەوەیە کە بە ئەخلاص دلسۆزی تەنها بەندەی خوایە هەموو هەولێك دەدا تاکو پەروەردگای خۆی لێ رازی بێت دەست بەم ئاینە ئیسلامەوە بگرێت و کە ئاینی پێغەمبەرانە (علیە السلام ) ئاینی خوا پەرستی راستە قینە یە ، ئاینی توحید و یەکتاپەرستیە ، بۆیە ئەو کەسەی لە سەر رێبازی ئاینی ئیسلام بێت سەر فرازە ..!!

بێ گومان دونیا شوێنی ماندوو بوون سەختیە ، ئەم شوێنە یە تاکو مردن دەبێت هەولی بۆ بدیت حەسانەوەی تێدا نیە ، جا لە هەر پلە پایەك و دا بێت ، ئەوەی شوێنی ئارامی و حەسانەوە وخۆشی شادی و هێمنی یە دڵ رفینە کە پر لە باغ بێستان و رووباری جۆرەها مێوە خواردن کە نەهیچ کەس بینویەتی و نەهیچ کەس بە سەر دلی داهاتووە ، کەواتە خۆشیە کانی بەهەشت نەبراوەن بۆ هەمیشەیە هەروەها بۆ هەمیشەیی دەمێنینەوە مردنی تێدانیە ، ئەو وصفانەی کە لە قورئان دا هاتووە لە پێشدا باسمان کرد ..؟!

هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەك دا باسی ژیانی دونیا مان بۆ دەکات ، کە چەندە سەخت گرانە ئەم ژیانەی دونیا..؟!

📖 لە (عبد الله بن عمر ) – خوا لێ رازی بێت – بۆمان دەگێریتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((أَيُّها الناسُ إنَّ هذه الدنيا دارُ التِوَاءٍ لا دَارُ اسْتِوَاءٍ ومَنْزِلُ تَرَحٍ لا مَنْزِلُ فَرَحٍ فَمَنْ عَرَفَهَا لمْ يَفْرَحْ لِرَجَاءٍ ولَمْ يَحْزَنْ لِشَقَاءٍ ألا وإنَّ اللهَ تَعَالَى خلق الدنيا دارَ بَلْوَى والآخِرَةَ دَارَ عُقْبَى فَجَعَلَ بَلْوَى الدنيا لِثَوَابِ الآخِرَةِ سَبَبًا وثَوَابَ الآخِرَةِ من بَلْوَى الدنيا عِوَضًا فَيَأْخُذُ لِيُعْطِيَ ويَبْتَلِي لِيَجْزِيَ وإنَّهَا لَسَرِيعَةُ الذَّهَابِ وشِيكَةُ الانْقِلابِ فَاحْذَرُوا حَلاوَةَ رَضَاعِهَا لِمَرَارَةِ فِطَامِهَا واهْجُرُوا لَذِيذَ عَاجِلِهَا لِكَرِيهِ آجِلِهَا ولا تَسْعُوا فى عُمْرَانِ دَارٍ وقَدْ قَضَى اللهُ خَرَابَهَا ولا تُوَاصِلُوهَا وقَدْ أَرَادَ اللهُ مِنْكُمُ اجْتِنَابَهَا فَتَكُونُوا لِسَخَطِهِ مُتَعَرِّضِينَ ولِعُقُوبَتِهِ مُسْتَحِقِّينَ)).[١] واتە: ئەی خەلکینە ، ئەم دونیایە جێگای یان مالی پێچانەوە یە ، نەك جێگای یان مالی راستبوونەوە و ئەرتاحیە یان حەسانەوەیە ، نەك جێگای شادی بەوە کە بزانێ کە نە بەهۆی شادی هیواو ئومێدەوە ، وە نەك بەهۆی نەهامەتی غەمگینی ، بەراستی (خوای گەورە ) دونیایی وەکو جێگای بەلاو ناخۆشیە ، دوا رۆژیش یان قیامەتیشی وەکو پاداشت و سزاو لێ پرسینەوەیە ، هەر بەلایەك یان ناخۆشیەك بۆ پێش بێت لە ژیانی دونیادا ئەوا دەبێتە هۆکارێکە بۆ پاداشت دانەوە لە ژیانی دوارۆژ یان قیامەت دا، وە پاداشتی قیامەتیش لە بەلاو ناخۆشی دونیا دا وەك جێگیرەوەیەك بۆ وەرگرتنی پاداشت ، هەر بۆیە رۆشتنیچکی بە پەلە و خێرا هەیە خەریکە هەلدەگەریچتەوە یان دەروخێت ، بۆیە ئائاداری شرینیەکەی بن بۆ تالی شیر لێدانەکەی ، واز لەم تام و چێژی ساتە وەختی ئێستا بهێنن واتە : (مەبەستی لێ خۆشی دونیایە ) بۆ ناخۆشی ژیانی دواتر (مەبەست لێ قیامەتە یان دۆزەخ ) ، هەول مەدا مالێك ئاوەدان بکەیتەوە لە کاتێك دا (خوای گەورە ) بریاری وێران کاریەکەی داوە ، (مەبەست لێ رۆژی قیامەت دێت ئەم جیهانە وێران دەبێت ) ، بەردەوامی یان گرینگی زۆر بەژیانی دونیا مەدە ، چونکە ویستی (خوای گەورە) یە کە خۆت لێ بەدوور بگریت یان خۆتی لێ دوو بکەویتەوە ، چونکە بەر توورەیی (خوای گەورە ) دەکەویت و شایستەی عقاب سزای ئەو دەبیت ..؟!

[١] - اخرجه الديلمي في الفردوس (٩١٨٦) ، و الذهبي الاربعون الودعانية .

بەڵێ سەرەرای ئەو هەمووو بارەی کە ئادەم (علیه السلام ) لە بەهەشت تێدا بووە ، لەم بارەیەو زۆر ئاسوودە مورتاح بووە ، کە ژیانێکی زۆر نموونەیی بووە ، هیچ تۆمەتبارکردنێکی تێدانە بوو جگە لەو درەختەی خواردی ..؟!! هیچ ماندوو بونێکی تێدا نەبوو ..؟! هیچ ترسێکی تێدا نەبوو ..؟! هیچ ژاوە ژاو زێدە رەوی تێدا نە بوو ..! هیچ دلە راوکێ دوو دلی تێدا نەبوو ..؟! هیچ نەخۆشیەکی تێدا نەبوو..؟! هیچ خەم و پەرژارەو غەم گینی تێدا نەبوو ..؟! هیچ کات هاوسەرەکەی بێزاری نەدەکرد ..؟! هیچ نە خۆشی نەفسی دەروونی تێدا نەبوو ..؟! هیچ ژانێکی تێدا نەبوو ..؟! هیچ هەژاری فەقیری تێدا نەبوو ..؟! هیچ بەندیخانە وزیندانێکی تێدا نەبوو ..؟! هیچ کەسێك هیچ کەسی تر بێزار ناکات بە ووتەی گران و ناخۆش ..؟! هیچ برسیەتی تێدا نەبوو ..؟! هیچ ماندوو بوونێکی تێدا نەبوو ..؟! هیچ بوختان و جاسووی زەم وباسی یەکتری تێدا نەبوو ..؟! هیچ خوێن رشتنی تێدا نەبوو ..؟! هیچ خۆ بەگەورە زانین و لە خۆبایی و غروری تێدا نەبوو ..؟! هیچ حەسوودی چاو هەلبرینی تێدا نەبوو ..؟! هیچ نادادگەری تێدا نەبوو..؟! بەلکو هەمووو شتێك راست و دروست دادگەری و دادپەروەی تێدابوو ..؟! هەروەك دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ ۝٨﴾ [التِين : ٨]واتە : ئایا (خوای گەورە ) چاکترین فەرمانرەوا نیە ..؟! دادگەرترین فەرمانرەوانیە ..؟! کەچی مرۆڤی بەدبەخت سەر کشی دەکات بەداد گەری (خوای گەورە ) رازی نابێت ..؟! لە سنوور دەردەچێت و رێگای هیدایەت رێنموویی (الله ) وەر ناگرێت و سەر کێشی دەکات ..؟! هەمیشە بەدوای خواستی خۆیەتی لە ژیانی دونیادا ، گرنگی بەم ژیانە هەمیشەیە نادات کە بۆ هەتاهەتایی دەمێنیتەوە تێدا دەژی ، ئەوە یکە بسمان کرد ئەم خۆشی شادیەکانی بەهەشتی نەبراوەیە..؟!

بەلام ئەگەر سەرنجێك بدەین ژیانی (ئادەم ) لە دونیادا پێچەوانەی کە باسمان کرد لە پێشدا ، بەلکو لە دونیا تومەتبار دەبێت ، لێ پرسینەوەی لی دەکرێت ، هەروەها بە پرسیار دەبێت لە سەر هەمووو کارو کردەوەکانی دا ، بەدوای پژێوی مال و سامان دا دەگەرێت ، وە برسی دەبێت ، هەژار دەبێت ، بەدوای خواردن خواردنەوە دا دەگەرێت ، بۆ ئەوەی بژێوی خۆی پەیدا بکات ..؟! ئەوە کارو پیشەی هەمووو پێغەمبەران (علیه السلام ) ئۆمەتەکانی پێغەمبەران بووە ، هەروەکو (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالی: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي ٱلۡأَسۡوَاقِۗ وَجَعَلۡنَا بَعۡضَكُمۡ لِبَعۡضٖ فِتۡنَةً أَتَصۡبِرُونَۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرٗا ۝٢٠﴾ [الفُرْقَان : ٢٠]واتە : [ وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي الْأَسْوَاقِ ] وە لە پێش تۆشدا ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - ئێمە هیچ لە پێغەمبەرانمان نەناردووە ئیلا هەر هەموویان مرۆڤ بوونەو خواردنیان خواردووەو لە بازاڕدا گەڕاون و کڕین و فرۆشتنیان کردووە [ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً ] وە هەندێکتان ئەکەینە تاقیکردنەوە بۆ هەندێکتان، پێغەمبەران ئەنێرین تا بەهۆیانەوە خەڵکی تاقیبکەینەوە [ أَتَصْبِرُونَ ] ئایا ئارام ئەگرن لەسەر حەق و لەسەر ئەم تاقیکردنەوە قورسە [ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ] وە پەروەردگاریش زۆر بینایەو هەموو شتێك ئەبینێ و هیچ لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە..؟! لەم ئایەتەد هەولدانی مرۆڤ دووجارە لە ژیانی دونیادا بۆ ئەوەی لە هەژاری رزگاری بێت، أ- گەران بەدوای خواردن خواردنەوە بۆ ئەوەی لە ژیان دا بەردەوام بێت و بمێنیتەوە ..؟! ب- دەست کەوتنی مال و سامان بۆ ئەوەی خواردن بکرێتت وخۆشی ئارەزووەکانی دونیا پێ پرکاتەوە ..؟!

ئەوەی لە سەر رێگای رێنموویە کان و هیدایەتی (خوای گەورە ) بڕوات ئەو بەدلنیایەوە لە ترسی دەبێت و نەغەم وپەژارەی دەبێت..؟!

هەروەك دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ۝٣٨﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨]واتە : [ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ ] ئەوانە ترسیان لەسەر نیە لە داهاتوو لە قیامەت [ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ] وە خەفەتیش ناخۆن لە رابردوو لەوەی لە دونیا بەجێیان هێشتووە چونکە خوای گەورە باشتریان پێ دەبەخشێت..؟! بێ گومان ئەو کەسەی رێنمایەکانی (خوای گەورە ) وەرگرێت بە هیچ شێوەیەك هەرگیز خەم و پەژارە ناخوات ، کەچی لە راستیدا ژیانی دونیاش زۆر هیلاکەت و قورس گرانە بە جۆرەها تاقی کردنەوە دادەڕوات ، بەلام ئەو کەسەی کە خەم پەژارە ناخوات ، ئەوە بەدلنیایەوە گوێرایەلی رێنمایەکانی (خوای گەورە) یە ئەویش بەردەوام لە ئاسایش سەقام گیری ئارامی دا دەژی گوی بەهیچ نادادت چونکە ئیمانی دامەزراوە و توکل یان پشتی بە خوای خۆی بەستەوە بۆیە خەم پەژارەی نیە ..؟! چونکە (خوای گەورە ) لە نێو دلی دا هەموو شتێکی پێ بەخشیوە ، وەکو تەندروستی باش ، ژیری هۆشمەندی پێ دەبەخشێت ، بە مال و سامانێکی کەم رازیە چونکە خۆی گەشتیار حیساب دەکات ، کۆیی دەکاتەوە بۆ قیامەتی خۆی چونکە ئەو نیشنگەی یان شوێنی هەمیشەیی خۆیەتی ..؟!، خۆی بە جوانترین کەس دەزانێت ، چونکە باوەری وایە کە خالقەکەی بە جوان ترین شێوە دورستی کردووە ..؟! ئەو کەسەی رێگای هیدایەتی (خوای گەورە )ی گرتووە هەمیشە باوەری وایە کە (خوای گەورە ) دل و دەروونی ئارام دەکاتەوە هەروەك دەفەرمویێت : قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمۡ﴾ [الفَتْح : ٤]واتە : خوای گەورە ئەو خوایەیە کە هێمنی و ئارامی و ڕەحمەتی دابەزاندە سەر دڵی باوەڕداران لە (حودە یبیە) تا لەگەڵ ئەو ئیمانەی کە هەیانە ئیمانیان زیاتر بکات، (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیمان زیادو کەم دەکات)..!! بەلێ راستە ژیانی دونیا سەختە گران و قورسە ، بەلام ئەو کەسەی کە گوێرایەلی (خوای گەورە ) دەکات ، ئەوە بەدلنیایەوە هەموو کات دل خوش و خۆشحالە ، لە ناو ئەم ژیانە نەهامەتیە و هیلاکەتیە دا ، بەلام گوێرایەلی (خوای گەورە ) ئارامیت پێ دەبەخشێ دل ئارام دەبێت ، بەلام ئەگەر رێگایەکی تر بگریتە بەر ئەوا بەدلنیایی تووشی قەلەق و دلەراوکی دەبیت ، ژیانت لە ئارامی خۆشی دا نابێت ، رێگای هیدایەتی (خوای گەورە ) رێگایی نجات رزگاریە لە ژیانی دونیا لە ژیانی دوا رۆژدا..؟! بەلام رێگای چەوت هەلە رێگای نەهامەتی ترسناکە دژوارە چەرمەسلی هیکەت خەسارەت مەندو رێگایە کە بۆ دۆزەخی دونیاو دۆزەخی قیامەت دا ..؟! سیفاتەکانی مرۆڤ ، هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت :قال تعالى: ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ۝١٩﴾ [المَعَارِج : ١٩] واتە : بەڕاستی مرۆڤ وا دروستکراوە کە زۆر سوورە لەسەر شتەکان و داکۆکیان لێدەکات..؟! بەلێ ئەگەر لەسەر رێنمایەکانی(خوای گەورە ) برۆین ئەو رزگارمان دەبێت لەم پاساو هێنانەوە ی هەلە و گوناهو تاوانە کانمان ، بەردەوام بۆ هەلە و تاوان پاساو دەهێنینەوە داکۆکیان لێ دەکەین ،یان (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ۝٢٠﴾ [المَعَارِج : ٢٠]واتە : کاتێك کە تووشی خراپەیەك بێت لە فەقیری و هەژاری و نەخۆشی و دەردو بەڵا ئەبینی زۆر نائارامەو ئارام ناگرێ و بێئومێد ئەبێ..!!

بەڵێ لە کاتی هەژاری فەقیری نەهامەتی دەردەسەری بەلاو نسیبەت دا ، ئارام ناگرێت زۆر رەشبین و نائومیدە ،رازی نابیت بە و بەشەی خۆی یان بەو تاقی کردنەوەی کە بۆی هاتووە ، ئۆقرەیی لیّ دەبڕێت و پەلاماری هەموو شتێك دەدات ، وا دەزانی دونیا کۆتاییە ، ژیانی بۆ نەماوە ، بەلام لەراستی دا تەنها هەموو خەم پەژارەو بەلاو نەسیبەت و نەهامەتی دونیا تاقی کردنەوەیە بۆ مرۆڤەکان یان بەندە ئیماندارەکان ..؟! هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلۡخَيۡرُ مَنُوعًا ٢١﴾ [المَعَارِج : ٢١]واتە : وە ئەگەر هاتوو تووشی خێرێکیش بێ لە دەوڵەمەندی و پیت و بەرەکەت و رزق و ڕۆزی ئەو کاتە ئەبینی کە قەدەغەی خێرو چاکەی لێ ئەکات و رەزیلی و چرووکی دەکات..؟!بەلیّ ئەگەر مرۆڤە کان تووشی خیرو رزق رۆزی زۆر بوون ، (خوای گەورە ) مال سامان و بەروبوومەکانی لە رزق رۆزی دونیا بە سەر دا باراند ، ئینجا تووشی غروری بەخیلی رەزیلی دەبێت، لەو رزق رۆزیە کە (خوای گەورە ) بە سەری دا باراندووە ، قەدەغەی دەکات بە سەر هەژاراند ، خیری و زەکات و صەدەقەی لیّ دەرناکات ، تەنها ژیانی بۆ خۆ دەویت ، وە کو دەسەلاتدارو فەرمانرەوای سەرکردەکان دەولەمەند بەرپرسیارەکانی ئێستا ، دونیایان تەنها بۆ خۆ و دارو دەستەی خۆیان دەوێت ، گرنگی بەهەژاران نادە هیچ بەخشنێك ناکە لە پێناوی (خوای گەورە ) تەنها ئەوەی کە دەی کەن تەنها خۆ دەر خستن ریایی و خۆ بەگەورە دانانە ، هیچی لە پێناوی (خوای گەورە ) دا نیە ، بەلکو تەنها بانگەشەی بریقەداری بۆگەن قێزەونە چا بە ناوی جیاجیا کەمێك دەبەخشن ، کەچی ئەو مال پارەو سامانەی هەیانە هەر هەبوو بە فسادی و دزی گەندەلی خوێن مژینی خەلك پەیدایان کردووە ..؟! بەلام ئەو کەسانەی رێگای هیدایەت وەرگرتووە تەنها ئەوانەن کە گوێرایەلی (خوای گەورە ) دەکەن عیبادەت پەرستنیا تەنها بۆ (خوای گەورە)یە ، بۆ هیچ شتێك و کەسێك عیبادەت پەرستن ئەنجام نادەن تەنها بۆ (خوای گەورە ) نەبێت ..؟! هەر وەك (خوای گەورە ) باسی ئیمانداران دەکات یان نوێژکەران دەکات کە چەندە سیفاتی جوان نیان هەیە ..؟! هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالی: ﴿إِلَّا ٱلۡمُصَلِّينَ ٢٢﴾ [المَعَارِج : ٢٢]واتە : تەنها ئەو نوێژخوێنانە نەبێ..؟! قال تعالی: ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ دَآئِمُونَ ٢٣﴾ [المَعَارِج : ٢٣]واتە : تەنها ئەو نوێژخوێنانە نەبێ کە لەسەر نوێژەکانیان بەردەوامن و پارێزگاری لێ دەکەن و لە کاتی خۆیدا ئەنجامی ئەدەن بە روکن و واجبات و خشوعەوە، وە دڵیان لای نوێژەکانیانە ..؟! قال تعالی: ﴿وَٱلَّذِينَ فِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ ٢٤﴾ [المَعَارِج : ٢٤]واتە : وە ئەو کەسانەی کە لە ماڵەکانیاندا حەقێکی ئاشکرای تێدایە کە زەکاتە فەرزەکەیە..؟! قال تعالی: ﴿لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ٢٥﴾ [المَعَارِج : ٢٥]واتە : بۆ ئەو کەسانەی کە داوا ئەکەن، وە (مەحروم)یش ئەوەیە کە تووشی بەڵایەك بووەو هیچی نەماوە، یاخود ئەوانەی کە فەقیرو هەژارن و کەس نایانناسێت و خۆیان داوا ناکەن..؟! قال تعالی: ﴿وَٱلَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ٢٦﴾ [المَعَارِج : ٢٦]واتە: وە ئەو کەسانە ی کە باوەڕو یەقینیان بە ڕۆژی قیامەت هەیەو هیچ گومانێکیان نیە..؟! قال تعالی: ﴿ٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ ٢٧﴾ [المَعَارِج : ٢٧]واتە: وە ئەو کەسانەی کە لە سزای خوای گەورە ئەترسێن، هەر چەندە چاکەو کردەوەی باشیان هەیە بەڵام ترسیان هەیە لە سزای خوای گەورەو ئەمین نین لێی..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ ﴿٢٨﴾﴾ [المَعَارِج : ٢٨]واتە : بەڕاستی نابێ هیچ کەسێك ئەمین بێ لە سزای خوای گەورە، وە هەموو کەسێك ئەبێ ترسی لە سزای خوای گەورە هەبێت..؟! قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَـٰفِظُونَ ﴿٢٩﴾﴾ [المَعَارِج : ٢٩]واتە : وە ئەو کەسانەی کە دامێنی خۆیان ئەپارێزن..؟! قال تعالى: ﴿عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٣٠﴾﴾ [المَعَارِج : ٣٠]واتە: تەنها بۆ هاوسەرو خێزانەکانی خۆیان نەبێت [ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ ] یان ئەو کەنیزانەی کە هەیانە [ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ] ئەوان لەو شتەدا لۆمە ناکرێن و تاوانبار نابن..؟! قال تعالى: ﴿فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٣١﴾﴾ [المَعَارِج : ٣١]واتە: بەڵام هەر کەسێك جگە لە خێزانی خۆی یان کەنیزەك (کە کاتی خۆی هەبووە) ئارەزووی خۆی تێر بکات ئەوانە سنووری خوای گەورەیان بەزاندووەو تاوانیان کردووە، (زانایان ئەم ئایەتە دەکەنە بە ڵگە لەسەر حەرامێتی خوی نهێنی)..؟! قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَـٰنَـٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٣٢﴾﴾ [المَعَارِج : ٣٢]واتە : وە ئەو کەسانەی کە ئەگەر ئەمانەتێکیان لەلا دابنێ ئیتر ئەگەر ئەمانەتەکە ماددی بێ یان مەعنەوی ئەوان ئەیپارێزن، وە هەر عەهدو بەڵێن و پەیمانێك کە هەیانبێ ئەیبەنە سەرو خیانەت ناکەن، (ئەمانە سیفاتی باوەڕدارەو پێچەوانەکەی سیفاتی دووڕووە کە درۆ دەکەن و بەڵێن جێبەجێ ناکەن و ناپاکی لە ئەمانەت دەکەن)..؟! قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِشَهَـٰدَٰتِهِمْ قَآئِمُونَ ﴿٣٣﴾﴾ [المَعَارِج : ٣٣]واتە : وە ئەو کەسانەی کە شایەتییەك هەبێ لەبەر خوا وەکو خۆی دەیدەن بەبێ ئەوەی کە لێی زیادو کەم بکەن، وە نایشارنەوەو شایەتییەکە دەرئەبڕن و ئاشکرای ئەکەن، ئیتر ئەگەر دژی بەرژەوەندی خۆیان یان دژی خزمی نزیکیان بێ ئامادەنین زیادو کەمی بکەن یان بیشارنەوە..؟! قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٣٤﴾﴾ [المَعَارِج : ٣٤]واتە : وە ئەو کەسانەی کە پارێزگاری لە نوێژەکانیان ئەکەن بە ڕوکن و واجبات و خشوع و مەرجەکانەوەو وەکو خۆی ئەنجامی ئەدەن و پارێزگاری لێ ئەکەن، وە هیچ شتێك سەرقاڵیان ناکات لە نوێژەکانیان..؟! قال تعالى: ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ فِى جَنَّـٰتٍ مُّكْرَمُونَ ﴿٣٥﴾﴾ [المَعَارِج : ٣٥]واتە : ئەوانەی کە ئەم سیفەتانەیان تیابێت ئەمانە لە بەهەشتانێکدان و ئەچنە ناوی و ڕێزیان لێ ئەنرێ بە جۆرەها ڕێز..؟! بێ گومان ئەو کەسانەی یان ئەو ئیماندارانەی ئەو سیفە تە چاکانیان تێدا بەدی بکرێت ڕێگای هیدایەتی (خوای گەورە)یان گرتۆتەبەر ، هەروەها ریچگای بەهەشت تیان بۆ خۆ ئاسان کردووە ، بەم سیفەتانەی کە (خوای گەورە ) لە قورئانەکەی دا باسی دەکات ، ئەم سیفەتانەی کە باسمان کرد ئەو ڕێگایەیە کە (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] واتە : ئەوەی شوێن ئەو کتابە بکەوێ و کاری پێ بکات [ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ ] ئەوانە ترسیان لەسەر نیە لە داهاتوو لە قیامەت [ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ] وە خەفەتیش ناخۆن لە رابردوو لەوەی لە دونیا بەجێیان هێشتووە چونکە خوای گەورە باشتریان پێ دەبەخشێت..؟!

📖 لە (معاذ بن جبل)- خوا لی رازی بیت – دەگێڕیتەوە دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((یا معاذُ بنَ جبلٍ ! هل تَدْرِی ما حَقُّ اللهِ علی عبادِه وما حَقُّ العبادِ علی اللهِ ؟ فإنَّ حَقَّ اللهِ علی العبادِ أن یعبدوه و لا یُشْرِكوا به شیئًا ، وحَقَّ العبادِ علی اللهِ أن لا یُعَذِّبَ مَن لا یُشْرِكُ به شیئًا)).[١]واتە: فەرمووی : ئەی موعاز ئایا دەزانی مافی (خوای گەورە ) لە سەر بەندەکانی چیە ..؟! ومافی بەندەکانی چیە لە سەر (خوای گەورە ) ..؟! مافی (خوای گەورە ) لەسەر بەندەکانی ئەوەیە کە بی پەرستیت و هیچ شتێك یان هیچ کەسێك نەکەیت بە شەریك و هاوبەش ، هەروەها مافی بەندە لە سەر (خوای گەورە ) ئەوەیە کە سزای و ئازاری نەدات ئەگەر هیچ شتێکی نەکردە شەریك و هاوبەش ..؟!

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) –رەحمەتی خوای لیّ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿قُلْنَا ٱهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعًا﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] دەلێت: هەموو یان لە بەهەشت دەرکران ، واتە : ئادەم ، حەوا ، ئیبلیس ..!! ئینجا (خوای گەورە ) وەحی بۆ رەوانە کرد لە دوای هاتنە خوارە وەیان بۆ سەر زەوی فەرمووی : قال تعالی: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] ...).[٢]

✍ لە ریّ (اربیع بن أنس ) لە (ابی العالیە ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] دەلێت : واتە : رێنمووی یان هیدایەت : بۆ پێغەمبەران پەیامبەران و نێردراوانە یان راسپاردانە ..).[٣]

✍ لە ریّ (البراء بن زید ) لە (الحسن البصری ) – رەحمەتی خوای لیّ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالی: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] دەلێت : هدی یان ریّ نیشاندەر و رێنموویی ، بە مانای ( قورئانی پیرۆزە ) ..).[٤]

[١] - شیخ لالباني صحیح الجامع برقم (٧٩٦٨) ، و البخاري برقم (٢٨٥٦) ، ومسلم برقم (٣٠).
[٢] -تفسیر مقاتل بن سلیمان (١/١٠٠).
[٣] -اخرجه ابن جریر (١/٥٨٩).
[٤] -اخجه ابن ابي حاتم (١/٩٣).

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] دەڵێت : واتە نەوەکانی ئادەم بۆ یان هات ، یان ئەی نەوەی ئادەم قال تعالى: ﴿مِّنِّي هُدٗى﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] واتە : پەیامبەر یان نێردراو بە پەرتووك یان کتاب و نامە ، لە گەل هەوالی جێگیر بۆ ئەوانەی رێنمووی دەکرێن تا رۆژی دوای ، قال تعالى: ﴿فَمَن تَبِعَ هُدَايَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] ..).[1]

✍ لەرێ ( بكير بن معروف ) لە (مقاتل بن حيان ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] دەڵێت : واتە رێنمووی رێ نیشاندەری ﷺ ..).[2]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَمَن تَبِعَ هُدَايَ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] دەڵێت : واتە : پەیامبەر یان نێردراو کتابە کەی واتە : ( قورئان و تورات و زبور و ئینجیل و مصحف ابراهيم ).[3]

✍ لە رێ (عطاء بن دينار ) لە (سعيد بن جبير ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] دەڵێت : واتە : رۆژی قیامەت یان رۆژی دوایی ، قال تعالى: ﴿وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٣٨﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] دەڵێت : واتە : خەم و پەژارە ناخۆن بۆ مردنیان ..).[4]

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) –رەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٣٨﴾ [البَقَرَةِ : ٣٨] دەڵێت : نە دەترسن لە مردن ، نە خەم و پەژارە دەخۆن بۆ مردنیان ..).[5]

قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٣٩﴾ [البَقَرَةِ : ٣٩]

[1] - تفسير مقاتل بن سليمان (٩٩/١) .
[2] - اخرجه ابن ابي حاتم (٩٣/١).
[3] -تفسير مقاتل بن سليمان (١٠٠/١).
[4] -اخرجه ابن ابي حاتم (٩٣/١) .
[5] - تفسير مقاتل بن سليمان (١٠٠/١).

قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَآ﴾ واتە : وە ئەوانەی کە بێ باوەر بوون و نیشانە و ئایەتەکانی ئێمە یان بە درۆزانی..!! قال تعالى: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ﴾ واتە : وە ئەوانە هاوەڵ و هاودەمی ئاگرن ..!! قال تعالى: ﴿هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ٣٩﴾ واتە: تیایدا ئەمێنەوە بۆ هەتا هەتایی و هەمیشە یی ..!! کەواتە : (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : ئەو کەسانەی کە بێ باوەرو بێ ئیمانن ، لە رێگای راستە کەی من لادەدەن و پشت دەکەن فەرمانەکانم و نیشانە و ئایەتەکانم ..؟! کەواتە : ئایەتەکان و نیشانە و بەلگە کانی (خوای گەورە ) بە درۆدەخەنەوە و باوەری پێ ناکەن ن بێ گومان ئەوانە هاوەڵ و هارێی ئاگری دۆزەخن ، بۆ هەتا هەتایی و هەمیشەیی تیچدا دەمێنەوە ..؟! بەلی بێ باوەر بە ئایەت و بەلگە و نیشانەکان هاورێ ئاگری دۆزەخن ، هەلبەت ناتوانن لە ئاگر دەربچن بۆ هەتا هەتایی و هەمیشەیی دەمێنەوە ، ئەم سزایەکی زۆر گەورە و قورسە و ترسناکە بۆ ئەوانەی کە بێ باوەرن بە ئایەتەکان و نیشانەکانی پەروەردگار ، بێ گومان گەورە ترین سزایە کە بۆ هەمیشەیی ببیتە هاورێ ئاگری دۆزەخ ، بەلی ئەوانە هەر گیز رزگاریان نابێ لێ دەرناجن لە ئاگری دۆزەخ دا ، چونکە بە قەد تاوان ستەمەکەیان سزاکەشیان گەورەیە، وەکو دەلێن : (إن جزاءالعمل من جنس العمله ) واتە : پاداشت سزایی هەرکارێك لە جنسی کارەکە دایە ، جا کردەوەکەی خێر بێت پاداشتی بە خێر دەدرێتەوە ، جا کردەوە کەی بە شەر وبەدبەختی بێت سزاکەشی بە شەر بەدبەختی نەهامەتی دەدرێتەوە..؟! هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿جَزَآءً وِفَاقًا ٢٦﴾ [النَّبَإِ : ٢٦] واتە : ئەم سزایە کە خوای گەورە سزای ئەم تاوانبارانە ئەدا لەبەر ئەوەی شەریکیان بۆ خوای گەورە داناوە هاوشێوەی کردەوەکەی خۆیانە، ئەوان گەورەترین تاوانیان بۆ خوا داناوە کە شەریك دانان بوو بۆ خوا، خوای گەورەش سەختترین سزایان ئەدات لە ناو ئاگری دۆزەخدا..؟! جا ئاشکرایە تەنها دوو رێگا هەیە ، رێگای راست و رێگای هەل و چەوت ، یان تەنها دوو بەرنامە هەیە ، (حەق و ناحەق ) ئەگەر پەیرەوی رێگای راست و حەق بکەین ، ئەوا چاکە وپاداشت و خێری بە هەشتە بەدەست دەهێنین بۆ هەتاهەتایی ، بەلام ئەگەر پەیرەوی رێگای چەوت هەل و ناحەق بکەین ، ئیتر گومرایی سزایەکەشی دۆزەخە بۆ هەتا هەتایی دەمێنییەوە ، هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَـٰلُ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ٣٢﴾ [يُونُس : ٣٢]واتە : [ فَذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ ] ئەو الله یە پەروەردگاری حەقی ئێوەیە نەك ئەوانەی کە ئێوە کردووتانن بە شەریك بۆ خوا [ فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ ] لە پاش حەقیش هیچ شتێکی تر نیە تەنها گومڕایی نەبێ [ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ ] بۆچی لەم حەقە ئاشکرایە لائەدەن و ئەکەونە ناو گومڕاییەوە..؟!!

تێبینی / مانایی چەند ووشەیەك :

قال تعالى: ﴿وَكَذَّبُواْ﴾ واتە : (كذب) مانای : درۆكردن ، بەلام (كذب ) واتە: بەرانبەرەكەی خۆی بەدرۆ زانی دەلێ : (كذبته : نسبة إلى الكذب ، صادقا كان أو كاذبا ) (كذبته) واتە: بەرانبەرەكەی خۆمم بە درۆ زانی ، جا راست بكا یا خود درۆ بكا ، هەركاتێ بەرانبەری خۆتت بە درۆ زانی ، مانای وایە ئەوە (تكذیب ) كردوە ..؟!

قال تعالى: ﴿بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ واتە : نیشانە یان بەلگە ، یان قورئان ، یان بە هەربەشێك لە قورئان دەوترێت : (ئایەت) كە دەكوێتە نێوان دوو ژمارە ، بە هەموو موعجزەیەك دەووترێت : (ئایەت) كە لە لایان (خوای گەورە ) نێردرابێت ، وە كو ( قورئان ) و موعجیزە حسیە و معنوی ، یان (ئایەت ) بە شتێك دەوترێت : كە بەلگە بێت لە سەر بوون و تاك و تەنهایی و دەسەلات بێ سنووری (خوای گەورە ) ، هەروەها (ئایەت ) بەمانای نیشانە واتە (قورئان ) چونكە لە سەرووی هەموو تصوری ئادەمیزادە ، واتە : هیچ شتێك لەم جیهانە هاوشێوەی نابێت ، لە تاوانی مرۆڤ دانیە نیشانەیەك یان ئایەت بەدەست بهێنی ، تەنها و تەنها لە لایەن (خوای گەورە) یە كە نیشانە بەلگەی راست حەق دابەزێنی بۆ بەندەكانی خۆی ، هەروەك دەفەرمووێت : قال تعالى: ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٣ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٣ - ٢٤]واتە : {قورئان تەحەددا دەكات} [ وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ ] وە ئەگەر ئێوە گومانتان هە یە لەو قورئانە پیرۆزەی كە بۆ سەر عەبدی خۆمان كە محمد صلی الله علیه وسلم دامان بەزاندووە ئەوا تەنها هاوشێوەی سوورەتێكی قورئان بێننەوە ئەگەر وەكو كورتترین سوورەتیش بێت [ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ] وە شایەت و پشتیوانەكانی خۆیشتان بێنن لە غەیری خوا شایەتیتان بۆ بدات كە ئەمەی ئێوە هێناوتانەتەوە هاوشێوەی سوورەتێكی قورئانە ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن..؟! [ فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا ] بەڵام ئەگەر ئەم شتەتان نەتوانی وە ناشتوانن وە تا ئێستا نەیانتوانیوەو تا ڕۆژی قیامەتیش ناتوانن سوورەتێكی بچووكی هاوشێوەی قورئان بێننەوە، چونكە قورئان قسەی خوایە چۆن قسەی مرۆڤ وەكو قسەی خوا دەبێت..؟!

قال تعالى: ﴿خَٰلِدُونَ ٣٩﴾ واتە : (الخلود ) : (هو تبري الشيء من اعتراض الفساد ، وبقاؤه على الحالة التي هو عليها ) واتە: (الخلود ) بریتیە لە لەوە كە شتێك حالەتی تێكچوونی بە سەر دا نەیەت و لە سەر حالەتی خۆی كە لە سەر بووە بمێنێتەوە ، (خلد) : اسم الجزاء الذي يبقى من الإنسان على حالته فلا يستحيل مادام الإنسان حيا استحالة سائر أجزائه ) واتە : (خلد ) بەو بە شە دە ووترێت : كە لە مرۆڤدا وەك خۆی دەمێنیتەوە و هەتا مرۆڤ زیندوو بێ و وەك ئەندامەكانی دیكەی ناگۆری ، (یان وەك ئەم پەندە كوردیە هەیە دەلێن : خۆی پیوە گرتووە ناگۆری بەشیری گرتوویەتی بەرنادات بە پیری ) ، كە دیارە مەبەست بە (خلد ) پی مێشكە ، یان دەوترێت : (جرى هذه في خلده ) واتە : ئەوەی بەمێشك داهات ، ئەویش لەبەر ئەوەی دەماغ لە كاتێكدا ، كە خانەكانی هەموو بەدەن و دەگۆرێن و نویێ دەبنەوە خانەكانی ئەو ناگۆرێن ، وە چەندن هەر ئەوەندەن كەم و زیاد ناكەن ، كەواتە: (خلود ) واتە: مانەوە ، مانەوەیەكی بێ كۆتا ، یاخود هەر مانەوە ، بۆ هەمیشەیی هەتا هەتایی بێ كۆتایی لە دۆزەخە ..؟!

✍ لەڕێ (قتادە ) لە ( سعید ) – ڕەحمەتی خوا لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٩] دەڵێت : مانای : بێ باوەڕکانی قریش بووە ..).[١]

✍ لەڕێ (عطاء بن دینار ) لە (سعید بن جبیر ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی قال تعالى: ﴿بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ [البَقَرَةِ : ٣٩] دەڵێت : واتە : قورئانی پیرۆز ..).[٢]

✍ لەڕێ (أسباط ) لە ( إسماعیل السدي ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە سەر ووتەی ﴿بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ دەڵێت : سەبارەت بە ئایەتەکانی نیشانەکانی (خوای گەورە ) ئەوا محمد ﷺ..).[٣]

📖 لە ( أبی سعید الخدری ) – خوا لێ رازی بێت – دەڵێت: لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((أَمَّا أَهْلُ النَّارِ الَّذِينَ هُمْ أَهْلُها، فإنَّهُمْ لا يَمُوتُونَ فيها ولا يَحْيَوْنَ، ولَكِنْ ناسٌ أصابَتْهُمُ النَّارُ بذُنُوبِهِمْ، أوْ قالَ بخَطاياهُمْ، فأماتَهُمْ إماتَةً حتَّى إذا كانُوا فَحْمًا، أُذِنَ بالشَّفاعَةِ، فَجِيءَ بهِمْ ضَبائِرَ ضَبائِرَ، فَبُثُّوا علَى أنْهارِ الجَنَّةِ، ثُمَّ قيلَ: يا أهْلَ الجَنَّةِ، أفِيضُوا عليهم، فَيَنْبُتُونَ نَباتَ الحِبَّةِ تَكُونُ في حَمِيلِ السَّيْلِ، فقالَ: رَجُلٌ مِنَ القَوْمِ، كَأنَّ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ قدْ كانَ بالبادِيَةِ. وفي رواية: بمِثْلِهِ إلى قَوْلِهِ: في حَمِيلِ السَّيْلِ، ولَمْ يَذْكُرْ ما بَعْدَهُ )) .[٤] واتە : نیشتەجێ دۆزەخ ئەوانەی خەڵکی ئەوێن ، بەڕاستی ئەوانن ، نەدەمرن لە ناوی دا ..؟! نە دەژین لە ناوی دا ..؟! بەڵام کەسانێك لە ئێوە بە هۆی تاوانەکانیانەوە کەوتوونەتە ناو دۆزەخەوە ، (خوای گەورە ) بە جۆرە مردنێك ئەوانی مرادونی ، کاتێ بوونە بە خەڵوز مۆڵەتی شیفاعەت دەدرێت ..؟! ئەو کاتە کۆمەڵ کۆمەڵ و دەستە دەستە و جیا جیا دەیانهێنن بلاودەکرێنەوە بە ناو ڕووبارە کانی بەهەشت دا ..!! ئینجا دەوترێت : ئەی خەڵکی بەهەشت ئاو بکەن بە سەریاندا ، ئینجا شین دەبنەوە یان دەڕوێنەوە وەکو (تۆو ) لە ناو لیتاوی لافاو دا شین دەبنەوە یان دەڕوێن ..؟! یەکێك لە خەڵکەکە ووتی : پێغەمبەری خوا ﷺ لە گوندا ژیاوە...!!

✍ لە (مقاتل بن سلیمان ) –ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : لە گەل ئەو هەواڵە جێگیرە ، واز هێنانیان لە ڕێ نمووبی هیدایەت ، قال تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ واتە : بێ باوەڕ بوون بە پێغەمبەرەکەی خوا ﷺ قال تعالى: ﴿وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ واتە: قورئانی پیرۆزیان ، بەدرۆ زانی یان بە درۆیان خستەوە ئایەتەکانی قورئان یان نیشانەکانی (خوای گەورە) ، قال تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٣٩﴾ واتە: ئەوانە ، هەرگیز نامرن لە قیامەت دا بۆ هەمیشەیی لە ئاگردا دەمێنەوە ..؟!).[٥]

---

[١] -اخرجه ابن ابي حاتم (٩٤/١).
[٢] -اخرجه ابن ابي حاتم (٩٤/١).
[٣] - اخرجه ابن ابي حاتم (٩٤/١).
[٤] - صحيح مسلم برقم (١٨٥).
[٥] - تفسير مقاتل بن سليمان (١٠٠/١).

# سەرچاوەکانی عەرەبی

١-تفسير القرآن العظيم ابن كثير

٢-تفسير جامع البيان عن تأويل القران الطبرى

٣-تيسير المنام فى تفسير القران لابن سعدى

٤-تفسير مقاتل بن سليمان

٥- تفسير ابن زمنين

٦- تفسير الكشف البيان فى تفسير للثعلبى

٧- معالم التنزيل فى تفسير القران للبغوى

٨-الكشاف عن حقائق التنزيل للزمشخرى

٩-مفاتيح الغيب الفخر الرازى

١٠- جامع لأحكام القران القرطبى

١١- أنوار التنزيل وأسرار التاويل للبيضاوى

١٢-التسهيل لعلوم التنزيل ابن جزى

١٣-البحر المحيط لأبى حيان الاندلسى (ابو حيان )

١٤-تفسير الجلالين للمحلى والسيوطى

١٥-الدر المنثور فى التفسير بالمأثور للسيوطى

١٦-إرشادر العقل السليم إلى مزايا الكتاب الكريم لأبى السعود

١٧-فتح القدير الشوكانى

١٨-المحرر الوجيز فى تفسير الكتاب العزيز لابن عطية

١٩-التحرير التنوير لابن عاشور

٢٠-فى ظلال القران لسيد قطب

٢١-تفسير ميسر

٢٢-زاد المسير فى علم التفسير

٢٣-تفسير القيم للإمام ابن قيم

٢٤- تفسير الكبير ابن تيمية (إسماعيل بن عمر بن كثير)

٢٥-الوجيز للواحدى تفسير للواحدى

٢٦-بحر العلوم تفسير السمر قندى

٢٧- تفسير ابن ابى حاتم

٢٨-تفسير ابن عثيمين

٢٩-تفسير نابلسى (محمد راتب النابلسى )

٣٠-السنن الترمذى

٣١-السنن النسائى

٣٢- السنن الدارمی

٣٣-السنن ابن ماجه

٣٤- السنن ابی داود

٣٥- السنن ابن حبان

٣٦-صحیح البخاری

٣٧- صحیح المسلم

٣٨-تنویر المقباس من تفسیر ابن عباس

٣٩- مراح لبید لكشف معنی القران المجید

٤٠- كشف الاستار البزار

٤١- تفسیر المجاهد

٤٢- تفسیر ابن حیان

٤٣- بدائع التفسیر ابن قیم

٤٤-تفسیر الكبی الامام فخر الدین الرازی

٤٥- اخرجه الحاكم (ابو عبدالله محمد بن عبدالله الحاكم السینابوری ) كاتب(المستدرک الصحیحین)

٤٦- تخریج مسند شعیب الأرؤوناط

٤٧-الطبرانی فی المعجم

٤٨- اخرجه ابن جریر (ابو جعفر محمد بن جریر ) الامام ا ابو جعفر الطبری

٤٩- اخرجه ابن ابی حاتم (ابو محمد بن عبدالرحمن بن محمد بن إدریس بن المنذر بن داودبن المهران التمیمی)

٥٠- حلیة الأولیاء ابن أبی نعیم

٥١-اخرجه عبدالرزاق ، لأمام عبدالرزاق الصنعانى (منصف عبدالرزاق )

٥٢-الامام أحمد فى الزهد

٥٣- سيرة ابن هشام

٥٤- ابن ابى الدنيا فى صفة الجنة

٥٥-عبدالله بن عباس (مسائل نافع الا رزق )

٥٦-إتحاف الخير المهرة (البوصرى )

٥٧-تعظيم قدر الصلاة ، محمد بن نصر

٥٨- ابن ابى حاتم ميزان الاعتدال

٥٩- الطبرانى فى الكبير

٦٠-الامام أحمد فى كتاب (الأم )

٦١-تخريج الإحيا للعراقى

٦٢-شيخ الالبانى فى صحيحه

٦٣-اخرجه البيهقى فى شعب

٦٤-اخرجه الطستى فى الأتقان

٦٥-اخرجه ابن عساكر فى تاريخ دمشق

٦٦-الواحدى فى اسباب النزول

٦٧-فتح البارى

٦٨-جامع الصغير

٦٩-علقة الواحدى فى الوسط

٧٠-اخرجه ابن ابى الدنيا فى الصمت

٧١-شيخ الالبانى فى هدية الرواة

٧٢-الهيثمى فى مجمع الزوائد

٧٣- ابو يعلى فى مسند

٧٤-اخرجه ابن ابى الدنيا فى كتاب المطر (موسوعة ابن ابى الدنيا )

٧٥-اخرجه البيهقى (ابو بكر البيهقى ) احمد بن الحسين بن على بن موسى الخرسانى ، صاحب دلائل النبوة

٧٦- البخارى فى الاداب المفرد

٧٧-ابن كثير فى البداية والنهاية

٧٨-اخرجه ابن سفيان الثورى (ابو عبدالله سفيان بن سروق الثورى ، الامام أئمة الحديث النبوى .

٧٩-اخرجه الشافى فى المسند

٨٠-ابن القيسرانى فى ذخيرة الحافظ (هو احد أئمة الحفاظ )هو محمد بن طاهر بن بن على بن احمد ،أبو الفضل ابن القيسرانى ، كان فقيها الظاهرى .

٨١-محمد جار الله الصعدى فى النوافح العطر

٨٢-اخرجه ابن ابى شيبه ، هو ابى بكر ابن ابى شيبة (فى مصنف )

٨٣-ابو نعيم فى صفة الجنة

٨٤-عبدالله بن المبارك المروزى الخوارزمى ، هو عالم وإمام مجاهد مجتهد فى شتى العلوم الدينى كتاب (الزهد الرقائق ) ، (كتاب الجهاد )

٨٥- ابن العسقلانى هو شهاب الدين ابو الفضل احمد بن على العسقلانى شافعى مذهب فى (تغليق التعليق) لقب: الحافظ ابن حجر العسقلانى .

٨٦-شيخ الالبانى فى ضعيف الترغيب

٨٧- شيخ الالبانى فى سلسلة صحيحة

٨٨- الطبرانى فى الصغير

٨٩-الامام احمد بن حنبل فى الزوائد الزهد

٩٠الواحدى فى الوسط هو مشهور بكتاب اسباب النزول للواحدى .

٩١-تفسر الكبير الامام فخر الدين الرازى

٩٢- تاريخ الطبرى

٩٣-ابن تيمية فى (التوسل والسيلة)

٩٤-مجموعة الفتاوى ابن تيمية

٩٥- ابن عساكر فى تاريخ دمشق

٩٦-اخرجه الاصبهانى فى الترغيب والترهيب

٩٧-الامام احمد بن حنبل فى (المنتخب العلل الضلال )

٩٨-ابن الانبارى فى (الاضداد )

٩٩-الذهبى فى (الميزان الاعتدال)

١٠٠- ابن عدى فى (الكامل فى الضعفاء)

١٠١-اخرجه الوادعى فى صحيح المسند

١٠٢- ابن قيم فى (البدائع التفسير )

١٠٣-اخرجه ابن ابى داود فى فى (المصاحف )

١٠٤-أورده الديلمى فى (الفردوس )

١٠٥ موقع الدرر السنية موسوعة الحديث أو موسوعة التفسير . وموقع معجم المعانى عربى .

# سەرچاوە کوردیەکان

١-تەفسیری ابن كثير بە کوردی . وەرگێرانی (علی حاجی عبدالله پریسی ).

٢-تەفسیری قورئانی پیرۆز لە گەڵ وەرگێرانی ماناکانی بۆ زمانی کوردی (مامۆستا مەلا محمد مەلا صالح بامۆکی).

٣-تەفسیری رەوان بۆ تێگەیشتنی قورئان (مامۆستا مەلا محمودی گەلالە یی ).

٤-تەفسیری ژیانی ئینسان بۆ لێکدانەوە واتاکانی قورئان ( مامۆستا مەلام عبدالرحمن مە تەها عبدالعزیز حاجی پیرداود - دزەیی هۆرمزیاری .

٥- تەفسیری تەوحید (مامۆستا مەلا عبدالقادر تەوحیدی ).

٦-تەفسیری قورئان بەرز بەپێز (مامۆستا علی باپیر).

٧-تەفسیری نامی بۆ قورئانی پیرۆز (مامۆستا مەلا عبدالکریمی مودەریس ).

٨-تیسیر الكريم الرحمن فی تفسير كلام المنان بە کوردی وەرگێرانی (عباس محمد امین )

٩-تەفسیری کوردی لە کەلامی خواوەندی ( مەلای گەورەیی کۆیی ).

١٠- تەفسیری قورئانی پیرۆز (مامۆستا مەلا عوسمان عبدالعزیز )

١١- تەفسیری گولشەن (نظام الدین عبدالحمید ) .

١٢- اسباب نزول القران بە کوردی نووسینی: (خدر حمد خە تی ).

١٣-تەفسیری قورئانی پیرۆز (مامۆستا هەژار)

١٤- تەفسیری رامان ماناو مەبەستی قورئان (شێخ احمد کاکە محمود ).

١٥-تەفسیری ئاسان نووسینی : بورهان محمدامین .

١٦- تەفسیری باران نووسینی: زێرەڤان خۆشەوی .

١٧-تەفسیری رێبەر ئامادەکردنی (مامۆستا صلاح الدین عبدالکریم ).

١٨- تەفسیری المیسر بە کوردی وەرگێرانی : نەوا محمد سعید .

١٩- تەفسیری رێبەر (مامۆستا صلاح الدین عبدالکریم ) . لە ماڵپەری بەهەشت

٢٠-تەفسیری رۆشن

٢١- وەرگێرانی عەربی بۆ کوردی لە گۆگل الترجمە .

# سەرباسەکان

١٣) ئایەتی ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ [البَقَرَةِ : ٩] ---------------------------------------------------------------- ١١٢-١٢١

١٤) ئایەتی ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ١٠﴾ [البَقَرَةِ : ١٠] ---------------------------------------------------- ١٢٢-١٢٨

١٥) ئایەتی ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ١١﴾ [البَقَرَةِ : ١١]--- ------------------------------------------------------------------- ١٢٩-١٣٦

١٦) ئایەتی ﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ١٢﴾ [البَقَرَةِ : ١٢-------١٣٧-١٤٠

١٧) ئایەتی ﴿إِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ١٣﴾ [البَقَرَةِ : ١٣] ------------------------ ١٤١-١٤٧

١٨) ئایەتی ﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤﴾ [البَقَرَةِ : ١٤]----------------------------------- ١٤٨-١٥٣

١٩) ئایەتی ﴿ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ١٥﴾ [البَقَرَةِ : ١٥] ---١٥٤-١٦١

٢٠) ئایەتی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٦﴾ [البَقَرَةِ : ١٦] ---------------------------------------------- ١٦٢-١٦٦

٢١) ئایەتی ﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧﴾ [البَقَرَةِ : ١٧] ---------------------------١٦٧-١٧٤

٢٢) ئایەتی ﴿صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨﴾ [البَقَرَةِ : ١٨] -------------١٧٥-١٧٩

٢٣) ئایەتی ﴿أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ [البَقَرَةِ : ١٩] ----------١٨٠-١٩٣

٢٤) ئایەتی ﴿يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ قَامُواْۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠﴾ [البَقَرَةِ : ٢٠-١٩٤-٢٠١

٢٥) سودەکانی بیست ئایەتی سەرەتایی سورەتی (البقرە ) ----------------------٢٠٢-٢٠٦

٢٦) ئایەتی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٢١﴾ [البَقَرَةِ : ٢١] -------------------------------------------٢٠٧-٢١٦

٢٧) ئایەتی ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٢٢﴾ [البَقَرَةِ : ٢٢] ---٢١٧-٢٢٨

٢٨) ئایەتی ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٣﴾ [البَقَرَةِ : ٢٣] -----------------٢٢٩-٢٣٧

٢٩) چەند بەلگەیەك لەسەر ئەوەی كە قورئانی پیرۆز كلام و ووتەی (خوای گەورە) یە-----٢٣٨-٢٤٣

٣٠) ئایەتی ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُۖ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ٢٤﴾ [البَقَرَةِ : ٢٤] ---------------------------------٢٤٤-٢٥٠

٣١) ئایەتی ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًاۖ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌۖ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٥﴾ [البَقَرَةِ : ٢٥] ------------------------٢٥١-٢٦٧

٣٢) ئایەتی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْىِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًاۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًاۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ٢٦﴾ [البَقَرَةِ : ٢٦] ----------٢٦٨-٢٧٩

٣٣) ئایەتی ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ٢٧﴾ [البَقَرَةِ : ٢٧]-----------٢٨٠-٢٨٦

٣٤) ئایەتی ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ٢٨﴾ [البَقَرَةِ : ٢٨] ----------------------------------٢٨٧-٢٩٣

٣٥) ئایەتی ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ٢٩﴾ [البَقَرَةِ : ٢٩] ---------------------٢٩٤-٣٠٢

٣٦) چیرۆکی گێرانەوەکانی پاشایەتی ئیبلیس ------------------------------٣٠٣-٣٢٣